# ناسنامەی کتێب


ناوی کتێب : زەوی ناسی جیۆلۆجی

بابەت : زانستی

نووسینی : محمد حسن

تیراژ: ( ٢٠٠٠ ) دانە

چاپ: یەکەم / ( ٢٠١١ )

بۆ کارە هونەرییەکان و چاپکردن ( ٠٧٥٠١١٨١٩١٩ )

بۆ بڵاوکردنەوەو دابەشکرن ( ٠٧٥٠٤٦٧١٣٩٤ )

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی ( ٢٤٣٤ )ی ساڵی ( ٢٠١١ )ی پێ دراوە

زنجیرەی ئیعجازی زانستی قورئان و سوننەت (٢)

# زەوی ناسی

## لە سایەی قورئان وفەرمودە زیاتر لە (٢٠٠) ئیعجازی جیۆلۆجی لە خۆدەگرێت

محمد حسن سەرگەینێلی/ سەنگەسەر

چاپی یەکەم

٢٠١١ ز ١٤٣٢ هـ




# ( پێشەکی یەك )

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس بۆ خوا جارەکی تر بە خزمەت بەشی دووەمی ئینسکلۆپیدیایەکەتان گەیشتینەوە بە ناوی (زەوی ناسی – جیۆلۆجیا)، دوای ئەوەی گەردونناسیەکەمان بە چاپ گەیاند کە سوپاس بۆ خودا بە دڵی مامۆستایان و قوتابیان ورۆشنبیران بوو، وەزۆریان هاندام کە بە زویی زەوی ناسیەکەشمان ئامادە بکەین کە لە ئاستی گەردون ناسیە کە دابێت بۆ خزمەت کردن بە خولیایانی زەوی ناسی و خولیایانی ئیعجازی زانستی لە قورئاندا .

ئێمەش بێ دڵیمان نەکردن و شانمان دایە بەرو خۆمان بۆی ئامادەکردو نوێترین و باشترین سەرچاوەی زانستیمان بۆ کۆکردەوە و بە چڕو پڕی خستمانە سەریەك، ئەوەندەی کە لە توانامانداببو ئیعجازەکانی زەوی ناسیمان کۆکردەوە، تابتوانین لە ئاستەکی بەرزو ئەکادیمی دا دابیەزێنین و ببێ بە سەرچاوەییێ لە زەوی ناسیدا بۆ خولیایانی زانست و ئیعجازو بە زۆریێ لە ئیعجازەکانی زەوی ناسی یان ئاشنابکاتن کە بەشێکی گرنگە لە جیهانی زانست و خوێندنی ئیمرۆدا .

بێگومان ئەم ئیعجازانە بە شێوەیەك دامان رشتوون کە لەگەڵ موسلمانان و رۆشنبیرانی کوردی خۆماندا بسازێن و وەلامێ بێ بۆ ئەم پرسیارانەی بە مێشکی ئەواندا دێت و دەچێت لەم چاخەداو خزمەت بە ئاین و کلتوری گەلەکەمان دەکات و رێنوما بەخش بێ لەم بوارەدا بۆ گەیشتن بە راستەقینەکان لە زانستدا .

وەلێرەدا دەبینین قورئان هەر تەنیا عەقیدەو خواپەرستی و رەوشت ومامەلەکان نیە، بەلکو قورئان پەراوی بونەوەرە، هەموو بوونەوەر لەودا نوسراوەتەوە، هەموو زانستەکی بوونەوەری لەودا دەدۆزرێتەوە، بە قورئان هەلە زانستیەکان وهەلە فەلسەفیەکان و هەلە عیرفانیەکان وهەلە سیاسی وئابوریەکان و هەلە کۆمەلایەتیەکان و ....هتد راست دەبنەوە.

ئەم ئیعجازانەش بەپێی فراوانی بازنەی زانستی مرۆڤی فراوان دەبن، تا ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر راستی بپێکیت کە فەرموویەتی : (لا تنتهي عجانبه) .

ئیعجازی قورئان سەلمێنەری ئەوەیە کە قورئان دەستوری ژیانەو چاوگی بەختەوەریە بۆ مرۆڤەکان ودانراوی ئەو خودایەیە کە گەردونی دروست کردووە و بەرێوەی دەبات و، هەر بەقورئانیش بە ژوانی ئەو دەگەین ودەیناسین و خۆشمان دەوێ وبە گوێ ی دەکەین و دەبین بە بەندەیەکی راستەقینەی ئەو .

**نوسەر/ چیوەی سەرێ ٢٠٠٩/٤/٢٥/**




# موعجیزە چی یە ؟

**(وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ)** الذاريات/ ٢٠

(السيوطي) دەنوسێ : (موعجیزە، کارێکی لە ئاسایی بەدەرە، لەگەڵ مل بەملانە دایەو، کەس ناتوانێ مەیدانداری بکات) [١].

وە دەڵێ موعجیزە دوو بەشە: هەستیەو هزریە، زۆربەی موعجیزەکانی بەنو ئیسرائیلەکان هەستی بووە، چونکە زۆر ناتێگەیشتوو نا رۆشنبیر بوون ، هەرچی ئیسلامە لەبەر زۆر رۆشنبیریان بە زۆری موعجیزەکانیان تاپە سلان هزری دەبێت، تا مرۆڤی هۆشیار بیان بینێت) .

دەڵێ : (موعجیزەی قورئان تاپەسڵان بەردەوامەو، کارە نائاسایی یەکانی لە رەوانبێژی وپێشبینیەکانی و شێوازەکانیدا بەردەوام دەبێ، لە هەموو چاخێ دا شتەکی باس کردووە کە دەبێت و دەبێتە بەڵگە لەسەر راستی بانگەوازەکەی) .

(وتراویشە موعجیزەکانی رابردوو کە روون بوونە هەستی بوون بە چاو بینراون، وەکو وشتری سالح و گۆچانی موسا، هەرچی موعجیزەی قورئانیشە بە دوور بینی و هزر دەبێت).

لە زانایانی خۆرئاوا (دونالد رۆبەرت کار) مامۆستای کیمیایی جیۆلۆجی دان بە موعجیزە دادێنێ ودەڵێ : (گەر گەردون سیستەمێکی رێکی نەبوایە هیچ موعجیزەیەك نەدەقەوما، زۆر لەو موعجیزانەی پێغەمبەران هێناویانە بەر لە هەموو شتێ لە یاسا گەردونیەکان بەدەر بوون، ناکرێ بقرسێنرێن ونرخەکانیان بزانرێ لە گەردونەکی رێك دانەبێ کە دیاردەکانیان بە پێی چەند یاسایەکی دیاری کراو دەرۆن) [٢].

زانای گەورەی کورد (ابوبکر الباقلانی) یەکەم کەسە لە راست موعجیزەی قورئان کتێبێ دەنوسێ، کە قورئان موعجیزەیەکی گشتی یە بۆ مرۆڤ وجنۆکەو هەموو چاخێ دەمێنێتەوەو لە یەکەم ساتەوە تا قیامەت لەیەك ئاستدا موعجیزەیە .

(١) الاتقان في العلوم القرآن / للسيوطي/ ج.٢/ ل.١٠١/١٠٢

(٢) لعلم/كلوظر مونيسا/ ل: ٩٤ . الله يتجلى في عصرا





د. (عبدالستار حامد) دەڵێ (نابێ موعجیزەی قورئـان هـەر لـە وشـەکان و جـوانی ڕێـك خستنەکەی دا ببینین، چونکە قورئان بۆ هەموو خەلکی تاقیامەت بە موعجیزەکانیـەوە روو لـە خەلك دەکات، دیسان بەردەوامی موعجیزەیی یەکەی پێویستە، ئەمـەش لـە ڕێگـەی ئیعجـازی زانستیەوە نەبێت بەردەوام نابێت چونکە خەلکی لـە ئاسـتی زانـستدا جۆراوجـۆرن و شارسـتانی وبواری شارەزایی یان هەمەچەشنەو لـە سـەدەیەکەوە بـۆ سـەدەیەکی تـر لـە ژینگەیەکـەوە بـۆ ژینگەیەکی تر جیاوازە) .[1]

﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ﴾ الذاريات /٢٠ بەلێ یەکێ لە زاراوە گـەورەکانی قورئـان بـۆ موعجیزە (الآية)یە واتە: بەڵگەو نیشانەو موعجیزەو کاری لە ئاسایی بەدەر.

ئەوەی لەم کتێبە باسی دەکەین چەند موعجیزەیەکی جیۆلۆجی قورئـانی و سـوننەتی یـە، قورئان لەم بازنەیەدا زۆر راستی جیۆلۆجی باس کردوون دەبنە بنەما بۆ جیۆلۆجی نوێ، ئەمـەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان کە بەر لە (١٤٠٠) زیاتر لەمەوبەر باسی کردوون بـۆ کەسـێ دڵیان بۆ بکاتەوە. {یوجینا شتشیجسکا لێکۆڵەری پۆلـۆنی دەڵـێ : لەقورئانـدا چـەندا راسـتی زانستی دەبینرێ جیهان دوای چەندان سەدە پەی پێ بردون.

(فاغلیری)ئیتالی دەڵێ : (قورئان خەزێنـەکی فراوانـی زانـستییە هەرچـی زیـرەك و هـەرە فەیلەسوف و سیاسەت مەدارە لە بەرامبەریدا ماوە}[2].

---

(١) معجزة القرآن والطوفان بين العلم والايان/المهندس سعد حاتم محمد مزرة/ط١/١٩٩٥/ل:٤١/بغداد .

(٢) القرآن الكريم من منظر غربي، د. عماد الدين خليل، ل٤١.




# جۆری زانستەکان و سەرچاوەیان

بسم الله الرحمن الرحيم

﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾[1]

بێگومان لێرەدا قورئان داوامان لێ دەکات لە بوونەوەر لە وانەش زەوی بڕوانین کە چەند بەڵگەی تێدایە لە سەر بوون وتواناو زانستی خوای کردگار، کە بەدیهێنەرو یاسادانەرو هەڵسوڕێنەری ئەم بونەوەرەیە، ئەمەش بەر لە هەموو شتێ ئاماژە بەوەدەکات مرۆڤ پێویستی بە ئایدەلۆجیەکی ساغ و دروست و ڕوانینەکی گەردونی واقیعی هەیە، ئەو کاتە مرۆڤ مۆرکی مرۆڤی وەردەگرێت و لە گیانداران جیا دەبێتەوە کە غەریزەکان هەڵیان دەسوڕێنن و بێ ویستی ئازاد و بێ هزرەکی بیرکەرەەو داهێنەرن .

وەتا ئێمە ئایدۆلۆجیامان ڕاست نەکەینەوە ، ناتوانین بە ڕوانینەکی واقیعیانە لە گەردون وزەوی بڕوانین و سود لە دیتنەکانمان وەربگرین ، خوا فەرموویەتی :﴿ إِنَّ شَرَّ الدَّوَابِّ عِندَ اللَّهِ الصُّمُّ الْبُكْمُ الَّذِينَ لاَ يَعْقِلُونَ﴾ الانفال:٢٢ لێرەدا قورئان گرنگی ئایدەلۆجیاو ڕوانینی گەردونی باس دەکات و ئاماژە دەکات نرخی مرۆڤ پەیوەندیەکی پتەوی بە ئایدەلۆژیاو ڕوانینە گەردونیەکەوە هەیە .

ئەو مرۆڤەی بیردەکاتەوەو هێزی هزری دەخاتە گەر زەفەر بە ئایدەلۆژیاو ڕوانینی گەردونی ڕاست دەبات ودەیکات بە تەوەرێ بۆ ڕەفتارو هەڵسوکەوتەکانی ئەوە کەسایەتیەکی سەرکەوتووی بڕوادارە، بەڵام ئەو کەسەی بێ بەشە لە ئایدۆلۆژیایەکی ڕاست وردوان لە بەر ناتەواوی هزرو توانستی پەی پێ بەرین یان ستەم کاران بەرایی لێ بگرن ئەوە ژێر دەستەیەو بێ بەهایە، ئەو کەسەش ڕێگا بە خۆی نادات بیر بکاتەوە و هێزی پەی پێ بەری قۆرغ دەکات ئەوە کەسێکی

---

(١) الذاريات:٢٠





خـەوتووەو بـێ ئاگایـە، ئـەو کەسـەی دەمـارگیری دەکـات یـان هانـدەری تـر لـە پـشتەوەیە ئایدۆلۆژیایەکی راست ودروست رەت دەکاتەوەو نەوەبێ بروایـە، بابەتـە سـەرەکیەکانی روانـینی گەردونیش بریتیە لە (ناسینی بونەوەرو زەوی، ناسینی مرۆڤ، ناسینی ڕێگای ڕاست) .

مەبەست لە بونەوەر ناسینی بونەوەری ماددی وگیانییە یان ئەتیر، مەبەست لـە ناسـینی مرۆڤ بەشە فسیۆلۆجی وبەشە گیانی یەکەیەتی، کە هەردوو جیهـان سـەربەخۆن و بێـی یـەکتری هەلدەکەن و دەشتوانن بە کاتی ئامێزانی یەکتری بن، بۆ ناسینی ئەمەش پێویستیمان بە ڕێگـای ڕاست هەیە کە ئیسلامە، مرۆڤ وابەستە دەکات بە دنیای روحی وگیانی یەوە، واتە لێـرەدا سـێ مەسەلە دروست دەبێت :(یەکتا پەرستی، پێغەمبەرایـەتی و، پاشـەرۆژ) ئەوانـە بنـەمای بـرواو ئایدەلۆجیای ئیسلامین، گەر ئایدەلۆجیامان راست بۆوە ئەو کات روانینمـان بـۆ گـەردون راسـت ودروست دەبێت، گەرنا بە پێچەوانەوە، خودای گەورە بۆ روانین لە زەوی وبونەوەر چوار دەرگای بۆ کردوویەوە :(روانینی گەردونی زانستی، روانینی گەردونی فەلسەفی، روانینی گەردونی عیرفانی و تەسەووفی، روانینی گەردونی ئایینی) کە لەم ئایەتەدا کۆدەبنەوە :﴿ وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ الحج/٨ .

## مەبەست لە زانست ( العلم )

### ﴿وَمِنَ النَّاسِ مَن يُجَادِلُ فِي اللَّهِ بِغَيْرِ عِلْمٍ وَلَا هُدًى وَلَا كِتَابٍ مُّنِيرٍ﴾ .

مەبەست لە زانست ئەو مەسەلانەن کە دەتوانرێ لە ڕێگای تاقیکردنەوە بـەلێنرێن وەکـو زانستی فیزیایی وکیمیایی و فسیۆلۆجی لە ڕێگای پێنج هەستەکانەوە ، مەبەسـت لـە روانـینی گەردونی، زانستی ئەو زانستانەن بە ئەزمون لە تاقیگەداها تونە بەرهەم ، خوا لە راست هـاتنی چەرخی زانسـتی ئەزمونی فەرمویەتی:﴿ سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ .

واتە: لە ئایندەیەکی نزیکدا بەڵگەکانی خۆمـان لـە ئاسۆداو لـە خـودی خۆیانـدا پیـشان




دەدەین تا بۆیان دەربکەویٚ ئەوە حەقە .

بەلاّم زانست سنوورداره (وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً) چاوەکان وگوێچکەکان سنووردارن و ناتوانن پەی بە هەموو شتیٚ ببەن و هەموو لەرە لەرو شەپۆلیٚ ببینن ببیستن و توشی هەلّە دەبن وەکو زانای سروشت ناس وفەیلەسوف (میریت کونجدن) لە ئەمریکا دەلّیٚ :(زانست چەند راستیەکی تاقیگەییە، بەلاّم لەگەلّ ئەوەش دا تێکەلّ بوون بە خەیال و دالّغەکانی و ماوەی دوریەکەی لە وردەکاری ولە تێبینی و وەسفەکانی و سەرەنجامەکانی کاری تیٚ دەکرێت، ناکامەکانی زانست لەو بازنەیەدا پەسەند دەکریٚ بەم شێوەیە تەنیا لە مەیدانەکانی بڕێتی (الکمیة) دایە لە وەسف ونوقلانەدا، بە چەند ئەگەریٚ (الاحتمالات) دەست پیٚ دەکات وبە چەند ئەگەریٚ کۆتایی دێت و یەقین نییە، بەمەش ناکامەکانی زانستەکان نزیك خستنەوەیە (تەقریبی) یە توانای توش هاتنی ئەگەری هەلّەیان هەیە لە پێك گرتنی (القیاس) و بەراوردکاری دا، ناکامەکانی ئیجتیهادین توانای راست کردنەوەو هەموارکردنیان هەیەن سەرباری لابردن و دوا ئەنجام نییە، ئێمە دەبینین کاتیٚ زانایەك دەگاتە یاساو تیۆریٚ دەلّیٚ : تا ئێستا ئێمە دەستمان بەو مە راگەیشتووە، دەرگاکە دەخاتە سەرپشت وناوەلّەی دەکاتەوە بۆ دۆزینەوەی شتی تازە بۆ هەمواركردنەكان.[1]

ئەم زانایە دەلّیٚ : (هەرچی لە گەردون دا هەیە شاهیدی لە سەر بوونی خوا دەدات و بەلّگەیە لە سەر تواناو مەزنی ئەو، کاتیٚ ئێمە بە شیتەلّیٚ هەندیٚ دیاردەی گەردونی و تاوتویٚ کردنیان هەلّدەستین تابە رێگەی بەلّگە داواش (الاستدلال) ، ئێمە تەنیا تێبینی شوێنەوارەکانی دەستەکانی خواو مەزنیەکەی دەکەین، ئەمە ئەو خوایەیە تەنیا بە ئامرازە مادیە زانستیەکان دەستمان پێی ناگات بەلّکو بەلّگەکانی ئەو لە خۆمانّ و تەواوی ئەتۆمەکانی گەردون دەبینین ، وە زانستەکان تەنیا تاوتوێیەکن دروست کراوانی خواو شوێنەوارەکانی دەستی ئەو لێدەکۆلّنەوە).

بێگومان زانست بە شێکە لە دین لیٚ ی جیانابێتەوەو شرۆڤە کەرێکە بۆ ئاین ودروست کراوانی خوداو پەرژینێکە بۆ ئەو دوانە، هۆکاری جیاکردنەوەی زانست لە ئاین و بردنی زانست

---

([1]) الله يتجلى في عصر العلم/ضون كلوفرمونسا/ل:١٨ .



بەرەو رەوتی بێ بروایی و ماتریا لستی و بێ دینی و دژایەتی کردنی بۆ ئەو دیمەنە ئەفسوناویەی دەگەرێتەوە کە گەردون هەیبووە لە چەرخی ناوەراستدا لە ئەوروپادا، بۆ ئـەو دژایەتییـە گەرمـە خوێناویە دەگەرێتەوە کە کەڵێسا دژ بە زانست و پێشکەوتن و هەستی سۆراغ (حب الاستطلاع) کردوویـەتی، وەکـو چـۆن دژ بـە سـێکس وەسـتاوەو هـەولی کـپ کردنـی داوە، تـا لەرێگـەی هاوسەرگیری شەرعیشەوە، وەکو کـورد دەلـێ : کـاتێ جـام پربـوو لێـی دەرژێـت، ئاکامەکـەی کەوتنەوەی زانستەکی دژ بە کەڵێساو پرەنسیپەکانی بوو، دوای ئەوە ئاینی ئیسلامیش کە بەریە لە بیروبۆچونەکانی کەڵێسا هەمان حیسابی کەڵێسای بۆ کرا، گوایە ئایینەکان هەموویان تریـاکی گەلانن و رێگرن لەبەرامبەر ئازادیەکان و زانستەکان وپێشکەوتنەکانی لە جیهاندا .

ئەنجا بۆ رزگاری لە دەستی کۆتی کەڵێسا نەك هەرخۆی جیاکردەوە بەڵکو کەوتە شـەرەکی ئاشکرا لەگەڵ پرەنسیپەکانی ئایندا، لەوانەش بوونی خوداو پاشەرۆژو گیان و سروش، لـە جیـات ئەمە بیرۆکەی نەبوونی خوداو ئەزەلیەت و ئەبەدییەت داهێنرا تا بەتەواوی جەوهەری کەڵێسا لـە بنەوە بروخێنرێ و هەرەس بێت و زانست جێگای دین بگرێتەوە .

د.محمد عبـداللطیف دەنوسـێ : دیمـەنی گـەردون لـە ئـەوروپای چـەرخی ناوەراسـت دا دیمەنی(ئەرستۆ مەسیحی) بووە، کە (دیونیز یوس) پەرەی پێـدا لـە سـەدەی شەشـەمدا، لەگـەڵ تۆماس ئەکوینی دا لە سەدەی سێزدەهەمدا، گەردون بە پێی ئەم تیـۆرە سـنوردارە و چـەقەکەی زەوی یەو کە گۆیە ئاسمانیەکان دەوری داوەو تا دووربکەونەوە لە زەوی کامڵ ترو هەراشتر دەبن و فریشتەکان دەیجولێنن، ئەم سیستەمە دەیـەوێ زانسـت وبـروا رێـك بخـات ، سیـستەمی چـەقی زەمینی لە راست (ستۆلاستیکی) چەرخی ناوەراست راستیەکە گومـان هـەلناگرێ، زەوی بەکـەم وکوری وناتەواوی وەسف دەکات بەلام ئاسمـان بـە گۆیـە کانیـەوە کامڵـەو خـوا لەسـەر تـەخت وعەرشی لە دوای ئەستێرەکانەوە داینشتووەو هەڵیان دەسورێنێت .

زانستەکانی (بەتلیمۆس) ی گەردونی، بـووە بنەمایـەکی تیـۆری دروسـت وبـروا پێکـراو، وەهەر رەخنەیەك گەر بەرەو رووی سیستەمی چەقی زەمینی بکرابایەوە سەرکوت دەکـرا، ئەمـە دژ بە زانستەکانی گۆی زەمینی بوو، ئـەم لێکدانـەوە لاهـوتی یـە کـە بەتـەواوترین وراسـترین



لێکدانەوە دادەنرا توێژینەوەی زانستی ماوەیەکی درێژ گۆج ونیفلیج کردو لە کاری خست .

داویزوم سالی (١٣٢٣-١٣٨٢) پێشی بە زانستەکانی ئەرستۆ گرت ودژی راوەستاو ئەم بیرۆکەیەی زیندووکردەوە کە زەوی بە دەوری تەوەری خۆی دا دەسورێتەوە هەموو رۆژێ وبیروڕای وابوو گەردون بێ سنورەو لێرەدا جیهانی تری وەکو جیهانی ئێمەش هەیە، ئەنجا نیکولاکوزانی هات (١٤٠١-١٤٦٤) وتی :گەردون لە زەوی کامل ترنییە، بەلکو هەموو گەردون لەم چوارتوخمانە پێك دێت (ئاو-خاك-ئاگر-هەوا)، ئەم گەردونە جیهانی ئاوەدانی وەکو زەوی تێدایە وگەردون بێ سنورەو خالەکی نییە چەقی ئەو بێت، دوایی کۆپەرنیکۆس هات (١٤٧٣-١٥٤٣) و گەردونی ئەرستارخی زیندوو کردەوە گوایە خۆر چەقی گەردونەو زەوی وهەسارەکان ومانگی بەدەوری دا دەخولێنەوە، پاشان کپلەر(١٥٧١-١٦٣٠) هات کە سۆفی وعاریفێ بوو وتی : خولگەی هەسارەکان هێلکەیین، ئەنجا نیوتن (١٦٤٣-١٧٢٧) هات هێزی کێشکردنی زەوی دۆزیەوە، وەکو لە (گەردونناسی) دا باسکرا،دوایی زۆر گەورە زانای تر هات لەسەر تیۆری کۆپەر تیشیان کرد وەکو گالیلۆو کانت ولابلاس وهرشل ....هتدو پەرەیان پێدا . [1]

پاشان دوای پێشکەوتنی زانست و تەکنەلۆجیای نوێ راستکردنەوەیەکی تەواو بەسەر تیۆری کۆپەردا هات گوترا نەخۆر نەزەوی چەقی گەردون نییە، وەگەردون سەردتای هەیە وکۆتایی هەیە و یاسای دینامیکی گەرمی ئەوە دەسەلمێنێت و گەردون کردگارەکی ئەزەلی و ئەبەدی هەیە.

ئەوەبوو بە بۆنەی سالی دەولی زەمینی پسپۆرانی ئەمریکی لە هەموو بوارێکدا رایان گەیاند :(الله يتجلى في عصرا لعلم) کە چون کلوفر مونسا سەرپەرشتی نوسینی دەکات و (د.الدمرداش عبدالمجيد سرحان) وەری دەگێرێت ، لێرەدا زانست وئاین ئامێزانی یەکتری دەبنەوەو کۆتایی بە رەوتی بێ بروایی ماددی دێت، بەلام بێگومان زۆر لە زانایان پەلەیان کرد لە فتواکانیاندا، لە کاتێدا هێشتا زانستی گەردونی ساوابوو نەهاتبووە سەرپێیان، ئەمەش ئەم جیاوازیەی نێوان کەلێناو زانستی نوێی گەورەترکرد، وەکو خوا فەرمویەتی :﴿ سَأُرِيكُمْ آيَاتِي فَلَا

---

( [1] ) صورة الكون/د. محمد عبداللطيف المطلب/ل: ٥٠-٦٥ بە کورت کردنەوە .



تَسْتَعْجِلُونِ﴾. الانبیـاء /۳۷ . واتە : لە ئایندەیەکی نزیکدا بەڵگەکانی خۆمانتان پیشان دەدەیـن پەلە مەکـەن، (د. ئیرفـنج ولیانوبلوچـی) مامۆسـتای سروشـت ناسـی لـە گـەواهی خۆیـدا لـە ئەمریکادا لە دژی بۆچونی (بیرتراند روسل) دا کە دەیوت (دروست بوونی مرۆڤ هیچ مەبەستەکی لە دواوە نییە وە دروست بوون وژیان و سـۆزو هیـواو تـرس و ئایـدیاکانی هـەموویان بەرهـەمی کۆبوونەوەی ئەتۆمەکانی ئەون لە ڕێگای ڕێکەوتەوە)، ئەو وتی (هەموو زاناکـان بروایـان وانییـە کە زانست توانای هەموو شتەکی هەیە دەتوانێ ڕاڤەکی زانستی بۆ هەموو شتێ بکات، زانـست بۆ نموونە توانای نییە ڕاڤەی حەق وجوانی وبەختەوەری بکات، دیسانەوە نـاتوانێ لێکدانەوەیـەك بۆ ڕوالەتی ژیان بکات و هۆکارێ بەدەست بێنێ بۆ زانینی مەبەستەکەی، وە زانست زۆر لەوە بێ تواناتر کە نەبوونی خوا بسەلمێنێت) دەنوسێ : (زانست لەسەر بنەمای بڕوابوون بـە هەسـتەکان و ئامێرەکان دادەمەزرێ نەك لەسەر بنەماکانی بڕوابوون بە سلێتەو ئەگەرەکان وڕێکەوت .

بەوپێ ودانگە دەتوانین بڵێین زانست ودین لەسەر بنەمای هاوبەش دادەمەزرێن کە بڕوایـە، جیاوازیان ئەوەیە کە زانست لەناو بازنەی تایبەتی خۆیدا دەتـوانێ یاسـاکانی خـۆی بـە تێبـینی وئەزمون پێداچوونەوە تاقیبکاتەوە، بەو ڕێگایانە هەوڵ دەدات زۆر لەو هەڵانە پەی پێ ببات کـە تێی کەوتووە، بڕوابون بە دیـن دۆزراوە زانـستەکان پـشتگیری لـێ دەکـات، زانـست زۆری لـەو پێشبینیانەی پشت ڕاستکردەوە کە کتابی موقەدەس کردونی) . بـۆ نموونـە گەردونناسـی دەڵـێ (گەردون سەرەتاو کۆتایی هەیە، گەردون سەرەتای هەیەو کۆنەو بەرەو کۆتـایی یـەکی مـسۆگەر دەڕوات، ئەمە لەگەڵ ڕاستدا ڕێك ناکەوێت، بڕوامان وابێ گەردون ئـەزەلی یـەو سـەرەتای نییـە ئەبەدی یەوبڕانەوەی نییە، ئەو لەسـەر گۆڕان دادەمەزرێ، لێرەدا زانست ودین بەیـەك دەگەنـەوە، زانست زۆر لەوە لاوازترە بە هۆکاری ماددی نهێنی زاتی خوا پەی پێ ببـات، بـەڵام سـەیرکردنی شتە سەیرەکانی بونەوەر زۆر گەردونناسی ئەمینداری هاندا کـە ڕایبگەیـەنن ئـەم گەردونـە بـەو فراوانی ورژێمە ناناسـایی یـەوە دەبـێ بەرێوەبـەرێکی هـەبێ نـەبینرێ ولـە نهێنیەکـەی حـاڵی نەبین). [1]

---

([1]) الله يتجلى في عصر العلم/ ل: ۵۲/۵۳ .

کەواتە زانست پێویستی بە یارمەتی دەرەکانی تریش هەیە وەکو فەلسەفەو عیرفـان ودیـن تا بتوانێ دەستی خۆی بگەیەنێتە ئەو زانستانەی زانست نـاتوانێ بـە هەسـتەکان وهۆکارەکـانی راڤەیان بۆ بکات و مەتەڵەکانیان هەڵبێنێت .

دیسان زانست لە بواری بایۆلۆجی دا رەددی تیۆری پەرەسەندی (داروینی) دایـەوە، گوایـە خانەی سەرەتایی بە رێکەوت دروست بووەو گیانداران لە رێگـای پەرەسـەندنەوە دوای ملیارەهـا ساڵ دروست کردووە، ئەوەتا (٧٠٠) زانای ئەمریکی تیۆری دروست بوون دادێنن کە دەڵێ (ژیـان لـە هێکـرا بـەبێ پەرەسـەندن لەلایـەن خـواوە دروسـت بـووە) بروانـە (هـل تعرضـت لغسـیل الدماغ/بروفیسور. دوان .ت.کیش) کە لە (سێکس لە ژیانی هەموو کەسێکدا) باسمان کردووە کە لەژێر چاپدایەو داهاتوش لە باسی دروست بوونی ژیاندا باسی دەکەین، وە زانست رەدووی تیـۆری (فرۆیدی) دایەوەلە راست(سێکس) دا کە زۆر لە زانایان رەدیان دایەوە وەکو(یـۆنگ) و(ئەدلـەر)و هی تر. وەکو لە کتێبی (رێنمایی سێکسی ئیسلامی) داو (جنس لە ژیـانی هـەموو کەسـێکدا) باسمان کردووە، هەروەها لە (خەون ولێکدانەوەی خەونان بۆ هەموان) کە لە ژێر چاپدایە .

## ( زانستی جیۆلۆجیاو ئایین )

مامۆستای گەورە (دۆنالد رۆبەرت کار) مامۆسـتای کیمیـایی جیۆلـۆجی لـە ئـەمریکادا دەڵێ (توێژینەوەی زانستیم حەقی بروابوونی منی نییە بە خواو پشت پێ بەستنم بەوو پێویـستی پێ بوونم، بۆیە هاندان بۆ ئەم بڕوایە پێویستیەکی دیارە لە ناخم دا هەسـتم پـێ کـردووە، بـەلام توێژینەوەم دوای کیمیای جیۆلۆجی رێنومـایی کـردم بـۆ بروابـوون بـە کـرداری ئـەم گەردونـە، سەیرنییە بروام وابێ ئەم گەردونە دیەنێکی توانای خوایە .

ئەو خاڵانەی توێژینەوەی کیمیایی جیۆلۆجی تێیدا بە فەلسەفەی ئاین دەگات لە دوو خاڵ دایە :

١. دیاری کردنی ئەو کاتەی گەردونی تێدا دروست بووە .

٢. ئەو سیستەمەی بەرێوەی دەبات .

لە راست دیاری کردنی تەمەنی پێك هاتەی جیۆلۆجی وەکو کەرەستەی شـوهبەکان وهـیتر توانرا بەهۆی پەیوەندی تیشکی نیمچە چەندێتی (الشبه الكمية) لـە راسـت مێـژووی زەمـین بـە دەست بێنینن، ئێستا چەند رێگایەکی جیاجیا هەیە بۆ دیـاری کردنـی تەمـەنی زەوی بـە پلـەی جیاجیا لە وردەکاریدا بەلاّم تارادەیەك لێك نزیکن لە ئاکامدا، هـەموو ئەمانـە ئامـاژە دەکـەن گەردون بەرلە (٥) ملیار سالّ دروست بووە، بەو پـێ یـە گـەردون ئـەزەلی نییـە، گـەرنا توخمـە تیشکیەکان لەناو دەچون. ئەم رایە لەگەلّ یاسای دووەمی دینامیکای گـەرمی دا رێـك دێتـەوە، هەرچی رای دووەمە کە پێی وایە گەردون سوڕییە، واتە : دەچـێتەوە ناویـەك و دەکـشێ پاشـان دەگەرێتەوەو دەکشێتەوە .....هتد بێ بەلگەیەو رایەکی زانستی نییە، بەلکو بۆچـونەکی روتـە، بەلکو ئەو رایەی کە دەلێ گەردون سەرەتای هەیە، لەگەلّ دەقی ئینجیلدا دێتەوە : (لقد خلق الله في البداية السموات والارض) ئەم رایە هاورێکی یاسای دینامیکی گـەرمی و بەلگـەی گـەردونی جیۆلۆجیە .

هەرچی یاسای سیستەمە لە جیۆلۆجیادا بەشێکە لە بەلگـە نەویـستەکان، ئـەم پرەنـسیپە تێکستەکەی ئەوەیە هەموو کردارە جیۆلـۆجی وکیمیـایی جیۆلۆجیـەکان کـە ئێـستا کاردەکـەن رابردووش کاریان کردووە، ئەمەش یارمەتیمان دەدات بۆ لێکدانەوەی مێژووی جیۆلۆجی .

رێکی گەردون وبوونی یاسایە سروشتیەکان بنەمای زانستی تازەن .

گەردونی رێك کە تارادەیەك جێگای سەرقالی زانایانە لەگەلّ ئەوەدا هـاوکوف دێتـەوە لـە نامە ئاسمانیەکاندا هاتووە، و دەلێت خوا گەردونی بنیاتناوەو رایدەگرێ و دەیپارێزێت . [1]

جیۆلۆجیا زۆر زانستی لێ جیا دەبێتەوە وەکو: جیۆلۆجیای ژینگە، کانزا زانین، تاوێر زانی، بەردین زانی، نیشتەنی زانی، جیۆلۆجیای پێکهاتـەیی، جیۆکیمیـاو، چـین زانـی زەمـینی (علم الطبقات) و جیۆکرۆنۆلۆجی و جیۆ فیزیاو جیۆلۆجیای دەریاکان .

•

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ ل: ٨٥-٨٦.




# ( فەلسەفە )

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا لُقْمَانَ الْحِكْمَةَ﴾[1].

وشەیەکی یۆنانی یە لە (فەیلاسوف)ەوە هاتووە واتە(ویستیاری زانست وژیری ولێزانی-الحکمة) لە کۆندا بە هەموو زانستە راستیەکان وتراوە فەلسەفە، بەلاّم کاتێ زانست لە ئاین جیاکرایەوە هاتن لە فەلسەفەشیان دابڕی، ئێستا فەلسەفە بەو بابەتانە دەوترێ کە بە هۆکاری ماددی تاقی ناکرێنەوە وەکو میتافیزیکا پاراسایکۆلۆجیا زانستی سەروی سروشت .

بەوپێیە فەلسەفە ئێستا (زانستی گشتی – العلم الکلي) و(ئیلاهی یات) و(فەلسەفەی مادەکانی) دەگرێتەوە وەکو :(تاکەتی – الوحدة) و(زۆرێتی – الکثرة) و(پێویست – الواجب)و (دەتوانرێ هەبێ – ممکن الواجب) وهۆگرو هۆکار(العلة والمعلول)و چەسپیو(الثابت) و گۆڕاو، هەمور ئەوانە بە لێکدانەوەی شیتەڵی هزری راڤە دەکرێن نەك بە ئەزمون، بەم پێ ودانگە روانینی گەردونی فەلسەفی دروست دەبێت، بێگومان فەلسەفەش بەدەوری خۆی توانی هەرەس بە فەلسەفەی زانستی ماتریالستی بێنێ کە بە فەلسەفەی زانستی ناسراوەو مارکس ومامۆستاو قوتابیانی دایان هێناو برەویان پێداو کۆن بە (الدهري) ناسراون وەکو لە قورئاندا باسیان دەکات و ووتویانە﴿وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾الجاثية/٢٤ .

غەزالی لە (المنقذ من الضلال) دا دەلێ (گروپەکی کۆکن بروایان بە کردگاری بەڕێوەبەر زاناو بەتوانا نەبووە، بروایان وابووە گەردون هەرهەبووە کردگاری نییە .....) . مارکس وئینگلزو ماتریالستە فەرەنسیە توندرەوەکان لە سەدەی هەژدەدا زیندوکەرەوەی رەوتی دەهریا نەبوون ،.دەیان ووت (مرۆڤ لە سروشتدا سێ دوری هەیە لە گۆشت وخوێن وئێسقان پێکدێ وشتی نامادی ونابەرجەستەبوونی نییە، ئەنجا بروابوون بە خوایان نکۆلی لێکردو وتیان میتافیزیکاو لاهوت چەند قسەیەکی درۆو هەلّیت وپەلّیتن دەیەوێ شوێنی زانستی سروشتی

•

---

([1]) لقمان/ ١٢

بگرێتەوە کە دەتوانێ چارەسەریی تەواو بۆ هەموو مەسەلە واقیعی یەکان بکات) . [1]

بەلاّم فەلسەفەش لە بواری خۆیدا کە ڕێگای پێغەمبەران بووە شان بە شانی زانست بۆ سەلماندنی بوونی خواو پشتگیری لێ کردن لە پەیامەکەیان، توانی شان بە شانی زانست ودین وعیرفان دژ بە ڕەوتی ماتریالستی بوەستێت ودەمکوتی بکات: (جۆرج ئیبرل دانیز) ی سروشت ناس لە ئەمریکا رای فەلسەفەو لۆژیك باس دەکات لە راست دیندار شان بە شانی زانست دەڵێ: (ناتوانین تەنیا لە ڕێگای ماددی یەوە بوونی خوا بسەلمێنین، چونکە کەس نەیگووتوە خوا ماددەیە تا بتوانین لە ڕێگای ماددی یەوە پێی بگەین، بەڵکو دەتوانین لە ڕێگای هزرو هەڵگۆزین (الاستنباط) لە بوونی خوا بکۆڵینەوە کە دەیزانین ودەیبینین، لۆژیك (المنطق) کە دەتوانین دەستی پێوەبگرین وگومان هەڵناگرێ ئەوە دەردەخات لێرەدا شتێ نییە بتوانێ خۆی دروست بکات ، گەر بروامان بە توانای گەردون هەبێ لە دروست کردنی خۆیدا، ئەو کاتە گەردون بە خوا وەسف دەکەین، واتە دان بە بوونی خوایەکدا دێنینن، بەلاّم لەیەك کاتدا خوایەکی ماددی وگیانی یە، من وام پێ باشترە بروا بە خوایەکی نامادی دابێنم ئەم بوونەوەرەی بنیات ناوە بەڵگەو شوێن پەنجەی ئەوی تێدا دیارە بێ ئەوەی گەردون هاوشانی ئەو بێت). [2]

وەسەدان فەیلەسوفی ناودار لە ڕێگای فەلسەفەوە بوونی خوایان سەلماندووە لە کۆن ونوێ دا وەکو : (ئەرستۆ و سوکرات وئەفلاتون) یان دیکارت وبرگسۆن وهیتر)، بروانە کتێبی (فلسفتنا /محمد باقر الصدر) و (نقض الادهام المادية الجدلية / محمد سعيد رمضان البوطي) و(قصة الايمان) و (نديم الجسر) و(الملل والنحل / للشهرستاني) و (تأملات ميتافيزيكية في فلسفة الاولى/ رينة ديكارت) .

وە (٧) فەیلەسوفەکانی یۆنان (تالیس وئەنکساگۆرس و ئەنکسیمانس و ئەنباو قلیس و فیساگۆرس وسوکرات وئەفلاتون)، هەموو ئەوانە زانست وفەلسەفەی خۆیان لە پێغەمبەران و دین وەرگرتووە بۆ نموونە (فیساگۆرس) لە چەرخی سولەیماندا (ﷺ) دا ژیاوە حیکمەت

---

(١) الموسوعة الفلسفية المختصرة /ت :فواد كامل والآخرين/بغداد/بيروت/ل :٣٩١/ط :١٩٨٣م .

(٢) الله يتجلى في عصر العلم/ل: ٤٠- ٤١ ..

وفەلسەفەی لە چاوگی پێغەمبەرایەتی وەرگرتووە .[1]

(ئەنبادوقلیس) فەلسەفەی لە لوقمانی حەکیم وەرگرتووە، کە قورئان بە فەیلەسوفی نـاوزەد دەکات : ﴿ولقد اتینا لقمان الحکمة﴾ لقمان /١٢ وەحیکمەت وفەلسەفەو زانست ودین وفەلسەفە پەیامی پێغەمبەران بووە، پێغەمبەری خۆمان (ﷺ) بە شاهیدی قورئان هەموو ئەو زانستانەی هەلگرتوون وگەیاندونی و قورئانیش پریەتی لە بەلگەی دینی و فەلسەفی و زاستی وعیرفانی، خودا لە سورەتی( الجمعه) دا دەفەرموێ : ﴿هُوَ الَّذِي بَعَثَ فِي الْأُمِّيِّينَ رَسُولًا مِّنْهُمْ يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِهِ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ الْكِتَابَ وَالْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا مِن قَبْلُ لَفِي ضَلَالٍ مُّبِينٍ﴾ . بەلێ : (تزکیە) عیرفان وتەسەووفەو (الحکمە) فەلسەفەیە .

خۆرئاواش بۆ دروست کردنی شارستانی خۆی کەلکی لەو زاناو فەیلەسوفانە وەرگرتووە کە قوتابخانەی ئیسلام دروستی کردوون وبە جیهانی دا بلاوکردنەوە، ئەوەی لەم زەوی ناسی یەدا دەیخوێنیەوە وەکو گەردونناسی سەلمێنەری ئەم راستیە کە دین و زانست یەك شتەو ئەو کەسەی ئەم گەردونەی دروست کردووە هەرئەویش ئەم قورئانە پڕ لە زانست و فەلسەفەو عیرفانەی رەوانە کردووە کە یاسای ژیانەو هەموو گەردونی لە وێنەدا نوسیوەتەوە ، نموونەش ئەوەیە هەر زانستەکی گەردونی بنەرەتی دەدۆزرێتەوە لە گەردوندا کە پەراوی گەورەی خودایە دوایی دەبینرێ لە قورئانیشدا نوسراوە .﴿ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى﴾ طه / ٤ .

بێگومان فەلسەفەی ئیلاهی بە درێژایی مێژوو هەولێداوە لە رێگای هزرو لۆژیك و بەلگە داوا وە هەولی داوە کردگار بە مرۆڤ بناسێنن و وەلامی ئەم پرسیارانەی بدەنەوە ئەم جیهانە چۆن سەری هەلداوە بۆ کوێ دەچێت و چۆن هەلدەسورێ و مەبەست لە دروست کردنی چییە ! بەشداری دین و عیرفان و زانستی کردووە بۆ رەت دانەوەی فەلسەفەی ماددی، کە بنەمای خۆی لەسەر دوو رێـا دامەزراندووە (دێرینەیی مادده)و تیۆری رێکەوت و بەرکەنارکردنی هۆکارێتی، دەلێ : مادده لە تەزەلدا هەبوونی هەبووەو رێکەوت پێکی هێناوە و هیچ دروست کەرێکی نییە.

بەلام فەلسەفەو زانست توانیان هەرەس بەم دوو تیۆرە بێنن و لە بواری زانستی

---

(١) الملل والنحل/للشهرستاني / ل: ٢٣١ .



ئەزمونیشدا وەکو ئەفسانەیەك حیسابیان بۆ بکرێت لەوانەش (یاسای دووەمی دینامیکی گەرمی) ، بەلگەی فەلسەفەیی لە ڕێکی سیستەم و بەلگەی جولاندن و بەلگەی ئیمکانەوە بوونی خوای ئەزەل و دروست کراوانی گەردون زەوی دەسەلمێنێتن، بێگومان گەر ئەم جیهانە هونەرو شاکاریەك بێ پڕ لە سیستەم و ڕێکی بێت دەبێ هونەرمەندی هەبێ کێشابی وەکو (سەعید نەورەسی) کتێبەکی دانا بەم ناوەی نوسیوە : (ئایا جیهان هونەرە یان هونەرمەندە) ؟ ئەنجا ئەم گەردونە هەمووی لەجولەو بزوتن دایەو بەپێی تیۆری نیوتن (تەنی نەبزواو گەر هێزەکی دەرەکی نەیجولێنێ ئاوا بە خامۆشی و وەستاوی دەمێنێتەوە، هەروەها گەر هێزەکی دەرەکی نەیوەستێنێ هەر بە بزواوی دەوام دەکات) کەواتە : کێ ئەم تەنانەی لە خامۆشیەوە خستۆتە جولەوە لە دەرەوەی بازنەی مادده دا ؟ ! ئەنجا فەیلەسوفانی بڕوادار بۆ سەلماندنی بوونی کردگاری سێ بەلگەی لۆژیکی دێننەوە :

(١) بوونی مەحالێ : وەکو بوونی سەعاتێ بەبێ وەستا، بوونی دەنگێ بەبێ خاوەن دەنگێ، بوونی جولەیەك بەبێ جولێنەرێ، یان کۆبوونەوەی دوو شتی دژی بەیەك .

(٢) بوونی مومکین : ئەو شتانەی کە بوونی مومکینە یان نا مومکینە وەکو یەك وەکو کورسی ونوسەرو هونەرمەند ئەوشتانەی ماددەکەیان لێ دروست دەکرێت، ئەمانە سەرەتا لە حالی ئیمکانی بوون و نەبووندا بوون بەلام کاتێ دروست کران لەم قۆناغەوە دێنەوە قۆناغی بوونەوە، بەهەمان شێوە گەردونیش سەرەتا لە باری ئیمکانی بوون و نەبووندا بووە، کاتێ دروست کراوە هاتۆتە حالێکی بوونەوە، کەواتە : چۆن کورسی پێویستی بە وەستا هەیەو نیگار پێویستی بە نیگارکێشێ هەیە، گەردونیش پێویستی بە کردگار هەیە، بوونی واجبە ئەویش خودای پێویستە، دوورە لە سیفەتی ماددەو کۆتە سنوردارەکانی، ئەزەل و ئەبەدییە، بەم شێوەیە فەلسەفەی ئیلاهی دەوری خۆی بینی لە ڕاست کردنەوەی بڕوای مرۆڤداو ڕاستکردنەوەی ڕوانینی بۆ بوونەوەرو کردگار، بەلام ئەویش سنوردارەو پێویستی بە زانست و ئاین و عیرفان هەیە . بۆیە زانای ڕاستەقینە ئەو کەسەیە دەست بە دین وفەلسەفەو عیرفان وز زانستەوە دەگرێت !

# عیرفان ( تەصەووف )

## ( .......ولا هدی ..... )

مەبەست لە مە : (عیرفان)ە واتە : (المعرفه) کە لە زاراوەدا بەو زانستانە دەوترێ لەرێگای دڵەوە یان نەستەوە (الاشعور) دەبینرێن نەك بە هزرو ئەزمون، ئەمەش بۆ پێغەمبەران ورەوانە کراوانی خوایی موعجیزەیەو بۆ ئەولیایان کەرامەتە، وەکو میعراجی پێغەمبەرمان (ﷺ)و میعراجی ئیبراهیم (ﷺ)، ﴿مَا كَذَبَ الْفُؤَادُ مَا رَأَى أَفَتُمَارُونَهُ عَلَى مَا يَرَى﴾ النجم/ ١١-١٢ . واتە : ئەوەی دڵ بینی دروی نەکرد ئایا گومان دەکەن لێی لەوەی بینی. وەنەست ودڵی پێغەمبەران توشی داڵغەو ئیلقای شەیتانی نابێ تا هەڵە بکات لە بینینی دڵیدا وەکو خوا فەرمویەتی : ﴿مَا زَاغَ الْبَصَرُ وَمَا طَغَى لَقَدْ رَأَى مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾ النجم / ١٧-١٨ . واتە : چاوهەڵەی نەکردو لای نەدا، بەشێ لە نیشانە گەورەکانی پەروەردەگاری بینی .

غەزالی فەیلەسوف وعارف لە (کمیاء السعادة) دا باس لە بینینی دڵ و نەست (اللاشعور) دەکات بۆ عاریفان و سۆفیەکان ودەڵێ : دڵ دوو دەرگای هەیە یەك بۆ خەونەکانە دووەم بۆ دنیای بێدارییە کە دەرگای رواڵەتییە بۆ دەرەوە، کاتێ نوست دەرگای هەستەکان دادەخرێ دەرگای گیانی وناخی دەبنەوە دنیای پەنهانی لە جیهانی مەلەکوتدا بۆ والا دەبێ و وەلە لەوحی مەحفوزدا وەکو روناکی دەردەکەوێت .

(ج.اج.رایز) باس دەکات کە هەستیارە ماددیەکانن (الشعور) پەی بە لەرە لەرە ماددیەکان دەبەن، بەڵام نەست(اللاشعور) پەی بە شەپۆل ولەرە لەرە روحی وئەتیرەکان دەبات وزانستەکان لەو دوو رێگایەوە وەردەگرێت، باس دەکات روناکی بینراو بەشێکە لە کردارەکی فراوانی (تیشکە هرۆموگناتیسیە نادیارەکان) تەواوی دنیای فیزیایی یان پڕکردووە، کە خاسیەتەکانیان دەکەوێتە سەرناستی لەرە لەرەکانیان و، ئاستی هەرە بەرزی لەرە لەریان دەگاتە (بلیۆن بلیۆن لەرە لەر لە چرکەیەکدا کە لە زمانی بیرکاریدا بە (١٠)[٢٤] ئاماژەکراوە، چاو تەنیا توانای بینینی (٤٠٠-٥٠٠) بلیۆن لەرەلەری هەیە لە چرکەیەکدا بەرووناکی بینراو زانراوە،





گوێچکەی مرۆڤ ئەو لەرەلەرانە دەبیستێ کە لەنێوان(٣٠-١٦٠٠٠) لەرەلەردایە لە چرکەیەکداو، سەگ توانای بیستنی زۆر لەمە پترە، کەچی شەمشەمەکوێرە لە تاریکایی دا هەست بە دەنگە روناکیە بەرزەکان دەکات کە دەگەنە (٥٠٠٠٠) لەرەلەر لە چرکەیەکدا .[١]

وەباس لە جیهانی نەست وشەپۆلەکان وئەتیرە دەکات زانست توانیویەتی بە تاقیکردنەوەی بەرجەستە لە رێگای تلباتی (التخاطر) یە وە ئەم لەرەلەرانە بسەلمێنێ کە لە سەروی خێرایی تیشکەوە دەگوازرێنەوە و نەست پەیان پێ دەبات وەکو تەلەفۆن دەزگای وەرگرو رەوانەکەری تێدایە .

(تویژینەوە لە دیاردە لە ئاسایی بەدەرەکاندا — الظواهر الخارقة) دەستی بەسەر زۆرێ لە بایەخەکانی مرۆڤدا گرتووە، مەسەلەی تلباتی خراوەتە ناوباس ولێکۆڵینەوەو ئەزمونی تلباتی نێوان ژێر دەریایی ئەتۆمی تیلۆس وکۆمەلە کەسێکی مەشق پێکراو لەسەر تلباتی خرایە ژێر باس و لێکۆڵینەوە لەسەر کەنار دەوەستێ، سەرچاوەکانی رووسی کە بە ئەزمونی ئەم جۆرە هەلساون باسیان کرد تاهەندێ لەو ئەزمونانە لەسەر هەندێ لە گیانداران کراوە وەکو کەروێشك و هی تر، دوای ئەوە زۆر بەسەرهات باس دەکاتو گۆڤاری (سپۆتنیکی) رووسی بلاویان دەکاتەوە لەوانە رووداوی تلباتی نێوان کۆمەڵە کەسانێ کە نێوانیان (١٨٠٠) میلەو ئەو تلباتیە هزرییە گورج لە نێوان ئەو کەسانەدا دەگوازرێتەوە ......... هەموو بەلگەکان ئەوە دەردەخەن تلباتی وپەی پێبردنی هەستی نائاسایی لەسەر ئاستەکی نامادی روودەدات .[٢]

لێرەدا (البیرونی) هەلە دەکات کە دەلێ : وشە (التصوف) لە (سۆفیا) ی یۆنانیەوە هاتووە واتە (الحکمة)، ئەوەتا (نولدکە) دەلێ : (قەت نەبووە (س) یۆنانی بە (ﷺ) گوازرابێتەوە لە یۆنانیەوە بۆ زمانی عەرەبی).[٣] راست تر ئەوەیە وشەی (التصوف) نەلە (صوف)ەوە هاتووە کە مانای خوریە، نەلە وشەی (صفة) هاتووە کە بە کۆمەلێ لە یارانی پێغەمبەر (ﷺ) وتراوە،

---

(١) عصرالخوارق/ج.اج.رایز/ت:ماجدة صبیح/ل:٢٠-٢١ بە کورت کردنەوە .

(٢) عصرالخوارق/(٣٧) .

(٣) (الفرق الصوفیة في الاسلام /سبنسر منجهام) /ل: ٢٢ .




چونکە هەژاربوون وبۆ خواپەرستی لێ برابوون، (شیخ عبدالقادر الگیلانی) - قدس سره — لە (الفتح الرباني والفيض الرحماني) دا دەلێ : (( (التصوف) لە وشەی (الصفا)وە وەرگیراوە واتە پاکژی). هەمان واتای (التزکیه) دەبەخشێت، وەزانای گەورە (ماسینیون) ئەمە بە دوور دەزانێ کە (التصوف) ی ئیسلامی لە تەصەوفی بوزی و دیانەتی (فیدا) و فارسەکان، یان تەصەووفی مەسیحیەکان وەرگیرابێت و دەلێ : (تەصەووفی ئیسلام لەسەر خاکی ئیسلام گەشەی کرد بەو وەسفەی گیان ووشەی ئیسلامە، ئەزمونی سۆفیگەری دەرکەوت وبەپەلە گەشەی کردو بەردەوام ڕێرەوی خۆی بری بە توێژینەوە لە قورئان و زاراوەو چەمکەکانی لەو وەرگرتووە، هەروەها ڕێساکانی خۆی .....)[1] (التصوف) وەکو هەموو زانستەکانی تر لە ئال وبەیت و ئەوانیش لە پێشەوا عەلی (ر.ع) وەرگیراون کە دەرگای زانستە، ئەویش لە پێغەمبەر (ﷺ) وەری گرتووە، وەکو (ابن حدید المعتزلي) دەلێ : (زانستی تەریقەت وحەقیقەت وحالەتەکانی تەصەووف لە عەلی وەرگیراوە، گەورە پیاوانی سۆفیگەری لە هەموو وڵاتانی ئیسلامی دەیدەنە پاڵ ئەو وەکو : شیبلی وجونەید و سەری و بەستامی و ....) .[2]

جوانترین وەسف بۆ (التصوف) پێناسەی شێخی گەیلانی یە، کە یەکێکە لە قوتبەکانی ئال وبەیت و بە ڕەگەز کورد — ر- کاتێ دەفەرموێ : (هاوار بۆتۆ، خۆت بە سۆفی دەناسێنی، کاتێ تۆ لێڵی، سۆفی کەسێکە درون و ڕواڵەتی موبەمو لەسەر ڕێگای قورئان و سوننەت بێ، تائەو دڵی سافتر بێتەوە لە دەریای وجودی و دەردەچێ دەست بەرداری ویست وداخوازیەکانی دەبێ لە سەفای دڵیەوە، بنەمای خێروچاکە لە گرتنی ڕێوشوێنی پێغەمبەردایە (ﷺ) لە قسەوکردار دا، تامرۆڤ پتر دڵی پاکژبکاتەوە پێغەمبەر (ﷺ) لە خەون دەبینێ فەرمانی پێ دەکات بە شتێ و قەدەغەی دەکات لە شتێ ) .

(گەر دڵ لەسە یادی خوادەوام بکات زانست وزانیاری ویەکتا پەرستی و پشت بە خوا بەستنی و لە ڕو وەرگێڕان جگە لە خوای پێ دەگات، دەوامی یادی خودا هۆیەکە بۆ دەوامی خێر

---

([1]) التصوف الاسلامي / تورآندرية / ل: ٢١-٢٢ ..

[2] شرح نهج البلاغة / ابن حديد المعتزلي / ج١/ل: ٤٦ .

بۆ دنیاو پەسلان، گەر دروست بوو هەمیشە یـادو زیکـر لـە لێوارەکـانی دەنوسـرێت چـاوەکانی دەخەون ودڵی هەمیشە بێدارو بە ئاگایە بۆخوای شکۆداری، ئەمە لـە پێغەمبەرەکـەی (ص) بـە میرات دەگرێت، هەندێ لە خواناسان دەیەوێ شەو سەرخەوێ بشکێنێ خۆی بۆ ئامادە دەکرد بـێ ئەوەی پێویسی پێ هەبێ، لە راسـت ئـەوە پرسـیاریی لێکـرا ؟ وتـی : دڵـی مـن پـەروەردگاری شکۆدار دەبینێ، ئەمەش راستە، چونکە خەونی راست ئیلهامی خودایە هێزی چاوی لە نوسـتنی دایە) . [1]

لە تەصەوفدا (القطـب – جەمسەر) هەیە کـە ئـەو یەکەیـە جێگـای روانـینی خوایـە لـە جیهانـدا و لـە هـەمو جێگایەکـداو لەسـەر دڵـی ئیـسرافیلە، وە (الاوتـاد- مێخـەکان) هەیـە چوارکەسن لە چوار قورنەی جیهان دا، خۆرهەلات وخۆرئـاوا بـاکورو باشـورن هەریەکـە جێگـای خۆی هەیە لەو ناوچانەدا، ((البدلاء) هەیە حەوت کەسن، وە (النقباء) هەیە (٣١٣) کەسـن، وە (النجبـاء) هەیە (٤٠) کەسن، سەرقاڵی هەڵگرتنی گرانایی خەلکن، دوو پێـشەوایان(الامامـان) هەیە لە راست وچەپی جەمسەر یان غەوسدا، بۆ زانستی پـتر بروانـە (التعریفـات/ للجرجـاني/ل: ٢١٢) . ﴿اذ قالت الملائكة یامریم ان الله اصطفاكم﴾ ال عمران/٤٢.

بەڵێ (التصوف) ئەم رێگایەیە خوا ئیلهامی خۆی تێـدا دەنێـرێ بـۆ سـەرتەقواکاران وبـە زانستەکانی خۆیان شاد دەکـات ، بـە وشـەی (التـصوف) وەکـو (گـەیلانی) فەرمویـەتی : لـە (الـصفا)وە هاتووە، نەك لە پۆشینی صوف وخوری، صۆفی راست ئەو کەسـەیە دڵێ پاکدەکاتـەوەو تەنیا خوای شکۆداری تێدایە . [2]

بروانە (نهج البلاغة /الامام علي) و(الحكمة في مخلوقات الله تعـالى) و(معـراج الـسالكين)ی غەزالی پڕن لە بابەتی زانستی و زەمینی و ئاسمانی و گیانداری کە لە رێگای موشاهەدەو ئیلهام پەیان پێ براوە، یان لە رێگای (جفر)و (زایجـري) یەوە، پەیان پـێ بـراوە، (ابـن خلـدون) دەڵـێ : (گەمرۆڤ بەر لە خەوتن خۆی ئامادە بکات لە روویدەرونیەوە لە پێناو بیرۆکەیەکی دیاری کـراودا

(1) الفتح الرباني والفیض الرحماني/للسید عبدالقادر الگیلاني (قدس سره)/ل: ٢٠٠ ..
(2) ...................../ ل : ٩٥ ..




ئەو بیرۆکەیە لە خەوندا دەبینێ وسودی لێ وەردەگرێت) . [1] وە (د.میلان ریزل) هەمان قسە دەکات .[2]، هەموو داهێنراوەکانی مرۆڤ لە ڕێگای خەون و ئیلهام وخورپەی خوایی دۆزیوەتەوە. (وما اوتیتم من العلم الا قلیلا). (ابن خلدون) لە راست (علم التصوف) دەڵێ :(زانستەکی شەرعیە لە ئایندا داهێنراون لە بنەرەتدا ئەم ڕێگایە لای سەلەفی ئومەت وگەورە سەحابەکان وتابعینەکان بە کارهاتووە، هەروەها دوای ئەوان کە ڕێگای حەق وڕێنوما بووە) . [3] وەخوای گەورە خۆی فەرمویەتی :﴿ وَاتَّقُواْ اللَّهَ وَيُعَلِّمُكُمُ اللَّهُ﴾ . واتە : تەقوای خوا بکەن خوا فێرتان دەکات، وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمویەتی : (لو لا تمریغ قلوبکم لسمعتم ما اسمع) . رواه احمد واتە: گەر چلکی دڵتان نەبوایە من چیم دەبیست ئێوەش دەتان بیست. (رؤیا المؤمن کلام یکلم بە العبد ربە في المنام) . رواه الطبراني . [4]

زانای گەورەی ئەمریکی (تیمرسن /١٨٠٣ – ١٨٨٢) دەڵێ : ( هەموو کەسێ لە توانای دایە خوا لە قولایی دڵیدا ببینێ، گەر گوێ بۆ ویژدانی بگرێ بەگوێ ی هۆشیاری گوێ ی لە دەنگی خوا دەبێ لە دڵیدا) . تا دەڵێ : (بیرکردنەوەو رامان وەکو ئیلهام دادەبەزێتە سەر کەسانی تەقواکار) (باسکال) دەڵێ : دڵ لۆژیکەکی هەیە دوورە هزر سەری خۆی لێ دەربکات) . [5] ﴿ثم انزلنا علیکم من بعد الغم امنة نعاسا﴾ ال عمران /١٥٤.

(د. مصطفی) زۆر بە زانستیانە باس لە سوکە خەو (النعاس) دەکات کە مرۆڤ تێیدا نەستی (اللاشعور) هۆشیارەو لەو کاتەدا ئیلهام وخورپەی دڵی دەست پێ دەکات و دەڵێ : (پێغەمبەران سروشیان لەم ساتەدا وەردەگرن، سروش لە نێوان خەوو بێ ئاگایی دایە).

نیوتن هێزی کێشکردنی لە کاتی سوکە خەودا دۆزیەوە، بە چاوی سوکە خەوەوە سەیری سێوێکی دەکرد لە دار دەکەوێتە خوارەوە زانی نابێ سێو بکەوێتە خوار دەبێ زەوی رایکێشێت،

---

([1]) غرباء وخارقون ودخلاء / فرید مجید/ ل: ٦٥.

([2]) تدریب الادراك الحس الفائق/ میلان ریزل / ل : ٩٢

([3]) مقدمة ابن خلدون / ل : ٥٠٦ . .

([4]) واتە خەونی ئیلهامی بروادار قسەی پەروەردگارە لەگەڵ بەندەکەیدا دەیکات .

([5]) الله ذاتا وموضوعا/ عبدالكريم الخطيب/ ل: ١٤٩ .

هەموو داهێنەران دانەران و شاعیران و بیرتیژان لەم ساتەدا بیریان کراوەتـەوە، چـونکە سـاتێکی گرنگە شتە ئاساییەکان لە ناوی دا کەوتوون، ژیان بە سەیریەوە دەرکەوتووە، هزر بەتەواوی بـە پرسیاری نوێوە تروسکایی داوە، گەر بە تەواوی هۆشیار بوایە ئەم ئیلهامانەی وەرنەدەگرت، یـان گەر پەیوەندی تەواوی بە شتەکانەوە بوایە جیاوازی نێـوان رەوانـەکراوی خـوایی وبلیمـەت لـەو ساتەدا بۆ روبەری ئەو بینینە دەگەڕێتەوە بۆ هەر یەکێ لـەم دوانـەدا دەردەکـەوێت، پێغەمبـەرو رەوانەکراوی خوایی بە دەزگایەکی تەلەفزیۆنی دەچێ ملیۆن کۆیلی هەیەو روبەری دیتنی فراوانە، توانای وەرگرتنی گەورەیە، ئـەو دەتـوانێ چـەند دیمـەنێ لـە مـەریخ وەربگـرێ لەسـەر شاشـەی پانۆرامای فراوانەوە، چونکە بە ئامێرەکانی خوایی کۆمەکی دەکرێت .

بلیمەت دەزگای ترانزیستۆری بچوکە زۆر بە دژواری گوێ بیستی وێستگەی قاهیرە دەبێ، چونکە پشت بە هەوڵی دالغەو ئیلهامەکەی دەبەستێ، کە رەنگە بیپێکی یان نە، ئێستا هەردولا لە ئۆقیانوسی راستیەکاندان) . [1]

غەزالی دەڵێ : (سەرەتای عیرفان وتەریقەت بە موشـاهەدەو وێنـەو موکاشـەفەوە دەسـت پێدەکات ، تا لە بێداری دا فریشتەو گیانی پێغەمبەران دەبینن دەنگیان دەبیسـتن وسـودیان لـێ وەردەگرن) . [2] بەڵام زانستەکانی ئەزمونی وعیرفانی و فەلسەفی و لۆژیکی هەموویان سنوردارن بۆیە پێویستیان بە هزری بێ سنور هەیە کە ئاینەو سروشتی خودایە !

(د.مصطفى محمود) باسـی رۆڵـی عیرفـان وتەصـەوف دەکـات لـە دۆزینـەوەی رازەکـانی گەردونداو چۆن بە چاوی دڵ کە زۆر لە وورد بین تیـژترە توانیویانـە زۆرێ لـە رازەکـانی گـەردون بپشکنن، دەڵێ (بەر لە هەزاران ساڵ بەر لەوەی مرۆڤ کارگـەی سروشـتی وکیمیـایی بدۆزێتـەوە بەرلەوەی بواری شیکاری کارگەیی ماددەی بۆ برەخسێ سەرقالی دۆزینـەوەی رازەکـانی مـاددەو پێکهاتەی بووە، بە هزری رووت ورامان، کەچی سۆفیەکان هەولیان داوە بە ئیلهام بـەم راسـتیانە

([1]) القرآن كائن حي / د. مصطفى محمود/ ل : ٦٥ .

([2]) المنقذ من الضلال / ل : ٥٠ .

بگەن، زۆر سەیرە کە دەست نوسەکی سۆفی موسلمان بدۆزینەوە بەناوی (جەلالەددینی رۆمی) بەر لە هەزار ساڵ دەڵێ (گەر گەردیلە لەت بکەیت سیستەمی خۆر دەدۆزیتەوە. (فرید الدین العطار) هەمان قسە دەکات...) [1]

(پرۆفیسۆر کریسۆن مۆریسۆن) دەڵێ : (لێرە ئیلهامی رامان(ایحاء التصور)دێ کە گەیشتۆتە چلەپۆپە، ئێمە لە زەوی دا وا بەستەین بە ماددەوەوپێوانە ماددیەکانەوە کە ئاماژەم بۆیان کرد، بەلاّم وەکو باسمان کرد رامانمان گورج بەسەر ئەو ماوەیە دا زاڵ دەبێ و دەمانگەیەنێتە هەموو شوێنێ ئیلهامی وامان دەداتێ لە راستیەوە نزیك بن، هزمان بۆ چەند جۆرە جوانیەك دەکاتەوە کە لەسەروی واقیعەوە بێت .......) . [2] دەنوسێ : (زانای جیۆلۆجی بە رامانی روحانی دەگاتە چینەکانی زەوی و چەقە تواوەکەی، ئەوەی دەیبینێ ئەو پەیوەندییە رێکەیە کە ئەو چینانە هەیانە لە توێکڵی زەوی .........) . [3] ئەنجا خۆشبەختانە ئیمرۆ دیاردەکانی گیانی وەکو تلباتی وسایکۆکینیزیاو دووربینی و بیر خوێندنەوەو بەرزبوونەوەی گیانی و دەیان دیاردەی بە تاقیکردنەوە سەلماون !

## ئاین (الدین)

### (...ولا کتاب منیر.....)

ئاینی خوا (الدین) وەکو دەفەرموێ :﴿ إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ﴾.آل عمران /١٩ ، واتە ئاین لای خودا ئیسلامە .

ئەم شەریعەت وزانستانەیە کە لە رێگای سروشی دڵەوە (الوحي) لەلایەن خواوە لە رێگای فریشتە گەورەکانەوە بە پێغەمبەران گەیشتووە، یان راستەوخۆ لە خواوە هاتووەو ئەست لە

(١) القرآن کائن حي / د. مصطفى محمود/ ل :٨٩ .
(٢) العلم يدعوا للايمان / كريسون موريسون / ل :١٨٠..
(٣)............./ل :١٨١.





حاڵەتی سوکە خەوو (النعاس) و خەوی قوڵدا وەریگرتووە، قورئـان دەفـەرموێ : ﴿قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَى قَلْبِكَ﴾. البقرة/٩٧ . واتە : بڵێ : کێ دوژمنە بۆ جبریـل ئـەو تـۆی ناردووە بۆ سەر دڵی تۆ . وەبە سروشی غەیری پێغەمبەران وەکو هەڵبژاردەکان و ئـەولیاکان لای ئەهلی سوننە دەوترێ (ئیلهام) وەکـو ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلاَئِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاء الْعَالَمِينَ﴾. آل عمران /٤٢ . ﴿وَإِذْ أَوْحَيْتُ إِلَى الْحَوَارِيِّينَ﴾. المائدة /١١١ . یان ﴿وَأَوْحَيْنَا إِلَى أُمِّ مُوسَى أَنْ أَرْضِعِيهِ﴾. القصص/٧ . وە ئیلهام پاڵپشتی وەحی پێغەمبەرانە، وەکو زانست وفەلسەفەو عیرفان پشتگیری لەو دەکات، وە وەحی پێغەمبەران پارێزراوە لە دالغەو وەسوەسەی شەیتانی تا ببێ بە رێبازەکی خاوێن بۆ نادەمیزادو رێنومایی و دەستوری ژیان .

لە بەرامبەر دا ئیلهامی شەیتانی هەیە بەتایبەتی بـۆ پیـاوانی خـۆی :﴿ وَإِنَّ الشَّيَاطِينَ لَيُوحُونَ إِلَى أَوْلِيَآئِهِمْ﴾. الانعام /١٢١ . بەڵام هەموو زانیاریەکانی ئـەوان پڕوپـوچ و ناراسـتن :﴿ يُوحِي بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ زُخْرُفَ الْقَوْلِ غُرُورًا ﴾.الانعام/١١٢ . وە فریـشتەکانیش هەربـە ئیلـهام قسە لەگەڵ خودادا دەکەن .

﴿إِذْ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى الْمَلآئِكَةِ﴾. الانفال:١٢ . وەشـەیاتینەکان نـاتوانن زانیـاری لـە فریشتەکان بدزن و تیر باران دەکرێن : ﴿إِلاَّ مَنِ اسْتَرَقَ السَّمْعَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ مُّبِينٌ﴾. الحجر:١٨ .

ئەمەی لەم زەوی ناسیەدا دەیخوێنیەوە کۆمەڵگە زانـستەکی مـوعجیزەیی قورئانیـە، کـە زانـست دوای زانـستی ئەزمونگـەری نـوێ پـەی پـێ بـردون و پرەنـسیپەکانی زەوی ناسـی (جیۆلۆجیا)ی لەسەر دامەزراون، کەچی قورئان (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبـەر ئامـاژەی بـۆ کـردون و دەری خستوون، ئەمەش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە لەسەر ئەمەی قورئان وشەی خوای کردگـاری بونەوەرە، وەقورئان زۆر ئایەتی تێدایە هانمان دەدات بۆ زانستی جیۆلۆجیا تـا بیانکەینـە بەڵگـە لەسەر کردگاری بەرێوەبەر و گەیشتن بە یـەقین و دڵنیـایی، وەلەسـەر ئـەم بنەمایـە ئایـدەلۆژیاو روانینمان بۆ بونەوەر راست بکەینەوە ، خوای گەورە راستی فەرمووە : ﴿لَخَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ أَكْبَرُ مِنْ خَلْقِ النَّاسِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ﴾. غافر/٥٧. نـەك هـەر زانـستەکان شـاهیدن لەسەر موعجیزەی قورئان بەڵکو زانایانی هەڵگری ئەم زانـستەش گەواهیدەری ئەوەن .




(د.واجلیری) مامۆستا لە زانکۆی (نابل) لە کتێبەکەی خۆیدا دەنوسێ : لە راست قورئاندا : (ئێمە گەنجینەیەك زانست لە قورئاندا دەبینین لە سەروی هزری فەیلەسوف وسیاسەتمەدارەکانەوەیە، لە گەورەترین ئاستدانە، بۆیە ناتوانرێ قورئان بە ئاسەواری کەسێکی فێرکراو دابنرێت کە خوێند بیت) .

(د.بورث ورث ئەسمیث) لە کتێبی (محمد واعتناق الاسلام) دا دەڵێ : لە رێگای ئاراستەی قورئانەوە لە سایەی زانست وزانیاریەکانیەوە ژمارەیەکی بێ شومار زانا پەروەردەبوون، کتێبی بێشوماریان نوسی، زانستی جیاجیاوتایبەتی پەیدابوو، کە ژیان وناوەرۆکیان لە قورئان وەرگرتبوو، پاشان بیرتیژو بلیمەتە موسلمانەکان بە دنیادا پەخشیان کرد، ئەنجا لە سایەی قورئان وکۆمەڵگەی ئیسلامی کە ئیسلام زیندوی کردنەوە جیهان روناك بۆوە). [1]

(د.واجلری) دەڵێ (قورئان زۆر ئایەتی تێدایە باسا سروشتیەکان وزانستی جیاجیا روون دەکاتەوە ئەو زانستانە بەوردی وسەلیقەیەك و ئەوەندە دوور لە هەڵە باس دەکات ئاستی زانایان وفەیلەسوفان وسیاسیان لە بەرامبەریاندا دادەبەزێت) . [2] بەڵێ : ئەمانە هەموو بەڵگەن کە قورئان موعجیزەیە لە هەموو بوارێکدا هیچ هزرێ، هیچ بلیمەتیەك ناتوانێ تۆزیشی لە دوبکات، بۆیە قورئان دوا دەستوری ژیانی ئادەمیزادەو، دوا رێنوماو رێگای راستە بۆ مرۆڤەکان و بەختەوەری هەردوو جیهانی بۆ مرۆڤ هەڵگرتووە .

---

(1) اصول العقائد في الاسلام/ مجتبى الموسوي/ج٢/ل : ١٤٢ ..
(2) ............/ل :١٤٩ .





## بەندی یەکەم : زەوی لە ئاسماندا :

١- زەوی لە مێژوی زانستیدا .
٢- زەوی لە وشەو زاراوەدا .
٣- زەوی هەسارەیەکە لە کۆمەڵەی خۆردا .
٤- زەوی چەقی کۆمەڵەی خۆر نیە، بەڵکو خۆر چەقی کۆمەڵەکەیەتی .
٥- زەوی نیمچە گۆیی یە نەك گۆیی یە .
٦- تیرەی زەوی و بونەوەر، قەبارەو چڕی وکێش ورووبەرەکەی.
٧- مانایەکی (فج عمیق).
٨- مەبەست لە (ادنی الارض) چییە ؟ کوێ نزمترین شوێنی زەوی یە ؟
٩- ١٠- کێشکردنی زەوی وچەند سەرنجێ لە وشەی (مهادا) و (کفاتا) !
١١- هێڵە پان ودرێژەکانی زەوی .
١٢- خۆرهەڵات و خۆرئاواکانی زەوی .
١٣- سوڕی تەوەرەیی وسوڕی خولگەیی زەوی .
١٤- لاری زەوی لە تەوەرەکەیدا .
١٥- ١٦- زەوی بە (١٥) جۆر لە یەك کاتدا دەجولێتەوەو مانایەکی وشەی (ذلولا) !
١٧- دروست بونی شەووڕۆژ چەند سەرنجێ لە وشەی (نسلخ) .
١٨- چەند سەرنجێ لە وشەی (اذا جلاها) .
١٩- چەند سەرنجێ لە وشەی(نسلخ) .
٢٠- شەووڕۆژ بەردەوام هەیە .
٢١- بە شوێن یەکداهاتنی شەووڕۆژ .
٢٢- خێرایی بە شوێن یەکداهاتنی شەووڕۆژ (یطلبه حثیثا) .
٢٣- گرنگی بە شوێن یەکداهاتنی شەووڕۆژ بە بەردەوامی .
٢٤- جیاوازی شەووڕۆژ بەردەوام هەیە .
٢٥- مەبەست لە هەناسەدانی بەیانی (والصبح اذا تنفس) و گرنگی زوو لەخەو هەڵسان .
٢٦- مەبەست لە (ان ناشئة اللیل) و خواپەرستی شەوانە بۆچی بەهێزترە ؟!
٢٧- هێواش بوونەوەی خێرایی زەوی و وەستانی !



## ١- زەوی لە مێژوی زانستیدا :

قورئان ئاماژە بۆ دوورترین مێژوی جیۆلۆجی دەکات :
﴿أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا...... لِتَسْلُكُوا مِنْهَا سُبُلًا فِجَاجًا﴾. نوح/١٥-٢٠.

لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ کۆنترین زانستی گەردوونناسی وفیزیـایی وبـایۆلۆجی و جیۆلـۆجی دەکات، کە نوح پێغەمبەر _د.خ) لە کوردستاندا لە دۆڵی دوزێ دا لـە ناوچـەی (جـودي) دا بـۆ سـەلماندنی بـوونی خـوای کردگـارو پێغەمبەرایـەتی خـۆی پەسـلان دەیانخاتـە روو بـە گـوێ ی شارستانێتی ئەو سەردەمەیدا دەدات کە بروای بە خودای تاقانە بووەو بت پەرست بوون، وەکو لە گەردوونناسی دا باسمان کرد، بەپێی دەقی قورئان و تابلۆ دێرینەکان (نوح) لە کوردستان بووە، کـە مێژوی بوو (٩٠٠٠ – پ.ز) دەگەرێتەوە، قورئان دەفەرموێ : (وا ستوت علی الجودي). دیـارە جودی کێوێکی کوردستانیە سەربە زنجیرە چیاکانی ئاراراتە.

دووەم شت لە حەفتاکاندا لە سەدەی رابـردوودا (جـورج سمـث) ی لێکۆڵـەر لـە مۆزەخانـەی بەریتانی دا کاری دەکرد هەندێ تابلۆی قورینیان کە نەخش کرابووە بـە نوسـراوی بزمـاری و لـە (نەینەوا) دۆزرانەوە لێکۆلینەوەی لەسەر کردن، بەشێ بـووە لـە کتێبخانـەی پادشـای خوێنـاوی (سەنحاریب) لە تەوراتدا، سمیث رایگەیاند ئەمە بەشێکە لە بەسەرهاتی داستانی (گلگامیش).[1]

(١) الانسان وقواة الخفية/كولن ولسن/ل :١٠١ .





لە (تابلۆی/١١)ی گلگامش هاتووە کە یەکێ لە خواکان نـوحی بـابلی ئاگـادار دەکاتـەوە کەشتی یەك دروست بکات خۆی رزگار بکات . [١]

بابل کوێیە؟ راست ترین را (بابل) سنجارە وەکو لە (کتـاب المقـدس)دا (تکـوین١٠/١١) : (وقد تکونت مملکته اول الامر من بابل وارك ولکنة في ارض شنعار SHINAR) .

لە قورئاندا ئاماژە دەکات کـە خـاکی بابـل سـنجارە یـان ئەینـەوا مەلبەنـدی یەکـەمی سەرهەڵدانی زانستەکانی ئەستێرەگەری وسیحرو ئەستێرەناسی وزانستە روحیەکانە : ﴿وَمَـا أُنـزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ﴾.البقرة/١٠٢. بەم پێیـە ئـەم زانـستانە لـە رێگـای خـەون ونیلهامەوە فێری خەڵکی شایستە کراون کە توانای روحیان هەبووە، بەلام خـەلکی زیـاتر وەکـو عادەتی مرۆڤ وایە بۆ زیان بەکارهێناوە، لەوانە : نوشتەی رەش لە ژن ومێرد (ویتعلمـون منهمـا مایفرقون بین المرء وزوجه) البقره/١٠٢.

(حمید الازري) دەلێ : (سـیحر دوو جـۆرە جـۆری رەش وسـپی جـۆری رەش مەبەسـت لـە گەیاندنی زیانە بە خەڵکی وەکو شێتی وبەخت بەستن وسوتان وئازاردان بە ئەندامەکان ومندالان، سپی پێچەوانەی ئەمە مەبەست لە سود گەیاندنە بەوانـە) . [٢] (کـولن ولـسن) دەڵـێ (هەرلـە کۆنەوە ناسراوە کە کلدانیەکان دامەزرێنەری ئەستێرەگەری و گەردونناسین). [٣]

ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان کە ئەم هەموو مووعجیزە مێژوویە زانستیانەی لە خۆ گرتووە ، بەر لەوەی مرۆڤایەتی پەیان پێ ببات بەپێی مێژوو سەردەمی نوح سـۆمەریەکان حوکمیان کردووەو هەشت پادشا بەر لەو تۆفانە حوکمیان گێراوە . [٤] هەرچی سۆمەری بـوون لـە بنەرەتدا مەگۆلی بوون ..... [٥] وەهەر لە سالی (١٩٢٠) کاتێ ئینگلیز کوردستان داگیر دەکات چۆن تابلۆکانی (گلگامیش) لە کوردستان لە ئەینەوا دەدۆزنـەوە سـێ تـابلۆ دێرینـەکانی (نـوح)

---

(١) معجزة القرآن والطوفان بين العلم والايمان/المهندس سعد حاتم محمد مزرة/ط١/١٩٩٠/ل :٩٥ .

(٢) الابراج/ حميد الازري/عميد اتحادا الفلكيين العالمين/ل : ١٥ .

(٣) الانسان وقواة الخفيه /كولن ولسن/٩٣ .

(٤) معجزة القرآن والطوفان/ل :١٠٠ .

(٥) ابو الانبياء /عباس محمود العقاد/ل :١١٨ زانایەکی میسری بە رەگەز کوردە .

دەدۆزنەوە کە هاید پارك بلاوی کردەوەو شوێنەوار زان (تەقی عابد) وشەکانی هەڵهێنان وە لە تاکامدا بینی ئەم سروشە بە کوردی نوسراوەتەوەو ، نوح ناوی (کوردە) بووە کە وشەی کورد لە مەوە هاتووە واتە : کوری دەیەمی نادەم . وەهەرچی مەسەلەی سامی وحامی ویافثي یە لە مێژودا بێ بنەمایەو ناراستە . [1]

لە فەرمودەی (صحیح) دا هاتووە : (بین آدم ونوح عشرة قرون) رواه البخاري . وەدوای (١٠) وەچەی تر (ابراهیم) دێ لە وەچەی نوح (علیه السلام) ئەو کاتە (کلدانی) حوکم دەکەن، لەوانە نەمرود، کە ئەژیهاکەو کوردستان جینۆساید دەکات . مێژوو نوسی گەورەی کوردی (ابن الاثیر) دەڵێ :(هشام بن الكلبي) دەڵێ :(ئەژدیهاك نەمرود بووەو ئیبراهیم لە چەرخی ئەودا لە دایك بووەووەئەو بوو ویستی بیسوتێنێت) . [2] وەزانای بە رەگەز کورد (عباس محمود العقاد) هەڵەیەکی گەورە دەکات کە دەڵێ : (ئیبراهیم) لە (ابو الانبیاء) دا بە عەرەب ناوزەد دەکات .چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی بەعەرەب نازانێت و بوخاری گێڕایەوە : (ثم شب فیهم وتعلم اللغة العربیة منهم) .

مێژوو نوس(برسوس) باسی ئیبراهیم دەکات : (ئەو لە وەچەی دەیەمە دوای لافاو لە ناو کلدانیەکان دا ژیاوە، پیاوەکی راستگۆ بووەو لە زانستی ئاسمانیدا قوڵ بۆتەوە . مێژوونوس هێکتارس لە میسر (٣س .پ.ز) کتێبێ دەنوسێ کە نقولای دیمەشقی لە کتێبی چوارەمی لە راست مێژوی (ئیبرامیس) دەنوسێ ئەو حوکم لە دیمەشقدا دەکات لە بابلەوە دێ کە بە وڵاتی کلدانیەکان ناسراوە، زۆری نەبرد خۆی وگەلەکەی بردن بۆ کەنعان .....) . [3] وە (عباس محمود العقاد) هەڵە دەکات کە دەڵێ : (دیانەتی پێغەمبەران لە پشتی عەرەبدا نەبێت وجودی نیە) [4] یان (ئیبراهیم عەرەبی بووە ) . [5] وە (تقي عابد) ی شوێنەوار زان وەکو لە فەرمودەی

---

(1) جریدة العرب الثلثاء /٢٨/٥/١٩٩٠ .

(2) الكامل في التأريخ/ابن الاثير/ج١/ل :٥٩ ..

(3) ابو الانبياء /ل : ٩٤ . .

(4) ............/ل: ١٤٤ . .

(5) ........./ل:١٢٤ ..

پێغەمبەردا هاتووە (ﷺ) ئیبراهیم عەرەب نەبووەو نە ئیسماعیل و زمانی عەرەبی لە ناو ئەواندا فێربوون، ئەویش لە ناو سێ لەوحەکانی نوح دا دەدۆزێتەوە ئیبراهیم لە هۆزی جافەو سۆزانیە ژنەکەی هەورامی یە .[1] وە ئەمرود یان ئەژدیهاك خۆی بە خوا زانیوەو ستەمکار بووە وەکو قورئان دەفەرموێ :﴿ أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِي حَآجَّ إِبْرَاهِيمَ فِي رِبِّهِ أَنْ آتَاهُ اللّهُ الْمُلْكَ إِذْ قَالَ إِبْرَاهِيمُ رَبِّيَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ قَالَ أَنَا أُحْيِي وَأُمِيتُ قَالَ إِبْرَاهِيمُ فَإِنَّ اللّهَ يَأْتِي بِالشَّمْسِ مِنَ الْمَشْرِقِ فَأْتِ بِهَا مِنَ الْمَغْرِبِ فَبُهِتَ الَّذِي كَفَرَ﴾. البقرة / ٢٥٨ . واتە : ئایا نەت بینی ئەو کەسەی دەمەقالێ لەگەڵ ئیبراهیم کرد کە خوا موڵك ودەسەلاتی پێدابوو، کاتێ ئیبراهیم پێی وت : پەروەردگاری من مرۆڤ زیندوو دەکات ودەمرێنێ ، وتی منیش زیندوو دەکەم و دەمرێنم، ئیبراهیم وتی : خوا خۆر لە خۆرهەلاتەوە هەلدێنێ تۆ لە خۆر ئاواوە هەڵی بێنە، ئەو کەسەی بێ بڕوابوو دەمکوت بوو) .

وە خەڵکی دۆڵی دۆزێ وەکو کلدانیەکان وئاریەکان ئەستێرەپەرست بوون وئاگریان لا پیرۆز بووە، تا (اذر) کە باوکی یان مامی ئیبراهیم پێغەمبەر بووە ناوی ئاگر بووە، هەروەها شەیتانیان خۆش ویستووە، بۆیە بە ئازەری ووت: (یا ابت لاتعبدوا الشیطان) [2] .

سەیری ئەم دەمەقالێ و وتووێژو دیالۆگەی نێوان ئیبراهیم وگەلەکەی بکەن چۆن فەلسەفیانەو لۆژیکیانەو گەردووناسیانەو جیۆلۆجیانە لەگەڵیاندا دەکەوێتە دەبە ڕێکڕاچون، وەخوا بەر لەمە ئیبراهیمی فێری ئەم زانستانە کردبوو گەشتی روحی ئاسمانی و زەمینی پێکردبوو تا خۆی دڵنیا دەبێت لە مەیدانی کرداری دا :﴿ وَكَذَلِكَ نُرِي إِبْرَاهِيمَ مَلَكُوتَ........ وَمَا أَنَاْ مِنَ الْمُشْرِكِينَ﴾. الانعام/٧٥-٧٩ . واتە : (دیسان مەلەکوتی ئاسمانەکان وزەویمان پیشانی ئیبراهیم دا تا بگاتە زانستی دڵنیایی ، کاتێ شەو بۆوە هەسارەیەکی بینی، ووتی (وەکو نموونە) ئەمە پەروەردگاری منە، کاتێ ئاوابوو ووتی: (من شتێکم خۆش ناوێت ئاواو بزربێت،

[1] جریدة العرب/٢٩/٥/١٩٩٠ .

[2] (فون هامر) زانای گەورەی ئەڵمانی دەڵێ (پەرستنی شەیتان یەکێ بووە لە ئاینە کۆنەکانی کورد وهێشتا گرووێ ماون بە ناوی یەزیدیەکان) .(امارە بهدینان/صدیق الدملوجی/ل :٦٧ .

کاتێ مانگ هەڵهات ووتی (بەنموونە) ئەمە پەروەردگاری منە، کاتێ ئاوابوو وتی : گەر پەروەردگارم ڕێنومام نەکات لەگەلی گومرایان دەبم، کاتێ خۆر دەرکەوت فەرموی (وەکو نموونە) ئەمە پەروەردگاری منە لە هەموان گەورەترە کاتێ ئاوابوو وتی : ئەی گەلی من خۆم دوورم لەو هاوبەشانەی پەیدای دەکەن، من روم کردۆتە ئەو کەسەی ئاسمانەکان وزەوی دروست کردووە بەحەق من لە بت پەرستان نیم) . عەللامە (البیضاوي) دەڵێ :هەسارەکە رەنگە زوهرە یان موشتەری بوبێ گەردەلێ : (هذا ربي) وەکو نموونە هێنانەوە دەلێت . دیارە ئەوان بت وهەسارەیان پەرستوون .عەللامەی موفەسیران(الزمخشري) دەلێ : (باوکی ئیبراهیم ئازەرو گەلەکەی بت و خۆرو مانگ و هەسارەکانیان دەپەرست، ویستی وریایان بکاتەوە لە هەڵەکانی دینیان وبەرەو رێگای روانین (النظر) وبەلگە داوا(الاستدلاك) یان ببات، گەر مرۆڤ بەراستی سەیربکات و وردبێتەوە ئەوانە شیاوی پەرستن نینن چونکە دروست کراون وهەموو دروست کراوێ دەبێ کردگارو بەدیهێنەرەکی هەبێ هەلیان بێنێ وئاوایان بکات و بیان خولێنێتەوە) . موفەسیری مەزن (الرازي) دەڵێ : (ئاوابوونی ئەستێرەکان نیشانەی دروست بوونە، دروست بوون مانای پێویستی بوونە بە خوای بە توانا و سەرپشك، ئەو بکەرە دروستکەری خولگەکان وهەسارەکانە) . کەواتە لێرەدا ئیبراهیم بە بەڵگەی لۆژیکی و زانستی و بیروبروای کلدانیەکان و خەلکی دۆزێ کە تێکەڵ بە زانست بووە رەت دەکاتەوە، چۆن ئەمڕۆ بیری ماتریالستی ورێکەوت تێکەڵ بە زانستی نوێ کراوە لە جیهانداو زانستی لەکەدار کردووە .

ئەوانیش وتوویانە هەسارەکان وخۆرومانگ ئەزەلی و ئەبەدی بوون و خوایەتیان داوەتە پاڵ ئەوانەو بیر ئەفسانەو میتۆلۆجیان تێکەڵ بە زانستەکان کردووە، کە کاردەکاتە سەر بیروراو روانینی راست لە بوونەوەرو کردگارەکەی، لێرەدا ئیبراهیم چەند زانستەکی گەردونناسی و جیۆلۆجی دەردەخات :

١- بەکارهێنانی (الکوکب) نەك( النجم) چونکە هەسارەکان پەرستراون لە دۆلی دوزێ وەکو (مەردۆخ) یان (مەریخ) ، ئەستێرە (النجم) چاوگی ڕوناکین کەچی هەسارە تەنێکی لێڵن ڕووناکی لە خۆر وەردەگرن ودەیدەنەوە .

(¹)



٢- لەکاتی نوێژەکانیاندا روویان کردۆتە مانگ و ووتویانە: (ئەی پەروەردگار دەسەلاتت لە نێوان ئاسمان و زەوی درێژبۆتەوە ....)ئەنجا زوهرە پەرستراوە و بە خوای خۆشەویستی ناسراوەو مەریخ لەبەر سوریان بە خوای شەڕ ناسراوە .

٣- بە خۆر دەفەرموێ (هذا اكبر) واتە: لە ناو هەسارەکاندا لە هەموویان گەورەترە، واتە: چەقی هەسارەکانە (فول) مانای سورانە بە دەوری چەقدا، وەخۆریان پەرستووە و بە شای خواکانیان داناوە ، کەچی موفەسیرانی کۆن وەکو (بیضاوي) دەلێ : (اکبر) واتە خۆر بەلگەیەکی رۆشنترە !

٤- دەری دەخات : خەلکانێ هەبوون پادشاکانیان پەرستووە ، وەکو لە مۆزەخانەی بەریتانی دا (ASHOLE ) دا ناوی ئەو پادشایانە هاتووە کە دوای تۆفانی نوح حوکمیان کردووە تا سەرجون ..... [1] وەکو لە گەردونناسی دا باسکرا .

دیسان جودیەکان یان گوتیەکان کە کوردەکانن (١٢٤)ساڵ حوکمیان کردووە (٢٢٦٤-٢١٧٣ پ.ز) بیست ویەك پادشا بوون زۆرجار پەلاماری سۆمەرو ئەکەدیان داوەو پەرستگاکانیان روخاندون . [2] وەئۆن کلۆس بە چیای ئەرارات کە کەشتی نوح لێ نیشتۆتەوە دەڵێ: کاردۆ(کوردەکان) [3]

لە کتێبی (تلمود)ی جولەکەدا هاتووە ئیبراهیم (٧) ساڵ لە خاکی کاردۆ (کوردەکان) ماوەتەوە ، دوای ئیبراهیم زۆر پێغەمبەری تر هاتوون وەکو یونس و زەردەشتی کوری دەغدوڤای کچی ئیبراهیم خلیل پێغەمبەری میدیەکان وەکو لە (گەردونناسی) و (زەردەشت وزەردەشتیەکان) کە چاپ کراون باسمان کردووە، خۆرهەلاتناس (کریستن) لە راست بیروبروای ئاریەکان بەر لە زەردەشت دەلێ : (ئاینی کۆنی ئاریەکان پەرستنی هێزی سروشتی بووە، هەمیسان توخم وتەنە ئاسمانیەکان) . (د.محمد معین) دەلێ : (ئێرانیەکان هەرلە کۆنەوە بروایان

---

(١) بۆ زانستی زیاتر بروانە (ابراهيم ابو الانبياء)/العقاد/ل :١٢٩-١٦٠ بە کورت کردنەوەو دەستکاریەوە .

(٢) کوردو کوردستان، /ئارشاك سافراستیان/و: ئەمین شوان /ل :٢٢٦ سەیربکە .

الكرد في مصادر القديمة /د.درايفر/ت: فؤاد حمه خورشيد/ل :٢٣ . ٣





بە خوای خێروشەر هەبووە بە شەیاتینەکانیان ووتـوە ئەهریمـەن و کـاری چـاکیان وەکـو بـاران و ڕووناکی داوەتە پاڵ خوای خێرو ئاگریان بە کچی ئاسمان ناوبردووە .......)[1] وە ئێزدیـەکان کـە پاشماوەی کۆنی ئەم ئاینەن بروایان بە سێ خوا هەیە وەکو مەسیحیەکان : (خودا- شەیتان- شێخ نادی) .وەهەندێ لە نوسەرانیان وەکو (خلیل جندي) دەلـێن : ئـەوان وا بەسـتەن بـە شارسـتانی سۆمەریەوە[2]

خۆرهەلاتناس (پ.ژ.دومناشە) دەڵێ : (ئایینی ئەفـسانەیی وچـیرۆکی کـۆن جـارەکی تـر دوای زەردەشت سەری هەلدایەوە، سەرباری چاکسازیەکانی زەردەشـت) ، ئەمـەش مانـای وایـە گەردون پێویـستی بە هاتنی پێغەمبەرەکی ترە لە نەوەی ئیـبراهیم و زەردەشـت کـە موحەمـەدە (ﷺ) تابروای ئەوان جارەکیتر زیندوو بکاتەوەو ئایدیای خەلکی وروانینیـان بـۆ گـەردون راسـت بکاتەوەو دادوەری و یەکسانی وئازادی و کامەرانی بۆ سـەرجەم گـەلان بگێڕێتـەوە ئەمـەش لـە رێگای قورئانەوە .

لە هیندستان (براهمە) هەبوون کە هەندێ پێیان وایە گـەلی ئیـبراهیم بـوون، بـەلاَم ئەمـە راست نییە، چونکە ئەوان بروایان بە پێغەمبەرایەتی نیە، ئـەوان بروایـان بـە دوو خـوا هـەبووە، عەرەبەکان بتیان پەرستووەن هەروەها خـۆرو مـانگ وئەسـتێرەو بروایـان بـە پێغەمبەرایـەتی و زیندوبوونەوە نەبووەن وەکو لە (الملل والنحل/للشهرستاني) دا باسکراوە .

لای یۆنانیەکان و سۆمەریەکان و ئەکەدیەکان وبابلیەکان ومیسریەکان وئاریـەکان گـەردون بە گشتی ودروست کەرەکەی شێوەیەکی ئەفسانەیی وەرگرتبوو، بروایـان وابـووە ئـاو سەرچـاوەی بوونەوەرە، خواکان لە ئاو دروست بوونەو پاشان خواکان بوونەوەریان دروست کـردووە، بەشـێ لـە ئاو وشك بووە زەوی دروست بووە، هەندێ هەڵم بەرزبۆتەوە مەردۆخ یان مـەریخی بابلیـەکان یـان (رع)ی میسریەکانی دروستکردووە[3] ئـەوەتا قورئـان دەفـەرموێ :﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ

---

([1]) الاسلام وايران/للمطهري/ل: ج٢/ل: ٥٠ .

([2]) الاديان والمذاهب بالعراق/رشيد الخيون/ل: ٦٨ سەیریکە .

([3]) صورة الكون / د. محمد عبداللطيف مطلب/ل ك ١٣ سەیریکە ..





السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ یان :﴿ لَا تَسْجُدُوا لِلشَّمْسِ وَلَا لِلْقَمَرِ وَاسْجُدُوا لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَهُنَّ﴾ . لێرەدا قورئان دەری دەخات خوا دروست کەری ئاوو ژیان وخۆرو مانگ وبوونەوەرە .

لە بیری یۆنانی دا هاتبوو: (سەرەتا گەردون تاریك بوود، زەوی دروست دەبیّ، ئینجا ئیرۆس خودای خۆشەویستی پێك دێت، لەم دوانە ئەتیرو رووناکی پێك دێت، لە زەوی چیاکان وئاسمان پەیدا بوون ، لە جووتبوونی زەوی و ئاسمان ئۆقیانوسەکان دروست بوون) [1] کاتیّ فیساگۆرس هات ووتی زەوی گۆیی یە هەروەها خۆرو مانگ و ئەستێرەکان، زەوی چەقی گەردون نییە، بەڵکو لەگەڵ هەسارەکاندا بە دەوری ئاگری سەرەکیدا دەخولێنەوە) [2]. دیارە فیساگۆرس هاوریّ ی سولەیمان پێغەمبەر (ﷺ) بووە ئەم زانستانەی لەو وەرگرتوون، خاوەن کەرامەت وئیلهام بووەو گەیشتۆتە پلەی فریشتە . [3] وە لە چەرخی ناوەراستدا وەکو باسمان کرد ئەورووپا دیمەنی گەردونی لەسەر شێوەی (ئەرستۆ مەسیحی) دارشتبوو گەردون بەم پێیە سنووردارەو زەوی چەقی بونەوەرەو ئەستێرەکان وخۆر بە دەوری ئەودا دەسورێنەوە .

ئەورووپا بڕواکەی جولەکەیی بوو بریتی بوو لە تەوراتی گۆڕاوە، یان مەسیحیەتی پۆلسی بوو. (ویلز) لە (موجز تأريخ العالم) دا دەڵیّ : (مەسیح مژدەی بەم مەسیحیەتەی ئیمرۆ نەداوەن بەڵکو پۆلس دایهێنا لە ئەسکەندەرونە ئاینی بت پەرستی لە ویّ وەرگرت، خوای میسریە کۆنەکانیّ (ئیزیس ـ هورس ـ سیزاییس)ی گۆری بە (باوك ـ کور ـ گیانی قودس) [4]

هەتا فەیلەسوفی گەورەی ئەڵمانی (هیگڵ /١٧٧٠-١٨٣١ز) بیری فەلسەفی میثالي خۆی لەم سیّ کوچکە(الثالوث) ە وەرگرت و ستایشی مەسیحیەت دەکات کەپەی بەوە بردووە خوا روحەو خوابووە بە مرۆڤ و لەودا خودا خۆی نواندووە .... [5] ئەنجا کاتیّ مارکس وئینگلز هاتن

---

([1]) صورة الكون/ل: ٢٣ .

([2]) ................................/ ل : ٢٤ .

([3]) الملل النحل/للشهرستاني/ ل :٢٣٢ .

([4]) وەرگێرانی : (عبدالعزيز تۆفيق جاويد) د .

([5]) الموسوعة الفلسفية المختصرة/و : فؤاد كامل واخرين/ل ٥١٦ .




بیری ماتریالستی دیالەتێکی یان لە هیگل وەرگرت بەڵام بە ئاوەژوویی، کە ماددە بەلایانەوە پرەنسیپی سەرەتایی یە ئەم دوانە ماتریالستی ئاسایی یان رەفزکردو، کە هەموو گەردون گەردیلەیە و بەپێی یاسایەکی میکانیکی کاردەکات ئەوان بروایان بە گەشەو پەرەسەندن هێنا، شتی تازە دێنێتە بوون زۆر لەو ئالۆزترە، ئەمە ماتریالستی دیالەتیکە، کە ئەمانەش یاساکانن :

١ـ یاسای گۆڕانی برەکان بۆ گۆڕانی چۆنێتی ، وەکو گۆڕانی ئاو بۆ هەڵم بە گەرمی ..

٢ـ یاسای دژەکان ٣ـ یاسای نەفی نەفی . وەماددیەکانی نوێ باوەریان بە گیان وخوای کردگار نییە، بەڵام زۆری نەبرد هەموو ئەو یاسایانە زانستی نوێ رەتی کردنەوە، تا خۆشی روخا لە دەسەلاتداو نەیتوانی ئایدیاو دەسەلاتی خۆی بهێلێتەوەو وەکو واقیعیەتی زانستی خۆی دەربخات . بروانە (الله یتجلی فی عصر العلم) کە کۆمەلێ پسپۆری ئەمریکی دایاننـاوە (العلم یدعو للایمان /کریسون موریسون) لە دژی کتێبی جولیان هکسلی دەینوسێ کە دەڵێ : (مرۆڤ بە تەنیا هەڵدەستێت) ، وە (فلسفتنا /محمد باقر الصدر) و (نقض الاوهام المادیة الجدلیة/محمد سعید رمضان البوطي) .

ئێمەش لەو گەردونناسیە لە سایەی قورئان وفەرمودە دا زۆرێ لە پرەنسیپەکانی ماتریالستی دیالە تیکمان رەت دایەوە، لەم زەوی ناسیەشدا زۆرێ لەم رەددانە دەبینی کە قورئان وزانست دەمکوتی ماتریالستی و بێ بڕواکانی پێ دەکات و شا رێگای راستەقینەیان پیشان دەدات ، ئەمەش نمونەیەکە لەم ئیعجازانەی زەوی ناسی، قورئان بەر لە جیۆلۆجی نوێ باسی کردون دەیان ئیعجاز دەبێتن لەم کتێبەدا دەبینی ماددە چییە ؟ ئایا تەنیا ماددە هەیە یان روح ونەتیریش هەیە ؟ ئایا زەوی سەرەتاو کۆتایی هەیە وە ئایا زەوی چەقی بونەوەرە ؟ جموجۆلی زەوی وژیان لە ئاوی داو چۆنیەتی دروست بوونی ژیان و مانای ژیان ، سیستەمی زەوی وناخی زەوی وپێکهاتەکانی، هەموو ئەو مەسەلە گرنگانە کە بۆ دین وزانست وفەلسەفە گرنگە باس دەکرێن، لە سەروی هەموویانەوە کردگاری دروست کەر، کە زەوی وبونەوەری بنیاتناوەو هەڵی دەسورێنێ و بەرێوەی دەباتن لەسەر رێرەوی ئەم ئایەتە دالرۆین ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾ ! بابزانین ئەم بەڵگەو موعجیزانە چین کە خوا لە زەوی دا داینـاون و خوا لە پەراوی قورئانـدا




ـوسیونیەوە تا ببن بە موعجیزەو بەلگەییّ بۆ بروادارانی یەقین دار .

بەلّیّ قورئان سەنەدی مانەوەی ئیسلامە لە ئاسۆی بیری مرۆیی دا دەرکەوتو بەردەوام وەکو خـۆر درەوشـایەوە ئـاییـنی پێغەمبـەر (ﷺ) لـە بـەرزترین ئاسـۆدا بـەرزی دەکاتـەوە بـۆ ڕووناککردنەوەی هۆشەکان لە جیهاندا، تاکە کتـێبی خوایـە لـە هـەموو چـاخەکانداو لەهـەموو گۆرانەکانـدا تاسـەر پێویـستی یەکەمینـە بـۆ دەوام دان بـە ژیانیـان وبەختـەوەرکردنیانو پێشخـستنیاندا، تـا زانایـانی هاوچـەرخی خۆرئـاواش دەکەونـە ژێـر کاریگـەری قورئـان و بـە موعجیزەیەکی گەورەی نـاوزەد دەکـەن بـە گـەورەترین دەسـتوری پێـشکەوتن ویاسـای مرۆیـی دادەنێن .

مامۆستا (سنایس) دەلّیّ : (بێگومان قورئان ئەم یاساگشتی وتەواوەیە لە هـیچ لایەکـەوە ناتەواوی وکەلێنی تێدا بەدی ناکەی و شـایانە بـە هـەموو سـەردەمیّ و هـەموو شـوێنیّ، گـەر موسلمانان دەستی پێوە بگرنەوە شکۆی جاران وەردەگرنەوە) . (١)

بەلّیّ ئیمرۆ سەرمایەداری نویّ ملیاران دۆلار خەرج دەکەن لە هەموو بوارێکدا بۆ رووخانی ئیسلام، کەچی نەیانتوانیوە ئایەتیّ بنوسن لە شێوەی قورئاندا بیّ، گـەر بیانتوانیبایـە جیهانیـان پڕەکرد لـەم دەنـگ ودۆیـە و بـە هـەموو جیهانیـان دا پـەخش دەکـردن ئەمـەش گـەورەترین موعجیزەیە، ﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾ . (٢)

---

(١) تفسير نوين فارسي/ ل :٤٢ .

(٢) البقرة /٢٣ .

# ( زەوی ناسی ـ جیۆلۆجیا )



له چەندان ئایەتدا هـاتووه : ﴿سِيرُوا فِي الْأَرْضِ﴾ الانعام /٦ . ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾ العنكبوت/٢٩ . (د.زغلول النجار) دەلـێ : (كۆمەلـه ئایـەتێ هەیـه فەرمان دەكەن بە رۆیشتن بە زەوی دا سـەیركردنی چۆنیەتی دروست بوونی بوون ئەمـەش بنـەمای مەنهەجی زانستیه له جیۆلۆجیادا) [1] . ﴿وَفِي الْأَرْضِ آيَاتٌ لِّلْمُوقِنِينَ﴾ . ئەم ئایەت وزانسـتانه چین ؟ دیاره جیۆلۆجیایه .

جیۆلۆجیا ئەو زانستەیه تایبەته بە زەوی ناسـیەوەن بنەماكەی وئەو چالاكیانەی لـه دواوەی گەشەو پەرەسـەندنی ژیانن تێیدان، زەوی ناسی بابەتەكی تیۆری وپراكتیكـی یـه، جیۆلۆجیـەكان هەر بۆ مێژووی زەوی جیۆلۆجیا بە كارناهێنن بەلكو بۆ دۆزینەوەی كانزاكانیش له توێكلەكەیدا زانستی تریش سودی لێ دەبینن .

---

(1) الارض في القرآن كريم/د. زغلول/ ل :٨١ .





زەوی ناسی لە سەدەی هەژدە بە دواوە سەربەخۆیی وەرگرت بە پشت بەستن بە کانزازانی وژیانزانی هەر لەو کاتەوە دۆزراوەی نویّ سەریانەلدان بەلاّم لە هەموویان سەرنج راکیّشترو بایەخدار تر ئەم تیۆرە بوو لە راست چینە پلیّتەکان (الصفائح)بوو، بۆ یەکەم جار تیۆرەکی هەموەکی تایبەت بە زەوی دەرکەوت کە تویّکلی زەوی لە چینی پلیّتی (لەوحی) پیّکدیّ بەچەند روداوەکیەوە وابەستە دەکات، ئەم تاویّرانە چەند بەشیّ لە کیشوەرەکان و قولایی زەریاکان پیّکدیّنن لە راست یەکتریەوە دەجولیّن، کیشوەرەکان جیادەکاتەوە یان زدریاکان ویّران دەکات، بەم ریّگایە چیاکان پیّکدیّن وبومەلەرزەو بورکان روددەن، دیسان رەنگە مۆلگەی ئاژەلی ورووەکی جیاببنەوەو هەریەکە ریّبازەکی خۆی بگریّ لە پەرەسەندندا ......[1] ئەنجا جیۆلۆجیا کەوتە دۆزینەوەی ماددەی خاو وەکو نەوت وخەلوز و یۆرانیۆم و ئاوو لم و چەوو کانزای تر..... قورئان ئاماژە بە هەمو ئەو شتانە دەکات کە خویّنەرانی جیۆلۆجی ومامۆستایانی دەتوانن وەکو مەنهەجەکی راست وریّنوما بە خش شان بە شانی زانست سودی لیّ وەربگرن، ئیّمەش بەم ئەرکە گرانە هەلّساین بە هیوای لیّ وەرگرتن وسودمەندبوون .

---

(١) علم الارض/ الك سمث/ ل :٨ .

# ( زەوی لە قورئان وفەرمودەدا )

## ٢- مانای زەوی لە زمان وزاراوەدا ( الارض ) :

لە سەر وشەی (الارض) هاتووە بۆ (الجرم المقابل للسماء وجمعه الارضون ولا تجيء مجموعة في القرآن) . بەم پێیە زەوی ئەم تەنەیە لەسەری دەژین وەلە ژێرماندایە لەبەرامبەر ئاسماندا کە سەقفی تێمەیە وەکو دەڵێ (ويعبر بها عن اسفل الشئ كما يعبر بالسماء عن اعلاه) . [1] کەواتە : زەوی بەمانای خاك ونەم هەسارەیە دێ لەسەری دەژین .



## ٣- زەوی هەسارەیەکە لە کۆمەڵەی خۆردا :

## ٤- زەوی چەقی کۆمەڵەی خۆر نییە، بەڵکو خۆر چەقی کۆمەڵەکەیەتی :

و(لاالشمس ينبغي لها ان تدرك القمر والليل سابق النهار وكل في فلك يسبحون). [2] واتە خۆر بۆی نیە بە مانگ بگات و شەویش پێش رۆژ بکەوێ، هەموویان لە خولگەی خۆیاندا مەلە دەکەن .

---

( [1] ) المفردات للراغب الاصفهاني .

( [2] ) يس / ٤٠ .



## ( راڤەی زانستی نویٚ )

١- خۆر چەقی کۆمەڵەی خۆرە وەکو ئیبراهیم فەرموی : (هذا اکبر) واتە : ئەمە گەورەترین تەنە لە زەوی و مانگ و هەسارەکانیش گەورەترە، وە کاتیٚ دەفەرمویٚ :(وکل في فلك یسبحون) . عەللامە (الزمخشري)

دەڵیٚ : (لێرەدا تەنوین لە جیاتی (المضاف الیه)یە واتە : (وکلهم) لێرەدا (الضمیر) بۆ (الشموس) و (الاقمار) ە). [1] لێرەدا ئەم موفەسیرە مەزنە دەری دەخات ئەم (کل) ە هەموو هەسارەکان ومانگەکان وخۆر دەگرێتەوە .

٢- (المهندس سعد حاتم) دەڵیٚ : (١) : خۆر چەقی زەویە بەدەوری دا دەسورێتەوەو زەوی چەقی سورانەوەی مانگە، مانگ راستەوخۆ بە خۆر ناگات بەهۆی زەوی نەبێت ، خۆر بە مانگ ناگات (لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ) نەك خۆر بە مانگ ناگات چونکە خۆر چەقە.

زەوی بە دەوری دا دەسورێتەوەو، زەوی سەر بە خۆرەوە خۆر پاشکۆی زەویە گەر خۆر نەبوایە زەوی نەدەجولاْیەوە، بەلاْم بۆ مانگ ناواپێویست نییە، لێرەدا لەم ئایەتە کورت ترو رەوان بێژتر نییە بۆ والاْکردنی ئەم راستیە .

٣- هەموو تەنەکان دەخولێنەوە لە خولگەی خۆیاندا (وکل في فلك یسبحون) .

٤- شەووڕۆژ دوو دیاردەی سورانەوەی زەوین بە دەوری خۆی و خۆردا .

٥- (والليل سابق النهار) واتە : دوای سورانەوەی زەوی بە دەوری خۆردا و ساردبوونەوەی شەووڕۆژ پێکەوە پەیدابوون . [2]

(تەلك سمث) دەنوسیٚ : (هەسارەکان بە هەمان ڕێرەوی سوری تەوەرەیی یان بە دەوری خۆردا دەسورێنەوە، هەسارەکانی ناوەوە عەتاردو زوهرەو زەوی و مەریخە کە هەسارەی چرو بچووکن، دوای ماوەیەکی زۆر هەسارەی دەرەکی دێن چڕیان کەمترەو قەبارەیان زل تر کە

---

( [1] ) تفسیر الکشاف / للزمخشري .

( [2] ) معجزة القرآن والطوفان/ ل : ٦٢-٦٤ بە کورت کردنەوە .

موشتەری وزوحەل وئۆرانۆس و نیبتۆن وپلۆتۆن) . [1]

وە دەنوسیّ : (کۆمەلەی خۆر لە (٩) هەسارەو بریّـك هەسـارۆك ونیـازك و کلکـدار پیّـك دیّت، تیرەی بە شی سەرەکی لەمە (١١) سەعاتی تیشکی یە، خۆر بـە ملیـۆنیّ جـار لـە زەوی گەورەترەو بارستایی خۆر (٩٩٪) ی بارستایی رژێمی خۆر پێکدێنێت، عەمبارەکی ناوەکی زلـەو هەرچرکەیەك چوارملیۆن تـەن مـاددە دەگـۆریّ بـۆ وزە، لەسـەر خـۆردا نـوکی گـەورەی بلّێـسە دەردەکەون پلەی گەرمیان (٦٠٠٠)°س دەبـیّ، خـۆر چـاوگی وزەیـە بـۆ زەوی هەرسـەعاتیّ بـە ئەندازەی سوتاندنی (٢٠٠٠٠) ملیۆن تەن خەلوز وزەی بۆ دەنێریّت).

وە زەوی سیّ یەم هەسارەیەو نزیکەی (١٥٠) ملیۆن کـم لـە خـۆر دوردەو بـە (٨) خولـەك روناکی دەگات بە زەوی، هەروەها قورئان لە ئایەتی تر بـە راسـتەوخۆیی ئامـاژە دەکـات زەوی هەسارەیەکی خۆریە دانەیەکە لە دوانزە ئەندامەکەی خۆر :

یوسف پێغەمبەر (ﷺ) لە خەونەکەیدا بۆ باوکی (ﷺ) گێڕایەوە :﴿ يَا أَبتِ إِنِّي رَأَيْتُ أَحَدَ عَشَرَ كَوْكَبًا وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ رَأَيْتُهُمْ لِي سَاجِدِينَ﴾. واتە : ئەی باوکە مـن دیـتم یـانزە هەسـارەو مانگ وخۆر کڕنوشیان بۆ دەبردم ، لێرەدا ئـەم یـانزە هەسـارانە ئاماژەیـە بـۆ یـانزە کورەکـانی یەعقوب، یوسفیش زەویە کە هەسارەی سیّ یەمە، خۆر یەعقوبەو مانگیش دایکی یوسفە . [2] .

کورەکانی یەعقوب ئەمانەن : (رەئوبین، شەمعون، لاوین یهوذا، یەساکر، زەبولون، یوسف، بونیامین، دان، نەفتالی، جاد، ئەشیر) هەموو ئەمانە لە (فدان نارام) یان دۆلناران لە دایك بـوون لە کوردستاندا لە دۆلّی خۆشناوەتی، کە شوێنی لە دایك بوونی باوکیانەو یـەعقوب دوای کۆچـی بۆ ئەویّ لە ویّ ژن دێنیّ و هەموو کورەکانی جگە لە بونیامین لە ویّ لە دایك دەبن . [3]

ئەمـەش هەسـارەکانی خـۆرن : (عـەتارد، زوهـرە، زەوی، مـەریخ، موشـتەری، زوحـەل،

---

( [1] ) علم الارض/ الك سمث/ ت: فارس لطفي الخوري/ ل :١٢ .

( [2] ) گەردونناسی لەسایەی قورئان وفەرمودە/ل :٢٨٨/کتێبی نوسەر .

( [3] ) قصص الانبياء /عبدالوهاب النجار/ل :(      ) ، قصص القرآن/محمد احمد جادالمولى/(ل:٧١) ،(حتى لا تخطئ فهم القرآن /محمود غريب/ل :١٠٨) .(ژیانی پێغەمبەران/محمد شلماشی/بەسەرهاتی ئیبراهیم سەیریکە، ناوچەی دۆلناران ونەشکەوتی ئیبراهیم وکێوی نەمرود دەکەوێتە لای حاجیاوەو ناوچەی سەروچاوەو بێتواتەو شوێنەواریان ماوە .



تۆرانۆس، نیبتۆن، پلۆتۆ، سێرس، چارۆن، UB۲۱۳ /۲۰۰۳) . لە کۆنفراسی نێودەولەتی (IAV) دا لە (۹) هەسارەوە کران بە (۱۲) و دەقی قورئان هاتەدی کە ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەو نوێیە بۆ قورئان ! ئەمانەش هەسارەکانن :

۱- عەتارد : بچوکترین ویەکەم هەسارەیە لە خۆرەوە بە (۸۸) رۆژ کە سالی عەتاردە بە دەوری خۆردا دەخولێتەوەو سوری تەوەرەیی(۵۸,٦۵) رۆژەو (۵۸)ملیۆن کم لە خۆر دوورەو (۸۰)ملیۆن کم دوورە لە زەوی .

۲- زوهرە (۱۰۸) ملیۆن کم لە خۆر دوورەو نزیکترین هەسارەیە لە زەوی و (۹۵,٦) هەندەی دووری مانگ لە زەوی لێی دوورە، مانگی زەوی (٤۰۷۰۰۰) کم لە زەوی دوورە . سوڕی خولگەیی (۲۲۵) رۆژەو سوری تەوەرەیی (۲۲۵)رۆژە .

۳- زەوی : نزیکەی (۱۵۰) ملیۆن کم لە خۆرەوە دوورەو سوری تەوەرەیی (۲٤) سەعاتەو سوری خولگەیی (۳٦۵) رۆژە .

٤- مەریخ : کۆن بە مەردۆخ ناسراوە لە زەوی بچوکترە تیرەی کەمەرەیی (٦۸۰۰)کم و (۲۲۸)ملیۆن کم لە خۆر دوورەن سوڕی تەوەرەیی (۲٤,٦) کات ژمێرەو سوری خولگەیی (٦۷۸) رۆژەو گومانی ژیانی سەرەتایی لیّ دەکریّ لە ناوی دا .

۵- موشتەری (بەرجیس) گەورەترین هەسارەی خۆرە، تیرەی کەمەرەیی (۱٤۳۰۰۰) کم تێکرای دوری لە خۆر (۷۷۸)کم سوری تەوەرەیی (۹,۵۰) کات ژمێرەو سوری خولگەیی (۱۲) سالە، (۲۰) مانگی پتر هەیە .

٦- زوحەل (کەیوان) : چوار ئەلقەی جوان دەوری داوە، تیرەی کەمەرەتی (۱۲۰) هەزار کم سوری تەوەرەیی (۱۰,۱٤) کات ژمێرەو، سوری خولگەیی (۲۹ ۱/۲) سالەو (۱٤۲۷)کم لە خۆرەوە دوورە (۲۷) مانگی پتر هەیە .

۷- تۆرانۆس : تیرەی (٤۷۱۰۰) کم ودوری لە خۆر (۲۸۷۰)ملیۆن کم سوری خولگەیی (۸٤) سالەو سوری تەوەرەیی (۱۰,۵۰) کات ژمێرە ، (۱۰) مانگی هەیە .

۸- نیبتۆن تیرەی (٤۸٤۰۰) کم (٤۵۰۰) ملیۆن کم لە خۆر دوورە، سوری تەوەرەیی

(١٥,٤٨) سەعاتەو سوری خولگەیی (١٦٥) سالە .

٩- پلۆتۆ : لە سالی (١٩٣٥) دۆزرایەوەن تیرەی کەمەرەیی (٥٩٠٠) کم سوری تەوەرەیی (٦,٤٩ رۆژەوسوری خولگەیی (٥٢٤٨)سالە، (٥٩١٠)کم لە خۆرەوە دوورە .

١٠- سێرس : تیرەکەی (٥٧٨) میلە، تازە کراوە بە هەسارە دوای مەریخ دێ وەکو لە گەردوونناسی دا باسکران جاران بە هەسارۆکە ناوزەد دەکرا .

١١- چارۆن : چارۆن بە مانگی پلۆتۆ ناودەبرا ئێستا بە هەسارە ناسراوە .

١٢- (UB٣B) مایك براون دۆزیەوە و بە قەدەر نزیکەی پلۆتۆیە .

هەموو ئەو هەسارانە جگە لە زەوی ژیانیان لە سەر نییە، بەلاّم ئەمە مانای وانییە کۆمەلّەی خۆری ترنییە ژیانی تێدابێ، بەلّکو بە ملیارەها کۆمەلەی خۆر هەیە ژیانی لەسەرە، مەزندە دەکرێ وەکو (د. طالب ناهي الخفاجي) باسی کردووە هەر لە مەجەرەی خۆماندا کە (١٠٠) ملیار ئەستێرەی تێدایە، (١٠) ملیار هەسارەی تێدابێ بۆ ژیان لەباربێ و( ٥٠) ملیۆن هەسارە ژیانی تێدا دەرکەوتبێت .[١]

لە دەقی قورئاندا هاتووە ﴿وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ﴾. الشوري /٢٩ . دیسان (احمد) گێرایەوە : (لله دار بيضاء مشحونة خلقا كثيرا مسيرة الشمس فيها ثلاثون يوما مثل ايام الدنيا ثلاثين مرة) . واتە : خودا خانەی سپی هەیە پڕە لە خەلّك خۆریان بە سی رۆژ رووناکی یان پێ دەگەیەنێ ، سی ئەوەندەی رۆژانی دونیایە) ! (سبحان الله) !

## ٥- نیمچە گۆیی ( هێلکەیی ) زەوی:

لە زانایانی کۆن یۆنانی ئەناکسیمەندەر (٦١١-٥٤٥ پ.ز) بڕوای وابوو ئەستێرەکان بە دەوری ئەستێرەی پۆلی (القطبي) دا دەخولێنەوە، وە فیساگۆرس بروای وابووە زەوی گۆیی یە، (هیراقلیتس/٣٨٨-٣١٥ پ.ز) بروای وابووە زەوی گۆیی یە، یان تۆپی یە خۆرومانگ وهەسارە بەدەوری دا دەسورێنەوە، ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٢ پ.ز) بروای بە گۆیی زەوی هەبووە، (ئەرستاخ

---

(١) بڕوانە گەردوونناسی / نوسەر .





٣١٠-٢٣٠) بروای وابووە خۆرو ئەستێرەکان ناجوڵێن وزەوی بە بازنەیی بـە دەوری خـۆردا خـول دەدات .(١)



لە زانا موسلمانەکان (ابن حزم الظاهري) دەڵێ :(بەڵگەکان راستن زەوی گۆیی یە، هەروەها ئاسمانیش، بەڵام خەڵکی رەشۆکی وانالێنن وەلامی ئێمە ئەمەیە :هیچ لە زانا گەورەو شایانەکان بە زانایی نکۆلی یان لە گۆیی وخری زەوی (الكروية) نەکردووە، کەس قسەیەکی لێ نەبیستروون، بەلکو بەلگەی قورئان وسوننەت ئاماژە بە گۆیی زەوی دەکەن، خوای گەورە فەرموویەتی :﴿ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾ . الزمر /٥ . واتە : شەو بە گـۆیی دێـنێ بەسـەر رۆژداو رۆژیش بەگۆیی دێنێ بەسەر شەودا، ئەمـە روونتریـن راڤەیـە بـۆ گـۆیی هەنـدێ بەسـەر هەندێکی تردا، ئەمە لە لولدانی مێزەر (کورالعمامـة) هاتوۆە، ئەمە دەقە لەسەر گـۆیی زەوی و سورانی خۆریش هەروەها، ئەوە بە هەڵاتنی رۆژ پەیدا دەکات و بە ئاوابوونێ شەو پەیدا دەکـات، وەکو قورئان دەفەرموێ : ﴿وَجَعَلْنَا آيَةَ النَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾. الاسراء/١٢ .(٢)

دیـسان قورئان وردتر باس دەکات بۆ زەوی ناسان وگەردونناسان ومرۆڤایەتی، کە ئەم گۆیی یە بەتەواوی نییە، بەلکو نیمچە گـۆیی یـە، ئـەوەتا قورئـان دەفـەرموێ : ﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ

(١) بروانە صورة الكون/ل : ٢٤-٣٠ بە کورت کردنەوە .

(٢) الفصل/ج١/ابن حزم/ل : ٣١٠ .

دَحَاهَا﴾ . [1] وشەی (الدحیة) زۆر مانای ئیعجازی زانستی هەیە وەکو (دحي —البسط) تەخت وهەموار کردنوفراوان کردن. (الفراء) دەڵێ : (دحي- الی بسط) . بەمانای (رمی- هاویشتن وفرێ دان) دێت . [2] .

یان بە مانای هێلکە دێت، (د.عبدالرزاق النوفل) دەڵێ {(الدحیة) هێلکەیە، تا ئیمرۆش زۆر لە وولاتانی عەرەبی وولاتی جمهوری عرەبی هێلکە بە (الدحیة) دەناسن} . [3] وە خوا فەرمویەتی :﴿ وَالْأَرْضَ مَدَدْنَاهَا﴾. ق:٧ .

لێرەدا قورئان ئاماژە بە درێژبونەوەی زەوی دەکات کە کۆتایی نییە بەهەرکوێیەکی زەوی دابرۆیت دەگەیەوە ئەم خاڵە واتە زەوی گۆیی یە.

## ( راڤەی زانستی )

{زەوی (EARTH) گۆیەکی تەپیوە (مفلطحة) تیرەکەی (٦,٥) هەزار کم و چوارچێوەکەی (٤٠) هەزار کم ورووبەرەکەی هەندێ لە (٥٠٠) ملیۆن کم$^{٢}$ پترە . وە (٧١٪) ی ئاوە، ئۆقیانوسی هێمن ـ هادی بە تەنیا بە ئەندازەی هەموو وشکانیە، کۆی ئاوی سەر زەوی (١٠٠٠) کم$^{٣}$ یە، زەوی مانگەکی هەیە (٤٠٠٩ هەزار کم لێی دوورە، قەبارەی زەوی (١,١) ملیۆن ملیۆن کم$^{٣}$ ، بارستایی وکێشی (X٦ ١٠ $^{٢١}$) تەنە، واتە : (٦٠٠٠) بلیۆن بلیۆن کم (بلیۆن = ١٠٠٠ ملیۆن) چڕی (الکثافة) ی زەوی (٥,٥) گم بۆ هەر سانتیمەتر سێجایەك لە هەموو هەسارەکان چڕترە} . [4]

ئیمرۆ لە یەکی ناوەندی دا یان لە پۆلی حەوتەمدا ئەوە دەخوێنین : (زەوی بە تەواوی وەکو گۆ خرنییە لە جەمسەری سەرو خوارو دا تەپیوە، لە هێلی کەمەرەشدا دەرپەریوە) .

---

( [1] ) النازعات/٣٠ .

( [2] ) بروانة لسان العرب/ابن المنظور .

( [3] ) الله وعلم الحدیث/عبدالرزاق نوفل/ل :١٢٨ .

( [4] ) الکون العمیق/ د.علي الامیر /١٩٨٦/بغداد/ل :٢٣ .



بێگومان هێلکەش بە تەواوی گۆیی نییە و لە ناوەراست دا دەرپەڕیوەو، ئەم سەرو ئەو سەری وەکو یەك نییە، (د.زەغلول النجار) ی زەوی ناس وسەرۆکی یەکێتی زانایانی ئیعجاز لە جیهان دا دەڵێ : (اولم یروا انا نأتي الارض ننقص من اطرافها ؟) [1] واتە : ئەوە نابینن ئێمە دێین زەوی لە تەنیشتەکانی کەم دەکەینەوە ؟!

لێرەدا دەتوانین سێ مانای زانستی گەورە لەم ئایەتە دا بخەینە بەرچاو : یەك لەوانە : (هەندێ لە جەمسەرەکانەوە تەپیوەو لە هێڵی یەکساندا هەندێ دەرپەڕیوو قۆقزە : نیوتن سەلماندی گۆی زەوی تەواونییە ، چونکە ماددەی زەوی نەك هەر بەردەو چەق هێزی کێشکردن (الجاذبية) کاری تێدەکات، بەڵکو هێزی پاڵنەری چەق (القوة الطاردة المركزية) یش کاری تێ دەکات، لە ئاکامی سورانەوەی زەوی بە دەوری تەوەر –المحور- ی خۆیدا پەیدا دەبێت، ئەمەش دەرچونەکی کەمی لە زەوی دا پەیداکرد، بەڵام لە هێڵی یەکساندا –الخط الاستواء- بەردەوامە، تا ئەو پەر یەکەی هێزی پاڵنەری چەق زیاد دەکات، لەبەرامبەر ئەم دەرچون وقۆقزبوونە (الانبعاج) دا لە هێڵی یەکساندا تەخت بوون و تەپین (التفلطح) لە هەردوو جەمسەرەکاندا پەیدا دەکات، هێزی کێشکردن کەم دەکات، ناوچەی جەمسەری باکور زۆر تەخت ترە لە جەمسەری باشور .

ناوەراستی تیرەی هێڵی یەکسانی زەوی (١٢٨٥٦,٣) کم و نیوەتیرەی جەمسەرەکانی (١٢٧١٣,٣) کم جیاوازیان (٤٢,٧) کم ، ئەم تەپینە (التفلطح) (٣٣٪) ی نیوە تیرەی زەوی یە، ئەم کردارەش هێواشە، هەر هەزارساڵێ یەك سانتیمەترە، ئەمە یەکێکە لە کردارەکانی کەمکردنەوە لە لایەکانی زەمین) . [2]

---

(1) الرعد /٤١ .

(2) الارض في القرآن الكريم/د.زغلول/ل :١٥٨-١٥٩ .



## ٦- تیرەی زەوی و بوونەوەر :

﴿يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانفُذُوا﴾. الرحمن/٣٣ .




واتە : ئەی کۆمەڵەی ئەجنەو مرۆڤ گەر بتانەوێ لە هەرێمەکانی ئاسمانەکان وزەوی بڕۆن وبچن . وشەی (الاقطار) لە (تفسير الجلالين) دا بە (النواحي) ماناکراوە، وەلە (مفردات الراغب) دا بە (الجانب) کە تاکەکەی القطر)ە ، (هەروەها (قطر) بە تیرە دەوترێ، تیرەی هەر شێوەو تەنێ ئەو هێڵەیە کە لە یەکێ لە سەرەکانەوە رەت دەبێ بۆ سەرەکەی تر بە چەقی تەنەکەدا) . وەکو لە (کەمال نامە/کمال جلال غريب) و (الارض النجار) دا هاتووە.. [1] لێرەدا یەکێ لە ماناکانی (الاقطار) تیرەکانە، کە زەوی وئاسمان هەیەتی، لێرەدا بۆیە بە کۆ هاتووە چونکە زەوی وئاسمان هەریەك تیرەی نییە بەڵکو چەند تیرەیەکیان هەیە .

## لەڕووی زانستیەوە :

زەوی تیرەکانی لەمیان (١٢٧٥٦) کم دایە بە گوێرەی ناوەراستی تیرەی هێڵی یەکسانی و(١٢٧١٣) کم بە گوێرەی ناوەراستی تیرەی جەمسەریەکەین چونکە زەوی بە تەواوی خرنییە

(١) الارض/د.النجار ل :٣٣٩ . .




چونکە لە هێلی یەکساندا هەندێ دەرچووەو لە هەردوو جەمسەردا تەپیوە) وەکو باسکرا.

هەروەها دوور نیە زەویش چەقی ئاسمان بێت، چونکە وەکو (د.زغلول) باس دەکات ناوەراستی گەردون کوێیە ؟ ! هزری زانایانی بە درێژایی مێژوو واق ورماندووە و تا ئێستا زانستی نوێ و تەکنەلۆجیای پێشکەوتوو نەیتوانیوە پەی پێ ببات، وەچەند فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) پشتگیری لەوە دەکات کە زەوی یان مەجەرەکەمان چەقی بونەوەر بێ، یان زەوی چەقی مەجەرەکەمان بێت، وەکو :(یا اهل مكة انكم بحذاء وسط السماء) . رواه البيهقي . واتە ئەی خەلکی مەککە ئێوە لەبەرامبەر ناوەراستی ئاسماندان .

وە قورئان ئاماژە دەکات ئاسمان تیرەی هەیە، بۆ نمونە مەجەرەی خۆمان کاکێشان تیرەکەی بە ۹۰۰۱۰ هەزار سالی تیشکی پتر دەقرسێندرێت، مەجەرەی (ئەندرومیدا) تیرەی نزیکەی سێ نەوەندەی تیرەی کاکێشانەو نزیکەی (۲) ملیۆن سالی تیشکی لێمان دوورە . هەر مەجەرەیەك کە ژمارەیان بە (۱۰۰) هەزار ملیۆن زیاتر دەقرسێندرێ زیاتر لە (۱۰۰) هەزار ملیۆن ئەستێرەی تێدایە . بروانە چەند تیرەو کێش وچریەکی زەوی و روبەرەکەی :

١- قەبارەی نیوەتیرەی جەمسەری :(٦٣٥٧) کم .

٢- قەبارەی نیوەتیرەی هێلی یەکسان :(٦٣٧٨) کم .

٣- قەبارەی مامناوەندی نیوە تیرەی زەوی : (٦٣٧١) کم .

٤- قەبارەی چوارچێوەی جەمسەری :(٤٠,٠٠٩) کم .

٥- قەبارەی چوارچێوەی هێلی یەکسان : ٤٠,٠٧٧) کم .

٦- قەبارەی گشتی زەوی : (١,٠٨ * ١٠ ^٨ کم^٣) .

٧- قەبارەی رووی ئاوی : (١,٣٧٠ * ١٠^٦ کم^٣) .

٨- قەبارەی توێکلی زەوی : (٦,٢١٠ * ١٠^٦ کم) .

٩- قەبارەی توێکلی قەپاغی زەوی : (٨٩٨,٠٠٠) کم^٣ .

١٠- قەبارەی ناخی زەوی :(١٧٥,٥٠٠ * ١٠^٦ کم^٣ ) .

١١- چری زەوی بەپێی ئاو : مامناوەندەکەی (٥,٥٢) ، چری توێکلەکەی (٢,٨٥) .

چڕی توێکڵی قەپاغی زەوی : (٤,٥٣) . چڕی ناوجەرگەکەی : (١٠,٧٠) یە .

١٢- ڕووبەری سەر ڕووی زەوی : (٥١٠ * $١٠^{٦}$ کم$^{٢}$) .

١٣- ڕووبەری وشکانیەکەی : (٢٢,٢٩٪) واتە ك (١٤٩ * $١٠^{٦}$ کم$^{٢}$) .

١٤- ڕووبەری ئاوەکەی : (٧٠,٧٨٪) واتە : (٣٦١ * $١٠^{٦}$) کم$^{٢}$ .

١٥- بەرزترین بەشی زەوی لوتکە ئیڤێریستە (٨٨٤٨م) .

قوڵترین شوێنی ئاوی لە (خانق ماریانا) یە (١١٠٣) .

ناوەڕاستی بەرزی وشکانی (٨٤٠م) .

ناوەڕاستی قوڵایی زەریاکان (٣,٨٠٨ م) . (١)

**تیرەی (الاقطار) هەسارەکانی خۆر بە میل :**

**١- عەتارد ٣١٢٥**

**٢- زوهرە ٧٦٠٠**

**٣- زەوی ٧٩٢٧**

**٤- مەریخ ٤٢٠٠**

**٥- موشتەری ٨٨٧٠٠**

**٦- زوحەل ٧٥١٠٠**

**٧- ئۆرانۆس ٢٠٩٠٠**

**٨- نیبتۆن ٣٣٠٠٠**

**٩- پلۆتۆ ٣٦٠٠**

ئەنجا کۆمەڵە ئەستێرەکان پێیان دەوترێ هێشوەکان (العناقید) وەکو چۆن مەجەڕەکان هێشویان هەیە وەکو لە گەردونناسیدا باسمان کرد، ئەم هێشوانە دوو بەشن : هێشوی کراوەو هێشوی داخراو، هەندێ جار ئەم هێشوانە چەند ئەستێرەیەك یان چەند سەد ئەستێرەیەك دەگرێتەوە، هێشوو هەیە تیرەکەی (٢٠) سالیس تیشکی یە ، لەناو مەجەڕەی خۆماندا زۆر

---

(١) بڕوانە : الموسوعة العلمية في اعجاز القرآن الكريم والسنة النبوية/ د.هاني بن مرعي القيسي / ل ك٤٧٠-٤٧٢ .

هێشور هەیە وەکو پەروین (الثریا) لە کۆمەڵەی (گا) دا، هیادیس (القلائص) هەر لە گا دا (الثور) کە (١٣٠) ساڵی تیشکی لێمان دوورە، جوانترین هێشو (m٣) لە ناو گومەزی ئاسماندا کە شۆخی و نیگارەکی جوان وسەرنج راکێش بە ئاسمان دەدات بۆ خولیاکان وشاعیران و خواناسان نزیکەی (٣٠٠٠٠)

ئەستێرەی تێدایە و (٤٦٠٠٠) ساڵی تیشکی دوورە (١ساڵی تیشکی = ١٠ملیۆن ملیۆن کم) .[1]

گەر ئێمە سەیری تیرەکانی ئەستێرەکان بکەین لەناو ئەستێرەکاندا کە هەریەکەیان ئاسمانێکن ودونیایەکی سەربەخۆن زیاتر شکۆو موعجیزەی ئە ئایەتەت بۆ دەردەکەوێت : ﴿اقطار السموات والارض﴾ بۆ نموونە : سەروی زەبەلاحە گەورەکانمان (فوق العمالقة) هەیە کە تیرەیان سەدان ملیۆن بۆ هەزاران ملیۆن کم دەبێت چەند سەدجاریّ لە تیرەی خۆر زلتر دەبێت ، (ئەلفای راوچی ـ ابط الجوزاء) تیرەکەی (٤٠٠) ملیۆن کم، واتە : (٣٠٠) ئەوەندەی تیرەی خۆرە، (ئەلفای دوپشك ـ الفا العقرب) هەیە تیرەکەی (٥٦٣) ملیۆن کم و (٤٠٠) ئەوەندەی تیرەی خۆرە، (ئەلفای هیرقل ـ رأس الجاثي) هەیە، کە بە گەورەترین ئەستێرەی ناسراو زانزاوە، تیرەکەی (٤٥) بلیۆن کم (٣٠) هەزار ئەوەندەی تیرەی خۆرە و جێگای (٣٠) ملیۆن خۆری تێدا دەبێتەوە .[2] کۆمەڵەی خۆرمان تیرەکەی (١١) سەعات ساڵی تیشکی یە، لەناو مەجەرەی کاکێشاندا، لەلایەك (٣٠) هەزار ساڵی تیشکی و لە لاکەی ترەوە (٢٠) هەزار ساڵی تیشکی لە چەقەکەی دوورە.

گەر مرۆڤ بە خێرایی تیشکی بە کەشتی یە ئاسمانیەکەی بروات کە (٣٠٠) هەزار کم لە چرکەیەکداو بیەوێ لە تیرەی کاکێشان دەربچێت پێویستی بە (٢٠) هەزار ساڵی تیشکی یە ! ئایا مرۆڤ قەت ئەمەی لە دەست دێت وئەم رۆژە بە چاوی خۆی دەبینێت، لە کاتیّ دا جنۆکەکان ئەمە ناتوانن؟! خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ﴾ ! مرۆڤ تەنیا لە رێگای

---

(١) ئەم زانستانە لە (دلیل السماء والنجوم)/د. عبدالرحیم بدر/وەرگیراوە .

(٢) الکون العمیق / د. علی الامیر/ ل : ٢٥٨ سەیریکە .

خێرایی گیانەوە (ئەتیر) دەتوانێ ئەم هەموو دووریانە ببرێت، ئەمەش لە جیهانی خەون وئیلهامدا دێتەدی، زۆر لە عاریفەکان باسیان لە گەشتە روحانیەکانیان دەکەن بۆ دەرەوەی دونیای ماددی و دونیاکانی تری دەرەوە، وەکو (ابن قضیب) لە (المواقف الا لهية) وەکو لە کتێبی (الانسان الكامل في الاسلام/ د. عبدالرحمن البدوي) دا هاتووە، وەکو (ابن عربي) لە (كتاب الاسراء الى مقام الاسرى) دا .

پێشەوا عەلی (ر.ع) دەفەرموێ وەکو (ابن القيم) لە (الروح / ل : ٥٤) دا گێڕایەوە لە (ابن مندة)وە : (مامن عبد ينام يمتلئ نوما الا عرج بروحه الى العرش، فالذي لا يستيقظ دون العرش فتلك الرؤيا التي تصدق ، والذي يستيقظ دون العرش فهي التي تكذب) .

واتە : هەر بەندەیەك خەوت مسۆگەر گیانی بەرزدەکرێتەوە بەرەو عەرش، هەرکەسێ روحی بگاتە عەرش خەون وبینینەکانی راستن، گەر نەیتوانی بگاتە عەرش ئەو خەون وبینینانە راست دەرناچن ، بەڵێ مرۆڤ جگە لەم لەشە جەستەی گیانیشی هەیە و هەستی نا ئاسایی هەیە وەکو (ج.ا.ج.رایز) دەڵێ : (ئەم هەستە نائاساییانە بە سنوری زەمان ومەکان دیاری ناکرێن، کە دوو دیاردەی فیزیایین، بەڵکو دەردەچن تا کار لە نموونەی تربکەن کە لە دەرەوەی نموونەی ئەم بازنانەوە هەیە خۆمان هەمانەو وابەستەیە بە تەقس ئەم نموونانەی ترەوە لە جیهانی دەرەکیدا) .[1] {(توماس یۆنگ) سالی (١٨٠٤) رایگەیاند رووناکی تەوژمێ نییە لە چەند گەردێکی رووناك بەڵکو جولەیەکە لە ناو ناوەندێکی دا ناسراو بە ناوەندی ئەتیری، پاشان توێژینەوەکان لە لایەن (فریزل) و(فارادای) و (ماکسویل) راستی ئەوەی چەسپاند} .[2] بەرزترین نموونەمان لە قورئان وسوننەتدا میعراجی پێغەمبەرە (ﷺ) کاتێ توانی بە (بوراق) بگاتە (سدرة المنتهى) و تیرەی ماددی وگیانی لە ماوەیەکی زۆر کەمدا ببرێت : ﴿وَالنَّجْمِ إِذَا هَوَى........ مِنْ آيَاتِ رَبِّهِ الْكُبْرَى﴾ .[3]

---

(1) عصر الخوارق/ج.ا.ج.رايز/ ل :٣١ .

(2) ....................../ ل :٥٧ .

(3) النجم/ ١-١٨.



بێگومان تیرەی ئاسمانی بینراوی دونیا بە (٢٠) بلیۆن سالّی تیشکی قەرسێندراوە، ئەمانەش چەند راستیەکن مرۆڤ بە هەموو دەسکەوتە زانستیەکانەوە لەبەردەم دووریە سەرسورهێنەرەکانی بوونەودر بچووك دەکاتەوە[1] ! بۆ ئاگاداری ئەم فەرمایشتە لە راست مەجەڕەگوایە (لعاب حیة تحت العرش) واتە لیکی مارێکە لە ژێر عەرشدا ئەمە فەرمایشتەکی درۆیە .[2]

## ٧- مانایەکی (فج عمیق) !

﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ .[3] واتە : جاربدە بۆ خەلّکی بە حەج(ئەی ئیبراهیم) خەلّکی تا بە پیادەو سواری ولآخی لەڕ لە هەر ڕێگایەکی دوور (قول)ەوە. لێرەدا سێ موعجیزەی زانستی دەبینین بەلّگەن لەسەر زانست وتوانای خوای زاناو چەند بەلّگەیەکی یەکلاکەرەوەن هەموو روناکبیرێ بەرەو بڕوابوون بە کردگاری مەزن دەبەن :

١- چۆن ئیبراهیم بێ ئامێرێکی پەیوەندی وەکو تەلەفۆن ومۆبایل دەزگاکانی تری پەیوەندی جاڕی حەج کردنی بە هەموو جیهان و هەموو گەلان وهەموو زمان و رەنگەکان دەگات ؟!

٢- مێژوو دەری دەخات کە هەموو گەلان بەر لە ئیسلام حەجیان کردووە.

٣- بۆچی قورئان وشەی (فج عمیق) ی بەکارهێناوە نەك (فج بعید) ؟

### ( وەلآمی زانستی نوێ )

١- دیارە ئەم جاڕەی ئیبراهیم بۆ هەموو جیهان وگەیشتنی دەنگی ئەو بە دلّانی مەردوم بە هەموو زمان و رەنگێ پێی دەوترێ موعجیزە، کە کەس ناتوانێ خۆی لە قەرە بدات و بۆی

---

( [1]) الارض في القرآن الكريم/ د. زغلول/ ل ك٣٤٥ سميريكه .

( [2]) البداية والنهاية /ابن كثير/ ج١/ ل :٤٢ .

( [3]) الحج / ٢٧ .





دووباره بێتەوە، بۆ ئەولیایان کەرامەتە، وەکو نموونەی (یاسارية الجبل الجبل) ی حەزرەتی عومەر (ر.ع) کە ئەو لە مەدینەیەو ساریە لە ئێرانە و گوێی لێ دەبێت، لە راڤەی زانستی میتافیزیکی دا باس لە (تلباتی ـ تخاطر الفكري) دەکرێ ئیمڕۆ زانست وجیهان زۆر گرنگی پێ دەدات و زۆر تاقیکردنەوەی سەرکەوتووی لەسەر کراوە، لە رێگای خەواندنی موگناتیسیەوە کە مرۆڤ دەکەوێتە حالەتی نەست (اللاشعور) ەوە، دیارە مرۆڤ وەکو تەلەفۆن دەزگای رەوانەکەری (الارسال) و دەزگای وەرگر (الاستلام) ی هەیە، بەلاّم لێرەدا شەپۆلی رادیۆیی ومایکرۆفۆنی ورادار یان تەلەفزیۆنی بە کارنایەت کە خێرایی یان (٣٠٠) هەزار کم/چ، بەلکو شەپۆلی ئەتیر بە کاردێ لە بازنەی کۆتی فیزیایی ماددی دەرواتە دەرەوە. لێرەدا یەك بەلگەی زانایەکی هەرە گەورەی جیهانی فیزیایی (ارثر کویستلر) ە کە لە (جذور المصادفة) دا دەنوسێ بە نموونە وەردەگرین : (لەسالّی ١٩١٦ دا بیجترۆف ـ هاورێ یەکی بافلۆف بە چەند تاقیکردنەوەیەك لە راست پەی پێ بردنی هەستی سەدو ـ ادراك الحس الفائق - هەلّساو ناوی نا (تیشکی زیندەوەری) تا ئەو کارەی دەیکات وەکو راز بیهێلّێتەوە، بەلاّم لە شەستەکاندا گۆرانی بەسەر داهات، کاتێ یەکێ لە قوتابیانی بیجترۆف کە دەرون زان بوو لە بواری خەواندنی موگناتیسی دا لەفاسیلیف لە زانکۆی لینینگراد دا، رایگەیاند ئەوانەی خەواندبوونی بە هیپنۆتیزم بە هۆی فەرمان کردن لە دوورەوە لە رێگای تلباتی یەوە بێداری کردوونەوە، وە ئیحای پێ داون دوای ئەوەی وەستاون بکەون بەسەر دەم وچاویاندا) . [1] بەلێ ئەم ئامێرە پێی دەوترێ هالەی موگناتیسی کاری نائاسایی وەکو تلباتی ئەنجام دەدات، کە (فیراسة) ی بروادارانە : (اتقوا فراسة المؤمن فانة ينظر بنور الله) . [2] واتە : خۆت لە دوور بینی بڕوادار بپارێزە ئەو بە رووناکی وهالەی خوا دەبینێت ئەم دیاردەیە وەکو (سیرئەلیفەرلودج) و (فونك) و (ولیام کروکس) باسیان کردووە بە ئامێری بێ تەل دەچێت کە شەپۆلی (ئەتیر) بەکار دێنێت . (ولیام کروکس) دەلێ : بیر

---

( ١) جذور المصادفة/ ارثر كويستلر/ ت : فوزية ناجي/ م د ك قدامة الملاح / ل :١٤ ..

( ٢) رواه الترمذي والطبراني .



ـەر;نەر دەنێرێت لە مێشکی رەوانەکەرداو مێشکی وەرگر وەریان دەگرێت .[١]

٢- بەلێ عەرەب وکوردو فارس وزەردەشتی وسابیئەو هیندەکان هەموویان سەردانی کەعبەیان کردووەو بە دوای جاردانەکەی ئیبراهیمەوە چوون دوای ئەوەی دلاَنی بروادار لە جیهانی حەون وئیلهامدا وەریان گرتووە، عەرەب لە دورگەی عەرەبیەوە چوون هیندەکان چوون و وایان ـیوە گیانی (شنوە) لە کاتێ دا لەگەلّ خێزانی چووەتە مەککە (مەکشیشا) چووەتە بەر بەردە ـشەکەوە، فارسەکان چوون و وایان زانیوە گیانی هورمزان چۆتە بەر کەعبە، بەلاَم هەرچی مەسعودیە دەلێ : بۆیە فارسەکان چوون بۆ حەج چونکە ئیبراهیمیان بە باپیرەی خۆیان زانیوە. لە معجم البلدان) ی (یاقوت الحموی) دا هاتووە (ساسان) چووەتە کەعبەو تەوافی کردووە .[٢] وەکو (شوکرالله بابان) باسی کردووە (ساسان) و ساسانیەکان بە رەگەز کوردبوون و دوا حوکمی ئێرانیان کردووە .[٣] کە خۆیان بە نەژادی ئیبراهیم زانیوە بۆیە حەجیان کردووە[٤].

٣- زانایان دەلێن بۆیە قورئان وشەی (عمیق) ی بەکارهێناوە واتە : رێگایەکی قولّ نەك بعید) واتە دوور، چونکە ئاماژەیە بۆ خڕی وگۆیی زەوی چونکە هێلەکانی زەوی راستەوانە نین ەکو چەماوەین، هێلی چەماوەش پێویستی بە دووری سێ یەمو رووبەری قولّی هەیە، بۆیە پەروەردگارمان ئاماژەی کردووە کە ئەو زەویەی ئێمە لەسەری دەژین خڕەو گۆیی یە .[٥]

---

( ) التنويم المغناتيسي/ محمود سعيد/ ل :١١ ـ ١٢ ـ سەیریکە .

( ) تاريخ الكعبة/ د. علي حسني الخربوطلي/ ل : ٢٦-٢٧ بە کورت کردنەوە .

( ) مێژووی کوردستان/ شوکروڵای بابان/ ل ك٦٣ .

(٤) بڕوانە (تاريخ الطبري/ ج٢/٨١٧ساسانیەکان کوردن

( ) آيات الله في الافاق/الاستاذ الدكتور.محمد راتب النابلوسي/ل :١٢١ .

## ٨- مەبەست لە نزمترین خاك ( ادنى الارض ) چی یە ؟

﴿غُلِبَتِ الرُّومُ فِي أَدْنَى الْأَرْضِ وَهُم مِّن بَعْدِ غَلَبِهِمْ سَيَغْلِبُونَ فِي بِضْعِ سِنِينَ لِلَّهِ الْأَمْرُ مِن قَبْلُ وَمِن بَعْدُ وَيَوْمَئِذٍ يَفْرَحُ الْمُؤْمِنُونَ بِنَصْرِ اللَّهِ...﴾ .(1)



واتــە: (رۆمــەكان لــە نــزمترین زەوی دا ســەرنەكەوتن و ئــەوان دوای ســەرنەكەوتن سەردەكەونەوە، چەند ساڵێ دەبات، فەرمان بۆ خوایە بەرلە مەو دوای ئەمە، ئەو رۆژە بـرواداران دڵخۆش دەبن بە سەركەوتنی خودا)، لێرەدا چەند ئیعجازەكی زانستی پیشان دەدات :

١- مێژووی جەنگی دوو ئیمپراتۆری گەورە رۆم وفاس، كە رۆم ئەوروپای ئیمرۆیە لە شامدا .

٢- پێشبینی دەكات (١٠) ساڵ نابات جارەكی تر رۆم وفارس بـە شـەڕ دێنــەوە ئـەو جـارە رۆم سەردەكەون ، كە بە قازانجی بڕواداران تەواو دەبێتن، چونكە هەردوو لا یەكتری بێ هێـز دەكـەن و زەمینە خۆش دەبێ لە داهاتوودا بۆ غەزاكانی ئیسلام بۆ وڵاتانی ژێـر دەسـتەكانی ئـەوان وەكـو كوردو فارس وعەرەب و هیتر رزگاریان بێت .

٣- مێژووش خۆی دووبارە دەكاتەوە، ئەوەتا ئیمرۆ لە ساحەی سیاسیدا ئـەم دووبـارە بوونەوەیـە

---

(1) الروم / ٢-٥ .





ـەرەتاکانی دیارە، فەرمودەش زۆرە لەسەر جەنگی رۆمەکان وموسلمانان لە داهاتوودا .[1]

- ئاماژەیەکی جیۆلۆجی وجوگرافی تێدایە، بۆ ناوچەی (دەریای مردوو) کە نزمترین جێگایـە لـە زەوی دا لە ئاستی رووی دەریاوە .

## راڤەی زانستی :

١- پروفیسۆر (وحید الدین خان) دەڵێ : (لایەنی دووەم لـە مـەزنی قورئـانی پـیرۆزدا لـە پێشبینیە جیاجیا کانی دا رەنگ دەداتەوە کە راستیەکەی لە دواییدا بە چەند رێگایەکی جیاجیا دێتەدی، خەلکانەکی زۆر لە زیرەکان و بلیمەتان ئەو غیرەتە گرتنی کە پێشبینی بۆ خۆیان یان بۆ غەیری خۆیان بکەن، بەلاّم رۆژگار بە هیچ شـێوەیەك راسـتی ئـەم پێـشبینیانەی نەهێنایـە دی، بەلکو بە توندی بە درۆی خستنەوە) .

(ناپلیۆن لە پاریس کە گەورەترین سەرلەشکری ئـەو چـاخەبوو داگیرکاریـەکانی سـەرەتایی ئەوەی پیشان دەدا داهاتوو دەبێتـە هاوشـانی قەیـسەرو ئەسـکەندەری مەقـدونی، تـا ئـەوەبوو ئەوەندە بروای بەسەرکەوتنی خۆی هەبوو لوت بەرزی گرتی وراوێـژکارانی دەرکـردن، بانگەشـەی دەکرد ئەو سەرکەوتنی بۆ نوسراوە بەسـەر زەوی دا، کەچـی لـە سـاڵی (١٨١٥) دا زۆری ئـەبرد لەگەڵ سوپایە گەورەکەیدا کـاتێ لەگـەڵ (دوق ولنجتـون) دا بـەرەو روو بـۆوە (٦) رۆژی ئـەبرد گەورەترین شکەستی بە سوپای ناپلیۆن هێنا) .

(بەیانی حیزبی شیوعی لە سالی (١٨٤٩ ئەوەی پێشبینی کرد یەکـەم ولاّت کـە شۆرشـی شیوعی یەت پێشرەوی دەکات (ئەلمانیا) یە، سەدوبیست سال رابرد بەسـەر ئـەم پێـشبینی یـەدا کەچی ئەم ولاّتە خالّی بۆ لە سەرهەلّدانی ئەم جۆرە شۆرشانە . (کارل مارکس) لەسالّی (١٨٤٩) وتی : (کۆماری سور لە ئاسمانی پاریـسدا دەردەکـەوێت) کەچـی تـا ئێـستا ئـەم پێـشبینی یـە نەهاتۆتەدی. (ئەدۆلف هیتلەر) خاوەنی کتێبی (کفاحی - خەباتی من) لە وتارە ناودارەکەیدا لە

---

[1] ستقاتلون جزيرة العرب فيفتح الله، ثم تقاتلون الروم فيفتح الله، ثـم تقـاتلون الـدجال فيفـتح الله) رواه مـسلم وابـن ماجة .

میونیخ (مارس ١٩٣١) دا وتی : (من بە ڕێگای خۆمدا دەڕۆم وتەواوی متمانەم بە خۆیە کە سەرکەوتنم لە چارە نوسراوە) کەچی هەموومان دەزانین خراپترین شکان بەسەر ئەم جەنەراڵە مەزنە ئەڵمانیە داهات)[1] یان دوور نەڕۆین سەددام خۆی بە (منصوربالله) دەزانی ولە بەرنامەو بروای دابوو هەموو نیشتمانی عەرەبی وئێران و ولاتانی دەوروبەری بداتە بەر خۆی، جەنگی ئێران وکەنداو شاهیدی ئەوەبوو، کەچی لە بەرامبەر ئێراندا و لە بەرامبەر هاوپەیمانانـدا گەورەترین شکەستی هێناو خۆشی خستە ژێر پەتی سێدارەوە.

بەڵام قورئان پێشبینی یەکەی وەکو دوخێ هاتەدی، کاتێ پێشبینی کرد بە سەرکەوتنی ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا لە جەنگی داهاتوودا، کەچی ئەمە لە عەقلی کەسدا نەبووەن وەکو (جبن) لە راست ئەم پێشبینی یە دەڵێ (لەکاتێ قورئان ئەم پێشبینی یەی کرد، زۆر دوور بوو لە ڕێتێ چوون،چونکە ئەو دوانزە ساڵەی حکومەتی هیرقل ڕێگای دەدا بە کۆتایی هێنانی ئیمراتۆریەتی ڕۆمانی) .

بەڵێ فەرمانی خوا هاتەدی کاتێ فارسەکان بەسەر ڕۆمدا سەرکەوتن دەستیان کێشا بەسەرتەواوی ناوچەکان ی خۆرهەڵاتی ڕۆمدا، کەچی دوای ئەوە هیرقل سێ جەنگی ئری کرد لە ساڵی (٦٢٣- ٦٢٤ – ٦٢٥ ز) دا توانی خاکی میزۆپۆتامیا بگرێ لە ڕێگای دەریای رەشەوە فارسەکان ناچاربوون لە تەواوی خاکی ژێر دەسەڵاتی ڕۆمەکاندا پاشەکشە بکەنن دوا جەنگی **چارەنوس ساز لە نەینەوا کرا لەسەر کەناری دیجلە (٦٢٧ ز) .**[2]

**٣- دوای ئەوەی قورئان پێشبینی یەکی غەیبی دەکات ئیعجازەکی جیۆلۆجی دەخاتە گەڵ، تا ببێ بە ئەدگارێ بۆ جیاکردنەوەی پەیامی خوا لە کەرامەتی ئەولیاکان وپێشبینی پێشبینی کەران ئەویش ئەوەیە : (غلبت الروم في ادنى الارض) . لێرەدا (دنى) لە (مفردات الراغب) دا بە (الاقرب) ماناکراوە، لای موفەسیرانی کۆن وەکو (الجلالين) ئاوا ماناکراوە(نزیکترین خاکی ڕۆم لە جەزیرەدا بۆ فارس هەردوو سوپا تێك هەڵچوون) لە (تفسیر**

---

([1]) الاسلام يتحدى/ وحيد الدين خان/ ل :١٢٧-١٢٨ بە کورت کردنەوە .

([2]) الاسلام يتحدى/ ل :١٣٥-١٣٧ بە کورت کردنەوە و دەسکاریەوە .




ـضري) دا هاتووە (نزیکترین خاکی شام لە خاکی فارس) .

(د.زغلول النجار) دەڵێ : (بەڵام توێژینەوە نوێ یەکان دەریـان خـستووە ناوچـەی دەریـای مردوون سەرباری ئەوە نزیکترین جێگایە لە دوورگەی عەرەبی کە رۆم داگیری کردووە، لە هەموو وشکانیەکیش نزمترە، (٤٠٠) م لە ئاستی رووی دەریاوە نزمە، ئەم ناوچـەیە جێگـای سـەرەکی کێشەی نێوان رۆم وفارس بووە، ئەم جەنگە یەك لاکراوەیە کە سوپای فارس بەسەر سوپای رۆمای خۆرهەڵاتی بیزنتی دا سەرکەوت دەبێ لە دەریای مردوو بووبێ، لەگـەڵ ئەوەشـدا (ادنـی الارض) مانای نزیکترین شوێن لە دورگەدا دەگەیـەنێ، ماناشـی وایـە لـە هـەموو ناوچـە وشـکانیەکان نزمترە، ئەم ئاماژە قورئانیە پێش دۆزینەوی زانستی کەوتووە، چونکە کەس لە کـاتی دابـەزینی سروشتی قورئاندا ئەمەی نەزانیوە، تاچەند سەدەیەکی زۆریش دوای ئەوە) [1]

کەواتە وشەی (ادنی) بە مانای (اقرب) دێ واتە نزیکترینو بە مانای (الاخفض) دێ، واتـە نزمترین شوێنی دەریای مردوو، لە فەلەستین وەکو مانگە دەستکردەکان تۆماریـان کـردووە . [2]

لە (موسوعة البريطانية) دا هاتووە لەسەر (دەریـای مـردوو) : دەریـای مـردوو پەڵـە خوێیـەکی داخراوە لە نێوان فەلەستین وئەردەن داو نزمترین شوێنی ئاویە لە زەوی دا، نزمی یەکەی نزیکـەی (٤٠٠ م) لە ئاستی رووی دەریاوە . [3]

(د. الشيخ عبدالمجيد الزنداني) گێراویەوە لە (وغـدا عـصر الايمـان) دا : لەگـەڵ یـەکێ لـە مامۆستایانی جیۆلۆجیدا لە ئەمریکادا بە ناوی پرۆفیسۆر (بالما) دا دیداری یەکترمان کـردن کـە لە گەورە زانایانی جیۆلۆجی ئەمریکا بوو، ئەو بەسەر دانێ هات نموونەیەکی گۆی زەوی پێ بـوو، بەرزو نزمایی یەکان وقوڵایی دەریاکان و چەندە بەرزن وچەندە قوڵن هـەموو ئـەو بـەرزو نزمـایی یانەی تێدا

ابوو بە مەترەکی نوسراو، کـاتێ دانیـشت وتم، ئێمـە دەسـتەواژەیەکی قورئانیمـان هەیـە

(1) الارض في القرآن الكريم/ ل:٢٨٤ .

(2) الموسوعة الكونية الكبرى/ ج٦/ د. ماهر احمد الصوفي/ ل : ٢٩٩ .

(3) ......................./ ل :٢٨٩ .




دەفەرموێ : ناوچەیەك لە قودس هەیە كە جەنگی تێدا قەوماوە نزمترین شوێنە لە جیهان دا لە وشەی (ادنی الارض) دا، (ادنی) بە مانای (الاقرب) یان (الاخفض) دێ ، وتی: ئەڵلا لە قورئاندا باس لە جەنگی نێوان فارس وڕۆم دەكات كە لە (نزمترین خاكدا) روویداوە ؟ وتم : بەڵێ : دڵنیام لەوەی دەیلێم .... ئەم گۆی زەوییە كە بەرزایی ونزمایی یەكانی تێدابوو بە خێرایی خولاندیەوە كاتێ خستیە سەر قودس ودەڤەری دەوری، بینی تیرەكی درێژ بۆ ناوچەكە كراوەو بە روونی نوسراوە نزمترین ناوچەی جیهان! كاتێ بینی وتی : راستە قسەكەت وایە ئەمە نزمترین ناوچەی جیهانە، ئەم قورئانە خوای گەورە ناردوویەتی كە ئاگادارە بە هەموو شتێك) . [1]

(وە قولایی حەوزی باشوری ئەم دەریایە _٦-٧ م) خەریكی وشك بوونە، زۆر لە مێژنییە وشكانی بووەو خەلكی لێ بووە، ئەم ناوچەیە لە دۆلی (عربە) وە تا دەریاچەی (تەبەریە) لە باكورەوە هەر لە كۆندا ئاوەدان بووە، ئەم دەریای مردووە لە نوسراوە كۆنەكانی مێژوودا بە (بحر سدوم) و (بحیرة لوط) و (بحیرة زعز) و (بحر عربة) و (بحر الاسفلت) و (البحر المیت) ناوی هاتووە ، چونكە خاكەكەی بەپیت ناسراوە، خەلكان لە عێراق ودورگەی عەرەبی یەوە چوون بۆ ئەوێ، هەروەها خەلكی شامیش، لەوانە گەلی لوت (برازای ئیبراهیم خلیل ـ د.خ) كە پێنج ناوچەی ئەوێ ئاوەدان دەكەنەوە (سدوم) و (عمورة) و (ادمة) و (سوبیح) و(زەغر) تاكۆتایی یەكانی سەدەی بیستەمی بەر لە زایین ژیانی تێدا پەرەسەندووە، بەلام خوای گەورە بە هۆی گوناهەكانیان بە سزایەكی توند هەر هەموان لە ناو دەبات و ناوچەكە وێران وخاپور دەكات وەكو قورئان دەفەرموێ : ﴿فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ﴾ .هود/٨٢ . واتە : كاتێ فەرمانی ئێمە هات سەرەو ژێرمان كرد و تاوێری سەنگلی كەوتووەسەریەكمان بەسەر داباراند، وەبەپێی توێژینەوە جیۆلۆجیەكانی ئەم دوابی یە ئەم تاوێرانەی دەریای مردوو ئاوەژو كراونەوە ،وەنەو دەریایە ناوچەیەكی زۆر گەرمایەو سەرچاوەو هەلمی كبریتی تێدا هەلدەقولێ، لە مێژ نییە بارستایی ئەسفلتی سەرئاو دەكەوت .

گوندی هود كە خاكی حەوزی باشوری دەریای مردووە كە بە فەرمانی كردگار ئاوەژو

---

(١) ................................../ ل :٢٩٢ .

کرێمی هیچ پەیوەنی بەو جموجۆڵە زەمینی یەوە نییە کە ئەو زەلکاوانەی پێك هێناوە، بەر لە ۲: ۲ سالدا، بەڵام دوای وێران بوونی بە سزای خوایی لە سورەکی بارانیدا ئەم ئاوە تاوانی گەلی وتی خاوێن کردەوەو داپۆشین و کردی بە حەوزی باشوری دەریای مردوو) کە ئێستاش خەریکە گۆڕێتەوە بە وشکانی) .[1]

(د.مصطفی محمود) دەلێ : (لێرەدا لوت رزگاربوونی نییە، ئەم کارەساتە سروشتی یە، ببێ نیوە رۆژێ دوربکەوێتەوەو بە موعجیزە رزگاری نابێت ودەبێت رابکات، خوا شەوی دانا بۆ کردن وبەیانی بۆ هاتنی سزا، ئەو کاتەش لوت ئەو ماوەیەی بڕی وە کە لەم بومەلەرزەیە دیارێ ببێتن دەبێ هەلاتوان سەیری دوای خۆیان نەکەن، چونکە بروسکەی گڕەکە داهاتوو ببێ وسۆمای چاویان دەبات ﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَامْضُواْ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾ . الحجر/٦٥ . زیاتر لەمەش توێژینەوەکان ئەوەیان پیشاندا ئەو کارلێك کردنانەی بەسەر خاکی هیرۆشیما داهات و پاشماوە بلوریەکانی کاتێ ئەمریکا بۆمبای ئەتۆمی پێکێشا بەو خاکەی دەچێ کە لە سەدوم عموره دا پاشماوەکانی بە جێهێشتووە، کە گەلی لوتی تێدا ژیاوەن لەراست ئەم بابەتە جوانە و ئەم راستیانەو هیتریش بیرتیژی نوێی ئیسلامی ئەندازیار (أحمد عبدالوهاب) لە کتێبی اساسیات العلوم الذرية الحديثة في التراث الاسلامي) کە بەم زوانە دەری کردووە گەشتەکی خۆشمان پێ دەکات لەم بارەوە، کتێبێکە شایانی خوێندنەوەیە) .[2]

---

(١) الارض في القرآن الكريم/ د.زغلول / ل :٢٨٨- ٢٨٩ بە کەمێ دەستکاریەوە .

(٢) القرآن كائن حي/ د.مصطفى محمود/ ل :٩٦/٩٧ .





**٩- هێزی کێشکردنی زەوی :**

**١٠- چەند سەرنجێ لە وشەی ( کفاتا ) و ( مهدا ـ مهادا ) :**



قورئانی مەزن دەفەرموێ : ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ كِفَاتًا أَحْيَاء وَأَمْوَاتًا﴾ ؟ المراسلات/ ٢٥-٢٦ . واتە : ئایا زەویمان نەکردووە بە کۆکەرەوەو راکێشەری زیندوان ومردوان؟! (الراغب) لە (مفردات) دا دەنوسێ : (الكفت : القبض والجمع) واتە : گرتن وکۆکردنەوە . وەدەلێ : (وتراویشە مردوان وزیندوان کۆدەکاتەوە وتراوە تەنە زیندوەکان وەکو مرۆڤ وگیانداران و رووەك، تەنە مردووەکان وەکو تەنە بێ گیانەکان ئاوو شتی تر کۆدەکاتەوە) وتراوە : {(كفت) : (اي الطيران السريع) — واتە : (کفت) : بە مانای فرینی خێرا دێت) . بەم پێیە (کفت) بە مانای (راکێشان وگرتن) دێ، هەم بە فرین دێ، واتە : زەوی بە ئاسماندا بە مردوو زیندووی سەری دەفرێت و دەخولێتەوە وەکو بالندە ! کە ئەمەش دوو ئیعجازی گەورەن بۆ قورئان لە چەرخی زانستی جیۆلۆجی نوێ ! وە (کِفّت) بە مانای مەنجەلی بچوك دێ وەکو لە (لسان العرب) دا هاتووە. یەکێ لە ئەدگارەکانی ئیعجازی قورئانی ئەوەیە زۆرجار لەیەك وشەدا چەندان موعجیزەی قورئان دەخوێنیەوە، بێ ئەوەی زیان لە ماناکەی تری بدات هەروەها لای (الراغب) بە (السوق شدید) لێ

خورینی توند دێت . حەزرەتی عەلی (علیه سلام) راستی فەرمووە : (ثم انزل الکتاب نورا، لا تطفأ مصابيحة، وسراجا لا يخبو توقده، وبحرا لا يدرك قعره، ومنها لا يضل نهجه، وشعاعا لا يظلم ضوء، وفرقانا لا يخمد برهانه، وتبيانا لاتهدم اركانة لا تخشى اسقامه، وعزا لا تهزم الضاره، وحقا لا تخذل اعوانه، فهو مصدر وبحبوحته، وينا بيع العلم ورياضة ورياضي العدل وغدرانه، واثا في الاسلام وبنيانة واوديه الحق وغيطانة، وبحرا لاينزفة المنزفون، وعيون لا ينضبها الماتحون، ومناهل لا يغيضا الواردون، ومنازل لايضل نهجا المسافرون، واعلان لا يعمى عنها الساهرون، واكام لا يجوز عنها القاصدون، جعله الله ريا لعطش العلماء وربيعا لقلوب الفقهاء، ومحاجا لطرق الصلحاء، ودواء ليس بعد داء ونورا ليس معة ظلمته، وحبلا وثيقا عروته ومعقلا منيعا ذروته، وعزا لمن تولاه ، وسلما لمن دخله، وهدى لمن انتم به، وغدرا لمن انتحله، وبرهانا لمن تكلم به، وشاهدا لمن خاصم به ..........) [1] واتە : پاشان خوا قورنانی نارد بە رووناکی قەت خامۆش نابێ، چرایەکە سوتەمەنیەکەی ناکوژێتەوە، دەریایەکە قولایی یەکەی نازانرێ، رێبازێکە رێرەوەکەی بزرناکرێ، تیشکێکە تاریك دا نایەتن لێك جیاکەرەوەی حەق وناحەقە بەلگەکانی کزنابن، چەند روون کەرەوەیەکە پایەکانی دانارمێن، چارەیەکە ترس بۆ نەخۆشەکانی نییە، پالپشتێکە قوتابیان ولایەنگرانی قەت تێ ناشکێن، حەقێکە هەلگرانی سەر شۆرنابن، چاوگ وسەرچاوەی بروایە، کانیاوو دەریای زانستە زەلکاوو گۆمی دادگەریە، سێ کوچکەو بینای ئیسلامەو، دۆل ونارامگای دادگەریە، دەریایەکە ئەوانەی دەیبەن وشکی ناکەن، سەرچاوەیەکە ئەوانەی هەلی دێنجن کەمی ناکەن، رووبارێکە ئەوانەی دێنە سەری کەمی ناکەنەوە، جێگایەکە گەشتیاران وکاروانەکانی بزی ناکەن، چەند نیشانەیەکە کۆچکەران ورەوەندەکان ونی ناکەن، تەپۆلکەو گردێکە ئەوانەی مەبەستیانە نایبرن، خوا کردوویەتی بە تێری بۆ تینوەتی زانایان، بەهارێکە بۆ دلی فەقیهەکان، شەقامێکە بۆ رێگای خوا ناسان، دەرمانێکە دوای ئەو دەرمانی ترنییە، رووناکیەکە تاریکی لەگەل دانییە، پەتەکی قایمە جێگایەکە لوتکەکەی قایمە، سەربلندیەکە بۆ کەسێ دەیکات بە پێشەوا، ئاشتی یە بۆ کەسێ برواتە ناوی، رێنومایە بۆ

---

( [1] ) نهج البلاغة/ الامام علي (عليه سلام) / تبويب د. صبحي صالح/ ل :٣١٥ .

کەسێ شوێنی بکەوێ، تکاکارە بۆ کەسێ هەڵی بژێرێ، بەڵگەیە بۆ کەسێ قسەی پێ بکات، شاهیدو گەواهی یە بۆ کەسێ دەبەرێکراچونی پێ بکات ....) .

وەقورنان لە زۆر ئایەتی تردا ئاماژە بە هێزی کێشکردن دەکات بۆ زەوی :

١- ﴿وَيُمْسِكُ السَّمَاء أَن تَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ إِلَّا بِإِذْنِهِ﴾ [1] واتە : خوا ئاسمان دەگرێ کە نەکەوێ بەسەر زەوی داو بە ویستی ئەونەبێت

٢- ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَن تَقُومَ السَّمَاء وَالْأَرْضُ بِأَمْرِهِ﴾ . [2] واتە : لە بەڵگەکانی خوا ئەوەیە ئاسمان و زەوی بە فەرمانی ئەو دەوەستێت . وشەی (قام) بە مانای هەڵسان، یان راوەستان دێت هەڵسان بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوا، وەستان لە ئاسماندا لە بۆشایی دا وەکو (د.محمد حسن الحمصي) لە (مفردات القرآن) دا ئاماژەی بۆ کردووە .

٣- قورئان زەوی بە (المهد ـ المهاد) ناودەبات بە دوو مانای سەرەکی دێت وەکو (د.زغلول النجار) ئاماژەی بۆ کردووە :

یەکەم / جێگاکە تەخت وخۆش کراوە . دووەم / بێشکەو لانکی منداڵ . ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ مَهْدًا﴾[3] . واتە : خوا ئەو خوایەیە زەوی بۆ کردون بە بێشکە . ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا﴾ [4] ، ئەوەتا خوا لە راست مەسیح (علیه السلام) دەفەرموێ : ﴿وَيُكَلِّمُ النَّاسَ فِي الْمَهْدِ﴾[5] ، واتە : لەسەر بێشکە قسەی دەکرد لەگەڵ خەڵکیدا .

سەیری بێشکە بکە یان لانکە لە کوردەواری خۆماندا، چۆن تەخت وخۆش کراوە، منداڵی تێدا بە دەست رازە توند قایم دەکرێ تا لە کاتی راژاندن وخۆ جولاندنی دا نەکەوێتە خوارەوە . بەڵێ : زەوی وەکو لانکەیە رادەژێ ودەجولێ ونێمە دەلاوێنێتەوە وەکو منداڵ، پاشان بە هێزی کێشکردن نێمەی بە ستۆتەوە بوار نادات لە کاتی جوڵەو راژاندنەکانی دا بکەوینە خوارەوەو

---

([1]) الحج/ ٦٥ .

([2]) الروم / ٢٥ .

([3]) طه / ٥٣

([4]) النباء / ٦ .

([5]) آل عمران / ٤٦ .




دەستی پەروەردگار کە فەرمانی ئەوە ڕێگا نادات.

پێشەوا (عەلی) کە پێغەمبەر (ﷺ) لەڕاستی دەفەرمێ: (انا مدينة العلم وعلي بابها)[1].
واتە: شاری زانستم عەلی دەرگایەتی.

ئەو -د- دەفەرمێ: (وانشأ الارض فامسكها من غير اشتغال، و ارساها على غير قرار، واقامها بغير قوائم، ورفعها بغير دعائم، وحصنها من الاود والاعوجاج...)[2].

سەیرکە چۆن قوتابی پێغەمبەری خودا (ﷺ) وقورئان بەرلە زانایانی خۆرئاوا وەکو نیوتن وئەینشتاین ئاماژە بەهێزی کێشکردنی زەوی دەکات و دەیبەستێتەوە بەئایدەلۆژیاکەیەوە و لەم ڕوانگەوە ڕوانینی بۆ ئەم دیاردە باس دەکات: (زەوی دروست کردو گرتی بێ کارکردن، لەنگەری پێ گرت بەبێ ئارام گرتن، دایمەزراند بەبێ کۆڵەکەوپایە، بەرزی کردەوە بەبێ ستون، لەخواروخێچی پاراست).

## ( ڕاڤەی زانستی )

خۆربە قەبەی زلی خۆیەوە دەکەویتە ناوەندی کۆمەڵەی خۆرەوە (٩٩,٨٦%) ی بارستایی گشت ئەم کۆمەڵەیە پێك دێنێ، ئەم هەسارانە گشتیان بەهۆی هێزی ڕاکیشان بەخۆرەوە بەندەکە (نیوتن) دۆزییەوە ، ئەو هەسارانە بە خولگەی خۆیاندا بەدەوری خۆردا چەرخ دەدەن و خێزانی خۆرپێك دێنن.

(د: احمد ماهر صوفی) لە (الموسوعه)کەیدا دەنوسێ:

(١) رواه الطبراني.

(٢) نهج البلاغة/ د: صبحي صالح/ ل:٢٧٥.




## هۆی کێشکردن چییە؟

هەزاران ساڵە مرۆڤـ هەوڵی داوە وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە، یەکەم کەس کە سـۆراغی جوڵەی تەنەکان و هێزی کێشکردنی زەوی کرد زانای ئیتالیێ(گـالیلۆ) بـوو، بـەڵام ڕاڤـەی کـاری کێشکردن (الجاذبیة) زانای بەریتانی (ئیسحاق نیوتن) لەساڵیێ (١٦٨٧ز) دا بـڵاوی کـردەوە، بـە نـاوی یاسـای گـشتی کێـشکردن (Universal Law of Mathematical) کەچـەند لێکدانەوەیەکی ماتماتیکی وبیرکاری بە جوڵەی شتەکان بەخشی لەناو بازنـەی مافـەکانی هێـزی کێشکردن لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا، زانای ئەڵمانی (ئەلبەرت ئەینشتاین) تیوری (نیـسبی) دانا هێزی ڕاکیشانی وەکو نارێکی یەك (التشوە— Deformation) لەبۆشایی دا وەسـف کـرد، کـەبوونی دەگەڕیتـەوە بـۆ تەنەزەبەلاحـەکان ، ( ئەینـشتاین) ئامـاژەی کـرد ئـەم نـارێکی یـە بەچەماوەیی وخواری (الاعوجاج) بەرێکتـەکی (الطابـة) لاسـتیکی دەچـێ کـە تۆپـەکی ئاسـنی گەورەی دەکەوێتە سەر، ئەو نارێك بونە (التشوە) بارەکی خواربونەوە (الالتواء) ی ئانـارام پێـك دێنیت و ڕۆڵەکی سەرەکی دەبینێ لەناراستەکردنی شتە بچوکەکاندا بەئاسماناداو وایان لێ دەکـات بەخولگەکانیاندا بسورێتەوە یان بەسەر تەنە ئاسمانیەکاندا بکەون.

وەتیۆری نیسبی بیرۆکەی چاڵی بۆشایی (تقعر الفراغ) ی بەهۆی بونی ماددەوە زیـادکرد، کەمەبەستی ئەوەیە هێڵە ڕاستەکان بەهۆی بوونی بارستایی نارێك دەبن، ئـەم تیورەشـە ڕاسـتی خۆی سەلماند کاتی گریمانـەی (ئەینـشتاین) هاتـە دی کـە لـەکاتی خۆرگیرانـدا بەئاشـکرا لێـك دورکەتنەوەی دوو ئەستێرە بینرا، دەگەڕێتەوە بۆ خواری ڕێڕەوی ئە تیشکەی لەم دوو ئەسـتێرەوە دێ بـەهۆی ڕابردنـدا بـەنزیك خـۆردا بارسـتایی یـەکی تـاڕاددەبێ زلـەو ئـەو ڕوناکیـەی لـەم دونەستێرەیەوە دێت خواریان دەکات)[1].

بێگومان قورئان لەچەندان ئایەتدا ئاماژە بەم خواری وکەوانەیی تەنە ئاسمانیەکان دەکات بەئاسماندا دێن ودەچن ، یان دەسورێنەوە، دەری خستووە، تیشکەکان ڕاستەوانە بەئاسماندا نایـەن بەڵکو بەخواری دادەبەزن، هەسارەکان وئەستێرەکان بە خولگەی هێلکەیی و خواردا دەخولێنـەوە

(١) الموسوعة الكونية الكبرى/ج٥ /ل:١٥١.



نەك بە خولگەی بازنەیی دا، مانگی دەست کرد وگەشتی ئاسمانی بەڕێگای خواردا بەرزدەبێتـەوە نەك ڕاستەوانە.

ئەوەتا دەفەرمێ:﴿ فَظَلُّواْ فِيهِ يَعْرُجُونَ﴾ [1]. لـە (مفـردات الراغـب) داهـاتووە: (عـرج، مشي مشي العارج)، واتە: بە خواری ڕۆیشتن وەکـو کەسـێ کەدەلـەنگێ، وەکـو لەگەردونناسـی واباسکرا، یان ﴿مِّنَ اللَّهِ ذِي الْمَعَارِجِ﴾ وشـەی (العـروج) واتـە: بەرزبونـەوە و جولـەی تەنـەکان لەئاسماندا بە خواری وچەماوەیی.

خوای گەورە دەفەرمێ:﴿ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ [2].

واتە: هەمو تەنە ئاسمانیەکان لە خولگەی خۆیاندا مەلەدەکەن.

بۆچی (السباحه) بەکاردیت لێرەدا؟ چونکە یەکەم نێوان تەنـە ئاسمانیـەکان پـڕە لـەگازو ئەتێرو تەنی وردیلە، دووەم: کاتێ مرۆڤ مەلە دەکات بـە خـواری دەڕوات نـەك ڕاسـتەوانە! (د. طالـب نـاهي الخفـاجي) دەڵـێ: (جولـەی هەسـارەکان لەمەسـەلە دینامیکـە سـەرەکیەکانە کـە ماوەیەکی زۆر بوو مرۆڤی وروژاند بوو، لەسەرویەندی سەدەی شانزەمدا (کۆپەر نیکـۆس) زانـای پۆڵەندی ڕاکانی ئەوسەردەمەی گۆڕی کاتێ وتی: خۆرچەقی گەردونەو هەسارەکان وزەوی بـەدەوری دا دەسـوڕێنەوە نـەك زەوی، پاشـان (کپلـەر) بـەڕێگای لێکۆڵینـەوەی گەیـشتە ئـەو ئاکامـەی هەسارەکان دەوری خۆردا بەسێ یاسا دا خول دەدەن.

١- هەموو هەسارەیەك بەخۆاری وهێلکەیی دەسورێ وخۆر لەناوەڕاستیەوەیەتی.

٢- هێڵی گەیێنەری نێوان هەسارەکان وخۆر چەند ڕوبەرێکی یەکسـان دەبڕێ لەچـەند کاتـەکی یەکساندا.

٣- چوار گۆشەیی زەمەنی خولەکەی بەدەوری خۆردا لەگەڵ خشتەکی دریژی تەوەری سـەرەکی ڕیگرە وەکە دەسازێت.

کاتێ زانای ئینگلیزی نیوتن هێزی کێشکردن وڕاکیشانی لـە سـالی (١٦٦٦ز) دا دانـا

---

(١) الحجر:١٤.

(٢) يس:٤٠.

هەنگاوەکی تر گەردنناسی چووە پێش.

ئەم یاسایە لە تاکامی هەوڵەکی زۆری زانایان بوو لەم کاتەدا ، تا لە نهێنی ئەو هێزە حاڵی بن هەسارەکانی خستۆتە جووڵەو مەلەوە ،کە دەڵێ:کاردانەوەی نێوان دوو تەن جووڵەی لێ سەر هەڵدەدات دەتوانرێ بە یاساکانی کپلەر وەسف بکرێ . یاساکانی رووبەرەکان ئەوە دەردەخات کارو کاردانەوەکان چەقی یە ، واتە هێزەکە لەسەر درێژی ئەو هێڵە کار دەکات لە نێوان دوو تەن دایە ، وەکو هێڵ ڕاکشاوی پەیوەندی نێوان خۆرو زەوی ،یان زەوی و مانگ ، هەروەها) [(١)].

وە دەڵێ : (یاسای کێش کردنی گشتی و یاساکانی کپلەر لە روون کردنەوەی جووڵەی ئەم هەسارانەداو مانگانەدا زۆر بە وردی سەرکەوت ،تا ئیمرۆش گەردوون ناسان تەنیا ئەم یاسایانە بە متمانەوە بەکار دێنن لە هەندێ باری تایبەتی دا نەبێت کە تیۆری نیسبی گشتی روونی کردۆتەوە .نیوتن بڕوای وابوو کە هێزی یەکتر ڕاکێشان نێوان هەسارەکان لە سروشتی پێکهاتەی ماددی یەکەی دایە ) [(٢)].

(کاتێ ئەنیشتاین تیۆری گشتی نیسبی دانا بڕوای وابوو (١٩١٦) تیشکی خۆر ڕاستەوانە بە ئاسماندا بلاّو دەبێتەوە ، ئەمەش ڕاست نی یە چونکە تیشکی خۆری بلاّوبە ئاسماندا لە تەنی ماددی کێشکردن نزیك دەبێتەوە کەواتە دەبێ تیشکەکە خوار بێتەوە ) [(٣)].

بەڵێ ئەنیشتاین لە ڕێگای توێژینەوەکانی چەمکی نوێ ی داهێنا لە ڕاست هێزی کێشکردندا کە پشت بە بیرۆکەی چەمانەوەو خواری بۆشایی(الانحناء) ئەبەستێ لەدەوری ئەو تەنە ماددی یانەی لەناوی دایەو پشتی بە ماتماتیکی (ڕیمان) بەست کە دەیان ساڵ بەرلەو تیۆری خۆی لەڕاست بۆشایی چەماوەی چوار دەوری دامەزراندبوو، ئاکامەکەی گەیشتە ئەو پەیوەندیانەی چەماوەیی شوێنی-کاتی ودابەش بوونی بارستایی ماددی و جوڵەکەی بە ئاسماندا

---

(١) النسبية بين نيوتن و انيشتاين/د:طالب ناهي الخفاجي/ ل:٧٠-٧٢.
(٢) ............/ ل :٧٧-٧٨.
(٣) ............/ ل:٩٩.

پێکەوە ببەستێتەوە. سەلماندنی تیۆری نیوتن نزیك بوونەوەیە لە تیۆری ئەو ،کەچی جیاوازی شێوەیان کەمە)[1]. تیۆری نیسبی گشتی وادەروانێ کە(بۆشایی چون یەك نییەو ماددە نییە بەچوار دووریەکانیەوە لە دەوری بارستاییەکی ماددی دا کورِ دەبێ(یتحدب)بوارەکی کێشکردن پێك دێنێ و، تا بارستایی یەکە گەورەتر بێ ئەو کوورِیە پتر دەبێ. بۆ نموونە کوورِ بوونەوە لە دەوری زەوی پترە وەك لە دەوری مانگدا. تا لەچەقی تەنی ماددی دوور بکەوینەوە ئەو کوورِیە کەم دەبێتەوە، دیسان هێزی کێشکردنیش ...) [2]. بەم شێوەیە هەموو تەنەکانی ئاسمانی بەهۆی هێزی کێشکردن وەستاون وبە چەوەیی دەچورِێنەوە، هەربەم هێزەش تەنەکانی سەررووی زەوی لە چیاکان و دەریاکان و گیانداران و تەنی تر بە کاروکاردانەوە بە زەوی یەوە دەبەسترێنەوە کەهێزی کێشکردنە، وەکو نیوتن دەڵێ: (هەتا ئێستا من دیاردە ئاسمانیەکان) هەتا دەریا بەهۆی هێزی کێشکردنم روون کردەوە، بەڵام هێشتا هۆکاری سیفاتەکانی کێشکردن لەماوەی ئەم دیاردانەوە ناتوانم بزانم[3].

بەڵێ قورئان کاتێ دابەزی کە مرۆڤ شتەکی کەم نەبێ لە راست سروشتی نەدەزانی، وایان دەزانی باران لە ئاسمان دەبارێ،زەوی تەختە وەکو فەرش وئاسمان بانی زەویەو،ئەستێرەکان وەکوو زیوەکی درەوشاوە بەگومەزی ئاسمانەوەن ،یان چرایەکن بە ئاسمانەوەن.بێگومان گەر بۆ مێژوو بگەرِێینەوە لەوانە: (البدایة والنهایة) دەبینین زۆر شتی ئەفسانە هاتۆتە ناو کەلتووری موسوڵمانانەوە لە راست زانست و هەموو شتەکی تردا، بەزۆری خەڵکانی ئەهلی کیتاب و جولەکە هێناویانە، وەکو(کعب الاحبار)گوایە لەسەردەمی عومەردا(ر) موسوڵمان دەبێ وشتی زۆر لە ئەهلی کیتاب دەگێرِێتەوەو برادەری ابو هورەیرە(ر) دەبێ وئەویش زۆر شتی لێ گێراوەتەوە، جار هەیە وازانراوە کاتێ ئەبو هورەیرە شتەکی لەو گێراوەتەوە ، ئەوە قسەی

---

(١) ............ ل:١١٠.

(٢) ............ ل:١١٠.

(٣) الریاضیات والبحث عن المعرفة/ مورس کلاین/ ت: سمیر یاسین یوسف/ ل:١٢٣.(kepier) (کەسێکی سۆفی بوو دەبوت خواربوونەوەی لەسەر نەخشەیەکی ماتماتیکی سادەو جوان دوورست کردووە). (ل:٨٢)ی هەمان کتێب سەیر بکە.




پێغەمبەرەو(ﷺ) تێکەڵ کراوە، نمونە: عن ابي هريرة ان رسول الله اخذ بيدي فقال: يا ابا هريرة، ان الله خلق السماوات والارض وما بينهما في ستة ايام استوى على العرش يوم السابع، وخلق التربة يوم السبت).(ابن کثیر) دەڵێ(بوخاری) لە (التاریخ)دا دەڵێ ئەم گێڕانەوەیە لە کەعبەوەیە.

وە هەندێ ڕاوی وایان زانیوە هی پێغەمبەرە(ﷺ) بەڵام گێڕانـەوەی ئـەبوو هورەیرەیـە لـە کەعبەوە. هەروەها( ابن کثیر) ڕەخنە لەم گێڕانەوەیـە دەگـرێ کـە بـەناوی (ابـن عبـاس)و(ابـن المسعود) لە پێغەمبـەر(ﷺ) دەگێڕێتـەوە، کـە فەرموودەکـە درێـژە(خـوا زەوی لەسـەر ماسـی درووست کرد، کە ئەو نونەیە خوا لە ڕاستی دەفەرموێ ﴿ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ﴾ القلم:١.ئـاو لەسەر تاوێرەکی لوسە، تاوێرەکە لەسەر پشتی فریشتەیەکە، فریشتەکە لەسەر بەردێکە، بەردەکە لە بادایە، ئەمە ئەم بەردەیە لوقمان باسی کردووە نە لە ئاسمانە نـە لـە زەوی یـە ، ئەهەنگەکـە خۆی جوولاندو زەوی کەوتە جووڵە....) [1]. (ابن کثیر) دەڵێ: (ئەم ئیسنادە- السدی- زۆر شـتی سەیری تێدا گێڕاوەتەوە کە بە زۆری ئیسرائیلی یاتـە وەرگـیراوە، کـەعب کـوڕی ئـەحبار کـاتێ لەسەردەمی عومەردا موسوڵمان بوو کە زۆر شتی لـە سـەردەمی عومـەردا(ر) دەگێڕایـەوە لـە ئەهلی کیتابەوە.

بەم شێوەیە دەبینین کە سروشتی خوا بەرییە لەو ئەفسانانە کە بەناوی دینـەوە تێکـەڵ بـە دین کراون وبووە بە مۆرکەکی کلتوری کۆمەلایەتی لە ناو موسوڵماناندا، بەڵام بێگومان ئـەوەی حەقە دەمێنێتەوەو ئەوەی ناڕاستە وەکو کەفی سەر ئاو بزر دەبێـت. ئـەم فەرموودانـەی قورئـان وڕایەکانی پێشەوا عەلی(ر) سەلمێنەری ئەم ڕاستیەن کە ئیسلام لـەم شـتە ئەفـسانانەی کلتـوری کۆمەلایەتی یان وەرگرتووە بەرییە و زانایانی ئیسلامیش وەکو (ابـن کـثیر) پـەی بـەم ڕاسـتیانە بردووەو بەگوێ ی موسوڵمانانی داداوە.

(د.ئاج.کردینن) کەسەرەتا بێ برواب‍وو دەڵـێ(گـەر ئێمـە سـەیری گـەردوون و ڕازو نهێنـی یەکانی و سیستەم وگەورەیی و جوانیەکەی بکەین، دەبێ بیریـش لـە کردگـاری بکەینـەوە).کـێ هەیە سەرنجی ئاسمان بدات لە شەوێکی ساماڵدا ئەستێرە بێ سـنورەکان ببینـێ کـە لـە دوورەوە

---

(١) البداية و النهاية/ ابن كثير /ج١ / ل:١٩.





دەدرەوشێنەوە، پاشان بڕوای وانابێ ئەم هەموو گەردوونە بەرهەمی ڕێکەوتەکی هەڕەمەکی نییە؟ زەوی خۆمان بەجوولەیەکی وردووڕێك بە ئاسماندا دەخولێتەوە، وەرزەکانی بەدوای یەکدادێن، ناگونجێ هەر تۆپێ بێ لە ماددەیەکی خاڵی و لەخۆر جیابوبێتەوەو بێ مەبەست و مانا لە ئاسماندا فڕێ درابێت. سەیری دونیا بکەو لێ ی ورد بەوە، وە سەیری وتەکانی کیتابی موقەددەس بکە، سۆراغی ژیان بکە، تۆ تووشی مەتەڵۆنهێنی یەکی نادیاری قوول دەبی، ناشێ ئەمە لە نەبوونەوە دروست بوبێت، هیچ شتێ پەیدانابێ لەشتێ گەرنەبێت) [1]. وە قورئان کاتێ دەفەرموێ﴿وَبَنَيْنَا فَوْقَكُمْ سَبْعًا شِدَادًا﴾ [2]. یان﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْحُبُكِ﴾ [3]. مەبەستی لە هێزی گەورەی بونەوەرە کە خوا گەردوونی پێ توند وتۆڵ کردووە وەکو بینایەك و ڕایگرتووە لە ئاسمانداو پێکەوەی بەستونەوە، بەشێوەیەك لادانەکی کەم لەم سیستەمە واتە لە ناو چوونی بونەوەر، وەکو لە قیامەتدا روو دەدات کاتێ دەفەرمێ: ﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾ [4].

وشەی (الحبك) وەکو (الراغب ) باسی کردووە بە مانای ڕێگاو خولگەی ئەستێرەکان و مەجەرەکان دێت. وە بەمانای قایم و توندو تۆڵی (المحكم)دێت لە(اسرار الذرة)دا..

پرۆفیسۆر (اومید شمسك) دەنوسێ : (هەوێنی هەموو شتێ ماددەو چوار هێزە : (١) هێزی کێشکردن . (٢)هێزی لاواز . (٣) هێزی کەهرۆ موگناتیسی . (٤) هێزی ناوکی) .

(گەر هێزی ناوکی نەبوایە ناوکی ئەتۆم نەدەبوو، گەر هێزی لاواز نەبوایە ئەلیکترۆن نەدەبوو ،گەر هێزی کەهرۆ موگناتیسی نەبوایە ئەتۆم نەدەبوو، گەر هێزی کێشکردن نەبوایە زەوی و خۆرو خۆمان نەدەبووین).دیارە بەهێزی موگناتیسی ئەلیکترۆنەکان بە دەوری ناوکدا دەخولێتەوە، بە هێزی نوکی ناوکەکان لە یەك جێگادا کۆدەبنەوە. هێزی کەهرۆموگناتیس کە بلیۆنەها بلیۆن ئەوەندەی هێزی کێشکردن بە هێزترە ئەتۆم وگەردەکان پێکەوە دەبەستێتەوە.

---

(١) الله وعلم الحديث/عبدالرزاق نوفل/ ل:١٦.

(٢) النبأ:١٢.

(٣) الذاريات: ٧

(٤) الانشقاق:١.





هەرچەندە هێـزی کێـشکردن لـە هـەموویان لاوازتـرە کەچـی بـە هـۆی گـرد بوونـەوەی ئـەتۆم وگەردەکانی ئەوەندە بە هێزدەبێ دەتوانێ زەوی و مانگ و خۆرو هەسارەو مەجەرڕەە ئەستێرەکان بە شێوەی کۆمەڵ پێکەوە گرێ بدات، تا لە کونە ڕەشەکاندا **(الثقوب السوداء)** دەگاتە ئاستێ لە هێزدا دەتوانێ ئەستێرەی زەبەلاح و ڕوناکی و کاتیش قوت بدات .(الشداد) واتە: بە هێزو تونـدو تۆڵ. بەڵێ خوا ئاسمان بە حەوت چین وەکو حەوت چینی بینایەك توندو تۆڵ کـردووە :﴿ وَالسَّمَاء بِنَاء ﴾[1]. ئاسمانەکان حەوتن، بەرگی هەوا حەوتە وەکـو گۆیـەك دەوری زەویـان داوە. بێگومـان نەمانی هەر هێزێ لە مانە، یان بوونی هەر هەڵەیەك با کەمیش بێ واتـە لەناوچـونی بوونـەودر. کەواتە: چەندە جوان و وردە ئەم ئەندازیارییـە کـە هـەر هێـزێ لـە شـوێنی خۆیـدا دانـاوەو بـە وردەکاری و ڕێژەی ئەندازەیی داینـاون. سەیر بکە هەرچەندە هێزی ناوکی هەزار ئەوەنـدەی هێـزی کەهرۆ موگناتیسی یە بەڵام خوا ڕێگای نەداوە کاریگەری خۆی لە ناوکی ئەتۆم بباتە دەرەوە !

## ١١- هێڵە پان و درێژەکانی زەوی :




---

(١) البقرة:٢٢.





## ١٢- خۆرهەڵات و خۆر ئاواكانی زەوی :

## ١٣- سوڕی تەوەرەیی و خولگەیی زەوی :

قورئانی مەزن دەفەرموێ : ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الأَرْضَ فِرَاشاً﴾ [1]. لێرەدا قورئان ئاماژە بە پان و پۆڕی زەوی دەكات . واتە: ئەو كەسەی زەوی بۆ كردوون بە ڕایەخ ﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا﴾ [2]. واتە: زەویمان بۆ درێژ كردنەوە . ﴿رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ﴾ [3].

﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ﴾ [4]. پەروەردگاری خۆر هەڵات و خۆرئاوا یەك ﴿فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ﴾ [5]. واتە: پەروەردگاری دوو خۆر هەڵات و دووخۆر ئاوا واتە : ئەمن سوێند دەخۆم بە پەروەردگاری خۆر هەڵاتەكان و خۆر ئاواكان ئێمە لە تواناماندایە .



---

(١) البقرة:٢٢.

(٢) الحجر:١٩.

(٣) الشعراء:٢٨.

(٤) الرحمن:١٧.

(٥) المعارج:٤٠.





## ڕاڤەی زانستی نوێ

**( ١ ) خۆرهەلآت و خۆر ئاوای زەوی:** (رَبُّ الْمَشْرِقِ وَالْمَغْرِبِ) : هەرچەندە هەرچی لـە ئاسمانـدا هەیە لە تەنەکان بە دەوری تەوەری خۆیدا دەسوڕێتەوە و بەخولگەکەیدا چەرخ دەدات، جگـە لـە ئەستێرە (پۆلی-القطبی) نەبێ لە ڕاست زەوی دا وەکو وەستاو وایە، لە سوڕی ڕواڵەتی گومـەزی ئاسماندا بەشداری ناکات، کە لە ئاکامی سوڕی تەوەرەیی زەوی هەر (٢٤)کـات ژمێـرێ جارێـك ڕوودەدات).

چونکە ئەستێرەی پۆلی دەکەوێتە سەر ڕێگای تەوەری سوڕی زەوی بەدەوری خۆیدات، بەوە ڕێڕەوی (باکوور) ی ڕاستەقینە بۆ ئێمە دیاری دەکات، بە(باکووری جوگرافی) ناسراوە.

لەسەر ئەم ڕێڕەوە ستوونی دەبێت، بەلای ڕەستیدا بەرەو خۆرهەلآتی زەوی و بەلای چـەپیدا بەرەو خۆرئاوادا، واتە بەرەو ئاراستەی خۆر هەلآتی ڕاستەقینەو خۆرئاوای ڕاسـتەقینە بـەگوێرەی زەوی وەکو هەسـارەیەك. ئەمـەش کـارزانی یـەکی گـەورەی خـوای تێدایـە تـاوەکو ئەسـتێرەی پۆلی(قطبـي) وەکو (قیبلە نوما) ی گەردوونی بێ بەئاسمانی دنیادا هەلواسـرابێ بـۆ ڕێنومـایی خەلکی بۆهەرچوار لاکە، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی : ﴿وَبِالنَّجْمِ هُمْ يَهْتَدُونَ﴾[١].

### ( ٢ ) خۆرهەلآت وخۆرئاواکانی زەوی :

بەهۆی سووڕی تەواوی زەوی بەدەوری تەوەری خۆیدا هەر(٢٤) سەعاتێ بەپێوەری خۆمـان ئەوڕۆژە دیاری دەکرێ شەو و ڕۆژ دابەشی دەکات، بەهۆی سـووڕێکی تـەواوی مـانگ بـەدەوری تـەوەری خـۆی و زەویـدا بـەماوەی (٢٩/٥) ڕۆژ و بـەپێی دابەشـبوونی بـۆ چـەند هەفتـەو چەندمانگێکدا بەپێی قۆناغی یەك لەدوا یەکەکانی مانگ لەمانگی یەك شـەویدا(اهـلال) واتـە: مانگ کەوتنەوە (المحاق) مانگی هەیڤی (القمری) پەیدا دەبێت.

مانگی دوازدە سووڕان دەدات لەدەوری زەویدا، لەهەر سـووڕێکی تـەواوی زەوی بـەدەوری

---

(١) النحل:١٦.

خۆردا، بەو هۆیە درێژەی ساڵی هەیڤی دیاری دەکرێکە(٣٥٤) ڕۆژە ودەکرێ بە(١٢) مانگی هەیڤی دیاریکراو.

هەرکام لەمانگ وزەوی لەخولگەیەکی دیاری کراودا بەدەوری خۆردا دەخولێتەوەو لەماوەیەکدا بە(٣٦٥/٢٥) ڕۆژ دەقرسێندرێت و ساڵی هەتاوی (الشمسی) خۆر دیاری دەکات، کەبە(١١) ڕۆژ لەساڵی هەیڤی پترە.

بەهۆی خواری تەوەری زەوی لەسەر هێڵی گەیەنەری نێوان چەقی زەوی و خۆر چوار وەرزەکان دروست دەبین: (بەهار، هاوین، پاییز، زستان) . بەهۆی بەدوای یەکتری بەهۆی بەدوای یەك تری دا هاتنی بورجەکانی ئاسمان کە دوازدە کۆمەڵە ئەستێرەیە کەزەوی لەکاتی خولانەوەیدا بەدەوری خۆردا دەیانبڕێ ساڵی هەتاوی یان خۆری بەسەر مانگدا دابەش دەبێت.

بەهۆی سووڕانی زەوی بەدەوری تەوەرەکەیدا بەتواوی هەر(٢٤) کاتژمێر ڕوویەری نیوە گۆی زەوی داپۆشراو بەڕووناکی خۆر بەکەوتنە ناو تاریکی شەوەوە لەلایەکیەوە لەکەمی دەدات و بەهەمان ڕادە لایەکەی تر دەکەوێتە بەر ڕووناکی یەوە، بارودۆخەکە بەردەوام بەهێواشی دەڕوات تا ڕووناکی ڕۆژ نیوە گۆیە تاریکەکە بەتەواوی دادەپۆشێت و تاریکی نیوە گۆیەکەی تر بەچاکی دادەپۆشێت. بەم پێ و دانگە خۆرهەڵات وخۆرئاواکان لەسەر هێڵە پانەکان (الخطوط العرض) زۆر دەبن، تابە ڕەو خۆرئاوا بچین هەڵاتنی خۆر دوا دەکەوێ.

کاتێ سووڕی تەوەرەی زەوی تەواو بوو واتە(٣٦٠) پلە هەر(٢٤) کاتژمێرێك، تیشکی خۆر(١٥) پلەی هێڵی درێژی (الخطوط الطول) دەبڕێ لەکاتژمێرێکدا لەخۆرهەڵاتەوە بۆخۆرئاوا،واتە(٤)خولەك بۆیەك هێڵی درێژی، واتە جیاوازی زەمەنی کەلە جیاوازی هێڵەدرێژەکان پەیدا دەبێت بەسەریەك هێڵی پاندا(٤) خولەك بۆهەرهێڵێکی درێژ، گەرجێگاکە لەنیوە گۆی خۆرهەڵاتی دابێ ئەم جیاوازییە سەربارەدەبێت و، گەرلەنیوەی خۆرئاوادا بێ فرێ دەدرێت.

(هێڵی درێژ{١٨٠}هێڵەکی جیهانی یە لەمێژوودا) بەبڕینیان لەخۆر هەڵاتەوە بۆخۆرئاوا کات یەك ڕۆژی ڕەبەق دوادەکەوێت، هێڵە جیهانیەکە لەخۆرهەڵات وخۆرئاوادا بەسەرهێڵی درێژی

(١٨٠) داخوارد دەبێتەوە (یتعرج) وەدەبێتەکەوانەیی، (هێڵەپانەکان) کاری تێدەکەن، وەبەتەنگەبەری(بیرنج) دا تێدەپەڕێ بەرەوخۆرهەلاتی دوورگەی (نیوزلەندا) لەباشوردا. کات لەجێگەیەکەوە بۆجێگەیەکی تردەگۆڕێت بەسەر(هێڵی یەکسان) دا بەهۆی گواستنەوە لەهێڵی درێژییەوە بۆهێڵی تری درێژی. بەلام جیاوازی کات، ئەنجا لەهەردووساتی خۆرهەلاتن وخۆرئاوابووندا لەکاتی گواستنەوە لەهێڵی یەکسانەوە بۆهێڵەکانی پانی لەباشوور و باکووردا گەورەترە لەگواستنەوەی سەریەك هێڵی پانن، چونکە گواستنەوە بەسەرهێڵەپانەکاندا کاریگەری تەواوی تری هەیە لەسەرکاتەکانی خۆرهەلات وخۆرئاوای خۆردا، ئەم کاریگەریەش هەموو رۆژێ جێگیرنییە بەهۆی لاری تەوەرەی زەوی، دیسانەوەلەگەڵ جیاوازیەکانی هێڵی پانی بەتێکردنەوەیەکی راستەوانە ناسازێت .

لەمەوەدەردەکەوێت بری جیاوازی کات بۆهەر خۆرهەلاتنێك وخۆرئاوابوونێك لەنێوان هێڵ پانەکاندا(٥٠-٦٠) پلەیە لەباکووردا گەورەترە زۆر لەبری کاتەکانی نێوان هێڵەپانەکانی (١٠-٢٠) دا لەباکووردا.

سەرباری ئەمەش ئەم جیاوازیانە نەگۆڕ نین لەهاتنی سالدا، خۆرهەلات وخۆرئاوا کات دیاری دەکات بۆچەند ژمارەیەك کەنازانرێن، وجیاوازیەکان لەنێوان کاتەکانی خۆرهەلات وخۆرئاوادا لەهەمان کاتدا لەدووجێگای هێڵی درێژیدایە، بەلام لەهێڵی پانی سەرودا جیاوازدا کەمترە لەنێوان جیاوازی نێوان دووجێگادا کەهەمان بەهایان هەیە لەبری هێڵی پانیدا، کەچی دەکەونە سەر دووهێڵی درێژی جیاواز. دیسانەوە ئەگەر هەردووکاتی خۆرهەلات وخۆرئاوامان لەیەك جێگادا ژمارد لەڕووی زەویدا لە سوورگەی سالدا، دەبینین زۆر دەگۆڕێن بەتایبەتی لەهێڵە پانە بەرزەکاندا، یەك جێگا لەسەر ڕووی زەوی چەند خۆرهەلات و خۆرئاوایەکی هەیە لەسەر سوورگەی سالدا.

جولەی ڕوالەتی خۆر لەناستی بازنەی بورجەکاندا[1]. کارلەبری لاری هێڵی یەکسانی دەکات و وای لێ دەکات رۆژ بە رۆژ بگۆڕێ، لاری یەکسانی(الاستوائی) کارەکی گەورەی هەیە

(١) وەکو خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾ البروج:١. وەکو لە گەردونناسی دا باسکرا.





لە دیاری کردنێ هەر لەو ساتی خـۆر هەڵاتنـەکانو خۆرناواکـان ئـەوەش بـەزیاد بـوونی بـەهای هێڵەکانی پانی زیاد دەکات.

خاڵەکانی درێژی و پانی جیا جیا دیاری دەکات لە هەر دوو ساتی خۆرهەڵات و خۆرئاوادا، هێڵەکانی پەیوەندی نێوانیان پێیان دەوترێ(هێڵەکانی یەك گرتووی خۆرهەڵاتەکان) و (هێڵـەکانی یەکگرتووی خۆرئاواکان)، ئەم هێڵانەش رۆژ بە رۆژ لە جیاوازی دان و رۆژەکان هاوتەریبن.

لە(٢١/ئادار) نەورۆز دا هەموو ساڵێ خاڵی ڕۆژ گەرانـەوەی بـەهاری(الاعتـدال الربيـع)ی روودەدات و لە(٢٣/ئەیلول) دا خاڵی ڕۆژ گەرانەوەی پایزی روودەدات لە نیوەگۆی باکوردا، ئـەنجا شەو و رۆژ بەرامبەر دەبن چونکە تیـشکی خـۆر بەسـەر هێڵـی یەکـساندا(سـتونی-- عـەمودی) دەبێت. لە(٢١/ حوزەیران)دا هەموو ساڵێ گۆرانی(هـاوینی) لـە نیـوە گـۆی بـاکوردا روودەدات لەبەر ستونی تیشکی خۆر لەسەر هێڵی قرژاڵ(مدار الـسرطان)دا و رۆژ لە هـەموو کـاتێ درێـژتر دەبن، ناوچەی دەوری(جەمسەری باکور)ئـەو کاتـە شـەو ڕۆژەکانیـان دەبنـە(٢٤) کـات ژمێـر، لە(٢٢/کانونی یەکەم)دا هەموو ساڵێ گۆرینی(زستانی) روو دەدات لە نیـوە گـۆی بـاکوردا کـە تیشکی خۆر لەسەر خولگەی کارژۆڵە (الجدی) ستونی دەبێت وناوچەی جەمسەر باشـوور بـەرۆژی (٢٤) کاتژمێری شاد دەبن، کەچی ناوچەی دەوری (جەمسەری باکوور) بە (٢٤) شەو شاد دەبن.

لەم خستنە ڕووەدا فرەیی خۆرهەلات وخۆرناوان دەبینیت بەهۆی یەك بەدوای یەکدا هـاتنی رۆژەکان و وەرزەکان لەسەر یەك جێگا لەهەموو ساڵێکدا و بەهۆی فرەجێگاکانی هێڵی پانی یەك لەگەڵ فرە هێڵە درێژەکاندا، وە لەسەریەك هێڵی درێژیدا لەگـەل چـەند هێڵێکـی پانیـدا بـەهۆی زۆری ئەوانـەوە خۆرهـەلات وخۆرنـاوا زۆر بـە سـەیری زۆردەبـن؛ بێگـەردی بـۆ ئەوخوایـەی دەفەرمووێت:﴿ فَلَا أُقْسِمُ بِرَبِّ الْمَشَارِقِ وَالْمَغَارِبِ إِنَّا لَقَادِرُونَ﴾.

٣-دووخۆرهەلآت و دووخۆرئاواکان :

لـەناکامی سـوورِی زەوی بـەدەوری تەوەرەکەیـدا هەنـدێ لـەهێلی یەکـساندا قۆقز(الإنبعاج)دەبێت، کەمێ لەهەردووجەمسەرەکاندا دەتەپێت، لەناکامدا هەموو خۆرهـەلات وخۆرناوایەکان بە دوو کۆتایی دەگـەن دوو زەمـان و جێگـا پێـك دێـنن بـۆ هـەر خۆرهـەلآت و




خۆرئاوایەك لەسەر ئەو پەڕی دوو ناوچەدا لە ناوچەكانی زەوی و، هەر یەكە لەم دووانە ئەوپەڕی خۆرهەڵاتەكان پێك دێنیّ، جارەكی تر ئەوپەڕی خۆرئاوا پێك دێنێت، بەو پێیە دوو خۆرهەڵات و دوو خۆرئاوا پێك دێت، بیّ گەردی بۆ ئەو خوایەی فەرمویەتی: ﴿رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ﴾ [1]. وە قورئان دەفەرمویّ:﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا﴾ [2]. واتە: زەویمان درێژكردۆتەوە. یان ﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ﴾ [3]. واتە خوا ئەو خوایەیە زەوی درێژكردۆتەوە. هەندیّ زانا وا لیّ حاڵی بوون وشەی(مد) واتە: (البسط)، بەڵام وشەی(البسط) سەر بە(مدد)یە. مەبەست لە(مد) درێژبوونەوەیە(الارض) ئەو زەوییەیە تۆی لەسەری، ئەم زەوی یە بە هێڵەكانی پانی و درێژی لە باكورەوە بۆ باشور و لە خۆرهەڵاتەوە بۆ خۆرئاوا درێژبۆتەوە. بۆ نمونە: گەر لە خاڵی هێڵی یەكسانەوە دەست بە رۆیشتن بكەی ئەوە كۆتایی نایەت و خاڵی برانەوەی نییە بە وشكانی دابیّ یان دەریاوە و دەگەیەوە ئەو خاڵەی لێوەت دەست بەرۆیشتن كردووە. بەم پێیە زەوی سنوردار نییە بەڵكو درێژبۆتەوە، بەڵكو زەوی گۆیی یە و خاوەنی هێڵی پانی و درێژییە. ئەمە بەڵگەیەك بووە بە دەست زانایانەوە بۆ گۆیی زەوی بەر لەیەوەی لە دەرەوەی زەوی وێنەی بگرن. وە خوا زۆر فەرمویەتی لە بارەی پانتایی و فراوانی زەوی فەرمووە:﴿وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾ [4]. واتە: بۆ سەیری زەوی ناكەن چۆن رووی هەموار كراوە.(بەڵام رووەكی گۆیی یە). ﴿وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا﴾ [5]. وشەی(الطحو) واتە: پان ڕاخران(بەشێوەی درێژ بوونەوە). ﴿وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ﴾ [6]. واتە: زەویمان بۆ ڕاخستون باشترین هەموار كەرین.

لێرەدا قورئان لەم چەند ئایەتەدا ئاماژە بۆ ئەم چەند زانستانە دەكات:

١- بوونی هێڵە پان و درێژە نادیارەكان لەزەویدا.

---

(١) الارض في القران الكريم/ د.زغلول/ ل:٤٩٦- ٥٠١.

(٢) الحجر:١٩.

(٣) الرعد:٣.

(٤) الغاشية:٢٠.

(٥) الشمس:٦.

(٦) الذاريات:٤٨.





٢- خۆرهەلآتی هاوین و خۆرئاواکەی لەخولگەی قرژاڵدا.

٣- خۆرهەلآتی زستان و خۆرئاواکەی لەخولگەی کارژۆڵەدا.

٤- خۆرهەلآتن و وخۆرئاوابوون لەسە هێڵی یەکساندا.

٥- سووڕی تەوەرەیی و خولگەیی زەمین.

٦- بوونی جەمسەری باکوور و باشوور.

٧-نیمچە دوورگەی گۆیی زەوی .

٨-لاری زەوی لەتەوەرەکەیدا.

## ١٤-لاری زەوی لەتەوەکەیدا :

**﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى رَبِّكَ كَيْفَ مَدَّ الظِّلَّ وَلَوْ شَاء لَجَعَلَهُ سَاكِنًا ثُمَّ جَعَلْنَا الشَّمْسَ عَلَيْهِ دَلِيلًا ثُمَّ قَبَضْنَاهُ إِلَيْنَا قَبْضًا يَسِيرًا﴾[1] .**



واتە: ئەوە نابینی پەروەردگارت چۆن سێبەری درێژ کردۆتەوە، گەر مەبەستی بوایە جێگیری دەکرد، پاشان خۆرمان کرد بەبەڵگەیێ بەسەریدا پاشان کەمێکمان بەرەولای خۆمان گرت.

---

(١) الفرقان:٤٥-٤٦.

ئەم ڕاستیە قورئانیە ئەوەنیشان دەدات زەوی بەلاری بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، واتە: تەوەری زەوی برێ لارە، ئەمەش دانایی زۆری تێدایە، گەر تەوەری زەوی وەستاو بایە دەبووە هۆی کۆبوونەوەی ئاو لە دەورەی هێڵی یەکساندا، ئەو کاتە خەڵکی ئەوشوێنە نقوومی ئاو دەبوون، لەجەمسەرەکانیش دەخنکان لەتینوان، بەڵام ئەم گرتنە بۆتە هۆی ئەوەی ئاوەکان لەجەمسەری باشوور گل ببێتەوە وەلەجەمسەری باکووردابەرزبێتەوە.

## (ڕاڤەی زانستی تر)

(گەردوون ناسی سەلماندوویەتی تەوەری زەوی بەپلەی(٢٣/٥) پلە لارە لەسەر ڕووی جوڵەی ساڵانەی زەوی، بەم گرتنە کەمە جیاوازی شەو و ڕۆژ بەپێی وەرزی ساڵ پەیدا دەبێت. گەر تەوەری زەوی ستوونی بوایە لەسەر بازنەی جوڵێنەری زەوی بەدەوری خۆردا شەو و ڕۆژ یەکسان دەبوون لە زستان و هاویندا لە زۆربەی زەویدا و چوار وەرزەکان نەدەبوون گەر ئاو و هەوا گۆڕانی بەسەردا نەهاتبایە ئەو ڕووەکە جیاجیاکانمان دەست نەدەکەوت و ژیان لەسەر زەوی ئەگەری نەدەبوو) [١].

ئەوەتا خوای گەورە ئاماژە بەچوار وەرزەکان دەکات بەهۆی سووڕی زەوی بەدەوری خۆردا و لاریەکەی لەتەوەری دا: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ ثُمَّ يَهِيجُ فَتَرَاهُ مُصْفَرًّا ثُمَّ يَجْعَلُهُ حُطَامًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِأُوْلِي الْأَلْبَابِ﴾[٢].

لێرەدا قورئان ئاماژەیەکی پڕ لەنهێنی دەکات: باران لە ئاسمان دەبارێت لەزستاندا و لافاو و جۆگەلە بەفرو تەزرە پەیدا دەکات، هەندێ لەم ئاوە ژێر زەوی دەکەوێت دەبێتە سەرچاوەو کانی، بەم ئاوە لەبەهاردا کشتوکاڵ و ڕووەکی جۆراو جۆر دەڕوێ وشین دەبێتەوە، پاشان لەهاویندا بەهۆی پلەی گەرمی بەرزو وشك دەبێتەوەو زەرد هەڵدەگەڕێ، گەڵای درەختەکان

---

(١) حقائق القرأن والعلم الحديث/ عامر تحسين/ ١٩٨٦/ موصل/ ل:٨٢.

(٢) الزمر:٢١.

زەردەبن پاشان لەپاییزدا زیاتر ووشك دەبن ودەبن بەخۆڵەمێش، سەیربکە ئەمانە وانەن بۆ ئەوکەسانەی کە بلیمەتان!.

(د:کریسۆن موریسۆن) سەرۆکی پەیانگای ئەمریکی لە نیورك دەنوسێ: (پاشان زەوی بەبڕی (٢٣٪) پلە لارە، ئەمەش چەند هۆکارێکی هەیە وای لێ کراوە: گەر گۆی زەوی لار نەبوایە جەمسەرەکان هەمیشە شەو دەبوو

ئەو هەڵمەی لە ئۆقیانوسەکانەوە پەیدا دەبوو بەرەو باکور و باشور دەچوو ، لە رێگاکەیدا چەند کەرتی بەستەڵەکی کەڵەکە دەکردە سەر یەکتری و، یان وەکو بیابانەکی بەجێ دەهێشت لە نێوان هێلی یەکسان و بەفردا . لەم بارەدا چەند روبارێ لە بەستەڵەك پەیدا دەبوون لە چەند دۆڵێکەوە بۆ قولایی زەریا خوێاوکەکان دەچوون ، تا ببن بە گۆمەکی کاتی خوێاوکی تاڵ.

قورسایی گەورەی بەستەڵەکە فشاری دەخستە جەمسەرەکان ئەمەش دەبووە هۆی ئەوەی هێلی یەکسان تەخت بێ، یان بەلای کەمەوە هێلەکی یەکسانی نوێ ی دەویست دیسانەوە نزمایی زەریا توشی روبەرەکی فراوانی نوێ ی زەوی دەبوو، بارانی کەم دەکردەوە لە هەموو جیهاندا، ئەمەش ناکامی ترسناکی لێ دەکەوتەوە[1].

## ١٥- زەوی بە ( ١٥ ) جۆر لەیەك کات دا دەسوڕێتەوەو دەجوڵێت.

## ١٦- مانایەکی ووشەی ( ذلولاً ):

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ [2].

واتە: خوایە کە زەوی بۆ رام و هێمن کردن، بەرۆخەکان دابڕۆن، لە رۆژی ئەو بخۆن، زیندوو بوونەوە بۆ لای ئەوە ﴿اللَّهُ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ قَرَارًا﴾[3].

واتە: خوا ئەو خوایەیە کە زەوی بۆ کردوون بە ئارامگا.

---

(١) العلم يدعو للايمان/ كريسون موريسون/ ت:الاستاذ: محمود صالح الفلكي/ ل:٥٦- ٥٧.

(٢) الملك:١٥.

(٣) غافر:٦٤.




﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾ (١).

واته : چیاکان دەبینی وا دەزانی وەستاون ، ئەوان وەکو پەڵە هەور دەڕۆن﴿أأمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾ (٢).

واته: ئایا دڵنیان کە کەسێ لە ئاسمانەوە زەویتان لێ رۆبچوێنێ کاتێ ئەو گێژدەخوات.

کێ زەوی کردووە بە ئارامگا، ئێمە و گیان لەبەران بەسەری دادەڕۆین و ناکەوین؟، بیناو کۆشکەکان لەسەری دەوەستن و ناڕوخێن؟ کە چی زەوی لە چرکەیەکدا(٣٠) کم دەڕوات؟ گەر بلەرزێ هیچ بینایەك بە هەواوە نامێنێ وەکو لە کاتی ڕودانی بومەلەرزەکاندا دەبینرێت. وەکو قورئان دەفەرمێ تۆ کاتێ چیاکان دەبینی وادەزانی وەستاون، کەچی ئەمە فێڵی چاوە ئەوان لەگەڵ زەویدا دەجولێن. ئەوەی ئەم ئارامیەی دروست کردووە هێزی ڕاکێشانە، کەباسمان کرد، چونکە هەموو شتێ لەسەری دا بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت، ئەمە کێشی شتەکەیە کاتێ کەشتی یە وانەکان دەگەنە خاڵی نەمانی هێزی کێشکردنی زەوی کاتێ لە خەو هەڵدەستن دەبینن بەرزبۆتەوە بۆ سەقفی کەشتی یەکە و کێشی نی یە، ژیانیش بەبێ کێش ئەگەر نابێ، کێ ئەم هێزەی دروست کردووە کە قورئان بە (کفاتا) ناوی بردووە، بێگومان خوای گەورە: ﴿أمَّن جَعَلَ الْأَرْضَ قَرَارًا﴾(٣).

**بۆچی هەست بەم جولەیە ناکەین؟ چونکە هەرچی لەسەر زەوی یە بەیەك ئاراستە لەگەڵ زەوی دا دەجولێت. ووشەی﴿فَإِذَا هِيَ تَمُور﴾ لە(تفسیری القرآن العظیم /ابن الکثیر) دا واتە: (اي تذهب وتجي وتضطرب) واتە: (دێت و دەچێ و شپرزە دەبێت) لای (الراغب) لە (مفردات) دا لەسەری ووشەی (تمور) دەلێ: (المور) واتە: (الجريان السريع) واتە: ڕۆیشتنی بە خێرا وەکو خوا فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاء مَوْرًا﴾ (٤).**

---

(١) النمل:٨٨.

(٢) الملك:١٦.

(٣) النمل:٦١.

(٤) الطور:٩.

کاتێ قورئان دەفەرمێ:﴿ هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا ﴾ الملك:١٥. ووشەی (ذلـول) بـە مانای ولآخێکی ڕام دێ کە سەرکەش نەبێت وەکو(الراغـب) دەلێ: (ماکـان بعـد تـصعب وشمـاس من غیرقهر) وەکو لە قورئاندا لە ڕاسـت مانگای بەنو ئیسرائیلی داهاتووە ﴿لاَ ذَلُولٌ تُثِيرُ الأَرْضَ﴾ [١]. وە دەلێ : (وذلتْ الدُابة به شماش وهي ذلول، اي ليس بصعبة). بەو پێیـە سـەرەتا زەوی زۆر سەر بزێو بووە و خێرا جوولآوەتەوەو نا ئارام بووە دوایی خوا ئۆقرەی پێ گرتووە . (سـید قطـب). زۆر جوان بۆ ئەو مانایە چووە کاتێ دەلێ: (زەوی ڕام - الذل- لە مێـشکی خـەلکی کۆنـدا بـەم زەوی یە دەگۆترا (ذلول)کە بۆ ڕۆیشتن بە پیادەو سواری ڕام کراوە، یان بۆ کەشتی ڕام کراوەکە بـە دەریادا دەڕوات، بۆ کشتوکالْ کردن و درونەوە و چنینەوە ڕام کراوە. بۆ ژیان ڕام کـراوە بـە ئـاوو هەواو خاکەوە کە بۆ کشتوکالکردن و ڕواندن ڕام بووە. ئەم ڕێبەدی یانە بە تەواوی زانست کە تـا ئیمرۆ دەستی پێ گەیشتوون ڕوونی کردونەوە، کە بە ساحەی دەقی قورئانی دا درێژ دەبێتەوە لـە پەی پێ بردندا. ئەوەی زانست دەیلێ لە ڕاسـت (ڕام بوونی زەوی _الـذلول)کـە بـەزۆری بـە ولآخ دەوترێ مەبەستی پێ لەسەر زەوی یە! ئەو زەوی یەی دەبیبنین ولآخەکی بە جوولەیە و ڕادەکات، کەچی لە هەمان کاتدا ڕامەو سەر کەش نییە و سوارەکەی ناکەوێنێ و هەلناگوێ و هەلێ ناوێـت و ناجوولێ ماندووی ناکات وەکو ولآخی سەر بزێو [٢]. هەروەها(تـور) مانـای گێـژاوو هەلـچونی ناخی زەوی دێت وەکو لە باسی چینەکانی زەوی دا باس دەکرێت .

## سوڕەکانی زەوی لە ڕووی جیۆلۆجییەوە:

(د: اومیـد شـەشك)دەلـێ: (یـەك بومەلـەرزەی سـادە بەپلـەی(٦) ی ڕێختـەر وناکامـە تراژیـدیاکانی کـەمترە لەجولآنـدنی بـالێ مێـشولەیەك لەڕاسـت ڕوداوە گەردونیەکانـدا. زەوی کە(٦٠) ملیۆن ملیۆن ملیۆن تەن دەبێ بەبۆشایی ئاسماندا بەحەوت جولـەی جۆراوجـۆری ئـالۆزو سەراسیماکەردا دەمانباتو ودەمان هێنێ بەهۆی جولەکانی، بـەبێ هـیچ جولـە ولەرزینەوەیـەك،

(١) البقرة:٧١.

(٢) في ظلال القران/ج٦ /:٣٦٣٧.








نــاکرێ ئەمــە بــەرێکی جوڵــەی زەوی وەسف بکـرێ، چـونکە لەکاتێـدا بـاس لەرێکی رۆیشتنی ترومبێلێـك دەکـەین لەرێگای پەرستگایەك و ڕاسـتە ڕێــەك دا بـــو شــــارەزایی شـــــوفێرەکەی دەگێڕینـــەوە، چـــۆن هەنـــدەك کـــەس دەتـــوانن جوڵـــە ئەکرۆباتیکیـــە ئـــاڵۆزە ســـەیرەکانی ئـــەم کەشـــتیە زەبەلاحـــە ئاسمانیـــەی لەســـەری دەژیـــن بەشـــتەکی ئاسایی وڕووداوەکی سروشتی لەقەڵەمی بدەن)؟.

(نورخان محمد عەلی) لەڕاڤەی جوڵەکانی زەویدا لەسەر قسەی پروفیسـۆر(ئومیـد شمـشك) لەپەراوێزی نوسراوی ئەودا دەنوسێ کە وەریگێڕاوە: (جوڵە سەرەکیەکانی زەوی حـەوت جوڵەیـە، بەڵام جوڵـەی تریـشی هەیـە، لێـرەدا گـرنگترین جوڵـەکانی زەوی بـۆ خوێنـەران دەخەینـە ڕوو:

١-خولانەوەی بەدەوری تەوەرە خەیالیەکەیدا:

جوڵە سەرەکیەکانی زەوی حەوت جوڵەیە لەیـەك کاتـدا، بـەڵام لێـرەدا جوڵـەو ویـزواوی تریشی هەیە، لێرەدا باسیان دەکەین جوڵەی تەوەرەی خەیالی، ئەم سوڕە بە (٢٤) کاتژمێر تەواو دەکات کە لەناکام دا شەو ورۆژ پەیـدا دەبـن خێرایـی سـوڕەکەی (١٦٧٠کـم / کاتـژمێریك دا) لەهێلی یەکساندا، هەر لە کەمیدایە هەتا لەجەمسەرەکاندا دەبێتە سفر.

٢- سوڕی خولگەیی بـەدەوری خـۆردا، یـەك سـوڕ بـە (٣٦٥,٢٥) ی ڕۆژ تـەواودەکات بەخێرایی (٣٠کم/ چ).

٣- زەوی بەدەورەی تەوەرەی خۆیـدا دەسـوڕێتەوە، ئـەم تەوەرەیـەی ئامـاژە بـۆ کۆمەڵـە ئەستێرەی ورچە بچکۆڵە (الدب الـصغیر) دەکـات، دەبیـنین وردە وردەو بەهێواشـی لاردەبێتـەوە



بەجوڵەی خولگەیی، وەك بڵێ ی قوچەکی (مخروط) بێت، تەوەرەی ئەو قوچەکی یە لەسەر ئاستی خولگەی زەوی ستونی دەبێت، ئەم سورە هێواشە بە (٢٥٧٨٠) ساڵ تەواو دەکات و پێی دەوترێ: (لاربونەوەی هەردوو خۆر گەڕانەوە- ترنح الاعتدالین).

٤- لێرەدا جوڵەکی تر هەیە لەسەر جوڵەی هەردوو لادانی خۆر گەڕانەوەکان دادەمەزرێ و ئەشێوەی لەرەلەر دەردەکەوێ، ئەمەش بەهۆی هێزی کێشکردنی خۆر کەکار دەکاتە سەر بڵندایی ناوچەی هێڵی یەکسانی. بولەرە وجوڵەیەك (١٨,٦ ساڵی دەوێت).

٥-لێرەد اجوڵەی تری زەوی هەیە، گۆڕانێکە لەشێوەی خولگەی زەوی بەدەوری خۆردا، ئەم خولگەیە شێوەی هێلکەیی هەلکەوتووە، تێبینی کراوە ئەم شێوە هێلکەییە بە هێواشیەکی زۆر دەگۆڕێ و لە شێوەی بازنەیی نزیك دەبێتەوەو، دوای(٩٠٠٠٠) ساڵ زۆر لە شێوەی بازنەیی نزیك دەبێتەوە.

**٦- شێوەیەکی تری جوڵەی زەوی هەیە کە ئاستی خولگەی زەوی بە دەوری خۆردا دەگۆڕێت، چاوەڕێ دەکات پاش (٢٨٠٠) ساڵ ستونی خولگەی زەوی لە دەوری خۆردا لەسەر ئەم ئاستەی ستوونی بێت.**

**٧- بوونی جوڵەی وردیلە لە کۆتایی هەردوو جەمسەرەکاندا بینراوە لە بازنەی چوار گۆشەیەکدا لاریەکانی (٢٠)م بێت.**

**٨- جوڵەی مانگانەی زەوی بەرەو رووی چەقی گواستنەوەی دوانەیی کە لە خۆرو زەوی پێك دێ، چونکە بارستایی زەوی لە بارستایی خۆر گەورەترە چەقەکە لە خۆر نەك لە زەوی نزیکترە.**

**٩- لێرەدا جوڵەیەکی تر بڕی لاری تەوەری زەوی دەگۆڕێ، وەکو زانراوە لاری ئێستای زەوی (٢٣,٢٧) پلە واتە: (٢٣) پلەو (٢٧)خولەکە، بینراوە ئەو لاریە لە هێواشی دایە، کاتێ ئەم لاریە گۆڕانی بەسەر دادێ وکەم دەکات و دەبێ بە سفر، واتە: تەوەری زەوی دەبێ بە ستوونی چوار وەرزەکان بزر دەبن .**

**١٠- سەرباری ئەم جولانە هێزی کێش کردنی ئەستێرەکان بۆ سەر زەوی هەندێ جوڵەی**

لاری (الترنحیة)ی بچوك پەیدا دەكەن.

١١- لەرە لەری جێگای چەقی قورسایی كۆمەڵەی خۆر.

١٢- جوولەی گەردوونی كە كۆمەڵەی خۆر پێوەی هەڵدەستێ، لەوانە زەوی بە دەوری كاكێشانداو خولەكە(٢٢٥) ملیۆن ساڵ دەخایەنێ و خێرایی (٢٥٠)كم/ چ.

١٣- جولەیەكی تری گەردوونی هەیە كە كاكێشان لەوانە زەوی بە دەوری چەقی سیستەمی مەجەرەكانی خۆ جێ یی(المحلیە) دا چەرخ دەدات كە دەورو بەری (٣٠)مەجەررە دەبێت بە خێرایی (٣٠كم/ چ) بە گوێرەی خێرایی مەجەرەكانی تر.

١٤- جوولەی گەورەی گەردوون، هەموو مەجەرەركان بە دەوری چەقی گەردوون دا دەسوورێنەوەو، ئیمرۆ خێرایی ئەمە ناژمێردرێت[1].

**١٧- سەرنجێ لە وشەی ( نسلخ ) مەسەلەی شەوو ڕۆژ.**

**١٨-سەرنجێ لە وشەی ( إذا جلاّها ).**

**١٩-سەرنجێ لە وشەی ( یولج ).**

## ئایا دەزانی ڕۆژ لە شەو دادەماڵرێت؟
## داماڵرانی ڕۆژ ڕاستیەكی قورئانی كۆنە.

چۆن زانست دیاردەی داماڵرانی(الانسلاخ)ی ڕۆژی لە شەو دۆزیەوە ؟

خوای گەورە فەرموویەتی ﴿وَآيَةٌ لَّهُمْ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ﴾[2]. واتە لە بەڵگەكانی خوا بۆ ئەوان شەوەكە ڕۆژی لێ دادەماڵین و ئەو كاتە ئەوان لە تاریكی دان .

---

(١) الانفجار الكبير / او مولد الكون/ اومید شمشك/ ت: اورخان محمد علی/ ل:٩-١٢.

(٢) یس: ٣٧.



## ڕاستی یەکی زانستی

(الشیخ محمد متولی الشعراوی) لە( الادلة المادیة علی وجود الله) دا دەنوسێ: ( زانستی نوێ دۆزیەوە لە هەموو لایەك شەوو تاریکی دەوری زەوی داوە، ئەو بەشەی ڕوناکی دەگرێتەوە لە ڕۆژدا ئەو هەوایەیە دەوری زەوی داوە کە بەرگەکی تەنکی وەکو پێستە، کاتێ زەوی سورایەوە ئەو پێستە تەنکە ڕادەمالێ کە ڕۆژە و بە هۆی ڕەنگدانەوەی ئەو تیشکانە پەیدا دەبێ کە لە خۆرەوە دێن بۆ سەر گەردەکانی ناو هەواو ڕۆژ پەیدا دەبێ، بەو سوڕانە داماڵرانی ڕۆژ لە شەو ڕوو دەدات) [1].

وە ئایا مەبەست لە﴿وَالنَّهَارِ إِذَا تَجَلَّى﴾ چی یە؟ لای ( الجاهد) وشەی ( تجلی) بە مانای داپۆشین دێ.

## ڕاستی یەکی تری زانستی

( خەڵکی وا دەزانن زەوی وەستاوە و هەموو ڕۆژێ خۆر هەتاو بەسەری دا هەڵدێ ئاوا دەبێ : واتە خۆر هەموو بەیانیەك هەڵدێ و هەمووشتێ ڕووناك دەکاتەوە لە ڕۆژدا ، بەلام قورئانی پیرۆز شتەکی تر دەفەرمێ کە زانستی جیۆلۆجی نوێ پەسەندی دەکات زانایان قبوڵیانە : ڕۆژ کە لە جوڵەی زەوی یەوە پەیدا دەبێ ئەو خۆر دەردەخات و بۆ سەیر کەرانی دەینوێنێت)[2].

﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا﴾ [3].

کەواتە: (جلاها) واتە : جوڵەی خۆر دەردەخات !

مەبەست لە ( الولوج) چی یە لە ئایەتی ﴿يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ﴾[4]. واتە:

---

(١) الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفی متولي/ ل:٩٢.

(٢) الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفی متولی/ ل:٩٢.

(٣) الشمس:١-٣.

(٤) الموسوعة الكونية الكبری /ج٦ / ل:٢٢٩.

خوا شەو دەخاتە ناو ڕۆژ و، ڕۆژ دەخاتە ناو شەو. بۆچی ووشەی ( ولـوج ) بەكاردێنێ، نەك ووشەی تر وەكو (يدخل )؟

ووشەی (الولوج) لەزمانی عەرەبی دا واتە: چونە ناو شتێ لەسەرەخۆ، نەك بە خێرایی یەكی زۆر، خوا خێرایی زەوی كردووە بە (١٦٠٠كم) لە سەعاتێ دا، گەر خوا مەبەستی بوایە لەكات ژمێرێكدا(١٠٠٠٠كم ) یان (١٠٠٠٠٠كم ) بڕوات، یان بە خێرایی و لە هیكرا شەوو ڕۆژمان بۆ دابنێ دەیتوانی.... [1].

(پرۆفیسۆر (دوان .ت. كیش ) دەڵێ :( ئەو وردەكارییەی گەردون لە ناوی دا دەخولێتەوە وەكو ئامێرەكی زۆر وردو تەواوە بێ ناتەواوی و ئەنگێ، ئەم وردەكاییە دەكرێ لەم گەشتەی زەوی خۆماندا ببینرێ كە بە كامڵ وەسف دەكرێ، ئەو بە (٣٦٥) ڕۆژ و (٥)كات ژمێرو (٤٨) چركە خولێ بە دەوری خۆردا تەواو دەكات، لەو سوڕەش دا زەوی گۆڕانەكی كەم نەبێ تۆمار ناكات، كەس ناتوانێ ئەو گەشتە ڕێكە دابین بكات كە بەردەوامە و دوورە لە هەموو ناتەواوی یەك جگە لە توانای بێ سنور كردگار نەبێت) [2].

بەڵێ: خوای گەورە ڕاستی فەرمووە: ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يُولِجُ اللَّيْلَ فِي النَّهَارِ وَيُولِجُ النَّهَارَ فِي اللَّيْلِ﴾! (د.كریسۆن موریسۆن) دەڵێ : زەوی بە (١٨ میل/چ) بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە، گەر بۆ نموونە (٦)میل یان (٤٠) میل بوایە لە چركەیەكدا ، گەر لە ڕۆژ نزیك باین یان دوور بواین جۆری .ژیانمانی قەدەغە دەكرد.

(١) هل تعرضت لغسيل الدماغ/ ل:٤٨.

(٢) العلم يدعو للايمان/ ل:٥٥.





(٢٠)- **شەوو ڕۆژ بەردەوام هەیە :**

**﴿يُقَلِّبُ اللَّهُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَعِبْرَةً لِّأُوْلِي الْأَبْصَارِ﴾[1].**

واتە: خودا شەوو ڕۆژ ئاڵوو گۆڕ دەکات لەمەش پەند هەیە بۆ هۆش مەندان.

﴿حَتَّى إِذَا أَخَذَتِ الأَرْضُ زُخْرُفَهَا وَازَّيَّنَتْ وَظَنَّ أَهْلُهَا أَنَّهُمْ قَادِرُونَ عَلَيْهَآ أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا﴾[2].

واتە: هەتا کاتێ زەوی خۆی جوان و ڕازاوە کرد، خەڵکەکەی وایان زانی ئەوان بە توانان بەسەری دا، فەرمانی ئێمە یان بۆ دێ شەوێ یان ڕۆژێ.

## (ڕاڤەی زانستی نوێ)

**(١) پێشبینی یەکی قورئانی یە کە زەوی لە داهاتوودا بە هۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا لە هەموو بوارێکدا خۆی جوان و درەخشان دەکات، مرۆڤ دەکەوێتە حاڵەتێ لە خۆبایی بون وەکو خوا فەرموویەتی: ﴿إِنَّ الْإِنسَانَ لَيَطْغَى أَن رَّآهُ اسْتَغْنَى﴾ و خوانەناسی وا دەزانێ بە چەکی تەکنەلۆژیاو زانست دەتوانێ دەسەلاتی خۆی بە تەواوی بەسەر زەوی دا بگێرێت و کۆنترۆلی بکات . ئالە و کاتەدا فەرمانی خوا دێ بۆ لەناو بردنی ئەم شارستانی یە ماددی یە تەکنەلۆژییە سەرمایە داری یەو خاپوری دەکات.**

**(٢) مەبەست لە (نقلب) و﴿أَتَاهَا أَمْرُنَا لَيْلاً أَوْ نَهَارًا﴾ ئاماژەیە کە زەوی لەیەك کاتدا شەوەو هەم ڕۆژە، وە ئێمە ئیمڕۆ دەزانیین نیوەی گۆی زەوی کە بەرامبەر خۆرە ڕۆژە و نیوەکەی تر کە بەرامبەری خۆرنیە شەوە، کاتێ فەرمانی خوا دێ بۆ گۆڕینی ئەو سیستەمە ماددی و بێ دینی یە بۆ سیستەمێکی ئیسلامی، یان فەرمانی خوا دێ بۆ وێرانکردنی یەکجاری زەوی بە گوێرەی لایەکی زەوی ڕۆژە و، بە گوێرەی لاکەی تر شەوە. ئایا موحەممەد( ص) گەردونناس و جیۆلۆجی یەك بووە تا ئەمە بزانێ؟ ئەوەی ڕاستی بێ ئەمە معجیزەیەکی قورئانی یە بۆ**

---

(١) النور:٤٤.

(٢) یونس: ٢٤.





پێغەمبەر(ﷺ) وە ڕەدی ئەم بێ بڕوایانە دەداتەوە کەوا دەزانن مرۆڤ دەتوانێ بـە تەکنـەلۆجیاو زانست شوێنی دیـن و خـوا بگرێتـەوە لـە زەوی دا. وەکـو فەیلەسـوفی سـەرگەردانی لاو (گیـۆ guyau-١٨٨٦) دەیوت وەکو لە کتێبەکەی دا نوسیویەتی بە ناوی( بـێ بڕوایـی داهـاتوو ) : (داهاتو دین جێگای خۆی بـۆ زانسـت چـۆڵ دەکـات ). کەچـی پێـشبینی یەکـەی نەهاتـەدی و فەلسەفەی زانستی ماددی لە ماوەیەکی زۆر کەم دا هەرەسی هێنا لە بەرامبەر زاسـتی ئیمـانی دا. چونکە زانسـت نـەك لـەڕووی تیوریـیـەوە سـنور دارە و لـە بازنـەی هەسـتە ماددییـەکان دا ئەزموونەکانی تاقی دەکاتەوە، بەڵکو لە ڕووی پراکتیکی یەوەش هەر سنور دارە. پاشان زانـست لە ڕێگای ئەزمونیەکانیەوە توانی پەرچی هەموو ئەو تیورو گریمانکارییە ماددییانە بداتـەوە کـە پێچەوانەی پرەنسیپە دینیەکانن و لەسەر خەیاڵ و ئەندێشەی هەڵەشی دامـەزراون نـەك بنـەمای زانستی و ئەزموونی و بیسەلمێنێ زاسـت ڕاڤەیـەکی دینـە. وەکـو (میریـت سـتانلی کونجـت) ی فەیلەسـوف سروشـت نـاس لـە (الله یتجلـی فی عـصر العلـم /١٦) دا دەڵـێ: (زانسـت تـەنیا توێژینەوەیە کە بۆ دروست کراوو ئاسەوارەکانی خواو تواناکەی) .

**( ٢١ ) بە شوێن یەکدا هاتنی شەوو ڕۆژ.**

**( ٢٢ ) خێرایی بە شوێن یەکدا هاتنی شەوو ڕۆژ**

**( ٢٣ ) گرنگی بەخێرایی یەکتری دا هاتنی شەوو ڕۆژ بە بەردەوامی.**

**( ٢٤ ) جیاوازی شەوو ڕۆژ بەردەوام هەیە :**

**(١)- ﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ خِلْفَةً لِّمَنْ أَرَادَ أَن يَذَّكَّرَ أَوْ أَرَادَ شُكُورًا﴾ [١].**

واتە: خوا ئەو خوایەیە شەوو ڕۆژی بۆ کردون بە هاتوو بە دوای یەکتری دا بۆ کەسێ بیەوێ یادبکاتەوە یان بیەوێ سوپاسگوزار بێت.

(١)الفرقان:٦٢.




(٢) ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾[١].

واتە: شەو دادەپۆشیٚ بە ڕۆژ بە پەلە داوای دەکات﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾[٢].

(٣) ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ الشَّمْسَ ضِيَاءً وَالْقَمَرَ نُوراً وَقَدَّرَهُ مَنَازِلَ لِتَعْلَمُواْ عَدَدَ السِّنِينَ وَالْحِسَابَ﴾[٣].

واتە: خودایە خۆری بۆ کردون بە چەند ڕوناکی یەك و مانگ بە تریفە و کردویەتی بە چەند پلەیەك تا ساڵ و ڕۆژی پیٚ بزانن.

﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِراً﴾[٤].

واتە: خوایە شەوی بۆ داناون تا تیٚ یدا ئارام بگرن و ڕۆژی بۆ داناون بۆ بینین.

﴿وَهُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِبَاساً وَالنَّوْمَ سُبَاتاً وَجَعَلَ النَّهَارَ نُشُوراً﴾[٥].

واتە: خوایە شەوی بۆ کردون بە پۆشاك و شەو بۆ پشودان و ڕۆژی بۆ کردون بەڵاوبونەوە

(٤) ﴿وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾[٦]. واتە: لە جیاوازی شەوو ڕۆژدا .

## (ڕاڤەی زانستی نویٚ)

(١): لێرەدا قورئان دەری دەخات شەوو ڕۆژ بەردەوام بە شوێن یەکتردا دێن و چۆن بە شوێن یەکتردا دێن بۆچی؟! قورئان سەرەنجمان ڕادەکێشیٚ کە شەوو ڕۆژ بەردەوام بەرێکی بەدوای یەکتریدا دێن بیٚ پچران، لەگەڵ چەند گۆڕانی لەو تاریکی و ڕوناکیەدا لە هەموو ڕۆژێك دا لەگەڵ درێژی و کورتی زەمەنی شەوو ڕۆژی ڕۆژەکی تردا خوای گەورە هەموو ئەو گۆڕانانەی بەیەك ووشە گوزارش کردووە لە زۆر ئایەتی قورئانیدا﴿وَاخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ﴾. وشەی(خلفة) واتە:

(١) الاعراف:٥٤.

(٢) الرعد:٣.

(٣) يونس:٥.

(٤) يونس:٦٧.

(٥) الفرقان:٤٧.

(٦) ال عمران:١٩٠.

شەوو ڕۆژ بەدوای یەکتریدا دێن، پێویستە لەیەك کاتدا شەوو ڕۆژ پێکەوە لەدایك بوبن، هەتا هەردوولا ببنە جێگرەوەی ئەوی تر(خلفة)، ناکرێ ڕۆژ هاتبێ ئەنجا شەو، یان شەو ئەنجا ڕۆژ، چونکە یەکێ دەبوو بە سەرەتا (بیدایە) ی ئەوی تر نەك جێگرەوەی ئەویتر. هیچ پارچە خاکێك نیە هەمیشە شەو بێ یان هەمیشە ڕۆژ بێ، بەلکو هەموو پارچە خاکەکی زەوی شەوو ڕۆژی تێدایە، گەر زەوی جێگر بوایە شەوو ڕۆژ پێکەوە دروست نەبان لە سەرەتادا شەوو ڕۆژ نەدەبوون بە جێگرەوە (خلفة) ی یەکتری، بەلکو سوڕی زەوی بە دەوری خۆی دا ئەو شەوو ڕۆژ بە دوای یەکتریدا هاتنە پەیدا دەکات[1].

(٢) گەر سەیری بەشی دووەم بکەین دەبینین ئەم ئایەتە: ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ﴾ دەبینی لە سوڕەی (الاعراف) دا ﴿يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ هاتووە ، کەچی لە سوڕەی (الرعد) دا نە هاتووە ئەمەش لێکدانەوەیەکی زانستی گەردونناسی و جیۆلۆجی مەزنی هەیە.

## ( ڕاستی یەکی زانستی )

(١) زانستی نوێ سەلماندویەتی سەرەتا دروست بونی زەوی بە خێرایی یەکی گەورە سوراوەتەوە، پاشان لەکەمی داوە تا بووە بە (٢٤) کات ژمێر لە سوڕێکی تەواودا.

(٢) ئەم خێرایی یە لە کەمی دایە بەپەیتا پەیتایی و بەردەوامە. بۆیە خوا لە سورەتی (الرعد) دا بە﴿يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ی هێناوە واتە : بەپەلە داوای دەکات، ئەمەش ئاماژەیە بۆ خێرایی سوڕی زەوی لەم کاتەدا، کەچی لە(الرعد) دا نەهاتووە چونکە لە باری ئاسایی دایە[2].

(٣) (ویلیام دای) دەنوسێ: (زەوی سەرەتایی ڕووت و قوت بووە شەوو ڕۆژی بە خێرایی هاتووەو بەیانیان تیشکی سەر بنەوشەیی بە بلێسە گڕینە توندەکەی بەو ئاسمانە ڕەشەدا دەیسوتاند، ئەو کۆگلۆ و سەکۆیە کانزایی تاوێرییە نەتواوانە کە لەسەرەتادا ئەم هەسارەیان پێك هێنابوو لەوێ کەوتبون و زۆر بەسەر ڕووی مانگی وشك و بریقەدار دەچوو، خۆر بە ماوەیەکی کەم

---

(١) الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفى المتولي/ ل:٩٠-٩٦.

(٢) الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفى المتولي/ ل:٩٧-٩٨. بە هەندێ دەسکاریەوە.





بە هەمان خێرایی هەڵاتن ئاوادەبوو، لەم جیهانە دۆزەخیەدا( hadean کە نەهەواو نە ئاو هەبوو، ماوەی شەوو ڕۆژ لە پێنج کاتژمێر پتر نەدەبوو) [1].

(٣) ئەمجا لە ئایەتەکانی زنجیرە سێ دا قورئان ئاماژە بە گرنگی شەوو ڕۆژ دەکات بۆ مرۆڤ و هاتنیان بە دوای یەکتریدا، کە زانستی جیۆلۆجی نوێ تازە پەی پێ بردون. وەکو لە سورەتی (یونس:٦٧) و (الآسراء:١٢) و (الفرقان :٤٧) دا باسی کردووە.

(١) : گرنگی شەوو ڕۆژ ئێستا زانراوە کە بەدوا یەکتری داهاتنیان چەندە سودی هەیە، خەڵکی ڕۆژمێری و ساڵنامەی پێ دەزانن کە (١٢) دوانزە مانگەکان و ڕۆژانی مانگەکانن، خوا شەوی کردووە بە مایەی پشودان و حەسانەوەو ڕۆژیش بۆ بینین و یارمەتی دانی ئەوە. خوای گەورە شەوو ڕۆژی کردووە بە دوو بەڵگە بەسەر خەڵکەوە کە بەرژەوەندی دین و دنیایان تێ دایە ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ اللَّيْلَ لِتَسْكُنُواْ فِيهِ وَالنَّهَارَ مُبْصِرًا إِنَّ فِي ذَلِكَ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ﴾ یونس:٦٧. نیشانە و بەڵگەیە ئەمە لە دیندا چونکە هەردوو لا شوێن کەوتووی یەکترن و دەگۆڕێن، ئەمەش مانای وایە سەرەتابونیان نەبووە، بەڵکو بکەرێ هەیە لەدوای پەردەوە هەڵیان دەسوڕێنێ و بەرێژەو ئەندازەیەکی دیاری کراو بەڕێوەیان دەبات، نیشانەو بەڵگەشن بۆ دنیا چونکە هەندێ بەرژەوەندی دنیایی هەیە بێ شەوو ڕۆژ دەست ناکەون، گەر شەو نەبێ نوستن و پشودان نابێ و، گەر ڕۆژیش نەبێ کاروکاسبی نابێت، پاشان ڕۆژومانگ و ساڵی پێ دەزانرێ، شەو بە بە پۆشاك ناسراوە، چونکە لە گڕی خۆرو هێرشی دوژمن دەیان پارێزێ وخەوی کردووە بە مایەی پشوو دان دوای ماندوو بوون و، ڕۆژی کردووە بە مایەی بلاّو بوونەوەو چوون بۆ ئیش و کار)[2]. هەندێ گیانداریش هەیە شەو گەڕن بە دوای نێچیردا دەگەڕێن! -

(٢) ڕۆژ تیشکەکانی خۆر سوود بەخشی بە زەوی دەدات بە مرۆڤ و گیانداران و ڕووەك کە

---

(١) نشأة الكون على الكوكب الارضي/ت: يعقوب يوسف ابونا / مراجعة: د: ريعون شكوري/ ل:٣٥ / ط ١٩٨٩ / بغداد.

(٢) الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفى المتولي/ ل: ٩٩-١٠٠. سەیر بکە.





خوا لە ووشەی ﴿وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا﴾[1]. دا کورتی کردۆتەوە.

(معاش) واتە: بژێوی و هۆکاری ژیان. (د.احمد زکی)ئەم وشەیە (المعاش) بەم شێوەیە ڕاڤە دەکات:(هەموو سەرچاوەکانی ژیان لە تیشکی خۆرەوەیە، ئەو ڕوەکانەی وەکو پاقلەو گەنم و هەرچی زەوی دەیروێنێ بە هۆی خۆرەوەیە. خۆریش خۆی ڕەوانەی زەوی دەکات و توخمەکانی زەوی ڕێك دەخات وەکو بەن ودەرزی. بە هەزاران جۆراو جۆر ڕێکیان دەخات. چەندان گەنجینەی تێدایە کە وزەو توانست وژیانیاندا تێ حەشار داوە. ئەوانە ڕووەکی زەوین. لەو ڕووەکانە گیاندارانی زەوی دروست دەبن .

توندو تۆڵی لە دروست بووندا و زەوی بۆ جوڵەیەك لە ڕووەکی زەوی وەردەگرێ. مرۆڤ خواردنی سەرەکی ڕووەك و گیانداری زەویە، لەم سەرچاوانە کە وزەکانیان داخراوە سەرچاوەی هەموویان خۆرە، مرۆڤ لێیان دەخوات و وزەو توانستی یان لێ وەردەگرێت. ژیان پێویستی

بە ئاوە ،ڕووەك پێویستی بە ئاوە ،ئاژەڵ و گیانداران پێویستیان بە ئاوە. دەریا خوێ یەکی تاڵ و تفتە. خۆر دەیگۆڕێ بە ئاوەکی سازگار. ئەو دەیکات بە باران بۆ سەر دارو درەخت و ڕووەکەکان، یان وەکو جۆگەلەو ڕووبار بە زەویدا لێ دەخوڕێ، مرۆڤ دەیەوێ بە زەویدا بڕوات، بەڵام دەڕواتە شوێنێ ئاوی لێ یە کە سەرچاوەکەی ئاسمانە، خۆ گەرم کردنەمان و برژاندن و لێنانی خواردن بە دار سووتاندنە، داریش گەنجینەی ووزەیە هەزاران ساڵە خۆر ئەو ووزەیەی پێ سپاردووە. داوای جووڵە دەکەین هەڵمان بگرێ، یان جوڵەیەك بە دەورماندا بجوڵێتەوە بەهۆی لێ خۆرینەکانمان، ولاخەکانمان دەکەین بە ترومبێل و مەکینە، هەر ترومبێلە پەیکەری خۆی هەیەو سوتەمەنی خۆی هەیە، ترومبێلی سەرەتای مرۆڤ کەرو ئێسترو ماین و گاو وشتر بووە، کە بەهۆی خۆر دروست بوون و بەنزینیان لە خۆرەوە بووە، بەنزینی ئەوانە ئەو کاوو سێوەڕەیە بووە کە بەرهەمی خۆرە. شارستانی پێش دەکەوێ و داخوازی جوڵەی زۆر لەوە پتر دەکەین، ئەو جوولانە لە ئامێرێ داوادەکەین زۆر خێرا دەجوڵێنەوەو خێر بۆ خەڵکی دێنن و، ئەمەش لە خەڵوزو چەوری دا دەدۆزینەوە، یان لەوزەکانی تری خۆردا، کەلەزەوی دا تاقەت

---

(١) النبأ:١١.



کراوە.....) [1]. بەڵێ ئیمرۆ کارەباو هەر ئامێرەکی تر سەرچاوەی لە وزەی خۆرەوەیە:

٣- شەو و نوستن پشوودانە بۆ مرۆڤ و دەرچوونی لە دونیای ماددی: ﴿وَجَعَلْنَا اللَّيْلَ لِبَاسًا﴾[2]. یان ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾[3]. واتە (شەومان بۆ کردوون بە پۆشاك) یان (نووستنمان بۆ کردوون بە حەسانەوە) (بێگومان لەگەڵ جوولەی زەوی و هاتنی شەوو ڕۆژدا سووری بایۆلۆجی لە لەشی مرۆڤدا بە دوای یەکتردا دێن، لە ڕۆژدا چالاك دەبن و لە شەودا کەم دەبنەوە، سووری نوستن و بێدار بوونەوە چەند چەقە دەمارێ لە ناو مۆخدا بە ناوی ناوچەی ژێر لانکۆڵەی بینین(HY POTH HALAMUS) هەڵی دەسووڕێنێ و چەقی خەو دەکەوێتە پێشەوەی ئەم ناوچەیەوەو بەشی بێدار بوونەوە دەکەوێتە دواوە، ئەم دوو چەقە چالاکی و خاوی بە دوای یەکتر دادێنن بە شێوەیەك هاوکاتی بە دوا یەکتر داهاتنی شەو و ڕۆژبن، بۆیە دەزانین لەم ناوچەیەدا کات ژمێرەکی بایەلۆجی هەیە زۆرکرداری نوستن وهەڵسان ڕێك دەخات ) [4].

(بۆچی نووستن؟ کەسی هەراش وکامڵ ڕۆژانە پێویستی بە (٦ )کات ژمێر بەلای کەمەوە هەیە بۆنوستن، تاباری هزری باش بێ، زۆربەی خەڵکی پێویستیان بەم ڕاددەیە پترە هەیە، بەلاّم ئەو کەسانەی وا دەزانن دەتوانن کاری ڕۆژانەیان بە چوستی ئەنجام بدەن و کەمتر لەم ماوەیە خەوتوون ئەوە فێڵ لە خۆیان دەکەن. بێ خەوی دەست درێژی یەکە دەکرێتە سەر یاد (الذاكرة)، ئەوقوتابیەی نایەوێ بەڕاددەیەکی باش بخەوێ ڕۆژی داهاتوو ناتوانێ زەینی تەواوی لەوانەکەی بێت و بیرپەرت دەبێت و زۆری لەوانەکانی ڕابردووی نایەتەوە یادی، بۆیە پلەی چاك بە دەست ناهێنی، زۆر جار بێبەشیەکی زۆر لەخەو هەرەس هێنانی دەماری (الانهيار العصبي) پەیدا دەکات.

ئەوکاتەی بەخەو بەسەری دەبەیت بەلاش ناڕوات، خەوی تەواو جەوهەرێکی گرنگە وات

---

(١) مع الله في السماء/ د: احمد زكي/ ل:١٤٤-١٤٥.

(٢) النبأ:١٠.

(٣) النبأ:٩.

(٤) الموسوعة الكونية الكبرى/ ج١٥ / د: ماهر احمد احمد الصوفي / ل: ٥٢.

لێدەکات هەست بەخۆشیەکانی ژیان بکەیت، مرۆڤی ماندوو دەتوانێ کاری ڕۆژانەی ڕۆتینی ئەنجام بدات، بەلاَم ناتوانێ هیچ بڕیارێکی ساغ بدات. خەو چارەسەری دلاَنی پڕلە دلەڕاوکێ(القلق) و لەشە داهێزراوەکانەو پشووی ماندوبوونی ڕۆژانەیە، لەکێشەکانت دووردەخاتەوەو خەو بۆ نەخۆش و ساغ بەسوودە .

خەولەبەرهەتاو دروست نیە، بەتایبەتی لەناوچەی گەرمداو تووشی تاویردن وئاکامە خراپەکانی دەبیت) [1].

دیسان (نووستن) بێداربوونی دنیای ڕووح و نەستە بۆ چوونەناو دنیای گیانی و میتافیزیکی یەوە بۆخەون و ئیلهام وپەیوەندی کردن بەگیانەکانەوە .

(ابن عباس)لەسەرئەم ئایەتە﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ [2].

دەڵێ (گیانی مردوان و زیندوان لە خەودا بە دیداری یەکتری دەگەن، پرسیار لە یەکتریەکەن، خوا گیانی مردوان دەگرێت و گیانی زیندوان بۆلاشەکانیان دەگێڕێتەوە) [3].

(د: شتاینر) دەڵێ لەوتارەکەی دا(مردوان لەگەڵمان داناماادەن):(ئێمەلەکاتی چونە سەرجێگا بۆ نووستن کاتی بێدار بوونەوە پەیوەندی بەمردوان وگیانە بالاَکانی تر دەکەین) [4].

(٤) دیسان وەکو(ج.ا.ج.رایز) باسی کردووە(پێویستە ئێمە ئاماژە بکەین بەسەعاتەکانی ڕۆژ کە بەپێی وەرزەکان و هێڵی پانی دەگۆڕێن، ئەمەش ڕەنگە هەندێ کاریگەری لەنێوان ئەوماوە جیاجیانەدا دروست بکات. (فرانس هلبرج) ناوی ناون ئیقاعەکانی ڕۆژانە) [5].

---

(١) سەرچاوەی ڕابردوو/ ل:٦١-٦٢.

(٢) الزمر:٤٢.

(٣) الروح / ابن القيم الجوزي/ ل:٣٦.

(٤) ما بعد الحياة/ كولن ولسن/ ت: د: فاضل السعدوني/ ل:١٦٦.

(٥) عصر الخوارق/ ج.ا.ج.رايز/ ل:٤٩-٥٠.



ئەم ئیقاعانە قورنان بەخۆرهەلأت و خۆرئاواکان ناوی بردووە.

(هەندێ زانا بۆ ئەوە دەچن کەئەم ئیقاعانەی ڕۆژانە ڕەفتاری ئەندامی بەگشتی ڕێك دەخات، بەتایبەتی لەڕاست خەون و بێداری ووزەی بەدەست هاتوو وزەی خەرج کراوو کاری تر کەجوولەی شەوو ڕۆژکاری تێدەکات، زانراوە کەژمارەیەکی زۆرگوڵ و ڕووەك لە ڕۆژدا دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەمژێ لەگەڵ خۆرئاوابووندا ئۆکسجین دەبەخشێت، ئەمەش ئیقاعێکە کاریگەری زۆری هەیە بۆسەر مرۆڤ و گیانداران، هەمووگیاندارانی ئەندامی پێویستیان بەم ئیقاعانە هەیە، تا زیندەوەری یەك خانەیی وەکو یۆگلینا کە لە گۆم وزەلکاوەکاندا دەژین هەستیارن بەرامبەر بە ڕوناکی بۆ خۆراك دەگەڕێ و لەگەڵ خۆرنابووندا دەوەستێت لێرەدا ئیقاعی تری جۆراو جۆر هەیە لەناو ئەو ئیقاعانەی ڕۆژانەدا و سروشت بە گشتی وەلأمی دەداتەوەو هەمووی بە هەلأتن و ئاوا بوونی خۆر کاریان تێ دەکرێت).

(شاراوە نیە تیشك کار دەکاتە سەر میوەو هەراش بوونیان چۆن هەندێ ڕووەك وەلأمی ڕووناکی دەدەنەوەو هەندێ جار گەلأکان دەکەن بە درك و پەرچ لەبەرامبەر گەرمی خۆردا. ئەمانە هەندێ تێبینی گشتین زۆر کەس لەوانەی سەیری سرووشت و گیانداران و ڕووەك دەکەن دەیزانن. دیسان زانایان تێبینی ئیقاعی مانگیشیان کردووە کە لەو جووڵەوە دەردەکەوێ لەگەڵ جوولەی زەوی دا دەبینرێ، لەڕاست خۆردا خوولگەی تەواوی مانگ لەدەوری زەویدا هەموو خالەکی زەوی زۆر کەمتر لە(٢٤) کاتژمێردا تووشی ڕوناکی مانگ دەبێ، واتە: ڕۆژی هەیڤی (٢٤,٨) کاتژمێر دەخایەنێ. زانراوە کە کاریگەری مانگ لە ڕووی هێزی کێش کردنەوە بۆ زەوی دیارە، بەمە مانگ جۆرە ئیقاعەکی خۆری تر لە ڕووی زەمەنەوە کەمتر پەیدا دەکات، واتە هەلکشانی بەرز لە زەویدا هەر (٤٨)سەعات جارێ دوا دەکەوێ، ئەمەش یەکێکە لە کاریگەریەکانی مانگ لەسەر ژیانی ئەندامی، هەلکشان کار دەکاتە سەر ژیانی ئۆرگانی و کرداری میتاپۆلیزم ئیقاعی مانگ کاری تێدەکات). دیسان دەلێ (هەسارەکانی دەوری خۆر بەهۆی ئەوەی خوولگەیان هێلکەییە لەهەندێ وەرزدا لە زەوی دوور دەکەونەوە و لەهەندێ وەرزدا





نزیك دەكەونەوە، ئەمەش ئیقاع و كاریگەری پتر دەكەن) [1]. (كاریگەری ئاسمانی لەوانە كاریگەری هەسارەیی لە مرۆڤ و زیندەوەران زیاترە چوونكە زۆر نزیكن لە زەوی، سەرباری كاریگەری خۆرو مانگ لەچاو گاریگەری تەنە وردەكانی تری ئاسمان.

(هەر لەكۆنەوە ئەستێرەناسان ئاسمانیان كردووە بە(١٢) بورجەوە، بۆ ئاسان كاری دۆزینەوەی شوێنی ئەستێرەكان كە بە پێی جوولەی زەوی شوێنیان دەگۆڕێت). دیارە ئەمانەش كاردەكەنە سەر ژیانی سەر زەوی. قورئانی مەزن لەزۆر ئایەتدا ئاماژە بەم ئیقاعانە دەكات ﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ [2].

واتە مانگ پلەی پلەمان كردووە تاوەكو لە لقەدار خورمایەكی كۆنی وشكی چەماوەدەگەڕێتەوە. خۆر بۆی نیە بگاتە مانگ و شەو پێش ڕۆژ بكەوێ هەموویان بە خوولگەی خۆیاندا مەلە دەكەن ﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الْبُرُوجِ﴾[3]. واتە: سوێند بە ئاسمانی خاوەن بورج.

ئایا ئەم هەسارەو بورج و مانگ و خۆرە لە ڕووی زانستیەوە چۆن سەیری كاریگەرییان دەكرێت؟

**(بێگومان ئەستێرە گەری لە سەردەمی ئیبراهیم و مووسا دا لە عێراق و كوردستان ومیسردا زۆر پەرەی پێدراوە تا لە سەدەكانی ناوەڕاستیش لە خۆر هەلآت و خۆرئاوای ئیسلامیدا زۆر پەرەی پێدراوە چوونكە خەلیفە و میرەكان و سوڵتانەكان بێ پرس كردن بەو ئەستێرە گەرانە هیچ كارێكیان نەكردووەو نەچوونە مەیدانی جەنگەوە.**(ابو ریحان البیرونی )لە (التفهیم فی صناعه **التنجیم)**دا دەڵێ بابای ئەستێرە گەر دەبێ لەچوار زانستدا شارەزابێ(ئەندازەو ژمارەی وهەیئەت وئەحكامەكان. .... ) [4].

---

(١) سەرچاوەی رابردوو/ ل:٥٢.

(٢) یس:٣٩-٤٠.

(٣) البروج:١.

(٤) تاریخ الاسلام/ د: حسن ابراهیم حسن/ ج٤/ ل:٤٩٩.




وە زۆر زانای تر لە ڕاست ئەم زانستە کتێبیان نووسیوە وەکو (مجموعە ابن سیناء فی علوم السحر والتنجیم) وە غەزالی لە (الاوقاف) داو(احمد بن علی البونی) لە(شمس المعارف الکبری)دا.

ئەوان پێیان وایە مەبەست لە(لا یعلم الغیب الا الله) مەبەست لە غەیبی ڕەهایە، نەك غەیبی نیسبی کە بە خەون و ئیلهام و ئەستێرە گەری دەزانرێت. لە هەمان کاتدا زۆرێ لە زانایانی ئیسلام تەنجیم و سیحر بە کوفر دەزانن. بۆ نموونە(د.یوسف القرضاوی) دەڵێ(تەنجیم یان ئەستێرە گەری بەشێکە لە جادوو، تەنجیم ئەوەیە واتە: خاوەنەکانی وا دەزانن ئەوان پەی بە ڕووداوی داهات وپێش هاتەکان دەبەن بە تایبەتی لە ڕێگای ئەستێرەکانەوە، ئەمە بە شێکە لە سیحرو تەڵەکە بازی ) یان دەڵێ:(ئەمە بەشێکە لە سیحرو شیرك) [1].

لە زانایانی خۆر ئاوا پرۆفیسۆری ناودار(ج.ا.ج.رایز) دەڵێ:(لێرەدا لای خەڵکی باوە کە هەسارەکان کاریگەرییان بۆ زەوی و مرۆڤ هەیە. ئەستێرەگەری و تەنجیمی کۆن پەرەی بەم کاریگەریانەو پراکتیکەکانی داوە بەلاّم گەردووناسی دژی ئەستێرەگەری و تەنجیم ڕاوەستا، دوای ماوەیێ لەم توندیەی دەستی کێشایەوە و ئێستا زۆر لە خەڵکی بڕوایان بە بورجەکان هەیە.........) [2].

عەللامە(ابن حزم الظاهري) ڕاڤەی جوانی داوە لە ڕاست ئەو ئەستێرەگەرانەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموودەی هەڕەشەی لە ڕاست خۆیان و فکرەیان کردووەو ڕەددی دانەوە(ئەو ئەستێرەگەرانەی دەڵێن: گەردوون هۆشیارەو بکەرەو بێ ویستی خوا یان لەگەڵ خوا دا گەردوون بە ڕێوەدەبەن یان تا سەر هەر هەبووە، ئەوانە کۆمەڵەکی بێ بڕوان وهاوبەشی پەیدا کەرن.....).

دەڵێ:(ئەمە ئەو جۆرە ئەستێرەگەرانەن پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستنی، کاتێ فەرموویەتی:(ان الله تعالی قال: اصبح من عبادي کافر مؤمن بالکواکب) رواه بخاري واتە: خوای گەورە فەرموویەتی بەندەم هەیە بڕوای بە من نیە بڕوای بە هەسارەکانە.

---

(١) حقیقة التوحید/ د: یوسف القرضاوی/ ج٢/ ل:٥٦.

(٢) عصر الخوارق/ج.ا.ج.رایز/ ل:٤٩.




پێغەمبەر(ﷺ) ڕوونی کردۆتەوە کە ئەمە ئەوانەن دەڵێن:(مطرنا نبوء کذا وکذا) [1]. بەڵام ئەوەی بڕوای وایە گەردوون دورست کراوەو هزری نییە و خوا دورستی کردووە و کردویە بە بەڵگە بۆ بونەوەرەکان ئەوە کافریان بیدعە کارنییە. ئەمە ئەوەیە وتمان هەڵەی کردووە، چونکە ئەو کەسەی ئەم قسانە دەکات پشت بە ئەزمونەکان دەبەستێ، هەیە لەو ئەزمونانە چاکە وەکو هەڵکشان و داکشانی کاتی هەڵاتن و پڕبونەوەی مانگ و ئاوابونی و پڕبونەوەو کەمکردنی.

یان وەکو کاریگەری مانگ بۆ سەر کوشتنی و لاخی بریندار کە روونـاکی ئەوی بەرکەوتووە، یان کاریگەری بۆ سەر مێشك و خۆین وموو.....) [2]. بەم شێوە مەسەلەی تەنجیم لە کۆن و تازەدا جێگای جیاوازی موسڵمانان و زانایانی بووە! ئـەوەی گومـانی تێدا نییە خۆر کاریگەری هەیە بۆ سەر زەوی بە خاکەوە، بە ئاوەوە، بەهەواوە، بە گیانـدارو رووەکـەوە، بە سامانی کانزایی یەوە کە چاوگی ژینگەی مرۆڤن. بەڵێ(خۆر چاوگی تیشکی کەهرۆموگناتیسی یە، گرنگی یەکی تایبەتی هەیە بۆ سوڕی سروشت لە ژینگەدا، سورەکی پێویست لە ژینگەدا، سورەکی پێویستە بۆ پاراستنی بەردەوامیژیان لە گۆی زەوی دا، وەرگرتنی وزەی خۆرو گۆڕینی بۆ کارلێکردنی کیمیایی دا لە ژیانی ئاو لە سروشتداو نوێ کردنەوەی چاوگی ئـاوی شیرینی کیشوەرەکان. **تیشکی کەهرۆموگناتیسی لە کاتی کاریگەری ئاڵوگۆڕی لەگەڵ ماددە دا بۆ وزەی گەرمی دەگۆڕێ، خۆر چاوگی لەرە لەرە کەهرۆموگناتیسیەکانە بە هەموو جۆرێ تیشکە درێژەکانی(X)تیشکی سەر بنەوشەیی وە تیشکی کەهرۆموگناتیسی. لە کاتی ڕژانی شەپۆلی کەهرۆموگناتیسی بە سەر ماددە دا هەندێکی هەڵدەمژێ، بەشێك لەو تیشکانە ئەو ماددانە دەبڕن کە دەکەونە سەریان و بەشەکەی تر دەدەنەوە، (٤٠٪)ی تیشکی خۆر لە هەوای زەوی دا دەمژێت وەکو وزە. هەر تەنێ تیشکی خۆر وەربگرێ پلەی گەرمی زیاتر لە سفری سەدی بەرز دەبێتەوە، بەرۆڵی خۆی گەرمی دەداتەوە لە شێوەی لەرە لەری درێژدا.**

بڕی گەرمی کەڕووی زەوی لە خۆری وەردەگرێ و بە تیشك دانەوەی خۆری نەگۆڕ ناسراوە

(١) واتە: بەهۆی دەرکەوتنی ئەو ئەستێرەیە بارانمان بۆ باری.

(٢) الفصل/ ابن حزم/ ج٢/ ل:٣٨٦ بەهەندێ کورت کردنەوە.




ئـەوە ووزەی تیـشكدانەوەی خۆرییـە و لـە نێـوان (١,٨) و(٢,١) تـا ووزەی گـەرمی سـم٢ خولەكێك).

(بڕی تیشكی خۆری كە ڕووی زەوی دەیداتـەوە(٥٪) لـە سـەر زەریـاو دەریاكـان و(١٥٪) لەسەر ڕووبەرە سەوزەكان و (٢٠٪) لەسەر ڕووەكەكان و(٣٠٪) لە سەر دەشـتەكان و(٨٥٪) لـە سەر بەرگی بەفرین، هەمووی(٤٠٪).

وەرگرتنی تیشكی خۆر بە ڕێكی لە ژیانی زەمینیەوە مەرجی سەرەكی كرداری ڕۆشنە پێك هاتنە لە ڕووەكدا، كە ووزەكە لـە ڕێگـای (كلۆرۆفیـل) مـاددە سـەوزەكەوە و(دووەم ئۆكـسیدی كاربۆن ) و( ئاو) دەگۆڕێ بۆ ماددەی ئەندامی، دیسان لەم كردارەدا(كاربۆن ) بە دەست دێنێت و بۆ ماددەی ئەندامی سەوزی دەگۆڕێت. وە تیشكی خۆرو هێزی كێش كردنـی زەوی دوو مـەرجی سەرەكی سوڕی ئاون لە زەویدا. وزەی خـۆری بـۆ وزەی گـەرمی دەگـۆڕێ هـەڵمی ئـاو دروست دەكات. بڕی جیاوازی وزەی خۆر لە جێگای جیا جیای زەوی وەردەگـرێ، وە بڕێكـی جیـاواز لـە وزەی دراوە بۆ هەوا جیاوازی لە پلەی گەرمی ئەو شـوێنانە دا پەیـدا دەكـات. ئـەم جیاوازیانـە تەوژمی هەوایی دروست دەكەن، هەڵمی ئاو وهەوای گـەرم بـۆ بـەرزایی بڵنـد بـەرز دەكەنـەوەو كرداری(هـەور) پێـك هـاتن دەسـت پێـدەكات. ئـەم هەورانـە بـە هـۆی تـەزووی هـەوایی(بـا) دەگوازرێنەوە لە كاتی باری گەرمی تایبەتی دا بە هۆی بـوونی تـوخمی چـڕكەرەوە، چـڕبوونەوەی هەورەكان دەست پێدەكات وەكو باران لە سەر زەوی دەبارێت.

ڕێـسای بنەڕەتی بۆ هێنانەدی سووڕی ئاو لە سروشتدا ڕووی ئۆقیانۆسی جیهانی یە كـە زۆر لە وشكانی پترە. بارستایی ئاوی بە هەڵم بوو بـەرەو كیـشوەرەكان دەڕوا ت، چـر دەبێتـەوەو لـە شێوەی باران و بەفروو تەرزەدا دەبارێت. لە وشكانیدا هەڵمی چڕبووی كەوتوو كۆدەبێتەوە تـا بـە سەر زەوی یان ژێر زەوی دا بڕوات سەر لە نوێ بۆ زەریا بگەڕێتەوە. ئەم سوڕە بە سووڕی گەورەی هایدرۆجینی ناسراوە) [1].

ئەمەی بینیمان گرنگی خۆرو تیشكی خۆرو هەسارەكان و مانگ وسوڕو ئیقاعەكانی ئەوان

(١) الانسان والبيئة/ ١م. هولي/ جي سلادك. و: عصام عبداللطيف/ ل:٣٦-٤٠ بە كورت كردنەوە.

بوو بۆ زەوی و ژیانی سەر رووی زەوی، وە سوودی شەوو ڕۆژو خەوتن و وەرزەکان بـوو بـۆ ژیـانی سەر زەوی، هەموو ئەم ڕامکردنانە بۆ پاراستنی ژیانە لـە زەویـدا لەوانـەش مـرۆڤ﴿مَتَاعًـا لَّكُـمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾!

گەر بڕوانینە قورئان لە سەدان ئایەتدا ئاماژە بۆ ئەم نهێنیە سروشتیانە دەکـات خـودا لـە گەردووندا بۆ خزمەتی ژیانی زەوی حەشاری داون وەکو لە ڕابردوو باسمان کـرد. یـان بـۆ نموونـە: خوداوەند لە ڕاست پەیوەندی تیشکی خۆرو مانگ و سوورەکەیان و هێزی کێـشکردنیان و شـەوو ڕۆژو سووڕی زەوی و دەروونی مرۆڤ وکارو کاردانەوەیان بۆ سەر یەکتری فەرموویەتی: ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا وَالْقَمَرِ إِذَا تَلَاهَا وَالنَّهَارِ إِذَا جَلَّاهَا وَاللَّيْلِ إِذَا يَغْشَاهَا وَالسَّمَاءِ وَمَا بَنَاهَا وَالْأَرْضِ وَمَا طَحَاهَا وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴾ (١).

واتە: سوێند بە خۆرو تیشکەکەی. سوێند بە مانگ کاتێ بە شـوێنی داهـات. سـوێند بـە ڕۆژ کاتی دەری خست. سوێند بە شەو کاتێ دایپۆشی. سوێند بە ئاسـمان و ئـەوەی کـە بونیـادی ناوە. سوێند بە زەوی ئەوەی پانی ڕاخستووە. سوێند بە دەروون و ئەوەی ڕێکی خستووە.)

لێرەدا خوداوەند بە زانستی یەك بە دوای یەکتری دا هێنان(الترتيب) پەیوەنـدی نێـوان ئـەم دروستکراوانە و دروست کەریان و پەیوەندی نێوانیان بۆ ئێمە والا دەکات هانمان دەدات بۆ زیـاتر وورد بوونەوە لەم ڕازانە شاراوانە، بۆ مەزنتر بوونی کرد گاریان لە هزرو ڕامانماندا.

وە خودا وەند دەفـەرموێ : ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾(٢).

واتە: ئەو خودایەی ئاگری بۆ لە داری سەوز داناون کـاتێ هـەڵی دەکـەن. بـەڵێ مـاددەی سەوز کلۆرۆفیل لە دارو درەخت دا وەردەگرێ وتاقەتی دەکات لە کاتی ڕۆشنە پێکهاتندا.(دیسان بۆچی دار دەسووتێ و بڵێسەی گازەکەی دەوام دەکات؟ چوونکە پێکهاتەی ئـەم سـووتەمەنیە لـە هایدرۆجین و کاربۆن پێکـدێت لـە کـاتی یـەکگرتنیان لەگـەڵ گەردیلـەی هـەوایی ئۆکـسجیندا

(١) الشمس:١-٧.

(٢) يس:٨٠.

دەسوڕێت هەموو ئەم مانایانە لە ووشەی﴿وَجَعَلْنَا النَّهَارَ مَعَاشًا﴾ دا کۆ دەبێتەوە، کە خوودا ڕۆژی کردووە بە مایەی بژێوی بۆ مرۆڤ و ڕووەك و گیانداران کە تیشکی خۆر ڕۆڵی سەرەکیدا دەبینێت ﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجًا لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾ لێرەدا قورئان وابەستەیی و پەیوەندی نێوان تیشکی خۆرو باران و ڕووەك ئاماژە پێدەکات، ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان کە بە هەزار ساڵ پتر باسی لەم ئیعجازە جیۆلۆجیانە کردووە، لە کاتێدا مرۆڤ شتەکی کەم نەبێ لە بوونەوەرو ژیانی نە زانیوە، ئەو بەشە کەمەش پڕبووە لە ئەفسانەو خەیاڵاتی ناڕاستی جۆراو جۆر تا زۆرێ لە کەلتووری ئیسلامیشی پڕکردۆتەوە، بۆ نموونە (ابو منصور عبدالقادر البغدادی) دەڵێ: زەوی ناجولێت[1]. وە قورئان ئاماژە دەکات شەوو ڕۆژ هەمیشە هەیەو دووبارە دەبێتەوە ئەمەش ئاماژەیە بۆ جوولەی زەوی ﴿كَلَّا وَالْقَمَرِ وَاللَّيْلِ إِذْ أَدْبَرَ وَالصُّبْحِ إِذَا أَسْفَرَ﴾[2]. واتە: نەخێر، سوێند بە مانگ، سوێند بە شەو کاتێ ڕابرد، سوێند بە بەیانی کاتێ دەرکەوت ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ إِنَّهُ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ﴾[3]. واتە سوێند بە شەو کاتێ پشتی هەڵکرد سوێند بە بەرە بەیان کاتێ هەناسەی دا، ئەم قورئانە ووتەی پێغەمبەرێکی بەڕێزە ﴿وَالْفَجْرِ وَلَيَالٍ عَشْرٍ وَالشَّفْعِ وَالْوَتْرِ وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ هَلْ فِي ذَلِكَ قَسَمٌ لِّذِي حِجْرٍ﴾[4]. واتە:سوێند بە بەیان. سوێند بە دە شەوەکان. سوێند بە تاك و جووت. سوێند بە شەو کاتێ دەڕوات، ئایا لەمەدا سوێندێ هەیە بۆ کەسێکی هۆشیارو ژیر؟ هەموو ئەم ئایاتانە ئاماژەن بۆ سووڕی زەوی و بەر دەوامی شەو و ڕۆژ لە یەك کاتداو دوو بارە بوونەوەیان: ﴿وَاللَّيْلِ إِذَا يَسْرِ﴾ . بێگومان(يسر) واتە: دەڕوات چی دەڕوات؟ بێگومان زەوی کە شەو و ڕۆژ پەیدا دەکات. ئەنجا خۆر سەرچاوەی بینینی مرۆڤە خوا فەرمویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا آيَةَ

---

(١) الفرق بين الفرق/ ل:٢٤٦. ئەمەش پێچەوانەی ئەم هەموو دەقە ڕونانەیە کە قورئان ئاماژەی بە جوڵەکانی زەوی کردوون وەك باسمان کرد.

(٢) المدثر:٣٢-٣٤.

(٣) التكوير:١٧-١٩.

(٤) الفجر:١-٥.

النَّهَارِ مُبْصِرَةً﴾[1].

کەواتە: چاو شتەکان نابینیٚ بەڵکوو تیشك لە تەنەکان دەدات و ڕەنگ دەداتەوە بۆ چاو و ئەنجا مرۆڤ دەبینێت! ئایا ئەمانە موعجیزە نین؟!

## ٢٥- مەبەست لە﴿ وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴾ وزوو لە خەو هەڵسان .

## ٢٦-مەبەست لە ﴿ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ ﴾ وگرنگی خوا پەرستی شەوانە.

قورئان دەفەرموێ: ﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾[2].

ئایا بەیانی هەناسە دەدات؟ مەبەست لەمە چیە؟! یان ﴿إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْءًا وَأَقْوَمُ قِيلًا﴾[3].

یان ﴿إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا﴾[4].

یان پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (اللهم بارك لامتي في بكورها)[5].

واتە: (خوایە فەڕو بەرەکەت بخەیە ناو میللەتم لە بەرە بەیاندا).

### ( ڕای زانستی )

**(١)زانایان بڕیاریان داوە بەرزترین ئاستی ئۆزۆن لە بەیان دایە ئەم بڕەیە لەگەڵ هەتاو هەڵاتندا لە کەمی دەدات و نامێنیٚ، ئەم گازە بۆ چالاکی مێشك بە هێزەو بۆ کاری هزری و ماسولکەیی بە سوودە، هەر کەمیٚ دوای تاو هەڵات بێدار بێتەوە ئەم ڕۆژەیە هێزەکەی داهێزراوو تەمبەڵە.**

---

(١) الاسراء:١٢.

(٢) التكوير:١٨.

(٣) المزمل:٦.

(٤) الاسراء:٧٨.

(٥) راوه الترمذي وابن ماجه.

(٢) دووەم شت لە کاتی بەرە بەیان و گزنگ دا ڕێژەی تیشکی،(سەرووی بنەوشەیی) پتره نەك کاتێ خۆر دەگاتە ناو جەرگەی ئاسمان، ئەم تیشکەیە لەش هاندەدات بۆ درووست کردنی ڤیتامین(D - د) کە تاکە ڤیتامینە(کلس) لە لەشدا قایم دەکات وە ئێسق نەرمی و زوو شکانی و لاوازی بونیەی ئێسقی هۆکارەکەی نووستنە تا هەتاو هەڵدێت.

(٣) زوو لە خەو هەڵستان لە خەوی زۆر بە دوورت دەخات، هەشت سەعاتی ڕەبەق تا ئەو پەڕی لەش تەمبەڵ و ناچالاك دەکات ژمارەی لێدانی دڵ تا ئەو پەڕی کەم دەکاتەوە و خوێن بە هێواشی بە ناو خوێن بەرەکاندا ڕەت دەبێت و چەوری لە دیوارەکانی خوێنبەرەکاندا دەنیشێنێ و تەنگە بەریان دەکات و سینگە کوژێ(الذبحة الصدرية) پەیدا دەکات. بێدار بوونەوەی نوێژی بەیانی لە خەوی درێژ دوورت دەخاتەوە.

(٤) لە لەشدا هۆرمۆنێ هەیە چالاکی لەش پتر دەکات و ئاستی ئالو گۆڕی بەرز دەکاتەوە، دیسان شەکر لە خوێندا پتر دەکات،لە بەیانیاندا تا ئەو پەڕی بەرز دەبێتەوە ئەویش(کۆرتیزۆن)ە کە لە لەشدا هەیەو، چالاکی بە کۆ ئەندامەکانی تریش دەدات، لە بەرە بەیاندا پلەکەی دەگاتە(٢٤) پلەو تا حەوت سەعات کەم دەبێتەوە. ئەمە هەندێ ڕاستی زانستین کە قورئان وسوونەتی خوایی پشتگیریان لێ دەکەن. [١].

(٥) (تنفس) ئاماژەیە بۆ کرداری ڕۆشنە پێکهاتن لە گەڵ بەرەبەیاندا.

کەواتە: بەرەبەیانیان بۆ نوێژ کردن وقورئان خوێندن وسەعی کردنی قوتابی وکارو کاسبی باشترین کاتن بۆ مرۆڤەکان،کە مرۆڤ دەتوانێ بە هۆی چالاکیەوە سوودی زیاتریان لێ وەربگرێت. وە بۆ ڕووەکیش گرنگە کە ئۆکسجین بەرهەم دێنێت.

(٦) پاشان شەوانەو بەر لە بەرەبەیان شەپۆلی بێ تەل ورادیۆیی وشەپۆلی ئەتیر لە ڕۆژ چالاکترن.

بۆ نمونە:(هەندی کرایس و ولیەم دیك) لە ڕاست(تەوفیق دادا جیف) کە خاوەن توانەیەکی هالەی مرگناتیسی گەورەیەو توانای بیر خوێندنەوەی هەیە لە ڕوسیادا سەیر دەکرا ئەو کەسەیەلە

(١) ايات الله في الانسان/ الاستاذ الدكتور: محمد راتب النابلوسي/ ل:١٠١-١٠٣.



شەودا توانای گیانی پترە، چونکە هۆکارەکانی شێواندن وتەشویش کەمترە[1]. خـوای گـەورە بـیێ هۆ نەیفـەرموە:﴿ إِنَّ نَاشِئَةَ اللَّيْلِ هِيَ أَشَدُّ وَطْءًا وَأَقْوَمُ قِيلًا ﴾.واتـە: خـوا پەرسـتی شـەوانە سەقامگیرترەوچەسپیوترین وتنە.(چونکە دڵ ئامادەیەو کش وماتی یە).

## ٢٧-وەستانی سوڕی زەوی

﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِن جَعَلَ اللَّهُ عَلَيْكُمُ اللَّيْلَ سَرْمَدًا إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ مَنْ إِلَهٌ غَيْرُ اللَّهِ يَأْتِيكُم بِضِيَاء أَفَلَا تَسْمَعُونَ﴾[2].

واتە: بڵێ گەر خوا تا سەر شەوتان لێ دابێنێ تا ڕۆژی پەسلاَن کێ جگە لـە خـوا توانـای هەیە ڕوناکیتان بۆ بێنێتەوە، ئەوە گوێتان لێ نییە؟!




(١) الباراسايكولوجي سر من الاسرار الدولة/ ت: منير يوسف زينل/ ل:٢٠ مراجعة: د: وائل عريم/ بغداد/ ١٩٨٩.
(٢) القصص:٧١.





## راڤەی زانستی

(١)لێرەدا قورئان دەری دەخات زەوی بە دەوری خۆیی و خۆردا دەسووڕێتەوە ر شـەوو ڕۆژو وەرزەکان دروست دەبن، وە خوداش دەتوانێ بـە وەسـتاندنی جوولـەی زەوی یـان کوژاندنـەوەو لا بردنی خۆر تا سەر شەوتان لێ دابێنێت، یان نیوەی زەوی بـەردەوام ڕوونـاك بـێ و نیوەکـەی تـر بەردەوام شەو بێت.

بەڵێ جیۆلۆجیەکان دەڵێن:(زەوی کاتێ لە خۆرجیا بۆوە بە (٥)کاتژمێر شـەوو ڕۆژی تـەواو کردووە) [1]. پاشان وردە وردە کەمی کردۆتەوە تا بووە بە (٢٤ )کاتژمێر.(لە ئـەمریکادا بەشـی باشووری لە ناوچەی تیاهواناکو پارچە تاوێرێ دۆزرایەوە زانستێکی گـەردوونی مـەزنی تێـدابوو، بۆ سەردەمێ دەگەڕێتەوە کە ساڵی زەمینی (٢٢٨) ڕۆژ بووە. ئەم ماوەیەش بۆ (٢٧٠٠٠) سـاڵ لەمەو بەر دەگەڕێتەوە ) [2].

بەلاّم ئایا ئەو ڕۆژە دێ زەوی بووەستێ؟ دیارە بە لای خواوە ئاسانەو بە دووریـش نـازانرێ! بەلای هەندێ زاناوە هەر (١٢٠)هەزار ساڵی زەوی چرکەیەك لە خێرایـی سـوڕی کـەم دەبێتـەوە، وەکو(د: عبدالرزاق نوفل) لە (الله وعلم الحدیث/ ل: ١٣٣)دا ئاماژەی بۆ کردووە!

بەم شێوەیە قورئان بە (١٢٠٠) زۆر پتر پێش زانستی نوێ ئاماژەی بۆ ئەم زانستە وردانـە کردووە، کە لە جیۆلۆجیـادا بـە هەسـتیارو گـرنگ سـەیریان دەکرێـت و جێگـای ڕامـان وسـەر سوڕمانن!

ئەنجا قورئان بەر لە زانست سەرنجمان بۆ زانستی وردی جیۆلـۆجی ڕادەکێـشێ کـە دەسـتی بوون و زانست و تواناو لێ زانی جیهان ئافەرینیان تێدا دەر دەکەوێ، وەکو(لابلاس) دەڵـێ:(ئـەم توانایەی تەنە ئاسمانیەکانی لە کۆمەڵەی خۆردا داناوە بە چڕی وتـیرەو خولگەکانیانـەوەو مـاوەی سووڕی هەسارەکانی بە دەوری خۆردا دیاری کردووە، هەروەها پاشکۆکان بە دەوری هەسـارەکاندا

(١) نشأة الحیاة علی کوکب الارض/ ولیام واي/ ل:٣٥.

(٢) عصر الخوارق/ ج.ا.ج.رایزر/ ل:١٠٣.

به سیستەمەکی بەردەوام تا خوا حەز بکات ناکرێ بدرێتە پاڵ رێکەوت )[1] .

قورئان ڕاستی فەرموەوە: ﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾[2]. بێگومان زۆر نابات خۆر ئاوا ڕاستی هەرە گەورەشی بۆ ئاشکرا دەبێ کە قورئان ئاماژەی بۆ دەکات ،(د:چارلس ستاینتز) لەم بارەیەوە دەڵێ کەلە زانا هەرە گەورەکانە: (گەورەترین دۆزینەوە لە ڕوانگەی گیانی یەوە دەبێ ڕۆژێ دێ خەڵکی بزانن شتی ماددی بەختەوەری ناهێنێ، سوودی کەمە لەوە دا کە ژیان و پیاوان ئەو توانستە بداتێ کە خاوەن داهێنان بن، ئەو کاتە زانایان کارگە کانیان ئاراستەی توێژینەوەی خواونێژ دەکەن ، کاتێ ئەو ڕۆژە هات خەڵکی لە یەك وەچەدا پێشکەوتنێ دەبینن کە زۆر لە هی ڕابردوو پتر بێ و چوار وەچەی بەر لەوان بەر چاوی نەکەوتبێت)[3].




---

(١) الله وعلم الحديث، عبدالرزاق نوفل/ ل:١٥.

(٢) فصلت/ ٥٣

(٣) الله وعلم الحديث/ ل:١٦



## بەندی دووەم : دروست بوون و پێك هاتنی زەوی لەسەرەتادا :

٢٨- زەوی سەرەتای هەیە هەر نەبووە ئەزەلی نییە.

٢٩- درووست بوونی زەوی لە سەدیمی گازی(الدخان)یەوە.

٣٠- پێك هاتنی بەرگە هەواو بەرگی ئاوی و بەرگی تاوێری زەوی .

٣١- ڕێك خستن و هاوسەنگ کردنی زەوی بۆ ژیان .

٣٢- جوولەی درز بردن و شکان(الصدع) وبەشەکانی و ڕۆلی یان لە پێکهێنانی زەوی دا.
تیۆری درووست بوونی کیشوەری(نظرية زحزحة القارات).

٣٣- ئاماژەکانی قورئانی بۆ دیاری کردنی تەمەنی زەوی و ڕاڤەی جیۆ لۆجیا بۆ ئەمە.



## ٢٨- زەوی سەرەتای هەیە نەك ئەزەلی بێت:

قورئانی مەزن دەفەرموێ: ﴿بَدِيعُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾ [١]. واتە: خوا داهێنەری ئاسمانەکان و زەوی یە.

(الراغب) لە(المفردات)دا دەڵێ:(الابداع: دروست کردن و بنیات نانە بێ لاسایی کردنەوە. وتراوە(رکیة البدیع- واتە: چاڵەکی تازە.گەر ووشەی (البدیع) بۆ خوا بەکار هات واتە:(بە دیهێنانی شتێ بێ ئامێر و ماددە و زەمەن و جێگا، ئەمەش تەنیا بۆ خودایە) [٢].

﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ [٣]. واتە:ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە . (خلق) واتە: (بدع) [٤].

## ( ڕاڤەی زانستی )

(١)(ئەدوارد لۆتر کیسیل) زیندەوەرزان دەڵێ: (یاسای دووەمی دینامیکایی.گەرمی کە دەڵێ: گەردوون ئەزەلیە ناڕاستی ئەم ڕایەی سەلماند، زانست سەلماندی ناشێ گەردوون ئەزەلی بێ، لێرەدا گواستنەوەی گەرمی بەردەوام هەیە لە تەنە گەرمەکانەوە بۆ تەنە ساردەکان و، پێچەوانەی ئەمەش) ڕوونادات، بەو پێیە گەردوون بەرەو پلەیەکی گەرمی دەڕوات کە هەموو تەنەکان تێیدا یەکسان دەبن وتەواوی وزە ووشك دەبێت، ئەو کاتە گۆڕانی کیمیایی یان سروشتی. ڕوونادات و شوێنەواری ژیان نامێنێ، کەواتە مادام ژیان بەردەوامەو کرداری کیمیاوی و سروشتی بە ڕێگای خۆیاندا دەڕۆن، ئێمە بەو ئاکامە دەگەین کە گەردوون ناکرێ ئەزەلی بێت، گەر نا لە مێژ دەبوو گەردوون لە چالاکی دەکەوت. بەم شێوەیە بەبێ مەبەستەکی دیاری کراو زانست گەیشتە ئەو ڕاستی گەردوون سەرەتای هەیە. ئەمەش بوونی خوا دەسەلمێنێ، چونکە هەر شتێ سەرەتای

---

(١) البقرة:١١٧.

(٢) مفردات الفاظ القران/ للراغب. الاسماء والصفات للبیهقي.

(٣) الانعام:١.

(٤) مفردات الراغب.

هەبێ دەبێ کەسێ دروستی کردبێ یان بزۆکی یەکەم بێ یان کردگاری بێ، کە خودایە) [1].

بەڵێ:خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ﴾ [2].

واتە: خوا سەرەتایە و دوای شتەکانە. ﴿إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾[3]. ئەو دروست دەکات و دەیگێڕێتەوە. واتە خوا زەمان وجێگای دروست کردووە لە نەبوونی ڕەهاوە ئەویش لە ناویان دەبات. بەلاّم بە داخەوە تا ئیمڕۆش لە وانەکانی خوێندندا لە قوتابخانەکاندا لە کیمیا دا ئەم گریمان کاریە(لا فوازییە ) وەکو ڕاستیەکی زانستی دەخوێندرێ:(مادده هەر هەبووەو لە هیچەش پەیدا نابێ)،کە لە سەردەمی حیزبی بەعسدا وەکو ژەهرێ هەر لە پۆلی دووەمی ناوەندی دا دەرژێندرایە مێشکی خوێندکارانەوە بۆ شوشتنی مێشکیان لە خوای دروست کەرو سەرەتاو کۆتایی مادده و دوارۆژ !

٢-(احمد) گێڕایەوە: (ابو رزین) لە پێغەمبەر(ﷺ) دەپرسێت: بەر لەوەی خوا زەوی و ئاسمانەکان دروست بکات لە کوێ بوو؟ فەرمووی : (کان في عماء ما فوقة هواء وما تحتة ثم خلق العرش علی الماء). واتە : لە ناو هەورو گازەکی چڕدا بوو سەری هەوا بوو، ژێری هەوا بوو، پاشان عەرشی خۆی لە سەر ئاو دروست کرد. ئەم دەقەیە لە(تەورات)دا لە(سفر التكوين)دا هاتووە: (في بدء خلق السماوات والارض وكانت الارض خربه. على وجة الغمر ظلمة وروح الله يرفرف على الماء، وقال الله ليكن نور فكان نور).

(د.کریسۆن مۆریسۆن بۆ ڕاڤەی ئەمە دەڵێ:(سەرەتای زەوی بەر لە پێکهاتنی زەوی بێ سەرو بەر بووە. زۆربەی ئۆقیانۆسەکان وەکو هەور لە ئاسمان بوون کە ناکرێ بیرەڕێن و ڕووناکی بە زەوی نە گەیشت. پاشان هەورەکە ڕامالدراو زەوی سارد بۆوەو سوڕانی زەوی شەوو ڕۆژی لێ دروست بوو) [4].

---

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ چون كلوڤر مونسا/ ل:٢٧.

(٢) الحديد:٣.

(٣) البروج:١٣.

(٤) العلم يدعو للايمان/ كريسون موريسون/ ل:٩٩.





عەرش: بریتی یە لە گەردوونی گەورە بە گەردوونی ماددی و ئەستێرەوە کە زەوی و ئاسمانەکان و بەهەشتەکان و دۆزەخەکان وکورسی هەمووی لە ناو دایە. وشەی(عەرش) زۆر مانای هەیە:

(١) تەخت.

(٢) سەقف و بینا[١].

(٣) وە هەندێ لە زانایانی کەلام دەڵێن: عەرش بوونەوەرێکی خڕە لە هەموو لایەك دەوری جیهانی داوە بۆیە ناو نراوە (گەردوونی نۆیەم یان ئەتڵە یان ئەثیر)[٢]. کەوا، عەرش بە مانای تەخت و کورسی نایەت وەکو پێشەوا عەلی (کرم الله وجهه) فەرموویەتی : ( ان الله تعالی خلق العرش اظهارا لقدرته لا مکانا لذاته). واتە: خوا عەرشی دروست کردووە بۆ دەرخستنی توانای خۆی نەك جێگایەك بۆ زاتی خۆی. فەرموویەتی: (کان ولا مکان وهو الان علی ماکان)[٣]. واتە: خودا هەبوو هیچ جێگایەکی نەبوو، ئێستاش هەروەك جارانە .

کەواتە:(عەرش) کە پلە پلەیە ئەویش دروست کراوی خوایە: ﴿رَفِيعُ الدَّرَجَاتِ ذُو الْعَرْشِ﴾[٤]. وە خوا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾[٥].

لێرەدا ووشەی(الاستواء) زانا موسڵمانەکان چەند لێکدانەوەیەکیان بۆ کردووە :

(١) (استواء) ای الاستلاء . واتە: دەسەڵات بەسەر داگرتن(الاستاذ ابو المنصور بن ابي ایوب ) دەڵێ: زۆر لە زانایانی پاشینە بە مانای دەسەڵات بە سەر داگرتن مانایان کردووە کە گەورەترین دروستکراوی ئەوە، وەکو وتراوە: (قد استوى بشر علی العراق من غير سيف ودم مهراق).

(٢) هەیە بە مانای(ارتفع) مانای کردووە وەکو(ابو بکر بن فورك) کە مەبەست لەمە

---

(١) النهاية/ ابن الاثير/ مادة: العرش. سەیر بکە.

(٢) البداية والنهاية/ ابن کثير/ ل:١٢/ ج١.

(٣) الفرق بين الفرق/ ابو منصور البغدادي/ ل:٢٤٨/ دار الطلائع.

(٤) غافر:١٥.

(٥) الرعد:٢.




بەرزی نییە لە ڕاست جێگاوشوێن و مادده دا، کە خوا لە شوێنێ دانیشتبێ، واتە: لە سە ڕووی هەموو شتەکانەوە هیچ چێن و هەرێمێ دەوری نادات[1].

(٣) (ابن حزم الظاهري ) دەڵێ: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (فاسألو الله الفردوس فانه وسط الجنة واعلى الجنة وفوق ذلك عرش الرحمان) بوخاری گێڕایەوە. یان خوا فەرموویەتی:﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ طه:٥. لێرەدا ئەم دوو دەقە ئەوە پیشان دەدەن عەرش کۆتایی جیهان و دروست کراوانە[2]. فەر مووده زۆرن کە گەردوونی ماددی لە ناو عەرش دایە وەکو لە ڕاست خۆر هاتووە کە بوخاری گێڕایەوە:(مستقرها تحت العرش ) وە(معتزلە) دەڵێن: خوا لە هەموو شوێنێکە﴿وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنكُمْ وَلَكِن لَّا تُبْصِرُونَ﴾ [3]. وە( ابن حزم ) دەڵێ: (الاستواء ) لە زمان دا بۆ کۆتاییە: ﴿وَلَمَّا بَلَغَ أَشُدَّهُ وَاسْتَوَى﴾ [4]. وە خوا فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ﴾ [5]. واتە: کاتێ خوا ویستی ئاسمان دروست بکات دوکەڵێ بوو. واتە: دوای ڕێك خستنی زەوی دەستی کرد بە ئاسمان ئەمە ڕاستەو ڕای خۆمانە بەڵگەکانی تر بەتاڵن. ئەم ڕایەی دەڵێ: خوا لە هیچ کات و شوێنەکدا نی یە ئەمە ڕای جەماوەری سوننەیەو ڕای حۆمانەو لە مەزیاتر ناڕاستە، وەکو فەرموویەتی ﴿أَلَا إِنَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطٌ﴾[6].

واتە: (بەڕاستی خوا دەوری هەموو شتێکی داوە) [7]. بەو پێیە بە پێی بۆ چوونی(ابن حزم) وەکو خۆشی دەڵێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾ هەمان مانای﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء﴾ هەیە. واتە کاتێ خوا زەوی ڕێك خست دەستی بە ئاسمان کرد، دوای ئاسمان کاری خۆی لە عەرش دا کرد کە

---

(١) الاسماء والصفات/ للبيهقي/ ج١/ ل:١٥٢-١٥٣. سەیر بکە.

(٢) الفصل: ابن حزم/ ج١/ ل:٣١١.

(٣) الواقعة:٨٥.

(٤) القصص:١٤.

(٥) فصلت:١١.

(٦) فصلت:٥٤.

(٧) الفصل/ ل:٣٣٥/ج١.




دوا دروست کراوی خوایە[1].

٤- هەندێ زانای تر وەکو(مالك) و(ابن تیمیە) پێیان وایە نابێ(الاستواء) مانا بکرێ و دەبێ وەکو خۆی بهێڵدرێتەوە و سیفەتەکی خودایە، ئەم فەرمایشتەی مالیکی مەشهورە: (الاستواْ غیر مجهول، والکیف غیر معلوم والایمان به واجب، والسؤال عنه بدعه) [2].

٥- هەیە(الاستواء) وەکو(ابي عالیة) بڕوای وایە: واتە: (الارتفاع)ە، کە مەبەست لە بەرز بوونەوەی فەرمانی خوایە یان دوکەڵی ئاوەکەیە کە ئاسمانی لێ دروست بووە.

کە بە زاراوەی زانستی(سەدیمی گازییە) وەکو لە داهاتوو باسی دەکەین: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ﴾[3]. بەم شێوەیە قورئان بەر لە زانستی نوێ وئەنیشتاین کێشەی زەمان وجێگای چارەسەر کردووەو زەمەن بە دووریەکی مادده دادەنێ، واتە: خودا بەر لە بوونی زەمان و مەکان بوونی هەبووەو ئەو زەمان و مەکانی دروست کردووەو، زەمان لە ئاکامی ماددەو جوولەوە پەیدا دەبێت.( وەکو لە گەردوون ناسی دا باسکرا).

لە خۆر ئاوادا ئەنیشتاین بۆ یەکەم جار(بیرۆکەی خۆی لە سەر چوار تەوەرەکەیدا دانا کە بە شێوەیەکی ماتماتیکی و هێزی کێش کردن و کات و ماددەو ئاسمان بونە بەشێك لە پێکهاتەی ئەندازەی ئەو) [4].

بێگومان ئیسلام بۆ یەکەجار خودای لە بیرۆکەی ئەفسانەیی رزگار کردکە فەیلەسوفان وعاریفانی بەر لە ئیسلام بۆی دەچوون. بۆ نموونە ئەرستۆ دەیوت: خوا ئەوەندە پاکەو هەر بووە و ئەبەدی یە بەلاّم کارو ویستی نییە چونکە خوا بێ نیازە لەم شتانە. یان دەیوت خوا ماددەی سەرەتایی گەردوونی (هەیولی )دروست نەکردووە، بەڵکو ئەو هیولی یە توانستی بوونی هەبووە و ئەویش لە هێزەوە بۆ کردار دەری هێناوەو ئارەزوو مەندی بوونی هەبووە کە خوا بە سەری دا

(١) الفصل/ ج١/ ل:٣٣٥.

(٢) الاسماء والصفات/ ج٢/ ل:١٥١.

(٣) فصلت:١١.

(٤) الریاضیات والبحث عن المعرفة/ مورس کلاین/ ت: د سمیر یوسف/ ل:



دەبرێژێت، پاشان لە ناتەواوی یەوە بۆ کەماڵی دەبات کە لە سنووری توانای دایە بەو نارەزوو و توانایە کار دەکات، بەو ناوتریٚ دروست کراوی خودا بەو مانایە نەبێت[١].

بەلاّم خوای گەورە ڕەددی هەموو ئەو بۆ چوونانە دەداتەوە. کە خوا لە سنووری زەمان ومەکاندا دادەنیٚ یان لە سیفاتە جوانەکانی دا دەرنیٚ، زەمان و مەکان کار ناکەنە سەرو خوداو خودا لە نەبوونی ڕەهاوە بەدی هێناون و ئەو یاسای بۆ داناون و، ئەو هەڵیان دەسوڕێنیٚ و،ئەو سەرەتایە هیچ شتیٚ بەر لەو نەبووە، ئەو کۆتایەو نامریٚ و خاوەن زانست و ویست و توانایەکی بیٚ سنوورە﴿هُوَ الْأَوَّلُ وَالْآخِرُ﴾[٢]. ﴿كُلُّ شَيْءٍ هَالِكٌ إِلَّا وَجْهَهُ﴾[٣]. ﴿هُوَ الَّذِي يُحْيِي وَيُمِيتُ﴾[٤].﴿فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ﴾[٥].

پروفیسور(ئەدوارد کیلەر) دەنوسی: (ئەو بیروکەیەی لەگەردوندا دەنگی داوەتەوە ئەوەیە هەمو شتیٚ سەرەتاو کوتایی هەیە ئەم زەویەش سەرەتا وکوتایی هەیە. زەوی بەر لەنزیکەی پینج ملیار سال دروست بووە ولەهەورەکی گازی بەسەدیمی خوری ناسراوە، ناوکی سەرەتایی ئەستیرەکان و سیستەمی هەسارەکانی بیك هیناوە. ژیان دوای دوو ملیار ساڵ لەدروست بوونی زەویدا دروست بووە، لەو کاتەوە زۆریٚ زیندەوەر دەکەوتن[٦].

(١) حقائق الاسلام واباطيل خصومه/ عباس محمود العقاد/ ل:٣٠.

(٢) الحديد:٣.

(٣) القصص:٨٨

(٤) الغافر:٦٨.

(٥) البروج:١٦.

(٦) الجيولوجيا البينة/ ادورات كيلر/ ت: د: غسان محمد السبتي/ ل:٢٩.





## ٢٩- تیوری دروست بونی زەوی لەسەدیمەکی گازیەوە( الدخان ) :

﴿ثُمَّ اسْتَوى إلى السَّماء وَهِي دُخانٌ﴾[١]. واتە: پاشان کاتێك خوا ویستی ئاسمان دروست بکات(دوای زەوی) دووکەڵێ بوو. لەزانا وعاریفە موسلمانەکان(شیخ محی الدین ابن عربی) بەر لەزاناییانی خور ئاوا بەکەشف وراماڵی دەرونی ئەم ئایەتە زور زانستیانە وەسف دەکات کاتێ دەڵێ: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إلى السَّماء﴾ لێرەدا واتە کاتی مەبەستی بوو دروستی بکات، لێرەدا (ثم) واتە پاشان بۆ جیاوازییە لەنێوان دوو دروستکراودا لەقایمی وناقایمی دا و جیاوازیان لە جیهەت وجەوهەر، لێرەدا بۆ کات خەیاڵدن نیە چونکە ئەو کاتە کات نەبورد لەوێدا(الدخان) جەوهەرەکی ئاسکی نادیارە پێچەوانەی جەوهەری چڕی قورسی زەمینی). ﴿فَقَالَ لَهَا وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا﴾، خواویستی ئاسمان وزەوی هەردوکیان دروست بکات گورج پەیدابون وەکو کەسێکی فەرمان پێ کراوی گوێڕایەك)[٢].



---

(١) فصلت:١١.

(٢) تفسير القران الكريم/ ج١/ ابن العربي.




قورئان بەر لەزانستی گەردووناسی نوێ ئاماژە دەکات کە یەکەم ژیان و یەکەم شارستانی لە کوردستاندا یان دۆڵی دۆزێ داسەری هەڵداوە، لەوانە: گەردووناسی و زانستەکانی میتافیزیکی: ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ﴾(١).

لێرەدا قورئان دەری دەخات زانستەکان لەبابلدا لەریگای هاروت وماورتەوە فێری خەڵکی شایستەکراوە.(کۆڵن ولسن) دەڵێ: (هەر لەکۆنەوە زانراوە کەکلدانیەکان دامەزرێنەری گەردووناسی ونەستیرەگەرین(التنجيم) (٢). (بابل) حيلله نييه بەڵکو نەينەوايە سنجارە وەکو لە(التوراة) داهاتووە: (وقد تكون اول الامر من بابل وارك واكد ولكنه في ارض شنعار (shinar(٣).

زانای گەورەی کورد(تیحسان نوری) روونی کردوتەوە بەبابلیەکانی باشووری دۆڵی دۆوزی و ئەکد ووتراوە سۆمەر(٤٥٠٠پ.ز) ئەمانە خاوەنی شارستانی گەورە وخەت ونوسین بون، یاساکانی حەمورابیش لەیاسای ئەوان وەرگیراوە، ومانگە هەیڤیەکانیش) دەڵێ: (خەڵکی بابل لەرەگەز ونەژادی جوراوجۆر پێکهاتوون و بەزمانی جۆراوجۆر دواون و شارستانیەکان لەسۆمەرەکان وەرگرتووە).

(ڤادن) کەرابردوو مامۆستای زانکۆی لەندەن بو فەرهەنگەکی بەناوی (سۆمەریانی ئاری) بڵاوکردۆتەوە وسەلماندویەتی سۆمەریەکانیش ئاری بونە) (٤). وەمیسریەکان و یۆنانیەکان سوودیان لەشارستانی ئەوان وەرگرتووە. ئەو زانستانەش هەموی لەپێغەمبەران وەرگیراوە، ئەوەتا

---

(١) البقرة:٢:١٠٢.

(٢) الانسان وقواه الخفية/ كولن ولسن/ ل:٩٩.

(٣) كتاب المقدس/ التكوين/ ١٠-١١.

(٤) بۆ زانستی پتر بروانە(مێژووی رەگ و رەچەڵەکی کورد/ و: حەمە کەریم عارف/ ل:٧٠) بەکەمێ دەستکاری وەرگیراوە.

ئیبراهیم سەیری ئەستێرەکانی کردووە ﴿فَنَظَرَ نَظْرَةً فِي النُّجُومِ﴾[1]. یوسف فێری لێکدانەوەی خەونان دەبێ ﴿وَيُعَلِّمُكَ مِن تَأْوِيلِ الأَحَادِيثِ﴾[2]. (موسی) زانستی سیحر تاووتوێ دەکات و بە موعجیزە ئاستی نزم دەکاتەوە .... مەسیح نەخۆشان چاك دەکاتەوە ..

لە کتێبی (یۆبیل)دا هاتووە کە نوح لە خاکی کلدانیەکاندا وەفاتی کردووە و ئیبراهیم لەوێ لە دایك بووە، لە داستانی گلگامشدا نوح بە نوحی بابلیدا هاتووە. وەکو لە گەردوون ناسیدا باس کراوە .

وە لە(تلمود)دا ئیبراهیم حەوت ساڵان لە خاکی کوردەکاندا دەمێنێتەوە. وەکو(ج.ار.درایڤر) لە(الکرد فی المصادر القدیمه/ ل:٣٥) داباسی کردووە.

(ئەرتپانووس) بڕوای وایە ئیبراهیم (٢٠) ساڵ لە میسردا ماوەتەوە لەوێدا لە گەردوون ناسی کۆڵیوەتەوە. بەلای (یوسیفوس)ەوە ئیبراهیم میسریەکان فێری گەردوون ناسی دەکات[3].

لای( الشهرستانی) هەر(٧) فەیلەسوفانی یۆنان وەکو(ئەنبا دوقلس) لە سەردەمی داود پێغەمبەردا(ﷺ) ژیاوە زانستی لەو وەرگرتووە. (فیساگۆرس) قوتابی سولەیمان و لوقمانی حەکیم دەبێت[4].

وە فەلسەفەو زانستی (فیساگۆرس) لەڕێگای قوتابیە هیندیەکەیەوە بەناوی (قلانوس) لە هیندستان بلاّو دەبێتەوە.

ئەو کاتە فیساگۆرس لە ڕووناکی پێغەمبەرایەتی فێر دەبێ:(زەوی گۆی یە هەمیسان خۆرو مانگ و ئەستێرەکان و زەوی چەقی گەردوون نییە.....) [5].

(بێگومان ئەم شارستانیە کۆنانە (سۆمەری و ئەکەدی و بابلی و میسری و یۆنانی) هەموویان ئەفسانە تێکەڵ بە ڕوانینیان ببوو لە ڕاست دیمەنی گەردووندا، لە هەندێ خاڵدا

---

(١) الصافات:٨٩.

(٢) یوسف:٦.

(٣) ابراهیم / عباس محمود العقاد/ ل:٤٤. سەیر بکە.

(٤) الملل و النحل/ للشهرستاني/ ٢٢٨-٢٣١.

(٥)صورة الکون/ د: محمد عبداللطیف مطلب/ ل:٢٤.




پەیوەندی هاوبەشیان هەیە، بۆ نمونە لای سۆمەرو بابلی و میسریەکان ناو سەرەتای بوونەو خواکان لە ناو دروست بوونەو ئەوانیش دروستکراوانی تریان دروست کردووە، هەندێ لە ناوی نۆقیانۆس وشك بووە وشکانی لێ دروست بووە، ئەو هەڵمە بەرز بۆتەوە مەردۆخی بابلیەکان(کە مەریخە) یان (رع )ی میسریەکان — ئاسمانەکان- دروست بوون).

جەنگی پێغەمبەرانی بابل یان کوردستان لەسەر ئەمە بووە، ویستوویانە بیری بت پەرستی نە هزری خەڵکی دا لا ببەن و بیری یەکتا پەرستی بۆ خەڵکی بگێڕنەوەو لەم ڕێگایەوە ڕوانین یان بۆ گەردوون ڕاست دەبێتەوە ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ﴾[1].

لە کوردستاندا یان دۆڵی دۆزێدا زیاتر لە(٤٠) پێغەمبەر هاتووە[2]. وەکو ادم و شیت و نوح و ئیبراهیم و زەردەشت و یونس و هی تریش وەکو لە زۆرێ لە سەرچاوەکاندا هاتووە. وە لە چاخی نوێ جارەکی تر ئەوروپا و خۆرئاوا لە دوای چەرخەکانی ناوەڕاستدا دوای جیاکردنەوەی زانست لەدین جارەکی تر بۆ بیری ئەفسانەی کۆنی بابلیەکان و یۆنانیەکان گەڕاینەوە لەڕاست گەردون و کردگارەکەی، بەڵام بەبەرگێکی نوێ وشێوازەکی تازە، بەرگی زانستی کردەبەر تابتوانێ کۆتایی بەڕەوتی دینی بێنێت، گوایە دین تریاکی گەلانەو، زانست دەبێ شوێنی دین بگرێتەوە ودین لەسەر ئەفسانەی دێرین دامەزراوە، گەردوون هەر هەبووە وئەزەلی وئەبەدییەو خودا وجیهانی پەنهان نییەوە، ئەوەی بە پێنج هەستەکان پەی پێ نەبرەرێ و نەخرێتە ژێرتاقیگاوە بونی نییەو وخەیاڵ ونەندێشەی دێرینەکانە).

﴿إِنْ هَذَا إِلَّا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ﴾[3].

ئەوەتا مارکسی یەکان هاتن وتیان: (مادده ئەزەلی یەو ئەبەدییەو کۆنە، هەر لەوکاتەوە سەری هەڵداوە بونی نییە گەشە دەکات وپەرە دەستێنێ شتی نوێ ماددی شێوە و پەرەسەند

---

(١) النحل:٣٦.

(٢) التراث العلمي العربي الطبى/ د: طارق صالح الزبيدى/ ل:٣٦٩.

(٣) المؤمنون:٨٣.

ودیاردەکانی ئەوە، بەلاّم لە زاتدا لە قولاّیی سەرمەدی دایە وسەرەتای نییە، چون لە زاتدا سەرمەدی و ئەزەلی یە داهاتوش ئەبەدی دەبیّ‌و دیاردەکانی دەگۆڕیّن بەدیاردەی تر، بەلاّم جەوهەری مادده دەمیّنیتەوە وملبەملانەی نەمان دەکات، زەمان وجیّگا دوشیّوەی سەرەکی ئەم بونەن) [1].

یان (بیرتراند راسل) ئەم ماددەییە توندەوە دەلّیّ: (لەدوای دروست بونی مرۆڤەوە هیچ مەبەستیّ نییە، ژیان ودروست بون وهیوا وترس وسۆز وبیرو بڕواکانی ئاکامی کۆبونەوەی گەردیلەکانی لەشیەتی بەرێکەوت..) [2].

بەلّیّ فەلسەفەی یۆنانی کاری کردە سەر فەلسەفەی ئیسلامی و چەندان ڕەوت وبیرۆکەی داهیّنا، بەهەمان شیّوە کاریشی کردەسەر ئەوروپا و چەند ڕەوت وبیرۆکەی فەلسەفی داهیّنا. (غەزالی) بلیمەت لەڕاست پیّڕی ماتریالستی کۆن دەلّیّ: ئەمانە دەهرییەکانن کەلە قورئاندا هاتون ﴿وَمَا يُهْلِكُنَا إِلَّا الدَّهْرُ﴾ الجاثية:٢٤. : (گروپەکی کۆکنن نکۆلیّ لەدروستکەری زانا و بە توانا دەکەن، وادەزانن گەردوون هەر هەبووە نەك دوروستکەر هۆکاری بیّ، بەردەوام گیاندار لە تۆوە و تۆ ولە گیانداره ئەمە تا سەر بەردەوام دەبیّت) [3]. کەواتە: ماتریالیزمی دیالەتیك ئەم پیڕەی نویّ کردۆتەوە.

بەلاّم غەزالی زیادەرویی دەکات لە کافرکردنی سوکرات و ئەفلاتون و ئەرستوتالس و شویّن کەوتوانیان لە فەیلەسوفە موسلمانەکان وەکو(ابن سینا) و (فارابی) و ئەوانی تردا کەلە (المنقذ من الضلال) و (تهافت الفلاسفة) دا بەرپەچیان دەداتەوە.

ئەوەی غەزالی ئەنجامی دا وەکو خاوەنی (قصة الايمان) باسی کردووە مانای کات و جیّگابوو، کە ئەرستۆو ئەرستویی یەکان بۆی چوبوون و لیّی تیّنەگەیشتبون، کاتیّ دەیان وت جیهان کۆنە و لەگەلّ خوادا هەبووە و لە کاتدا لیّی دوا کەوتووە، غەزالی هات وتی: زەمان

(١) الفاتر الفلسفية للبنين/ ج١/ ل:٧٧. نقض اوهام المادية الجدلية/ د: محمد سعيد رمضان البوطي/ ل:٤٨.

(٢) الله يتجلى في عصر العلم/ ل:٥١.

(٣) المنقذ من الضلال/ ل:٢١٨.

مـاددەیەو دروست کراوەو بەر لە دروست بـونی جیهانـدا نـەبووە، ئـەنجا خـوا خـاوەنی کـەمالی ڕەهایەو ئیرادەی بێ سنوری هەیە، گەردوون دروست بـووەو، هۆکـارەکی دروسـت بـوونی هەیـە، ئەگەر بوترێ ئەو ڕوداوانە ڕوداوی تریان لە پێشەوەیە بێ بڕانەوە ئەوە ئەگـەر نییـە. مـادام خـوا بونی پێویست بێ و گەردوون بونی مومکین بێ و دروست بوبێ ئەوە شتی تازە لە خوای ئەزەلەوە بەدیهاتبێت و سەری زنجیرەکە بە ئەو بگات. دووری مەکانی سەر بە تەنەو، دووری زەمەنی سـەر بەجوڵەیە. وە دوای (٦) سەدە (عەنومانیل کانت) هەمان قسەکانی غەزالی دووبـارە دەکاتـەوەو بیرە ساغەکان لە سەر ئەم ڕاستی یە یەکدی گردەبن.

پاشان (ابن رشد) یەکێکە لە فەیلەسوفە هەرە بەرزەکانی ئیسلام، ئـەو ڕاسـتە فەلسـەفەی ئەرستوی بە دڵ بووە قسەکانی ئەوی ڕاڤە کردووە، بەڵام نـەیوتوە جیهـان کۆنـە و خـوا ویـستی نییە، نە ئەرستوو فەیلەسوفەکانیش نکۆڵیان لە بونی خوا کردووە نە سـیفەتی ئـیرادەش، بـەڵکو هاتون بە شێوەکی فەلسەفی مانای کۆنی و ئیرادەیان کردووە. وە (ابن رشد) لە کتێبەکەیدا (فصل المقال) دا دەڵێ: کاتێ خوا دەفەرمێ ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ﴾ هود:٧.

لێرەدا دەری دەخات بەر لە دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی و بونەوەری تـر هـەبووە کـە عەرش و ئاوە، واتە: زەمەنێ بەر لەمە هەبووە،(ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ) لێـرەدا دەری دەخات بەر لە ئاسمان شتەکی تر هەبووە کە ئاسمانەکە لێی دروست بووە، بـەلام ئـەم ماددەیـەش خوا پێش ئەرزو ئاسمان دروستی کردووە، شێخ (محمد عبـده) کـە وەکـو (جمـال الـدین الافغـانی) زانایەکی کورد بووە لە پەراوێزی خۆیدا لە سەر(شرح العقائد العضدیة) دا دەڵـێ: (مـن بەڵگـەم هێناوەتەوە لە سەر دروست بوونی جیهان و ڕاستی یەکەم لە وێدا تاوتوێ کردون، بە پێی بۆچـون و لێ حاڵی بونی خۆم، من ناڵێم ئەوانەی دەڵێن: ئـەم جیهانـە کۆنـە کـافرن بـەم مەزهەبـە یـان زەروریەکی دینیان نکۆڵی لێ کردووە، بەڵکو لە ڕوانینیاندا بە هەڵە چوون، سـەرەتای بیرەکانیـان چاك نە پێکاوە، زانراوە هەرکەسێ بێ لاسایی کردنەوە ئیجتیهاد بکات و مەعصوم نەبێ توشـی هەڵە دەبێ. بەڵام هەڵەکەی لای خوا قبوڵە، چونکە مەبەستی لەم ڕوانینە گەیشتنە بە ڕاسـتی و

یەقین).

کەواتە: (ابن رشد) نکۆوڵی نەکردووە لەوە کە خوا کردگاری جیهانە، بەڵکو ئاماژە دەکات کە ئاسمان و زەوی کە لە دوکەڵێ دورست بوون، ئەم دوکەڵ و ئاسمان و زەوییە نێوانەکی زەمەنیان هەیە، کە ئاماژە دەکات﴿وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاء﴾ واتە: بەر لە ئاسمانەکان و زەوی عەرش و ئاو هەبووە.

بەم پێیە کە(ابن رشد) و(ئەرستۆ) ئاماژە بە کۆنی ماددە دەکەن مانای وانییە کە ماددە دروست کراو نییە و خۆی هەبووە و پێویستی بە کردگارێ نییە بەدی بێنێت، وە (ابن رشد دان بەم دوکەڵ و ئاوە دەنێ کە دروست کراوە کاتێ دەڵێ: (ئەم بونەوەرەیە لە هیچ دروست نەبووە و زەمەنی پێش نەکەوتووە، بەڵام لە بکەرێکەوە پەیدا بووە، ئەویش جیهانە بە گشتی). بو زانستی پتر بروانە(قصة الايمان/ نديم الجسر) کە بەراستی ناوی خۆی بە خۆوەیە. هەر وەها (نقض الاوهام المادية الجدلية/د.محمد سعيد رمضان البوطي) و (فلسفتنا/ محمد باقر الصدر).. (العلامه الراغب الاصفهانی) لە(مفردات)دا لە سەر ووشەی(الخلق) دەڵێ: لە بنەمادا تەقدیرەکی ڕاستەو بەکاردێ بۆ دروست بوونی شتێ لە غەیری بنەمایەك واتە: لە نەبوونی ڕەهاوە وەکو ﴿خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ﴾ التغابن:٣.

وە دەڵێ: بە مانای دروست کردنی شتێ دێ لە شتێ وەکو ﴿خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ﴾ الزمر:٦.

پێشەوا عەلی (کرم الله وجهه) دەفەرمێ: (كائن لا عن حدث، موجود لا عن عدم، مع كل شيء لا بمقارنة، وغير كل شيء لا بزايلة، فاعل لا بمعنى الحركات والالة، بصير اذ لا منظور اليه من خلقه، متوحد اذ لا سكن يستأنس به ولا يستوحش لفقده، انشأ الخق إنشاءا، وابتدأه ابتداءا، بلا روية اجالها، ولا تجربة استفادها، ولا حركة احدثها، ولا همامة نفس اضطرب فيها، احال الاشياء لأوقاتها) [1].

واتە: خوا بووە نەك دروست بوبێ، لە ئارادا بووە نەك لە عەدەمەوە، لەگەل هەموو

(١) نهج البلاغة/ بشرح د: صبحي الصالح/ خطبة الاول.





شتێدایە نەك بە بەراورد، غەیری هەموو شتێکە نەك بە لێك دابرانـدن، بکـەرە نـەك بـە جولـەو نامێر، بینەرە کاتێ کەس نەبووە لە دروست کراوانی سەیریان بکات، بە تەنیایە جێگایەکی نییە تێیدا هۆگر بێ و بە لەدەستدانی وەرەس بێ، گەردوونی بونیات نـا چـۆن بنیـات نـانێ، دەسـتی پێکرد چۆن دەست پێکردنێ، بێ بیرکردنەوەو ڕامانێ، بێ ئـەزمونێ سـودی لـێ وەرگـرتبێ، بـێ جولەیەك پەیدای کردبێ، بێ بایەخ پێدانێ کە پێی شپرزە بوبێ و شتەکانی بـۆ کاتـەکانی خـۆی دانا)

وە چون ڕەوتی فەلسەفی هەڵەوەر لە ناو موسلماناندا ڕاست کرایەوە، لە خورئاواشـدا بـیری ماتریالیستی و ئەزەلیەتی ماددی هەرەسی هێنا و دین و فەلسـەفە و عیرفـان زانسـت ئـامێزانی یەکتری بوونەوە لەسەر بوونی خودا و نادروستی ئەزەلیەت و ئەبەدییەتی ماددی. وەکـو:(ئیفـرنج ولیا) و(نوبلوچی) سروشت ناسی ناوداری ئەمەریکی دەڵێ: بڕوا بوون بە دیـن دۆزراوەی زانسـتی پشتگیری لێ دەکات،

زانست زورێ لە پێشبینیەکانی کیتابی موقەددەسی بەڕاست دانا، ڕابردووش دان بە شـتی تردا دەنێ کە هێشتا دەستی پێ نەگەیشتوە. بۆ نمونە گەردوون ناسی ئامـاژە دەکـات گـەردوون سەرەتایەکی کۆنی هەیـە و گـەردوون بـو کۆتاییـەکی مـسۆگەر دەڕوات، ئەمـە زانسـتی نییـە گەردوون ئەزەلی بێ سەرەتای نەبێ و ئەبەدی بێ و کۆتایی نەبێ ئـەو لـە سـەر بنـەمای گـۆڕان دامەزراوە، ئالێرەدا دین و زانست یەکتری دەگرنەوە، زانستی ماددی زۆر لەوە بێ توانـا تـرە بـە ڕێگای ماددی لە خوا بکوڵێتەوە یان ڕازەکەی بزانێ، بەڵام سەیرکردنی شتە سەیرەکانی گـەردوون زۆر گەردوون ناسی ئەمینـداری ڕاکێشا کـە پێویـستە ئـەم گەردوونـە فراوانـە بـەم سیـستەمە ناناسابیەوە هەڵسوڕێنەرەکی هەبێ نەبینرێ و لە ڕازەکەی حاڵی نەبین) (١).

---

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ ل:٥٣.

## (تیوری ئیمانۆیل کانت و لابلاس و فون فایسکەر)

ئەم تیورە باس لە چیرۆکی دوروست بوون دەکات دوای دوروست بوونی دوکەڵەکە یان سەدیەکە، سالی(١٧٥٥) تیوری کانت سەری هەڵدا ئەو کاتە مامۆستای فەلسەفەو گەردونزانی بوو لە زانکۆی کونجوبرج دا، ڕایگەیاند سەرەتا کۆمەڵەی خۆر لە تەنی وردیلەی ڕەقی خامۆش پێك دێ کە لە قەبارەو چڕی دا ناچۆن یەکن، دەستیان کرد بە یەکتری کێش کردن پێکەوە لکان و بوونە تەنی گەورە تر، بەردەوام ئەو تەنانە یەکتریان کێشکرد لە تەنە بچووکەکان، لەمەوە گرێ ی گەردوونی گەورە لە کەرەستەی گەردوونی پەیدابوون. ئەو گرێیانە زیاتر یەکتریان ڕاکێشاو بەیەك کەوتن، لەمەوە گەرمی گەورە دوروست بوو بەس بێ بۆ تواندنەوەی، پاشان بۆ بارستایی گازی درەوشاوە گۆڕا لە شێوەی سەدیمدا.

ئەم سەدیمە بە خێرایی یەکی زۆر بە دەوری خۆیدا سوڕایەوە و ئالقە گازاییەکان وردە وردە لێ ی جیادەبونەوە بە هۆی هێزی پاڵنەری چەقەکەی، هەر ئالقەیە هێزی کێشکردنی تایبەتی هەبوو، ئەنجا ئەو ئالقانەی کەوتنە خول بەدەوری ناوکی سەدیمەکەدا کە خۆری خۆمانە، هەر ئالقەیەك وردە وردە دەستیان بە چڕبوونەوە کرد لە شێوەی نیازکدا و یەکتر گیربوون بە هۆی هێزی کێشکردنەوەو کۆمەڵەی خۆر پێك هات.

بەڵام ئەم تیورەیە گرنگی پێ نەدرا تا(لابلاس) لە سالی(١٧٩٦) دا ڕایگەیانداو لە بازنەی گەردونناسی دا بایەخی پێ دراو سەربەخۆ بڵاوی کردەوە، هەر چەند هاوشێوەی تیوری کانت بوو، بەڵام ئەو وتی سەرەتا خۆر و کۆمەڵەکەی لە تەنە گازەکی بڵێسەدار (سەدیم nobula) دوروست دەبێ بە هۆی یەکتر کێشکردنی پێك هاتەکانی لە چەند سەدیمەکە چڕ بۆوە و خۆر پێك هات.

لای(کانت) لە ئاکامی یەك گرتنی تەنۆلکە وردەکان و سووتان و ساردبونەوەیان کۆمەڵەی خۆرپێك دێ، کەچی لای(لابلاس) بە هۆی ساردبوونەوەی وردە وردەی سەدیم پێك دێ ئەنجا بە هۆی کرداری گرژبوون و چوونە ناو یەکتری.

وە(ڤۆن وایسکەر von weizsacker) لە سالی(١٩٤٤) دا تیوری سەدیمی گازی پەسەند





دەد لەگەڵ هەندێ چاکسازی دا[1].

لێرەدا قورئان بەر لە(کانت) و(لابلاس) ئاماژە بە سەدیمی گازی دەکات کە گەردونی لێ دروست بووە و بە(الدخان) ناوی زەوی دەکات، دیارە دوکەڵیش دیاردەی ئاگرو گڕە. وە دەفەرمێ:﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ﴾؟ الانبياء: ٣٠.

واتە: ئایا بێ بڕوایان نابینن کە ئاسمانەکان و زەوی یەك پارچە بوون لە لایەکترمان جیا کردونەوە؟!

ئایا گەر قورئان سروشتی خوانەبێ چۆن پێغەمبەر(ﷺ) لە سەردەمی نەزانی دا بە(١٠٠٠) ساڵ بەر لە زانستی نوێ پەی بەمە بردووە، گریمان بلیمەتی سەردەمی خۆشی بوو بێت؟!

لە کۆنگرەیەکی ئیعجازی قورئان وا لەسەعودییە ئەم پێشنیازەی دکتۆر(فەرید کرونەر) دەکرێ کە ناودارترین زانای جیۆلۆجی جیهانی یە و کاتێ ماناکەی دەخوێنێتەوە هاوار دەکات: ئەمە رێتێ نەچووە ئەمە لە هیچ کتێبەکی بەر لە(١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر باسکرابێ، ئێمە چەند ساڵێکە پەیمان بەمە بردووە و هۆکاری زانستی زۆر پێشکەوتووی تێ دا بەکارهاتووەو تاووتوێ ئاڵۆزی درێژی تایبەت بە زانستی ناوکی کراوە....

پارچە بووە، بەڵام ئامێرە نوێیەکان ئێستا لە بارێکدان دەتوانن ئەوە بسەلمێنن کە پێغەمبەر(ﷺ) بەر لە(١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر فەرمویەتی[2]. وە بەڵگەیەکی ترمان لەسەر ئەوەی کە مەبەست لەم دوکەڵە(الدخان) سەدیمی گازی یەکی گڕدار بووە دوکەڵی لێ هەڵساوە ئەم فەرمودەیەی(ابن عباس)ە کاتێ لەسەر لە ئایەتی﴿فَمَحَوْنَا آيَةَ اللَّيْلِ﴾[3]. دا دەفەرمێ: (واتە: مانگ سەرەتا وەکو خۆر رووناکی دەدا بەڵام رووناکیەکەمان لێ کوژاندەوە). ڕابردوو بینمان کە

(١) لە کتێبی معالم سطح الارض/ د: جوده حسين جوده/ ل:١١ و کوکب الارض /د: حسن سيد احمد ابو العينين/ ٦١-٦٣ وەرگێراوە بە کورت کردنەوە.

(٢) الموسوعة العلمية في الاعجاز القران الكريم والسنة النبوية/ د: هاني بن مرعى القليني/ ل:٧١١.

(٣) الاسراء:١٢.

لابلاس وتی: ئەو ماددەیەی خۆرو کۆمەڵەکەی و پاشکۆکانی لێ پێك هاتووە تەنەکی گازی بڵێسەدار بووە! بڕوانە(گەردووناسی) کتێبی خۆمان.

## (٣٠) پێك هاتنی زەوی بە بەرگەهەواو بەرگی ئاوی و بەرگی تاوێرییەوە لە سەرەتادا:

قورئانی مەزن دەفەرمێ: ﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاء بَنَاهَا رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾(١).

واتە: ئایا دورستی کردنی ئێوەی مرۆڤ دژوارترە، یان ئاسمان، کە بنیاتی نا، باڵاکەی بەرزکردنەوەو ڕێکی خست، شەوی تاریك کردو ڕووناکی لێ دەرهێنا، ئاوی لێ دەرهێنا لەگەڵ لەوەڕگاکەی، چیاکانی لەنگەرپێ گرتن، بۆ سودی ئێوەو ئاژەڵانتان.

لێردا قورئانی پیرۆز بەر لە زانایانی خۆرئاواو تیورەکانانیان لە ڕاست دورست بوون و پێك هاتنی زەوی هەموو ئەو بنەما گرنگانەی باس کردون کە چیرۆکی زانستی دورستی بونیان لەسەرداد‌ەمەزرێت.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْاْ أَنَّا نَأْتِي الأَرْضَ نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾(٢). واتە: ئایا نابینن ئێمە فەرمان ڕەوانەی زەوی دەکەین لە ڕۆخ و قەراغەکانی کەم دەکەینەوە؟

**(نوح) بە کوردستان و حکومەتی بابلی دەفەرمێ:﴿ أَلَمْ تَرَوْا كَيْفَ خَلَقَ اللَّهُ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقًا وَجَعَلَ الْقَمَرَ فِيهِنَّ نُورًا وَجَعَلَ الشَّمْسَ سِرَاجًا﴾(٣).** واتە: ئایا نابینن چۆن حەوت ئاسمانی چین لەسەر چینی دورست کردووە، مانگی کردووە بە تریفە لە ناویانداو خۆری کردووە بە چرا؟ لێرەدا نوح ئاماژە بە(٧) بەرگە هەواکانی زەوی دەکات، وە مانگ بە تریفە ناو دەبات و خۆر بە

---

(١) النازعات: ٢٧-٣٢.

(٢) الرعد:٤١.

(٣) نوح:١٥-١٦.





چرا لە ناویاندا، چونکە مانگ و بەرگە هەوا رووناکی لە خۆر وەردەگرن و دەیدەنەوە![1].

﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾[2]. شەو بە رووناکی دادەپۆشێ و بە پەلە داوای دەکات.

﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾[3]. واتە: ئاسمان بارانـدووە هێـزی زۆری تێدایە وە چەند سودێ بۆ مەردوم.

## راڤەی زانستی

(١)لێرەدا قورئـان لـە﴿أَأَنتُمْ أَشَدُّ خَلْقًا أَمِ السَّمَاءُ بَنَاهَا رَفَعَ سَمْكَهَا فَسَوَّاهَا﴾ النازعات:٢٧-٢٨. ئاماژە دەکات بە دوورست کرانی ئاسمان لە سـەدیمی گـازی﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاءِ وَهِيَ دُخَانٌ﴾ فـصلت: ١١. دوای بنیاتنـانی تەنـەکان بەرزدەکاتـەوە بـە هـۆی هێـزی کێشکردن و هەمواریان دەکات. ﴿وَأَغْطَشَ لَيْلَهَا وَأَخْرَجَ ضُحَاهَا﴾ النازعـات:٢٩. ئاماژەیـە بـۆ دەرهێنانی وزەو گـەرمی و رووناکی لـەم سـەدیمە دوای ئـەوەی ساردبۆوە، یـان ئاماژەیـە بـۆ هەسارەکان و هەیڤەکان دوای ساردبوونەوەیان و سوڕانەوەیان بە دەوری خۆردا شـەو. رۆژیـان بـۆ پەیدا دەبێت.

(ئەلك سمث) دەڵێ: (سەرەتا خۆر ساردبووە چونە ناویەکی بە هۆی هێزی کێشکردن پلـەی گەرمی چەقی بەرز دەکات تا ئاستی کالێکردنی ناوکی لە ناودا دوورست ببێ، بـەم رێگایـە خـۆر پەیدا بوو، پەیدابوونی بووە هـۆی گـەرم کردنـی هەسـارەکان بـۆ ئاسـتی توانـەوەی پێـك هاتـە

---

(١) لەمەش پتر ئەگەر تەماشای ئایەتی تری قورئانی بکەین دەفەرمێ:﴿ قُلْ سِيرُواْ فِي الأَرْضِ﴾ الانعـام: ١١. واتـە: بڕۆن بە ناو زەوی دا. لێرەدا نافەرمێ(علی الارض) بەسـەر زەوی دا چونکە ئێمە لە بازنەیەکی داخراوی هەوا داین، کە دەوری گۆی زەوی داوەو بەناو ئەودا دەڕۆین. ئەمەش موعجیزەیـەکی گەورەیـە بـۆ قورئـان و دەری دیـخـات، کەسێ ئەم وشانەی دارشتون کە ئەم بونەوەرو ژیانەی داڕشتووە!

(٢) الاعراف:٥٤.

(٣) الحديد:٢٥.

سەرەکیەکانی)[1].

دەڵێ: (ئەو تیوری لە هەمووان پەسەندترە لە ڕاست بنەمای سیستەمی خۆر بەر لە(٦) ملیار ساڵ دورست بووە لە ڕێگای پارچە بوونی سەدیمی سەرەتایی بزۆك لە تەنۆلکەی ڕەق و گازی خاوو پلازما پێك دێت[2].

(٢) ﴿نَنقُصُهَا مِنْ أَطْرَافِهَا﴾ الرعد:٤١. ئاماژەیە بۆ کەم کردنەوە لە قەبارەی زەوی تا دەگاتە حاڵەتی ئاسایی یەکەی. (ئەلك سمث) دەڵێ: (پێویستە سەرەتا زەوی قەبارەی لە ئێستا گەورەتر بوبێ، بە هۆی نزیکی لە خۆر پێك هاتە زوپەرش بوەکانی(الاکثر تطایرا) لە دەست دابێ ماددە تواوەکان لە ئاسن و سلیکان کە ماددەی تواوەن مابنەوە)[3]. (بڕوا وایە سەرەتا زەوی قەبارەی(٢٠٠) ئەوەندەی ئێستا بوبێ، واتە: زەوی بەردەوام چوتەوە ناویەك و دەچێ بەلام بارستایی دەمێنێتەوە، بە هۆی ساردی توێکلی زەوی فشار لە هەمور لایەکەوە پەیدا دەبێ بەرەو ناخی زەوی کە لە ماددەی تواوە پێك دێ لە گازاوو تاوێر، ئەم ماددە تواوانە لە شێوەی گازدا لە ڕێگی بورکانەوە دەردەچن، بەڵام لە ڕێگای هاتنی ملیۆنەها نیازك و شوهبەوە کە ساڵانە دێنە سەر نۆقیانوس و وشکانی دوور لە دانیشتوان وەکو بەزەیی خوا ئەم ناتەواویە پڕ دەبێتەوە. دووەم: خێرایی سوڕی زەوی بە دەووری چەقدا و هێزی پاڵنانی چەقی لە جەستەکاندا زەوی دەتەپێنن و ئەمەش مانای کەم کردنەوەیە لە زەوی کە شێوەیەکی هێلکەیی ئەك گۆیی بە زەوی دەدات. سێ یەم: تیوری خشانی کێشوەرەکان(زحف القارات) لە ماوەی ملیۆنەها ساڵدا لە ڕۆخەکانی زەوی کەم دەکاتەوە. چوارەم: ئاماژە بەداخوران و ڕامالینی چیاکان دەکات(الحت) بە هۆی باران و با کە رووبار دەیگوازێتەوە و لە کەناری دەریاکان و نوقیانوسەکان دەنیشێ، ساڵانە رووبارەکان بە تەن لوتکەی چیاکان بۆ زەریاکان دەگوازێتەوە کە بەرزایی یەکان کەم دەکاتەوەو نزمایی یەکان دەروخێنێ و هەمواریان دەکات ئەمەش مانای داخوران(التعریە) دەگەیەنی.

---

(١) علم الارض/ الك سمث/ ت: فارس لطفي الخوري/ ل:١٣.

(٢) ............/ ل: ١٣.

(٣) .......... /ل :١٤.





دوایی باسی دەکەین، چونکە بە رانەبردوو هاتووە: (ننقصها).

پێنجەم: بەرزبوونەوەی ئاستی دەریاکە ڕۆخەکانی وشکانی دا دەپۆشی، کە بە هۆی بومەلەرزە ڕۆدەچێ لە ئاکامی فشاری گازەکاندا تواوەکان کە تەقینەوە پەیدا دەکەن و لە ئاکامدا قلیشان(التصدع) لە هەندێ ڕۆخی زەوی دا پەیدا دەکات، ئەنجا ڕۆچوون لە هەندێ کەناری قوڵایی دەریا پەیدا دەبێ و ئاو شوێنە ڕۆچووەکە دادەپۆشێ وشکانی کەم دەبێتەوە، یان شارەکە بە تەواوی ڕۆدەچێت[1].

بێ گەردی بۆ خوای زاناو کارزان کە ئەم قورئانە موعجیزەیەی دابەزاندووە!

(٣) ﴿يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا﴾ الاعراف: ٥٤ . ئاماژە دەکات سەرەتا زەوی خێرایی سورانەوەی پتر بووە و بەپێنج کات ژمێر لە شەو و ڕۆژێکدا خولەکی تەواو کردووە. وەکو باسکرا.

(٤) ﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا﴾ النازعات: ٣٠. باسمان کرد کە خێرایی سوڕی زەوی وەکو خوا فەرمویەتی:﴿ يَطْلُبُهُ حَثِيثًا / أي سريعا﴾ بەدەوری خۆیدا و هێزی پاڵنەری چەقی دەبنە هۆی تەپین لە جەمسەرداو دەرپەرین لە هێڵی یەکساندا ئەمەش شێوەیەکی هێلکەیی نەك گۆیی و خڕ بە زەوی دەدات. وە وشەی(دحی) زۆر مانای تری ئیعجازی هەیە جگە لە هێلکەیی وەکو(مفردات الراغب) دا هاتووە.

(أ)(دحی): (أي ازلها عن مقرها) واتە: لە ئارامگای خۆی لایدا. بەڵێ زەوی لەم سەدیمە دورکەوتەوە و خولگەیەکی پێك هێنا.

(ب) (دحیها) واتە: سەرەتا زەوی ئارێك بووە لەگەڵ هەسارەکانی دا وە(د: حسن سيد احمد ابو العينين) لە لاپەرە(٦٤)ی کتێبەکەیدا(كوكب الارض ظواهره التضاريسية الكبرى) وێنەی قۆناغی ئارێکی هەسارەکان و قۆناغی هەموار و هێلکەیی یانی کێشاوە بە سێ قۆناغدا وەکو(لابلاس) دایناوە.

(د) (دحیه) واتە: (الانحراف) دێ واتە: ڕامالێن(الانجراف) کە باو و باران دروستی دەکات و

---

(١) الموسوعة الكونية الكبرى/ د: ماهر احمد الصوفي/ ج٦ / ل:٢٨٢ .





چیاکان دا دەخوێنییَ بە هۆی رووبار بۆ کەناری ئۆقیانوسەکانی دەبات. وە سەرەتای زەوی دورست بوون ڕامالّی زۆر بە خۆوە دەبینیّ وەکو باسی دەکەین.

(ج) (د: زغلول النجار) پسپۆر لە زەوی ناسی و ئیعجازی قورئاندا دەڵێ: (دحیها) بە مانای دەرچواندنی ئاوو بەرگە هەوای دیّ لە زەوی. وە بە مانای دەرچوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن دیّ لە زەوی. وە بە مانای دەرچواندنی بەرگی تاوێری دێت[1].

لە فەرهەنگی(الصحاح)ی (الجوهری) دا یەکیّ لە ماناکانی(الدحیه) فڕیّ دانە(وادحه أي ارمیه).

زەوی(٧١٪)ی ئاوە و بڕی ئاوەکەی بە(١٣٦٠) ملیۆن کم٣ مەزەندە کراوە. زانایان هەر لە کۆنەوە واقیان وڕماوە ئەم ئاوە زۆرە لە کویّ وە هاتووە زەوی داپۆشیوە! زۆر تیور بۆ وەلامی ئەمە دورست بوون. هەیە دەڵیّ: ئەم ئاوە لە یەك پێ گرتنی ئۆکسجین و هایدرۆجین پەیدا بووە لە بەرگە هەوای سەرەتایی زەوی، هەیە دەڵیّ لە بەستەڵەکی کلکدارەکان پەیدا بووە لە بەرگە هەوای سەرەتایی زەوی، تیوری سێیەم دەڵیّ لە ناخی زەوی هاتۆتە دەر و بەردەوامیش لە شێوەی بورکان دێتە دەرەوە. بەشێتەڵ بینراوە(٧٠٪)ی ئەو هەڵم و گازەی لەم بورکانانەوە دێتەدەر هەڵمی ئاوە. ئەوەی تر: دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و هایدرۆجین و هەڵمی ترشی هایدرۆکلۆریك و نایترۆجین و دووەم ئۆکسیدی کبریت و کبریتیدی هایدرۆجین و میثان و ئامۆنیا و هی تره.

سەرچاوە تازەکان پیشانیاینداوە بڕی ئاو لە قولایی زەوی دا زۆر لەوە زیاترە کە مەزندە کرابوو، دیسان دەرکەوتووە هەندیّ لە ئاوی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان لەگەڵ نیشتەنی یەکان دەجولێن بۆ ناو بەرگی تاوێری زەوی بە هۆی جولانی بنی ژێرەوەی ئەو بارستایی یە کیشوەرەکان.

ئاو بۆ ناو بەرگی تاوێری زەوی دزە دەکات، بە ناو تۆرەکی گەورەی قلێشەکانی زەوی کە لە ژێر ئۆقیانوس و دەریاکان بلاّبونەوە.

ئەو تۆڕەی ئەو قلێشانە(الصدوع) بەرگی تاوێری درز پیّ دەبات لە هەموو جێگایەکەوە، بە

---

(١) الارض، د: زغلول النجار





قولایی(٦٥)کم لە ژێر دەریاکـان و ئۆقیانوسـەکاندا و(١٠٠) کـم لـە ووشـکانی دا دەوری زەوی داوە.

سەڵماوە تواوەی تاوێری(الصهارە الصخریە) لە خاڵـە لاوازەکـانی زەوی دا چـاوگی ئـاوی زەوییە و رۆڵەکی باڵا دەگێڕێ لە جولاندنی ئەو ئـاوەدا لـە نـاو زەوی دا بـۆ سـەر ڕووی زەوی و بەپێچەوانەوەش، چونکە گەر مژینی ئاو نەبوایە پلەی گەرمی توانەوەی تاوێرەکان نزم نـەدەبۆوە. گەر ئەویش نەتوابایەوە دینامیکی زەوی دەوەستا لەوانە هەڵچوونی بورکانی. و دەرکـەوتووە کـە ئەو سەرچاوەی بەرگی ئاوی و گازییە.

بەو پێیە لای زانایانی جیۆلۆجی ئەم تیورە پەسەندە کە چالاکی گڕکانی لەگەڵ پێك هـاتنی بەرگی تاوێری هاتووە بەرپرسیارە لە پێك هاتنی بەرگی ئاوی و گـازی دا، بـەردەوام بورکانـەکان ڕۆڵەکی باڵا دەبینن لە دەوڵەمەند کردنی سەر زەوی دا لە ئاو داو گۆڕانی پێك هاتـەی کیمیـایی بەرگی گازی ئەوە مەبەستە لە فرێدانی زەوی(الدحو)دا، لەم ڕاستی یە سەرچاوەی گرگرتـووە کـە ئاو بەشی زۆری تواوەی تاوێری پێك دێنێ هەر چەندە ڕێژەی سەدی لە چاو بارستایی تواوە کە بە گشتی کەمە، بەڵام ڕێژەی گـەردەکانی مـاددە تواوەکـە(١٥٪)یـە، کـاتێ ئـەو بـەردە تواوانـە ساردەبێتەوە پێك هاتەکانی دەست بە(بلور) بوون و کریستاڵی بوون دەکەن. گازەکانی ناو فشاری پتریـان دەکەوێتەسـەر قـەبارەیان بـچوکتر دەبێتـەوە، ئەوەنـدە فـشارەکەیان زیـاتر تـا بـەرگی تاوێریەکەی بەهێزێك دەتەقێتەوە دەگاتە(١٠) ملیۆن تەن لەسەر(سم٢) یـە، ئەمـەش بەرگەکـە درزپێ دەدات گازەکان دەکشێن و گازەکان دەست بـە کـشان و ڕاکـردن لـە توانـەوە دەکـەن لـە توانەوەی تاوێری دا و هەریەك لەو هەڵمی ئاوەو گازەکـانی یـاوەری‌دا و تـواوەی تـاوێری دا بـۆ دەرەوەی دەمـی گڕکانـە، دەردەچـن یـان بـە ئاوتیـك و درزو قڵیـشەکاندا بـەرەو ئاسـمـان چـەند کیلومەترێ بەرز دەبنەوە تا دەگەنە بەشەکانی بازنەکانی گۆڕانی کەش و هەوایی(٨-١٨کـم) لـە سەرروی ئاستی ڕووی دەریاوە یان(٣٠-٨٠کـم)، پلـەی گـەرمی یـان(٢٥٠-٥٠٠) ەس دەبـێ و بەخێرایی(٢٠٠کم) بەرەو زەوی لە کات ژمێرێکدا دەگەرێتەوە.

چونکە چڕی لە چڕی گازی زەوی پترە. ئەو ئاوەی لەو هەورە گرکانەوە چـڕبۆتەوە لـە نـاو

گەردەکانی خۆڵە مێشدا کە لەبەرگە هەوای سەر زەوی دا بەرز دەبێتەوە دادەبارێ وەکو باران و هەندێ خوڵەمیش و چەوی گرکانی دەوری دەمی گرکانەکە ڕادەماڵێت و لە شێوەی دەرپەڕیندا(الدحو) قوڕولیتەی بورکانی دەردەچوێنێ مەترسی بۆ گوندو کێڵگەکانی ئەوێ دورست دەکات، لەمێژنییە دورگەیەکی فلیپینی توشی ئەم قوڕو لیتە بورکانی یە بو ئەو گوندەی ئەوێ بە تەواوی بە دانیشتوانەوە دادەپۆشێت. ئەم هەڵچونەگڕکانی یە زۆر سەرچاوەو نافورەی گەرم[1].

یان قوڵقوڵە هەیە بە پلەی گەرمی هەڵمی زۆرە وە بەوزەیەکی گەرمی بەرزی تاقەتکراو لە قوڵایی توێکڵی زەمینەوە هەڵدەچێت. جیۆلۆجیەکان بروایان وایە توێکڵی هەسارەی زەویمان(اوشاح) سەرەتا تواوە بووە بە ناتەواوی یان بە تەواوی، ئێستاش بەشێ سەرەوەی نیمچە تواوەو لینج و چڕە و براوا وایە ئەو تواوەیە سەرچاوەی سەرەکی هەڵمی ئاو و بەشی لەو گازانەبێ کە لە زەوییەوە دەرچوون و ئێستاش سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی بەرگی هەواو ئاوی زەوین.

ڕەنگە ئەمە مەبەستی(الدحو) بێ[2]. واتە: دەرچوون(وادحە) ای(ارمە) (دحی: رمی) واتە هاویشتنی، دەری پەڕاند. بڕوانە: (الصحاح/ الجوهری). هەمیسان لە قورئاندا رونتر هاتووە:﴿ أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا﴾ النازعات:٣٠. وە لە لافاوی نوحدا گڕکانەکانیش و ئاوی ژێر زەوی بەشداری دەکات لەم لافاوەدا وەکو قورئان دەفەرمێ: ﴿وَفَارَ التَّنُّورُ﴾ المؤمنون:٢٧. (الراغب) دەڵێ(الفور) واتە: زۆر هەڵچوون بە هۆی گەرمی زۆر. تەنور وشەیەکی کوردی یە ئاگردانە. عەلی(علیە السلام) دەفەرمێ رووی زەوی مەبەستە(صحاح/للجوهری).

وەکو لە گەردوونناسی دا باسکرا ئەم لافاوو بورکانە کیشوەری(ئەتڵەنت) ژێر ئاو دەخات. (د: مصطفی محمود) دەڵێ:﴿ وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ [3]. واتە: سوێند بە

---

(١) جوانترین نافورە نولد فیپفول لە جیهاندا کە(٢٠٠) ساڵە دەرچووە(٤٥-٥٠٠) لیتر ئاو فڕێ دەدات لە(٥) خولەکدا بۆ بەرزایی(٣٠٠-٤٥)م. وە لە نیسلەندا(٨٠٠) ناوچەی گەرمی لێ یە سەرباری سەدان کانی گەرم. وە لە باخچەی(Yellowstone) دا لە باخچەکە کانیاوێکی گەرم هەڵدەقوڵێت. (عجائب الطبیعة/ ت: بسام محمد عیسی/ ل: ١٥-١٦.

(٢) الارض في القرآن الكريم/ د: زغلول النجار/ ل:١٣٥-١٤٠.

(٣) الطارق:١١-١٢.





ئاسمان گێڕەوە، بە زەوی قڵیش قڵیش. دەڵێ: (لێرەدا قورئان لـەم ئایەتـە ئاسمـان گێـڕەوەوە، بـە زەوی قڵیش کە هەرچی بەرەو لای بەرز بێتەوە دەیگێڕێتەوە بۆ زەوی. (هەڵمی ئاو بـەبارانمان بـۆ دەگێڕێتەوە ئێستا دەزانین کە شەپۆلی بێ تـەل و تەلـەفزیون دەگێڕێتـەوە کـاتێ لـە زەوی یـەوە ڕەوانەی دەکرێ، چونکە چینەکان ئایۆنی ئاسمانی دەیدەنەوە، بۆیە دەتوانین کەناڵـەکانی لەنـدەن و پاریس و تەواوی کەناڵ و وەربگرین لە زەوی دا بە دەنگ و ڕەنگەوە دوای ئەوەی دەیداتەوە، گەر نەدرابایەوە پەرش دەبۆوەو نەمان دەدۆزیەوە، ئاسمان وەکو ئاوێنەیە، هەرچی بـۆی بەرزبکرێتـەوە دەداتەوە ئەمە ئاسمانی﴿ذَاتِ الرَّجْعِ﴾ە.

زەوی قلێش قلێشە﴿ذَاتِ الصَّدْعِ﴾، واتە: قلێش دەدات تا ڕووەك و نافورەو گازی سروشـتی و نەوت و ئاوی کبریتی و شلەی بورکانی لێ بێتە دەرەوە.

ئالێرەشدا لە بەرامبەر چەند وشەیەکی وردی پڕ لە واتـادا دەبینینـەوە کـە زۆر بـەوردی و دارێژراوی گوڵبژێر کراون. دەیان نمونەی تریش، کە تەنیا ئەو لێکدانەوەیە هەڵدەگرن ئـەم قورئانـە زانستی خوایە نەك مرۆیی و، تۆ لەبەردەم ئیعجاز و وردە کاری و شـاکاری و زانسـتەکی گـشت لاگرەوە دایت[1].

(د: زغلول) دەنوسێ:

## (سوڕی ئاو لە سروشت دا)

کردگاری مەزن ویستی ئەم ڕێژە زۆرەی ئاو لە زەوی دا تاقەت بکات، کە هەموو پێویستی یەکان ژیانی ئەو هەسارەیە دابین بکات و هاوسەنگی گەرمی سەر ڕووی بپارێزێت لەسـەر ڕووی، دیسان هاوسەنگی گەرمی لەسەر ڕووی دەپارێزێ لە هـاوین و زسـتاندا بـۆ پاراسـتنی ژیـان بـە جۆرەها شێوەوە. ئەو بڕە ئاوەی بەشداری لـە بەرگـە هـەوای زەوی وا دەکـات خـوای گـەورە بـە ڕێژەیەکی زۆر وردو دیاریکراو لە زەوی دەرهێناوە﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا﴾!

گەر لەم بڕە پـتر بوایـە هـەموو سـەر ڕووی دادەپۆشـی، گـەر کـەمتر بوایـە نەیـدەتوانی

---

(١) القران محاولة لفهم عصرى/ د: مصطفى محمود / ل:٢٧٦/ بيروت ١٩٧٩..

داخوازیەکانی ژیانی ناوی دابین بکات. بۆ هاوسەنگی پەیدا کردن پەروەردگار بەشێکی لەو ناوەی کردووە بە بەستەڵەك لەسەر جەمسەرەکان و لوتکەی چیاکاندا تا چاوگەکی شێداری خوازراو بێ و وشکانی بە پێ ی پێویست ناوەڵەبکاتەوە بەپێی پێویست ژیان لە وشکانیدا بلاو بکاتەوە. تا پەروەردگارمان ئەو برە ناوە لە بۆگەن بوون و گۆڕان و خراپ بوون چەپاڵە بدات لە سورەکی موعجیزەیی دا خستویەتە جولەوە، کە بە(سوڕی ئاو) لە زەوی دا ناسراوە و هەر ساڵە ئەم سوڕەی(٣٨٠,٠٠٠) کم٣ ئاو هەڵدەگرێ لەمیان زەوی و بەرگەهەواکەیدا.

کاتێ بڕی هەڵمی ئاو لە زەوی جێگیرە بڕی بارانی ساڵانەش نەگۆڕەو بە پێی ی بڕی هەڵمەکەیە، هەر چەندە بارینی بڕەکە بەسەر کێشوەرو دەڤەرەکاندا بە پێ ی ویستی خودایە. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (ما من عام باقل مطرا من عام) اخرجه البيهقي في سننه الكبرى. واتە: هیچ ساڵێ بارانی لە ساڵی تر کەمتر نییە. لە گێرانەوەی(الحاكم) :ا ئەمەزیاد کراوە(ولكن الله يصرفه) واتە: بەلاّم خوا لێ ی دەخورێ و بەشی دەکات.

ناوەراستی بارینی رۆژانەی باران دەگاتە(٨٥,٧)سم٣ لە ساڵێ دا، لە دورگەی (هاوای) دا دەگاتە(١١,٤٥)م٣ و لە زۆرێ لە بیابانەکاندا دەگاتە(سفر). بونە هەڵمی رووی، دەریاکان و زەریاکان(٣٢٠,٠٠٠) کم٣ یە لە ئاو لە هەر ساڵێکدا، زۆربەی لەوناوچەی هێڵی یەکساندا روودەدەن کە ناوەندی پلەی گەرمی(٢٠)° س و، ساڵانە(٤٤٨,٠٠٠)کم٣، تا ئاوی زەریاکان و ئۆقیانوسەکان نەگۆڕێ لە سەردەمی خۆماندا دەبێ لە کێشوەرەکانەوە ئاوی یان بچێتەوە ناو.

کت و متیش هەڵمی ساڵانە لە کیشوەرەکانەوە بە(٦٠,٠٠٠)کم٣ مەزەندە دەکرێ، کەچی ساڵانە(٩٦٠٠٠)کم٣ ی باران دەبارێ، جیاوازی میان ئەم دوو ژمارەیە بە ئیجابی هەمان جیاوازییە بە سەلبی لە نێوان بڕی باران و بە هەڵم بوون لە دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا کە(٣٦,٠٠٠)کم٣.

بێگەردی بۆ ئەو خوایەی هاوسەنگی ئاوی بەو وردەکارییە ڕاگرتووە. هەڵمی ئاو لەوشکانی دا لە دەریاچەکان و گۆم و زەلکاوەکان و رووبارو چەمو گەنجەڵ و خڕەکانەوە، وە لەبەستەڵەکانەو، ناڕاستەوخۆ لە ژێر زەمینەوە و لە رێگای هەناسەو ئارەقەو پاشەرۆکی گیانداران و ئارەقی




رووەکانەوەو، چاڵی گرکانەوە... هتد دێتەدیٚ. کاتیٚ ناوەندی بەرزی وشکانی(۸۲۳)م لەسەر ئاستی رووی دەریاوەو ناوەندی قوڵایی ئۆقیانوسەکان(۳۸۰۰)م لە ژێر ئاستی رووی دەریاوە، زەوی وشکانی کە دێتەوە ناو دەریاکان و زەریاکانەوە(۳٦۰) هەزار کم۳، کە لیٚژ دەبێتەوەو زەویەکی میکانیکی گەورە پەیدا دەکات لە بەرزو نزمی ئالۆزی زەوی دا رێگا دەکاتەوەو تاوێرەکان دەهاریٚ و نیشتەیی و خڵتەو تاوێری نیشتەیی دورست دەکات کە سامانی زەوی تیٚ دا پەیدا دەبیٚ و دەبێتە خاك و گڵەکی بە پیت بۆ رووەکی زەوی، گەر مرۆڤ هەرچی وزەی ماددی هەیەتی بۆ ئەو پێناسەوە خەرجی بکات ناتوانیٚ نرخی ئەو وزەیە بدات کە پەروەردگارمان پیٚ ی داوین تا زەوی بۆ ئاوەدانی بشێت[1].

وەکو خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا وَعِنَبًا وَقَضْبًا﴾[2].

واتە: پاشان زەویمان شەق کرد، تێماندا رواند دانەوێڵە و تریٚ و گژوگیا(الشقوق) بە هۆی ئاوو کرمی زەوی!

**( دابەش بوونی ئاو لەسەر زەوی دا )**

**( دابەش بوونی وشکانی و چیاکان )**

**﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾النازعات:۳۱-۳۲.**

واتە: ئاوو رووەك و لەوەری لە زەوی دەرهێنا، وە چیاکانی لەنگەر پیٚ دا. لێرەدا قورئان ئاماژە بە دەوری ئاو دەکات لە دورست کردنی ژیانداو پەیدابوونی رووەك و تاوێرو چیاکان و زۆربوونی ئۆکسجین لە هەوادا.

پرۆفیسۆر(ئەلك سمث) دەڵیٚ: (بەهۆی نزیکی زەوی لە خۆر تازە لاو پێك هاتەکانی پتر لە دەستدا لەوانەی زووپەرش دەبنەوە، هەرچی ماددە تواوەکانن(magma) لە ئاسن و پێك هاتەی

(۱) الارض / د: زغلول/ ل:۱٤۰-۱٤۳.

(۲) عبس:۲٦-۲۷.







سلیکۆن دەمینێتەوە. کاتێ ئەو تواوانە ساردبونەوە توێکڵی تاوێری ئاگری(الصخور الناریـة) پێك دێنێ لە جۆری(بازلت)ی بەزۆری، پاشان(بەرگە هەوای سـەرەتایی زەوی) دورسـت ددبـێ، دوایـی تاوێری(گرانیت) کە چڕییان کەمترە و کەوتنە سەر تاوێری(بازلتی) چڕ و بوونـە هـۆی جیـاوازی لەبەرزی و نزمی داو دورست کردنی بەرزایی و نزمایی یەکان لە زەمیندا.

هەڵمی ئاو هۆیەکی تر بوو ئەو مادده تواوانەی سارد کردەوە و لە نزمایی یەکاندا چڕ بۆوە ئۆقیانوسی سەرەتایی پێك هێنان. ئەنجا گەردەلولی سەخت و باران بونە هۆی داخـورانی تـوێکڵی زەوی ساواو بواری بۆ دورست کردنی تاوێری نیشتوو(الرسوبیة) ڕەخساند، ئەو پەستان و گـەرمی یە بەرزە زۆرێ لە ناوچە فراوانەکانی تواوەی ڕەق و تاوێری نیشتەیی گۆڕی تا بیانکات بە تاوێری گۆڕاو(الصخور المتحولة). کۆنترین تاوێر لە زەوی دا دۆزرابێتەوە تەمەنی دەگاتە(٣٨٠٠) ملیـۆن




ـنّ بە مەزندەیی، زۆربەی تاوێری زەوی لەمە کەم تەمەنترن.

بەرگە هەوای سەرەتایی زەوی زۆر لە بەرگە هەوای ئیمڕۆ جیا بوو، ئۆکسجین زۆر نەبوو، تەنیا لە کاتیّ دا زۆر بوو دارو درەختی چڕو پڕهاتنە ئاراوە بەر لە(٢٠٠) ملیۆن ساڵدا ت(ئۆکسجین) بەرهەم بێنن، ئەم رووەکانە تیشکی خۆریان قورغ کرد بۆلەت کردنی گەردەکانی :ووەم ئۆکسیدی کاربۆن و بەرەڵا کردنی ئۆکسجین[1].

بەڵیّ: خوا فەرمویەتی: ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾. لە(تەورات)یشدا هاتووە(وقال الله ليكن جلد في وسط المياه). (وقال الله لتنبت الارض عشبا وبقلا يبزر بزرا).

(د: کریسۆن موریسون) بۆ راڤەی ئەمە دەڵیّ: ( لە ناو ئەو ئاوەی هەموو زەوی داپۆشی بۆ کێشوەرەکان دەرکەوتن ووشکانی پەیدا بوو هەوا لەسەر زەوی سەری هەڵدا. لە یادت نەچیّ لێرەدا ژیان رووەکی بەر لە ژیانی گیانداران باسکراوە)[2].

دەڵیّ: (رژێمی خۆر کاتیّ هاتە پێش تێکەڵاوی چەند توخمیّ بوو بە تاریکی و لە پلەی گەرمی(٤١٢,٠٠٠) پلەدا جیابۆوە لە خۆرو بە ئاسمانی بیّ سنوور بە توندو تیژی پەرش بونەوە کە هزر بری ناکات. ئەنجا رێك بوویّ سەرەو بەری بە وردی ئەما، ئەمەش وامان لیّ دەکات بە چرکە ئەو شوێنە بزانین کە هەر بەشێکی لیّ داگیر دەکات، هاوسەنگی لە ناوی دا گەیشتۆتە ئاستیّ بلیۆنیّ ساڵ دەبیّ گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، ئەمەش بەڵگەیە تا بیّ برانەوە حوکم دەکات، ئەمەش هەمووی بە حوکمی یاسا. بەم یاسایەش ئەو سیستەمەی لە رژێمی خۆردا دەبینین لە شوێنی تردا بەرچاومان دەکەوێت[3].

ئەم رێکخستنە لای خوا بە وشەی(فسويها) دەری بریوە واتە: رێکی خست و هەموار و بەسەروبەری کرد، دوای ئەوەی بیّ سەروبەر بووە سیستەمی بۆ دادەنێت.

---

(١) علم الارض/ الك سمث/ ل: ١٤-١٥.

(٢) العلم يدعو للايمان/ كريسون موريسون/ ل:٢٠٠.

(٣) العلم يدعو للايمان/ ل: ٥٩.



(ئەلك سمث) دەڵێ: (توێکڵی زەوی و رووەکەی زۆربەی گەرمی لە خۆر وەردەگرێ، بەڵام ناخی زەوی کرۆکەکەی(اللب) زۆر شلەو تواوەیە و ئەوپەری چڕەو زۆرینەی (ئاسن)ە، (بواری موگناتیسی) لە سوڕی زەوی بە دەوری خۆر دا لە ئاکامی ئەو کرۆکە(کاکڵ) پەیدا بووە بە زۆری لە کاری(دینەمۆ) دەچێت.

بواری موگناتیسی زەوی لەو گەردە وردە بارگاوییانە(المشحونة) دەپارێزێ کە لە خۆرەوە دێن، کە بە(گەردەلول و بای خۆر) ناسراوە، پشتێنەی(ڤان ئەلن) ئاکامی کارلێکردنی موگناتیسی زەوی و ئەو گەردەلولە خۆرییەیە[1].

وەکو لە گەردووناسی دا باسمان کرد خوای گەورە بە ئایەتی:﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ﴾ [2]. ئاماژەی بەو پشێنەی(ڤان ئەلن)ە کردووە.

## دەرچوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە زەوی




(د: زغلول) دەڵێ: مانایەکی تری(دحو الارض) دەرچوونی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە لە زەوی، سەلماوە زۆربەی گازەکان کە لە بورکانەوە دێتەدەر دوای هەڵمی ئاو دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، بەبنەمای کرداری ڕۆشنە پێك هاتن(التمثيل الضوئي) دا دەنرێ ڕووەکە سەوزەکان بە ئەنجامدانی هەڵدەستن، ئەم گازەو ئاوو هەندێ

(١) علم الارض/ ل:١٥.

(٢) الرحمن: ٣٥.





توخمی زەوی بەکاردێنن بۆ دورست کردنی چەند(کاربۆهیدرات)ێک کە(خانەی رووەکی و شانەکانی) پێك دێنن. لێرەدا قورئان ئاماژە بە دەرچوونی ئەو گازەو گازی تر دەکات بە شێوەیەکی مەجازی بە دەرچوانی لەوەڕ(ومرعاها)، چونکە گەر دووەم ئۆکسیدی کاربۆن نەبوایە ڕووەك و سەوزیی لە زەوی دا نەدەهاتە بوون[1].

مانایەکی تری(دحا) وەکو لە(الصحاح) ی (الجوهری) هاتووە پان ڕاخستن و هەموارکردنی زەوی یە(دحوت الشيء دحوا أي بسطه). بەڵێ: خوای گەورە دوای ناڕێکی زەوی هەمواری کردو ڕێکی خست و هەمواری کردو کردنی بە بێشکەی ژیان). ﴿وَإِلَى الْأَرْضِ كَيْفَ سُطِحَتْ﴾ الغاشیە:٢٠.

## (بارینی ئاسن) بۆ سەر زەوی:

وەکو لە گەردوونناسی دا باسکرا نیازك و شوهبەکان زۆربەیان لە ماددەی ئاسن پێك دێن و ئاسنی ناخی زەوی بەرهەمی ئەو شوهب و نیازکانەیە بە درێژایی(٤,٥) ملیار ساڵی تەمەنی زەوی دا باریونە سەر زەوی، ڕۆژانە بە هەزارانیان بەرەو زەوی دێن و بەشەکی زۆریان بەهۆی لێك خشانیان لەگەڵ بەرگە هەواوە دەسوتێن، بەڵام جار هەیە زۆر گەورەن دێنە زەوی لەوانەی ئاوداره نەوەی(ئەریزۆنا) بوو کە چاڵەکی دورست کرد قوڵی(٢٠٠)م و تیرەی(١٠٠)م دەبوو ڕاددەکەی دەیان تەن ئاسنی تێکەڵ بە نیکل بوو.

ئاسن لەهەموو توخمەکان بۆ مرۆڤ بە سودترەو سەرچاوەی ئامێرەکانی کۆن و نوێیەتی و بەشداری لە پێك هاتنی خوێنی مرۆڤدا دەکات. (٥٪)ی توێکلی زەوی پێك دێنێ لە تەواوی کانزاکان بەتواناترو قایم ترە و لە هەموویان موگناتیسی ترە بۆ زەوی بۆ پاراستنی هێزی کێشکردن. وە لە(٣٥٪)ی بارستایی زەوی ئاسنە.

سەرەتا زەوی کۆمەڵێ خۆڵەمێش بووە لە توخمی سوك خوای گەورە نیازك بارانی کردووە کە پڕبوون لە ئاسن﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾ الحدید:٢٥. موعجیزەیەکی

---

(١) الارض/ د: زغلول/ ل:١٤٥.

تری قورئان لە ڕاست ئاسندا ئەوەیە ئاسن کێشی ئەتۆمی(٥٤-٥٦-٥٧) لـە هـەموویان بڵاوتـر ئەو هاوتایەیە کێشی(٥٦)ە، سەیر بکە سـوورەتی(الحدیـد)ژمـارەی ژمـارەی سـورەتەکەی(٥٦) و لەگەڵ یەکێ کێشەکانی ئاسندا دێتەوە، کە(٥٦)، ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان بـۆ ئەوانەی بیر دەکەنەوە[1].

## ٣١- ( ڕێك خستنی زەوی و هەموار کردنی بۆ ژیان هاوسەنگ کردنی.

قورئانی مەزن دەفەرمێ(فسواها) واتە: ڕێکی خست و هەمواری کرد بۆ ژیـان. ﴿وَالْأَرْضَ وَضَعَهَا لِلْأَنَامِ﴾[2]. واتە: خوا زەوی بۆ خەڵکی داناوە. بێگومان زەوی لە نـاو(١٢) هەسـارەکانی خۆردا تاکە هەسارەیە لەبارێ و بۆ ژیان ڕێکخرابێ و ئامادەکرابێ و هەموو هۆکارەکـانی ژیـانی تێدا دانرابێت. بۆیەش خوا فەرمویەتی:﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴾؟! ئایا زەویمـان نـەکردووە بـە لانکۆڵەی ژیان؟!

(د: فرانك ئالن) زانای سروشتی بایۆلۆجی لە ڕاست ئەم ڕێـك خـستنە زۆر شـتی زانـستی پەردە لەسەر هەڵماڵیوە وەکو دەڵێ:

(سازانی زەوی بۆ ژیان زۆر شێوە وەردەگرێ ناشێ لەسەر بنـەمای ڕێکـەوت و لـە خـۆوەی **هەرەمـەکی لێـك بدرێتـەوە. زەوی گۆیەکـە بـە ئاسمانـدا بـەرز کراوەتـەوە بـە دەوری خـۆی دا دەسورێتەوە، بەمەش شەوو ڕۆژ پەیدا دەکات، ساڵێ جارێ بە دەوری خۆردا دەسورێتەوە بەمەش چوار وەرزەکان دروست دەبن کـە بـە ڕۆڵـی خـۆی ڕووبـەری چـاك بـۆ نیـشتەجێ بـوون لەسـەر هەسارەکەمان پتر دەکات و جۆری ڕووەکەکان زیاتر لەوە دەکـات، گـەر هاتبایـە نەسـوڕابایەوەو وەستابایە.** بەرگەکی گازی دەوری زەمینی داوە بـۆ ژیـان پێویـستە و بـۆ بـەرزایی(٥٠٠) میـل

(١) سەیری الموسوعة الكونية الكبرى/ ج٦/ ل: ٢٦٨ بکە.

(٢) الرحمن:١٠.

پێغەمبەر (ص) ئاماژەی کردووە ئاسـن و ئاگر و خوێ لـە ئاسمانـەوە دابـاریون بـۆ زەوی(ان انـزل الله اربـع بركـات مـن السماء الى الارض: الحديد، والنار، والماء، والملح) رواه الديلمي.



:ەوری داوە، لە چڕی دا گەیشتۆتە ئاستێ ملیۆنەها شوهبای کوشندە ئەو ڕۆژانە بەرەو ڕمان :ێن بەراییان لێ دەگرێت و لە چرکەیەکدا (٣٠) میل دەبڕن.

بەرگە هەوای دەورمان پلەی گەرمی لە ئاستەکی لەباردا بۆ ژیان دەپارێزێت و هەڵمی ئاو ـە ئۆقیانوسەکانەوە بۆ شوێنە دورەکانی ناو کیشوەرەکان دەگوازێتەوە، لەوێ چڕ دەبێتەوەو دەبێ ـە باران و زەوی دوای مردن زیندو دەکاتەوە. باران چاوگی ئاوی سازگار و شیرینە، گەر ئاو ـەبوایە زەوی ڕەق و تەق و رووت و دەشتایی یەکی دوور لە شوێنەواری ژیان دەبوو، لێرەدا :ەبینین هەواو ئۆقیانوسەکانی سەر زەوی هاوسەنگی لە سروشتدا ڕادەگرن. ئاو چوار ڕەوشتی هەیە ژیان لە دەریاچەو رووبار و زەریاکاندا دەپارێزێ، بە تایبەتی لە زستانی ساردو سڕدا، ئاو بڕەکی زۆر لە کاتی پلەی گەرمی نزمدا هەڵدەمژێ.

چڕی ئاو دەگاتە ئەو پەڕی کە(٤)° س یە. بەفرو بەستەڵەك چڕی لە ئاو کەمترە، بۆیە سەر ئاو دەکەون لە دەریاچەو رووبارەکاندا ئەمەش هەلی پتر دەڕەخسێنێ بۆ بەردەوامی ژیان لە ناوچە ساردەکاندا. کاتێ ئاوەکە دەیبەستێ بڕەکی زۆر گەرمی فڕێ دەدات گیاندارانی ئاوی کە لە دەریاکاندا دەژین یارمەتی پاراستنیان دەدات.

بەڵام وشکانی ژینگەیەکی لەبارە بۆ ژیانی زۆرێ لە گیاندارانی زەمینی، خاکەکەی ئەو توخمانەی تێدایە رووەك دەیان گۆڕێ بۆ جۆری جیاواز لە خۆراك کە گیانداران پێویستی یان پێ ی هەیە. زۆر لە کانزاکان لە نزیك رووی زەوی یەوە هەیە زەمینەیان بۆ شارستانی ئێستا خۆش کرد و زۆرێ لە کۆمپانیاکان و هونەرەکان و پیشەسازیەکان پەیدا بوون.

بەو پێ و دانگە زەمین لە باشترین و هەموارترین شێوەدایە بۆ ژیان، گومان لەوەدانی یە ئەمە زەمینە سازکاری پەروەردگاری زاناو دانایە، ڕێتێ چوونییە ڕێکەوتەکی رووتو هەڕەمەکی یەك بێت. (ئەشعیا) لەسەر حەق بوو کاتێ ئاماژەی بۆ خوا دەکرد(لم يخلقها باطلا للسكن صورها). (١٨/٤٥).

زۆر کەس بە بچووکی زەوی لە چاو ئەو بۆشایی و ئاسمانە بێ سنورە گاڵتەیان دێت. گەر زەوی وەکو مانگ بچووك بوایە، یان تیرەی چارەکی هەندەی ئێستا بوایە نەیدەتوانی بەرگی

هەوایی و ئاوی خۆی بپارێزێ و پلەی گەرمی ئاوی دەگەیشتە ئاستی مردن. ئەگەر تیرەی هەندەی تری تیرەی ئێستای بوایەو رووبەری زەوی چوار هەندەی ئێستا دەبوو هێزی کێشکردنی دوو هەندەی ئێستای دەبوو بەوەش بەرگە هەوای هەندە بەرز نەدەبوو پەستانی هەوایی لە یەك کیلۆمەترەوە دەبوو بە دوو کیلۆگرام لەسەر سانتیمەتر دووجا، ئەمەش کاری زۆری دەکردە سەر رووبەری زەوی و ناوچە ساردو سرەکان فراوان دەبوون و خاکی بەسوود بۆ نیشتەجێ بوون زۆر کەم دەبۆوە، بەو هۆکارە کۆمەڵەکانی مرۆیی زۆر لێك دوور دەژیان یان لە ناوچە دوورەکان دەبوون تەریکی نێوانیان فرەدەبوو زۆربە دژواری پەیوەندی و گەشتیان پێکەوە دەبوو، بەڵکو دەبوو بە ئەندێشەیێك.

گەر زەوی قەبارەی لەمە پتر بوایە و چڕی خۆشی پاراستبایە هێزی کێشکردنی سەر رووی(١٥٠) هەندەی ئێستای دەبوو و بەرگە هەوای(٤) میل نزمتر دەبۆوە و بوونە هەڵمی ئاو ئەگەر نەدەبوو پەستانی هەوا بۆ(١٥٠) کگم لە سەر(سم٣) بەرز دەبۆوە. قەبارەی مرۆڤ ئەوەندە نزم دەبۆوە دەگەیشتە قەبارەی مشکەکی خورما(ابن عرس) یان سمۆرە(السنجاب) یەك دەبوو ژیانی هزری بۆ ئەم گیاندارە بوونی نەدەبوو.

گەر زەوی لەم بڕەی ئێستا لە خۆر دوورتر بوایە بڕی ئەو رووناکیەی لە خۆری وەردەگرت چارەکی ئەو بڕەیەی ئێستای دەبوو،بە خێرایی زۆرتر زەوی بە دەوری خۆردا دەسورایەوە، لە ئەنجامی ئەوەی زستان ساردتر دەبوو و گیاندارانی سەر زەوی دەکردن بە بەستەڵەك. گەر گەرمایی چوار هەندە دەبوو سوڕی خولگەیی پتر دەبوو وەرزەکان بەنیوە کورت تر دەبوون گەر هەشبانە، ژیان لەسەری ئەگەر نەدەبوو، بەوپێ و دانگە زەوی بەو قەبارەو دوورییەی لە خۆرو خێرایی یەکەی بە خولگەکەیدا هۆکارەکانی ژیان و سود لێ وەرگرتنی لە دیمەنی ماددی و هزری و گیانی دا رەخساندووە بەو شێوەیەی ئێستا دەیبینین.....) [(١)].

گەر تەماشای بەرگە هەوای زەوی بکەین دەبینین زۆر بە رێژەیی ورد گازەکانی ئاوی دیاریکراوە لە ئۆکسجین و نایترۆجین و ئەرگۆن و نیۆن و کنسیۆن و کریبتۆن و هەڵمی ئاوو دووەم

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ جون كلوفر مونسما/ ل:٦-٩.





ئۆکسیدی کاربۆن بە ڕێژەی(٣/١٠٠)ی (١٪). نایترۆجین(٧٨٪)ی هەوایە و ئۆکسجین(٢١٪)ی هەوایە ئۆکسجین شنەی ژیانە بۆ سەرجەم گیانداران، لەهەوا نەبێ ناتوانن وەری بگرن.

گەر ئۆکسجین لەم بڕەیە بتر بوایە، بۆ نمونە(٥٠٪) بوایە هەمموو شتەکی سەر زەوی گەر شابایە بۆ سوتان دەسوتا، لە پلەیەکدا لە یەکەم بروسکدا گەر بەرداری کەوتبایە دارستانەکە هەمووی گڕی دەگرت تا خەریك دەبوو بتەقێتەوە.

هەموو ڕووەکێ پشت بە کاربۆنی ناو هەوا دەبەستێ و هەڵی دەمژی. گەڵای ڕووەکەکان وەکو سی یەکان ئەو کارلێکردنە کیمایی یە دورست دەکەن کە بەکرداری ڕۆشنە پێك هاتن ناسراوەو توانای هەیە واتە: گەڵاکان لەبەر ڕووناکی خۆردا دووەم ئۆکسیدی کاربۆن پارچە بکەن بۆ کاربۆن و ئۆکسجین، ئۆکسجین دەهاوێ و کاربۆن تاقەت دەکات لەگەڵ هایدرۆجین یەك دەگرێ کە ڕووەك لە ڕەگەکانەوە وەری دەگرێت شەکرو سلیلۆز و ماددەی کیمیایی ترو میوەو گوڵی لێ دورست دەکات.

ڕووەك ئۆکسجین بەرەڵا دەکات کە ناتوانین لە پێنج خولەك زیاتر بێ ی بژین. بەم شێوەیە دەبینین تەواوی ڕووەکەکان و دارستانەکان و گژو گیاو قەوزە و هەرچی کشتوکاڵە پێك هاتەی خۆی بەتایبەتی لە ئاوو کاربۆن پێك دێنێت. (ئۆکسجین و هایدرۆجین و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و کاربۆن هەموو ئەوانە بە جیاو پێکەوە توخمی بایۆلۆجی سەرەکین.

نایترۆجین خۆراکەکی سەرەکی ڕووەکە، بێ ی ئەو ڕووەك ناژیێت، ئەو گازە بە دوو ڕێگە ڕووەك کەڵکی لێ وەردەگرێ، یەکەم لە ڕێگای بەکتریای نایترۆجینەوە دووەم لە ڕێگای گرمەو بریسکەی هەواوە کە ئۆکسجین و نایترۆجین یەکتری دەگرن وەکو نایترۆجینەکی پێك هاتە لەگەڵ باراندا دەبارێت[1].

بەڵێ خوای گەورە لە ناو هەر(١٢) هەسارەکاندا ژیانی بە زەوی بەخشی و هەموو هۆکارەکی ژیانی تێدا دابین کرد:﴿ وَآيَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا وَأَخْرَجْنَا مِنْهَا حَبًّا فَمِنْهُ يَأْكُلُونَ وَجَعَلْنَا فِيهَا جَنَّاتٍ مِن نَّخِيلٍ وَأَعْنَابٍ وَفَجَّرْنَا فِيهَا مِنَ الْعُيُونِ لِيَأْكُلُوا مِن ثَمَرِهِ وَمَا

---

(١) بە کورت کردنەوەو دەستکاری لە(العلم يدعو للايمان) ل:٦٣-٨٠ وەرگیراوە.



عَمِلَتْهُ أَيْدِيهِمْ أَفَلَا يَشْكُرُونَ سُبْحَانَ الَّذِي خَلَقَ الْأَزْوَاجَ كُلَّهَا مِمَّا تُنبِتُ الْأَرْضُ وَمِنْ أَنفُسِهِمْ وَمِمَّا لَا يَعْلَمُونَ وَآيَةٌ لَّهُمُ اللَّيْلُ نَسْلَخُ مِنْهُ النَّهَارَ فَإِذَا هُم مُّظْلِمُونَ وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَّهَا ذَٰلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ لَا الشَّمْسُ يَنبَغِي لَهَا أَن تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ يَسْبَحُونَ﴾ [1].

بەڵێ خوا لەم ئایەتە﴿وَآيَةٌ لَّهُمُ الْأَرْضُ الْمَيْتَةُ أَحْيَيْنَاهَا﴾ ئەوە دەردەخات خوا لـە مردنـەوە ژیانی بە زەوی بەخشی و ئەویش سـەرەتا وەکو هەسارەکانی تری برای بێ ژیان بووە خـوا کردویـە بە بێشکە بۆ ژیان.

### ( ٣٢ ) جوڵەی درز بردن( الصدوع favlting ) و جۆرەکانی و تیوری دورست بوونی کیشوەرەکان: نظرية زحزحة القارات:

قورئانی مەزن دەفەرمێ:﴿ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾.

واتە: سوێند بە زەوی خاوەن(کەرت و قڵیش قڵیش). بەڵام وشەی (الصدع) لـە (الـصحاح) دا دوو مانای بۆ کراوە: (الصدع- الشق)، (التصديع: (أي التفريـق) واتە: کـەرت بـوون و پارچـە بوون.

وە(الراغب) جوانتر بۆی چووە لە(المفردات) دا و دەڵێ: (الصدع في الاجسام الصلبة كالزجاج و الحديد و نحوهما). واتە: کەرت بوون و درز لەتەنی رەقداو وەکـو شوشـەو ئاسـن و شـتی تـر. لە(المحيط/ الفيروز ابادی)دا هاتووە: (الصدع أي الشق في اشياء صلبة). لـە(لسان العرب/ ابـن منظور) دا هاتووە(تصدع أي شقه نصفين) واتـە: بوبـە دوو کـەرت. وە هـاتووە(الـصدع: نبـات الارض) واتە: زەوی قڵیش دەدات بـۆ هاتنـە دەری پنجـە رووەك(وتـصدعت الارض بالنبـات أي تشققت). لە تفسير البيضاوی دا هاتووە: (کەرت بوونی زەوی بـۆ هاتنـە دەری رووەك و کـانی). بەڵام وشەی﴿ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا﴾ لێـرەدا وشـەی(شـق) زیـاتر بـۆ روانـی رووەك بـەکار دێـت و(الصدوع) مانای تری هەیە.

---

(١) يس:٣٣-٤٠.

## درز بردنی زەوی (الصدوع) لە رووی زانستی جیۆلۆجی یەوە:

بە شوێنی شکانی تاوێرەکانی زەوی لە رووی جیۆلۆجی یەوە دەوترێ: (التصدع fault)، لە قوڵایی یەکی گەورەی رووی زەوی دا دەست پێ دەکات کە چەقی بومەلەرزەکان لەوێ وەیە لەو شوێنەوە شەپۆلی بومەلەرزە دەست پێ دەکەن بۆ سەرەوەو زەوی دەلەرزێت[1].

بێگومان جگە لەوەی زەوی کەرت دەبێ بۆ رووەکەکان تا بێنەدەر لە زەوی مانای تریش دەدات وەکو(البیضاوي) باسی کرد، ئەنجا(القرطبي) زۆر مانای تری کردووە کە هەموو ئەم واتایانە هەڵدەگرێ، چونکە قورئان هەر یەك وشەیەك ئۆقیانوسێکە بۆ چوونە ناو قوڵایی یەکەی و دەرهێنانی مرواری و مەرجانەکانی ماندووبوون و مەلەوانی کارامەیی دەدوێت. بۆ نمونە(المجاهد) دەڵێ: (أي الارض ذات الطرق التي تصد عما المنشاة).

ئەنجا لە قورئاندا(الصدع) لە(الشق) جیاکراوەتەوەو بۆ رووەك بەکار هاتووە: ﴿فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبًّا ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا﴾[2]. با سەیری راڤەی زانستی بکەین:

---

(١) الزلازل والبركان/ د: ايمن الاسكندراني/ ل:١١.

(٢) عبس: ٢٤-٢٧.



**(١) ((درزدانی خاك بۆ رووەك( انصداع التربە عن النباتات ))):**

خاکی زەوی بەشی زۆری لە کانزای گڵی تێکەڵ و ناتێکەڵ بـە لم پێـك دێ، کـانزای دەنـگ وردیلەیە تیرەیان لە(٠,٠٠٤)ملم کەمترە، لە بنەڕەتدا لـە سـلیکانی ئەلـەمنیۆم و توێژاڵـەکانی ئاڵوگۆڕ لە دووەم ئۆکسیدی سلیکۆن(سیلیکا) و ئالۆمینیا و توخمی تـری زۆر پێـك دێ دێ هـەر توێژاڵێ بەپێ ی جۆری گڵەکە بارگەی سالب و موجەبی هەڵگرتووە.

گڵی لە جۆری لینج و مڵ(الغروي)یـە چـونکە زۆر وردە زوو بڵاودەبێتـەوە، دەتـوانێ ئـاو بخواتەوە و بە ئایۆنی توخمەکانەوەبلکێ، بۆیە کاتێ ئـاو بەسـەر خاکـدا دەرژێ بـە برەکـی بـاش گڵەکە هەڵدامسێ و قەبارەی زیاد دەکـات و دەنکـە وردیلـەکانی دەهـەژن و بـۆ سـەرەوە بـەرز دەبنەوە تا توێژاڵەکی توند پەیدا دەکەن و کەرت دەبن بۆ هاتنە دەری لق و ڕەگی ناو تۆوەکان بۆ سەرەوە تا بە ئاسانی گڵەکە ببڕن و بەردەوام گەشە بکات و لە سەر زەوی هەڵچن.

دیـسان لەرزینی خاك و جوڵانی بەدابەزینی ئاو بەسەری دا هۆی تریشی هەیە جگە لە زیـاد بوونی قەبارەی دانکەکانی، ئەویش بە هۆی بارگەی کارەبایی چونیەك لەسەر رووی دانکەکان کـە دەبنە هۆی لێك دوورکەوتنەوەی دانکەکان لە یەکتری لە گەردەکانی ئاو کە دزەی کردۆتـە نـاوی دەکەونە لەرەلەرو بەهۆی هاوبارگە بوونی ئەو بارگانە(الـشحنات) دەوەسـتێ بـە هـۆی بارگـەی



پێچەوانەکە لە ئایۆنی خۆییەکانی خاك لە ئاوی ئاودێری پەیدا دەبێت.

لەوانە گەردەکانی ئاو پاڵ بە دانکەکانی خاکەوە دەنێ لە هەموولایەکەوە تا شوێنی بۆ عەمبارکردنی ئاو بکاتەوە لەمیان ئەو دانکانەدا، لەوانەش پاڵنانی گەردەکانی هەوای خەزن کراو لە نێوان گەردەکانی هەوادا بە هۆی ئاوەوە هەمیشە شوێنی ئەو دەگرێتەوە تا بە تەواوی تەری دەکات، تا قەبارەی ئاو پتر بێ زیاتر گلەکە بلاودەبێ و قەبارەی گەورەتر دەبێ و هەر گەردێکی خاك بیگری توانای خواردنەوەی ئاوی هەیە و لەسەر رووی هەڵی دەگرێ و لە ماوەکانی نێوانیانداو نێوانی دانکەکانی دەوری عەمباری دەکات، بەمەش ئاڵووگۆڕ لەمیان ئایۆنە جۆراو جۆرەکان دێتە دی لەسەر رووی دانکەکانی گڵ و ئایۆنە تواوەکان لە ئاودا کە پارێزراوە لە ناوی دا هەتا رووەك سوود لە ئایۆنەکانی توخمە خۆراکیەکان سوود بگرێ لە خاکدا پاش شی بوونەوە بەهۆی ئەو ئەنزیمە تایبەتانەی ڕەگۆکان دەیرێژێ کە لەو تۆوە شین بووەو بەرەو خوارەوە پاڵیان پێوەنراوە.

گەر ئەو خاکە لە کاتی ئاو بەسەردا ڕژانی دا یان ئاودانی دا **قلیشی نەدابایە(الانصداع)** زەوی رووەکی نەدەهێنا، ئەمەش بەشێکە لە بەشەکانی قلیشی زەمینی کە **رۆڵەکی بالای هەیە** لە ئاوەدانکردنەوەی زەوی بە رووەك و کردنی بە خاکەکی لەبار بۆ ژیان[1].

---

(١) هەروەها قورئان دەفەرمێ:﴿ وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾ الحج: ٥. واتە: دەبینی زەوی ڕەق و رووتە کاتێ بارانمان بەسەردا باراند لەرێیەوە بەرز بۆوەو هەموو جۆرێکی کەشاوەمان تێدا ڕواند. لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ کشانی گڵ و فراوان بوونی دەکات دوای تێرو بوون وەکو لەگەردووناسی دا باسکرا.





## (٢) لێك دانرازان و قلیشدانی تاوێری وشكانی:



لە ئەنجامی تووش هاتنی تاوێرەكانی توێكڵی زەوی بە فشارو ماندوبوونی زۆر بە هۆی كۆمەڵێ نێوانی هاوتەریب و پارچە پارچە لە شێوەی درز لە توێكڵی زەوی دا دەشكێت، تاوێرەكانی بۆ بارستایی نزیك لێك دەترازێن بێ بینینی برەكی دیری جوڵە لە رووی ئاستەكانی ئەو درزانەوە.

دیسان بە هۆی رووشان و ڕامالْ ڕان(التعریة) نێوانە(الفواصل) روودەدات كە بە لابردنی برەكی زۆر تاوێری سەرەوە هەڵدەستێ و ئەمەش یارمەتی دەردەبێ بۆ سووك كردنی فشاری سەر ئەو تاوێرانەی لەژێرەوەدان، ئەنجا ئەو ماندوو بونە كەم دەكاتەوە كە ئەو تاوێڕانە دووچاری دەبن و تووشی كشان(التمدد) و كەرت بوون(التشقق) دەبن لە شێوەی شكان دا تاوێرەكان بۆ بارستایی هاوسێ بەیەك جیادەبنەوە بێ بینینی جوڵەیەكی بینراو بە ناو ئەو نێوانانەدا[1].

---

(١) دیاردەی كشان(المد) و درزبردنی زەوی و تاوێرەكانی زۆر لە قورئاندا دووبارەبۆتەوە وەكو﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا﴾ الرعد: ٣. وشەی(المد) بە مانای كشان و درێژ بونەوە و فراوان بوون دێت. ﴿وَالأَرْضَ مَدَدْنَاهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ﴾ الحجر: ١٩. لێرەدا قورئان ئاماژە بە كشانی زەوی و شاخ و تاوێرەكانی دەكات. ﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ﴾ الانشقاق:٣-٤. واتە كاتێ زەوی كشاو درێژ بۆوە هەرچی لە ناخی دابوو هاتەدەر. بەڵێ: لە پەسلاندا تاوێرەكان بە تەواوی دەكشێن و ناخی زەوی بە هۆی فشارو جۆش و خرۆشی بە شێوەی بوركانە و بومەلەرزە هەڵدەكوڵێت و سەر زەوی دەبێتە یەك پارچە بوركان و ئاگر. (ابن عباس) وەكو(تفسیر القرطبی)دا هاتووە: (مد) بە مانای كشان لێك دەداتەوە(ویزاد). ئاشكرایە ماددەش بە گەرمی دەكشێت، دەبێ زەوی بە هۆی گەرمی زۆری بكشێت!





زۆربەی نێوان و کەلێنەکانی زەوی(الفواصل) دەکەونە ناوچە تەریب و پارچە پارچە لە دووڕودا یان پتر گەرچی هەندێکیان ئاراستەیەکی دیاری کراوایان نییەو قوڵایی یان کەمە.

دیسان ئەم کەللەبەرانە لە توێکڵی زەوی دا بە هۆی ساردبوونەوەی تەواوەی تاوێری ڕوودەدات کە لە ناو جەرگەی زەوییەوە نزیك لە ڕووەکەی دەردەپەڕن لە شێوەی گڕو گڕکاندا. ئەم نێوان و درزو کەلێنانەی توێکڵی زەوی زۆر لێزانی یان تێ دایە، هەنگاوەکی بە نرخە بۆ وردو خاش بوونی تاوێرەکان(تجوية الصخور) و ڕامالێنیان(التعريه)، ئەو کەلێن و نێوانانە(الصدوع) وەکو ڕێرەوێ دەبن بۆ ڕامالێنی جۆراو جۆر بۆ ناوەوەی تاوێرەکان،دیسانەوە کار بۆ دوروست کردنی خاك و خۆڵ و نیشتەنی یەکان و تاوێری نیشتو(الصخور الرسەبيه) دەکات، بە بێ بـ‌ـوونی خاك و لیتە زەوی کێلاّن مسۆگەر نابێ، بە بێ بوونی تاوێری نیشتویی پترۆل و گازی سروشتی بەرهەم نایەت، دیسانەوە سامانی تری نیشتوییش بەرهەم نایەت وەکو(خەڵوز) و (فۆسفات) و بە هەڵم بووەکان و هی تریش.

دابەش بوونی درزو نێوانی تری بەرگی تاوێری زەمینی(الغلاف الصخرى) زۆر شوێنی تری کانزا زەمینی یە گرنگەکانی تر دەست نیشان دەکات وەکو: (زێر) و(زیو) و(مس) و(قورقوشم) و(فافۆن-القصدير) و هی تر. هەمیسان یارمەتی دەردەبێ لە دیارکردنی هەندێ سەرچاوەی ناوەڕۆی ڕووبارەکان و پێك هاتنی هەندێ ئەشکەوت و چاڵی تواندنەوە لە تاوێرەکاندا و کەرت کردنی ڕێگا بەناو چیاکان و گردەکان و بەرزایی تری زەمینی دا.

هەرچی درزو کەلێنی زەمینی یە ئەوە شکانێکە لە توێکڵی دا بە هۆی جوڵەی تاوێرەکانی ڕوودەدات لە هەردوولای ئاستی درزی جوڵە ئاسۆکەی دا، یان بە پلەیەکی بینراو لارە و نێوانی دووری ئەو درزانە بە ئاشکرا دیارەو هەیانە بە چاوی ڕووت نابینرێن و جوڵەکەی هەست پێ ناکرێ و هەیانە دەیان کیلۆمەتر درێژ دەبێتەوە[1].

---

(١) پێشەوا عەلی(کرم الله وجهه) ئەرمرمویەتی: (فطر الخلائق بقدرته ونشر الرياح برحمته، ووتد بالصخور ميدان ارضه). (نهج البلاغه/ شرح: د: صبحى صالح/ ل:٣٩/خطبة(١). واتە: خوداوەند دوروستکراوانی بە توانای خۆی دوروست کردووە بای بە ڕەحمەتی خۆی بڵاوکردۆتەوەو مەیدانی زەوی خۆی بە تاوێرەکان قایم کردووە.




هەیە لەو درزانە(الصدوع) لە ئەنجامی قـایمی تاوێرەکـانی زەوی یـەوە دوروسـت دەبـیّ لـە دوولای پێچەوانەوە، هەیە بە هۆی فشاری دوولای بەرامبەر بە یەکتری پەیدا دەبێـت. دیـسانەوە درزی وا هەیە بە هۆی خزانی بارستایی تاوێرەکان دورست دەبیّ بەسەر یەکتری دا.

جوڵانی درزی زەمینی چالاك چەند بوومەلەرزەیەك دورست دەکات، درزە کۆنەکان بە زۆری بیّ جوڵەو خامۆشن. ئەم درزانە زۆر بایەخدارن چونکە ڕێڕەوێکی سروشتین لەمیان نـاخی زەوی و سەر رووی دا، بە ناوی دا هەڵم و گازەکان دەبزوێن کە سامانی کانزایی یان هـەڵگرتووە، دیـسان بەیەکاچووەکانی ئاگری(المتداخلات الناریـە) و لاڤـەی بورکـانی(الطفـوح البرکـانی) کـە کـانزای تواوەی هەڵچووە دەکەونە جوڵەو جۆرەها تاوێرو کانزای تابورییان هەڵگرتووە زۆر گرنگن، دیـسان توخمی پێویستی یان پیّ یە بۆ نوێکردنەوەی سامانی تاوێری و خاکی رووی زەوی گرنگن. وە ئـەم درزو کەللە بەرانە رۆڵەکی گرنگ دەبیـنین لـە نوکـەکان و رووچـوونی زەمینـی داو بـە ناویانـدا سەرچاوەی زەمینی دورست دەبێت، هەروەها گەنجینەی پەترۆڵ و نەوت، دیسان یارمەتی کـرداری رووتانەوەی جۆراو جۆر دەدات[1]. یارمەتی هـەمووارکردنی رووی زەوی دەدات، کـە گـڵ و خـاك نیشتەیی و سامانی زەمینی بەدوا دا دێت.

دیسانەوە ئەم کەللەبەرانە هۆیەکی گرنگە بۆ رووخاندنی رووی زەوی و بنیات نانەوە، چیاو شاخەکان و گردو تەپۆڵکەکان و حەوزو گۆم و ڕۆچوونی زەمینی پەیدا دەکات[2].

خوای گەورە دەفەرمیّ:﴿ أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاء أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾[3].

---

(١) خوای گەورە لە ڕاست ئەم کەللەبەرانەو گرنگی یان بۆ سەرچاوەکانی و نافورەکان دەفەرمیّ﴿وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاء عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ﴾ القمر:١٢. واتە: زەویمان تەقاندەوە وەکو چەند کـارێزو سـەرچـاوەیەك﴿أَلَمْ تَـرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ﴾ الزمـر:٢١. واتـە: ئایـا نـابینی خـوا نـاوی لـە ئاسمانـەوە بارانـدووە بـە شـێوەی چـەند سـەرچـاوەیەك بردویـە بـە زەوی دا. وەفورتـان لـە ڕاسـت سـامانی نـاخی زەمینـی دەفەرمیّ﴿وَمَا تَحْتَ الثَّرَى﴾ طه: ٦. واتە: ئەوەی لە ژێر خـاك و زەمیندایـە لـە سـامانەکان و کانزاکـان. وەکـو داهاتوو باس دەکرێت.

(٢) الارض في القرآن الكريم/ د: زغلول النجار/ ل:١٧٠-١٧٣.

(٣) الملك:١٦.




واتە: ئایا دڵنیان کەسێ لە ئاسمانەوە زەویتان لێ ڕوبەڕوبێنێ کاتێ گێژ دەخوات. بەڵێ .ەوی لە ئاخدا لەبەر گەرمی یان گێژ دەخوات و ئەم گێژ خواردنەی گازاوەکانی بە هۆی گەرمی .ریەوە زۆر جار بومەلەرزەو بورکان و بومەلەرزە دورست دەکات و ڕوچوونی زەوی پەیدا .ەکات. وەکو داهاتوو باسی دەکەین.







**( ٣ ) گەردووناسان دەڵێن:** سەرەتا گۆی زەوی یەك پارچە بووە بەڵام دوای ملیۆنەها ساڵ بە هۆی فشاری زۆری ناخی زەوی توێکڵەکەی درزی بردووە(تصدعت) و پارچە بووە و کیشوەرو نۆقیانوسەکان لێ پەیدا بووە[1].

بەڵام وشەی﴿ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا﴾ لێرەدا لە وشەی(الشق) لە وشەی(الصدع) جیایە وەکو(الراغب) لە(مفردات)دا دەڵێ: (بۆ درزو کەلێنی تەنی ڕەقە وەکو ئاسن و شوشە و شتی تر). وەکو تاوێرەکان. (الشق) بە مانای(الخرم الواقع في الشيء) واتە: کون بوون.

وەکو کون بوونی خاك بۆ دەرچوونی گیاو رووەك.وە تەمەنی زەویش لای زۆربەی زانایان(٤,٥) ملیار ساڵە، وە زەوی بەر لە دورست بوونی مرۆڤ و ئاوەدانکردنەوەی چەند قۆناغی بەخۆوە بینیوە. زانایانی جیۆلۆجی ئیمرۆ دۆزیویانەوە کە زەوی بۆ(٢٤) پارچە کەرت بووە(تصدعت)، ئەم پارچانە کیشوەرەکان و قوڵایی دەریاکانی پێك هێناوە، لەوانە کەرتی ئەفریقیا و کەرتی ئەمریکا، ئەنجا ئەوروپا و ئاسیا و ئوسترالیا و هیندی و عەرەبی... گرنگتر لەمەش دۆزینەوەی درزوتیکی(الصدوع) گەورەیە لە قوڵایی نۆقیانوسەکاندا لە ڕێگای ژێر دەریاکاندا کە یارمەتی ئەم دۆزینەوە گەورەیەی دا، ئەم کەلێنانە لە هەموو لایەکەوە دەوری زەوی داوە، درێژی یان دەگاتە سەدان کیلۆمەتر و قوڵایی یان خۆ لە(٦٥-١٥٠) کم دەدات و

---

(١) تیوری پارچە بوون و خزان(زحزحه القارات) کە قورئان بە(التصدع) ناوی بردووە(awcgener) لە ساڵی(١٩١٤) دا ڕایگەیاند لە کتێبەکی سەربەخۆدا بە ناوی(دورست بوونی کیشوەرو نۆقیانوسەکان). بڕوای وایە سەرەتا لە چەرخی خەڵوزدا زەوی یەك کیشوەر بووە بە ناوی کێشوەری(پانجایا) یەك نۆقیانوسی گەورە دەوری داوە بە ناوی چینی(سیما). وە بڕوای وایە ئەم کیشوەرە بۆ چەند پارچەیەك لەت بووە و خزاوە و لێك دورکەوتۆتەوە کە کیشوەرەکانی ئیمڕۆی پێك هێناوە. بڕوانە(معالم سطح الارض/ د: جودة حسین جودة/ ل:٥٢٣.

پرۆفسۆر(وحید الدین خان) لە کتێبی(الاسلام یتحدی/ ل:١٤٩) دا بڕوای وایە ئایەتی﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا﴾ ئاماژە بەم تیورە دەکات کە دەڵێ: سەرەتا کیشوەرەکان یەك پارچەبوون و دوورکەوتونەتەوە و بوون بە حەوت پارچەو کەرت بوون. وشەی(دحیها) بەمانای(القذف) مانا دەکات، واتە: دەربەڕاندن. ماناکەشی جوانە چونکە لە(مفردات الراغب) دایەکێ لە ماناکانی(الدحو) واتە: (ازلها عن مقرها) لە(لسان العرب) دا یەکێ لە ماناکانی: (أي ارمیه). کە مانای دوور کەوتنەوەو پارچە بوونی زەوی دەگەیەنێ! بەم شێوەیە هەرووشەیەکی قورئان نۆقیانوسەکی زانستی پڕ لە مرواری و مەرجانە مەلەوانی کارامەی دەوێ بڕوانتە قوڵایی یەوەو دەریان بێنێت!





گڕی بورکانییان لێوە دێتە دەرەوە، گەر زەوی ئەو درزو تیکانە(الصدوع)ی نەبوایە زەوی وەکو بۆمبایەکی هایدرۆجینی دەتەقیتەوە یان وەکو بۆمبای ئەتۆمی. قورئان پیرۆزیش ئاماژە بەو دیاردەیەی کەلێنەکان(الصدوع) دەکات لە قوڵایی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان، کاتێ قورئان لە سورەتی(الطور) دا سوێند دەخوات:

﴿ وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ واتە: سوێند بە دەریای داگیرساو[1].

لەم درزو کەلێنانەوە(الصدوع) لە جوغرافیای تـوێکڵی زەوی دا زانستی(بومەلەرزەکان و بورکانەکان) دورست بوو، جیۆلۆجیەکان وتویانە: (٩٠٪)ی بومەلەرزەو بورکانەکان لە دەوری ئەو درزو تیکانە(الصدوع) وە دورست دەبێ، بۆیە دەوترێ ئەم ناوچانە دەکەونە ناوچەی بومەلەرزەکانەوەو ئەم ناوچانە ناکەوێتە ناو ناوچەی بومەلەرزەکانەوە. (د: زغلول النجار) لە ڕاست دیاردەی(التصدع) لە قورئانی پیرۆزدا﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ ی بە درزی ناوقوڵایی ئۆقیانوسەکان مانا کردووە.

بەڵام جیۆلۆجیانی نوی ئەم دوایی یە دۆزییانەوە کە چینی تاوێری دەرەکی زەوی کە بە لیتوسفیر(lithosphere) ناسراوە و قوڵایی لە ئۆقیانوسەکاندا(٦٥-٧٠)کم و لە ژێر کیشوەرەکاندا ئەستوریەکەی(١٠٠-١٥٠)کم، بە سەری تۆزێ لە درزو کەلێنی قوڵدا دابەش بووەکە(١٢) لەوحی(پلێت plate)ی ڕەق دەبێت، سەرباری کۆمەڵە پلێتۆکەیەکی بچوک و ناسراو بە پلێتۆکەکان(لویحات) کە سەر چینی تواوەی ناسراو بە ئەنتوسفیر(asthenosphere) کەوتووە.

واتە چینی لاوازە بە ئازادی بەرەو یەکتری یان دوور لە یەکتری دەجوڵێن، گەر وای بۆ بچین ئەو پلێتانە لە شێوەیەکی درێژکۆڵەدان، ئەو تاوێرە تواوانە کە ناسراون بە تواوە(الصهارە —

(١) قورئان دەفەرمێ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾التکویر:٦. وشەی(السجر) وەکو(الراغب) لە(المفردات) دا باسی کردووە واتە (تهیج نارا یقال سجرت التنور). واتە دا داگیرسا لە ئاگر، وەکو وتراوە تەنورم داگیرساند. تا لە فەرمودە دا هاتووە: (البحر هو الجهنم) رواه الطبري في تفسیره.واتە: دەریا دۆزەخێکە. یان خوا فەرمویەتی: ﴿وَفَارَ التَّنُّورُ﴾. واتە: کاتێ تەنوریان بورکان هەڵچوو لە ئاگرو گڕ. (الراغب) دەڵێ: (الفور: شدة الغلیان و یقال ذلك في النار نفسها اذا هاجت). وەکو لە باسی(بومەلەرزە و بورکاندا) درێژتر باسی دەکەین.



magma) لە یەکێ لەلایەکانی ئەو درێژ کۆڵەیەدا بەرز دەبێتەوە تا پارچەیەکی نوێ لە بنی ئۆقیانوسدا پێك بێنێت، بەڵام لە لای بەرامبەریەوە ئەو پلێتەیە بەر پلێتی بەرامبەری دەکەوێ کە هاوسێ یەتی دەست بەڕۆچوون دەکات لە ژێریدا تا چینی(ئەنتوسفیر) وردە وردە بە هەمان خێرایی بنی ئۆقیانوسی تازەی لایەکەی تر هەڵ لوشێت، سەرباری ئەوەش پلێتی لیتوسفیر(الصفائح) لایەکی هەیە لە کاتی درز بردنی دا لە ناوەڕاستی ئۆقیانوسدا گەشە دەکات کە بە لای کراوە(الجانب المنفرج divergent boundary) ناسراوە و لاکەی بەرامبەری کە بەلای هاوسێ(الجانب المتقارب bondarg convergent) ناسراوە، دوو لاکانی تریشی لە پلێتە هاوسێ کان تێ دەپەرن بە درێژایی تۆڕی ئەو درزانە گۆڕاوانە(الصدوع المتحولە) و کەبەلاکانی درزە گۆڕاوەکان(الجوانب الصدوع المتحولە) ناسراوە.

بە پێ ی هەموو ئەوانە پلێتەکانی(لیتوسفیر) بەردەوام لەسەر رووی زەوی دەگەڕێن و هەمیشە کیشوەرەکانیان هەڵگرتووە، ئەم کیشوەرانەش هەمیشە بەرەو لای یەکتری یان دوور لە یەکتری دەجولێنەوە، کاتێ پلێتەکانی(لیتوسفیر)ی ئوقیانوسی دەکەوێتە ژێر پلێتەکو،(کیشوەری) یان(ئۆقیانوسی) ترەوە ئەو لایەی نزیکە دەکەوێتە توانەوە و کرداری(نیشتنەنی بوون) دەست پێ دەکات، هەروەها فشاری ئەو تواوە لینجەی نێوان ئەو دوو پلێتە بەر یەك کەوتوانە، دیسانەوە **کرداری دوورکەوتنەوەی ئەو تواوانەی لە لاکەی ترەوە لە هەموویان پتر شل بوونەوە تا کەوانەی دورگەیی(arcsisiand)** پێك دێنن، پەیتا پەیتا گەشە دەکەن تا نیمچە کیشوەرەکان یان **کیشوەرەکان دوورست بکەن. یان بە تەنیشتی کیشوەرێکەوە بنوسێ، یان فشار بخاتە نێوان دوو کیشوەری بەیەك کەوتووەوە.**

**درزو تێك بردن ( الصدوع ) كیشوەرەكانی دروست كرد :**




كرداری لێك دوركەوتنەوەو لێك نزیك كەوتنەوەو لێك دەكۆهەڵاتنی لیتوسفیر لەسەر ژێرەوەی ئۆقیانوسەكان بە تەنیا روونادات، بەڵكو لەسەر لێواری كیشوەرەكان و نێوان ئەوان و ئاوەوە یان دا روودەدات، بۆ نمونە درزی(دەریای سور) لە ساڵێ دا(٣)سم فراوان دەبێ، درزی(كەنداوی كالیفۆرنیا) لە ساڵێ دا(٦)سم فراوان دەبێت، وە دەبێتە هۆی بەیەك كەوتنی(پلێتی هیندی) لەگەڵ پلێتی(یوروئاسیەوی)دا دوای داخورانی(التآكل) پلێتی(ئۆقیانوسی) كە لەنێوانیان دایە و زنجیرە چیای(هیمالایا) پێك دێ كە بەرزترین لوتكەیە لەسەر زەمیندا.

ئەو درزو نێوانانەی (الصدوع) توێكڵی تاوێری دەرەكی زەمینی دەبڕێ بۆ دەیان هەزار كیلۆمەتر و لە هەموو لایەكەوە و بۆ قوڵایی نێوان(٦٥-١٥٠)كم بەدەركەوترین نیشانەكانی گۆی زەمینی لە قەڵەم دەدرێن، ئەم درزانە دوای(جەنگی جیهانی دووەم) نەبێ نەدۆزرانەوە و راڤەكانیان لە ماوەی(تیوری پلیتەكانی تكتونی)یەوە كرا كە لە سەرەتاكانی حەفتاكانی سەدەی رابردوو دا دارێژرا. ئەم درزوكەلێنانە(الصدوع) تۆری ناوچەی درزاوی پێك دێنێ كە دەوری گۆی زەوی دەدەن بە درێژایی ئەو درزوكەلێنانە كرداری لێك دووركەوتنەوەو لێك نزیك بونەوە و لێك

دەکۆهەڵاتنی پلیتەکانی(لیتوسفێر) لەگەڵ یەکتری دا دێنە دی.

دیسانەوە ئەم درزانە کە لە ناوچەیەکی درزاونی وەکو تۆڕێ لە دەوری گۆی زەوی دا پێك دێنن، ئەم درزانە رێرەویان هەیە بۆ راڤە کردنی گەرمایی قەتیس کراو لە ژێر چینی(لیتوسفێر) دا بەبەردەوامی و هێمنی. ئەو ماددە تواوانە بەهۆی چڕی کەمیان لە چەند ناوچەیەکی گەرمی قوڵایی تەێکلی زەوی دادەردەپەرن، پاشان لە کاتی ساردبوونەوەیاندا نزم دەبنەوەو تەزووی هەڵگرتنی گەرمی(connection currents) پێك دێنێ و لەو تەزوانە پلێتەکانی(لیتوسفێر) دەخەنە جوڵەو جوڵەی لێك نزیك بونەوەو لێك دوورکەوتنەوەو لێك دەکۆهەڵاتن دوروست دەکەن، لەوێ دا کەلێن لە بەشی بەرزەرۆی تەزووی هەڵگری گەرمی دا پەیدا دەکات و لێك نزیك بونەوەی بەشی نزمایی روودەدات.

سەرەتا کرۆکی زەوی زۆر لە ئێستا گەرمتر بووە، چونکە رێژەیەکی پتری زرتوخمە تیشك دەرەکانی(النظائر المشعة)ی لەناودا بووە وەکو: (k٤٠ u٢٣٥) دیسانەوە تەزووەکانی هەڵگرتنی گەرمی خێراتر بوون و چالاکی بورکانی و بومەلەرزەیی و جوڵەی لیتوسفێر و ئەو جوڵانەی پێك هاتنی چیاکان و کیشوەرەکان دوروست دەکات، کە بە سوڕی ئۆقیانوس- کیشوەر( continent/ cycle/ ocan) یان نزم بوونەوەی توێکلی زەمینی و پێك هاتنی چیاکان( -buiding aycle mountain/ geosynclinal) ناسراوە، پاشان گازەکان(الغازات) لە بەرگە هەوا/ بەرگی ناوی زەمینی یەوە دزە دەکەن، سەرباری پێك هێنانی کیشوەرەکان لەسەر حەوزی ئۆقیانوسەوە لە رێگای زیادکردنی کەوانەکانی دورگەیی بورکانی یەوە بۆ نیمچە کیشوەرو کیشوەرەکان سەرباری پێك هێنانی شاخەکان.

کیشوەرەکان بەر لە(٥٠٠) ملیۆن ساڵ لە شوێنی تری جیا لە شوێنی ئێستایان بوون[1].

(١) قورئانی مەزن دەفەرمێ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾ النمل:٨٨. واتە چیاکان دەبینی وا دەزانی وەستاون کەچی وەکو پەڵە هەور دەڕۆن. لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ جوڵەی چیاکان دەکات لە کاتی جوڵەی زەوی تەوەرەیی دا، ئاماژە بە جوڵەی چیاکان دەکات بەبەردەوامی بە هۆی جوڵەی لیتوسفێر، کە تەواوی کیشوەرەکان بە چیاو دۆڵ و بیابانەوە دەخاتە جوڵەوە، لە جوڵەی لێك نزیك کەوتنەوەو دورکەوتنەوەو لێك دەکۆهەڵاتن.



تەزودکانی هەڵگرتنی گەرمی ئەو کیشوەرەتازەو نوێیانە دەخەنە بزوانەوە تا بەر لە(٢٠٠) سیۆن ساڵ بارستە بارستە بوون، تا ئەم تاکە

کیشوەرە بە ناوی(pangea) و ئەم تاکە ئۆقیانوسە زلە بەناوی (panthassa) پێك بێنێت[1]. (لیتوسفیر) بەرگێ دورست دەکات ناهێڵێ گەرمی دزە بکاتە ناو گۆی زەمینەوە، بۆتە هۆی قەتیس کردنی گەرمایی لە پێك هێنانی تۆڕەکی درزی بێ شومار لە ناوەراستی کیشوەری .یکدا، کە بەدرێژایی رۆژگار گەورە بووە تا باکوری ئەمریکاو ئەفریقیای لێك دابریوە، بەر ـە ١٨٠) ملیۆن ساڵدا، ئەنجا نێوانی ئەوو ئەوروپا بەر لە(١٥٠)ساڵ دێتەدی، ئەنجا بەر ـە ١١٠) ملیۆن ساڵ باشوری ئەمریکا لە ئەفریقیا دا دەبرێت، وە(جرینلاند) لە(نەرویج) بەر ـە ٦٥) ملیۆن ساڵ لەیەك جیادەبنەوە. (نسلەندا) لە وێ وە دەست بە دورست بوونی دەکات.

وە لە سەرەتای کردای جیابونەوەی ئەمەدا ڕێرەوە ئاویەکان دەست بە دروست بوونی

---

١) قورئان ئاماژە بەم ئۆقیانوسە زلە دەکات کاتێ دەفەرمێ﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾ الطور:٦. واتە: سوێند بە دەریای داگیرساو. دەفەرمێ﴿وَفِي الأَرْضِ قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ وَجَنَّاتٌ مِّنْ أَعْنَابٍ﴾ الرعد:٤. لێرەدا قورئان دوورتر دەر دەروانێ لە دوو پارچە زەوی هاوسێ ی یەکتری بن، بەڵکو﴿قِطَعٌ مُّتَجَاوِرَاتٌ﴾ ئاماژەیە بۆ پارچە کیشوەرەکان کە هاوسێ ی یەکترین یەك جۆر رووەکیان لێیانە، ئەمەش مانای چییە؟! پرۆفیسۆری رووەك ناس(رونالد گور ronad good) ی رووەك ناس دەڵێ(رووەك زانەکان لەسەر ڕاستی ئەم تیورە یەك ڕان کە ناتوانرێ دیاردەی بوونی یەك جۆرە رووەك لە هەموو کەرت و کیشوەرەکانی زەوی دا مانابکرێ گەر بڕوامان وانەبێ سەرەتا یەك پارچە بوون).

پرۆفیسۆر(بلاکیتblaket) سروشت ناس لە کۆلێژی شانشینی لەندەن دەڵێ: تاوتوێ کردنی تاوێرەکانی هیند ئەوە دەردەخات ئەم تاوێرانە لە باشوری هێڵی یەکسان هەبوون بەر لە(٧٠) ملیۆن ساڵدا، بەم شێوەیە تاوتوێ کردنی چیاکانی باشووری ئەفریقیا ئەوە دەردەخات، کیشوەری ئەفریقیا لە جەمسەری باشور جیابۆتەوە بەر لە(٣٠٠) ملیۆن ساڵدا. (الاسلام یتحدی/ وحید الدین خان/ ل:١٤٩). وەکو (کولن ولسن) لە(الانسان وقواه الخفیه/ ل:١٠٤) دا ئاماژە دەکات(هوریاجر) بڕوای وایە لافاو کیشوەری ئەتلانتسی وێران کردووە، ئەفلاتون باس دەکات ئەم کیشوەرە لە لیبیا و ئاسیا زلتر بووە گەر لافاو وێرانی نەکردبایە هێرشی دەکردە سەر میسر و ئەثینا کە دوو شارستانی بوون لەم چاخەدا). وە هەندێ زانا باس لە کیشوەری(مو) دەکەن کە بەهۆی بومەلەرزە بەر لە(٦٠) ملیۆن ساڵ ژێر ئۆقیانوسی هیندی کەوتووە. (قصص الانبیاء/ د: عبدالوهاب النجار/ ل:٢٦). وە قورئان باس لە لافاوی نوح دەکات کە وشکانی یەکی زۆری زەوی داپۆشیوە و مرۆڤی ئەوێ ی قڕ تێ خستووە﴿رَّبِّ لَا تَذَرْ عَلَى الْأَرْضِ مِنَ الْكَافِرِينَ دَيَّارًا﴾ وەکو لە سورەتی(نوح) دا باسکراوە.





دەکەن لە شێوەی کەنداوی گەورەدا کە زانایان بە(tethys) ناوی دەبەن، وردە وردە خزاوە بەسەر کیشوەری(pangea)دا بە دوو کیشوەرەکانی دەگەیەنی یەکەمیان باکورییە بە ناوی(laurasia) و دووەمیان باشورییە بە ناوی(gondwana)، دوای تەواو بوونی جیابوونەوە کیشوەری ئێستامان دروست بوو کە دەیناسین و بەردەوام لە دابڕاندایە، دابڕانی سەرەتایی بە درزی ناوەڕاستی ئەتلەنتی(atlantic ridge mid) ناسراوە، هەمیشە ناوچەکی چالاك پێك دێنێ تا(بازلت) دابڕێژێ، نمونەی ئەوانە زۆرە لە ناوچە درزاویەکان(الصدوع)، بەدرێژایی ئەوانە کرداری بلاوبونەوەو گەشەی بنی ئۆقیانوسەکان دوروست دەبێت.

هەر لە سەرەتای دورست بوونی دۆڵە درز بردوەکاندا لە ناوەراستی ئۆقیانوسەکان و کەرەستەکانی بازلتی دا هەمیشە لەبەرزبوونەوەدان لە هەردوولای درزەکانەوە(التصدعات)، دیسان هەمیشە تویکلی ئۆقیانوسی هەمیشەیی هەیە لە هەردوولای دۆڵە قوڵەکەوە وردە وردە تارادەیێ دووری دەخاتەوە، کۆنترین تویکلی ئۆقیانوسی کە تائیمرۆ مابێ لە رۆژگاری ناوەراستدا(mesozic era)یە واتە: بەر لە نزیکەی(٢٠٠) ملیۆن ساڵدایە، وردە وردە داخوراوە لە نزیك رۆخەکانی نزیك بە پلێتەکانی(لیتوسفیر)ەوە بە هەمان رێژەی پێك هاتنی تویکلی ئۆقیانوسی نویێ لە تەك درزی نیوەی ئۆقیانوسی دا.

لەسەر کیشوەرەکان زۆر چیای بورکانی هەیە، وەکو بورکانی چیای ئەرارات(٥١٠٠)م لە ئاستی رووی دەریاوەو چیای(ئەتنا) (٣٣٠٠)م لەسەر رووی ئاستی دەریاوە، چیای(فسوفیس) (١٣٠٠) م و(کیلیمانجرۆ)(٥٩٠٠)م و(کینیا)(٥١٠٠)م، ئەم چیایانە وابەستەن بە تۆری درزێکی قوڵەوە لە ناو زارکەکانیاندا کە ئەبیتوری(لیتوسفیر) دەبڕن تا دەگەنە(ئەنتوسفیر) کە بووە هۆی پارچە کردنی ئەو کیشوەرانەی ئیمرۆ بۆ بارستایی زەمینی تا رادەیێ بچوکتر.

وە ئەگەر ئەو درزانە(التصدع) نەبوایە ژیان ئەگەر نەدەبوو: چونکە ئەو درزانە بەردەوام هۆکارێکن بۆ دزە کردنی گازەکان لەبەرگە هەوای زەمینەوەو بەرگی ناوی گۆی زەمینەوە. دیسان هۆکارێکن بۆ پێك هێنان و تێك شکاندنی چیاکان و بەپیت و فەرکردنی تویکلەکە بە کانزای نویێ بە شێوەیەکی رێك، هۆکارێکن بۆ جولاندنی پلێتەکانی(لیتۆسفیر)، ئەنجا فریدانی ماتە




وزە(الطاقة الكامنـة) لـە نـاو گـۆی زەوی دا بەشـێنەیی، چ شـتێ وەكـو ئەمـە ڕاسـتی یـەكی حاشاهەڵنەگرە، كە ئارادەیێ زیندەگی یە لـە پێنـاو گـۆی زەوی داو مانـەوەمان لەسـەری، بـەم شێوەیە شایستەی ئەوەیە لە قورئانی پـیرۆزدا بـاس بكـرێ وەكـو نیـشانەو بەڵگەیـەكی كرگـار بخرێتەروو.

زانایانی تـەنیا دوای جـەنگی جیهـانی دووەم ئاوڕیـان لەمەدایـەوە، واتـە لـە سـەرەتای حەفتاكاندا، كەچی قورئان زانیاری یەكی ئاوای بەر لە(١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر باس كردووە وەكـو نیشانەیەك كە گەواهی بـدات بـە ڕاسـتگۆیی ئـەم كتێبـە خـوایی یـە و ڕاسـتگۆیی پێـشەوا و سـەروەرمان موحەمەد(ﷺ)[1].

بەڵام وەكو باسمان كرد لە پەراوێزەكانی ئەم باسەدا وشەی(انشقاق) واتە: (كون بوون) وەكـو كون بوونی خاكی زەوی تا دارو درەخت و رووەكی لێ بێتـەدەرو لەوشـەی(الـصدوع) جیایـە كـە بەمانای درزبردن و شكانی تەنە ڕەقەكان دێت وەكو(الراغب) ئاماژەی پێ كردووە.

﴿وَإِذَا الْأَرْضُ مُدَّتْ﴾ الانسقاق:٣. یەكێ ئاماژەكانی(مـدت) بـە مانـای كـشان دێـت لـە ئاوێرەكاندا وەكو باسكرا.هەموو ئەوانە موعجیزەیەكی گەورەن بۆ قورئان كە لەسەردەمی نەزانی دا هەزاروچوارسەد ساڵ بەر لە هاتنی زانـستی ئـەزمونی جیۆلـۆجی دا باسـی كـردوون! ﴿فَبِأَيِّ حَدِيثٍ بَعْدَهُ يُؤْمِنُونَ﴾ المرسلات:٥٠. ؟

سەرباری ئەمەش وەكو(عبدالرحمن سعد صبی الدین) ئاماژەی پێ كردووە، هەروەها(هارون یحی) و(د نزغلوا النجار) ئەم ئایەتەش﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾[2].

ئاماژەی بە جوڵەی چیاكان دەكات كە بۆ جوڵـەی ئـەو زەوییـە دەگەڕێتـەوە لەسـەریەتی،

---

(١) الاعجاز العلمی فی القران الكريم/ د: زغلول. (الارض فی اللقران الكريم/ د: زغلـول/ ١٧٤. (الموسـوعة الكونيـة الكبری/ ج٦/ ل:٢٥٩. (كوكب الارض/ د: حسن سيد احمد ابو العيـنين/ بابـەت: (الـصدع = الانكـسارات). دیـارە هەندێ زانا لە جیاتی وشەی(الصدوع) دا(الانكسارات) بەكار دێـنن، هەیان(الفوالق)، بەڵام(د: حسن سـید احمـد ابـو العينين) وشەی(الصدوع) بەكاردێنێ واتە: درزبردنی(faults) كە هـەمان وشـەیە قورئـانی بـەكارهێناوە.(ل:٣٢١) سەیر بكە.

(٢) النمل: ٨٨.




کاتێ توێکڵی زەوی(لیتوسفیر) دەکەوێتە سەر چینی(ئەنتوسفیر) کە بە ئازادی دەجوڵێن، ئەو چیایانەشی لەگەڵدا دەجولێت[1]. وەکو باسکرا.

**٣٢- ( ئاماژەکانی قورئانی بۆ دیاری کردنی تەمەنی زەوی و راڤەی جیۆلۆجی بۆ ئەمە :**

قورئانی پیرۆز ئاماژەی کردووە لە زۆر ئایەتدا خوای گەورە گەردونی لەشەش رۆژدا دوروست کردووە، وەکو فەرمویەتی﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَمَا مَسَّنَا مِن لُّغُوبٍ﴾[2].

لێرەدا قورئان دەری دەخات خوا تەنە ئاسمانەکان زەوی و هەرچی لە نێوانیاندایە لە تەنۆلکە و گازەکان لەشەش رۆژدا دوروستی کردووە، یان لە(٦) قۆناغدا. لە(لسان العرب)دا(اليوم) بە رۆژ هاتووە، هەروەها بە کاتی رەها(الوقت مطلقا) وەکو لە فەرمودە داهاتووە: (تلك ايام الهرج). واتە: ئەمە کاتی هەراو ئاژاوەیە. بابزانین لە رووی گەردووونناسی یەوە چۆن حیسابی بۆ دەکرێت؟ گەردوونناسی تەمەنی گەردوون بە(١٥-٢٠) ملیار ساڵ دەقرسێنێت.

قورئان ئاماژە دەکات﴿قُلْ أَئِنَّكُمْ لَتَكْفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ وَتَجْعَلُونَ لَهُ أَندَادًا ذَلِكَ رَبُّ الْعَالَمِينَ﴾[3].

واتە: بڵێ: ئایا ئێوە بڕوا بەو خوایە ناکەن زەوی لە دوو رۆژدا دوروست کردووەو هاوەڵی بۆ دادەنێن، ئەو پەروەردگاری جیهانیانە. بەپێ ی ئەم ئایەتە خوا ئەم(٦) رۆژەی بەش کردووە، وەکو موفەسیران کردویانە بەسێ بەش، کە هەر بەشە دوو رۆژە لە رۆژانی دوروست بوون بە چەمکی نسیبی زەمەن:

(١)دوروست کردنی زەوی بە دوو رۆژ لە ئاسمانی دوکەڵی یەوە(سەدیمی گازی)﴿ قُلْ أَئِنَّكُمْ

---

(١) بروانة(ايات الاعجاز العلمى/ عبداارحمن سعد صبى الدين/ ل:٤٨.

(٢) ق:٣٨.

(٣) فصلت:٩.





ـتكفُرُونَ بِالَّذِي خَلَقَ الْأَرْضَ فِي يَوْمَيْنِ﴾ مانا كراوە.

﴿أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا﴾ [1]. واتـە: ئایـا بـێ ـڕوایان نابینن کە ئاسمانەکان زەوی یەك پارچە بوون جیامان کردوونەوە؟!

(٢) دوو ڕۆژ بۆ هەموار کردنی حەوت ئاسمانەکان﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ فَقَالَ ـهَ وَلِلْأَرْضِ ائْتِيَا طَوْعًا أَوْ كَرْهًا قَالَتَا أَتَيْنَا طَائِعِينَ﴾[2]. واتە: پاشان کاتێ خوا ویـستی ئاسمـان ـدروست بکات دوکەڵێ بوو ئەنجا بە ئەرد و ئاسمانی فەرموو: وەرن بە خۆشی بێ یان بـە ناچـاری، ـوتیان: بە گوێڕایەڵیەوە هاتین. ﴿فَسَوَّاهُنَّ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ﴾ [3]. کردنـی بـە حـەوت ئاسمـان. ئەمـە ـئاماژەیە بۆ دۆخی گازی و پلازما و سەدیمی ئاسمان دوای(تەقینەوە گەورەکەی گەردونی) لـە دوو ـڕۆژدا کە(٧) ئاسمانی تێ دا پێك هات.

(٣) دوو ڕۆژ زەوی تێـدا هـەموار دەکـرێ و ڕام دەکـرێ لـە ڕووی جیۆلـۆجی یـەوە بـۆ مرۆڤ﴿وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ مِن فَوْقِهَا وَبَارَكَ فِيهَا وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء ـلِّلسَّائِلِينَ﴾[4]. واتە: چیای تێدا دانا لەسەر زەوی و فـەڕی خـستە نـاو قـووت و قوەتەکـەی تێـدا بڕیاردا لە چوار ڕۆژدا وەکو یەکە بۆ داواکاران.

ئەمە ئاماژەیە بۆ چیای نیازکی کە سەرەتا باریونە سـەر تـوێکڵی زەوی و لـە کـاتی ڕەق بونیاندا گورج دامەزراون بە بەڵگەی(مِن فَوْقِهَا) واتـە: لەسـەر زەوی. وە﴿وَقَدَّرَ فِيهَا أَقْوَاتَهَا﴾ واتە: ڕۆزی و ئازووقەی دانیشتوانی تێدا بڕیاردا. ﴿فِي أَرْبَعَةِ أَيَّامٍ سَوَاء لِّلسَّائِلِينَ﴾ واتە: لە چـوار ڕۆژی ڕەبەقدا بێ زیاد و کەمی وەکو یەکە بۆ داواکارانی مرۆڤ، یان پرسیار کەران، کە پرسیار لە ڕاست ماوەی دورست بوونی دەکەن، هەموو موفەسسیران کـۆکن کـە ئـەو چـوار ڕۆژە دوو ڕۆژی دورست بوون و دوو ڕۆژی پێك هاتنی جیۆلۆجیەکەی دەگەیێنێت.

---

(١) الانبياء: ٣٠.

(٢) فصلت: ١١.

(٣) البقرة: ٢٩.

(٤) فصلت: ١٠.





بەو پێ یە: (١) ڕۆژەكان یەكسانن گەرنا بۆ سێ قۆناغی یەكسان دابەش نەدەبرو.

(٢): ڕێك خستنی جیۆلۆجی زەوی تا گەیشتنی پرسیارکەرانی مرۆڤ دوو ڕۆژ لەو(٦) ڕۆژانەی خایاند، واتە: (٣/١)ی تەمەنی گەردون.

(٣): ڕێك خستن و ئامادەكرانی جیۆلۆجی زەمینی هەر لە ڕەق بوونی توێكڵی زەمینەوە تا دەركەوتنی مرۆڤ(٤,٥) ملیار ساڵی پێ چووە، بەپێ ی توێژینەوەی تەمەنی مرۆڤ، ئەم ژمارەیە لە دۆزراوەی ئاژانسی ئاسمانی(ناسا)ی ئەمریكی نزیكە كە كۆمەكی ئاسانی بەكار هێناوەو دەزگای زۆر هەستیاری تێدایە بۆ تاووتوێ كردنی گەردوون تەمەنەكەی بە(١٣,٧) ملیار ساڵ قرساندووە. [١].

(الك سمث) دەنوسێ: ( ڕاسترین تیور لە ڕاست بنەمای دورست بوونی كۆمەڵەی خۆر ئەوەیە، كە بەر لە(٦) ملیار ساڵ دورست بووە لە سەدیمی گازی سەرەتایی بزۆك كە لە وردیلەی ڕەق و گازاوی سست و پلازما پێك هاتبو)[٢].

بەبڕوای من دوور نییە(٦) ملیار ساڵ هەمان(٦) ڕۆژی زەمینی بێت. یەك ملیار(١٠٠٠) ملیۆنە. (خوا زاناترە).

ئەو هاوڕێكی یەی ئیمرۆی زانستی ئەزمونی لەگەڵ ڕابردووی دووری سەیری قورئاندا ئەوەمان نیشان دەدات ئەم وتانە فەرمایشتی كەسێكە ڕابردوو و ئێستاو داهاتووی لەبەر چاو لەسەر یەك ڕاستە هێڵە كە خوای كرگارە!

---

(١) ايات الاعجاز العلمي/ عبدالرحمن سعد صبي الدين/ ل:٦٤-٦٥.

(٢) علم الارض/ ل:١٣.





## بەندی سێ یەم:

# بەرگە هەوای زەوی

٣٤-٣٥-٣٦: حەوت چینەکانی بەرگە هەوای زەوی/ چینی ئۆزۆن/ پشتێنەیی ڤالن ئەلن:

٣٧- ئەو گازانەی بەرگە هەوا پێك دێنن لە: ئۆکسجین و نایترۆجین و گازە دەگمەنەکان:

٣٨-٣٩: سوڕی ئۆکسجین لە سروشتدا و گرنگی یەکەی.

٤٠-٤١: سۆڕی کاربۆن لە سروشتداو گرنگی یەکەی.

٤٢-٤٣: سوڕی نایترۆجین لە سروشتداو گرنگی یەکەی.






## ٣٤-٣٥-٣٦/ حەوت بەرگە هەوایەکانی دەوری زەوی:

﴿ اللَّهُ الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾ [1].

واتە: خودایە کە حەوت ئاسمانی دوورست کردووە، وە لە زەویش وەکو ئەوان.

**( ڕاڤەی زانستی )**

بێگومان خوای گەورە، حەوت بەرگە هەوای لە دەوری زەوی دوورست کردووە، ئەنجا حەوت بەرگی(ئەتیر) دەوری داوە، ئاسمانەکان حەوت ئاسمانن لە ناو کورسی داو، کورسی لە عەرشدایە، دۆزەخ حەوت چینە، بەهەشت هەشت چینە، وە چینە تاوێرەکانی زەوی حەوت چینە، کیشوەرەکان لەسەر زەوی حەوتە، تیشکە بینراوەکانی کە حەوت ڕەنگەکانن حەوت دانەن. پادشای میسر(٧) گوڵە گەنمی قەڵەو لە خەو دەبینیێ(٧) گوڵە گەنمی وشك لە گەڵی دا، ئەنجا حەوت مانگی قەڵەو دەبینیێ حەوتی کز قوت دەدەن لە خەونی دا، وە قورئان ئاماژە بە(٧) دەریا دەکات﴿سَبْعَةُ أَبْحُرٍ﴾ ... هتد.

دیارە بەرگە هەوای زەوی(حەوت چینە) کە چین لەسەر چینە کە ئەمانە، ئاسمان و سەقفێکن بۆ زەوی وەکو لە(گەردووناسی) دا باسکرا:

(١)چینی(ترۆبۆسفیر) لە بەرزایی(١٠-١٢)کم دایە، لەم چینە دا گەرمایی یەدا گەرمایی لەگەڵ بەرز بوونەوە وردە وردە نزم دەبێتەوە.

(٢)(٣): دوو توێیە بە هەردووکیان دەوترێ(ستراتوسفیر)، چینی ژێرەکە(٢٠)کم بەرزە بە پلەی گەرمی یەکەی جیا دەکرێتەوە کە ئەگۆڕە بەڵام لە چینی دووەمدا بۆ(٤٥-٥٠)کم بەرز دەبێتەوە لەگەڵ بەرزبوونەوە پلەی گەرمی زیاد دەکات.

(٤) چینی چوارەم(میزوسفیر)ە، وردە وردە پلەی گەرمی لە نزمی دەدات، تا دەگاتە پلەی(٨٠-٨٥)کم، لێرەدا پلە بوونی گەرمی تا دەگاتە چینی پێنجەم ڕەنگدەداتەوە.

---

(١) الطلاق:١٢.




(٥) چینی پێنجەمی هەوا(ترپۆسفیر)ە، کەمێ سەروی ئەو چینێ دێ بەوە جیا دەکرێتەوە هەموو ئەو شتانەی لە ناوی دایە ئایۆنی دەکاتەوە، چونکە تیشکی سەر بنەوشەیی خۆرکاری زۆری تێ دەکات و هیچ بەربەستەکی لە پێش نییە، بەم چینەش دەوترێت:

(٦) ئایۆنی سفیر، چینی شەشەمە، کارلێکردنی ئۆزۆنی تێدایە، دوای(٥٠٠)کم گازەکان ئەکەمی دەدەن تا دەگەنە بۆشایی رەها، ئەم چینەش ناسراوە بە

(٧) ئیکسۆسفیر[١]. ئەمانە بەشێکن لە مانای ئاسمانی چین لەسەر چین وراستگۆیی قورئانی تێدا دێتەدی.

## (چینی ئۆزۆن و پشتێنەی ڤان ئەلن):

قورئان ئەم چینە ئاسمانی یە بەسەقفی پارێزاو ناو زەد دەکات کاتێ دەفەرمێ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاء سَقْفًا مَّحْفُوظًا وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾[٢]. واتە: ئاسمانمان کردووە بە سەقفەکی پارێزراو ئەوان لە بەلگەو نیشانەکانی ئێمە روو وەردەگێرن. وە بە سەقفەکی گێرەوە ناوی دەبات﴿وَالسَّمَاء ذَاتِ الرَّجْعِ﴾[٣]. واتە: سوێند بە ئاسمانی گێرەوە وە بەڵێ بەرگە هەوای زەوی تیشکەکانی خۆرو گەردونیەکان جوان دەپالێوێ ئەنجا رەوانەی زەوییان دەکات نا زیان بە گیانداران نەگەێینن، لەوانەش تیشکی(سەربنەوشەیی) کە بەشێکی کەم رێگا پێ دەدات بە زەوی بگات بۆ کرداری رۆشنە پێك هاتن و پێویستی تر.

دیسان ئەم چینە ئۆزۆنە زەوی چەپاڵە دەدات لە بەستەڵەکی و ساردی ئاسمانی کە دەگاتە(٢٧٠)° س لە ژێر سفردا. دیسان رێگا نادات شوهبەکان کە رۆژانە بە ملیۆنەها زەوی سەنگ باران دەکەن بەر زەوی بکەون وەکو لە گەردونناسی دا باسکرا.

ئەنجا﴿سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾ ئاماژەیە بۆ پشتێنەی(ڤان ئەلن) کە جیۆلۆجیەکان دەڵێن: کرۆکی

---

(١) الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفى المتولي/ ل:٢٠.

(٢) الانبياء:١٢.

(٣) الطارق:١١.




زەوی زۆر گەرمەو بە زۆری ئاسنە، کایەی موگناتیسی زەوی ئەو پەیدای دەکات و زەوی لە ڕەشەبای گڕی خۆر دەپارێزێت، گەرنا ئەو تەقینەوە هایدرۆجینی گەورانەی لە خۆردا ڕوو دەدەن بە بەردەوامی گڕی بەردەدایە زەوی.

(د: هوگ ڕوس) ڕۆڵی پشتێنەی(ڤان ئەلن) ئاوابأس دەکات: (زەوی چڕی یەکی هەیە لە هەسارەکانی تری خۆردا بەم زۆرییە نییە، ناو دڵی زەوی کە ئاسن و نیکلێ پێکی هێناوە بەرپرسیارە لە کایەی موگناتیسی وە زەمینی و دەبێتە زرێیەکی پارێزەر لە تەقینەوە تیشکی یەکان، گەر ئەم زرێیە نەبوایە ژیان لەسەر زەوی ئەگەر نەدەبوو. هەسارەکانی تر ئەو بەرگەیان نییە، مەریخ(مەردۆخ) کە تاوێری سەد ئەوەندەی زەوی کایەی موگناتیسی کەمە. زوهرە کە وەکو زەوییە نییەتی، ئەم پشتێنەیە تایبەتە بەزەمینەوە.

بەم شێوەیە قورئان(١٤٠٠) ساڵ بەمەوبەر ئاماژە بەبەرگە هەوای زەوی دەکات پارێزەرمانە لە تیشکەکانی، کە لە دەرەوەی زەوی دا هەنە وەکو دەفەرمێ:﴿ يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ﴾[1].

واتە: ڕەوانەتان دەکاتە سەر پریشکی ئاگرو مس.

بەڵێ(خۆر بەردەوام ڕەشەباو گەردەلولی ئاگری هەڵدەکات کە ماوەکەی دەگاتە زۆربەی هەسارەکان و تەنەکانی کۆمەڵی خۆر وەکو کلکدارەکان و هەسارۆکەکان مانگەکان و هی تر. ڕەشەبای خۆر دەبێ بەدوو بەشەوە:

(١) ڕەشەبای خۆری بە خێرایی تیشکی دەڕوات وەکو ڕووناکی بینراو سەربنەوشەیی و سینی و ژێر سورو ڕادیۆیی.

(٢) بای خۆری لەسەر شێوەی تەنۆلکەی بارگەکراوی کارەبایی و ئەلیکترونی و پرۆتۆنی و بەخێرایی کەمتر لە خێرایی ڕووناکی دەڕوات و چەند ڕۆژو هەفتەیەکی پێ دەچێ تا دەگاتە زەمین. زانایان دۆزیویانەوە ڕەشەبای خۆری بە شێوەیەکی گشتی کار لە زەوی دەکات لە کاتی وروژانی خۆردا بە شێوەیەکی تایبەتی کار دەکاتە سەر:

---

(١) الرحمن:٣٥.





(١)بە گشتی کار دەکاتە سەر کەشی زەوی.

(٢) تەشویش دەخاتە سەر پەیوەندیەکان.

(٣) ڕێژەی شەفەقی جەمسەری پتر دەکات.

(٤) گەردەلول زۆرتر دەکات لە زەمیندا.

(٥) باران لە غەیری کەژی خۆی دا دەبارێنیت.

(٦) کار دەکاتە سەر کەشتییە وانە ئاسمانیەکان و کەشتی یە ئاسمانییەکان.

(٧) کار دەکاتە سەر وشکی لە هەندێ ناوچەدا.

(٨) کار دەکاتە سەر چینی ئۆزۆن.

ئەم بایە هۆکارێکە بۆ زیاد کردنی کونی چینی ئۆزۆن، ئەم پەردەیە زیندەوران لەسەر زەوی : لە تیشکی سەربنەوشەیی مەترسیدار چەپاڵە دەدات، کە ڕێژەی شێرپەنجەی پێست پتر دەکات. بەپێی کون بوونی چینی ئۆزۆن لەسەدەی بیستەمدا ڕێژەی توش هاتن بە شێپەنجەی پێست لە ئەمریکا پتر بووە، بۆیە کون بوونی ئۆزۆن بووە بە مەسەلەیەکی گرنگی لەم چاخەدا بە کێشەیەکی گرنگ دادەنرێت[1].

وە قورئان ئاماژە بە کون بوونی چینی ئۆزۆن دەکات﴿السقف المحفوظ﴾ کە نیشانەیەکی هاتنی ئاخر زەمانە﴿إِذَا السَّمَاءُ انشَقَّتْ﴾[2].

واتە: کاتێ ئاسمان کەرتبوو بۆ، (یان کون بوو). بەڵێ چینی ئۆزۆن لە هەوادا تیشکی خۆر دەپاڵێون ناهێڵێ بەشی پێویست نەبێ بگاتە زەوی. ئۆزۆن هەر ئۆکسجینە وەکو داهاتوو باسی دەکەین و لە کاتی دورست بوونی پریشکی کارەبایی دا لە کاتی تریشقەدا هەندێ لە گەردەکانی ئۆکسجین بۆ جۆرە ئۆکسجینەکی تر دەگۆڕێ کە چالاکترە و بە ئۆزۆن ناسراوە و لەسێ گەردیلەی ئۆکسجین پێك دێت و دوای ڕووانی بروسکە بۆنەکی تیشکی لێوە دێت[3].

---

(١) بڕوانە: الموسوعة الفلكية/ عماد المجاهد/ ل:١٢٨.

(٢) الانشقاق:١.

(٣) كنوز العلم/ ٢٦٢.




ئەم چینە و پشتێنەی ڤان ئەلن لە قورئاندا بە(السقف المحفوظ) ناسراوە کە بانێکن بۆ زەوی دەیپارێزن. ئەم چینە لە تەقینەوەکانی خۆردەمان پارێزێت. بەڵێ حیساب کراوە یەك تەقینەوەی سەر خۆر(١٠٠) بلیۆن تەوەندەی ئەو تەقینەوەیە دەبێ (هیروشیما)ی پێکا، کەدوای(٨٥) سەعات بینرا دەرزیلەی قیبلەنوما بەناناسایی دەجولێتەوەو پلەی گەرمی هەوا بۆ بەرزایی(٢٥٠)کم دەگەیشتە(١٥٠)° س[1].﴿وَالسَّمَاءِ ذَاتِ الرَّجْعِ﴾!

ئاسمان یان بەرگە هەواگێڕەوەیە، چونکە هەڵمی ئاو بە باران و تەنەکان بە هۆی هێزی کێشکردن و شەپۆلی بێ تەل بە هۆی چینی ئایۆن سفیر و تیشکی ژێر سور شەوانە بۆ گەرمی زەوی دەگێڕێتەوە. وەکو لە گەردونناسی بە درێژی باسکراو بۆ ئەو بگەرێوە. دیسان تیشکی کوشندەی وەکو سەربنەوشەیی و شوهبەکان بۆ دەرەوەی زەوی دەگێرێتەوەو بوار نادات بێنە ناو زەوییەوە.

## ٣٧- ئەو گازانەی بەرگە هەوا پێك دێنن لە ئۆکسجین و هایدرۆجین و نایترۆجین و گازە دەگمەنەکان:

﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾. بەڵێ خوا هەموو شتەکی بەئەندازە دورست کردووە: بەرگە هەوای زەوی لە(٧٨٪) گازی هایدرۆجینە و لە(٢١,٩٥٪)ی ئۆکسجین پێکی دێنێ، ئەوەی دەمێنێتەوە هەڵمی ئاوو دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆزۆن و تۆزو خۆڵ و هایدرۆجین و ئەرگۆن و هیلیۆم و هەندێ پێك هاتەی کبریتە، کە هەموو ئەوانە بۆ پێك هاتەی کیمیای و سیفاتی فیزیایی ژیان پێویستن[2].

## ٣٨-٣٩: ئۆکسجین و گرنگی یەکەی و سوڕەکەی لە سروشتدا:

ئۆکسجین گازێکی گرنگە بۆ ژیان، لە زیندەوەران و رووەکدا بۆ کرداری هەناسە و وزە پەیدا کردن، چونکە خواردنی ناوخانەی زیندەوەران دەئۆکسێنێت. زیندەوەرانیش بۆ بەرهەم هێنان

(١) علم الارض/ الك سمث/ ل:١٥/ ايات الاعجاز العلمى/ عبدالرحمن سعد صبى الدين/ل:٧٣.
(٢) الموسوعة الذهبية/ ل:٢١.





ـوێ: لەو کردارە میکانیکی یە وەردەگرن، وەکو جوڵەو هەرسی خواردن و گەشە و پێ گەیشتن.

ئۆکسجین یارمەتی سوتان دەدات و، لە پێك هێنانی زۆر جۆری خواردنەکان بەشدارە، وەکو ـ و شیرو هێلکەو میوەو ئاو، دیسان لە مەیدانی پیشەسازی دا بەکەڵکە. ئۆکسجین گازێکە بێ ـە و ڕەنگ و بۆنە و کەسێ لە هەوا سوکترەو کەم لە ئاودا دەتوێتەوە.




گەر تەماشای قورئان بکەین بەر لە(جوزیف بریتلـی/ ١٧٧٤) و(لافوازییـە) ئامـاژەی بـە بونی ئۆکسجین و ڕۆڵی کردووە لە ژیاندا، بۆ نمونە:

(١)﴿ وَمَن يُرِدْ أَن يُضِلَّهُ يَجْعَلْ صَدْرَهُ ضَيِّقًا حَرَجًا كَأَنَّمَا يَصَّعَّدُ فِي السَّمَاءِ ﴾[1].

واتە: خودا کێ ی بوێ سـنگی تـەنگ و قـورس دەکـات وەکـو کەسـێ بـە نـاو ئاسمانـدا سەربکەوێت. (دیارە پاسکاڵ یەکەم کەس بوو لە خۆرئاوا گرنگی بە توێژینەوەی خاسیەتی هەوای سەرو ئاسمان بدات و بینی لەگـەڵ بەرزبونـەوە پەسـتانی هـەوا کـەم دەبێتـەوە و پەسـتان پێـوی توریـشلی بـەکار هێنـا، دوای داهێنـانی بـاڵۆنی هایـدرۆجین، کـاتێ(گلیـشر) بـۆ(١١کـم) لـە

(١) الانعام:١٢٥.




ساڵی(١٨٦٥)دا بەرز بۆوە بۆ(١٣) خولەك لە هۆشی خۆی چوو بەهۆی کەم بوونەوەی ئۆکسجین و نزمی پەستانی هەوا) [١].

(٢) وە ئاماژە دەکات ئۆکسجین بە تواوەیی لە ئاودا هەیە، یارمەتی زیندەورانی دەدات بژین﴿حَتَّى إِذَا أَدْرَكَهُ الْغَرَقُ﴾[٢].

واتە: کاتێك خەریك بوو فیرعەون لە ئاودا بخنکێت. یان﴿وَإِذَا الْبِحَارُ فُجِّرَتْ﴾[٣]. واتە: کاتێ دەریاکان تەقینەوە. ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾[٤]. واتە: کاتێ دەریاکان داگیرسان. دیارە ئاو بریتی یە لە(h٢o) ئۆکسجین یارمەتی سوتان دەدات و هایدرۆجین دەسوتێت. وەبە(٨٩٪)ی ئاو(٣/٢)ی کێشی مرۆڤ پێك دێنێت و،(٥٠٪)ی کێشی بەردەکانزاکان پێك دێنێت.

(٣) قورئان ئاماژە بە کرداری ڕۆشنە پێك هاتن و هەناسەی ڕووەك دەکات کاتێ فەرمویەتی﴿وَالصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ﴾[٥]. واتە: سوێند بە بەرەبەیان کاتێ هەناسە دەدات.(هەناسەدانی بەیانی بەڵگەیەکی روونە لەسەر کرداری رۆشنەپێك هاتن، لێرەدا قورئان بەریان بەکەسێ دەچووێنێ کە لەگەڵ بەرەبەیاندا هەناسە دەدات، ئەمەش ئاماژەیە بە پێویستی بوونی ئۆکسجین لە کاتی بەرەبەیاندا، کرداری ڕۆشنە پێك هاتن لەگەڵ گزنگدا دەست پێ دەکات، کرداری ڕۆشنە پێك هاتن وەکو گرنگی ئۆکسجین بۆ مرۆڤ بە سوود دادەنێت و زەوی ناتوانێ پێویستی پێ نەبێت بۆ ژیان) [٦].

(٣٠٪) ئۆکسجینی ناو هەوا ڕووەکەکانی سەری پێکی دێنن، ئەم کردارەش بەچاوی ئاسایی تێبینی ناکرێ چونکە ئەم میکانزمە ئەلیکترۆنەکان و گەردیلەو گەردەکان بەکار دێنێت،

(١) الانواء الجوية/ د.فياض النجم/ ل:٨٥. بە کورت کردنەوە.

(٢) يونس: ٩٠.

(٣) الانفطار:٣.

(٤) التكوير: ٦.

(٥) التكوير:١٨.

(٦) ايات الاعجاز العلمي/ عبدالرحمن سعد صبحي الدين/ ل:٤٢.





ـەلام بەرهەمی کرداری رۆشنە پێك هاتن دەبینرێت، لە ماوەی ئەو ئۆکسجینەدا توانای هەناسە ـ خۆراکمان دەداتێ کە ژیانمان دەپارێزێت. رۆشنە پێك هاتن سیستەمێکی ئالۆزەو شێوازی کیمیایی چەند یەکەیەکی کێش بەکاردێنێ لە بازنەیەکی تەسکداو زۆر دەزگای وردی هەستیار ـێك دێت. لە هەر رووەکێ دا ملیۆنەها تاقیگەی کیمیایی هەڵدەستن، سەرباری ئەوە رووەك ئەو ئۆکسجینە بەرهەم دێنن ئێمە بەکاری دێنین و وزە لەو وەردەگرین، ئەم کردارەش ملیۆنەها ساڵە ـەردەوامە) [1].

وە قورئان ئاماژە بە کارگەی(سەوز) دەکات لە رووەکدا کە بەرپرسیارە لە کرداری رۆشنە پێك هاتندا﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾[2].

زانایان دۆزیویانەوە یەك خانەی سەوز بەبنیاتنانی بیست پێکهاتەی ئەندامی هەڵدەستێ لە خولەکێدا کاتێ دەکەوێتە بەر خۆر، رووەك خۆراك لە ئاوو هەندێ کەرەستەی کانزایی و ئەندامی وەردەگرێ، زۆربەی ئەو هەوایانەی وەری دەگرێ کاربۆنە کە لە پێکهاتنی بونیەی رووەکدا بەشداره، بونیەی رووەك لە خاکەوە نایەت، بەڵکو لەو کارگە مەزنەوە دێت کە خوا لە گەڵای سەوزدا بنیاتی ناوە.

وە خوا کاتێ ئەم دارە بەوشکی دەسوتێنێ کە لە کاتی سەوزی دا بنیات دەنرێت، هەر خانەیەکی ناوگە ئەو گەڵایانە کارگەیەکە ماددەی ئەندامی بنیات دەنێ کە بەشداری دەکات لە گەشەو گەورە بوونی دا، ئەمەش بەڵگەیەکی خوای گەورەیە) [3].

(خانەی رووەکی یەکەی وردن زۆربەیان بە چاوی رووت نابینرێن، بۆ نمونە: داری سێو کە گەڵاکانی رووبەریان(٢٥)سم دەبێ لە(٥٠,٠٠٠,٠٠٠)خانە پێك دێ، گەر داری سێو(٦٠٠) هەزار گەڵای پێوەبێ، هەر گەڵاکانی لە (٣٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠) خانە پێ دێت) [4].

---

(١) ايات الاعجاز العلمي/ ل: ٤١-٤٢.

(٢) يس: ٨٠.

(٣) ايات الله في الافاق/ د:محمد راتب النابلوسي/ ل:٢٢٧. بەکورت کردنەوە.

(٤) العملي في تشريح النباتات و التحضيرات الجهرية/ د: طالب عويد حزرجي/ ل:١٦.





بیگومان ئۆکسجینی پەستێنراو لە نەخۆشخانەکاندا لە ناو لولەی پۆلایینـدا بـەکاردێنریّ، هەروەها بۆ ئەو کەشتی یە وانانەی دەچنە دەرەوەی زەوی، وە بـۆ مەلـەوانانی ژێـر دەریـاو ئـەو ئاگرکوژێنەوانەی دەچنە ناو خانوی سوتاوە گازی خنکێنەری تیا هەیە. وە بۆ بەرزکردنەوەی پلەی گـەرمی بـەکاردێ بـۆ لـەتکردنی ئاسـن، بـۆ دەرهێنـانی پـۆڵای بـاش بـەکاربێ، دیـسان بـۆ پاکژکردنەوەی ئاسنی شل لە کاربۆن و پیسایی یەکانی.

## ٤٠-٤١- کاربۆن و سوڕەکەی و گرنگی یەکەی:

کاربۆن سوڕەکی تەواو دورست دەکات، چونکە بۆ بەهـەمان خێرایـی بـۆ ئـەو ژینگەیـەی دەگەرێتەوە کەبەجێ ی هێشتووە، گازی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن(٠,٠٣٪)ی هـەوا پێـك دێنـێ، گەر لەم رێژەیە پتر بێ زیانی ژینگەیی و تەندروستی دورست دەکات.



ئەم گازە بە سوڕەکی داخراودا دەروات، لەم سوڕەدا هەندێ گیاندار بەکاری دێنن و، وە لـە هەندێ کارلێکردندا، پاشان بۆ بەرگەهەوای زەوی دەگەرێتەوە. سوتانی سوتەمەنی و دارستانەکان و کرداری هەناسەی مرۆڤ لە هەناسە وەرگرتن و دانەوەو سوتاندنی پترۆڵ (نەوت) و خـەڵوز وشـی بونەوەی ماددە ئەندامیەکاندا هەمور ئەوانە دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بەرەلاّ دەکـەن. ئـەوەی لـە





ـوری ترشی بارانی دەگەڕێتەوەو لەڕووبەرە ناویەکاندا دەمژرێ کە لەگەڵ هەڵمدا یەك دەگرێ، ـ:کانی(جیر)ی پێك دێ کە لە قولایی دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا دەنیشێ، هەرپێی رووەکـی ـوی و زەمینی یە چاوگەکی سەرەکی و گرنگی سوڕی کاربۆنن.

ئەم رووەکانە بە مژینی دووەم ئۆکسیدی کاربۆن هەڵدەستن لە رێگای رۆشنە پێك ـتن(العملية الضوئي) دا بۆ پێك هێنانی زنجیرەی کاربۆن و کاربۆهیدرات بۆ گیاندارانی بەکار ـتوو دەگوازێتەوە پاشان بۆ مرۆڤ ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەو خۆ.

دیسانەوە سەرباری ئەوە رێژەیەکی زۆر کاربۆن بۆ کەرستەی عەمبار کراو دەگۆڕێ ـ:کو(خەڵوز) و(پەترۆڵ) کە لەناو زەوی دابە عەمبارکراوی دەمێنێتەوە، پاشان دوای دەرهێنانی مرۆڤ بەکاریان دەهێنێت، سەرباری بڕی ئەو کاربۆنەی لە شێوەی(بەردی کلسی) دا عەمبار ـ:مێنێت[1].

وە قورئان ئاماژە بە گازی کاربۆن یان خەڵوز(الفحم) دەکات کاتێ دەفەرمێ﴿الَّذِي جَعَلَ ـكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾.

بەڵێ خوا ئاگری لە داری سەوزدا عەمبار کردووە کاتێ ئێوە هەڵی دەکەن،(ئاگر) لێرەدا ـزەی خۆرە، ئاگر کاربۆن و هایدرۆجینە، خەڵوزەکە لە ئەنجامی رووەکەکانی بەر لەمێژوو دورست ـوە. سوتەمەنی لە گەردی هایدرۆجین و کاربۆن پێك دێ لە دارو تەختەدا بە هۆی یەك گرتنی ـەگەڵ ئۆکسجینی هەوادا دەسوتێت[2].

وە قورئان ئاماژە بەنەوت(پەترۆڵ) دەکات﴿وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾[3]. (د:عمادالدين خليل) دەڵێ: (القطر) لێرەدا(نەوت)ە[4].

وشەی(پەترۆل) لە(پەتراpetral) و(لیوم oleum) پێك هاتووە واتە: (چەوری تاوێرەکان) .

---

(١) التربية البينة/ عادل مشعان ربيع/ ل: ٢٢-٢٣ بەكورت كردنەوە.

(٢) بۆ زانستی پتر بروانە(كنوز العلم/ روليم فرجارا/ ل:٢٧٥.

(٣) سبأ:١٢.

(٤) حول اعادة تشكيل عقل المسلم/ د: عمادالدين الخليل/ ل:١٤٥.

وە کوردەکان و خەڵکی دوزیّ لە کۆنەوە ناشنات بوون پیّ ی، لە تەوراتدا هاتووە-کە نوح کەشتی یەکەی بە(قیر) سواق داوە(فامره بان یصنع فلكا من خشب قطرانی ويدخله هو وعياله). وە مێژوونوس(هیرودوتس/ ٤٥٠پ.ز) باسی کردووە کاتیّ دەڵیّ: (لە نەدریکادا بیریّ هەیە سیّ جۆر کەرەستە هەیە لەمەوادی ئیسفلت و خویّ و چەوری)[1]. پێغەمبەر(ﷺ) باس لە جەنگی نەوت دەکات لە داهاتوودا: (يقتتل عند كنزكم هذا ثلاثة) رواه ابن ماجه. واتە: سیّ کەس لای خەزێنەی ئێوە بەشەر دێن، مەبەست لەم خەزێنەیە نەوتەکە بەزێڕی ڕەش ناسراوە.

## ٤٢-٤٣- سوڕی نایترۆجین لە سروشتدا و گرنگی یەکەی:




نایترۆجین(٧٩٪)ی هەوایە و بەشداری پێك هێنانی زۆریّ لە کەرەستەکان دەکات، لە پێکهێنانی ژیانی سەر رووی زەویدا گرنگە، نایترۆجینی توخمەکی ناچالاکە و ڕاستەوخۆو گەرماو گەرم لەبەرگە هەوای زەوی وەرناگیریّ، پێویستە بۆ چەند پێك هاتەیەك بگۆڕیّ دوایی مرۆڤ و گیاندار بتوانن بەکاری بێنن. ئەم گۆڕانانە دروست دەبن بە بروسکە(البرق) و چالاکی بوڕکانی یان(بەکتریا)ی ناو خاك

---

(١) دراسات عن ذهب اسود/ عزيز حسن الخفاف/ ل: ١٩-٢٠ سەیریکە.



کە بە گۆڕینی(نایترۆجینی) هەڵدەستێ(بۆ نیترات) پاشان بۆ(ترشی ئەمینی) و(پرۆتینەکان).
زۆربەی سەرچاوەکان ئاماژە دەکەن کە لە کارەبا و جێگیری(کیمیا – ڕووناکی) پەیدا دەبێت.

لێرەدا شێوەی نایترۆجینی هەیە ڕووەکە بالاکان(الراقیە) و قەوزە(الطحالب) دەتوانن لە ڕێگای ڕەگەکانیانەوە بەکاریان بێنن لە شێوەی(نترات) و(نتریت) و(ئامۆنیا) دا، ئەو بەشداری دەکات لە بنیاتنانی(پرۆتینەکان) لەناو لەشی ئەو زیندەوەرانەدا، لەوانە پاشماوەی پێک هاتەی کیمیایی تر.

کاتێ مرۆڤ و گیانداران لەم ڕووەکانە دەخۆن ئەو کەرەستە ئەندامی یانەیان بۆ دەگوازێتەوەو دوای مردنیان کرداری شی بونەوە دەست پێ دەکات بە هۆی زیندەوەرە شیکەرەوەکان(بەکتریاکان و کەڕوەکان- الفطریات)، کاتێ نایترۆجین بۆ شێوەی نائەندامی ئەگۆڕێ کە(ئامۆنیا)یە بە شێوەی سەرەکی پاشان بەکتریا بە گۆڕینی هەڵدەستێ بۆ نیتریت(no۲) پاشان بۆ نیترات(no۳)، پاشان لە ڕێگای ڕەگەکانەوە دەگوازرێتەوە، بۆ گازی نایترۆجین(n۲) دەگۆڕێت و بۆ ناو هەوا دەگەڕێتەوە[1].

گەر بڕوانینە قورئان بەر لە زانستی نوێ ی کیمیایی باس لە گازی نایترۆجین و بوون و سوڕی گرنگی یەکەی دەکات، لەوشەیەکی پڕ لە زانستی و کورت دا دەیخاتە بەردەم زانایان و مەیدانداری یان دەکات﴿لَوْ نَشَاءُ جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾[2].

واتە: گەر بمانەوێ ئاوی باران ترش و تاڵ دەکەین، ئەدی بۆ سوپاسی خوا ناکەن!

لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ: (جێگیربوونی نایترۆجین دەکات کە بریتی یە لە گۆڕانی نایترۆجینی گازی بۆ نیترات کە بە شێوەیەکی کەم لە ناوەندی کەهرۆکیمیایی دا ڕوودەدات لە کاتی بروسکەی هەوردا. ئەم کارە بە زۆری ناوچەی یەکساندا زۆرە کە هەورە گرمەی زۆرە برەکی زۆر بۆ (نیترات) دەگۆڕێ، برەکەی(۳۵ملگم نایترۆجین ٠م٢ . ساڵانە(١٠٠) بەم شێوەیە تێکەڵ

(١) التربية البيئة/ د: عادل مشعان ربيع/ ل:٢٤-٢٥.

(٢) الواقعة:٧٠.

بە خاك دەبێت[1].

وەقورئان ئاماژە دەكات لەشی مرۆڤ لە توخمەكانی زەوی پێك هاتووەو دوای مردن بۆ ئەم توخمانە شی دەبێتەوە﴿كَيْفَ تَكْفُرُونَ بِاللَّهِ وَكُنتُمْ أَمْوَاتاً فَأَحْيَاكُمْ ثُمَّ يُمِيتُكُمْ ثُمَّ يُحْيِيكُمْ ثُمَّ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ﴾[2].

واتە: ئێوە چۆن بڕوا بەخواناكەن ئێوە مردو بوون خوا زیندوی كردن، پاشان دەتان مرێنێ، پاشان زیندوتان دەكاتەوە، پاشان بەرەو لای ئەو زیندودەبنەوە.

بەم شێوەیە خوا هاوسەنگی لەبونەوردا ڕاگرتووە رووەك ماددەكانی پێك هاتنی خۆی لە خاك وەردەگرێ تا گیانداران بیخۆن، مرۆڤ گیانداران دەخوات. كاتێ مرۆڤ و گیانداران و رووەك دەمرن لەشیان شی دەبێتەوە بۆ ئەو خاكەی لێ ی پێك هاتووە. پەیوەندیەكی تەواو هەیە لە نێوان توخمەكانی ژینگەدا(تیشكی خۆر+ رووەك+ گیانداران+ مرۆڤ+ هەندێ پێك هاتەی گازی) بە هاوسەنگی یەكی تەواودا لە سروشت و ژیاندا لە بازنەكی داخراودا.

---

(١) مبادیء علم البیئة/ بریج كوبال/ ت: د ریزان محمد صالح/ ل:٦٨.

(٢) البقرة:٢٨.





## بەندی چوارەم: بەرگی ئاوی زەوی و سوڕەکەی:

٤٤-٤٥- ئاو و گرنگی یەکەی/ سوڕی ئاو لە سروشتدا.

٤٦-٤٧-٤٨-٤٩/ ئۆقیانوسەکان/ دەریاکان/ مەبەست لە دەریای شیرین و سوێر/ دەریاچەکان:

٥٠- رووبارەکان.

٥١- جۆگەو ئۆکەندەکان(القناه) / تاڤگەکان/ کەنداوەکان/ دوورگەکان:

٥٢-٥٣-٥٤-٥٥: ئاوی ژێر زەوی/ کانیاوەکان/ بیرەکان/ ئافورەکان:

٥٦-٥٧/٥٨: سامانە ئاویەکان و سوڕەکانیان و ڕاوی دەریایی:

٥٩- ماسی و نەهەنگ.

٦٠- مرواری.

٦١- ئیسفنج.

٦٢- خوێ ی چێشت لە دەریادا.

٦٣- نەهەنگی یەنس(ﷺ).

٦٤- بونی بەربەست(الحجز) لەمیان دەریاکاندا.

٦٥-٦٦- ئاگری ناو زەریاکان و دەریاکان و ماناکانی(المسجور).

٦٧- مەتەڵی سێگۆشەی بەرمۆدا.

٦٨- جوڵەو شەپۆلی ئۆقیانوسەکان و دەریاکان.

٦٩- هەڵکشان و داشکانی ئاوی .

٧٠- تەزوی دەریایی(التیار البحری).

٧١- تاریکایی ناو دەریا قوڵەکان و ئۆقیانوسەکان.

٧٢- ٧٣- ٧٤- ٧٥: چۆن دەریاکان و ئۆقیانوسەکان و ناو کەشتی یەکان و تەنەکان بەرز دەکەنەوە؟

/ یاسای پاڵنان بۆ سەرەوە لە ئاودا/ دۆزینەوەی هێزی گواستنەوەی نوێ لە پێشبینی قورئان دا وەکو پاپۆرە زلەکان/ چۆن ژێر دەریاکان نقوم دەبن و سەر ئاو دەکەونەوە؟

## ٤٤-٤٥: ئاوو گرنگی یەکەی و سوڕی ئاو لە سروشتدا:

قورئانی مەزن لە ڕاست گرنگی ئاوو سوڕی نەگۆڕی لە سروشتدا دەفەرمێ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاء كُلَّ شَيْءٍ حَيّ﴾(١).



واتە: لەئاومان دورست کردووە هەموو شتەکی زیندوو. ﴿وَالسَّمَاء ذَاتِ الرَّجْعِ﴾(٢). واتە: سوێند بە ئاسمانی گێڕەرەوە، بەڵێ ئاسمان هەڵم بە شێوەی باران و تەرزەو بەفر دەگێڕێتەوە بۆ زەوی. وەکو باسکرا.

## لەرووی زانستی یەوە:

(ئاو ٧٠٪)ی لەشی مرۆڤە-و هەندێ رووەك لە(٩٠٪)ی کێشیان ئاوە. (وە ئاو بەشەکی زۆری زەوی پێك دێنێ لە ئۆقیانوس و دەریاو دەریاچەو رووبارو ئاوی ژێر زەوی و بەستەڵەك. بڕەکەی(١,٥) بلیۆن کم٣ یە. ئاوی سوێر بڕەکەی(٩٥-٩٧٪) کەچی ئاوی سازگار(٣,٥٪).

(١) الانبیاء:٣٠.
(٢) الطارق:١١.





ـەگەڵ ئەوەشدا بڕی ئاوی شیرین و سازگار ئەمە لێرەدا دانیشتوان لەزۆربوندان و زۆرتر بۆ خۆیـان ـ کشتوکاڵ و پیشەسازی بەکاری دێنین. ئاو رەگەزێکی گرنگە بۆ ژیـان لـەزەوی داو گیانـداران و ـووەك و پشتی پێ دەبەستن، یان هەڵم لە هەوادا یان لە دۆخی شـلی رووبـارو دەریاچـەو دەریـاو ئۆقیانوسەکاندا هەیە، یان بەبەستەڵەکی لە هەردوو بەستەڵەکی باکورو باشودا هەیە.

رۆژانە(١٨٧٥کم٣) دەبێ بە هەڵم و(١٧٧٥کم٣) لەشێوەی باراندا دەگەرێتەوە ئەوەی تر بە شێوەی هەڵم لە هەوادا دەمێنێتەوە، سەرباری ئەوەش(١٦٠کم٣) ئاو لە وشکانی دا دەبیتە هەڵم ـ ئەمبڕەیە لەسەر وشکانی و دەریاکان و ئۆقیانوسەکان و رووبارەکاندا دادەبارێت. وە ئـاوی نـاخ ـزەوی لە عەمبارەکانی قوڵایی جیاجیاکانی ناخی زەوی دا هەیە لە چینەکانی ناوەوەدایە بـە نـاو تاوێرو لم و چەودا چۆتە خوارەوە، لە هەندێ وڵاتدا ئاوی ژێر زەوی چاوگی سەرەکی ئاوەکەیە[1].

دیسان گەر تەماشای قورئان بکەین ئاماژەیە بە رێـژەی نـەگۆڕی بـاران و هـەڵم دەکـات، ئاماژە دەکات باران چاوگی ئاوی ساز گاز و ئاوی ژێر زەوی و سەر زەوی یە، داهاتوش ئاوی ژێـر زەوی و سازگارو لەکەمی دەدات﴿وَأَنْزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً بِقَدَرٍ فَأَسْكَنَّاهُ فِي الْأَرْضِ وَإِنَّا عَلَى ذَهَابٍ بِهِ لَقَادِرُونَ﴾[2]. واتە: ئێمە ئاومان لە ئاسمانەوە بە ئەندازە ناردووەو ئـەنجا لـەناو زەوی دا نیشتەجێ مان کردووە، وە ئێمە لە نەهێشتنی دا بە توانایین.

بەڵێ سروشت وەکو خوا فەرمویەتی﴿إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ﴾[3]. مـل بـۆ یاسـایەکی ئاڵۆزو پەیوەندیەکی توکمەو توند کەچ دەکـات، سـەرەنجام هاوسـەنگی یـەك لـە نێـوان هـەموو توخمەکان سروشتدا پەیدا دەبێت، کە بەوردی کارەکانیان ئەنجام بدەن و، لەمەش دا رۆڵی خۆی بە تەواوی دەگێرێت.

بەڵێ خوا هاوسەنگی لە نێوان بەرهەم هێنان و بەکاربردن دا لە سروشتدا دروست کـردووە، کەرەستەکان رووەك پێك دێنن و، خاك دەیانۆێ تا گیانداران بیانخۆن کە مرۆڤ ژیانی لەسـەریانە،

---

(١) التربية البينة/ ل:٢١.

(٢) المؤمنون: ١٨.

(٣) القمر:٤٩.




کاتێ گیاندارەکان مردن دەبنەوە خاك، بەڵێ پەیوەندی نێوان توخمەکانی سروشت و ژینگە تۆکمەیە، تیشکی خۆرو رووەك و ئاژەڵ و مرۆڤ و بەرگە هەواو بەرگی ئاوی و بەرگی ئاوێری﴿وَجَعَلْنَا سِرَاجًا وَهَّاجًا وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجًا لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾(1).

## ٤٦-٤٧-٤٨- : ( ئۆقیانوسەکان و دەریاکان ) و( دەریاچەکان )

## ٤٩- مەبەست لە دەریای شیرین و سوێر چییە؟

قورئانی مەزن ئاماژە بە(٧) دەریای گەورە دەکات﴿وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ مَّا نَفِدَتْ كَلِمَاتُ اللَّهِ﴾(2).

واتە: ئەم دەریایەش حەوت دەریای تر یارمەتی بدات بۆ مرەکەپ بوون وشە خوایی یەکان تەواو نابن. بەڵێ: چینی هەوا حەوتە، چینی زەوی حەوتە، چینی جوگرافی وشکانی حەوت کیشوەرە، زۆربەی سەر زەویش ئاوە. لێرەدا قورئان ئاماژە بە ئۆقیانوسێ دەکات، کە(٧)ی تر یارمەتی بدات.

(ئاورێژەکەی لە زەوی دا(٧٢٪). قەبارەی ئاو لە دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا(١٣٤٧) ملیۆن کم٣ و(٩٧,٣٪)ی سەرجەم ئاوی سەر زەوی پێك دێنێت، کە دەگاتە(١٣٨٥) ملیۆن کم٣ یە. بۆیە زەوی بە هەسارەی ئاوی ناسراوە. دەریاکان و ئۆقیانوسەکان یەکەیەکی سروشتی بێ وێنە لە گۆی زەوی دا دروست دەکەن، چونکە پێکەوە پەیوەستن، بۆیە جوگرافیەکانی هاندا ئەمە بە ئۆقیانوس(المحيط) ناوزەد بکەن تا ئەم پەیوەندییە گوزارش بکەن، چونکە هیچ بەربەستێ نییە بۆ جیاکردنەوەی ئەو رووبەر ئاوانە، تەنیا هێڵی پانی و درێژی لێکیان جیا دەکاتەوە. رووبەری دەریایی لە نێوان سێ زەریایان ئۆقیانوسی سەرەکی دابەش دەبن، ئۆقیانوسی هێمن(هادی) کە(٤٩,٥٪)ی داگیر دەکات، زۆر دەریای تر لە خۆرهەلاتی ئاسیاو خۆرئاوای هەردوو

---

(١) النبأ:١٣-١٦.

(٢) لقمان: ٢٧.

ئەمریکایەکان دەچنە ناویەوە.

بەڵام ئۆقیانوسی تاریکی(ئەتڵەسی) لە(٢٩,٥٪)ی رووبەرەکە داگیر دەکات، ئەم رووبەرە ناوییە دەکەوێتە میان خۆرئاوای کیشوەری ئەوروپا و ئەفریقیا و بەرەو باشورو خۆرئاوای ئەمریکا درێژ دەبێتەوە، لەم شوێنانەوە دەریاکان دەچنەوە ناویەوە. ئۆقیانوسی(هیندی) رووبەرەکەی(٤١٪)ی ئەمەیە، کە لە ئۆقیانوسی هێمنەوە درێژ دەبێتەوە تا سەری(ئەجولهاوس) لە ئەفریقیا و، لە باشورەوە تا کیشوەری جەمسەری باشور[1].

کەواتە:

(١)هێمن(هادی) گەورەترین ئۆقیانوسە رووبەرەکەی(١٧٢) ملیۆن کم٢.

(٢) ئۆقیانوسی تاریکی(ئەتڵەسی-ئەتلەنتی) رووبەرەکەی(١٠٦) ملیۆن کم٢.

(٣) ئۆقیانوسی هیندی رووبەرەکەی(٧٥) ملیۆن کم٢.

(٤) ئۆقیانوسی بەستوی باکور رووبەرەکەی(١٤) ملیۆن کم٢[2].

ئەم ئۆقیانوسانە یەك ئۆقیانوسن یان یەك دەریای گەورەن و سنوری دەستکردنیان نییە، تەنیا بە هێڵی پانی و درێژی خەیاڵی زەوی جیا دەکرێنەوە، بۆیەش قورئان بە یەك دەریای گەورە ناویان دەبات﴿وَالْبَحْرُ يَمُدُّهُ مِن بَعْدِهِ سَبْعَةُ أَبْحُرٍ﴾.

وە قورئان ئاماژە بە بەرگی ئاوی و هەوایی دەکات کاتێ دەفەرمێ﴿وَالْبَيْتِ الْمَعْمُورِ وَالسَّقْفِ الْمَرْفُوعِ وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾[3].

واتە: سوێند بە خانەی ئاوەدان و سەقفی بەرزکراو، دەریای پڕ(یان داگیرساو). (البیضاوي) لە(تفسیر)ەکەیدا دەڵێ: (وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ: أي المملوء وهو المحيط او الموقد). واتە: دەریای پڕ کە ئۆقیانوسە، یان داگیرساو. بێگومان هەردوو ماناکان شان بە شانی یەکتری لەم وشەیەدا دەردەکەون وەکو دەرکەوتنی گەرمی و رووناکی لە ئاگرەوە.

---

(١) جغرافيا العالم/ الاء عبدالحميد/ ل:٢٨.

(٢) جغرافيا العالم/ الاء عبدالحميد/ ل:٢٨.

(٣) الطور: ٤-٦.

(٥) لە هەندێ سەرچاوەی تری گەردووناسی و جیۆلۆجی دا بەستەلەکی باشووریش بە ئۆقیانوس دادەنرێ کە رووبەرەکەی(٢٤,٣٣) ملیۆن کم٢ دادەنرێ و بڕی ئاوی بە(١٢٠) ملیۆن کم٣ دانراوە بە شێوەی بەستەڵەك[1].

بەڵام ئەو ئۆقیانوسانەی یان دەریایانەی دەکەونە ناو وشکانی یەوە یان نێوان دوورگەکانەوە پێ یان دەوترێ(دەریاکان). کە لە شێوەی دەریای پەراوێزی(الهامشیە) و دەریای ناووخۆو دەریای نێوان دورگەکان دەردەکەون. دەریای پەراوێزی ئەو رووبەرە ئاوەن دەکەونە سەرگەی یان لێواری کیشوەرەکان و دورگە گەورەکان و، دەریای ناووخۆ دەکەوێتە نێوانو ناو کیشوەرەکانەوە، وەکو(دەریای سپی ناوەراست، کە دەکەوێتە نێوان کیشوەری ئاسیا و ئەفریقیا و ئەوروپا، سەرباری ئەوەش دەکەوێتە ناو کیشوەرەکانەوە.

دەریای نێوان کیشوەرەکان بە رووبەری فراوان و قولایی زۆری جیا دەکرێتەوە، کەچی دەریا ناوخۆیی یەکان( ناو کیشوەرەکان) بە بچووکی رووبەرو تەنکی جیا دەکرێنەوە.

جۆری سێ یەمیان دەریای میان دورگەکان ئەوانە دەکەونە میان ئەو دورگە بچوکانەی بە ناو ئۆقیانوسە زلەکاندا بلاّوبونەوە. وەکو(مولوکا) و(سیلیبس) و(فلیپین) و جاوە(ئەندەنوسیا) و(کورال). دەریای ناوخۆ دەکەونە ناو وشکانی یەوە وەکو دەریای سپی ناوەراستی و بەڵتیق و دەریای رەش. نمونەی دەریای پەراوێزی کارسك وکاریبی دەریای چینی و بیرنك و جوکوتسکە.

## دەریا ناودارەکان: رووبەرو قولایی یان/ مام ناوەندی یەکەیان:

(١)دەریاکانی چینی باشور(٢٩٤٠١٦٠)کم٢ رووبەری و قولایی(١٤٦٣)م.

(٢) دەریای کاریبی: رووبەری(٢٤٨٦٨٧٤)کم٢، قولاّیی(٢٥٧٥)م.

(٣) دەریای سپی ناوەراست رووبەری(٢٤٨٠٨٩٦)کم٢ و قولایی(١٤٧١)م.

(٤) دەریای بیرنج رووبەری(٢٢٣٤٨٨٠)کم٢ و قولاّیی(١٤٩١)م.

(٥) ئەو خوتسك رووبەری(١٣٨٦٠٠٠) کم٢ و قولاّیی (٩٧٣)م.

(١) الموسوعة الفلكية/ عماد مجاهد/ ل:١٥٦.



(٦) دەریای چینی خۆرهەلآت رووبەری(٦٥٦٨٩٦)کم٢ و قولآیی(   )م.

(٧) ئەندمان رووبەری(٥٥٨٣٣٦)کم٢ و قولآیی(١١١٧)م.

(٨) دەریای رەش رووبەری(٥٠٢٠١٦)کم٢ و قولآیی(١١٩٠)م.

(٩) دەریای سور رووبەری٤٢٣٣٠٠)کم٢ و قولآیی٥٣٧)م.

(١٠) دەریای قەزوین رووبەری(٤٢٣٣٠)کم٢.

(١١) دەریای باکوور رووبەری(٤٢٢١٤٤)کم٢ و قولآیی(٩٣).

(١٢) دەریای بەلتیق رووبەری(٣٧٧٦٠٠)کم٢ و قولآیی(٥٥)م.

(١٣) دەریای زەرد رووبەری(٢٩٠٥٦٠)کم٢ و قولآیی(٣٧)م.

(١٤) دەریای ئۆرالْ رووبەری(٦٤٠٠٠)کم٢.

(١٥) دەریای مردوو رووبەری(٩٨٠)کم٢[1].

## دابەش کردنی دەریاکان بە پێ ی سوێرییان:

وە دەریاکان بەپێ ی خوێواوکیان(الملوحه) دابەش دەکرێن، پلـەی خوێـواوکی دەریاکـان و نۆقیانوسەکان لە رادەی(٣٥٪) دایە، واتە لە هەر لیترێ ئاودا(٣٥) گم.

وە ئەم سوێریەش لە نۆقیانوس و دەریاکاندا چۆن یەك نییە، بەلکو بە پێ ی پلەی گـەرمی و بەرزی پلەی بە هەلْم بوون و بری هەلْرژانی ئاوی رووبار بۆ ناویان و پلەی پەیوەندی دەریاکان بە نۆقیانوسە گەورەکانەوە دەگۆرێ.

**بە پێ ی هۆکارەکانی سوێری دەریاکان دەبنە چوار بەشەوە:**

(١)دەریای سوێر کە پەیتی یەکەی لە راددەی گشتی پترە وەکو دەریای سوور(٤١,٣٧) لە هـەزار دا و دەریای سـپی ناوەراسـت(٣٩,٣٧ لـە هـەزار) و کەنـداوی فارسـی(عـەرەبی)(٣٩,٣٧ لـە هەزار)ە.

(١) جغرافیا العالم، ل١٩٤.




(٢) ئەو دەریایانەی سوێریان مام ناوەندە وەکو دەریای کاریبی(٣٦,٣٥ لە هەزار) و کەنداوی کالیفۆرنیا(٣٦,٣٥ لە هەزار).

(٣) دەریایە کەم خوێیەکان کە پلەی خوێیان لە(٢٥-٣٥) کەمترە، وەکو دەریای چین دەریای بیرنك(٢٨-٣٣لەهەزار) و دەریای ژاپۆنی(٣٠-٣٤ لە هەزار) و دەریای باکور(٣١-٣٥ لە هەزار).

(٤) دەریای شیرین، کە بە شێوەیەکی بەرچاو ڕێژەی خوێیان کەمە، وەکو دەریای بەلتیق(٩-١٥ لە هەزار) کەنداوی هدسن(٨-١٥ لە هەزار) [1].

بە ڕاستی قورئان بۆ زانایانی کۆن ونوێ دەریاکانی بە پێ ی سوێری و شیرینی پۆلین کردووە کاتێ فەرمویەتی﴿هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾[2]. یان﴿هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ [3]. واتە: ئەمە شیرین و سازگارە بۆ خواردنەوە ئاسانە، ئەمەش سوێرەکی تاڵە.

دیارە ئەم سوێرییە بۆ دەریاکان زۆر پێویستە تا ئۆقیانوسەکان و دەریاکان بۆن نەبن، ئەنجا باران سەرچاوەیەکی باشە بۆ پالاَوتنی ئاوو لادانی خوێیەکەی، گەر باران نەبوایە ئاوی سازگارمان دەست نەدەکەوت﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء طَهُورًا﴾[4].

واتە: دامان بەزاندووە لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاکژکەرەوە.

(ئیسلام لێرەدا ئاوی بەفرو تەرزەو بارانی بە ئاوەکی پاکژ بۆ بەکارهێنانەکانی مرۆڤ داناوە، کە لە ڕێگای بە هەلم کردنەوە پالاَوتەی کردووە، ئەو خاوێنە لە خوێ و خلتە و میکرۆبەکان) [5].

---

(١) جغرافية البحار و المحيطات/ د: مهدي محمد علي/ ل:٦٠-٦١.

(٢) الفرقان:٥٣.

(٣) فاطر:١٢.

(٤) الفرقان:٤٨.

(٥) الطب الوقائي في الاسلام/ د: عمر محمود عبدالله/ ل:٣٧.





## دەریاچەکان ( البحيرات ) یان( گۆماوەکان ):

دەریاچەکان یان گۆمەکان بریتین لە حەوز یان چەند روچاڵێکی پڕ لە ئاو. دەکەونە سەر ڕەوی و بە بەشێ لە ئاوی سەر ڕوویی دادەنرێن.

ئەم گۆمانە جوڵەیان سستە یان نییە، بەپێ ی سەرچاوەی وەرگرتنیان شیرین یان سوێرن. لە هەموو کیشوەرەکاندا هەن، ئەم دەریاچانە سودبەخشن بۆ ئاودێری کشتوکاڵی و راوەماسی و گواستنەوەو پەیدا کردنی وزەو سنوری سیاسی میان دەوڵەتان و گەشتوگوزار[1].



**نمونەیان:**

(١) گۆمی سەرو لە ئەمریکای باکور: رووبەر(٨٢٧٠٠کم٢). بەرزی(١٨٣٠م) لە ئاستی دەریاوە.

(٢) گۆمی ئارال لە ئاسیا: رووبەر(١٦٨٧٠٠کم٢).

(٣) گۆمی فیکتۆریا لە ئەفریقیا رووبەر(٦٨١٠٠کم٢) بەرزی(١١٣٥)م.

(٤) دەریاچەی هورون لە ئەمریکای باکور رووبەر(٥٩٨٢٠)کم٢[2]. بەرزی(١٧٧)م.

---

(١)جغرافيا العالم/ الاء عبدالحميد/ ل:٢٧ بەکورت کردنەوە.

(٢) سەرچاوەی رابردوو/ ل:١٩٥.

**٥٠- ( رووبارەکان )**

﴿وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ﴾ ابراهيم:٣٢.

واتە: خودایە رووبارەکانی بۆخستونە ژێربار.

﴿وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ﴾ الحج:٤٥. واتە: وە چەند بیریکی لە کارکەوتوو.

﴿وَهُوَ الَّذِي مَدَّ الأَرْضَ وَجَعَلَ فِيهَا رَوَاسِيَ وَأَنْهَارًا﴾ الرعد:٣. واتە وە خوایە زەوی درێژکردۆتەوەو چیاو رووباری تێدا داناوە.

رووبارەکان بریتین: لە چەند رێرەوێکی ئاوی، رۆخەکانیان بەدەرەوەن، لە کۆبونەوەی هەندێ ئاوی ئەو دۆڵ و زینوو شێوانە پێك دێن دەکەونە بەرزایی یەکانەوە، کە بە قوڵایی گەورە ئاوزەد دەکرێن، لەگەڵ هەمواری رووی زەوی ژێرەوە لێژ دەبێتەوە تا دەرژێتە رووبارەوە لە تەك ئاستی بنەمای دا، کە زەریا یان رووبار، یان گۆمە. رووبارەکان لە ئەنجامی ئەو بارانە دروست دەبن، دەکەونە ناوچە سەرچاوەو گەنجەڵ و کانیاوە کانەوە، یان لە ئەنجامی توانەوەی بەفر دەبێ لە ناوچە سەرچاوەکانەوە، یان بە هۆی هەردوو رێگاوە دروست دەبێ، رووبار چۆگەیێکی گرنگی ئاوی شیرینی سەر زەوی یە، گرنگی یان لە جیهاندا بۆ کشتوکاڵ و پەیدا کردنی وزەی کارەبایی و راوکردن و رێگای گواستنەوەیە، دیسانەوە وەکو سنورێکی سیاسی نێوان دەوڵەتان قۆرغ دەکرێت[1].

**نمونەی رووبارەکان:**

(١)رووباری نیل لە کیشوەری ئەفریقیا درێژی(٦٦٧١)کم.

(٢) رووباری میسیسیپی لە ئەمزیکای باکور(٦٤١٨) کم.

(٣) رووباری ئەمازۆن لە ئەمریکای باشور(٦٢٨٠)کم.

(٤) رووباری بانگ تیسی کیانگ لە ئاسیا درێژی(٥٥٥٢)کم.

(٥) رووباری(فۆلجا) لە ئەوروپا(٣٦٦٤)کم.

---

(١) جغرافيا العالم/ ل: ١٩٩/٢٦.



(٦) رووباری فورات لە کوردستانی گەورەدا لە ئاسیا(٢٣٠٠)کم.[١].

وشەی(فرات) چەند جار لە قورئاندا هاتووە وەکو﴿وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاء فُرَاتًا﴾[٢]. (ابن عباس) دەفەرمێ: (روبارەکانی باخچەکە (الجنە) چوار رووبارن: سەیحان، جەیحان، نیل، فورات). وە بڕوای وایە(جیحان) دیجلە بێت. وەکو لە(تفسیر الطبری/٣٠) دا باسکراوە.



ئەم چوار رووبارە لە کوردستاندان و لەتەوراتدا(سفر التکوین/١٥/١١/٢)دا ئەم چوار رووبارانەن کە بەهەشتی ئادەمی لێ بووە و ژیان یەکەمجار لەوێ دا سەری هەڵداوە.

بەڵێ کوردستان یان دۆڵی دوزێ وەکو(پرۆفیسۆر: ه.أ.رایت) باسی کردووە چەخی پلاستوسینی بەستەڵەکی کە ژیانی تێدا دورست بووە لە کوردستاندا بووە. وەکو ناوچەی هەڵگوردو ناوچەی رووباری ڕواندوزو جیلوداغ[٣]. وەکو لە گەردوونناسی دا باسکراو داهاتوش لە

(١) جغرافیا العالم/ ل:١٩٩/٢٦.

(٢) المرسلات: ٢٧.

(٣) اثار العصر الجلیدی البلاستوسینی في کردستان/ ه.أ.رایت. سەیر بکە.




باسی دورست بوونی ژیاندا باسی دەکەین.

فورات لە ڕێژگەی فورات سۆو موراد سۆ پێك دێ لە چیا بەرزەکانی کوردستانی باکور هەڵدەقوڵێ، هەروەها دیجلە لە گوندی(پیشخاپور) دێتە کوردستانەوە. لە کوردستانی داگیرکراوی عێراقدا زێ ی خاپورو زێ ی گەورە و زێ ی بچووك و عوزێم و زێ ی سیروانی تێ دەرژێت. وە درێژی دیجلە(١٧١٨)کم.

وە قورئان ئاماژە دەکات رووبارەکان، فورات هەڵقوڵاوی چیاکانن﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاء فُرَاتًا﴾ المرسلات: ٢٧.

## ٥١- جۆگەو نۆکەندەکان( القناة )

جۆگە بریتین لە رووباری وردو بچووك، یان خڕیان پێ دەوترێت، یان گەنجەڵ هەڵدەقوڵێ و لەیەك گرتنی ئەوانە رووبارێك پێك دێن.

درێژترین نۆکەند لە جیهاندا(سان لوران)ە لە کەنەدا کە(٢٩٣)کم درێژە، ئەنجا نۆکەندی ستالین لە روسیا(٢٢٥,٦)کم درێژە، پاشان نۆکەندی سوێسە لە میسر کە درێژی(١٩٥)کم[1].



(١) جغرافيا العالم/ ل: ٢٠٠.





## -- تاڤگەکان(الشلالات):

تاڤگەکان دیمەنێکی جوانی ... یتن. لە جیهان و کوردستاندا ... تاڤگەکان ئەو ئاوانەن لە ... بەرزاییەکانەوە شۆڕدەبنە ... خوارەوەو هەڵدەرژێن، نمونەی ... تاڤگەی(گەلی عەلی بەگ و بێخاڵ و ... جمیان و سەرسەنگ و سۆلاڤ). ئەم ... تاڤگانە بوونە جێگایەك بۆ ... هاوینەهەوارو گەشت و گوزار لە ... هاوینی خۆماندا.

بەرزترین تاڤگە لە جیهاندا(ستالتودل ئینجیل)ە لە ... ڤەنزویلادا کە(٩٨٠)م بەرزە، دوژمیتە لە ئەمریکادا کە(٨٤٠)م بەرزە، ئەنجا(ئەویتجارد)ە لە نرویج کە(٦١٠)م بەرزە، و(سوتیرالاند)ە لە نیوزلەندا کە(٥٧١)م بەرزە[1].

## گرنگترین کەنداوەکان لە جیهاندا

کەنداو(الخليج) ئەو ئاوەیە لە سێ لاوە درێژ بۆتەوەو وشکانی دەوری داوە گرنگترین کەنداوەکان ئەمانەن: (کەنداوی: تورکیۆ، بنگاڵ، عەقەبە، ئیسکەندرون، لیون، فینیسیا، مەکسیك، سان لوران، هدسون، کەنداوی فارسی، غینیا).

(١) جغرافيا العالم/ ل: ٢٠١.




**گرنگترین دورگەکان لە جیهاندا و ئۆقیانوسەکانیان و رووبەریان بە کم٢:**

(١)دورگەی گریلاند لە ئۆقیانوسی ئەتلەسی رووبەری(٢١٧٥٦٠٠)کم٢.

(٢) غینیای نوێ لە ئۆقیانوسی هێمن رووبەری(٧٧١٩٠٠)کم٢.

(٣) بۆرنیو لە ئۆقیانوسی هێمن رووبەری(٧٣٧٠١٨)کم٢.

(٤) خاکی بافن لە ئۆقیانوسی ئەتلەسی رووبەری(٦١١٠٠٠)کم٢.

(٥) مدغشقر لە ئۆقیانوسی هیندی رووبەری(٥٩٥٧٩٠)کم٢.

(٦) سومەترە لە ئۆقیانوسی هیندی – هێمن رووبەری(٤٢٥٠٠٠)کم٢.

(٧) هۆنشۆ لە ئۆقیانوسی هێمن رووبەری(٢٣١٣٢٠)کم٢.

(٨) بەریتانیای گەورە لە ئۆقیانوسی ئەتلەسی رووبەری(٢١٩٨٠٥)کم٢.

(٩) فیکتۆریا لە ئۆقیانوسی بەستوی باکور رووبەری(٢٠٠٨٠)کم٢.

(١٠) خاکی ئیلیسمیر لە ئۆقیانوسی بەستوی باکور رووبەری(٢٠٠٤٤٥)کم٢.

(١١) سیلیب لە ئۆقیانوسی هێمن رووبەری(١٨٩٠٣٥)کم٢.

(١٢) زیلندای نوێ ی باشور لە ئۆقیانوسی هێمن- هیندی – هێمن رووبەری(١٣٢١٧٤)کم٢.

(١٣) زیلندای نوێ ی باکور لە ئۆقیانوسی هێمن رووبەری(١١٤٨٠٠)کم٢.

(١٤) کوبا لە ئۆقیانوسی ئەتلەسی رووبەری(١١٤٥٢٤)کم٢[١].

---

(١) الموسوعة الكونية الكبرى/ ج٨/ ل: ٢٥١-٢٥٢.




**٤٢-٥٣-٥٤-٥٥: ئاوی ژێر زەوی و کانیاوو بیرو نافورەکان:**

**﴿يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ﴾**[١].

واتە: ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدەوە! ئایا ژێر زەوی ئاوی خۆی هەیە، ئەگەر بێت و بێتەدەر بتوانێ زەوی دابپۆشێت و لافاو پەیدا بکات؟! بێگومان ئەمە موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان بۆ زانایان و هۆشیاران!

وە قورئانی مەزن لە چەندان ئایەتدا ئاماژە بە گرنگی ئاوی ژێر زەوی دەکات، کە چاوگێکی گرنگی ئاوی سازگارە بۆ دانیشتوانی سەرزەوی سەرچاوەیەکی گرنگی ئاوی ژێر زەوی یە، کە لە شێوەی کانیاو و نافورەو بیر و بیری ئیرتوازی دێنە دەرەوە:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ﴾[٢].

واتە: ئەوە نابینن خوا ئاوی لە ئاسمانەوە باراندووە، ئەنجا کردونی بە چەند چاوگێ لە زەوی دا؟! ﴿يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ﴾ واتە: ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدەوە.

﴿فَقُلْنَا اضْرِب بِّعَصَاكَ الْحَجَرَ فَانفَجَرَتْ مِنْهُ اثْنَتَا عَشْرَةَ عَيْناً﴾[٣]. واتە وتمان: ئەی مووسا بە گۆچانەکەت لە تاوێرەکە بدە دوانزە سەرچاوەی لێوە هەڵدەقوڵن﴿فِيهِمَا عَيْنَانِ نَضَّاخَتَانِ﴾[٤]. واتە: دوو سەرچاوەی تێدایە بە تیژی هەڵدەقوڵن.

(ئاوی ژێر زەوی ئەو ئاوانەی خزاونە ناو زەوی و هەندێ لەو بۆشایی یانەی پڕکردۆتەوە یان هەموو ئەو کەلێنانەی دەکەونە ناو پێك هێنانەکانی تاوێری، کە لە بنەڕەتدا ئاوی بارانە، یان ئاوی رووبارە، یان ئاوی تواوەی بەفرو سەهۆڵە، بەشێ لەو ئاوانە دزە دەکات بۆ ناخی زەوی و ئاوی ژێر زەوی پێك دێنێت. ئاوی ژێر زەوی سەرچاوەیەکی گرنگی سەرچاوەکانی ئاوییە لە جیهاندا. هەندێ توێژەر بڕی ئەو ئاوەی لە ناخی زەوی دایە قەرساندویانە کە دەگاتە بڕی

---

(١) هود: ٤٤.

(٢) الزمر:٢١.

(٣) البقرة: ٦٠.

(٤) الرحمن:٦٦.





چینەکانی ئاوی کە هەموو سەر زەوی بە ئەستوری(٢٠٠-٦٠٠) پێ بەرز بێتەوە.

ئاوی ژێر زەوی چاوگی سەرەکی ئاوی سازگار و شیرینە و لەهەموو چاوگەکان فراوانترە و قەبارەکەی بە(٩٢,٦٪) ئاوی شیرینی زەوی دانراوە لە جیهاندا.

## ( ئاوی کانیاو )

(ئەو ئاوانەی بە شێوەیەکی ئاسایی لە عەمباری زەوی یەوە دەدەچن یان لە چینەکانی ئاوتێییەوە کە لە سەر زەوی دەردەکەون).

## ( نافورەکان )

(نافورەکان ئەو ئاوە گەرمانەن لە ناخەوە بە پری چەند مەترێ هەڵدەچن کە فشارەکی هیدروستاتیکی لە پشتەوەیە، ئەم ئاوانە لە قوڵایی زۆری زەوییەوە بۆ سەر زەوی بەرز دەبنەوە، دەبێتە هۆی بەرزکردنەوە گەرمایی ئاستی ئەو ئاوانە).

## ( بیری ئیرتوازی )

(ئەو ئاوانەن لە عەمباری ژێر زەوییەوە بەفشارەکی هیروستاتیکی دێنەدەر بۆ سەر زەمین[1].

## ( نمونەی نافورەکان )

لە(ئیسلەندا)دا(٨٠٠) ناوچەی گەرمی هەیە سەرباری سەدان نافورەو کانیاوی گەرم. لە(ریکیا نیك) پایتەختی ئیسلەندا، بە هۆی ئاوی گەرمی سروشتی کارگەکان گەرم دەکرێنەوە، بەڵام دانیشتوانی ئاسیای ئەوێ ئەو ئاوە بۆ شوشتن و دورست کردنی نان بەکاردێنن، ئەمەش لە رێگای لێدانی چاڵی بچووك لە زەوی دا وەکو نانەوایەکی گڵێن، لە شاری(هفیراگیرد)دا کە بە

(١) جغرافیا العالم/ ل: ٣٣-٣٤.

باخچەی کانیە گەرمەکان ناسراوە، ئاوی گەرم بۆ گەرم کردنی ئەو میوەو رووەکانە بەکاردێ کە لە خانەی شوشەی و نایلۆندا دەکرێن وەکو مۆزو کاهو(خەس) و تری و سالمە(السحلبیە) و گوڵەکان بەکاردێت). لێرەدا(نافورەی ئۆلد فیتفول) هەیە لەگەڵ باخچەی بەردە زەردەکان کە بەشێکە لە جوانیە سروشتی یەکان، باخچەیەکی کۆنی جیهانییە ساڵی(١٨٧٢) دامەزراوە و لە ئەمریکادا گەورەترینە.

بەشی باکوری لە ویلایەتی(وایومینگە) کە ناوچەیەکی بورکانی سەر رویی یە لە لوتکەی چیاکانەوە پڕە لە گردو چاوگی گەرم و دارستان، بەڵام نافورەی(ئۆلد فیتفول) ئاوەکی گەرمی هەیە، چالاکی ئەو بۆ(٢٠٠) ساڵ لەمەوبەر دەگەرێتەوە، (٤٥-٥٠) لیتر ئاو لەو ئاوە گەرمە بۆ(٣٠٠-٤٥)م بەرزدەکاتەوە لە هەر پێنج خولەکێکدا[١].

## ٥٦-٥٧: (سامانە ئاوییەکان) و سوودەکانیان و ڕاوی دەریا:

سودەکانی ئاوی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان لێرەدا دەردەکەوێت:

(١)(دەستکەوتی ئاوی سازگار، کە لە ڕێگای سازگار کردنی و شیرکردنی دا(التحلیە) دا دەبێت)[٢].

قورئان دەفەرمێ﴿وَمَا يَسْتَوِي الْبَحْرَانِ هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾[٣]. واتە ئەم دوو دەریایە چون یەك نین، ئەمە شیرین و سازگارە بۆ خواردنە ئاسانە، ئەوەی تریشیان سوێرو تفتە.

(٢) ڕاوی دەریایی﴿وَهُوَ الَّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتَأْكُلُواْ مِنْهُ لَحْمًا طَرِيًّا﴾[٤]. واتە: خوا ئەو خوایە بە ڕام کردوون تا گۆشتی ناسکی لێ بخۆن. ﴿أُحِلَّ لَكُمْ صَيْدُ الْبَحْرِ وَطَعَامُهُ مَتَاعًا لَّكُمْ

(١) عجائب الطبیعة/ ت. د: بسام محمد عیسی ل:١٥.

(٢) جغرافیا العالم / ل:٣٠.

(٣) فاطر:١٢.

(٤) النحل:١٤

وَلِلسَّيَّارَةِ﴾[1]. واتە: بۆتان حەڵاڵ کراوە ڕاوی دەریا وەکو سودێ بۆ ئێوەو سەفەر چی یەکان.

(ڕاوی دەریایی چالاکی یەکی ئابوری گرنگ پێك دێنێت بۆ دانیشتوان لە زۆربەی جیهانداو جێگایەکی جوگرافی گرنگیان هەیە بۆ هەبوونی(ماسی) یەکان، خۆراکی دروست و گرنگ بۆ مرۆڤ پێك دێنێت، سەرباری سوودی ماددی کە لە ڕاو دەست دەکەوێ، ئەم پیشەیە هەموو جۆرەکانی پێك دێنێ وەکو ڕاوی(ئیسفنج) و دەرهێنانی(مرواری)[2]. و مەرجان.

﴿يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾[3]. واتە: لە هەردوو دەریاکان مرواری و مەرجان(شیلان) دەردەهێنرێت.

ساڵانە نزیکەی(٤٠) ملیۆن تەن ماسی و بەرهەمی تری دەریایی بەدەست دەهێنرێت. ئەمریکای لاتینی(٣٥٪)ی ماسی دەریایی جیهان بەرهەم دێنێت. وەرزانە(١١٥) ملیۆن تەن مەتری لە ماسی دەریایی بەرهەم دێنرێ. (٨٠٪)ی ماسیەکان لە دەریاو ئەوانەی تر لە ڕووبارەکاندا دەکرێت[4]. وە نزیکەی(٢٠٠) ملیۆن کەس لە جیهاندا ڕاوچێتی ماسی دەکات و(٩٨٪)ی لەوڵاتە هەژارەکانە، بەڵام تەنیا(٥٠٪)ی بەرهەم مەکە بۆ ئەوانە.



### ٥٩- (ماسی و ئەهەنگ)

**﴿فَإِنِّي نَسِيتُ الْحُوتَ﴾ الكهف:٦٣.**

ماسی بە سەرچاوەیەکی گرنگی پڕۆتینی دادەنرێت، کەبۆ ئەتەمی لەش پێویستە وە چاوگێکی گرنگی یۆدوو فسفۆرەکە بۆ ددان و خوێن گرنگە و

(١) المائدة: ٩٦.

(٢) جغرافية العالم/ ٣٠.

(٣) الدواجن / أ.ج.باتريك وبي جي. شايبل/ ت: د: علي عبدالخالق الياسين/ ج١/ ل:٤٤٦ سەیرکە.

(٤)



چاوگەکی سەرەکی کالیسۆمەو، ڤیتامین(D-A)ی زۆر لە جگەری ماسی دایە. وە ماسی بەشێکی زۆری ترشی گلوتمیکی تێدایە پێویستە بۆ پیشەکانی مێشك و دەمارو ئەتەم.

وە ماددەی ئۆمیگای(٣)ی تێدایە، کەلە ڕۆنی ماسی و سامانی تری دەریایی دا هەیە پێچەوانەی کلورستۆڵەکە زیان بە دروستی مرۆڤ دەدات، ئەم ماددەیە لەش لە جەڵتەی خوێنی چەپاڵە دەدات. لەوانەش ماسی(تونە) و سەردین و سەلمون. ماسی وزەی جنسی بەلەش دەدات و مرۆڤ لە نەخۆشیە هاوچەرخەکان چەپاڵە دەدات[١].



## ٦٠- ( مرواری – اللؤلؤ )

**(يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ)[٢].**

واتە: دەردەهێنرێ لەم ددانە مرواری و شیلان. لێرەدا پرسیار دەکرێت ئایا ئەو(منهما) مەبەست لە دەریای سوێر و شیرینە؟ گەروایە چۆن مرواری و مەرجان لە هەردوو دەریادا دەژین؟ ( د: غلول دەڵێ: (مرواری و مەرجان) لە ئاوی سوێردا نەبێ ناژین، بۆیە مەبەست لە( بحرين) لە سورەتی(الرحمن)دا دەریای سوێر و سوێرە، ئەمەش لەڕوی ئیعجازییەوە گەورە ترە لە پێك گەیشتنی ڕوباری سازگاربە دەریای سوێر بۆ بەردەوام بونی ژیان لە زەوی دا[٣].

قورئان دەفەرمێ: (اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ)[٤]. واتە: مرواری شاراوە. کەئاماژەیە بۆ سەدەف(گوێچکە ماسی– المحار).

---

(١) الطب والحياة/ د: محمد جهاد شعبان/ ل: ٣٠٢ بەکورت کردنەوە.

(٢) الرحمان: ٢٢.

(٣) مدخل الى دراسة الاعجاز العلمي/ د: زغلول النجار/ ل: ٢٠٥.

(٤) الواقعة: ٢٣.

( مرواری لە گوێچکە ماسی دەردەهێنرێ بەزۆری لە دەریای گەرمدا دەردەهێنرێ وەکو دەریای سورو کەنداوی فارسی و دەریای یابان. یابانیەکان ئەو دوایە توانیویانە مرواری لە ناو گوێچکە ماسی وا پەروەردەبکەن کە تەنی نامۆ بخەنە ناو ئەو زیندەوەرەوەو ئەویش ماددەی کلسی بە سەردابرێژێت و ئەو مرواریە پێك بێنێت).

گوێچکە ماسی( المحار) گیاندارێکە لە پێری ڕێخۆڵەی بۆشایی( الامعاءالجوف)ە ، زیاتر لە( ٩٥٠٠) جۆرە، وەکو هایدراو لالەی دەریا(قناديل البحر) و مەرجان و هەڵاڵەی دەریا( شقائق البحر) و هی تر.

مەرجان(شیلان) : شوێنی مەرجان لە زەریا گەورەکاندا هەیە کە لە کەڵەبونی پەیکەری گیانداری مەرجان پێك دێت، لە کاربۆنی کالسیۆم پێك دێت، بەڵام گیانداری مەرجان ناتوانێ بەرگەی شەپۆلی ڕۆژانە بگرێ بۆیە هۆکاری دەرەکی دێتە گۆڕێ بۆچەسپاندنی کە قەوزەی مەرجانێ یە لە جۆری کورالیتس، بەرگەکی قەرەنفلی ڕەنگ لەجیری دەرێژێ پەیکەری مەرجانی مردو دادەپۆشێ یەك دەگرێ بۆ بەردی جیری کون کونی دەگۆڕێت .



## ٦١- ( ئیسفنج )

لە بەشی ئیسفنجی یەکانە، (٥٠٠٠) جۆرە، لە ناوی لێواری دەردێنرێ، لە(٦٠) مەتر قوڵترنەبێ، لە ئابووری دا بۆ پاکژی و پیشەسازی و جل وبەرگ و کەل وپەلی و پێڵاوو ڕایەخی ترومبێل سوودی لێ وەردەگیرێت.

قورئانی مەزن ڕاستی فەرموود:﴿ وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ﴾ فاطر: ١٢. واتە: خشڵ لە دەریا دەرَدێنن دەیکەنەبەردوە.

غەزالی(ر) دەفەرموێ: (بیر کردنەوە لە دروست کراوانی خوا لە قورئاندا هاتووە و هاتمان



دەدات بۆ ئەوە:﴿قُلِ انظُرُواْ مَاذَا فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾[1]. بەشێ لە نیشانەکانی خوا مرۆڤە کەلە سپێرمێ دروست کراوە، با مرۆڤ لە خۆی بڕوانێ، لە دروست کردنی ئەودا زۆرشتی سەر سورهێنەر هەیە بەڵگەیە لەسەر مەزنی خوای گەورە، کەمرۆڤ ناتوانێ لە دە یەکی دەیەکیشی بڕوانێ و دەمرێ و پەی پێ نابات، خوا فەرمانی کردووە بەسەیر کردنی خود﴿وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ﴾[2].

لە نیشانەکانی خوای ئەو گەواهیرانەیە لە چیاکاندا دروستی کردووە، وەکانزای زێر و زیوو فەیروز و هی تر، ئەنجا نەفت و کبریت و قیر و هی تر، لە نیشانەکانی خوا دەریایە گەورەو قوڵەکانن کە هەرێمی زەوییان داپۆشیوە، کە بەشێکە لەو دەریایە مەزنەی دەوری هەموو زەوی داوە، ئەوەی لەسەر زەوی وشکانی یە لە دەشتایی و چیاکان سەرباری ئاو وەکو دورگەیەکی بچووکە لە دەریایەکی گەورەدا، ئەوشتە سەیرانەی لە دەریاکاندایە چەند قاتی شتە سەیرەکانی وشکانی یە. بڕوانە دروست کردنی مرواری لە سەدەفی ناو ئاودا، بڕوانە چۆن مەرجانی ڕواندووە لە ناو تاوێری ژێر ئاودا، سەرباری شتی ترکە دەریای دەیهاوێ لە عەنبەر و شتی تر...[3].

## ٦٢- خوێ ی چێشت و هی تر

٣- هەندێ توخمی کانزایی لە دەریاکان دەرهاویشتە دەکرێ، وەکو خوێ ی چێشت(کلوریدی سۆدیۆم) کە توخمەکی سەرەکی یە لە دەریاکان و ئۆقیانوسەکان دەردەهێنرێت، نەك بۆ چێشت بەڵکو لە پیشەسازی فراواند بەکاردێنرێ، هەروەها لە پیشەسازی کیمیاویی دا، دیسان( مەگنیسیۆم) و(برۆم) و( یۆد) لە دەریاکان دەردەهێرێت .

وە دەرهێنانی پەترۆڵ و گازی سروشتی لە دەریاکان بە پەرەسەندنەکی گرنگ دادەنرێ لە ئابووری دا لە زۆر لە وڵاتانی جیهاندا، تابووە بە پێشبڕکێکەرێکی بەهێزی پەترۆڵ و گازی

(١) یونس:١٠١.
(٢) الذاریات:٢١.
(٣) مختصر منهاج القاصدین ابن قدامة اللمقدسي/ ل: ٤٨٠.



کیشوەری)[1].

پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی(لا تقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه...)،رواه مسلم. واتە: قیامەت نایەت تا فورات بە چیایەکی زێڕ نەگیرێ، خەڵکی لە سەری دەکوژرێت .

لێرەدا ئاماژەیە لە نزیکی ئەم کەنزە لە فورات، ئێستا خەڵکی بەو کەنزو زێڕە دەڵێن: زێڕی ڕەش، ئەمە مەبەستی فەرموودەکەیە، گەر ئەم چیایە زێڕە واقیعی بوایە لە مێژبوو خەڵکی لە سەری دەکەوتنە شەڕ[2].

تیغرۆ یەدەگی نەوتی خاو لە جیهاندا بە(١٠٠,٠٠٠) ملیۆن تەن دەخەملێنرێ و ساڵانە(٢,٧) ملیار تەن دەردەهێنرێ، بۆیەش وتراوە ئەم سەرچاوەیە گەورە تەنیا(٣٧) ساڵ خۆی دەگرێ و وشك دەبێ و، جەنگی کەنداوو لە شکر کێشی خۆرئاوا بۆ کەنداو و عێراق بۆ ئەمەیە. سعودیە لەیەدەگدا پلەی یەکەمی هەیە، بەڵام دۆزینەوەی یەدەگی پتر وەکو لە کوردستاندا مەترسی ئەمەی کەم کردۆتەوە.

ئاوکە بەزێڕی سپی ناسراوە کەم بوونی ئەویش و دابەزینی ئاستی ئەویش لە ژێر زەمیندا و جەنگی ئاویش لە داهاتوودا مەترسی یەکی ترە، وەکو قورئان هۆشیاری داوە﴿قُلْ أَرَأَيْتُمْ إِنْ أَصْبَحَ مَاؤُكُمْ غَوْرًا فَمَن يَأْتِيكُم بِمَاء مَّعِينٍ﴾[3].؟

واتە: تۆبڵی: ئایا گەر بینیتان ئاوەکانتان لێ ڕۆچون کێ ئاوەکی تری سازگارتان وەکو کانیاو بۆ دێنێتەوە؟ گەر ئێمە تەماشای کوردستانی خۆمان بکەین بەغونە بەهۆی وشکە ساڵی ئاستی ئاوی ژێر زەوی لە دابەزینی-بەرچاودایە، جۆگەکان و کانیاوەکان لە زۆر شوێن وشك بون یان لەکەمی دەدەن و، خەڵکی پەنایان بردۆتە بەر لێدانی بیرەکان بۆ ئاودێری کشتوکاڵی و خواردنەوە، بەتایبەتی لەلادێ یەکاندا. ڕۆژنامەی( هەولێر) دەنوسێ ( یەك لیتر ئاوی کانزایی

(١) جغرافية العالم/ ل: ٣٠.

(٢) العراق في القران والحديث/ محمد العرب/ ل: ١١٦

(٣) تبارك:٣٠.




تورکی لە بازارەکانی عێراقدا (١٥٠) سەنتی ئەمریکی یە لە کاتێ دا یەك لیتر نەوتی عێراق لە بازارەکانی جیهاندا کە مترە لە(٢٥) سەنتە).

دیسان نوسراوە روبارەکانی دجلە و فورات کەلە تورکیا وە هەڵدەقولێن سەرچاوەی سەرەکی ناوی عێراقن، بەلام لەم سالانەی دوایی دا بە هۆی دروست کردنی چەند بەنداوێکی نوێ لە تورکیا بڕی ناوی عێراق و هەرێم لەئاستی کەمی دایە. بەنداوەکانی ئێرانیش کاریگەریان لەسەر هاتنی ئاو بۆ عێراق هەبووە کە بۆتە هۆی کەم بونەوەی ئاو لە کەرتی کشتوکاڵی و خواردنەوە[1].

## ٦٢- نەهەنگی یونس (علیه السلام):

یونس یەکێکە لە پێغەمبەرە کوردستانیەکان و لە ناوچەی نەینەوا بووە، دیارە ناوچەی نەینەوا بەناوچەی چل پێغەمبەری ناسراوە، کوردستان وەکو باسکراوە جێگای ئادەم و شیت و نوح و ئبراهیم و ئەسباط و عوزێر و یونس و زەردەشت بووە، گۆڕی یونس و مەزارگەی لە نەینەوایە.

وەکو دەبینین پێغەمبەر(ﷺ) بەعەداس دەفەرمێ لە تالیف دا دوای موسڵمان بونی لە مەسیحی یەتەوە: (عەداس لە سەرکام ئاینەیت؟ من مەسیحیم خەڵکی نەینەوام. فەرمووی: (من اهل قریة الرجل الصالح یونس بن متی)[2].

ئەوەی لێرەدا ئێمە مەبەستمانە ئەو نەهەنگەیە یونس قوت دەدات دوای ئەوەی دەیەوێ لەرێگای دەریاوە رابکات لە دەست گەلەکەی وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: (فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ)[3].

واتە: نەهەنگ قوتی داو ئەو سەر زنیشتە کرابوو. بەپێ ی( مستدرك الحاكم) کە پێشەوای

(١) رۆژنامەی هەولێر/ ١٠/٥/٢٠٠٩.

(٢) سیرة ابن هشام/ ٢/ ٤٧. اسد الغابة/ ابن الاثیر/ ج ٣٠/ ل: ٢٣١.

(٣) الصافات:١٤٢.

فەرمودەزانان (حاكم) نوسیویەتی: ( عن الشعبی): ( ان یونس بن متـی التقمـه الحـوت ضـحی و لفظه عشیة). لێرەدا بە سەرهاتی دەگێرینەوە کە موعجیزەی نەهەنگی یونس زیاتر لـە ناخمانـدا جێگیر دەکات و، پەرچی ئەوانەش دەداتەوە کـە نکـۆڵی لـەم ڕووداوەیـە دەکـەن: ( لـە پـایزی( ١٨٩١) دا لە دوورگەی (فوکلانـد)دا، ئـەم ڕوداوە لـە پـاپۆڕی(Star of the east)دا رویـدا، کەشتی یە وانەکان بالینەیەك کە لە نەهەنگە قەبەکانە دەخەنە بۆسەوە بۆ ڕاوکردن، لە ئـەنجامی شەپۆلی دەریایی گەورە(جێمس بارتلی) کە یەکێکە لە ڕاوکەران دەکەوێتە ناو دەریـاوە. هـەموو هەوڵەکان بۆ رزگار کردنی بێ هودە بوون، کەشتی یەوانەکان ناتومێد بـوون. کـاتێ نەهەنگـەکی قەبەیان ڕاوکرد بینی یان نەهەنگێ سکی هەڵاوسـاوە، کاتـێ چـەقۆ تیـژەکانیان گەیانـدە سـکی بەمەبەستی هەڵدڕینی واقیان ورما، بینی یان هەڵاوسانەکە تەنیا(جـێمس بـارتلی) بـە کـە ڕۆژو دانێکە کەوتۆتە ناو دەریاوە، دوای دەرچونی لە ناو سکی ئەم نەهەنگەدا بەسـاغی چـەندان سـاڵ بوو ئاماژەی بۆ دەکرد، ئەم بەسەرهاتە نوسەری ئەمریکی(کانت سمیـت) بـە جیهـانی دا پـەخش کرد. ئەم کەشتی یەوانە ڕۆژو نیوێ لەسکی نەهەنگەکەدا مایەوە، زانراوە ئەم نەهەنگانە دەتوانن تەنێ خواردن هەڵبلوشن، ئەم ڕادە خواردنە برە ئۆکسجینێ لەسکی نەهەنگدا پەیـدا دەکـات کـە مرۆڤ بتوانێ شەو و ڕۆژێ بەکاری بێنێت. لە(مستدرك الحاكم) داهاتووە وەکو باسکرا کە(یـونس) شەو و ڕۆژێ لە سکی نەهەنگەکە دا مایەوە. دەریاوانی گەورە(جاك کۆستۆ) بە جیهانی ڕاگەیاند لە لێکۆڵینەوەکەیدا( ئەو نەهەنگـەی یونـسی قـوت دا) : ( زۆر ئاسـانە ئـەم جـۆرە نەهەنگانـە مرۆڤەکی(٥٠٠)کیلۆگرامی قوت بدەن) [١].

(١) التربیة الاسلامیة/ حزیران/ ١٩٨٧/ العدد العاشر/ سنة ٢٨ / بغداد/ ل: ٤٨.





## ٦٤- (بونی بەربەست لە میان دوو دەریا دا)

**(وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا)**[1]. واتـە: لـە نێـوان دوو دەریـادا بەربەسـتێکی دروست کردووە. بێگومان گەر ئێمە سەیرێکی هەندێ لە تەفسیرە کۆن و نوێیەکان بکەین وەکو(تفسير ابن كثير) و(صفوة التفاسير) لەوێ دا هاتووە. (واتـە : خـوا لـە میـان ئـاوی شـیرین و سـوێردا نێوانەکی دروست کردووە ئاوێتەی یەکتری نابن). ( د: زغلول النجار)ی زەوی ناس دەڵێ: (لێرەدا مەبەست لە رووباری سازگار و دەریای سوێرە کە تێکەڵ نابن، لە هەمان کاتیـشدا هەنـدی جـار مەبەستی دوو دەریای سوێریشە کاتێ لە سیفاتی سروشتی و کیمیایی دا لـە یـەکتری جیـاوازن( مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَـانِ. بَيْنَهُمَـا بَـرْزَخٌ لَّـا يَبْغِيَـانِ)[2]. واتـە: هـەر دوو دەریـا کـە تێکـەڵ بـوون پەردەیەکیان لەمیان ئاوێتە نابن. لێرەدا ئەم دوو دەریایە(البحر) مەبەست لـە دەریـای سـوێرو دەریای شیرینە کەرووبارە، بەڵام کە(البحر) بە تەنیا هات ئەوە بـەرەهایی مەبەسـت لـە دەریـای سوێرە. وەکو(وَسَخَّرَ لَكُمُ الْفُلْكَ لِتَجْرِيَ فِي الْبَحْرِ بِأَمْرِهِ وَسَخَّرَ لَكُمُ الأَنْهَارَ)[3].




(١) النمل: ٦١.

(٢) الرحمن: ١٩-٢٠.

(٣) ابراهيم:٣٢.

واتە: کەشتیمان بۆ ڕام کردوون تا بە دەریادا بڕوات بە فەرمانی ئەوو ڕوبارەکانی بـۆ ڕام کـردون. ئەنجا لە ئایەتی( مرج البحرين) بەرەهایی لە سورەتی( الرحمن) دا﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ. بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ. فَبِأَيِّ آلَاء رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ. يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ﴾. دیسـان مـرواری و مەرجان لە ئاوی سوێردا نەبێ نازێن، هەر چەندە هەندێ سەدەفی مرواری لـە ئـاوی شـیریندا بـە دەستکردی ڕوێنراون، کەواتە: کۆبونەوەی دووئاو لە سورەتی ڕەحمانـدا مەبەسـتی لـە ئـاوی دوو دەریای سوێرە.

دیسانەوە قورئان ئاماژە بە مەزنی بەربەستی نێوان دەریای شیرین و سوێر دا دەکات بـە( البرزخ) و(الحجر المحجور ) لـە بـەربونی لیتـەو پێـشەکیەکانی و بەربەسـتی تـری نیـشتەنی تـری دەوریان، سەرباری ئاوی ئاوەڕاست لەمیان ئاوی شیرین و سـوێردا لەسەر لێوارەکانی ئاوی شیریندا لە تەك خۆلێکدانی هەردووك ئاوەکەدا و، بوونی بارگەی کارەبایی چون یەك( المتشابە) و ناچـون یەك( المتنافر)دا لە ئایۆنەکانی خوێ ی تواوە دا لە ئاودا، وە لە بەرامبەردا ئاماژەی قورئانی بـۆ بەربەست لە میان دوو دەریادا بەبێ دیاری کردن و بەوشەی( البرزخ) یان( الحـاجز)دا، ئـەوە ئـەو بەربەستەیە لە نێوان دوو ئاودایە کە لە سیفەتی کیمیایی و سروشتی دا لێـك جیایـە، وەکـو دوو دەریای سوێر کە ئاسۆیانە( أفقيا) یان شاوڵی یانە( رأسيا) لێـك جیـاوازن، چـونکە ئـەم جـۆرە بەربەستە زیندەوەر لە هاتووچۆ بۆ بارستایی ئـەویتریان قەدەغـە ناکـات کـە هاوسـێ ی ئـەوە، مەگەر زۆر لێك دووربن لە سیفاتدا، دیسانەوە زیندەوەران بەیەکجاری قەدەغەناکات، ئەنجا ئەمە بۆ غەیری پسپۆڕان نەبێ دژوارە پەی پێ ببردەرێت.

دوا خاڵ ئەوەیە سەلماوە هەمە جۆری نێوان دوو بارستایی هاوسێ بە ئاسـۆیی یـان شـاوڵی (شاقوڵی) لە میان دوو دەریای هاوسێ دا ولەناو یەك دەریای قوڵ و ئۆقیانوسـەکاندا بەشێکە لـە پێویستی هەمە جۆری ژینگەیی( البيئي) لەو دەریایەدا، گەر نەبوایە ژیان بە تەواوی لە دەریـادا گرژدەبوو. ئەم بارستایی یە ئاوییە هاوسێ ی یەکتری دەبن و تێکەڵ دەبـن بـێ ئـەوەی ئاوێتـەی یەکتری بن بەتەواوی، هەر چەندە شەپۆل و تەوژمی دەریایی بـە هـۆی چـالاکیەکانیان دەخـوازن هەردوو بارستاییەکان ئاوێتەی یەکتری بن، بەڵام هەرچی لە دەستیان دێ پێك هێنـانی پـشتێنەو





ـەربەستێکە لە ئاوی ئاوەڕاستی لە سیفەتەکانیاندا، لە هەموو بارێکدا ئەم پەردەیە کـار دەکـات ـۆ هێشتنەوەی ئەو بارستایی ئاوییە کەهاوسـێ ی یـەکترن بەتـەواوی لـە یـەکیان دابـڕێ، وەك ـەوەی هەر کامێکیان بەتەواوی سەربە خۆبن. وەبارستایی ئاوی هاوسێ لەگەڵ دەریا هاوسێکانی ـیفاتیان جیایە لەیەك دەریاشدا، هەر چەندە دەریاکان چونیەکن لە سیفاتی سرۆشتی و کیمیـایی ـاو بڕێکی زۆری ئۆقیانوس و دەریایە گەورەکانی دادەپۆشێ، چونکە پێوانـەی بـڕێ لـە سـیفەتە کیمیایی یەکان و سروشتی یەکان وەکو پلەی گەرمی و ڕێژەی خوێ و چڕی و ڕێـژەی ئۆکـسجینی تواوە لە ئاودا، بونی جیاوازی بینراو لەو سیفاتانەدا لەبارستایی یەکەوە بۆ بارسـتایی یـەکی تـر تالەیەك دەریادا سەلماوە، لەگەڵ بونی ئەم جیاوازییانە مۆڵگەی زینـدەگیش لەناویانـدا جیـاوازە، ـیسانە جۆری نیشتوەکانی دیارە.

ئەم ڕاستی یانەش لە کۆتایی یەکانی سەدەی(١٩) دا پەیان پـێ بـرا لـەکاتی گەشـتەکەی پاپۆڕی توێژینەوەی بەریتانی دا بەناوی( رحلـه التحـدی- The challenger Expedition) کە لەمیان(١٨٧٢- ١٨٧٦) دا هاتەدی. سەلما کە ئاوی دەریاو ئۆقیانوسەکان بۆ چەند بارستایی یەکی ئاسۆیی و شاوڵی دابەش دەبن.

گۆڕانەکانی شاوڵی( الرأسی) لە سیفاتی ئاوی دەریاو ئۆقیانوسـدا هەمیـشە خێراتـرە لـە گۆڕانە ئاسۆیی یەکان( الافقیـە)، ئـەدگاری شـاوڵی هەمیـشە بەرجەسـتە تـرن لـە لـەجیاکاری ئاسۆیی. بۆ نمونە پلەی گەرمی ئاو لەیەك هێڵـی یەکـساندا لـە(٢٥)ەس یـەوە لـە ئاسـتی ڕوی دەریاوە بۆ(٥)° س دادەبەزێ لەسەر قوڵایی یـەك کیلۆمـەتر، کەچـی ئاسـۆیی یانـە لـە دووری نزیکەی(٥٠٠٠) کم نەبێ بۆ باکوور و باشووری هێڵی یەکسان بۆ ئەم ئاستە دانابەزێت.

سەرباری ئەوەش گۆڕانەکانی ئاسۆیی لە سیفاتی سروشتی و کیمیایی دا بەرپادەبن لەگـەڵ گۆڕانە شاوڵی یەکانیش دا دەبینین بارستایی ئاوی لە دەریاکان و ئۆقیانوسـەکاندا لەسـێ دوریـە جێگاکانی دا دەگۆڕێ، لەگەڵ شەو و ڕۆژدا، واتە لەگەڵ کاتدا. لێرەدا بارستایی ئاوی سـەر ڕووی ئاو هەیە بۆ قوڵایی(٤٠٠)م لە هێڵی یەکساندا ولە(٩٠٠) مـەتردا لـە هێڵـی پـانی( ٣٠)دا بـۆ باکوور و باشووردا درێژ دەبێتەوە، کاتێ لەپلەی گەرمی دا لە هیکرا پلەی دادەبەزێ، هەر چەندە




ئاستی هەرەنزمی چالاکی ڕووی ئاو لە دەریا و ئۆقیانوسدا( ۲۰۰- ۳۰۰)م لە ژێر ئاستی ڕووی دەریادا، ئەوکاتە گۆڕانەکی دیار دەردەکەوێ کەبە چەمانەوەی چڕی( منحنى الكثافة) ناسراوە.

**بارستایی ئاوی قوڵایی مام ناوەند هەیە:** بۆ قوڵایی( ۱۵۰۰)م لە ژێر ڕووی دەریاوە درێژ دەبێتەوە، ڕێژەی خوێ و پلەی گەرمی ڕۆشن دیارە، چونکە ئەو ئاوە لە چاوگە سەر ڕویی یەکانی جیا جیاوە دەجولێت. بە تایبەتی لە ناوچەی جەمسەری باشوور هەیە و ئاوی سارد هەڵدەچێت بە ئاراستەی باکوور تادەگاتە هێڵی پانی(۲۰) پلە بەرەو باکوور لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی دا تا هێڵی پانی(۱۰) پلە بۆ باشووری هێڵی یەکسان لە زەریای هیندی و هێمندا. ئەو ئاوە ساردە لە جەمسەری باکوورەوە بۆ باکووری هەر یەك لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی و هێمن درێژ دەبێتەوە لە بەشی خۆرئاوایاندا چەقی دەبەستێ وبە هۆی بەستەڵەکیەکەی خوێ ی زۆرتردەبێ و چەقی خوێ یەکەی بۆ ئەو ناوچانە دەجولێت.

**بارستایی ئاوی قوڵ و زۆر قوڵ:** دیارترین نمونە لەبەشی باکووری خۆرئاوای ئۆقیانوسی ئەتڵەسی یە، ئەم ئاوە لە تێکەڵ بوونی ئاوی زۆر سوێر دروست دەبێ بەهۆی تەوژمی کەنداوی فلۆریدا پاڵ دەنرێ، ئەو ئاوەی لەناوچەی نیمچە بەستەڵەك دێ لە باکوورەوە زۆر ساردە بەتایبەتی زستانان، کەبە( بارستایی قوڵی ئەتڵەسی) ناسراوە و ژێری ئەم ئۆقیانوسە پردەکاتەوە تا هێڵی پانی(۳۰) پلە لە باکوورەوە،بەڵام بەرەو باشوور بڕوات لە نێوان بارستایی ئاوی قوڵی ناوەڕاست وهەرە قوڵدا هاوڕێك دەبێت، چونکە سەر ئاوی جەمسەری ساردی باکوور دەکەوێ کە زۆر چڕو سوێرە و هەریەکە لەم دوو بارستایی یە ئاوی یە هاوسێ یە شاوڵی و ئاسۆیی سیفاتی سروشتی و کیمیایی خۆیان دەپارێزن.

پلەی گەرمی ئەو ئاوە قوڵە لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی دا نزیکەی(۳)° س . لە ئۆقیانوسی هێمن و هیندی دا جگە لە هەندێ گیرفانەی بچوك لەهەرکامێکیاندا لە ئۆقیانوسی هیندی و هێمندا. هەرچی بارستایی ئاوی فرە قوڵە بەسەر ژێرەوەی ئۆقیانوسی جەمسەری باشووردا بڵاودەبێتەوە، لە هەموو ئاوەکانی سەر زەوی چڕترە ولەدەوری کیشوەری جەمسەری باشووردا کۆدەبێتەوە، ئەو ئاوە زۆر ساردو سوێر وچڕە لەوێ کۆدەبێتەوە لە باکوورەوە بۆ بنی ئۆقیانوسە





سەرەکیەکان( هێمن، هیندی، ئەتڵەسی) تادەگاتە هێڵی پانی(٣٠)پلە لە باشووردا.

ئەو بارستایی یە ئاوەی بن جەمسەری باشور لەبنەڕەتدا لە بەستنی ئاو پێك دێ بەبڕەکی زۆر بەسەر ڕەسیفی کیشوەری داو بڕەکی زۆر سامانی خوێ ی بەجێ دێڵێ کە پاڵی دەدات بەرەو ناوچە لێژەکانی کیشوەری تا لەگەڵ بڕەکی یەکسان لەگەڵ بارستایی ئاوی سەر ڕوویی تێکەڵ ببێ لە دەوری جەمسەری باشووردا ئەم ئاوە دروست دەبێ، کە بەساردی زۆر جیادەکرێتەوە، هەروەها بەچڕی بەرزی ئاوی و ڕێژەی بەرزی سوێری لە سنوری(٤٧, ٣%) دا.

ئاو ئاسۆیی لە دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا بە هۆی(با) و تەوژمی دەریایی و هەموو شەپۆلەکی تری سەر ڕوویی و ئاوەوەی دەجولێ، بەلام شاولی یانە بەهۆی زۆری چڕی و یان کەمیەکەی دەجولێ، کە بەهۆی جیاوازی پلەی گەرمی و ڕێژەی خوێ ی تواوەو یان ئاو هەردوکیان دێتە بەرهەم لە ئاکامی ئەوەی ئاوی سەر ڕوو توشی بونە هەڵم و باران دێ، یان ئاوی قولایی لە سەر بنی دەریاکان و زەریاکان توشی چالاکی بورکانی دێت. یان توشی هەندێ جیاوازی ڕێژەی خوێ ی تواوە دێ بە هۆی تێکەلاو بوونی لەگەڵ غەیری خۆیدا لە بارستایی ئاوی دا، گەر چڕی ئاوەکە پتربوو ئاوەکە لە سەرەوە بۆ خوارەوە دەجولێ، گەر کەمتر بوو بەپێچەوانەوە.

**جیاوازی لەمیان ئاوی نیمچە داخراو وکراوە دا:** جیاکاری لەمیان بارستایی ئاوی هاوسێ زیاترە نەك لە نێوان دەریای کراوەو نیمچە داخراودا، وەکو دەریای سپی ناوەڕاست کاتێ لە تەنگەبەری چیای( تاریق)دا بە ئۆقیانوسی تاریکی( ئەتلەس) دەگات، یان( دەریای سور) کاتێ بە( کەنداوی عەدەن) دەگات بە سەر( باب المندب)دا، کەنداوی فارسی( عەرەبی) کاتێ بە کەنداوی( عمان) دەگات بەسەر تەنگەبەری( هورمز)دا و( دەریای ڕەش) کاتێ بە دەریای( ئیجە) دەگات بەسەر دورگەی( بوسفور)دا.

ئاو لە دەریای سپی ناوەڕاستدا وردە وردە خوێ ی زیاد دەکات، چونکە ئەو ڕێژەیەی ئەوەی سالانە دەبێتە هەڵم سێ هەندەی ئەو بڕەیە دەبێتە باران و ئەو ڕووبارانەی دەڕژێنە ناویەوە، بەتایبەتی دوای تەواو بوونی پڕۆژەی بەربەستی( عالی) لە سالی( ١٩٧٠)دا، ئەمەش





بەتەوژمی ناوی ڕووبی ئۆقیانوسی ئەتڵەسی قەرەبوو دەکاتەوە کە بەناو تەنگەبەر(گەرو)ی (تاریق)دا بۆی دەچێت، هاوتەریبی کە ناری باکووری کیشوەری ئەفریقیا پاشان پێچەوانەی میلی سەعات بەرەو خۆرهەڵات دەجولێ،( ۸۰)م پێك دێنێ لە سەرودا لەناوی دەریای سپی ناوەڕاست تا بەردەوام ناوەکە نوێ بکاتەوە، دیسانەوە دەریای سووریش بەهەمان شێوە کە درێژی (۲۰۰۰)کم دەبێت قوڵی(۲۹۲۰)م، ناوی زۆر گەرمو سوێرە، لای ناوەندی ناوی بووە هەڵمی ساڵانەی (۲۰۰)م دەبێت.

ئەم دەریایە لە(۵۰)مەتری ژێرەوەیدا پلەی گەرمی( ۵۰- ۱۰۰)° س دەبێ و سوێریەکەی هەشت قاتی سوێری دەریا و ئۆقیانوسەکانە، واتە(۲ ,۲۷٪ )ەوە. ناوی گەرمی سوێری چڕ لە دەریای سورەوە بۆ کەنداوی عەدەن بە( باب المندب) دا پاڵ دەدرێ دەچێتە ژێر ئۆقیانوسی هیندییەوە بە قوڵایی(۸۰۰)م لە ژێر ئاستی ڕووی دەریاوە و تەزووی ناوی پێچەوانە هاندەدات لە کەنداوی عەدەنەوە بۆ ناو دەریای سور و ناوێ هەڵدەگرێ چڕی و گەرمی و سوێری کەمترو ئۆکسجینی تواوەی پترە.

هەرچی کەنداوی فارس(عەرەب)یە ناوی سوێری گەرمی بۆ کەنداوی عومان پاڵ دەدات بە گەرووی هورمزدا لە قوڵایی نزیکەی( ۳۰۰)م لە ژێر ناودا پەی پێ دەبرێ لەبەشی باکووری ئۆقیانوسی هیندی داو، تەزووی پێچەوانە لە کەنداوی عومانەوە کەنداوی فارس پاڵ پێوە دەنێت.

بەم شێوەیە ئەم ناوەندەیە بەناوی(ناوی تێکەڵ) و(بەرەی ناوی جیاکەرەوە لە میان دوو بارستایی هاوسێ) ناو دەبرێ کە قورنان بە( البرزخ) یان( الحاجز) ناوی دەبات واتە:( بەربەست — پەردە)، کە پەردەیەکی ڕاستی یە هەر چەندە بەرێگای ڕاستەوخۆ نابینرێت، چونکە دوو بارستایی گەورەی ناوی هاوسێ لێك جیا دەکەنەوە لەگەڵ هەبوونی چالاکی تەوژمی و شەپۆلی دەریایی، بەم شێوەیە ئەم بەربەستە( الحاجز) پێك دێ کە زیادو کەمی هەیە تا لەناوەچێ تاخۆی سەر لەنوێ لەمیان دووبارستایی ناوی تردا بنیات دەنێتەوە.

وا دەردەکەوێ کە بارستایی یە ناوەکان لە یەك دەریادا چۆن یەکن، بەهۆی شیتەڵی کیمیایی وردو وێنەگرتنی ئاسمانی بەهۆی( تیشکی ژێر سور) بەتەواوی جیاوازییان دەردەکەوێ بۆ بارستایی هاوسێ ی یەکتری بەپەردەی نادیار، بەبێ ئەوەی بەتەواوی تێکەڵ بن بۆ ئەو بارستایی





یە هاوسێیە دەگۆڕێت لە ئاسۆ و شاوڵی دا. بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی بەر لە( ١٤٠٠) ساڵ ەرمویەتی﴿وَجَعَلَ بَيْنَ الْبَحْرَيْنِ حَاجِزًا﴾ ئەمە ڕاستی یەکە لەساڵی( ١٨٧٢-١٨٧٦ ز)دا زانراوەو، تەنیا لە چلەکانی سەدەی بیستەمدا بەتەواوی والآبوو زانایانی پسپۆر قبوڵیان کرد[1].

## موسلمان بوونی دەریاوانی ناودار (کابتن کۆستۆ):



بێگومان ئۆقیانوسەکان پڕن لە نهێنی و راز کە زانستی نوێ پەی بەزۆرێ لەوانەبردووە، قورئانی مەزنیش ئاماژەی بە هەموو ئەم ڕازە گەورانە کردووە، ئەم زانست و ئیعجازانەش خەڵکی زۆری ڕاپێچ کرد کە کورنوش لەبەردەم مەزنی کردگار ببەن. یەکێ لەوانە دەریاوانی ناودارو داهێنەر پرۆفیسۆر و زانا(جان کۆستو) بوو کاتێ بینی ئەو زیندەوەرانەی لە دەریای ناوەراست و ئۆقیانوسی ئەتڵەسی دا دەژین کە هاوسێ ی یەکن لە پێك هاتندا لێك جیان. ئەم زانایە دەڵێ: (دەستەی توێژینەوەی ئەڵمانیا لە دەریازانی دا بەر لە خۆمان تێبینی بەربەستی نێوان دەریای سورو زەریای هیندی کردبوو، ئەمەش لە گەروی(باب المندب)دا لێرەدا تەوژمەکی تری ئاوی هەڵدەستێ دووبارە ئاهێڵی ئاوەکان ئاوێتە بێ و هەر یەکەکیان تایبەتی خۆی هەیە بە رووەك و گیاندارەوە). ئەم زانایە دوای سەیرکردنی قورئان کە وەرگەراوە بۆ زمانی ئینگلیزی و ئایەتی﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ﴾ الرحمن:١٩-٢٠. ڕای گەیاند: (ئێستا بە

(١) بەکورتی کردنەوە لە( مدخل الی دراسة الاعجاز العلمي/ الاستاذ الدکتور: زغلول النجار/ لبنان/ط ١/ ٢٠٠٩/ ل:( ٢٠٣- ٢١٣)وەرگیراوە.




دڵنیایی بەوە من گەواهی دەدەم قورئان سروشی خوایە و موحەمـەد(ﷺ) پێغەمبـەری خوایـەو زانستی نوێش بەئارامەوە(١٤٠٠) ساڵە سۆراخی ئەوە دەکات ئەو لەگەڵ خۆی دا هێناویەتی).

لەمەش سەیرتر دۆزرانەوەی ماسی یەکە بە نـاوی ماسـیە پەپولـە(hitory of fishes)، ئەم جۆرە ماسیە ناوە زانستیەکەی(pomacanthus semicirulatus) کەلە ئەفریقیادا هەنـە لە ناوچەی(زنجبار) و(دار السلام)دا، هەموو ئەم ماسیانە خودا مۆری کـردون بـە ئاشـکرایی لـە لایەکیان نوسراوە(لا اله الا الله) و لەلای تریـان نوسـراوە(شـأن الله) [1]. ئەمـەش بەشـێکە لـەو موعجیزانەی خوا بە ئاشکرایی لە دەریاکانی دا پیشانی مرۆڤایەتی داوە، تا ئەو خودایە بناسـن کە کردگاری وشکانی و ئاوو زەوی و گشت بونەوەرە!



## ٦٥-٦٦- ئـــاگری نـــاو زەریاكـــان و دەریاكـــان و مەبەســـت لـــە( وَالْبَحْـرِ الْمَسْجُورِ):

﴿وَالْبَحْـرِ الْمَـسْجُورِ﴾[2].

واتە: سـوێند بـە دەریـای(پـڕ) یان(گڕگرتوو): خاوەنی تەفسیری (الکشاف) کە باشترین تەفسیرە لە ڕاست ئەم وشەیە(الْمَـسْجُورِ) دەفەرمێ: (المملـوء) واتـە(پـڕ) وتراوە(الموقدة) واتە: داگیرســاو.

(الراغب) دەڵێ: (الـسجر: تهيج النار، يقال سجرت التنور) وەکو(وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ).

---

(١) مجلة التربية الاسلامية/ العدد:٨ السنة/ ٢٧. و العدد العاشر/ حزيران/ ١٩٨٧/ بغداد/ ل:٤٤-٤٥ سەیر بکە.

(٢) الطور:٦.



**( ڕاڤەی زانستی جیۆلۆجی )**

(١)( وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ) واتە: دەریای پڕو گەورە و دوور لە وشکانی: بەڵێ وەکو باسکرا زەوی لە کۆمەڵەی خۆر دەوڵەمەندترین هەسارەیە لە ناودا بڕی ناوی سەر رووی بە(١٣٦٠-١٣٨٤) ملیۆن کم٣ قرسێندراوە.

ساڵانە(٣٨٠,٠٠٠) کم٣ دەبێ بە هەڵم بۆ ئاسمان تابە ئاوەکی سازگاری بۆ زەوی بگێڕێتەوە بە سیستەمێکی داخراو(وەکو باسکرا). ئەم ئاوەش سەرەتا خوداوەند لە زەوی دەرچواند کە لە کونی بورکانەکانەوە و درزی قوڵی تاوێرەکانی ناو زەوییەوە تا لە ئاسماندا بەرچینی سارد بکەوێ لە بازنەی گۆڕانە کەشی یەکاندا، کە لەسەر رووی زەوی یەوە بەرز دەبێتەوە بۆ(١٦)کم لە ئاست رووی دەریاوە لەسەر هێڵی یەکسانەوەو(١٠)کم لەسەر هەردوو جەمسەرەکانەوە، تابەرز بیەوە لەو ناوچانە پلەی گەرمی نزم دەبێتەوە تا دەگاتە(٦٠)° س لە ژێر سفرەوە لە لوتکەیدا ئەو بازنەیە(٦٦٪)ی بەرگە هەوا پێك دێنی و بە لای کەمی بە(٥٠٠٠) ملیۆن ملیۆن تەن خەملێنراوە.

ئەوە ئەو بازنەیەیە هەڵمی ئاوی سەرکەوتوی تێدا سارد دەبێتەوەو هەوری تێدا پێك دێت و باران و تەرزەو بەفری لێوە دەبارێت و ڕواڵەتی بروسکەو تریشقە و گرمەی هەردوو گەردەلولی هەوایی تێدا روودەدات، دیسان دیاردەی تری هەوایی، گەر ئەم ساردبوونەوەیە لەگەڵ ئەم بەرزییەدا رووی نەدابایە ئەو هەڵمە بۆ زەوی نەدەگەرایەوە.

کاتێ هەڵمەکە وەکو باران و بەفرو تەرزە گەرایەوە زەوی بەسەر رووی زەوی دا لێژ دەبێتەوە تا کۆمەڵێ جۆگە پێك دێنێ، پاشان دەرواتە نزمایی یەکانی گەوردی زەوییەوە تا نۆقیانوسەکان و دەریاکان پێك بێنێت، بە دووبارەکردنەوەی کرداری بەهەڵم بوون لەسەر نۆقیانوس و سەر وشکانی یەوە لە ئاوەکان و زیندەوەرانەوە کرداری سوڕی ئاو دەستی پێ کرد تا بەردەوام ئەو ئاوە خاوێن بکاتەوە، هەوا ساف و بێ گەرد بکات و ڕێگا و بانەکان شەق بکات و بدرێ و تاوێرەکان هەڵوەشێنێ و سەر رووی زەوی هەموار بکات و خاك پێك بێنێت و کۆمەڵە کانزایەك عەمبار بکات، شتی تریش لەو شتە گرنگانەی کردگار بە سوڕە موعجیزەیەی

سپاردوون، کە(٣٨٠,٠٠٠)کم٣ ساڵانە ئاو هەڵدەگرێ بۆ بەرگە هەوا تا بە خاوێنی بیگێڕێتەوە سەر زەوی.

بە هەمان نزیکی ئەو بڕەی بووە بە هەڵم. ئەم سوڕە قایمە لە دەوری زەوی دا بووە هۆی خەزن بوونی زۆربەی ئاو لە دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا بە ڕێژەی نزیکەی(٩٧,٢٪) و هێشتنەوەی نزیکەی(٢,٨٪) لە وشکانیدا. بەم سوڕەییەی ئاو لە دەوری زەوی ئاوی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان دەبێ بە سوێراوو بەشەکی کەم لەو ئاوە بە سازگاری لەوشکانی دادەمێنێتەوە.

بەڵام ئەم ڕێژەیە کەمەش لە ئاوی سازگار زۆربەی بە ڕێژەی(٢,٠٥٢٪ -٢,١٥٪) بە شێوەی بەستەڵەک لەسەر هەردوو جەمسەرەکان گڵدراوەتەوە، یان لە لوتکەی چیاکانداو، بەشەکەی تر بە ڕێژەی(٢٧,٠٪ - ٥٠,٠٪) لەناو کون و کەلەبەرەی تاوێرەکانی زەوی دا عەمبار کراوە، وە لە دەریاچەکاندا نزیکەی(٣٣,٠٪) ئاو هەیە، بە ڕێژەی(١١,٠٪ - ١٨,٠٪) شێ ی خاك هەیە، شێ ی هەوای زەوی لەمیان(٠٠١,٠٪ - ٠٣٦,٠٪) هەیە. ئەوەی بە ڕووبارو جۆگەلەکاندا دەڕوات(٠٤٧,٠٪)ە.

ئەم دابەش بوونەش بەم ڕێژانە بە ئەندازەیەکی پێویست و هاوسەنگە، گەر کەمێ زیادو کەمی لەم ڕاددەیە هەبوایە سەر زەوی دادەپۆشی، یان بڕەکی زۆری بە وشکانی بەجێ دەهێشت و پێویستی یەکانی ژیان دابین نەدەبوو.

لەم ڕوانگەوە زانایان پێیان وایە گەر بەستەڵەکی سەر هەردوو جەمسەرەکان بتوێتەوە، یان لەسەر چیاکانی سەری یان، ئەمە پێویستی بە(٦,-)° س لە هاویندا، گەر ئەمە ڕوویدات ڕێژەی ئاوەڕۆ بۆ ناو ئۆقیانوسەکان پتر دەبێ ئەو کاتە ئەو دانیشتوانەی دەوری ڕۆڵی کەنار ڕووبارو دەریاو ئۆقیانوسەکان دادەپۆشێ، ئەمەش خەیاڵەکی زانستی نییە، زۆر سەردەم بەسەر زەوی دا هاتووە ئاوی دەریاکان وشکانیَ پتری داپۆشیوە لە کەنارەکاندا، زۆر سەردەم ڕۆیشتووە ئاوی کەنارەکان پتر کشیوەتەوە لە ئێستاو وشکانی فراوانتر بووە ئەوەی ئەم جڵەوەی ڕاگرتووە بڕی ئەو بەستەڵەکە بووە کە لەسەر وشکانی کەلەکە بووە. تالێرەدا سوێندی خوای گەورە دەردەکەوێ کە دەفەرمێ(وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ) واتە: سوێند بەئاوی پڕو کشاوە لە وشکانی. ئەمەش لەگەڵ





ژمارەیەك ڕاستی نەگۆڕی زانستی دا پراكتیك دەبێ، كە شاهیدی بۆ قورئان دەدەن وشەی كردگارە و شاهیدی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەدەن پێغەمبەرو خاوەن پەیام بووە.

(٢) مانایەكی تری(وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ) ئەوەیە ئەو دەریایە لەسەر ناخێكە تەواوەی تاوێری گەرمی كردووە و لە ناخی زەوی فڕێ ی داوەو پلەی گەرمی بەرز كردۆتەوە:

دكتۆر(زغلول) نوسیویەتی: ( زەویناس و دەریاناسەكان بە بەڵگەی ماددی بەرجەستە سەلماندویانە هەموو ئۆقیانوسەكان تا هەردوو ئۆقیانوسەكانی باكورو باشوورو زۆر لە دەریاكان وەكو دەریای سور بنیان بەڕاستەقینەیی داگیرساوەو گڕی گرتووە، ئەمەش بە هۆی ئەو بەردە تاوێرانەی بە ملیۆنەهایان لە ناخی زەوی دەردەچن و تەواوەن بە ناو تۆڕی درزە گەورەكاندا(الصدوع) كە بەرگی تاوێری زەمینی دەدڕن و دەگەنە خاڵی لاوازی زەمینی.

ئەم تۆڕەی درزەكان(الصدوع) كە تا بلێ ی قەبەیە لە بنەڕەتدا لەبن دەریاكان و ئۆقیانوسەكاندا ئۆقرە دەگرن، بڕی ئەو ئاوەش لەو حەوزە زەبەلاحانەدا كە(٣/٤)ی زەوی دادەپۆشێ بە قوڵایی یەكی مام ناوەند لە ئۆقیانوسەكاندا تا دەگاتە(٤)سم و، ناتوانێ بلێسەو پشكۆی تاوێری تواوە بكوژێنێتەوە بە تەواوی كە لە ناخی زەوی دەردەپەڕن، ئەم پشكۆو گڕانەش كە ئاستی پلەی گەرمی یان(١٠٠٠)° س دەبێ ناتوانن ئاوەكە بە تەواوی بكەنە هەڵم، ئەم هاوسەنگی یە وردەی نێوان ئەم دژانە لە ئاوو گەرمای بەرزدا لە هەموو دیاردەكان. پتر سەری زانایانی ئێمەی سوڕماندووەو حەپساندونی، ئەم ڕاستی یانەش لەسەرەتای حەفتاكاندا پەیان پێ براوا لەسەدەی بیستەمدا.

ئەوەی سەیرە ئەم پێغەمبەرە(ﷺ) نەخوێندەوارە كە هەرگیز جارێكیش سواری دەریا نەبووە، نەخوازەلا بنی دەریاكان ، وەكو(ابو داود) گێڕایەوە فەرمویەتی: (فأن تحت البحر نارا، وتحت النار بحرا). واتە: لە ژێر دەریادا ئاگر هەیە و لەژێر ئاگردا دەریا هەیە. بێگوسان مرۆڤی بلیمەت و ڕۆشنبیر واقی وڕدەمینێ كە چۆن قورئان و فەرمودە بەر زانستی نوێ ی جیۆلۆجی و دەریازانی ئاماژەی بە چەند ڕاستی یەكی زەمینی كردووە كە مرۆڤ تەنیا لە كۆتایی یەكانی

سەدەی بیستەمدا پەی پێ بردوون![1].

دوو زانای روسی بە ناوی(ئەناتول سجابڤیج) زانای جیۆلۆجی و(یوری بجدانوف) زیندەوەرزان و جیۆلۆجی بە هاوکاری زانای ئەمریکی ناودار(روناکلنت) هەر سێکیان چوونە ناو ژێردەریای هاوچەرخ(میرا) و لە دووری(١٧٥٠)کم لە کەناری(میامی) گەیشتنە خالی مەبەست، لە دووری دوو میل لەسەر رووی ئاوەوە چونە ناو دەریاوە لەوێ دا گەیشتنە دۆزەخێکی ئاوی، ئەوەی ئەوانی جیاکردبۆوە لەو تەنیا کونێ بوو لە(ئەکرلیك) و پلەی گەرمی(٢٣١)م بوو ئەمەش لەسەر لێواری ڕامالراوی تاوێری، ئەو ئاوانە سەرچاوەو بورکانی بلێسەداریان لە ژێردا هەلدەقولی، کە لەوێ دا درزی زەمینی هەیە لە بنی دەریادا، بینیان ئاوی سەر زەوی رووی ساردە و بەقولایی میلی بەرەو ژێرەوە دەروات و لە گازاوی بورکانی نزیك دەبێتەرە کە گڕی گرتوەو تواوەتەوە، ئەم ئاوە گەرم دەبێ و پاشان بە کۆمەلێ گازاوی گڕگرتوو دەردەپەرێ، ئەم سێ زانایە بڕوایان وابوو کە دیاردەی گازاوی بورکانی گڕدارو درزی زەمینی(الصدوع) لە ئۆقیانوسی هێمن و دەریای سوردا دیاردەکی ئاسایی یە، کەچی دوایی دلنیا بوون دوای چونیان بۆ ناو دەریاو ئۆقیانوسی تر کە ئەم دیاردەیە لە تەواوی دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا هەیە، کەم یان زۆر[2].

بێگومان جیهانی دۆزەخیش وەکو جیهانی بەهەشت وەکو ئەتیر لەناو زەوی فیزیایی دایە، تا خوای گەورە فەرمویەتی: سوتەمەنی دۆزەخ تاوێرە﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ أُعِدَّتْ لِلْكَافِرِينَ﴾[3]. باس لە گازاو دەکات کە وەکو گازاوی زەمینی دەدرێ بە تاوانباران﴿يُغَاثُوا بِمَاء كَالْمُهْلِ﴾[4]. تا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (البحر هو جهنم) رواه ابن جرير الطبري في تفسيره. واتە: دەریا دۆوەخێکە. ئەنجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئایەتەی خوێندەوە﴿نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا﴾[5]. لێردا وەکو (الراغب) لە(المفردات) دا باسی کردووە وشەی(سُرَادِقُهَا) وشەیەکی

(١) الارض/ د: زغلول النجار/ ل:١٩٧، مدخل الى دراسة الاعجاز العلمي/ د: زغلول/ ل:١٨٨-١٩٤.

(٢) الموسوعة الكونية الكبرى/ د:ماهر احمد الصوفي/ ج٨/ ل: ٣٣٥.

(٣) البقرة:٢٤.

(٤) الكهف: ٢٩.

(٥) الكهف: ٢٩.




فارسی یە واتە: (چادر) لە فەرهەنگی(عمید)دا هەربە چادر هاتووە.

دیارە قورئان کە دەستوری جیهانە هەموو زمانێکی تێدایە و لە عەرەبی و فارسی و کوردی و تورکی و حەبەشی و رۆمی و هتد. ئەمەش موعجیزەیەکی تری قورئانە بۆ جیهان. گەر تەماشای تەفسیرە مەزنەکان بکەین وەکو(الکشاف) و(التفسیر الکبیر) و(البیضاوی) یان(مفردات الراغب) و کتێبی(الاتقان في العلوم القران/ للسیوطي) دا دەیان وشەی قورئانیان باس کردووە کە غەیری زمانی عەرەبین. وە(السیوطي) رەخنە لەو زانایانە دەگرێ کە دەڵێن: قورئان تەنیا زمانی عەرەبی یە وەکو لە(ابن جریر) دەگێڕێتەوە کە(ابي مسیرة التابعي) گەورە فەرمویەتی: (فی القران من کل لسان). وە دەڵێ: (پێویستە قورئان هەموو زمانەکی تێدا بێت تا قورئان هەموو شتێ بگرێتە خۆی [1]. دوورنییە وشەی (سجر)لە(تاگر)ەوە هاتبێت، یان (گڕ).

(١) الاتقان في علوم القران/ للسیوطي/ ج١/ ل:٤٢٩/ تقدیم وتعلیق/ د: مصطفی البغا. بۆ نمونە وشەی(استبرق) وشەیەکی فارسی یە واتە: (ئەستور بەگ) هەم وشەیەکی کوردیشە(اذر) واتە ئاگر. (کورت) وەکو(الرازی) لە(عمر)ی دەگێڕێتەوە: واتە: (کوێربۆوە). وشەی(سجیل) واتە: (سەنگل) کە فارسیە. (صرهن) وشەیەکی رۆمی یە واتە: (پارچەیان بکە). (الصراط) وشەیەکی رۆمی یە واتە: (رێگا). (سندس) وشەیەکی فارسی و هیندی یە واتە: (ئاوریشمی تە نك). (غساق) تورکی یە واتە: (ساردی گەنیو). (الطور) بە سریانی واتە: (چیاو کێو). (فوم) بە عیبری واتە: (گەنم). وشەی(الکنز) فارسی یە، لە کوردیشدا هەرکەنزە یان خەزێنەیە. (مجوس) واتە: (موغ- موگ). کە ناوی زەردەشتیەکانە. (مقالید) لەوشەی(کلد) یان(کلیل)ی فارسی و کوردییەوە هاتووە. (میسك) و(التنور) وشەی فارسی و کوردین. (مهل) وشەیەکی بەربەری یە واتە: (چەوری تەڵخن). (ناشئة اللیل) بە حەبەشی واتە: شەو هەڵساوە. وشەی(هیت لك) لای(قیبتی و حورانی و عیبری) بەکاردێ واتە(هیتلج) واتە وەرە. لە کوردیشدا(هاتە) هاتووە. (یاقوت) و(مەرجان) فارسین و کوردین. (لینە) لای جولەکە(خورمایە). (قسط) لای رۆمەکان دادکەرییە.

وە زۆر وشەی تری قورئانی هەیە لە کوردی نزیکە وەکو(ابراهیم) واتە(بران هەموو). (التنا) لەتان نەکردووە، لە عەرەبی دا واتە(نقصنا). یان (صبح) واتە: (سپێدە). یان(جهنم) واتە: جێ ی هونەم کە دەکەوێتە خوارووی قودس دۆڵێکە و منداڵی تێدا کوژراونەوە و بتی تێدا پەرستراوە. (تورات) لە(تاو) و(ڕی) پێك دێ واتە: (رێگای رووناك) و چەندانی تر.... .

## ٦٧- مەتەڵی سیگۆشەی( بەرمۆدا ) یان سێ گۆشەی شەیتان:



رابـــــردوو بینیمـــــان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویـەتی: (البحر هو جهنم) واته: دەریا دۆزەخێکە. یان خوای گـەوره فەرمویەتی﴿وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾[1]. واتـــە: گـــەر بمانـەوێ نقومیـان دەكـەین و كەس نییە فریایـان بكـەوێ و رزگاریان ناكرێت. بەڵێ: ئەم ئایەت و فەرمودەیە بەشێك لە مانای مەتەڵی سێگۆشەی بـەرمۆدا پێك دێنێت كە هیچ فرۆكەو كەشتی یەك لی رزگار نابێت و كەس ناتوانێ فریایان بكەوێت.

## لەروی زانستی یەوە:

(سێ گۆشەی بەرمۆدا مەتەڵێكی سروشتی یە كە سەر سورمانی و نادیاری لێ هالاوە، ئەم سێ گۆشەیە ئەو ناوچە پەنهانەیە لە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی خۆرئاوادا كە دەیان كەشتی و فرۆكـەی هەڵ لوشی وەبێ ئەوەی شوێنەواریان دیار بێت. لە رووی كلتـوری یـەوە بـە سێگۆشـەی شـەیتان ناسراوە، ناوچەیەكی فـراوان وەبـەرەخۆی دەدات دەگاتـە(٤) ملیـۆن كـم٢. ئـەم ناوچـەیە سـێ گۆشەیەكی خەیاڵی یە لە خۆرئاوای ئۆقیانوسـی ئەتڵەسـی یـەوە درێـژ دەبێتـەوە بـە ئاراسـتەی كەناری باشوری خۆرهەڵاتی ئەمریكا و سەری لوتكەكەی باكوری لە دورگەی بـەرمۆدا دایـە كـە داگـیر كـراوی بـەریتانیا بـووەو پایتەختەكـەی(هـامتلون) بـووە. سـەری باشـوری خۆرئـاوای دەكەوێتە(بورتوریكۆ) وەكو بنكەیەكی سـەربازی ئـەمریكی یـە بـە ئیـسپانی دەدوێـن، سـەری

(١) یس: ٤٣.




ـشوری خۆرئاوای لە(هایتی)، لە ویلایەتی(فلۆریدا ئەمریکی)، پاشان بەرەو(کوبا)، ـوای(هایتی)، دواجار بۆ بەرمۆدا دەگەڕێتەوە. سێگۆشەی بەرمۆدا لە(٣٠٠) دوورگە پتر پێك ـێ، سەد دانە لەوانە کەس پێ ی تێ نەناوە چونکە کەشتی یە وانان خۆیان لێ دوور گرتووە، ـەبەر ئەو مەتەڵە نادیارەی دەوری داوەو(٥٠٠) ساڵە بەدوورگەی شەیتان ناسراوە لەبەر ئەو شێوە جوگرافی یەی هەیەتی ئەم ناوەی لێ نراوە. گەشتیاری ناودار(کریسوفر کلومبس) کەلە ڕۆژانی خۆیدا لەسەر کەشتی(سانتا ماریا) نوسیویەتی، لە(١١)ی تشرینی دووەم/ ١٤٩٢ دا دوای دوو سەعات لە خۆرئاوا بوندا بروسکەیەکی لە ئاوی دەریادا بیینی، کە سپی بوو، خۆیو سەرنیشانی هێڵەکی ئاگرینیان بەرچاو کەوت زۆر زەبەلاح بوو ئاسمانی دەبڕی و لە دەریادا ون دەبوو، دیسان شێواندن و تەشویشی دەخستە سەر ڕێرەوی قیبلە نوما(البوصلە)، ئەمەش لەکەوتنی(نیازك) چونکە نیازك تەشویش و تەقس پەیدا ناکات[1].

سەیرکە چۆن ڕووداوی پۆلی(١٩)(السرب ١٩) ڕوودەدات،﴿وَإِن نَّشَأْ نُغْرِقْهُمْ فَلَا صَرِيخَ لَهُمْ وَلَا هُمْ يُنقَذُونَ﴾ یس: ٤٣.

بانگی بورجی چاودێری(برج المراقبە) دەکەم، لێرەدا بارێکی نکاو و هەیە، ئێمە لە ڕێرەوی خۆمان لامانداوە زەوی نابینین...

-لە کوێین؟ وەڵام: نازانین کت و مت، وەك بڵێ ی ون بووین.

- سەرەتا دەبێ ڕێرەوی خۆرئاوای بگرن(٢٧٠) پلەیە.

- نازانین خۆرئاوا کوێیە، شتەکی سەیر ڕویداوە، نازانین بەرەو کوێین، تا دەریاکە خۆی سەیرە، ئێمە سەرگەردان داماوین! ئەمە بەشێکە لە گفتوگۆی نێوان بورجی چاودێری و سەرپەلی(١٩) کە پێنج فرۆکەی ئەمریکی جەنگی بوون لە ڕۆڵەکی ڕۆتینی دا هەڵسابوون.

بەڵام دوا نامە کە بورجەکە لە سەرپەلی(١٩) وەری گرت(چارلز تایلور) ئەوە بوو: ئێمە بەسەر ئاوەکی سپی دا دەڕۆین پێم وایە بە تەواوی گوم بووین، پاشان پەیوەندییە بێ تەلیەکە پچڕا، بەڵام بورجەکە توانی گوێبیستی هەندێ قسەی تری وەکو ستەمەنی نەماوە بەشی

---

(١) موسوعة الكونية الكبرى/ ج٨/ ل:٢٣٢.




ڕۆیشتنی(٧٥) میلە، قیبلە نوماکە شوێن و ڕێگا بە ڕێگایـەکی نـەزانراو دیـاری دەکـات. دوای ئەو فرۆکەیەکی وشکاوی(البرمائی) هەڵسا لـە جـۆری(مـارتین مـارتینز) بـۆ سـۆراغ کردنیـان و فریاکەوتنیان، ئەویش نەگەڕایەوە.

دوایین فرۆکە گەشتی گەڕانی خۆیـان دەسـت پـێ کـرد بـە شـوێن پـۆلی(١٩) و فرۆکـەی فریاگوزاری دا، بەڵام تاریکی کۆتایی بەگەڕانەکە نەهێنا، ئـەنجا کۆمـەڵێ پـاپۆرو بەلـەم چـوونە شوێنیان، سەرلەبەیانی زۆرترین فرۆکە لە مێژوو دا هەڵـسان کـە(٣٠٠) فرۆکـە و کۆمـەڵێ ژێـر دەریا و کەشتی بوون، بـەڵام لەگـەڵ گـەڕانی ڕۆژبـە ڕۆژیـان بەبـەردەوامی هـیچ شـوێنەوارێکی ئەوانەیان نەدۆزییەوە. دوای ئەوە سەر پەلی(١٩) نامەیەکی ڕەوانەی بورجەکە کـرد، بـەس لێ ی حاڵی نەدەبوون، ئەوەی سەیرە ماوەیەك ڕابردوو بەسەر بزربوونەکەدا ، سەرسـوڕمانی بەرپرسـانی بورجەکە لە وەدا بوو کە دەبوایە سوتەمەنی ئەم پۆلە لە مێژ بوایە تەواو بایە.

دوای ئەو ڕووداوە لێکۆلینەوەکە ناکامەکەی ئەمـە بـوو لێـرەدا هـیچ یـەك کەوتنەکـەکی هونەری نەبووە، چونکە ناشـێ پێـنج فرۆکـە پێکـەوە لـەکار بکـەون[1]. ئـەم ڕووداوەی بەسـەر گروپی(١٩)دا هاتووە لە دەیان حاڵەتدا دووبارە بۆتەوە، بەبێ ئەوەی کـەش و هـەوا نالـەباربێت. زۆربەی ئەم ڕووداوانە دەکەونە خاڵەکی دیاری کراوی باکوری خۆرئاوای ئۆقیانوسی ئەتڵەسـی بـە ناوی دەریای(سارگاسوم)، کەبەوە ناسـراوە قـەوزەی ڕەنـگ پەمـەیی لێیـەو، هـێمن و ئارامـەو هەڵسان و جوڵەو ڕەشەبای نییە، ئەم شوێنە زۆر ناوی لێ نراوە وەکو(دەریای ترس) و(گۆرسـتانی ئەتڵەسی).

چونکە ئەو کەشتی یەوانانەی بە نزیکی ڕەت بوون توشی دەردەسـەری هـاتوون. چـاودێران تێبینی یان کردووە زۆربەی ڕووداوەکـان لـە وەرزێکدایـە بـە(وەرزی ون بونـەکان) ناسـراوە، لـە نێوان(تشرینی دووەم) و (کانونی یەکەم، یان شوباتدایە).

ساڵی(١٨٥٠) زیاتر لە(٥٠) کەشتی نقووم بوون، هەندێ کابتنەکان نامەیان نـاردووە کـە کەس تێ ی نەگات و، زۆربەیان ئەمریکی بوون. یەکەم کەشتی (ئینسـار جنـت) بـوو کـە(٣٤٠)

(١) سەرچاوەی رابردوو/ ل: ٢٣١- ٢٣٢.




سەرنشینی بەسەرەوە بوو، ئەنجا ژێردەیایی(سکۆربیون)ی لە ساڵی(١٩٦٨)دا بە دواداا شوێنە ون بوو، کە(١٠٠) دەریاوانی تێدا بوو.

ساڵی(١٨٨٠) دەریای(سارگاسوم) کەشتی ئینگلیزی(ئەتلنتا)ی قوت دا. کە(٢٩٠) کەسی تەمەر بوو. ساڵی(١٩٤٥) دوو فرۆکە ون بوون کە بۆمباهاوێژ بوون و سەر بە هێزی ئەمریکا بوون، ساڵی(١٩٤٨) فرۆکەی بەریتانی(ستار تایگەر) وون بوو و(٣) سەرنشینی تێدابوو، ساڵی(١٩٤٩) فرۆکەی بەریتانی(ستارئەریل) وون بوو(٣٧) سەرنشینی تێدا بوو، ساڵی(١٩٥٦) فرۆکەی(pom) سەر بەهێزی دەریایی ئەمریکی بەسەر نشینی سەریەوە وون بوو کە(١٠) کەشتی یە وان بوون.

لێرەدا لەو(١٢) ناوچە ترساناکانەی جیهان دوو ناوچە هەیە لە هەموویان ترسناکترن سێگۆشەی بەرمۆدا سێ گۆشەی شەیتانی لە یابان، یەکەم کەس(ڤنست گادیس) نوسەری ئەمریکی ناوی نا سێ گۆشەی بەرمۆدا. وە زانای ئەمریکی سروشت ناس(داوین میشیگان) یەکەم کەس شی کردنەوەی بۆ ئەم دیاردەکردو ووتی: (لێرەدا ناوچەیەکی موگناتیسی بەهێز هەیە لەم ناوچەیەدا کە ئاماژەکان خێراتر دەکات، یان بەیەکجاری قیبلە نومەکان ڕادەگرێت).

دیارە زانایان لە ڕاست ئەم مەتەڵە بۆچونیان زۆرە وەکو: (پچرانی زەمەن لەوێ، یان بوونی شەپۆلی بومەلەرزەیی لەوێدا، یان هێرشی گیاندارانی دڕندەی گەورە، یان تریشقەیەك فرۆکەکان دەسوتێنێ، یان گەڕانەوەی کات و شوێنە وەکو کونە ڕەشەکان(الثقوب السوداء) لە ئاسماندا. یان هەندێ زانا دەڵێن: ئەم شوێنە بنکەی دەفرە ئاسمانیەکان(الصحون الطائرة) ئەوان لەوێ ئەم دیاردانە دوروست دەکەن، بەلام ساڵی(١٩٩٦) سۆنی کەشتی سەر بەدەریاوانزانی پەیمانگای(لایبنز)ی زانکۆی(کییل)ی ئەڵمانی لێکۆڵینەوەی وردی لەسەر(هیدراتی میثان) کرد، گوایە لەبنی دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا پەیوەندی بە سێ گۆشەی بەرمۆداوە هەیە. چونکە بلقی گازی سەرکەوتوو پەیدا دەکات و لە چینەکانی ئاودا پاڵەپەستۆی هەوا کەم دەکاتەوە و ناتوانێ کەشتی یەکان بەرزبکاتەوە[1].

(١) الموسوعة الكونية الكبرى/ ل:٢٣٦-٢٤٢/ ج٨. بەکورت کردنەوە.





ئیمرۆ زۆر بۆچونی تری سه‌یر هه‌یه له‌سه‌ر سێگۆشه‌ی به‌رمۆدا، بۆ نمونه‌(هشام کمال عبدالحمید) کتێبه‌کی نوسیوه به ناوی(اقترب خروج المسیح الدجال/ الصهاینة و عبدة الشیطان یمهدون لخروج مسیح الدجال من مثلث برمودا).

له‌م کتێبه‌دا هاتووه سه‌هیۆنی و شه‌یتان په‌رستان ڕێگا بۆ مه‌سیحی ده‌جال خۆش ده‌که‌ن به ده‌فری ئاسمانی یه‌وه له سێگۆشه‌ی به‌رمۆداوه. به‌م پێیه پایه‌ته‌ختی شه‌یتان و ده‌جال له سێگۆشه‌ی به‌رمۆدایه. له (ل: ٦٠)دا ده‌نوسێ: دورگه‌ی ده‌جاڵ و ته‌ختی شه‌یتان و مه‌مله‌که‌تی جنۆکه و مه‌ڵبه‌ندی لێکۆڵینه‌وه‌ی ده‌جال له سێگۆشه‌ی به‌رمۆدا وه سێگۆشه‌ی به‌رمۆدا شوێنی ده‌فره ئاسمانیه‌کانه که جنۆکه‌کانن. له کتێبی(حوار مع الجن)ی (اسامه الکرم) دا نوسراوه له ئاخاوتنه‌کی ئه‌و دا له‌گه‌ڵ جنۆکه‌کاندا ئه‌م جنه رایگه‌یاندووه که ته‌ختی شه‌یتان له ناوسیگۆشه‌ی به‌رمۆدایه.

دیسان له زۆر نوسراوی تردا باس کراوه وه‌کو(حوار صحفی مع الجنی المسلم/ مصطفی کنچور) وه له فه‌رموده‌شدا هاتووه که‌(مسلم) گێراویه‌وه: (ان عرش ابلیس علی البحر). وه له‌(سفر الشعیاء/ ٢٧-١) دا هاتووه ته‌ختی شه‌یتان له‌سه‌ر ده‌ریایه[1].

وه زۆر نوسه‌ر و زانا باس له‌م پێڕه تازه‌یه ده‌که‌ن به ناوی(عابد الشیطان) که مه‌ترسیدارترین گروپن له جیهاندا وه‌کو(یوسف البنعلی) له‌(عباد الشیطان، اخطر فرق في العالم) و(یوسف الحاج) له‌(ضحایا الشیطان)دا باسی کردون. تا له‌(تنبوات نوستراداموس) دا له‌زۆر جێگادا باس له مه‌سیحی ده‌جال کراوه که له‌ناو ژێرده‌ریادایه له ده‌ریداو له دوای ساڵی(٢٠٠٠) دێت. وه‌کو له ساڵی(١٩٩٩) و حه‌وت مانگ پادشای ترس له ئاسمانه‌وه دێ پادشای مه‌گۆلی گه‌وره بۆ ژیان ده‌گێڕێته‌وه).

(کاتێ چه‌ك و به‌ڵگه‌نامه له ناو ماسی دا داده‌نرێ پیاوه‌کی لێ دێته‌ده‌ر جه‌نگ هه‌ڵده‌گیرسێنێت، که‌شتی گه‌له‌که‌ی دورکه‌وتۆته‌وه به‌سه‌ر ده‌ریادا تا له نزیك که‌ناری ئیتالیا ده‌رده‌که‌وێت). له هه‌مووی سه‌یرتر له ڕۆژنامه‌ی(خه‌بات) ژماره‌(١٠٣٨) دا (جمعه:

---

(١) بۆ زانینی پتر بڕوانه‌(اقترب خروج مسیح الدجال/ هشام کمال عبدالحمید).

٢٠٠١/٨/١٠) دا (ل:١٦) و دوایی لەویّ دا هاتووە: (دەست بەسەرداگرتنی چەنا سیدییەکی ڤیدیۆ لە- عابد الشیطان) چەند شتەکی تازەو گروپەکی ناویزە دەیکەن بە خۆیان دەڵێن(شەیتان پەرست، کە بریتی یە لە گویّ گرتن لە موسیقای بە ڤیژو هاوار و کاری بەدڕەوشتی. لە میسر دا گروپیّ لەوانە گیران نێربازیان دەکرد و برانە بەردەم دادگای تایبەتی.

لەم دوایەدا بەرێوەبەرایەتی چاپەمەنی و بلاّوکردنەوەی ئەردەنی بلاّوی کردەوە هەزار کاسێتی ڤیدیۆیی گیراوە گروپەکی دەگمەن بیری خۆیانی تێدا بلاّودەکەنەوەو ڕەخنە لە تەواوی دینەکان دەگرن و ڕەخنە لە هەموو بەها کۆمەلاّیەتیەکان دەگرن. ئەوەی سەیرە دانەیەکیان لەو شەیتان پەرستانە لەبەردەم دادگای میسردا وتی: ئەو خەونی بینیوە داهاتوی کوڕەکی کورد سەر هەلّدەدات تا دینەکان لەناو ببات ئەو خۆی بۆ ئەوە ئامادەکردووە ئەو کوڕە لەناو ببات، بۆیە کتێبی مێژوو ژیانی کورد دەخوێننەوە).

بەڵێ لە چەندان فەرمودەدا باس کراوە نویّ کردنەوەی دین کوردەکان هێلّی پێشەوەن تیّ یداو ئالاّ ڕەشەکان و کوڕانی ئیسحاق کە لە خۆرهەلاّت دێن لە عێراق لە ناوچەیەکی شاخاوی و بەفراوی کە(٧٠) هەزار کەسەو دورشمیان بکوژ بکوژە ئەوانن، کە دژ بە دەججالّ ڕادەوەستن، وەکو(ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يقتله قوم، فاذا رايتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدى) رواه ابن ماجه/ صحصح. یان(لاتقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفا من بنى اسحاق) رواه مسلم.

(منصور على الناصف) لەبەرگی پێنجەمی(التاج) دا دەڵیّ: ئەوانە کوردەکانی شامن. لە(كتاب الفتن/ نعيم بن حماد)دا هاتووە: (انما اولئك قوم ياتون من المشرق حردين معهم الرايات السود.... شعارهم اقبل اقبل يعنى بكوش بكوش).

بەڵیّ: (يوسف البنعلى) جوان پەروەردەی لەسەر ئەم پێڕە هەڵماڵیوە کە لە یەزیدیەکانی کوردستان جیان، ئەوان کەلیسای شەیتانیان لە ئەمریکا و خۆرئاوا هەیە و رەواج بە موسیقاو سیحرو داوین پیسی و تیرۆر دەدەن. یەکەم کەلیسایان بەرەسمی لە ئەمریکا دا دامەزراند لە(سان فرانسسکو)، کە(کاهین ئە نطون لافیە)لە ساڵی(١٩٦٦) دا دایمەزراند و ئەندامانی بە(٥٠٠٠٠) هەزار ئەندام دادەنرێت، زۆربەیان لە خێزایی سەرمایەدارەکانن و زۆر لق و پۆپیان لە ئەمریکاو





ئەوروپا و بەریتانیا هەیە برەو بە بلاّوکردنەوەی ئەم بیرۆکەیە دەدەن و ماددە سڕکەرەکان برەو پێ دەدەن.

ڕاسترین نهێنی لەسەر سێگۆشەی بەرمۆدا ئەمەیە کە(بارێکی زانستی یەو بەشێکە لە شلە کانزایی یەکان- السوائل المعدنیه).

## ٦٨- جوڵەو شەپۆلی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان

﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ﴾[1]. واتە: یان وەکو تاریکاییەکان لە دەریایەکی قوڵدا شەپۆل دایپۆشیوە وە لەسەروی ئەوەوە شەپۆڵ هەیە.

﴿جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾[2]. واتە: ئەو کەشتی یە بایەکی ڕەشەبای بۆ بێت و شەپۆڵ لە هەموو لایەکەوە بۆیان بێت.

لێرەدا قورئان بۆ بابای دەریازان زۆر ئیعجازی زانستی دەردەخات وەکو:

(١)دەریای قوڵ تاریکە وەکو داهاتوو باسی دەکەین.

(٢) قوڵایی کاردەکاتە سەر شەپۆلەکان.

(٣) بایەکان شەپۆلی تێکەڵ پەیدا دەکەن لە شەپۆلی تەنك و قوڵ و لە هەموو لایەکەوە شەپۆل دێت، ئەم شەپۆلانە بەیکدا چوون.



---

(١) النور/ ٤٠

(٢) يونس/ ٢٢



## ڕاڤەی زانستی

هەرلەو کاتەوە مرۆڤ بە هۆی کەشتی و پاپۆڕ چۆتە ناو قوڵای دەریا و ئۆقیانوسەوە توشی شەپۆلان هاتووە خلۆربینەوە بەسەر ڕویدا کەترس و خۆشی تێدا بکەوێتە ناودڵەوە. ئەپۆلە شینە سەوزباوەکان کەلە سەرکەنارگێژ دەخۆن دڵی خۆش دەکەن، بەڵام شەپۆلە سەختەکان کە ڕەشەباو گەردەلول پەیدای دەکەن دەیتۆقێنن و زراوی دەبەن. شەپۆلەکان کاتێ دەبنە بارستایی بزۆك کەلە سەرکەنار بەریەك دەکەون و پەرش دەبنەوە، (با) پاڵ بە لوتکەکانیەوە دەنێت.

ئەوەی ڕاستی بێ شێوەی شەپۆلەکە دەگوازرێتەوە هەرچی ئاوە لە جێگای خۆیدا دەمێنێتەوە. کاتێ شێوەی شەپۆلی دەجولێ گەردە ئاوی یە ملی یەکان( الغردیە) لە ڕێرەوێکی هێلکەیی یان بازنەیی دا بۆ سەرێ و خوارێ دەکەونە جولە.کەچی لێك خشان جولەی کەم پەیدا دەکات بۆ پێشەوە و جولەی بازنەیی لەگەڵ قوڵایی دا نامێنن، هەرچی شەپۆلی ڕەشە باو گێژاوە گەورەکانە لە شەپۆلی ترکاری گەری پتر پەیدادەکەن، بەڵام ناگەنە ناو جەرگەکە. سەر ڕووی دەریابە شێوەیەك دێتە بەر چاوان کە تێکەڵاوی شەپۆلی نارێکە هەتا گەر( با) یەکە هێواش بێت، لەم بارەدا سیستەمەکە لەژێر ئەو تێکەڵاوی و نارێکیە شاراوەیە، کاتێ ئەو کۆمەڵە شەپۆلە جیاوازو بزۆکە لە چەند ڕێرەوێکی دوور لە یەکتری کار لەیەکتری دەکەن و شێوازی ئالۆز پێك دێنن لە قەبارەی جیاجیادا، بەناو یەکتر دادەچن و جار هەیە یەکێ ئەو یتریاز ون دەکات، کاتێ لەتکەی شەپۆلەکان لەسەر سکیان جوت دەبن.

ئەمەش پێ ی دەوترێ بەیەکدا چونی شەپۆلەکان( تداخل الامواج) کە بریتی یە لە شەپۆلی ناوەوە و سەر ڕوویی ئەکەونە سەر یەکتری. وەکاتێ لەخێرایی( با) دا شەپزلە بچوك و قوڵەکان لە بەشەکانی باڵا هەڵدامسێن لوتکەی سپی ڕەنگیان بۆ پەیدا دەبێت،( ئەم شەپۆلە بچوکانە کەڵەکەی سەر یەکتری دەبن). کاتێ( با) هەڵدەکات ئەم شەپۆلانە پەیدا دەکات کە بەیەکتری دابچن بەرێرەوی جیاجیا دا برۆن.

بەڵام کاتێ شەپۆلەکان لەژێر ڕکێفی(با) دەرباز دەبن کەئەو دروستی کردوون ئەو کاتە لە شێوەی شەپۆل لێکدان(تلاطم الامواج) ڕێك دەکەوێت، کە دەتوانێ بە پانتایی ئۆقیانوسدا



هەزاران کیلۆ مەتر ببرن، کاتێ ئەو شەپۆلە گەورانە بەر یەکتری دەکەون لەکەنارەکاندا گرمەیەکی لێ دروست دەبێ وەکو گرمەی هەورە( الرعد) و پێ ی دەوترێ گرمـە( الهـدیر – Sorf). بـەڵام گەر ئەم شەپۆلانەی ڕابردوو توشی( با) یەکی تازەبێ ئەو کاتـە شـێوەی شـەپۆلەکان و ڕێڕەویـان دەگۆڕێت، بەڵام گەر زۆر بەهەرەکەت بوو لەناویان، بەڵام گەر بارەکە ڕەخسا شەپۆلەکان دەتوانن ڕاستەوخۆ بگەنە کەنارەکان لەکاتی هەڵکردنی بای بنچینەدا بەرەو ئەوێ.

( شەپۆلە درێژەکان) زووتر دەگوازرێنەوەو( شەپۆلە بچوکەکان) بـە دوای خـۆی دا بـەجێ دێڵێ کەنارێکن و ماوەیان کەمە، تالە دوایی دا لە ناو شەپۆلێکی ڕێکدا نۆقرە دەگرن.

بەم شێوەیە ئەم شەپۆلانەی درێژ دەبنەوە و تێ دەشکێن دێنێ کەلـە وکەنارانـەدا بـەزۆری جیا دەکرێنەوە دەکەونە بەر(با) وە. بۆ نمونە: ئەو شەپۆلانەی لەسەر کـەناری( کالیفۆرینـا) تێـك دەشکێن لە هاویندا لە باشوورەوە دێن لە ماوەی( ٨- ١٨) چرکە دابەزۆری گەردەلول و ڕەشەبای زستانی لە ئۆقیانوسی هێمندا لە بەشی باشوورەوە بۆ خۆرهـەڵات لـە( نیوزلنـدا) ،ە دروسـتیان دەکات. لە هاویندا لە باشووری خۆرئاواوە دێن لە شـێوەی لوتکـەدا ئـەو کاتـەی لێکیـان جیـا دەکاتەوە لەمیـان( ٨- ١٨) چرکە دان، لەو شوێنەوەی لێ ی پەیـدا بـوون نزیکـەی( ٩٦٠٠)کـم بڕیوە،

## ئەم هۆکارانەی کار لە شەپۆلەکان دەکەن:

(١)هێزی هەڵکردنی( با).

(٢) ماوەی هەڵکردنی با.

(٣) ماوەی ڕووبەری ڕووی ئاو کە شەپۆلەکان دەتوانن لەمانەوەی دا پەیدا بێن.

(٤) قوڵایی ئاو. ئەو بایـەی بـەخێرایی(٦ ,١)کـم دەڕوات لـە کـات ژمێرێکـدا کۆمەڵـە شەپۆلەکی بەگرمەی کز پەیدا دەکات، بەڵام گەر بایەکە خێرایی(٥ , ٦)کم بێ لـەکات ژمێرکـدا ئەوە دەتوانێ شەپۆلی ڕاسـتەقینە پەیـدابکات. وە فراوانـی بـواری ئـاوی یارمـەتی دەردەبـێ و هەڵکردنی( با) بۆ ماوەیەك بگاتە هەزاران کم و یارمەتی دەر دەبـێ بـۆ گەشـەپێدانی شـەپۆل و





بەرز کردنەوەی بۆ(٤٠) پێ، بەو مەرجەی بایەکە خێرایی یەکەی(٤٠) میل بێ لە کات ژمێرێکدا.

گەردەلول و ڕەشەبای گەورەی دەریایی کە شەپۆلی سەرویی ناسایی دروست دەکات ڕەنگە لە دەریای هەڵچوودا ئەوەندە بەرزبێتەوە کەشتی نقوم بکات، تا گەورەترین پاپۆڕ ڕزگارنەکات. لەساڵی( ١٩٣٣) گەورەترین شەپۆلی دەریایی لەمیان( سان نیلا و سان یجو) ی ئۆقیانوسی هێمن دا بەرز بۆوە نزیکەی( ٣٣)م دەبوو. کاتێ شەپۆلی دەریایی ناوچەیەکی گەردەلولی بگرێتەوە وردە وردە بەرزیان کەم دەبێتەوە بۆ چەند سەد مەترێ و بەرەو کەنار دەڕوات، مام ناوەندی خێرایی شەپۆلەکانی ئۆقیانوسی هێمن نزیکەی(٥٦)کم/س.

کاتێ شەپۆلەکان لە ناوێکی قوڵەوە بۆ ناو ئاوێ دەڕۆن لەو قوڵایی یان کەمترە گۆڕانی جەوهەری تێدا پەیدا دەکات، لەوە دا پشت بە بەرزی گەورەیی شەپۆلەکان و ماوەی نێوان شەپۆلەکان دەبەستێت، گەر قوڵایی ئاوەکە بە ئەندازەی نیوەی شەپۆلەکە بوو ئەو کاتە شەپۆلەکە بەر بنی ئاوەکە دەکەوێ، بەو پێ و دانگە گەر کۆمەڵە شەپۆلەکی لێک دراو(المتلاطمة) ماوەی نێوان لوتکەکانی( ١٢٠)م بوو گەر ئاوەکەلە( ٦٠)م تەنك تر بوو ئەوە شەپۆلەکان دەگەنە بنی قوڵایی یەکەی.

لە ئاکامی بەیەك گەیشتنی شەپۆلەکان لەگەڵ بنی دەریادا خێرایی و درێژییان لەکەمی دەدات بەڵام بەرزتر دەبنەوە، جگە لە ماوەکەی لەسەر باری خۆی نامێنێتەوە. لەدواوە لوتکەی شەپۆلەکان کەڵەکە دەبن بەسەر یەکتری دا، لەم ڕێگایەوە ڕێرەوی بازنەیی بۆ گەردە ئاوەکان پەیدا دەبن کە لە کت و پڕدا فشار دەخەنە سەر یەکتری، کاتێ دواوەی شەپۆلەکان خێرا تر بێ لە بەشی پێشەوەیان، ئەو کاتە پێ ی دەگات و لەسەر شێوەی لوتکەیەکی تیژ دا بەرزی دەکاتەوە.

ئەم لوتکانە کە بەردەوام دەڕۆن لە نیشتنەوەدا دەبن و لول دەدرێن، بەردەوام پلەی گوزرەکەی بەرەو پێشەوە زیاد دەکات و پریشکان فڕێ دەدات، بەم شێوەیە شەپۆلەکە بۆ کەفێکی سەر ئاو کەوتوو دەشکێت.

شەپۆلەکان دەکرێ بەم ڕەنگە وێنە بکرێن، کە بڕەکی دیاریکراو لەوزە و توانست




هەڵدەگرێ کە لە(با) وەری دەگرێ لەگەڵ جوڵەی کۆمەڵە شەپۆلێك، ئەنجا لە کاتێ دا شەپۆلەکان دەچنە ناو بازنەی ناوەکی تەنکەوە ئەو ووزەیەی تاوی داوەتێ لە رێگای ستونەکی قوڵی ئاوی یەوە، ئێستا لە ناوێکدا چەق دەگرێ لە تەنکی دەدا، بەو شێوەیە هەر لیترێ ئاو دەبێ بە عەمبارێ وزەی زۆر، هەندێ لەم وزەیە ئاوە کۆکرا لە لوتکەکاندا بەرزتر دەکاتەوە. هەندێکی خێرایی تەنۆلکە ئاوی یەکان پتر دەکات لە لوتکەداو ئەو کاتە خێرایی هەمان شەپۆل شەپۆلەکە تێ دەشکێنێت، ئەمەش لە ئاوی قوڵدا روودەدات کاتێ بەرزی شەپۆل(٧/١)ی درێژیەکەی بێت.

بەڵام لە تەنکاودا قوڵایی ئاو خۆی بنەمایە لە شکاندنی شەپۆڵدا، بەزۆری کاتێ تێ شکان روودەدات کە رێژەی بەرزی بۆ قوڵی(٣/٤)، واتە: ئەو شەپۆلەی بەرزی سێ مەترە لە بەرامبەر چوار مەتر قوڵایی دا تێك دەشکێت.

هەتا قوڵایی ئاو کەمتر بێ شەپۆلەکان بەرزتر دەبن جوڵەی لەسەر بەربەستەکان هێواشتر دەبێ نەك کە دۆڵەکاندا، کە لەوێ دا ئارادەیێ ئاو قوڵە، ئەو بەرەیەکی شەپۆلی پێشەنگی شێوە چەماوەیی پێك دێنێت، لە هەمان کاتدا شەپۆلە شکاوەکان کاتێ بەسەر بەربەستەکاندا دەپەڕنەوەو لە کەنارێك تۆ دەبنەوە بەهێز دەبن، بەڵام ئەو شەپۆلانەی بە دۆڵ و شێودا دەرۆن لاواز دەبن.

## شەپۆلی تێك شکێنەر دوو جۆرە:

**تەنکە شەپۆل (الموجات الراقراقە)** کە بەزۆری بنی ئاوەکە بەرزتر بەرەو کەنارەکی لێژ دێت.

بەشی دووەم شەپۆلی داپۆشەری تێ شکاوە، بەزۆری کاتێ روودەدات کە شەپۆلی دەریا بەر شەپۆلی کەنارەکی بەرز دەکەون و بە توندی و خۆیان پێدا دەکێشن[1].

بەڵێ قورئان بەر لە زانستی دەریازانی ئاماژە بە شەپۆل لەسەر شەپۆل دەکات﴿مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ﴾ النور:٤٠. کە ئاماژەیە بۆ شەپۆلی ناوەکی(داخلی) شەپۆلی سەر ڕوویی(السطحیة) (اللجی) لێرەدا بە دەریای قوڵ دێ کە ئاماژەیە بۆ ئۆقیانوسەکان.

---

(١) جغرافية البحار والمحيطات/ د: مهدی محمد علی/ ل:١٤١- ١٥١. بەکورت کردنەوە.





(راشل کارسون) لە کتێبی(البحر المیحط بنا) دەنوسێ: (گەورەترین و ترسناکترین شـەپۆلی ئۆقیانوس شەپۆلە نادیارەکانن کە لە هێڵی ڕیرەوی نادیاردا دەڕۆن دوور لە قوڵایی دەریا. هەر لە کۆنەوە زانراوە کە زۆر لەو کەشتیانەی ڕەوانە کراون بـۆ جەمـسەری بـاکور بـە دژواری ڕێگایـان بڕیوە بۆیە ناوەکانیان بە مردوو ناساندووە. کەچی ئیمرۆ بەشەپۆلی ناوەکی ناسراون.

لەسەرەتاکانی(١٩٠٠) زۆر دەریازانانی ئیسکەندەنافیەکان تێبینی بوونی شەپۆلیان کردبوو لە ژێر رووی ئاودا، ئیمڕۆش هەر چەندە نادیارە چۆن ئەم شەپۆلە گەورانە دورست دەبن کـە بـەرز دەبنەوەو دائەبەزن لە دووری دا لە خـوار رووی دەریـادا، ڕوودانـی بـە فراوانـی لـە ئۆقیانوسـدا ئاشکرایەو لە ئـاوە قوڵەکانـدا پـاڵ بـە ژێـر دەریاکانـەوە دەنـێ و فڕێـان دەدات، وەکـو چـۆن شەپۆلەکانی سەر رووی دەریا کار بۆ پاڵنان و فڕێدانی کەشتی دەکـات، وە دەردەکـەوێ کـە ئـەم شەپۆلانە لە کاتی توش هاتنیان بە تەزوری کەنداوو تەزووی تری بـەهێزە لـە دەریایـەکی قوڵـدا تێك دەشکێن[1].

بەڵێ زۆر جار ئەم شەپۆلانە مەترسـی گـەورە دروسـت دەکـەن، لـە سـاڵی(١٧٣٧)دا لـە بەندەری(بانجوك)دا دەریا هەڵسا(٣٠٠٠٠٠) هەزار کەسـی کوشـت و(٢٠٠٠٠) هـەزار کەشـتی وێران کرد.ئەو شەپۆلەی(٢٥) پێ بەرز دەبێتەوەو لە کاتی گەردەلول(١٣٠) پێ بـەرز دەبێتـەوە. ساڵی(١٨٧٢) شەپۆلەکی گەورە لە ئیـسکوتلەندا لەنگـەرگا(المرسـی) یـەکی ئاسـنی هەڵکەنـد کێشی نزیکەی(٣) ملیۆن تەن دەبـوو. شـەپۆلەکی تـر تـاوێرەکی(١٧٥) ڕتیلـی بـۆ(١٠٠) پـێ هەڵدەگرێت[2].

﴿وَإِذَا مَسَّكُمُ الْضُّرُّ فِي الْبَحْرِ ضَلَّ مَن تَدْعُونَ إِلاَّ إِيَّاهُ فَلَمَّا نَجَّاكُمْ إِلَى الْبَرِّ أَعْرَضْتُمْ وَكَانَ الإِنْسَانُ كَفُوراً﴾[3].واتە: کاتێ تووشی زیان هاتن لە دەریادا جگە لە خواتان لە دڵدا نـامێنێ لـە پەرستراوانتان، کاتێ بەرەو وشکانی رزگاری کردن پشتتان هەڵکردوو، مرۆڤ ناسوپاس گوزارە. وە

(١) حقائق القران والعلم الحديث/ عامر تحسين/ ل: ١٠٢.

(٢) بەکورت کردنەوە لە(الله والعلم الحديث/ عبدالرزاق نوفل/ ل: ٧٦) وەرگیراوە.

(٣) الاسراء: ٦٧.



لێرەدا گەر سەیری وشە(لجی) بکەین ئیعجازەکی زانستی دەردەکەوێ لە جغرافیادا ئەویش پێوانەی بنی ئۆقیانوس و دەریاکانە.

(الراغب) لە(المفردات)دا دەڵێ: (لجة البحر أي ترددا مواجه). بەڵام لای(الزمشخری) واتە: (العميق كثير الماء). سەیر بکە وەکو باسکرا قوڵترین شوێن لە ئۆقیانوسی هێمن دایە لای دۆڵی(مریانس) کە(١٠٨٩٩) م قوڵە. لای مام ناوەندی ئۆقیانوسەکان قوڵاییان(٤٠٦٠)م .وەکو لە(جغرافیا العالم)دا باسکراوە.

(اسحاق عظیموف) دەنوسێ: ساڵی(١٨٦٩) تۆمسون بە کەشتی(پۆر کیوپاین) دەرچوو توانی تۆڕی تا قوڵایی(٤٤٠٠)م دابەزێنێت. ساڵی(١٨٧٢) سواری کەشتی(چالنچەر) بوو سێ ساڵ و نیو لە دەریادا مایەوە و هەموو ئۆقیانوسەکان گەڕاو(١٢٥٠٠٠)کم بڕی، لە(٣٧٢) شوێنی جیا جیادا قوڵایی ئۆقیانوسی پێوا لە باسیفکی کە گەورەترین و قوڵترین ئۆقیانوسە شوێن هەبوو قوڵایی(٧,٢٥)کم بوو زیندەوری ڕاو دەکرد[1].

وە قورئان ئاماژە بە شەپۆلی گەورە دەکات و بەچیایان دەچوێنێ، لە شێوەی و گەورەیی و لە بەرزی دا.

﴿وَإِذَا غَشِيَهُم مَّوْجٌ كَالظُّلَلِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ﴾[2]. واتە: گەر شەپۆلی دایان پۆشێ وەکو سێبەرێ، لە خوا دەپاڕێنەوە بە دڵسۆزی، دین بۆ ئەوە.

﴿وَهِيَ تَجْرِي بِهِمْ فِي مَوْجٍ كَالْجِبَالِ﴾[3]. ئەوە ئاوە دەیان بات لە شەپۆلێکدا وەکو چیاکانە. بەڵێ دەریاکان و تیشکەکان و تەواوی گەردوون بە ماددەو ئەتیرەوە شەپۆلە کە لە شێوەی چیادایە، هەتا دەنگەکانیش. جیاوازیش لە بونەوەردا بۆ خێرایی شەپۆلەکان دەگەڕێتەوە.

(رادونسکایە) دەڵێ: شەپۆلی بێ تەل وەکو شەپۆلی سەر دەریایە لەوە دا کە کردارەکی

---

(١) الاكتشاف الارض و الكون/ اسحاق عظيموف/ ت: هاشم احمد / ل: ١١٤.

(٢) لقمان: ٣٢.

(٣) هود: ٤٢.

خولەکی(الدوریە) یە. زۆرێك لە دیاردە سروشتی یەکان کرداری خولەکی یە[1].

لە رووی فیزیایی یەوە شەپۆل وەکو چیایە لە(أ) وە بەرز دەبێتەوە بۆ(أ) پاشان بۆ ئاستی سەرەتایی نزم دەبێتەوە کە(ج)، نمونەیان وەکو ئەوە وایە بەردێ فرێ دەدەیە ناو گۆمێکی مەندە شەپۆل دورست دەکات، ئەو گۆڕانەی نێوان(أ) و(ج) پێ ی دەوترێت شەپۆل (الموجە waves)[2].
پاشان لە بەرزی دا جار هەیە شەپۆلی دەریا بە(با) و گەردەلول(٤) پێ بەرز دەبێتەوە بەقەد چیایێك!

## ٦٩- (هەڵکشان و داکشانی ئاو) – المد و الجزر:

زۆر ئایەتی قورئانی هەیە ئاماژە بە هەلکشان و داکشانی ئاو دەکەن وەکو: (هەڵسانی لافاوی نوح) لە کوردستان و هەڵسانی رووباری (نیل) بۆ موسای نەوەی نوح لە میسردا.

﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾[3].

(١) الالكترنيات والحياة الحديثة/ ت: المهندس حسين احمد عيسى/ ل: ١٠.

(٢) الكون العميق/ د: علي الامير/ ل:٦٥.

(٣) هود: ٤٤.



واتە: وترا ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدەوەو ئـەی ئاسمـان ئاوەکـەت هەڵکێشـەوە. وەکـو دوایی باسی دەکەین). دەربارەی هەڵکشانی نیل بۆ موسـاو نقـوم بـوونی فیرعـەون و سـوپاکەی دەفەرمێ﴿فَانفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَالطَّوْدِ الْعَظِيمِ﴾[1].

واتە: ئاوە شەق بوو هەر لایە وەکو چیایەکی مەزن بـوو. دیـارە ئـەم دوو دیاردەیـە وەکـو موعجیزەیەك روویانداوە، بەڵام هێزی گیانی و هێزی سروشتی تێدا بەشدار بووە:

(١)(هویستن) دەڵێ: هۆی لافاوەکە ئەوە بوو کلکداریێ خولگەی زەوی بـڕی بـۆ ماوەیـەکی کورت. کەچی جیۆلۆجی ئەمساوی(ئەدوارد سوسن) دەڵێ: هـۆی لافاوەکـە هەڵکـشانەکی ئـاوی گەورە بوو ئارێکی بورکانی پەیدای کرد کە لە ناوچەی کەنداووە روویدا، ئەم لافاوەی رووبارەکـان یارمەتی دەربوو بۆ بە هێزی و پاڵنانی لافاوەکە[2].

هەرچی(د: زغلول)ە بڕوای وایە لافاوی نوح لە کوردستاندا بـووەو بـە ئـاوی رووبـار بـووە کەسازگارەو موعجیزەیەك بووەو جیا بووە لەو لافاوە دەریایی یانەی بە درێـژایی مێـژوو توشـی زەوی بوون. هەر چەندە دوو زانای فیزیایی ئەمریکی لە ساڵی(١٩٩٨) دا (ولیام رەییان) و(ولـتر پەتمان) ڕایان گەیاند لافاوی دەریایی کەبەر لە(٧٦٠٠) ساڵ ڕویداوە پەیوەندی بە لافاوی نوحـەوە نییە. [3].

**هەرچی زانای سروشت زانی روسی(ئیمانویل فلیکوفسکی)یە بڕوای وایـە نزیـك بوونـەوەی نیازکێ لە زەوی لەسەردەمی یوشع ڕویدا بێ و خۆری ڕاگرتبێ، وە موعجیزەکانی مووسـا بەمـە ڕویداوە. چونکە نزیك کەوتنەوەی هەسارەیەك یان نیازەکەکی گەورە لـە زەوی زۆر دیـاردە پەیـدا دەکات وەکو: سوڕانی زەوی بە دەوری خۆیدا خێرایی کەم بکات یان بوەستێ تا خەڵکی وا دەزانن خۆر لە ئاسماندا وەستاوە، لەوانە شەق بوونی دەریاو وەستانی چەند سـتونەکی هـەور لـە شـەو و ڕۆژدا، سەردەمی فیرعەونەکان هەسارەیەك ڕابرد زەوی لافاوەکی سوری بەسـەردا بـاری و زەوی و**

---

(١) الشعراء: ٦٣.

(٢) معجزة القران و الطوفان/ المهندس سعد حاتم محمد مزرة/ ل: ٩٣/ ط١.

(٣) مدخل الى دراسة الاعجاز العلمي/ د: زغلول/ ل: ٢٤٨.





نیل و دەریا سوراو بوون.

وەکو ڕەنگی خوێن، ئەمەش ئەم ئایەتە قورئانیە پشت گیری لێ دەکات﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ الطُّوفَانَ وَالْجَرَادَ وَالْقُمَّلَ وَالضَّفَادِعَ وَالدَّمَ﴾[1].

خۆڵی سور لە زۆر لای زەوی یەوە دادەباری ئەو موعجیزەیەی گردگار دورستی دەکات. کاتێ مووسا لە ژێر چەوسانەوەی فیرعەونی میسر ڕای کرد فیرعەون بە سوپاوە شوێنی کەوت دەریا شەق بوو، مووساو یارانی بە ساغی دەربازبوون، کاتێ فیرعەون و سوپاکەی چونە ناوی دەریاکە بۆ دۆخی ئاسایی گەڕایەوە و هەمووی قوت دان کەس دەربازیان نەبوو.

ئەم زانایە دەڵێ: ئەم چاخە سەروبەندی چاخی مووسا بوو، مێژوونوسانی چینی دەڵێن: ئەو کاتە خۆرئاوا نەبوو تا دارستانەکان سوتان و بەستەڵەك تواوە[2].

(٢) لە ڕووی گیانی یەوە، زانایانی ئیسلامی و خۆرئاوایی باس لە هێزەکی ڕووناکی گیانی دەکەن لە مرۆڤدا، کە پێغەمبەران وێستگەی ئەوەن و پیاوانی وەلی و خەڵکی ئاسایی تر بە پلەی جیا جیا هەیانە، بە پێ ی ماندوو بوون و کۆششی خۆیان، ئەم هێزەیە دەتوانێ کاری نا ئاسایی بکات وەکو لە قورئاندا خوا بە مووسا دەفەرمێ﴿اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاء﴾[3].

یان﴿وَنَزَعَ يَدَهُ فَإِذَا هِيَ بَيْضَاء لِلنَّاظِرِينَ﴾[4]. یان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی(اتقوا فراسة المؤمن فانه ينظر بنور الله) نمونەی کاری نائاسایی بۆ غەیری پێغەمبەران نمونەی دایکی مووسا و تالوت و مەریەم و زولقەرنەین و حەواریەکانە. لە یارانی پێغەمبەر(ﷺ) وەکو(السارية الجبل الجبل)ی عومەرو هەڵگرتنی دەروازەی خەیبەر و وەستاندنی خۆرە بۆ عەلی. وەکو لەگەردونناسی دا باسکراوە.

---

(١) الاعراف: ١٣٣.

(٢) العقائد الاسلامية/ السيد سابق/ ل:٢١٢.

(٣) القصص: ٣٢.

(٤) الاعراف: ١٠٨.




ئیمرۆ زانایـانی ئـەتیر بـەم هێـزە دەڵـێن: (هالـەی موگناتیـسی) و زانـستی فیزیـایی و میتافیزیکی بوونی باس کردووە(بیل) دەڵێ: (وزەیەکتان هەیە بە تـەنیا دەتـوانێ شـاری نیـورك بسوتێنێ، فیزیای پێشکەوتوو نەوەمان پێ دەڵێت).

دیارە بیری ساغ و بێ خەوش و نوێژ و خواپەرستی ئەم وزەیە پەرە پـێ دەدات و بـە هێـزی دەکات. (رونالد .م ماکری) دەنوسێ: (سایکوکینیزیا pk) واتـە: جولاَنـدنی تەنـەکان بـە هـۆی توانای گیانی نائاسایی بەبێ بەکار هێنانی هیچ هێزەکـی فیزیـایی ناسـراو. بـەڵێ: ئـەمریکا و روسـیا زۆر گرنگـی بـەم پاراسـایکۆلۆجی یـە دەدەن، وە بـەدیاردەکانی، وەکـو تلبـاتی و سایکۆکینیزیا بۆ مەبەستی پزیشکی و سیخوری و سەربازی. بۆئەمە سود لە پیـاوانی نائاسـایی وەردەگرن وە( بردن) باس لە( چەکی سایکترۆنی سۆڤیەتی) دەکات. وە بردن باس لـە( کۆنەسـتی مرۆیی – اللاوعي الجمعي الانساني) دەکات و ناوی ناوە(zarg) کە دەتوانێ هەوری ئەستێرەکان لە خولگەکەی دا رابکێشێ و گۆی زەوی و کۆمەڵەکـەی نارێـك بکـات و زەوی لـە خولگـەی دا بوەستێنێ و یاسا سروشتی یە سەرەکیەکان بگۆرێت. وەباس لە( تۆپی نـاوکی سـەروی مـەکانی دەکات) یان چەکی سایکترۆنی سۆڤیەتی. باس دەکات: چەکێکی سایکترونی سەرۆی مەکانی ژێر دەریایی ئەمریکی( تریـشر) ی لـە سـاڵی( ١٩٦٣) دا نقـوم کـرد، بـەهۆی کۆکردنـەوەی بـیری نائاسایی لەسەر وێنە فۆتۆگرافی یەکەی[1].

سەیرکە چۆن ساحیرانی کۆشکی فیرعەون بە هێـزی نائاسـایی و کۆنەسـتەکان چـۆن لەبـەر چاوی خەڵکی وەکو فێڵی چاو پەت و عەساکانیان دەکەن بەمارو چۆن هـەوەڵ دەدەن موسـا بـە ناردنی ترس بۆی تیرۆری بکەن وەکو(حميد الازري) باسی کردووە لە(الابـراج)دا. وتیـان﴿قَـالُوا يَـا مُوسَى إِمَّا أَن تُلْقِيَ وَإِمَّا أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنْ أَلْقَى قَالَ بَلْ أَلْقُوا فَإِذَا حِبَـالُهُمْ وَعِـصِيُّهُمْ يُخَيَّـلُ إِلَيْـهِ مِن سِحْرِهِمْ أَنَّهَا تَسْعَى فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِ خِيفَةً مُّوسَى﴾ ئەنجا خوای گەورە ئیحای دایە﴿لَـا تَخَـفْ إِنَّكَ أَنتَ الْأَعْلَى﴾[2].

---

(١) بۆ زانـستی پتر بروانە:( الحروب العقلية/ رونالد.م. ماكري)

(٢) طه: ٦٥-٦٨.




وە فەرمانی دایە دەستی هالەکەی لەسەر دڵدا بنێ تا خەیاڵ و وەسوەسە و ترسی ساحیران ..ت بکاتەوەو کاری تێ نەکات﴿اسْلُكْ يَدَكَ فِي جَيْبِكَ تَخْرُجْ بَيْضَاء مِنْ غَيْرِ سُوءٍ وَاضْمُمْ إِلَيْكَ جَنَاحَكَ مِنَ الرَّهْبِ﴾[1].

(دبلیونی) دۆزەرەوەی هاوسەنگی لەش دەڵێ: بەچاوی خۆم بینی چۆن ساحیرێ کەسێکی کوشت. زانایانی بایۆلۆجی دۆزیانەوە کە ئەو مەوادەی کیمیایی یەی لەش لە کاتی ترسدا پەیدای دەکات دەتوانێ مشك لە تاقیگەدا بکوژێت. وەکو لە(رونالد.م.ماکری)باسی کردووە.

بەڵام جیاوازی هەیە لەمیان موعجیزەو کەرامەت و کاری پاراسایکۆلۆجی و ساحیرەکان، هەربۆیەش ساحیرانی کۆشکی فیرعەون دوای دیتنی ناستی موعجیزەی مووسا لە چاو سیحری خۆیان ڕێك بروایان بە مووسا هێنا. موعجیزی خوا لەسەر دەستی ڕەوانە کراوانی خودا خۆی دەنوێنێ لەکاتی تایبەتی دا بۆ ملبەملانەو بەرەو روویونەوەو دەرخستنی توانا و شکۆی خوا و ڕاستێتی پێغەمبەرایەتی و ڕەوانەکراوی ئەو لە لایەن خوداوە.

## هەڵکشان و داکشانی ئاوی لە رووی فیزیایی یەوە:

هەڵکشان و داکشانی ئاو جوڵانی تەواوی ئۆقیانوسە، سەرباری ئەوەش بنی ئۆقیانوس و ئەو هەوایەی بەر ئۆقیانوسەکە دەکەوێ دەجوڵێنێ، دوای ئەوەش رووی وشکانی لەکاتی هەڵکشاند(١,٥)سم بەرز دەکاتەوە. پاڵ بەبەرگی گازییەوە دەنێ بەرەو مانگ یان خۆر چەند کیلۆمەترێك، تا مرۆڤ لە کاتی هەڵکشاندا هەندێ کێشی کەم دەبێتەوە. هۆکاری روودانیشی تارادەیێ نادیارە، بەڵام کارلێکردنی هەندێ هۆکاری جیا جیا کەکار لە دەرکەوتنی هەڵکشان دەکەن.

ئەوەندە ئاڵۆزە، کاتێ شارەزایان سۆراغی یان دەکەن لەبەردەمیان دا بۆتە گرفت. مانگ زەوی بە ئەندازەیێ زەوی ڕادەکێشێ، زەویش بە ئەندازەیێ مانگ ڕادەکێشێ، پاشان هەردووکیان بەدەوری چەقەکی هاوبەشدا دەسورێتەوە، گەر ئەم جوڵە هێلکەیی یە نەبوایە هەردووکیان خۆیان

(١) القصص: ٣٢.

پێکدا دەکێشا، بـەڵام هێـزی پاڵنـەری چـەقی(القـوة المركزيـة الطـاردة) جوڵەکـەيان هاوسـەنگی ڕاکێشان بۆ ناوخۆ ڕادەکێشێ. پاشان زەوی و مـانگ بە خولگەياندا بە دەوری خۆردا دەسـوڕێتەوە و ڕايان دەکێشێت.

هەرچەندە زەوی و مـانگ وەکو دۆلاَبەکی دوانەیی لەسـەر ئەم شێوەیە هاوسـەنگن، مـاددەی سەر رووی زەوی لەسەر ئەم شێوە هاوسەنگ نین، لەو نیوە گۆیەدا کە ڕاسـتەوخۆ دەکەوێتـە ژێـر کاریگەری مانگ ئەو کاتە هێـزی کێـشکردنی مـانگ تۆزێـك زیـاترە لـە هێـزی دژە پاڵنـەری دەرەکی(القوة النظرية المركزية المضادة) کەچی لە نیوە گۆی تری زەوی دا هێزی پاڵنـەری دەرەکـی بالادەستە، بە هۆی ئەم نارێکی یە کەمە لە هاوسەنگا دیاردەی هەڵکشان ڕوودەدات.

ئەم هێزە لە دوو ڕەگەز پێك دێ، شاوڵی و ئاسۆیی، هێزی شاوڵی مانگ لەچاو هـی زەوی کەمە، بەڵام هێزی ئاسۆیی یەکەی بۆ سەر زەوی ڕۆڵەکی گرنگ دەبینێ لە پەیداکردنی دیـاردەی هەڵکشاندا، چونکە گەر بەرەو مانگ بێ کەرەستەکان بەرەو ئەو خاڵە ڕادەکێشێ بەرامبەر خاڵی یەکەمە لە ئەنجامی ئەو هێزی لە سوڕی هەر یەکێ لە مانگ و خۆر بە دەوری یـەکتری دا پەیـدا دەبێ و، پاڵ بەناوەوە دەنێ بۆ ئەم لایە. بەڵام مانگ هەموو ڕۆژێ ناگۆڕێ بەڵکو زەوی دەگۆڕێ، ئەو ڕۆژانە هەر(٢٤) کات ژمێرێ خولی سوڕ دەدات هەموو ئۆقیانوس و دەریاکان جـارێ توشـی هەڵکشان دەبن، بەڵام مانگ لەم کاتەدا جێگیر نییە، تۆزێ لـە خولگـەی مانگانـەی بـە دەوری زەوی لە جێگای خۆی لادەدات، زەوی ناچار دەبێ لە سوڕی ڕۆژانەی دا(٥٠) خولەك زیاتر بکـات تا بوار بە رووی ئاو بدات ڕۆژی جارێ بەرەمانگ بێتە بەرەو روو ئەوە شەمە سـەعات نـۆو(٥٠) خولەك توشی هەڵکشان دەبێتەوە.

کەواتـە: ڕۆژێ دوو هەڵکـشان و داکـشان روو دەدات، واتـە: کـاتێ هەڵکـشان لـەو لایـە ڕوودەدات کەبەرەو روی مـانگە، لەلای تریشەوە هەمان هەڵکشان ڕوودەدات. خـۆر هـەر چـەندە زلە بەڵام لەبەر دووریيان لە زەوی نیو هەندەیێ مانگ کاریگەری هەیە بۆ سەر ڕوودانی هەڵکشان و داکشان. بەڵام کاریگەری ڕوودانی هەڵکـشان و داکـشان زۆرتریـان کـەمتر دەکـات بـە پـێ ی شوێنی نیسبی خۆی، کاتێ مانگ چواردەیە و خۆر و مانگ و زەوی لـە سـەریەك ڕاسـتە هێڵن



هێزی خۆری و مانگی زیاتر دەبێت، ئەو کاتە هەڵکشان و داکشان تا ئەوپەری بەرزو نزم دەبن کەبە(هەڵکشانی بەهاری) ناسراوە، بەڵام کاتێ خۆرو مانگ و زەوی گۆشەیەکی وەستاو دەگرن واتە مانگ لە دوو چارەکی یەکەم و سێ یەمدا، هێزی خۆرو مانگ دژ دێنەوە و(هەڵکشانی نزم) روو دەدات و ڕێژەی هەڵکشان و داکشان تا ئەوپەری کەم دەبێتەوە[1].

شایانی باسە(لاری تەوەری زەوی) و چوار وەرزەکان و جیاوازی دوری زەوی لە خۆر لە چوار وەرزەکانداو سوری هێلکەیی زەوی کە لە مانگ دورو نزیك دەکەوێتەوەو جیاوازی فراوانی رووی ناوو شێوەی جیۆمۆرفۆلۆجی ئەو روو قەبارانە هەموویان کاردەکەنە سەر شێوەکانی هەڵکشانی، هەر حەوزێکی زەریاکان و کەنداوێکی بچووك و گەورە شێوازی تایبەتی هەڵکشان خۆی هەیە...

بەڵام لە پانتایی ئۆقیانوسدا هێزی کریۆلس لەسوری زەوی پەیدا دەبێ کاریگەریەکی زۆری دەبێ، سۆنگەی ئەو کارلێکرنەش ئەوەیە ئەو هەڵکشانە کاتێ دەنیشێ تا لە وێنەی چەند شەپۆلێ دا لە ئۆقیانوسدا پێش بکەوێ تەزوی گەورەی ناوی هەڵدەگرێ لەناوچە بەرزەکانی ئاوی رایان دەکێشێ بۆ ناوچە نزمایی یەکان ناو سوری ئەو تەزوانە بە هێزی کۆریۆس بۆ لای ڕاست لە نیوە باکورداو لای چەپ لە نیوە گۆی باشوردا تەرزی هەڵکشانەکە بە ئالۆزی دەگۆڕێن لە کاتی دا قەبارەی ناوەکە گەورەیە[2].

بێگومان هەموو ئەم مانایانە و زانستی تری جیۆلۆجی و گەردوونناسی لە وشەی(قدرناه) وەردەگرین کاتێ خوای گەورە فەرمویەتی﴿وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ﴾[3]. یان ﴿الشَّمْسُ وَالْقَمَرُ بِحُسْبَانٍ﴾[4]. وشەی(قدرناه) واتە: ئەندازەمان بۆ داناوە. (بحسبان) واتە: خۆرو مانگ بە حیساب و ژمارەیەکی ورد دەڕۆن. وەکو ئامێرێکی وردی تەواو کە هیچ کەم موکوری یەکیان ڕوتێ ناکات، ئەوەی ئەم حیسابە وردو ئەندازەیی یانە ڕێك دەخات و دابینیان دەکات تەنیا دەسەڵاتی

---

(١) بروانە: (جغرافية البحار و المحيطات/ د: مهدي محمد علي/ ل: ١٥٠-١٥١ و گەردوونناسی نوسەر.

(٢) بروانە: (جغرافية البحار والمحيطات/ د: مهدي محمد علي/ ل: ١٥٠-١٥٥ و گەردوونناسی نوسەر.

(٣) يس:٣٩.

(٤) الرحمن:٥.



کردگاری مەزنە کە خاوەنی زانست و توانایەکی بیّ سنورە.

## ٧٠- تەزوی دەریایی (التیار البحری):

رابردوو باسمان کرد کە(ئۆقیانوسەکان و دەریاکان) جوڵەو هەڵکشان و داکشانیان هەیە، وە ئەم ئۆقیانوسانە لە جوڵەو چالاکی هەمیشەیی دان کە قورئـان لـە چەند وشەیەکی زانستی دا باسی کردوون وەکو﴿يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ﴾ یان ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾ مانا کراون. یان﴿حَتَّى إِذَا كُنتُمْ فِي الْفُلْكِ وَجَرَيْنَ بِهِم بِرِيحٍ طَيِّبَةٍ﴾ واتە: هەتا ئەگەر لە کەشتی دابن بە(با)یەکی چاك لیّ بخورەرێن﴿وَفَرِحُواْ بِهَا جَاءتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾[1]. واتە: وە دڵیان پیّ خۆش بوو، بایەکی گەردەلولیان بۆ هات و شەپۆلیان لە هەموو شوێنێکەوە هاتە سەر.

## راڤەی زانستی

ئاوەکان لە جوڵەیەکی هەمیشەیی دان لە هەموو لایەکەوە، لێرەدا چەند هۆکارێك هەیە ئانارامیان دەکات، لەوانە تیشکی خۆر کە هەمیشە کاردەکات بۆ گەرم کردنی سەر رووی ئاو لە بازنەی پانی خولگەیی دا، بەتایبەتی لە هێڵی یەکسان دا، بەمەبەش ئاوی گەرم دەکشێت، ئەنجا ئاستی سەر رووی ئاو چەند سەنتی مەترێك لە تەك هێڵی یەکساندا بەرز دەبێتەوە، گەر لەگەڵ ئاستی رووی زەریاکان بەراورد بکریّ لە هێڵەپانە ساردەکاندا، لەگەڵ ئەو جیاوازیەکەمەشدا لە ئاستی رووی ئۆقیانوسی جیهانی دا کەچی کاردەکات بۆ پەیدا کردنی لێژییەکی کەم کە تەزوی ئاوە لیّ وە سەر هەڵدەدات ئاوی روو لە ئاوی دا لە ناوچەی هێڵی یەکسانەوە بەرەو ئاراستەی هێڵەکانی پانی سەرەوەوە دەجولیّ لە هەردوو نیوە گۆی زەمیندا، هەرچی ئاوی ساردی قورسە ژێر دەکەوێت، هەمان کات لە ژێر ئاوی گەرمدا بە درێژایی بنی دەریا بەرەو هێڵی یەکسان دەڕوات.

---

(١) یونس: ٢٢.





کرداری ئاڵوگۆڕی نێوان ئاوی یەکسانی گەرم و ئاوی ساردی جەمسەر گرنگترین جۆری جوڵەکانە کە لە زەریاکانی جیهان ڕوودەدات، کەچی ئەم جوڵەیە دژوارو ئاڵۆزە بەهۆی ئەو هێزە گەورە شاراوەیەی لە ئۆقیانوسەکاندا سەر هەڵدەدات لە ئەنجامی سوڕی تەوەرەیی زەوی دا، چونکە زەوی کار دەکات بۆ لادانی باو ئاو بەرەو ڕاستی ڕێرەوەکەی لەنیوە گۆی باکورداو، وە بەرەو چەپی ڕێرەوەکەی لە نیوەگۆی باشوردا، ئەم دیاردەیە بە کاریگەری کۆریۆلس (coriolis) ناسراوە وە شوێنەواری(با) بۆ جوڵەی ئاو بە ڕۆیشتنی دەرکەوتووە، لە هەموو بایەکان ئارامتر بای(بازرگانی)یە کە فشاری بەرزی خولگەیی یەوە بەرەو هێڵی یەکسان پاڵ دەدرێ، لەوێ دا فشاری گەورەیی بۆ سەر ئاو تەزوی گەورە لە ئاوی ئۆقیانوسدا پەیدا دەکات لەو ناوچانەدا بەرەو خۆرئاوا دەڕوات کە دەکەونە باشورو باکوری هێڵی یەکسان.

بەرەچاوکردنی ئەوەی کە(با) کاری تێ دەکرێ بە هۆی دابەشکردنی گەرمایی لەسەر گۆی زەوی داو جوڵەی زەوی خۆیدا، بۆیە ڕێرەوێکی بازنەیی وەردەگرێ و بایەکە بۆ باکورو باشور لادەدات دوور لە هێڵی یەکسان. پاشان بایەکە بەجێگری هەڵدەکاتەوە بەپێ ی گۆڕانەکانی گەرمی بە ئاراستەی خۆرئاوا، کە بەجوڵە پاڵ بە ئاوی ڕووە دەنێ لە خۆرئاواوە بەرەو خۆرهەڵات پێچەوانەی ئەو ئاراستەیەی لای هێڵی یەکسانەوە بۆ دێ، بەم شێوەیە گێژاوی ئاوی گەورە بە پانتایی ئۆقیانوسی پەیدا دەبن. ئاوەکانی دەریاکان لە شێوەی ڕووبار و جۆگەدا بە ناو ئۆقیانوسەکاندا دەجوڵێن و بەچەند سیفاتێ لە ئاوی رووکاری تر، یان لە ئاوی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان جیا دەبنەوە کە بەرەو لای دەڕۆن، وەکو جیاوازی پلەی گەرمی و پلەی پەیتی خوێ و، ئەم ئاوە بزۆکانەیە زۆری بە(تەزوی ئۆقیانوسی) ناسراون. ئەم ئاوە بە شێوەی ئاوی تێکەڵاو دەردەکەوێ، بەڵام زۆر جار بەپێ ی بنەمای پێك هاتنی خودی تەزوەکە بە شێوەی تر دەردەکەوێت[1].

هەندێ جار بە هۆی کاریگەری هێزی جیا جیا دەجوڵێ کە کاردەکات بۆ جوڵاندنی ئاوی دەریا بە هەمیشەیی وەکو(با)و هێزی کێشی(با) لە(بارستایی × خێرا کردن) و هێزی کێشکردنی

---

(١) قورئان لە ڕاست ئەمە دەفەرموێ﴿مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ﴾ وەکو باسکرا.




مانگ و کە هەڵکشان پەیدا دەکات، کەبە زۆری بە هێزی یەکەم و سەرەکی ناوزەد دەکرێت. بەڵام هەندێ هێزی تر هەیە بە پلەی دووەم دێن لە بایەخ و کارتێ کردندا، وەکو هێزی(پاڵنانی چەقی) کە لە جوڵەی زەوی پەیدا دەبێ و هێزی(لێك خشانی ناوی).

لە سورشتدا سێ جۆر تەزوو هەیە، کە لە سێ هێزی سەرەکیەوە پەیدا دەبن:

(١)تەزووی لێك خشان(الاحتكاك) با پەیدایان دەكات.

(٢) تەزووی ڕاکێشان بە هێزی کێشکردن پەیدا دەبێ وەکو هەڵکشان.

(٣) تەزووی بەردەوام کە لە کاردانەوەی ڕابردوو پەیدای دەکەن وەکو دیاردەی داکشان.

هەندێ تەزوو بە تەزووی ڕێکەوتی ناسراون(التیارات العرضیة) بەپێ ی شوێنی ستونی یان دەکرێن بەسێ بەشەوە، لەخۆوە پەیدا دەبن و بەهۆکاری فیزیایی یەك ناگرن کە ئەمانەن:

(١)تەزووی ڕوویی(السطحیة).

(٢) تەزووی ژێرو(السفلیة).

(٣) تەزووی قوڵایی(الاعماق).

وە پلەی تەزووی ئۆقیانوس لە کاتی گواستنەوەی دا بۆ هێڵە پانە جیاجیان بە پێ ی گوشاری گەرمی ناو ناگۆڕێ، بۆیە تەزووی دەریایی بۆ تەزووی ساردو تەزووی گەرم دەگۆڕێ، بەپێ ی ئەو شوێنەی بۆی دەڕوات.

گەر تەزووەکان لە هێڵی پانی نزمەوە بۆ بەرز بچن بە تەزووی گەرم ناسراون، گەر لە هێڵی پانی بەرزی ساردە بۆ هێڵی خولگەیی و یەکسان بچن بە تەزووی سارد ناسراون. نمونەی تەزووی گەرم: تەزووی کەنداوو تیارکوروسیفۆر بەرازیل و مۆزەنبیقە، نمونەی تەزووی سارد: لبرادۆر و همبۆلتا و کەناری یە. تەزووەکانی زەریایی لە ڕێڕەودا جیان، هەیانە پێچەوانەی میلی سەعات دەڕوات لە نیوەی باکورو باشور، یان بە پێچەوانەوە، یان بەیەك ئاراستە دەڕوات ڕاست یان چەپ و پێشەوە، کە بە تەزووی(سایکلۆنی) ناسراون، مادام وەك میلی سەعات برۆن، گەر نابە(ئەنتی سایکلۆنی) ناسراون.

ئەو تەزووانەی بەیەك ناراستەدا دەڕۆن بە(تەزووی ڕاستەخۆ، ئەوانەی بازنەیین بەتەزروی



ـ ـمیی ناسراون. دیسان جوڵەی ئاوی بە هۆی ئەو قورسایی یە پەیدا دەبیّ لە ئاکـامی جیـاوازی ـێـتی ئاوی دەریاکان و زەریاکان دەردەکەویّ، یان لە ئەنجامی چڕی ئاو، جیاوازی ڕێـژەی دەریـاو ـۆقیانوس بۆ جیاوازی ئەو برە ئاوە دەگەڕێتەوە کەلە دەست چـووە لـەو بـڕە ئـاوەی لـە ڕێگـای ـەوبارو باران تێکەڵی دەبێتەوە، یان بەهۆی پەستانی هـەوایی. ئـەو ئاوانـەی ڕابـردوو باسـکران ـەمەو هۆیانەوە پەیدا دەبن بـە تـەزووی ڕەوان(الجاریـە) ناسـراون وەکـو تـەزووی(فلۆریـدا) کـە ـەگەرمی فلۆریدا بەرەو مەکسیك دەڕوات. ئەم تەزووانە بە دەزگـای تـەزوپێو کـە خێرایـی ئـاو ـەمێتون دەپێورێن[1].

ئەم تەزووانە بەشێك لە گەورەیی و مەزنی خودا پیشان دەدەن. (د: محمد راتب النابلوسـي) ـەنوسیّ: (یەکیّ لە نیشانەکانی خوا تەزووەکانی کەنداوی دەریایی یـە، کـە خێرایـیٔ(٨)کـم/س. گەر کەشتی یەك چووە ناوی و مەکینەکەی کوژایەوە(٨)کم/س دەڕوات بـیّ ئـەوەی مەکینەکـەی کاربکات. پانتایی ئەم تەزووە(٨٠)کم و قوڵایی(٤٥٠)م و چڕیەکەی(٤) ملیـۆن تـەن ئـاوە، لـە خولکێدا، ئـەم تـەزووە چـی دەکـات؟ (١٣٠) هـەزار تـەن لـە(١٠) ڕۆژدا لـە جەمـسەرەکاندا دەتوێتـەوە، کـە سـودەکانی نـاژمێردرێن، هـەوای ئـەوروپا فێنـك دەکـات، هـەوای فێنکـی نیسکەندنافیە تەزووی کەنداو پەیدای دەکات.

تەزووی تر هەیە لە قوڵایی دەریادا لە قوڵایی(٣٠٠٠)م دا، گەر ژێردەریاکـان(الغواصـات) بکوژێتەوە لەویّ دا دەیان گوازێتەوە. ئەمەش جێگای ورد بونەوەیە بەڵگەیەکی تر لەسەر مەزنی خوا لەم بابەتەدا ئەمەیە: لێرەدا تەزووی سارد هەیە بەرەو کەناری ئەمریکای باشـور دەڕوات تـا بگاتە وڵاتی(پیرۆ و شیلی)، لێرەدا ئەم تەزووە ساردە چی دەکات؟ بڕەکی زۆر گـژوگیای دەریـایی هەڵدەگریّ و ژمارەیەك ماسی سەردینی زۆر بەرەو لای خۆی کۆدەکاتەوە، تابینە خـۆراکی دەیـان ملیۆن باڵندە بە ناوی(قەڵە ڕەشەی دەریا) یان(ماسی گرە)، ئەم باڵندانە پـەیین لـە دوای خۆیـان بەجیّ دێڵن، کە بەداهاتی سەرەکی ئەوا، دادەنریّ چونکە پێشکەوترین پەیینی جیهانی پاشماوەی ئەم باڵندانەیە، (٥٠) ملیۆن باڵندە پاشماوەی ئەوانە بۆ جیهان دەنێردرێت و بەشۆفلّ تیّ دەکـریّ،

---

(١) بە کورت کردنەوەو دەسکاری لە(جغرافیة البحار والمحیطات/ ل: ١٦٤-١٧٠. وەرگیراوە.





گەلانی کەناری ئەمریکای باشور داهاتی پاشماوەی ئەو باڵندانەیە کە لەسەر ماسی سەردین دەژین، ساڵانە(٣) ملیۆن تەن لەو ماسیانە دەخۆن، ئەم ماسیانەش ئەو گژوگیایانە رادەکێشێت کە ئەو تەزووانە دەیان هێنن[1].

بەڵێ خوا رۆزی ئەم گەلانە و ئەو ماسیانە و ئەو باڵندانە دەدات، ئەمە بڕوارو یاسای رۆزی دەری زانایە.!

## ٧١- تاریکایی ناو دەریا قوڵەکان و ئۆقیانوسەکان:

**﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ سَحَابٌ ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ إِذَا أَخْرَجَ يَدَهُ لَمْ يَكَدْ يَرَاهَا وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُورًا فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾[2].**

واتە: یان وەکو تاریکی یەکانی دەریایەکی قوڵە، شەپۆل دایپۆشیوە، لەسەر ئەوەوە شەپۆل هەیە، لەسەر ئەو هەور هەیە، تاریکایی لەسەر تاریکایی یە، گەر دەستی دەربێنێ نزیك نییە ببینێت، کێ خوا رووناکی نەداتێ هیچ رووناکیەکی نییە.

لەم ئایەتە قورئانیەدا زۆر ئیعجازی جیۆلۆجی و دەریایی دەبینرێت، هەندێکیان باس کران. ئەوەی لێرەدا مەبەستە بوونی تاریکایی یە لەناو دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا. (بحر لجی) لای(قتادە) دا واتە: (بحر عمیق).

### (رای زانستی)

(١)یەکەم کەس کە دۆزییانەوە دەریاکان تاریکن دوو زانای گەورە بوون بە ناوی( ولیام بیب) و( ئۆر نیس بارثون)، ئەم زانایانە بینیان قوڵایی دەریاکان رێگا لە تیشکی خۆر دەگرێ و دەیان مژێت و بوارنادات بڕواتە ناویەوە، یەکەمجار روناکی سور نامێنێ، ئەنجا سەوز، شینی تلخن دەمێنێتەوە، دوای( ٥٠٠)م دەریا تاریك دەبێت و ماسیەکان بەرەش و تلخن و ئەر خەوانی

---

(١) موسوعة الاعجاز العلمي/ ايات الله في الافاق/ د: محمد راتب النابلوسي/ ل:٢٠٧-٢٠٩. بە کورت کردنەوە.

(٢) النور:٤٠.





نێك دەردەكەون. ئەمەش موعجیزەیەكی گەورەیە بۆ پێغەمبەر( ص) وەكو( مستر براون) كە زانایەكی دەریایی بەریتانی یە بەزانایەكی موسڵمان دەڵێ: ئایا پێغەمبەری ئێوە سواری كەشتی بووە؟ وتی: نەء وتی: كێ فێر زانستی دەریایی كردووە؟ زانا موسڵمانەكە وتی: مەبەستت لەو پرسیارە چییە؟ مستر براون وتی: لەكتێبی ئیسلام ئایەتەكم خوێندۆتەوە، هیچ كەسێ پەی پێ نابات مەگەر پسپۆربێ لە دەریازانی دا، ئەویش ئەمەیە﴿أَوْ كَظُلُمَاتٍ فِي بَحْرٍ لُّجِّيٍّ﴾[1]. لێرە دا قورئان ئاماژە بەسێ تاریكایی دەكات چۆن ئاماژە دەكات كۆرپەلە لە منداڵدانـدا سێ پەردەی تاریك دایپۆشیوە، وە چەندان زانستی تر وەكو:

(١) تاریكایی دەریایی قوڵ بەتەواوی.

(٢) تاریكایی ڕووی دەریا بەنیمچە تەواوی.

(٣) تاریكایی ئەو دەریایەی دەكەوێتە نێوان هەردوو ڕووی دەریای دووەم كە لەسەر ڕووە. ئەمانە تاریكایی لەسەر تاریكایین.

(٤) لە ناوەراستی دەریاكاندا ناوچەی قوڵی تاریك هەیە.

(٥) زۆربەی دەریاكان بەهەوردا پۆشراون و لەتەك خاڵی دەریا قوڵەكان دەبێت.

(٦) زانست دان بەبوونی شەپۆلی ناو دەریا قوڵەكان نێت كە خاڵی ناوبڕی نێوان دەریای قوڵ و تەنكە.

(٧) ژیانی ماسی و پلەی چڕی و گەرمی دەریای قوڵ لەهی دەریای تەنك جیاوازە.

(٨) زانست دان بەبوونی دوو شەپۆل دادێنێ لە دەریای قوڵدا.

(٩) زانست سەلماندویەتی ناوچەی دەریای تاریك، تاریكایی لەسەر تاریكایی یە. لەسەر ڕووی دەست پێ دەكات تا بەرەو قوڵایی بڕوا پتر دەبێ

(١٠) زانست سەلماندویەتی دەریای قوڵ لە هەموشتێ دا لە دەریای تەنك جیایە[2].

(١١) زانست ئاماژە بە ڕووناكی زیندەگی دەكات( الانارة الحيوية) كەخوابە هەندێ زیندەوەرانی

---

(١) الموسوعة الكونية الكبري/ ل: ٣٠٧- ٣٢٤ سەیریكە.

(٢) بڕوانە:( الموسوعة الكونية الكبرى) ج ٨/ ل: ٣١٨- ٣١٩.





داوە بۆ ڕووناکی دەریاکان.

وەکو لە( الموسوعة الكونية الكبرى) و( كل شيء عن البحار/ فروينادلين) دا باسکراوە، قورئانیش ئاماژە بەم هەموو زانستانە دەکات لەم چەند ئایەتانەدا، ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ ئەو( د: زغلول النجار) پسپۆر لە جیۆلۆجیا و ئیعجازی زانستی دا ڕوونی کردۆتەوە ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژەبە تاریکایی تەواو دەکات لە سەربنی دەریا قوڵەکان و ئۆقیانوسەکان و جەخت دەکاتەوە تاریکایی ئاویتەیە، هەرکام لە هەور و شەپۆلی ڕوویی و شەپۆلی ناوەوە. ئەمانە دەورەکی باڵادەبینن لە ڕودانی دا، ئەم ڕاستی یانەش مرۆڤ لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا پەی پێ بردووە. ئەم تاریکایی ئەی قورئان باسی کردون و کەرێگا لە ڕوناکی خۆر دەگرن کە چاوگی گەرمی و ڕوناکی یە بۆ تاریك کردنی بنی دەریاکان و ئۆقیانوسە کان:

(١) ڕێگایی یەکەم: هەور دروستی دەکات: تیشکەی لە خۆرەوە دێ لە شەپۆلە کەهرومرگناتیسی یەکانەوە، لە تیشکی( ڕادیۆیی) یەوە تا( سینی) پێك دێ، بەڵام زۆربەی (ڕووناکی بینراو) و تیشکی( ژێر سور) و( سەربنەو شەیی)یە، سەرباری هەندێ تەنۆلکە (الجسيمات)ی سەرەتایی خێرای وەکو (ئەلکترۆنەکان). زۆربەی تیشکی سەربنەوشەیی(بازنەی ئۆزۆن) دەیگێڕێتەوە، کاتێ تیشکەکەی تر دەگاتە بەشی ژێرەوەی بەرگە هەوای زەوی( هەور نزیکەی(٣٠٪) ی هەورەکە دەداتەوەو پەرتی دەکاتەوە. هەور هەڵمی ئاوو گەردو تۆزی هەواو شتی تر لە ئاوکەکانی تری چڕکردنەی بەرێژەی(١٩٪) هەڵدەمژێ وەکو تیشکی خۆرکە بەلای دا تێ پەڕدەبێ، بەم پێیە هەور بە دانەوەو پەرت کردنەوە و مژینی نزیکەی( ٤٩٪) ی تیشکی خۆر قەدەغە دەکات. تاریکایی دەخاتە سەر زەوی بەنیسبی، لەوانەش وشکانی و ڕووی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان.

(٢) شەپۆلی سەر ڕووی ئاو( الامواج السطحية)ی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان تاریکایی دووەم دروست دەکەن: ئەو تیشکەی دەمێنێتەوە و بەڕووی دەریاکان و زەریاکان دەگات نزیکەی( ٣٥٪)ی تیشکی( ژێر سور)ی بەکاردەبرێ بۆ بەهەڵم کردن و دروست کردنی( هەور) و کرداری( ڕۆشنە پێك هاتن = التركيب الضوئي) کە ڕووەکی دەریایی پێ ی هەڵدەستن. ئەوەی ماوەتەوە لە





(ڕووناکی بینراو = ڕووناکی سپی) شەپۆلی ڕوویی دەریا( ٥٪)ی دەدەنەوە بە ڕێژەیەکی تر تاریکایی نیسبی لە دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا پەیدادەکەن.

لاواز بوونی تیشکی بینراو بەڕەت بوونی بە ئاوی دەریاکان و زەریاکاندا:

ڕووناکی بینراوی تیشکی خۆر کاتی ڕەت بوونی بە بارستایی ئاوی دەریاکان و زەریاکاندا توشی کرداری شکانەوەی زۆر و شی بونەوە بۆ شەبەنگی(الاطیاف)ی جیاجیاو مژین دەبێ بە هۆی گەردەکانی ئاوەوەو گەردەکانی خوێ ی تواوەو ئەو تەنە ڕەقانەی پێوەی گیرساوە، وە بە هۆی جۆرەها زیندەوەری ئاوی و ئەو ماددە ئەندامی یانەی زیندەوەران دەیرێژن، هەموو ئەوانە وردە وردە تیشکی خۆر لاواز دەکەن.

لە(١٠)م دا یەکەم جار تیشکی سور دەمژێ، ناگاتە(٥٠)م شەبەنگی پرتقالی، ئەنجا زەرد بە تەواوی دەمژرێ، لە(١٠٠)م دا شەبەنگی سەوز دەمژرێ، لە(٢٠٠)م دا شەبەنگی شین بە تەواوی دەمژرێ، هەر لەبەر ئەوەش سەر رووی ئاوەکان شینە(وەکو ئاسمان) چونکە لە(٢٠٠)م دا بۆ سەرێ لەناو ئەم بارستایی یە ئاوەدا ئەم شەبەنگە سپی یە پەرش دەبێتەوە. بۆیە زۆربەی ڕووناکی بینراو لە قولایی (١٠٠)م لە ئاستی رووی دەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا دەمژرێت و(١٪)ی بۆ قولایی(١٥٠)م (١٠٪) و بۆ قولایی(٢٠٠)م لە ئاوی روونی لە خۆهەڵواسەکان بەردەوام دەبێت.

سەرباری خێرایی تیشک کە(٣٠٠) هەزار کم/چ لە بۆشایی داو(٢٢٥) هەزار کم/چ لە ناوەندی ئاوی دا لە ئاوەکی(١٠٠٠)م قوڵی دا دوای(٢٠٠)م تاریکی نیمچە تەواوی بەسەردا دێ و تەنیا(١٠,٠٪)ی ڕەت دەبێت. ئەم بڕەش دەست بە پەرتی و شکانەوە دەکات و ناگاتە(١)کم کە بە تەواوی نامێنێت.

ئەوەی دەمێنێتەوە تەنیا یەك بەشە لە(١٠) تریلۆن بەش، مام ناوەندی قولایی ئۆقیانوسەکان(٣٧٩٥)م، ئەو پەڕی قوڵیەکەیان(١١)کم و(١١,٤٣٠)م ە. بەم شێوەیە لە نێوان ئەم دوو ئاستەدا قولایی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان لە نێوان(٤-٥)کم لەمام ناوەندی داو(٨-١٠)کم لەو پەری قولایی دا، کەواتە: قولایی ئەم ئۆقیانوسانە شەوەزەنگ و ئەنگوستەچاوە.




(٣)شەپۆلەکانی ناوەوە(الامواج الداخلیە) هۆکاری تاریکی سێ یەمن لە بنی دەریا قوڵەکان و ئۆقیانوسەکاندا:

سەرباری ئەی بونەوەی روناکی بینراو لە ئاوی دەریاکان و زەریاکاندا هۆکاری سەرەکی بۆ تاریکایی تەواو شەپۆڵە لە ناوەوەیی یەکانن لە ناو ئەو دەریا قوڵ‌و ناچۆنیەکانەدا. ئەم شەپۆلە ناوەکیانە﴿يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ﴾ لە نێوان دوو بارستایی چڕی جیاوازدا دوروست دەبن، چڕی ئاوی دەریایە قوڵەکان و ئۆقیانوسەکان بە پێ ی جیاوازی پلەی گەرمی و خوێ ی تەواوە دەگۆڕێت. بارستایی ئاوییەکان لەم رووە ئاوییە گەورانەدا بە جیاوازی ئاسۆیی جیا دەبنەوە بە هۆی ئاوچەکانی ئاوو هەوایەکەیان ئاسۆیانە لەمیان رووبەرێکی فراوان هێڵی پانی دا دەجوڵێن و سیفەتی سروشتی نوێ وەردەگرن لە پلەی گەرمی و خوێ بەهۆی گۆڕانی تێکڕایی یەکان گەرم کردن یان سارد کردنەوەو تێکڕایی یەکانی هەڵم و بارینی باران، کە ناچاری دەکات شاوڵیانەش بجوڵێت. وە ئاوی دەریا قوڵەکان و زەریاکان بە شاوڵیش جیا دەبنەوەبۆ بارستایی روویی و بارستایی قوڵی ناوەند و بارستایی نیمچە جەمسەری قوڵ و بارستایی زۆر قوڵی دەوری جەمسەری، ئەم جیاوازیەش تەنیا لە دەریا قوڵەکاندا پەیدا دەبێت، لێرەدا دیاری کردنی قورئان(بحر لجي) وەسفێکە پێشی نەکەوتووە. شەپۆلی ناوەکی(يَغْشَاهُ مَوْجٌ) لە سنوری نێوان دوو بارستایی جیا لە چڕی دا دروست دەبن، شەپۆلی زۆر درێژو بەرزن و بەرزایی شەپۆلە رویی یەکان تێکڕایی یەکی گەورەیان هەیە و درێژییان دەیان و سەدان کیلۆمەتر دەبێت و بەرزی شەپۆلەکان (٢٠٠)م دەبێت و لە خێرایی(٥٠-١٠٠)م دەڕۆن/چ بۆ ماوەی نێوان(٤) خولەك و(٥٥)کات ژمێر دەڕۆن.

سەرباری ئەوەش ئەو شەپۆڵانە ڕاستەو خۆ نابینرێن، هەر چەند بە دەزگای میکانیکی بە هۆی چەند پێوەرێکی ئەو ناریکیانەی بەسەر ئەم شەپۆلە ناوەکی یانە دادێ پەیان پێ دەبرێ، ئەمەش ئاماژەیەکی قورئانی یە هیچ سەرکەشێ نکۆڵی لێ ناکات. ئەم شەپۆلە ناوەکیانە لە قوڵایی نزیکەی(٤٠)م دەست پێ دەکەن لە ئاستی رووی ئاوی زەریاکان، کە لەوێ دا لەنکاو سیفاتی ئاوی دەست بە گۆڕان دەکەن لە چڕی و گەرمی دا، لە هەموو قوڵایی یەکانی تر دەست





پێ دەکات مادام جیاوازی چڕی هەبێ لەبارستایی ئاوی دا. لەسەر رووی شەپۆلی ناوخودا شەپۆلی روویی دێن(يَغْشَاهُ مَوْجٌ مِّن فَوْقِهِ مَوْجٌ) دێ کە ڕەشەبای دەریایی پەلدایە، کە هەر کامێ لە باو هێزی ڕاکێشان و بومەلەرزە و سوڕی زەوی و هەلکشان هۆکاری تری زانراوو نەزانراو دروستی دەکەن.

ئەم شەپۆلە سەر رویی یانە کۆسپەکی ترن لبەردەم رووناکی، ئەنجا هەور دێ(٤٩٪)ی کۆی رووناکی خۆر دەمژێتە بێ گەردی بۆ ئەو خرایەی(١٤) ساڵێکەمەوبەر ئەم ڕاستی یانەی ئاشکرا کردوون. دواجار قورئان ئاماژە بە زانستی تری دەریایی دەکات، کە دوای داهێنانی ژێردەریاکان(الغواصات) پەیان پێ براوە. خوای گەورە فەرمویەتی﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾ النور:٤٠.

بینرا لە ناو قولایی ئەو ئۆقیانوسانەدا بلیۆنەها زیندەوەر هەیە لێرەو لەوێ لە قولایی تاریکایی دا بلاوبونەوە کردگار لە جەستەکیان دەزگای رووناک کردنەوەی بە ناوی رووناک کردنەوەی زیندەگی(bioluminescence) بۆ دارشتن.

ئەم رووناک کردنەوە دەگمەنە لە ئەنجامی کالێکردنی گەردی کیمیایی ئەندامی بەناوی(لیوسیفیریز) و گەردی ئۆکسجین دا بەرهەم دێ، لە ئەنزیمەکی تایبەتی دا بە ناوی(لیوسیفیریز) ئەم کارلێکردنە دەگمەنە کرداری ئۆکسیدبوونی دەگمەن پێك دێنێ کە بۆ ئێمە ناسراوە لە جەستەی زیندەواراندا، برەکی زازاوی گرمی پێك هێنانی لەگەڵدانییە.

ئەوەی سەیرە هەر زیندەوەرەکە لەو تاریکایی دا دەژین پێك هاتەی کیمیایی تایبەتی یان هەیە بۆ پێك هێنانی رووناکی و ئەنزیماتی تایبەتی خۆی هەیە. ئەو پرسیارەی دێتە پێشەوە ئەوەیە کێ جگە لە خوا هەریەکە لەم زیندەوەرنەی ناو قولایی دەریاو زەریاکانی ئەم رووناکیە زاتیەی پێ داون؟ ئالێرەدا دوری ماددی ئەم دەقە قورئانی یە موعجیزەیی یە دەردەکەوێ، وەکو چۆن دووری مەعنەوی دەردەکەوێتە﴿وَمَن لَّمْ يَجْعَلِ اللَّهُ لَهُ نُوراً فَمَا لَهُ مِن نُّورٍ﴾[1]. النور:٤٠.

(١) بەکەمێ کورت کردنەوەو دەسکاری لە(مدخل الى دراسة الاعجاز العلمي/ د: زغلول النجار/ ل: ١٩٦-٢٠٣. وەرگیراوە.




لێرە واتە شبیهی خوا بۆ دڵی بێ بڕوایانە کە وەکو چۆن ئەم تیشکە خێرایە نـاتوانێ بـۆ ناو قوڵایی دەریاکان زەریاکان بڕوات بەربەستی لە پێشە، ئاواش ڕووناکی قورئان شـەپۆلەکانی ناتوانێ پەردەکانی(دڵ) ئەوان ببڕێت و دڵیان ڕووناك بکاتەوە.﴿ خَتَمَ اللّـهُ عَلَـى قُلُـوبِهِمْ وَعَلَـى سَمْعِهِمْ وَعَلَى أَبْصَارِهِمْ غِشَاوَةٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ عظِيمٌ﴾[1].

بەڵێ قورئان ڕووناکیە، وە زانستی نوێ سەلماندویەتی وەکو(والتر کیلر) لەسـەر شاشـەی ڕەنگاو ڕەنگ ئەوەی دەرخستە لە دەوری لەشـی مرۆڤـدا ڕوونـاکی بـەك هەیـە بـەناوی هالـەی موگناتیسی کارەبایی کە حاڵەتی دەرونی ئەو کەسەیە کاردەکاتە سەر ڕەنگی هالەکە، هەر ئێش و ئازاری ئەو هالەیە دەشێوێنێت وەکو لە(عصر الخوارق/ ج.ا.ج. رایز/ل: ٨٤)دا باسکراوە.

وە(هەست)و(ئەست) بـە گونـەو تـاوان دا ەپۆشـرێن و بـە شـێوەیەك دڵ ڕەق دەکـەن و دادەپۆشن کە ئیحا و ئیفرۆسماندن و وەی قورئانی ڕ ئامۆژگاری ناتوانن وەکو شەپۆلەکی گیانی ئەم تاریکی یانە ببڕن و بچنە ژوورو ڕووناکی بکەنەوو گۆڕانی باشی ئیمانی لەم کەسەدا دروست بکەن.

---

[1] البقرة:٧.





**٧٢- چۆن دەریاکان و ئۆقیانوسەکان تەنەکان و کەشتی یەکان بەرز دەکەنەوە؟**

**٧٣- یاسای پاڵنان بۆ سەرەوە لە ئاودا:**

**٧٤- دۆزینەوەی هێزی گواستنەوەی نوێ لە پێشبینی دا وەکو پاپۆرە زلەکا**

**٧٥- چۆن ژێدەریایەکان نقوم دەبن و سەر ئاو دەکەونەوە؟**

قورئانی مەزن لە زۆر ئایەتدا ئاماژەی بە هێزی پاڵنەری ئاو کردە بۆ سەرەوە، کە یەکێکە لە خاسیەتەکانی ماددەوبەر لەڕاستی ئەم یاسایەی بەمرۆڤ گەیاندووە وەکو بەهرەیەکی خوا بۆ مرۆڤایەتی، گەرنا نەدەتونرا هاتووچۆ بکرێ و، گیانداران سەر ئاو بکەون و، کەشتی و ژێردەریاکان سەر ئاو بکەون و سردلە دەریاکان وەربگرێت:

(١)﴿ اللَّهُ الَّذِي سَخَّرَ لَكُمُ الْبَحْرَ لِتَجْرِيَ الْفُلْكُ فِيهِ بِأَمْرِهِ ﴾[1]

واتە: خودایە کە دەریای بۆ ڕام کردوون تـ بە فەرمانی(یاسا)ی ئەو کەشتی بڕوا بەناوی دا.

(٢)﴿وَتَرَى الْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُوا مِن فَضْلِهِ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[2]

دەبینی کەشتی چۆن نوکەتیژەکەی پێشەوەی ئاو دەبڕێ تا لە زێدەچاکەی خوا داخواز بکەن و شایەد و سوپاسگوزاری بکەن.



---

(١) الجاثية:١٢.

(٢) فاطر: ١٢.





(٣)وتورئـان پێـشبینی دەکـات داهـاتوو کەشـتی و پـاپۆڕی گـەورەی وەکـو چـیاکان دادەهێنن﴿وَمِنْ آيَاتِهِ الْجَوَارِ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ﴾[1]. وشەی(الجـوار) و(المنـشآ البحريـه) و(الفلك) هـوویان زاراوەی نوێن بۆ کەشتی وپاپۆڕدکان بەکاردێت.

(٤) دەریاکان: گواستنەوەو دەرهێنانی ماسی و مرواری و مەرجان و نیسفنج و مـاددەی تر بەکار دێنن﴿وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا﴾

(٥)﴿ وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاءٍ وَغَوَّاصٍ﴾[2]. شەیاتینەکان هەمرویان وەستاو ژێردەریابوون.

(٦) ﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ الْفُلْكَ تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِنِعْمَتِ اللَّهِ﴾[3]. تابا نابینی کەشـتی بـە بـەهرەی خوا دەڕوات. لێرەدا وشەی‌نعمه الله) و(بأمره)ئاماژەیە بۆ ئەم یاسایە: (هێزی پاڵنـان بـۆ سەرەوە):

## ڕاڤەی زانستی:

**(١) بۆچی کەشتی کە لە تەنی رەق دوورست کراوە سەر ئاو دەکەوێ؟**

خەڵکی لە دێرینەوە ئاشنا بوون بە هێزی ئاو بۆ پاڵنان، بـەڵام دۆزینـەوەی سروشـتی ڕاستی یەکەی لەسـەر دەستی زانای یۆنانی(ئەرخەمێـدس) بـو (٢٥٠ پ.ز). ئەرخەمێـدس لە ڕێگای ئەزمونەکانیەوە بینی ئەو تەنەی دەخرێتە ناو ئاوەوە بەرەو سەرەوە پـاڵی دەدات کە یەکسانەبە کێشی ئەو ئـاوەی ئـەو تەنـە لای ئاوە. ئـەو کەشـتی یـەی لـە تـەنی ڕەق دروست کراوە زۆر کەللە بەری هەوایی تێدایە تێکڕای چڕی یەکەی زۆر کـەم تـرە لـە چـڕی ئاو، تا وردە وردە ژێر ئاو بکەوێ دەگاتە خاڵێ کە ئەوەنـدە ئـاوە لادەبـات بـە ئەنـدازەی کێشی خۆیەتی، پاشان لەم بارەدا سەر ئاو دەکەوێت. گەر ئەم تەنەیە چڕ لە چـڕی ئـاو پـتر بێ وەکو ئاوێزێ یان شیشەیەکی ئاسن ئەوەبە ئاو دەکەوێت[4].

---

(١) الشوری: ٣٢.

(٢) ص: ٣٧.

(٣) لقمان: ٣١.

(٤) كنوز العلم/ وليم فرجارا/ ل: ١٠٠.





دیارە لە قۆناغەکانی سەرەتایی دا مرۆڤ فێری ئەوە بوو بە هۆی پارچە تەختەی لێك بەستراو بە ناو ئاودا بڕوا، پاشان بە هۆی تەختەو بامبۆکە بە شێوەیەکی تایبەتی بەیەکەوە دەبەستران دەستی کرد بە هاتووچۆ. یەکەمین بەلەمی چارۆگەداری نزیکەی(٦٠٠پ.ز) دروست کرد، کە پشتیان بە جوڵەی با دەبەست .

ساڵی(١٧٨٧) بۆ یەکەم جار ئەندازیارێکی ئەمریکی(جان فیچ) ماتۆری هەڵمی بەکار هێنا بۆ کارپێکردنی کەشتی یەکەی خۆی. لە کۆتایی سەدەی(١٨)دا ژمارەیەکی زۆر کەشتی دروست کران بە(دیزل) کاریان دەکرد. تازەترین پێشکەوتیش لە بواری پیشەسازی کەشتی دا بەکار هێنانی(وزەی ئەتۆمی بوو. ساڵی(١٩٥٤) ئەمریکا یەکەم کەشتی ئەتۆمی دروست کرد[1].

بەڵێ ئیمرۆ کەشتی داهێنراوە شارێکە و وەکو چیایە لە چەند قاتێ پێك هاتووە: (لێرەدا کەشتی نەوت هەڵگر هەیە یەك ملیۆن تەن، (٧٠٠) هەزار تەن، تا(٨٠٠) هەزار تەن هەڵدەگرن[2].

**قورئان دەفەرمێ:** ﴿وَلَهُ الْجَوَارِ الْمُنشَآتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلَامِ﴾.

**بەڵێ پێشبینی قورئان هاتەدی.** ئەم کەشتی یانەی ئێستا: ( لە چەندقاتێ پێك **هاتوون. ژوورەکانی قاتی سەرەوە.** کە بەشی خوارە عەمباریان پێ ئەوترێ، کەشتی یە تازەکان **تەنافەت بۆ سەرکەوتن** و دابەزین تەنەنوور(مصعد) بەکاردێنن، جگە لەوەی هۆڵی نان **خواردنە ژووری** نارلیشگە. وەرزشگە، مەلاوانگە، خزمەتگوزاری تریان تیایە....)[3].

(٢) وە **قورئان ئاماژە** بەوە دەکات کە بۆ یەکەمجار(نوح) پێغەمبەر(ﷺ) لە کوردستاندا یان- **دۆڵی دۆزێ دا** گەورەترین و پێشکەوترین کەشتی دروست دەکات،

---

(١) بانکی زانیاری بۆ نەوجەوانان/ د: سۆزیت گریت ... وەرگێڕانی ... حەمە غەریب/ ل:٧١.

(٢) ایات الله في الافاق/ د: محمد ثابت التیفوسي ... ه

(٣) بانکی زانیاری/ ل: ١٧٠.

کەسەر نشینەکی زۆر هەڵبگری، لە ئادەمیزادو لە گیان لەبەران، کاتیٚ خوا فەرموی﴿وَاصْنَعِ الْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا﴾[1]. واتە: کەشتی یەکە بە چاودێری ئێمە و سروشی ئێمە دروست بکە. تا خۆی و پەیرەوانی لەو لافاوە بپارێزیٚ کە دۆڵی دۆزیٚ دەگرێتەوە﴿فَأَنجَيْنَاهُ وَمَن مَّعَهُ فِي الْفُلْكِ الْمَشْحُونِ﴾[2]. وە کەشتی یەکەی لەسەر کێوی جودی نیشتەوە﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾[3]. لە کوردستاندا.

(٣) (ژێردەریایی-الغواصات) کە وشەیەکی قورئانی و زانستی یە ئەوەیە: (کەشتی یەکە لە هەموو لایەکەوە داخراوە بە ئاسانی لەسەر ئاوو لە ژێر ئاودا دەتوانیٚ کاربکات و بجولێت. مرۆڤ لەسەردەمی کۆنەوە بۆ گەیشتنی بە قولایی دەریاکان بۆ گەڕان بە دوای ئەڵماس و مرواری دا هەوڵی زۆری داوە، ئەو بۆ سەرکەوتن لەو کارەدا هەوڵی دا ئامێرێك دا بهێنریٚ کە نیوانیٚ بچێتە ژێر ئاوەوە. بۆیە یەکەمین ژێردەریای لە لایەن(کارنلیۆس ڤۆن دربل) لە هۆڵندا لە ساڵی(١٦٢٠) دورستکرا، کە بتوانیٚ(٣-٤)م بچێتە ژێر دەریاوە. لە جەنگی جیهانی دووەم) دا(١٩٣٩-١٩٤٥) دا ژێردەریایی دیزڵیشی بەکارهێنا لە جەنگدا. ئەمرۆ زۆر لە ژێر دەریاکان بە وزەی ئەتۆمی کار دەکەن[4].

(٤) ئەم ژێردەریایانە بۆ سەر ئاوکەوتن ژێر ئاوکەوتن سود لە دانانی ئار وەردەگریٚ لە ناو عەمبارەکەی دا، کە کێشەکەی بە ئەندازەی ئەو ئاوە لێی دەکات کە لای دەدات، کاتیٚ بیەویٚ سەر ئاو بکەویٚ ئەو ئاوەی پەستاوتویەتی بە هۆی هەوای پەستێنراو بەشێکی فڕیٚ دەداتە دەرەوە چڕی ژێر دەریایەکە کەمتر بێتەوە، بەمە سەر ئاو دەکەوێت[5].

(٥) قورئان ئاماژە بە بەکارهێنانی ژێردەریایی(ئەتیر) دەکات کە گیانەکان

---

(١) هود: ٣٧.

(٢) الشعراء:١١٩.

(٣) هود: ٤٤.

(٤) بانکی زانیاری بۆ نەوجەوانان/ ل:١٤٤ بە کورت کردنەوە.

(٥) کنوز العلم/ ل:١٠٢. بە کورت کردنەوە.



بەکاردێنن، سولەیمان(ﷺ) لەسەردەمی شارستانی خۆیدا بۆ ژێردەریایی سودی لـە شـەیتان وەگرتووە کە مرواری و مەرجان و ئەڵماسی بۆ دەربهێنن.. یان دەبینی لـە مـاوەی کـەمتر لە چاوتروکاندنێ یەکێ لە وەزیرەکانی زانای تەختی بەلقیسای بـۆ دەگوازێتـەوە﴿أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ﴾[1].

ئەمانە موعجیزەیەك بوون بۆ سولەیمان، لـەم چاخەشـدا زانسـتی پاراسـایکۆلۆجی و ئـەتیر هـەنگاوی کـرداری گـەورەی نـاوە بـۆ سـەلماندنی روودانـی ئـەم دیاردانـە، لەوانە(سایکۆکنیزیا) واتە: گواستنەوەی تەنەکان بە توانای گیانی لـە ئاسـایی بـەدەر. بـە بێ بەکار هێنانی هیچ هێزێکی فیزیایی ناسـراو و هێمـای(pk) بـۆ دا دەنرێـت. یـان لـە ساڵی(١٩٨٠)دا (هایمان) پێشنیازی کۆبونـەوەی سـاڵانەی کۆمەڵـەی ئـەمریکی کـرد بـۆ پێشکەوتنی زاست لەم ساڵەدا بەسترا، داوای لە ناوەندی زانستی کرد کە بیر لە یەکێ لـەو پێشنیازە سەیرانە بکەن: (هاورێیەکی بە تواناو بەرێز لە هاورێیـەکانی خۆتـان دەڵـێ ئـەو دانیشتنەکی ئامادەکردنی گیانەکانی(تحضير الارواح) لە ماڵی خۆیدا بەسـتووە. لـە کـاتی دانیشتنەکەدا داوای لە یەکێ لە ناوەندەکانی کـردووە کـە خەواندویـەتی بـە مـوگناتیـسی گـەر بتـوانی بـا گوڵەبەرۆژەیـەك ئامـادە بکـات، لـە دوای ئـەو داخوازیـیـە گـورج گوڵەبەرۆژەیەك لەسەر مێزەکە کەوت درێژی قەدەکەی(١٦) پـێ دەبـوو. ئـەم هاورێیـەتان شاهێدی بە نوسراو لە هەموویان وەرگرتووەو پێشکەشتانی دەکات، هەمووشیان پاك و بـێ خەوشن، جەخت دەکات ماڵەکەو ناوەند(مەدیوم)ە کـە بـەر لـە دانیـشتنەکە پـشکنینیان کراوەو هەموو پاراستنێ کراوە بۆ نەهێشتنی فێڵ.

زیاتر لەمەش ئەڵێ: ناوەند جۆرە پەیوەندییەکی هەیە بە هێزەکی نوێوە کە بە هێـزی گیانی ناناسایی ناوی دەبات[2].

---

(١) النمل: ٤٠.

(٢) حروب العقل/ رونالد. ماكري/ ت: سمير محمد/ ل: ٥٠-٩٨. سەیر بکە.




(ج. أ . ج . رایز) دەڵێ: (لێکدانەوەی ئەم دیاردە ناناسایی یانە ئەوەیە کە هەندێ کەس هالەی کارەبایی و موگناتیسی لە دەوری لەشدا هەیە ئەو بەر پرسیارە لە روودانی ئەم کردارە ناناسایی یانە، دیسانەوە دیاردەی بەرزبوونەوە هەیە بۆ هەوا، کەم خایەن بێ یان درێژخایەن بەبێ ستونێك)[1].

ئەم هالە موگناتیسی یە لە ئیسلامدا هەمان ناوی هەیەو بە(النور- رووناکی) ناسراوە، وەکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی(اتقو فراسة المؤمن فانه ینظر بنور الله) رواه الترمذي و الطبراني.

واتە: خۆت لە دووربینی بڕوادار بپارێزە ئەو بە رووناکی خوا دەبینێت. وشەی(الفراسە) لە زانستی پاراسایکۆلۆجی دا بە(الاستبصار – التخاطر) ناسراوە واتە: رۆشن بینی و تلباتی. (ج .ا . ج . رایز) دەڵێ: (هەموو بەڵگەکان ئەوە نیشان دەدەن کە تلباتی و پەی پێ بردنی ناناسایی لە ئاستی سەروی ماددی دا روودەدەن، ئەم رایەش لە هەموو ئەزمون و رایانە وەرگیراون لە ماوەیەکی زۆرەوە ئەنجام دراون.

دیارە جنۆکەکانیش ئەو هالەیان هەیە کە دەتوانن دیاردەی گیانی پێ ئەنجام بدەن وەکو(سایکۆ کینیز) و دووربینی و فیراسەو دیاردەی تر، وەکو جنۆکەکانی سونەیمان(ﷺ). بەڵام کاری ناناسایی بۆ پێغەمبەران و رەوانەکراوانی خوایی موعجیزەیەو بۆ ئەولیایان کەرامەتە. بەویستی خوا لە کتێبی(میتافیزیقا) بەدرێژی باسی ئەم زانستە دەکەین، دوعامان بۆ بکەن خودا بۆ ئەم کارە دەرفەتمان بدات. چونکە ئەم جۆرە رونکردنەوانە لە ناو میللەتی کوردا مردون، بەڵام سەرچاوە عەرەبیەکان و فارسیەکان پڕن لەم جۆرە باباتانە، گرنگترینیان(انسان روح لاجسد) و (تفسیر الجواهری) یە، کە پێویستە بخوێندرێنەوە.

مامۆستای کیمیا لە ئەمریکا(نوماس دافید بارکسن) دەنوسێ: (بوونی ئاو لە دۆخی شلی دا لە پلەی گەرمی ناسایی دا مرۆڤ هەڵوێستە پێ دەکات و دەیخاتە

---

(١) عصر الخوارق/ ج .ا . ج . رایز/ ت: ماجدة صبیح/ ل:٨٩.





بیرکردنەوە. ئاو جگە لەمە خاسیەتی تریشی هەیە گرنگن، کە ئەوە دەردەخەن بە نەخشەو پلان دارِژاون، ئاو(٤/٣)ی زەوی داپۆشیوە، بەمەش کارەکی زۆر لە کەش و پلەی گەرمی دەکات. گەر گۆڕانەکی کەم لە خاسیەتی ئاودا دروست ببیَ لەسەر رووی زەوی چەند گۆڕانی پەیدا دەبیَ و کارەسات دەقەومینێت.

ئاو پلەی توانەوەی بەرزی هەیە، ماوەیەکی زۆر شل دەمێنێتەوە، پلەی گەرمی بەرزیشی هەیە، کە یارمەتی دەردەبیَ بۆ ماوەی پلەی گەرمی لەسەر رووی زەوی دا بە نەگۆڕی و لە گۆڕانی گەورەی دەپارێزێت، گەر وانەبوایە گونجانی زەوی بۆ ژیان زۆر کەم دەبوو، سود وەرگرتنی مرۆڤ لە چالاکیەکانی لەسەر زەوی زۆر کەم دەبوو. ئاو خاسیەتی تری دەگمەنی هەیە، هەموو ئەوە نیشان دەدەن کە گردگاری گەردون چۆن لەبەرژەوەندی دورستکراوانی دایە ئاوای دارشتووە.

ئاو تاکە ماددەیەکە لە کاتی بەستندا چڕی کەم دەبێتەوە ئەمەش خاسیەتەکی گرنگە بۆ ژیان، بەو هۆیە لە کاتی سەرمادا بەستەڵەك سەر ئاو دەکەویَ، نەك بکەوێتە ژێر ئۆقیانوس و دەریاکان و رووبارەوە، وردە وردە دەبێتە بەستەڵەك و سەهۆڵ بەندانە کەسەر ئاو دەکەویَ چینەکی دابڕاوە ئاوی ژێرەوەی لە پلەیەکی گەرمی دا دەپارێزیَ لەسەروی پلەی بەستنەوە بێت. بەو هۆیە ماسیەکان و گیانلەبەرانی ئاوی بە زیندویی دەمێننەوە.

دەتوانین ئاماژە بە خاسیەتی تری ئاویش بکەین کە زۆر نایابن: بۆ وێنە گرژبوونی روویی(توتر سطحی) بەرزی هەیە یارمەتی ڕواندنی رووەك دەدات، چونکە کەرەستەی خۆراکی بۆ دەگوازێتەوە کە لە خاکدا هەیە، ئاو لە هەموو شلەکانی تر پتر توانای تواندنەوەی تەنەکانی هەیە، بۆیە دەوری باڵا دەبینیَ لە کردای زیندەگی(الحیوی) دا لە لەشماندا، بەو وسفەی ئاوێتەی سەرەکی ئاوێتەکانی خوێنمانە، وە ئاو فشارەکی هەڵمی بەرزی هەیە بۆ ماوەیەکی فراوان لە پلەی گەرمی دا، کەچی لەو ماوەیە درێژەدا کە بۆ




ژیان پێویستە بە شلی دەمێنێتەوە. پاشان دەڵێ: (من وا دەبینم لێکدانەوەی ئەو دیاردەو شتە سەیرانە بدرێتە پاڵ توانای خوای داناو شارەزا و پلانی کردگارەکی مەزن، کە لێکدانەوەیەکی قەناعەت بەخشە بۆ دڵان و هزرەکان[1].

خوای گەورە هەموو ئەم دیاردە سەیرانە لەم ئایەتەدا کورت دەکاتەوە﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾[2]. واتە: هەموو شتەکی زیندومان لە ئاو دروست کردووە! لە(گەردونناسی) دا بەتەسەلی باسی سوڕی ئاو لە سروشتداو باو هەورو دیاردەی تر کراوە، کە بۆ جیۆلۆجیەکان و خولیایانی ئیعجازی زانستی گرنگە[3].

---

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ جون كلوفر مونسا/ ل: ٤٤-٤٥.

(٢) الانبياء:٣٠.

(٣) بروانە ل:٣٤٠ بۆ ٤٠٤ لە گەروونناسی دا.



## بەندی پێنجەم: بەرگی تاوێری زەمینی و سورە جیۆلۆجیەکەی:

٩٦- توێکڵەکانی زەوی و زانستی پێك هاتەکانی.

٩٧- ٩٨- ٩٩: زەوی حەوت توێکڵی جیۆلۆجی هەیە/ زەوی حەوت کیشوەرە/ زەوی حەوت بەرگی ئەتیری هەیە.

١٠٠-١٠١: کانزاکان و تاوێرەکان و خاسیەتەکانیان.

١٠٢- ڕەقی کانزاکان.

١٠٣- ڕەنگی کانزاکان و شوێنی ڕوشان.

١٠٤- بریسکانەوە/ کەرت بوون/ کێشی جۆرێتی/ ڕواڵەت/ پۆلێن کردنی کانزاکان.

١٠٥- زێر.

١٠٦- بۆخشڵ لە پیاوان حەرامە؟

١٠٧- زیو.

١٠٨- ئاسن/ مەبەست لە ئاسنداو سودەکانی.

١٠٩- ئاسن قایم کردن.

١١٠- نەرم بوونی ئاسن بۆ داود.

١١١-١١٢: چۆن ئاسن دەردێنرێ؟ چۆن نەرم دەکرێ؟

١١٣- لەدەستدانی نەرمی کانزاکان.

١١٤- مس و سوودەکانی.

١١٥- ١١٦- ١١٧: یاقووت و مەرجان و مرواری و زبرجەد.

١١٨- سەرچاوەکانی وزە بەگشتی.

١١٩- ١٢٠- ١٢١: کەرەستە خاوەکانی سوتەمەنی(خەلوز- پترۆڵ – یۆرانیۆم):





## ٧٦- بەرگی تاوێری زەمینی و سورەکەی لە سروشتدا:

بیگومان زۆر ئایەت هەیە ئاماژە بە بەرگی تاوێری زەمینی و چینەکانی و پلێتەکانی(اللوحات) دەکات و، هەندێ لەم ئایەتانەمان باسکردن وەکو﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾[1]. واتە: سوێند بە زەوی قلێش قلێش و درز درز. وە ئاماژە بە جوڵەو چالاکی و جۆش و خرۆشی دەکات کە بومەلەرزەو بورکان پەیدا دەکەن وەکو دەفەرمێ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾[2].

واتە: ئایا دڵنیان کە کەسێ لە ئاسمان زەویتان لێ ڕۆبچوێنێ کاتێ ئەو گێژاوە دەخوات؟! بەڵێ ناخی زەوی گێژ دەخوات و لە چالاکی و جۆش و خرۆشدایە.

﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾[3]. (د: امین الاسکندرانی) دەنوسێت:

(ئەم زەوییەی لەسەری دەوەستی وا دەزانی ئارامە، کەچی وانییە! لە ناخی دا چالاکی و کارلێکردن هەیە، شتانێ هەیە دەجولێن، تاوێر هەیە دەتوێتەوەو، دوکەڵ هەیە بڵند دەبێت. تۆ وا دەزانی زەوی یەك پارچەیە لە تاوێرو بەرد، کەچی وانییە زەوی قلێش و درز درزە وەکو تۆیی پێ وایە، یان وەکو هێلکەیەکی وایە توێکڵەکەی درزی بردبێت، چونکە لە کۆمەڵێ پلێت(الصفائح) پێك دێ لە تاوێرو بەرد کە لە کاتی گەیشتنی بە ڕۆخەکانی یان مەیلی جوڵە دەکەن.

ئەم کوڵان و جۆش و خرۆشەی ناخ و پێك هاتەی نا ئارامی توێکڵی زەوی وای لێ کردوین ئەو زەوییەی لەسەری دەژین توشی دوو دیاردەی هەرەترسناکی سروشتیمان بکات کە بومەلەرزەو بورکانە. کەواتە: سەیر نییە گەر زەوی لە دەورماندا شەق بوو یان شتێ لە دوکەڵ و بەردو قورسایی یەکانی فرێ بدات خۆمان و ماڵ و سامان و خاکمان قوت بدات. خوای گەورە فەرمویەتی﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾.

---

(١) الطارق:١٢.

(٢) الملك:١٦.

(٣) الزلازل والبراكين/ د:امين الاسكندراني/ ل:٣.

..... وە جێگای سەیرییە هەندێ لەو قورسایی یانەی زەوی فڕێ دەدات کەرەستەی بەنرخمان بۆ دورست دەکات کە باڵاخانەو نمونەی بیناسازی سەرنج ڕاکێشی پێ دورست بکرێ، کە توانای کردگاری شکۆدار دەربخات.

یان﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾[1]. واتە: کاتێ دەریاکان گڕیان گرت. یان﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾[2]. سوێند بە دەریای گڕگرتوو. کە ئاماژە بە چالاکی و بورکانی ژێر دەریاکان و ئۆقیانوسەکان دەکات وەکو باسکرا.

وە قورئان ئاماژە بە جوڵەی چیاکان و داپچڕانی کیشوەری(الانزياح القاري) دەکات وەکو باسکرا کاتێ فەرمویەتی﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾[3]. واتە: چیاکان دەبینی وا دەزانی وەستاون کەچی وەکو پەڵە هەور دەڕۆن.

## ڕاڤەی زانستی بۆ ئەمە:

جوڵەی چیاکان بۆ جوڵەی زەوی سەری دەگەڕێتەوە، چونکە توێکڵی زەوی لەسەر بەرگەکی ترە لەو چڕی بەرزترە. سەرەتای سەدەی بیستەم(واگنەر) بۆ ئەو بۆ چوونە چوو کە کیشوەرەکان سەرەتا یە ك پارچە بوون و لێك دابراون و دوورکەوتونەوە. دوای پەنجا ساڵ ئەنجا جیۆلۆجیەکان پەیان بە بۆچوونی واگنەر برد. ساڵی(١٩١٥) وتی: (بارستایی زەمین بەر لە(٥٠٠) ملیۆن ساڵ یەك پارچە بووە، ئەم بارستایی یە لە جەمسەری باشورر بووە بە ناوی بانجا. بەر لە(١٨٠) ملیۆن ساڵ بانجا دەبێ بە کەرتەوە، کەرتی(گۆندوانا) کە ئەفریقیا و ئوستراليا و ئەنتارکتیکا و هیند بوو، کەرتەکەی تر لوراسیا بوو، کە ئەمریکای باکورو ئاسیای دەگرتەوە جگە لە هیند. دوای(١٥٠) ملیۆن ساڵ گوندوانا و لوراسیا پارچەی تری بچووکیان لێ بۆوە.

ئەم کیشوەرانە کە لە بانجانا جیابونەوە لە جوڵەی هەمیشەیی دان لەسەر ڕووی زەوی و

(١) التكوير: ٦.

(٢) الطور:٥.

(٣) النمل:٨٨.





ـ ڵانە بە چەند سەنتیمەترێ قرسێندراوەو ئەو جوڵەیە گۆڕانەکی دروست دەکات لـە وشـکانی دا ـە چاو ئاودا لە گۆی زەوی دا. لەسەدەی بیستەمدا زانایان ڕاڤەی ئەوەیان کرد کە تـوێکڵی زەوی ـ سەرەوەی لە بەرگێ پێك دێ ڕووبەرەکەی(١٠٠)کم دەبێ و بۆ شەش پلێـت دابـەش دەبـێ کـە ـەرِدتین و لەگـەڵ کۆمـەڵی تـری بـچووکدا. بـەپێ ی تیـوری( ئـارێکی پلێتـەکان) کـاتێ ئـەم ـێتانە(الصفائح) دەجوڵێن کیشوەرو ئۆقیانوسەکانیشی لەسەرەوە ساڵانە جوڵەکە(٥,١) سم . تـا ـەم جوڵەیە بەردەوام بێ گۆڕان لە جیۆلۆجیادا پەیدا دەکات، بۆ نمونە هـەموو سـاڵێ ئۆقیانوسـی ـەتڵەسی هەندێ فراوان دەبێت.

لێرەدا جێگای بایەخە قورئان لەم ئایەتە پیرۆزەدا ئاماژە بە جوڵـەی کیـشوەرەکان دەکـات ـەکرداری ترازان(الانحراف) ناوی دەبات و زانستی نوێش بۆ ئەم جوڵەیە(الانحراف) بەکاردێنێت[1].

دیسان قورئان بە جوڵەی درز برد(حرکە الصدوع) ناوی دەبات کـاتێ فەرمویـەتی﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾ الطـارق:١٢. وشەی(الصدوع: faults) زارەوەیەکی جیۆلـۆجی یـە. یـان(الفوالـق) وەکو(د: حسن سید احمد ابو العینین) لە(کوکب الارض ظواهره التضـاریسة الکبری/ ل:٢١) باسـی کردووە. ڕابردوو باسمان لە ڕاڤەی ئەم ئایەتە کردووە.

(د: الك سمـث) دەڵێ: (ڕەنگە دوای پەنجا ملیۆن ساڵی تر ئەفریقیا بـە فراوانـی بـە درێـژی ـۆڵی درزەکان پارچە پارچە ببێ و دەیان سورِ فراوان ببێ و ئوسترالیا لە ئەندونسیا نزیك بێتـەوەو ئەتڵەسی فراوان ببێ و هێمن بڕواتـەوە نـاو یـەك و هـەردوو ئـەمریکاکان لێـك دوورکەونـەوە و کالیفۆرنیا بە تەنیا لە نزیك ئالاسکا دەبێت.

لەهەموو ئەو جوڵەی تاوێرو پلێتانەدا لـە ڕابـردوودا یـان داهـاتوودا ئـەم کیـشوەرانە بـە ناوچەی ئاووهەوای جیاجیادا ڕەت دەبن. دیارە شێوەی کیشوەرەکان کار دەکاتە سـەر ئاووهـەواو هۆکاری دوورست بوونی(خەڵوز)ە لە ژێر دۆخی یەکسانی(الاستواء)دا، کەچی لە ناوچە ساردەکانی ئێستاش دەردەهێنرێ، هەروەها سۆنگەیە کە بۆ پەیدا بوونی چالاکی بەستەڵەکی لـە ناوچـەکانی

---

(١) ایات الاعجاز العلمی/ عبدالرحمن سعد صبـي الدین/ ل:٤٨.




ئیمرۆدا کە بەهێڵی یەکسان ناسراوە[1].

وە(ئەلك سمث) لە ڕاست(سوڕی جیۆلۆجی) دەڵێ:

هەمیشە باس لە نهێنی هەمیشە لای زەوی کراوە، نهێنی یەکەی بۆ ئەوەی دەگەڕێتەوە کە چەند سوڕێکی بەردەوامی هەیە لە گۆڕان کە زەوی والێ دەکات بەمەکینەیەکی بچێ تایەی ددان داری هەبێ و هەموویان پێکەوە کاربکەن و کار لە یەکتری بکەن. بەو پێ و دانگە ماددە تواوەکان دەگەنە سەر زەوی و چیاکان بنیات دەنێن و پاشان لێك هەڵدەوەشێن و هەپرون بە هەپرون دەبن تا تاوێرەکی تازەبنیات بنێنەوە، ئەمە لە سوڕی تاوێر لە سروشتدا باس دەکرێت. پێك هاتنی تاوێر(الصخور) لەسەر زەوی دا سەرەتا و کۆتایی ئەو سورەی هیدرۆلۆجیەیە کە تایبەتە بە سوڕی داخوران(التأكل) لە نزم کردنەوەی خاکی بەرزدا کە لە ئاستی رووی دەریا نزیکی بخاتەوە. بە دەگمەن ئەم سوڕە تەواو دەبێ بەرزایی یەکی نوێ دروست دەبێتەوە، هۆکارەکانی رووتانەوە(التعریە)ی جیاجیا دەبنە هۆی جۆراوجۆری بەرزو نزمی(التضاریس) لە زەوی.

بەڵام سوڕی(هیدرۆلۆجی) پەیوەندی هەیە بەگواستنەوەی ئاو بۆ هەواو گەڕانەوەی بۆ ناو ئاو. وە لێرەدا سوڕی(جیوکیمیایش هەیە ئەم ڕێگایە دەردەخات تۆخمەکە سوڕەکەی پێ دەست پێ دەکات کە ماددەی تواوە(الصهیر) و بە(کۆمەڵێ ژینگەی جیۆکیمیایی دا تێ دەپەڕێت. لە ماوەی ئەم سوڕانەدا هەمیشە زەوی خۆی بارگاوی(الشحن) دەکاتەوە، بەڵام بە داخەوە مرۆڤ کەرستەکانی زەوی زووتر لەو ماوەیە خەرج دەکات کە خۆی تێدا بنیات دەنێتەوە)[2].

ئەمەش هاوسەنگی زەوی ڕادەگرێت. بێگومان وەکو(د: حسن سید احمد ابو العینین) پۆلێنی کردووە ئەو هۆیانەی کار لە-شێوەی رووی زەوی دەکەن چەند هۆکارێکن:

(١)هۆکارەکانی ناخی زەوی کەبە هێواشی روودەدەن وەکو بومەلەرزە و بورکان و نافورەو کانیاوە گەرمەکان.

---

(١) علم الارض/ الك سمث/ ت: فارس لطفي الخوري/ ل:١٣.

(٢) علم الارض/ الك سمث/ ت: فارس لطفي الخوري/ ل:١٠٣.

(٢) هۆکارەکانی ناخی زەوی کە بە هێواشی ڕوودەدەن وەکو هۆکارەکانی(داخوران) و درزەکان(الصدوع).

(٣) هۆکارە دەرەکییەکان لە وردو خاش بوون(التجویە)ی میکانیکی و کیمیایی و هۆکارەکانی ڕوت کردنەوەو داخوراندن وەکو ئاوی سەر ڕووی زەوی لە دەریاو ئۆقیانوس و دەریاچە و ڕووبارو لافاوو، ئاوی ژێر زەوی و باوبۆڕانی دەشتایی گەرم و وشك و بەستەڵەك .

ئەلك سمث دەڵێ:

## ٧٧- ( چالاکیەکانی سەر ڕووی زەوی )

هەموو چیاکانی سەر زەوی توشی داخوران و ڕووتانەوە دەبن، کە کرداری داخوران پێوەی هەڵدەستێ، لە شێوەی وردیلە یان گیراوەی ئاوی دەگوازرێتەوە وبەزۆری لە دەریادا دەنیشێ. ڕووتانەوە(التعریە) و داخوران(التاکل) ئەنجامێکی شکان و خاش بونەوە و شێوەکانی کۆبونەوەی نیشتەنی یەکان(الرواسب) لە هۆکارەکانی نیشاندنە.

ڕووتانەوە لە پلەی گەرمی سروشتی دا ڕوودەدات لەسەر زەوی دا بەهۆی خاش






بوون(التفت) و شی بونەوە(التحلل) بە بەردەوامی. کرداری خاش بوون بە هۆکاری میکانزمی روودەدات وەکو بەستنی ئاو(التجمد) لە ناو درزو تیکەکانی تاوێرەکاندا کەلێکی هەڵدەتەکێنێ. ئەنجا بەهۆی فشاری گەشەی ڕەگ و ڕیشاڵی درەختەکان و گەرم بوون و سارد بوونی رۆژانە کەتاوێرو گاشەبەردو بەردەکان لاواز دەکات بەهۆی جیاوازی گرژبوونو کشانی جیاوازی کانزایی یان.

دیسان بەهۆی چالاکی کیمیایی روودانی شی بونەوە، بە کەمی کانزاکان بە ئاوی پەتی دەتوێنەوە، کەچی ئاوی باران کە تاوێتەی دووەم ئۆکسیدی کاربۆنە، واتە: گیراوەیەکی لاوازی(ترشی کاربۆنیکە) توانای تواندنەوەی هەندێ تاوێری هەیە بەتایبەتی(کلسی). دیسان ئەو ئاوەی ترشی و(humic)ی تێدایە کە ماددەی ئەندامین توانای تواندنەوەی تاوێرەکانیان هەیە سەرباری ئەوە ماددەی ئەندامی توانای مژینی خۆراکیان هەیە لە تاوێرەکانەوە کە دەبنە هۆی کشانی پێك هاتەی کانزایی و بەشداری دەکات لەشی بونەوەی دا و یارمەتی درزەکان دەکات کە هەڵوەشانەکان دورستی کردووە ئاو بڕوات کە بۆ توانەوەی تاوێرەکان یارمەتی دەدات، دیسان پیس بوونی هەوا دەبێ بە هۆی پەلەکردن لە کرداری ڕووتانەوە..... وە تاوێرەکان بە هۆی رووتانەوە دەبنە پارچەی بچووك کە بە(بەرگی تاوێری هەڵوەشاو) ناسراوەو جۆرێکە لە(خاك). **ئەمە تاوێر ئامادە دەکات لە شوێنی خۆی لابچێت**[1].

**قورئانی مەزن ئاماژە بە ترشی باران و کاریگەری بۆ سەرداخوران و دوورستکردنی لیتە کاتێ دەفەرمێ﴿لَوْ نَشَاء جَعَلْنَاهُ أُجَاجًا فَلَوْلَا تَشْكُرُونَ﴾**[2]. **واتە: گەر بمانەوێ ئاوی بارانە ترش و تفت دەکەین ئەی بۆ سوپاسی ناکەن؟! دەفەرمێ﴿أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا فَاحْتَمَلَ السَّيْلُ زَبَدًا رَّابِيًا وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الْحَقَّ وَالْبَاطِلَ فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاء وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ**

(١) علم الارض/ ل:٣٨- ٣٩ بەکورت کردنەوە.

(٢) الواقعة:٧٠.



كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ﴾ [1].

واتە: بارانی لە ئاسمانەوە باراندووە بە ئەندازەی خۆی دۆڵەکانی پڕ کردووە، لافاوە کە کەفی بەرزی هەڵگرتووە، وە هەروەها ئەو کانزایانەی ئاگری بەسەردا دەکەنەوە(وەکو موشەدەمە) بەمەبەستی خشڵ و پێویستی وەکو ئەو کەفە، خوا ئاوا نموونە بە ڕاستی و ناراستی دێنێتەوە هەرچی بەتاڵ و بێ سوودە دەڕوات بەفڕێ دراوی، ئەوەی سودی هەیە لە زەوی دا دەمێنێتەوە، ئاوا خوا نموونەکان دێنێتەوە.

(د: زغلول) دەڵێ: ئەم نموونە قورئانییە جوانە ناراستی بەو کەفە دەچوێنێ کە دەکەوێتە سەر رووی ئەو ئاوە ڕۆیانەی لە دۆڵە تەنگەبەرو دۆڵە فراوانەکان وەکو یەك هەڵدەقوڵێن و بلقان دەدەن، یان بەو کەفەو بلقانە دەچێ سەر رووی کانزا گرنگەکان و بەسوودەکان دەچێ لە کاتی توانەوەیاندا لەگەڵ هەندێ کەرەستەدا تا پاکژیان بکەنەوە لەو خڵتەوچڵکەی پێوەیان نوساوە. لە هەردوو حاڵەتەدا دەبینی ئەو کەفەی لافاو هەڵی گرتووە یان سەر کانزا تواوەکان کەوتووە پیسە و نرخی نییە و فڕێ دەدرێن، ناڕاستیش ئاوەهاڵە بەرامبەردا، ئەم نموونە قورئانییە ڕاستی بەو شتانە دەچوێنێ کە لە زەوی دا دەمێنێتەوە و سود بەخەڵکی دەگەێنن ئەویش لەدوو باردا: کاتێ ئاوەڕۆ لە دۆڵەکانەوە دێ سوود بە خەڵکی دەدەن- ئاو نهێنی ژیانە-، دیسانەوە ئەو ئاوەڕۆیانە سامانی کانزایی(المعدنی) گرنگ هەڵدەگرن، وردە وردە نیشتن لە بنی ئەو دۆڵەدا ئاوە ڕۆیەکەی لێوە دێ، لەگەڵ کەم بونەوەی ڕۆیشتن و خێرایی ئاوە هەڵقوڵێوەکە و توانای هەڵگرتن دا ئەم کانزایانە بە پێ ی قەبارەی دانکەکان و چڕیان دەمێننەوە: ئەوانەی قورسن و بارستایی یان کەمە وردە وردە تا دەتوانرێ ئەوەی ئاوەڕۆکە هەڵی گرتووە لە کانزاکان جیا دەکرێتەوەو، هەریەکەیان لەناوچەی دیاری کراوی ئەو ئاوەڕۆیەدا کۆدەبێتەوە، ئەو نیشتنە کانزایی بەنیشتنی(placer deposits) ناسراوە، زۆرێ لە کانزا زەمینییەکان وەکو(زێڕ و زیو) بەم ڕێگایە کۆدەکرێتەوە، ئەمەش لەبەر ئەوەی بە ڕێژەیەکی کەم لە تاوێری زەمینی دا هەیە، ئەوە بە دووبارە کردنەوەی چەند کردارێ ڕوودەدات دوای تێ پەرینی هەزاران ساڵ، گەر دەیان هەزار

---

(١) الرعد:١٧.




سەدەش نەبێت، ئەم ڕاستی یەش لە کاتی دابەزینی قورئاندا زانراو نەبووە تا چەندان سەدەش دوای ئەوە، بۆیە موفەسیرانی کۆن﴿مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ .....﴾ بە ئاویان مانا کردووە کە دوای بلق و کەف دەمێنێتەوە بۆ خواردنەوەی خەڵك و ئاوەدانی گیانداران و ڕووەك و کشتوکاڵ.

وە لە دۆخی کانزای خاوی گرانبەهادا وەکو(زێرو زیو و پلاتین) و کانزای بە سودا وەکو(ئاسن و مس و قورقوشم و فافۆن-قصدیر-)دا...هتد. هەندێ کەرەستەی تر ئاوێتەی ئەو کەرستە خاوانە دەکرێ کە یارمەتی دەردەبن بۆ تواندنەوەیان و پاکژکردنەوەیان بە خڵتەکان وەکو(بەردی جیری و لم و دووەم ئۆکسیدی مەنگەنیز) و هی تر و لەگەڵ خڵتەی ئەو کەرەستانە یەك دەگرن لە کاتی توانەوەیاندا دەکەوێتە سەر کەرەستە تواوەکە کە بە(خڵتەی کانزاکان-الشوائب) ناسراوە، ئەو خڵتەیە بە تەواوی لەو ماددە تواوە سافە جیا دەبێتەوە و کاتێ بە جێ ی دێڵێ و ساردەبێتەوە لە شێوەی چینەکی شوشەیی ڕەش ڕەق دەبێت و پریەتی لە(بلق)ی هەوایی و زۆر بەکەفی سەر ئاو و ئەو خشت و خاڵە دەچێ هەڵی گرتووە، کاتێ جیابۆوە ئەو کانزایە تا ئەوپەری بێ گەردو و رون دەبێت، لێرەدا قورئان حەق لە جوانی و خاوێنی بەمە دەچوێنێت.

یەکێ لە بنەما ئەگۆڕەکان ئەوەیە ئاو کە نهێنی ژیانە سوڕەکی ئاوی هەر لەو کاتەوە لە زەوی یەوە دەرپەریوە﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا﴾ بۆ دەرەوەی زەوی سوڕی خۆی لە سەر زەوی دەست پێ کردووە و زەوی و دۆڵەکانی هەڵدریوە و زەوی تەخت کردووە و یارمەتی دەربوو بۆ ڕووتاندنەوەو پارچە کردنی و لێك هەڵوەشاندنی پێك هاتوەکانی و تواندنەوەی ئەو شتانەی پێ ی توانەوە بۆ دەریاکان و زەریاکانی بردون و ئەوەی مابێتەوە لە شێوەی(خاك) و (گڵ) دا یان لە شێوەی خڵتەو لیتەو نیشتەنی یەکان(الرسوبیات) بۆ ناو ئۆقیانوسەکان و دەریاکانی گواستۆتەوە.

ئاشکرایە(تاوێرەکان- الصخور) لە(کانزاکان) پێك دێن، کە لە پێك هاتەی کیمیایی و سیفاتی فیزیایی لێکتر جیاوازن، هەیانە بەرگەی ڕووتانەوە(التعریە) دەگرێ ماوەیەکی باش خۆرادەگرێ، هەیە زوو لێك هەڵوەشێ، هەیە زۆر چڕە لە ئاو دەنیشێ، هەیە چڕی لە چڕی ئاو





کەمترە هەڵی دەگرێ بۆ دووری و زۆر بە هەڵواسراوی دەمێنێتەوە، وە کاتێ دا لافاوو لێشاوی ـ ماڵەر دێ ئەو تاوێرە شکاوو هەڵوەشاوانە هەڵدەگرێ کە لە چیا بەرزەکانەوە لیژ بونەوە بۆ قەدپاڵەکان و دەشتایی یەکانی دەوری و، دواجار بۆ قوڵایی دەریاکان و زەریاکان ڕاپێچ دەکرێ، ـن بۆ لەناو لێژایی و کەندرەکانی دەشتایی و بیابانەکان لەناو خۆدا، تا لێشاوەکە بەهێزترین توانای هەڵگرتنی تاوێرە ڕزیووشکاوەکانی پترە، کاتێ خێرایی تەوژمی بێ تین بوو توانای هەڵگرتنی کەم دەبێ ولە دۆڵەکە دا کە لێشاوەکەی پێدا ڕەت دەبێ دەنیشێ، بەپێ ی ئەوبارستایی یەی تاوی دابۆیە، بەم شێوەیە ئەو تاوێرە هەڵوەشاوەو خاش بووە بە پێ ی وردیلەکانی و چڕی جۆریەکەی هەرکامێکیان لێك جیادەبنەوە، ئەو کانزایانەی زۆر چڕن و تەنۆلکەکانی زبرن یەکەمجار دەنیشن، دوایی وردە وردە کانزای تر دەنیشن ، دوایی وردە وردە کانزایی تردەنیشن کە چڕیان کەمترەو قەبارەی تەنۆلکەکانی وردترە، کرداری لێك جیاکرنەوەکە(التمایز) دەبێتە هۆی نیشتنی ژمارەیی لە جەواهیرەکانی زەوی وەکو (ئەلماس) و(یاقوت) و(زمرود) و(زەبرجەد) و(عەقیق) و(فەیروز) و هی تر، دەبێتە هۆی کۆبونەوەی ژمارەیەك لە کەرەستەی خاوە بە نرخەکان وەکو: (زێڕ و زیوو پلاتین و...) و کەرستەی بە نرخی وەکو: (ئاسن و مس و خۆڵەمێش و فافۆن و زنك و مەنگەنیزو کروم(نیکل) لە شێوەی لیتەی نیشتەیی سەکۆدا لە بنی دۆڵەکاندا کاتێ لێشاوی پێدا ڕەت بووە، شایەد ئەمە بەشێ بێ لە مەبەستەکانی خوای حەق﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللّهُ الأَمْثَالَ﴾ الرعد:١٧. ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە زەوی دا هەر ئاونییە وەکو موفەسیرانی دێرین وای لێ حاڵی بوون(خوا پاداشتی چاکیان بداتەوە).

دیسان لە فەرمودەی﴿فَسَالَتْ أَوْدِيَةٌ بِقَدَرِهَا﴾ الرعد:١٧. دا دەبینین جگە لە مانای فراوانی و تەسکی قەبارەی دۆڵەکە ئاماژەیە بۆ بڕی زۆری کەمی ئەو ئاوەی لێوەی دەردەچێ، ڕەنگە مەبەست لەو ڕێگایەی پێ یدا ڕەت دەبێ ناوچەیەکی کانزایی بێ یان نا کانزایی بێ، وە بە هەر جۆرو ڕادەیەکی بونە کانزا بێ، چونکە ئەمە دیاری کردنی خوایە لە بڕو جۆردا هەرچی کەرستەی سوکە کە بلقی ئاو هەڵی دەگری و بەهۆی خێرایی پاڵنانی ئاو دورست دەبێ لە دۆڵدا لە شێوەی

کەف و بڵقی سەر ئاودا، ئەوە لە خۆی و خاکی وردیلە پێك دێ، وە کانزای تۆزو تەنکۆڵە و توێژو شتی تر لە درەختی رزیوو هەڵوەشاو کە سوودو بەهای نییە، بۆیە بە ناوی کەف و بڵقی سەر ئاو(الغثاء السيل) دەناسرێت لەبەر بێ نرخی ئەو ئاوەی بەسەردا دەبڕەرێت. ئەو ئاوەڕۆو لافاوە خڵتەو کەفی سەری هەڵدەگرێ بۆ لێواری دۆڵەکەیان دەلتای ناوخۆو یان پانتایی دەریا و شوێنەواری تر بزر دەبێت.

بەو پێ و دانگە هۆکارەکانی ڕوتاندنەوە(التعريه) لەوانە ئاو بە شلی ویەستەڵەکی بەردەوام ڕۆڵی هەیە لە هەموار کردنی زەوی دا تابە کەڵکی ئاو و ئاوەدانی بێت، لەو دەورانەی تری ئاو جگە لەمە کە چاوگی ژیانە تاوێرەکان و بەردەکان و شاخەکان هەڵدەوەشێنێ و(خاك) و (نیشتەنی و خڵتە) پێك دێنێت. ئەنجا ئەو کانزایانەی ناتوێنەوە لە ئاوداو بەرگەی هەڵوەشان دەگرن فڕێ دەدات و هەڵیان دەگرێ لە ناو تاوێرەکانەوە دوای هەڵوەشانیان لە ڕێرەوی دۆڵەکان و رووبارەکان و لێژایی یەکانیانداو کەناری دەریاکان و گۆم زەلکاوەندا لەگەڵ هێواش بونەوەی دا و کەم بوونی توانای ئاودا دەیانیشێنێت. بە(نیشتەنی نارامگرتوو) ناسراون.

لە ڕۆخی دەریاکانیشدا هەڵکشان و داکشانی ئاو بە ناوی(لمی ڕەش) کانزای و سوك هەڵدەگرێ و قورسەکە گرد دەکاتەوە. وە زێر و زیوو فافۆن سامانەکی گرنگن لەو نیشەیی یانە دا و لە نیشتەیی دۆڵەکان و بن و لێژایی یەکانی هەندێ رووبارەکاندا دەردێنرێت.

هەر لە لە کۆنەوە تا ئیمرۆ لێشاوو ئاوە ڕۆیەکان درەختی هەڵکەندون و بۆ ناو دەریاچەکان و زەلکاوەکان و کەناری دەریاکان هەڵی گرتوون و بە لیتەو تۆزی خۆی داپۆشیون کردوونی بە(خەڵوز) دوای داپڕینیان لە هەواو چینی(خەڵوز)ی یان پێك هێناوە، کە بە هۆی زۆری گەرمی لەو ناوچانەدا گۆڕاوە بە گازی سروشتی و بەهایەکی ئابووری گرنگی هەیە.

دیسانەوە زۆرێ لە شێوەکانی ژیان کە ئاوارە دەبێ یان مەلە دەکات لە دەریا و رووبارەکاندا کاتێ دەمرن دەچنە بن دەریاکانەوەو بە لیتە دادەپۆشرێن و شی دەبنەوەو دەبن بە(پەترۆل) و(گاز) کە گرنگی یان لەم چاخەدا شاراوە نییە. دیسانەوە ئەوەی ئاو هەڵی دەگرێ لە ئاوێتەی تواوە بە کارلێکردنی کیمیایی لە ڕێرەوی دۆڵەکان و رووبارەکاندا سەر بنی دەریاکان و



گۆمەکاندا لە شێوەی گەنجینەیەکی کانزایی دا گرنگدا دەنیشن وەکو(بەردی جیری وفۆسفات و پۆتاسیوم و کبریت و خوێ و جبس و ئەنهدرایت و بوکسایت و سێ یەم ئۆکسیدی ئەلەمنیۆم و مەگنیزات(کاربۆنی مەگنیسیۆم و هتد...) هەموو ئەوانە بەشێکن لە ماناکانی دەقی قورئانی موعجیزە....)[1].

گەر سەیری قورئان بکەین ئاماژەی بە زۆری لەو نیشتەیی کردووە کە ئاو هەڵی گرتون وەکو خوێ و نەوت و خەڵوز.... تا یەکێ لە ماناکانی﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾ ئەوەیە، ئاماژەیە بۆ بیرە نەوتەکان و پێك هاتەکانی. وە قورئان ئاماژە بە خێروبەرەکەتی کوردستان و حیجاز دەکات لە نەوت و سامانی تر کاتێ(نوح) باوکی کوردان دەفەرمێ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾[2].

واتە: خوایە لە شوێنەکی پڕخێرو بەرەکەتم دابەزێنی.

ئەوەبوو کرگار لەسەر(جودی) دایبەزاند﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾[3]. پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە بە زێری ڕەش دەکات لە تەك فوراتدا لە کوردستاندا کاتێ فەرمویەتی: (لاتقوم الساعة حتى يحسر الفرات عن جبل من ذهب يقتتل الناس عليه) متفق عليه. واتە: قیامەت نایەت تا فورات بە چیایەکی زێڕین نەگیرێ خەڵکی لەسەری دەکوژرێن. (محمد العرب) لە(العراق في القران والحديث/ ل:١١٦) دا ئاماژە دەکات بۆ نەوت کە زێری ڕەشە لە تەك فوراتدا.

دیسان پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە بە جەنگی نەوت دەکات لە داهاتودا کە جەنگی جیهانی و مەسیحی دەججالی لێ دەکەوێتەوەو ئالآڕەشەکان کە کوردەکانن و ڕۆڵەکانی ئیسحاقی کوری ئیبراهیمن بەم ڕۆڵە هەڵدەستن و دروشمیشیان(بکوژ بکوژە) و دەجّجال لەناو دەبەن و دینی خوا زیندو دەکەنەوە.ئەو کاتەی لەگەڵ سەرکردەیەکی خۆرئاوایی بەرەگەز ئەفریقی بەرەو ڕوو دەبنەوە کەدێ دەست بە نەوتی کوردستان و کەنداو دا بگرێت، بروانە دەقی ئەم فەرمودانە:

---

(١) الارض/ د: زغلول النجار/ ل:٣٨٦-٣٩٤ بە کەمێ کورتکرنەوە.

(٢) المؤمنون:٢٩.

(٣) هود: ٤٤.

(١)یقتتل عند کنزکم هذا ثلاثة،کلهم ابن خلیفة، ثم لا یصیر الی واحد منهم، ثم تطلع الرایات السود من قبل المشرق فیقتلونکم قتلا لم یقتله قوم فاذا رایتموه فبایعوه ولو حبوا علی الثلج، فانه خلیفة الله المهدی) رواه ابن ماجه/ صحیح الحاکم وصاحب الزوائد وابن کثیر.

(لا تقوم الساعة حتی یغزوها سبعون الفا من بنی اسحاق) رواه مسلم. خاوەنی(التاج الجامع للاصول) لە(ج/٥) دا(ل: ٣٢٩) دەنوسیّ: (هم اکراد الشام المسلمین).

(انما اولئك قوم یأتون من المشرق حردین معهم الرایات السود.... فیاتون حتی ینزلوا الی دمشق فیفتحونها قسرا شعارهم اقبل اقبل یعنی بکوش بکوش) رواه نعیم بن حماد/ الفتن/ ٥٧٢.

مەسیحی دەججال لە عیّراقەوە دەست پیّ دەکات کە(المشرق)ە و شویّنی تالاّرەشەکانە کە کوردەکانن و جەنگی کەنداو سەرەتایە: (یا اهل العراق لا اسالکم صغیرة وارکبکم للکبیرة سمعت ابي عبدالله ابن عمر یقول : سمعت رسول الله(ﷺ) ان الفتنة تجیء من ها هنا وامیء بیده نحو المشرق من حیث یطلع قرنا الشیطان...) رواه مسلم.

(یخرب الکعبة ذو السویقین من الحبشة) رواه البخاری.

(یغزو جیش الکعبة فیخسف بهم) رواه البخاری.

(لایستخرج کنز الکعبة الا ذو السویقین من الحبشة). (ابي قرة في السنن).

دیارە جەنگی(نەوت) لەسەر دەستی بۆشەکان ڕویدا لە جەنگی کەنداودا لە(١٩٩١) و(٢٠٠٣)، ئایا ئەم بابایە حەبەشی یەی جەنگەکە فراوان دەکات(ئۆبامای ڕەش پیّستی ئەفریقی)یە کە سەرۆکی ئیّستای ئەمریکایە؟

بەلاّم باوەڵامەکە بۆ داهاتوو لیّ بگەڕیّن و زەمان لیّکی دەداتەوە. وە بڕوا وایە جیهان زیاتر لە(٢,٧) ملیار تەن نەوت کاردەکات و یەدەکی نەوتی جیهانیش بە(١٠٠) ملیار تەن خەملیّنراوە، بۆیە بڕوایە وایە ئەم نەوتە(٣٧) ساڵی تر دەوام بکات، ئەمەش هۆکاریّکە بۆ لەشکرکیّشیەکانی خۆرئاوا بۆ سەر عیّراق و کوردستان و ئیّران و کەنداو، بەلاّم دۆزینەوەی یەدەکی تر ئەم بڕوایە دورست دەکات کە تەمەنی بیرە نەوتەکان پتر بیّت! وە بڕوا وایە خەلّوز کە



بەشی زۆری کاربۆنە لە(١٠) ملیار تەنی مەتری چوار گۆشەیی، ئەوەی لیّ ی بەکار هاتووە زۆر کەمە. قورئان ئاماژە بۆ خەلوزیش دەکات کاتیّ دەفەرمیّ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَارًا﴾[1].

دیسان یەکیّ لە ماناکانی﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا﴾[2]. واتە: ( دحى المطر الحصى عن وجه الارض أي جرفها). وەکو(الراغب) لە(مفردات)دا ئاماژەی پیّ کردووە. واتە: (ڕامالّین و تەخت کردن بە هۆی باران و ئاو).

یان﴿فَمَثَلُهُ كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا﴾[3]. واتە: نمونەی ئەو وەکو یەدەکی لوسە بارانەکی گەورەی لیّ دەدات ڕووتی دەکاتەوە.

دیارە باران ترشەلۆکەو توێنەرەوەو ڕامالّەرە. دیسان باس لە(با) دەکات کە داخوران و ڕامالّین پەیدا دەکات ﴿أَعْمَالُهُمْ كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ﴾[4]. واتە: کاری ئەوان وەکو خۆلەمێشێکە لە رۆژەکی گەردەلولدا با بە توندی دەیبات.

﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الْأَنْهَارُ﴾[5]. اتە: بەرد هەیە رووباری لێوە هەلّدەقولّێت. هەموو ئەوانە ئاماژەن بۆ داخوران و تواندنەوەی تاوێرەکان(الحت). (الك سمث) دەنوسیّ:

## ٧٨- دارِزان و خاش بوونی تاوێری ( داخورا- الحت ):

ئاوی ژێر زەوی کە لە جولّە دایە بەرگی تاوێری هەلّوەشاوەو خاش بوو دەتوێنێتەوەو هۆکارەکانی هەلّوەشاندن دەجولیّ و دەست دەکات بە گواستنەوەیان. خۆرو هێزی کێشکردن هۆیەکان لێك هەلّوەشاندن دەخەنە جولّەوە، ئەو(ئاوانە ڕەوان) بن یان(بەستەلّەك) یان(با) یان(دەریا) بن.

---

(١) یس: ٨٠.

(٢) النازعات: ٣٠.

(٣) البقرة: ٢٦٤.

(٤) ابراهیم: ١٨.

(٥) البقرة:٧٤.





دیسان هێزی کێشکردن ڕاستەوخۆ کار دەکاتە شکاندنی تاوێرەکان بەرەو قەدپاڵی لێژایی و زینوەکان، گواستنەوەوکە بە هێزی کێشکردن لە جوڵەیەکدایە یان زۆر کزەو هەستی پێ نەکرێ یان زۆر خێرایە، بە جوڵەی هێواش دەوترێت خزین(الزحف)، (خزینی خاك) بە هۆی دڵۆپە بارانەکان کەبەر خاك دەکەون چاڵاك دەبن و، وە بەگەشەی ڕەگەکان و شەپۆلەکانی بەستن و هەڵامسانی خاك بە هۆی تەڕ بوون و شێ وە وکاریگەری زیندەوەران کە چاڵ هەڵدەکەنن و گیانداران ماڵی، دیسان بڕی جوڵەکە بە جۆرێك تونێکڵی ڕووەکە کە ئاو کرداری کشتیاری کاری تێ دەکرێت. (لێشاوی خاك) لە خزینی خاك خێراترە لە ئەنجامی توانەوەی بەستەڵەکدا ڕوودەدات لە ناوچە بەستەڵەکەکانداو تاوێرە شکاوە بچووکەکان تێرا دەبن و بۆ ژێرەوەی لێژگەکان لە شێوەی پلیتەکاندا دەخزن یان لە شێوەی کەرتەخاك و پارچەی تاوێری.

(لێشاوی قوڕەکان) جوڵەیەکی خێرایی خاکەکی تێراوە. هەرچی(خزینی قوڕاو- الاوحال- lahar) بارێکی تایبەتی یە بارانی زۆر پەیدا دەکات بەسەر خڵتەی نیشتوی سەر پارچە تاوێرەکان لە دەوری گڕکانەکاندا.

(باران) خاك و تاوێری وردو خاش بە خێرایی ڕادەماڵێ جگە لەو دۆخانەی تاوێرە زلەکان چەند پارچە زەوی تێدا دەپارێزن کە بە پاشماوەی داخوران و داڕمانن و بەستونی زەمینی( earth pillars) ناسزاون. ترازانی زەمینی لە کاتێ دا ڕوودەدات ئەو کەرەستانەی توشی داخوران هاتوون، یان تاوێرە ڕەقەکان، یان هەردوولا دەکەونە جوڵە بەرەو لێژایی یەکان بە خێرایی یەکی زۆر لەسەرووی خێرایی خزانی گشتییەوە بێت. ئەو خزینە زەمینی یانە نیشانەی بەرجەستە پەیدا دەکەن.

لە لێژایە بەرزەکاندا چاڵی کراوە پێك دێن لە دەورو بەریاندا تیك و لێواری تیژ، ڕووی لێژگە(المنحدر) نارێك دەبێ بە ڕاستە وانە لەگەڵ ڕێرەوی نیشتوەکانی ژێر لێژەکەوە. بارستایی یەکە لەسەر ڕووی خزانەکی(سطح انزلاق) دیاری کراو دەجولێ، وە لە کەرەستەی چوییەکدا، وەکو قوڕ، بارستایی یە خزاوەکە هەمووی لەسەر ڕوویەکی چاڵ(سطح مقعر) دەجولێتەوە.

بەزۆری خزان(الانزلاق) لەسەر ڕووی لاوازی تاوێرەکان ڕوودەدات، خزینی زەمینی بەزۆری





دوای ڕێژنە بارانەکی زۆر ڕوودەدات کە لە کێشی لێژەکەوە یان نشێوەکەوە زیاتر بێ و لێك خشان کەم دەکاتەوە. ماوە ماوە تاوێری گەورە دەکەونە خوار نشێوو لێژەکان هەڕرون بە هەڕرون دەبن ، بەردو تاوێری بچووك تیژو گەورە لە قەد پاڵی نشێوەوە دەکەونە سەر یەکتری و بە کەڵەکە(الرکـام scree taus) ناسراوە.

لـە چـیاکانو شـاخە سەرکەشـەکانەوە ڕەنـوی بـەفرو بەسـتەڵەك و تـاوێر بـۆ نـشێوەکان شۆڕدەبنەوە و ڕمانی بەستەڵەکی و ڕەنویی(avaianches) دوروست دەکەن، زۆر بە خێرایـی لـە سەرپالگەیەکی هەوایی گەمارۆ دراو دەبزوێن، هەر کە لە ناوچەی نزمەکان بە هەردێ کەوت ئـەو ڕەن و بەستەلەك و سەیاقەیە دەتوێنەوە، وەکو بەزۆری لە چیاکانی(ئەندیز) ڕوودەدات و لێـشاوی قوڕی خاپورکەری بە دوادادێت. دیسان لەژێر ئـاودا ڕمـانی گـەورە ڕوودەدات لیتـەو قـوڕی ئـاو تێکەڵ دەبێ ئاوێکی لێڵ پەیدا دەکات، گەر ئاوە لێڵەکە لە ئاوی ڕوون چڕی پڕتربێ زوو بۆ نـشێوو لێژایی یەکان دەریا دەخلیسکێت[1].

قورئان لە ڕاست ئەمە دەفەرمێ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ لێرەدا قورئـان ئاماژە بەکەرت بوونی چیاو داخوران و شکانی دەکات، بەڵام لـە قیامەتـدا بـە هـۆی گـەرمی و نزیك بونەوەی خۆر لە زەوی و قڵیش بوونی زەوی و ڕوودانی بومەلەرزە و بورکان لە هەموو سـەر زەوی دا ئاوەکان دەبن بەگڕو چیاکان دەبن بە تۆزو گـەردو هـەڕرون بـە هـەڕرون دەبـن، ئەمـەی ئێستا دەیبینین لەم گۆڕانەی بەسەر چیاکان و تاوێرەکاندا دێ بەشێکی کـەمی نمونـەی قیامەتـە.
﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيبًا مَّهِيلًا﴾[2].

واتە: ڕۆژێکە زەوی و چیاکان دەلەرزن و چیاکان دەبنە کۆمەڵە لمێکی تواوە. وەکو لە چیای بورکانی دا دەبینرێت. ﴿وَإِذَا الْجِبَالُ نُسِفَتْ﴾[3]. واتە: کاتێ چـیاکان هەڵکـەنران. ﴿وَإِذَا الْجِبَـالُ

---

(١) علم الارض/ ل:٤٢-٤٤.

(٢) المزمل: ١٤.

(٣) المرسلات:١٠.





سُيِّرَتْ﴾[1]. واتە: كاتێ چیاكان ڕۆیشتن. واتە: هەڕرون بە هەڕرون بوون و بوون بە تۆزو خۆڵ بەهەوادا.

## .خاك – التربة:

(خاك- التربة) بە زۆری خەڵكی پێ ی وایە خاك ئاوێتەی پەیینە(humas) لە كەرستەی ئەندامی شی بووەوەو تەنۆلكەی كانزایی ورد پێك دێ، ڕاستەوخۆ لە ڕووتانەوەی تاوێرەكان پێك دێت واتە: (خاكەكی گوازراوەیە). جیۆلۆجیەكان سەرباری ئەمەش چینەكی تریش زیاد دەكەن لەو كەرەستانە كە توشی ڕووتانەوە دەبێ و لەسەر تاوێرە ڕەقەكان ئارام دەگرێ بەچینی خواری خاك(مادون التربە) ناسراوە. كەچی جیۆلۆجیەكان زاراوەی خاك بۆ هەموو نیشتوو لیتەیەك بەكار دێنن كە یەكان گیر نی یە لەوانەش تاوێری هەڵوەشاو. زانایانی خاك ناس(pedology) ئاماژە دەكەن بۆ چەند بڕگەیەكی خاك: (لەژێرەوە(d) هەیە كە تاوێری ڕەقە و(c) لەسەری ئارام دەگرێ لە خوار گڵەوەیە، ئەنجا چینی خاك دێ، بەش كراوە بۆ ئاسۆی باڵا(a) كە داشۆراوە لە خوێ ی كانزایی بە هۆی ئاوی بارانەوە و پڕە لە پەین، ئەنجا ئاسۆی ژێرەوە(b) كە خوێ ی كانزایی داشۆراو دەنیشێ لەگەڵ وردیلەی لیتە(الغرین) و قوڕو ڕێژەی پەینی تێدا كەمترە لە



(١) التكوير:٣.



ئاسۆی بالاّ.

وە دەڵێن: پێك هاتنی خاکەکی دیاری کراو کەش کاری تێ دەکات و جۆرەها داخوران و جوڵەی ئاوی ژێر زەوی و بەرگی ڕووەکی حوکمی بەسەردا دەکات[1].

رابردوو باسمان کرد قورئان ئاماژە بە کاریگەری باران و کەش دەکات بۆ دورست کردن و داخورانی خاك و چینەکانی خاك﴿كَمَثَلِ صَفْوَانٍ عَلَيْهِ تُرَابٌ فَأَصَابَهُ وَابِلٌ فَتَرَكَهُ صَلْدًا﴾[2]. لێرەدا ئاماژە بە چینە تاوێرەکی ڕەق دەکات کە گڵ و خوارگڵی لەسەرە و توشی رووتانەوە دێت.

وە قورئانی مەزن دەفەرمێ﴿وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاء اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنبَتَتْ مِن كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ﴾[3]. واتە تۆ دەبینی زەوی رووت و بێ ڕووەکە، کاتێ ئاومان بارانده سەر لەبیەوەو هەڵامساو لە هەموو جۆرە ڕووەکێکی رواند.﴿ إِنَّ الَّذِي أَحْيَاهَا لَمُحْيِي الْمَوْتَى إِنَّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[4]. واتە: ئەو کەسەی زیندوی کردۆتەوە مردوان زیندو دەکاتەوە ئەو بەسەر هەموو شتێ دا بە توانایە.

لێرەدا مانای وشەی(الارض) بۆ(خاکە) کە دارو درەخت و ڕووەك دەروێنێ دوای ئەوەی ئاو دەرژێتە سەری و ئەلەرزی و هەڵدامسێت.

وەکو(زەغلول) ئاماژە دەکات خاك لە(٢٥٪)ی ئاوەو(٢٥٪)ی هەوایەو(٥٪)ی ماددەی ئەندامی یەو(٤٥٪)ی کانزای زەوی و خاکی چینی و لم و ئۆکسیدی ئاسن و کاربۆنی کالسیوم وکاربۆنی مەگنیسیۆمە.

سەرباری پێك هاتەی کیمیایی و کانزایی خاك، کە قەبارەی وردیلەکانی و ئەترمی ناوەوەی ڕۆڵەکی گرنگی هەیە بۆ پۆلین کردنیان بەسەر چەند بەشێکدا، خاك بەپێ ی قەبارەی وردیلەکانی دابەش دەکرێ بۆ: (خاکی چینی-الصلصالي- و گڵی قوڕو لیتەی (الطمية) و خاکی لماوی و

---

(١) علم الارض/ ل: ٣٩-٤١.

(٢) البقرة: ٢٦٤.

(٣) الحج: ٥.

(٤) فصلت: ٣٩.



خاکی چەوی(الحصوی) لە هەموویان بڵاوتر ئەوەیانە کە تێکەڵی هەموو ئەو قەبارانەیە.

وە خاك لەناو خۆدا لە چوار ناوچە پێك دێ: (O) کە ماددەی پەیینی یە ناوچەی(A) لە کانزای هەڵوەشاو و زبر پێك دێ و پڕە لە چالاکی ئەندامی. ناوچەی(B) زۆر تۆخمی تێدایە (ناوچەی بەرگی تاوێری کە بەهەندێ کرداری وردو خاش بوون(التجوبە) کاری تێ دەکرێت. لەم. ئەو خاکەدا کۆمەڵێ زیندەوەر دەژین وەکو(بەکتریای نایترۆجین و کەرووەکان(الفطریات) و قەوزەکان و خوریە جندەکان(الطحالب). دیسان بەکتریای ئاسن و بەکتریای کبریت(گۆگرد) و جۆری تر هەیە خۆراك بۆ رووەك کۆدەکەنەوە.

## بابزانین چۆن خاك بە ئاو دەلەرزێ و دەکشێ و هەڵدامسێت؟!

گەردیلەی ئاو لە گەردیلەکانی ئۆکسجین و جووت گەردیلەیەکی هایرۆجین($H_2O$) پێك دێت و بەشێرازەیەکی بەهێز یەکتری گیربوون و کردنەوەی ئاسان نییەو بەشێوەیەکی گۆشەیی ئەم گەردیلانە یەکتریان گرتووەو جەمسەرێکی کارەبایی ئاشکرایان هەیە، چونکە هەردوو گەردیلەی هایدرۆجین بارگەی موجەبیان هەڵگرتووە بە نیسبی و گەردیلەکەی ئۆکسجین گەردیلەیەکی سالبی نیسبی هەڵدەگرێت، کەوا لە گەردیلەی ئاو دەکات لە کارەبادا هاوبارگە نەبێت.

ئەدگاری ئاو بۆ ئەو جەمسەرەی یە کارەبایی یە دەگەرێتەوە وەکو: توانای بەهێز لە تواندنەوەداو، هەڵسانی رویی و، یەکانگیری بەهێزی گەردەکانی کە توانای دەداتێ سەربکەوێ و لەشێوەی دڵۆپەکاندا خۆی لول پێچ بکات و گیراوەکانی چاك ئاوێتە نەبن.

ئاو بەو ئەدگارە سروشتی یە جیایانە گەردابپەزێتە سەر خاکێ لە رووی کارەبایی یەوە دەیوروژێنێ و دەیلەرزێنێ و هەڵدامسێ و دەکشێ و زیاد دەکات، چونکە بە زۆری خاك لە خاکی چینی و گڵ پێك دێ کە ئاو هەڵدەگرێ و پێك هاتەکانی گڵەکە دەلەرزێنێ و قەبارەی گەورە دەکات و بەرزی دەکاتەوە و تەنکۆڵە دەبێ کون دەبێ رێگا بۆ دەرچوونی ئەو رووەکە خۆش بکات کە لەو تۆوە وە لەناو خاکدایە هەڵبچێت ئەو هۆیانەی خاك دەلەرزێنێ و هەڵی دامسێنێ و بەرزی دەکاتەوە، ئەمانەن:

(١)خاك لە کانزایی گڵی و چینی پێك دێ، کە توانای تێر ئاوبونی هەیە و بە تێر هەڵدامسێت.





(٢) ئەم گڵە(سیلیکاتی ئەلەمنیۆمی ئاو خۆرەوە) پێك دێ لە تەبەقەی ئۆکسیدی سلیکۆن و ئەلەمنیۆم کە گەردی ئاوی و گازەکان نێوان دەخەنە ناویانەوە.

(٣) ئەم دانکە گڵانە تیرەیان لە(٢٥٦)ملم، گەر ئاویان کەوتە سەر بۆ لیتەیی دەگۆڕێ،(جوڵەی براونی) بەنایەکسانی گەردەکانی لێك دوردەخاتەوە.

(٤) ئەم گڵە بەشی سەرەکی سیلیکاتی ئەلەمنیۆمی تێراوە، ئەم پێك هاتە کیمایی یە توانای شی کردنەوەی هەندێ گەردی ئەلەمنیۆمی هەیە بە هۆی گەردیلەی. ڕێسای تر وەکو(مەگنیسیۆم و کالیسیۆم) بەهۆی شی بونەوەی گەردیلەی ئەلەمنیۆم بە هۆی گەردیلەی تر هەندێ گەردیلەی ئەتۆمی ئایۆنی بارگە موجەب وەکو(سۆدیۆم و کالسیۆم) لەسەر لێوارو رووی گڵەکە دەبەستێتەوە بۆ هاوبارگە بوونی بارگەی سالبی، کەلە ئەنجامی شی بونەوەی گەردیلەی ئەلەمنیۆمی سیانی هاوسەنگ بەگەردیلەی کالسیۆم یان مەگنیسیۆمی دوانی هاوسەنگ پەیدا دەبێت.

ئایۆناتی موجەبی وەکو ئایۆناتی سۆدیۆمو کالسیۆم ئاسانە بۆ شی بونەوە بە ڕێسای تر ئەمەش لەرینەوەی زۆر لەناو گڵەکەدا پەیدا دەکات، چونکە گەردی ئاوی جوت جەمسەری کارەبایی هەیە.

(٥) ئەو کردارەی ئالۆزاوی یەکی کە ملیۆنەها ساڵە خاکی پێك هێناوە زۆر توخم و ئاوێتەی کیمیایی پێداوە کە بۆ ژیانی رووەکی زەمینی پێویستە، دیسان ئەو زیندەوەرە زل و وردانەی خوای گەورە لە ژێر خاکدا داینا‌ون[1].

بەردەوام ماددەی ئەندامی و نائەندامی بەزەوی دەدەن، کاتێ ئاوباریە سەر ئەو خاکە پێك هاتووەکانی ئایۆن دەبێ، ئاو جەمسەری کارەبایی هەیە و هەندێ ئاوێتەی گڵ دەتوێنێتەوەو ئەمەش ئایۆنات پەیدا دەکات و بارگە هاوشێوەکان لێك دوردەکەنەوە لەسەر تۆێ ی گڵداو

(١) بۆ نمونە کرمی زەوی کە لە هۆزی خۆماندا بە(گڵ خۆرکە) ناسراوە لەیەك دێبەر زەوی دا(٥٠) هەزار دانەی تێدایە، کە لەشێکی درێژی نیمچە لولەیی یان هەیە، لەگەڵ دوولای باریکداو ڕەنگ پەمەیین مەیلە وکاڵە. لەشی(٢٠٠) ئالقەیە. یەکەم شت ئەوانە بۆشایی دەخەنە ناو خاکەوە تا ئاوو هەواو رووناکی بڕواتە ناو ڕەگ و ریشاڵی رووەکەوە، دووەم ساڵانە(١٨) تەن پاشەڕۆك دەردەن، کە دەبێ بە پەیینی کیمیایی بۆ خاك و رووەك. ئەمەش زەوی بە پیت دەکات.




گیراوەی ئاوی دا ئەمەش ئەو توێیە ڕادەکێشێ و بەتوندی دەیانلەرزێنێت.

(٦) (باو بلندەو مێروەکان و زیندەوەری وردیلە) زۆری لە تۆوەکان هەڵ دەگرن، لەوانە تۆوی باڵدارو سپۆرەکان(الابواغ) و هەلالە(حبوب اللقاح) و میکرۆبەکان بۆ ناو خاك هەڵدەگرن. کاتێ ئاو دەرژێتە سەریان بەتایبەتی تۆوەکان کە دەرۆن ئەو کەرەستانە دەمژن لە ناو تواوەنەوە گەشە دەکەن و ڕەگەکان بۆژێرەوە دەبێ و لقەکەش بۆ سەرەوە هەڵدەچێ، بەمەش لەززینی سەخت لە گڵدا دورست دەکات.

(٧) لەگەڵ زۆر بوونی ئاودا بۆ سەر گڵ هەمور دیمەنەکی ژیان دەبوژێتەوە لە بەکتریاو کەڕوەکان و قەوزەکان و هی تر. ڕووەکە جەستەدارەکان ڕەگ و ڕیشاڵی چڕو پڕ بەزەوی دا ڕودەچوێنن هەمور ئەمانە قەبارەی زەوی پتر دەکەن چالاکی کیمیایی و فیزیایی یان پتر دەبێ. ئەمەش پێك هاتەی گڵ دەلەرزێنێ و هەڵی دامسێنێ و ڕووەکی زۆر تێ یدا دەروێت، ئەم وێنانە بە وێنەی هێواش گیراون و دیمەنی ڕاستی قورئانی پیرۆز لە ڕاست ئەم مەسەلەیەدا کە ئاماژەی بۆ کردووە دەسەلمێنێت[1].

ئەم ڕاستیانەش لەم چەند ساڵانەی دوایی دا پەیان پێ براوەو مرۆۋ هیچی لەبارەوە نەزانیوە، ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان، لەسەردەمی نەزانیدا کە ئەوە دەردەخات قورئان فەرمودەی کردگاری بونەوەرە بۆ سەردڵی پێغەمبەرمانی(ﷺ) ناردووە وەکو نامەی خودا بۆ جیهانەکان.

قورئان ئاماژە دەکات ڕۆژێ دێ زانستی جیۆلۆجی گەشە دەکات، ئەو کاتە مرۆڤایەتی بۆی دەردەکەوێ ئەو خوایەی زەوی دورست کردووە لە ڕووی فیزیایی و کیمیایی و جیۆلۆجیەوە هەر ئەو خوایەشە ئەو زانیاریيانەی لەناو قورئاندا داناوە.

(دونالد روبەرت کار) مامۆستای کیمیای جیۆلۆجی لە ئەمریکادا دەڵێ: (توێژینەوەکانم لە کیمیای جیۆلۆجی ڕێ ی پیشان دام بڕوا بە بوونی کردگاری ئەم گەردوونە بنێم، نامۆش نییە بڕوام وابێ ئەم گەردوونە دیمەنێکە لە دیمەنەکانی توانای خودا). (لە دوایی دا کیمیایی جیۆلۆجی کە تاووتوێ ی دەکەم فێری کردین بە فراوانی لە شتەکان بڕوانین لەسەر بنەمای بلیۆنەها ساڵ لە

---

(١) الارض/ د: زغلول النجار/ ل:٣٥٨-٣٦٤. بەکورت کردنەوە.




کات بڕوانین و بەگشت گرەوەیی لە گەردوون بڕوانین وەکو شوێن و، سەیری سورڕ جیاوازەکان بکەین کە هەموو سورە گەردوونیەکان بگرێتەوە، ئەم جۆرە ڕوانینانە وامان لێ دەکەن زیاتر ڕێز بۆ شکۆداری خوای گەورە دابنێین. ئەوانەی بڕواشیان نییە داهاتوو ترس و تۆقین دایان دەگرێ و ناچار دەبن بڕوا بێنن ئاسمانەکان گەواهی گەورەیی خوا دەدەن و قایمیشی بەڵگەیە لەسەر جوانی و شاکاری لە دورستکردنی دا) [1].

## ٧٩- ( ئاوی سەر رووی زەوی ) و داخوراندن:

قورئان دەفەرمێ ﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾[2].

لێرەدا قورئان دەری دەخات: دوای دروست کردنی کۆمەڵەی خۆر زەوی و هەسارەکانی هێلکەیی ڕێك خست. ئاوو لەوەڕی لە زەوی دەرهێناو، چیاکانی لەنگەر پێ ڕاگرتن. وەلێرەدا ئاماژە دەکات ئاو پەیوەندی هەیە بە پەیدا بوونی ژیانی رووەکی و تاوێرەکان و چیاکان و بەرزایی نزمایی یەکان و خاك.

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ أَنزَلَ مِنَ السَّمَاء مَاء فَسَلَكَهُ يَنَابِيعَ فِي الْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَانُهُ﴾ [3].

واتە: ئایا نابینی خوا لە ئاسمانەوە ئاو دەبارێنێ دەیخاتە ناو زەوی یەوە وەکو کانی، پاشان پێ ی دەروێنێ کشتوکاڵی جیاجیا لە ڕەنگدا.

﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّا نَسُوقُ الْمَاء إِلَى الْأَرْضِ الْجُرُزِ فَنُخْرِجُ بِهِ زَرْعًا تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَامُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ﴾[4].

واتە: ئایا نابینن ئێمە ئاو لێ دەخورین بۆ خاکەکی رووت کشتوکاڵی پێ دەروێنن ئاژەڵان و خۆیان لێ ی دەخۆن ئەی نابینن؟

---

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ ل: ٨٦.

(٢) النازعات:٣٠-٣٢.

(٣) الزمر: ٢١.

(٤) السجدة:٢٧.



(الك سمث) دەڵێ: (هەندێ ئاوی باران کە دەکەوێتە سەر زەوی دەڕواتە ناو خاکەوە دەبێتە ئاوی ژێر زەوی و هەندێکی تر دەبێ بە هەڵم و هەندێکی تر بۆ هەوا دەگەڕێتەوە. ئەو ئاوەی دەمێنێتەوە لە شێوەی ئاوی سەر رووبی دەڕوات لە کاتی ڕەشە باو گەردەلولی بارانــاوی دا هەزاران تەن ئاو بەسەر یەك کیلۆمەتر زەوی چوارگۆشەیی دا دەکەوێت.

هەرکە دڵۆپە ئاوەکانی باران یەك دەگرنەوە لەسەر رووی ئاودا تەبەقێ ئاو پێك دێنێ گڵ و خاك بۆ ژێرەوەی نیشتوەکان هەڵدەگرێ و بەپەلە ئاوەکە دەگۆڕێ جۆگەڵەو بەناو دێراوەکانی کێڵگە دا یان ڕێرەوی ئاژەڵاندا دەڕوات.

کاتێ وردو خاش کردن و ڕامالینەکە(الحت) چالاك بێ نیشێوی(الشعاب)ی قوڵ دروست دەبێ، ئەو کاتە(خاکی خراپ) و رووت و ڕەق دروست دەبێ. گێژەڵۆکەی ئاوی جۆگەڵەو کەندرەکان قوڵ دەکات و تەنیشتەکانی دەڕمێنێ و لە ئاوی بەپالدا ڕای دەماڵێ، کاتێ باران وەستا ئاوەکە لە دەرچوون دەوەستێ و ئەو ماددانەی هەڵی گرتبون لە شێوەی خڵتەو لیتە(الغرين – alluvium) دەنیشێت، هەرچی جۆگەلە بەردەوامەکانن لە کاتی ژێر زەمینی یەوە دێ لە وەرزە وشکەکاندا. ئاوی ڕەوان هۆیەکی چالاکە بۆ وردو خاش کردن و داخوراندن، سەرباری توانەوەی تاوێرەکان جۆگەکانی قوڵ دەکات و خاك و کەندەڵان و تاوێرەکان ڕادەماڵێ و لە گێژەڵۆکەی ئاوی دا چەووبەردی بەدەوردا دەخولێنەوە و چاڵی تاوێری(potholes) پێك دێنێت.

ئاوی بزۆك ڕۆیشتنی ئارێك بێ دەتوانێ خشتوخاڵ لە شێوەی شتی گیرساوە(العوالق) هەڵیان بگرێ، وەکو چۆن خشتوخاڵی درشت بجولێنێ و بەهۆی بازدان، واتە: لەگەڵ تەوژمە بەینێ پاڵی بدات و سەرئاو بکەوێ، دیسانەوە دەتوانێ شتی گەورە تر تاوبداتێ لە شێوەی هەلگرتنی ناخ و بن(القاع) دا، واتە: بەخلۆر کردنەوەو ڕاکێشانی کەرتە تاوێردا، هەر تاوێرەش توشی رزین و کون بوون و خڕبوون دەبێت لە جۆگەدا.

قەبارەی ئەم جۆگەڵەیەو خێرایی یەکەی برو قەبارەی شکانی تاوێری بڕیاری دەدات کە دەتوانێ هەڵی بگرێ، خێرایی جۆگەیەکە پشت بە لێژی ڕێرەوەکەی دەبەستێ و هاوسەنگی لە نێوان جۆگەلە بۆ نیشتن و داخوراندن دا دروست دەکات، ئەو جۆگەلەیەی باری قورس هەڵناگرێ





داخوران بگرێ لە کاتی کەم بوونەوەی خێرایی یەکەیدا بە نیشتاندن دەکات.

ئەمەیە هۆکاری ئەوەی جۆگەکان لەوەرزی لافاودا پاڵبنرێن بۆ وردوخاش کردنی، لەوێ دا ڕەنگی یان دەگۆڕێ بەهۆی بار هەڵگرتن و دەتوانێ تاوێرو گاشە بەرد پاڵبدات، لەکاتی تریشدا روونەو بارەکەی بەکاتی هەڵگرتووە. ئەو خورانەی رووبار و جۆگە پەیدای دەکەن دەتوانێ هەموو بەرزی و نشێوەکان نزم بکاتەوە بۆ ئاستەکی تەخت، ئەوکاتە زەوی یەکە بە دەشتایی(السهب — peneplane) دەناسرێت[1].

## ( جۆگەلەو رووبارەکان ) و داخوران و داڕزاندنی تاوێری:

رووبارو جۆگەلە بە چوار قۆناغدا ڕەت دەبن (سەرەتایی، لاوی، پێگەیشتن، پیری) لە قۆناغی پیری دا رووبار فراوان دەبێ بەسەر دەشتایی یەکی فراوانی لێشاوی دا پێچ دەکاتەوە بەلاری، زۆرجار ڕێرەوەکەی لە ئاستی دەشتایی دا بەرز دەبێتەوە بە هۆی دەمەوانیەکی



(١) علم الارض/ ل:٤٩-٥٠.



سروشتی(levees) کە رووبار خۆی لــە کــاتی لافــاودا دروســتی دەکــات. رووبــار بــە زۆری بــە هێواشی دەڕوات لیتەی وردو خشتوخاڵ هەڵدەگرێ، ئەو خاکەی دەکەوێتە نێوان رووباری هێــواش و خاوەن گردەکی دابڕاو پێ ی دەوترێ(موناد نوك) کە هۆکارەکانی رووتاندنــەوە بــە دوای خۆیــدا بەجێ ی هێشتووە، پێچ و پەناکانی ئەو رووبارە لاسەنگە یەك دەگــرن و بەشــێ لــە چــەمانەوەی رووبارەکە دەبڕێ تا دەریاچەیەك بەناوی(oxbow) پێك بێنێت.

لەم قۆناغەدا ئاستەکی رێسایی دیاری کــراو رکێــف دەگرێتــە دەســت، بــەلاّم ئــەم ئاســتە زۆرجار چینەکی تاوێری رەقە، لەم دۆخەدا لە ژێرەوەی رێڕەوی رووبار داخورانی چــالاك روودەدات کەلە جۆری داخورانی قۆناغی لاویەکەی دا بێت، بەلام گەر ئاستی رێسایی و بنکــەیی لابــچێ و ئاستی رووی دەریا لە چاو زەوی نزم بێتەوە، ئەو کات تەمەنەکانی رووبار نوێ دەبێتەوە[1].

(لەدۆخی سەرەتایی دا رووبار لە ناوچەی بەرزدایــە و گزمــە بــچووکەکان هێــشتا رێــڕەوی دیاری کراویان نییە، ئەم رووبارە لە نێوان چەند ناوچەیەکی ئاوی مەندا دەڕوات، زۆر ئامێنێتەوە دۆڵەکی دیاری کراوی دەبێ و ئەوکاتە دەڕواتە قۆناغی لاوییەوە. بڕگەی پانی دۆڵەکە لە شــێوەی پیتی(V) تەنگەبەردا دەبێت.

بەدەگمەن ڕاستە رێ دەبێ و زۆر جار دۆڵەکان تێکەڵ کــێش دەبــن و یــەکتری دەبــڕن. لــەم قۆناغەدا تاڤگەکان و دەریاچەی بچووك و خڕ و چەند زێ یەك پەیدا دەبن.

ئاوەڕۆکە رێك نابێ و تاوێری گەورەو گاشەبەردی تیژ لە ئاوەڕۆکــەدا بلاّدەبنــەوە نیــشتەنی پەیدا دەکەن، ئەو نیشتەنی یە جۆگەلەکان پارچە دەکەن و نیشتەنی لیتەیی خۆجێ یــی پێــك دێ و، خاکی میان جۆگەکان پێویــستی بە بلاّوە پێ کردنی باش دەبێ بۆ ئاو. لەگەڵ رێڕەوی رووبــاردا پانی دۆڵەکە زیاد دەکات و کاتێ رووبارەکە پێ گەیشت دەبێ بە قاعێکی فراوان.

لێرەدا رووبارەکە ناگەرێتەوە پانتایی دۆڵەکە بەتەواوی داگیربکات بەهۆی بوونی دەشــتایی لیتاوی داپۆشراو بە لیتە لەســەر لاکانیــەوە، دیــسان رووبارەکــەش ژمارەیــەك لێــواری بــە دوای یەکتری بۆ خۆی دابڕیوە(terraces) نیشتەنی یەکان ئەم قۆناغــە نــەرم تــرە. رووبارەکــە بــەرەو دەشتایی لێشاوی لاردەبێتەوە دایدەتاشێ لــە لێوارەکــانی دەرەوەیــەوە لەبــەر خواریــەکانی و لــە

(١)....../ ل:٤٧.





لێواره خوارەوه کانیەوه دەنیشێت. لەم قۆناغەدا رووبار پێنج دەکاتەوە و شێوەی زەوی لەمیان پێچەکانی دا درێژ کۆڵەیە، دیسان ژمارەی زێیەکانی لەکەمی دەدات[1].

گەر سەیری قورئان بکەین لەزۆر ئایەتدا ئاماژە دەکات بە رووتاندنەوەو لابردنی تویکڵی زیندووی سەر زەوی و، دابەزاندنی رێژەی ئاوی زەوی وەکو سزایەك و یاسایەکی سروشتی﴿وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ السَّمَاء فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا أَوْ يُصْبِحَ مَاؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُ طَلَبًا﴾[2].

واتە: وەدادەبەزێیتە سەر باخچەکەت سزایەك(فەرمانێك) لە ئاسمانەوە بیکاتە زەویەکی رووت کە مرۆڤ بخلیسکێ بە سەریەوە یان ئاوت لێ رۆبچوێنێ وقەت نەتوانی داوای بکەیەوە. (بەڵێ باران و لافاو و تریشقە دەتوانن خاك و تاوێرەکان رابماڵن و تەختی بکەن)! پاشان بە هۆی کەم بارانی و وشکە ساڵی و هۆکاری تر ئاوی ژێر زەوی ئاستیان دادەبەزێ، یان بەتەواوی وشك دەبن.

## ٨٠- ( ئاوی ژێر زەوی و رووتانەوە )

ئاوی ژێر زەوی ئەو ئاوەیە دەڕواتە ناخی زەوی و گڵ هەندێ لەو ئاوە گڵ دەداتەوە، کەچی زۆربەی ژێر خاك دەکەوێ بۆ ناو تاوێرەکان و زۆربەی ئەو تاوێرانە کەلێن و بۆشایی یان هەیە، بەڵام لەگەڵ قوڵ بونەوەدا کەم دەبێتەوە. ئەو ئاوە دوای برینی ناوچەی هەوا گۆڕکێ لە خاکدا بۆ ناوچەی تێربوون هەموو بۆشایی یەکان پڕ لە ئاو دەبن.

ئەو تاوێرانەی ئاو وەرگرن(الصخور النافذة permeable) رێگا بە ئاو دەدەن بەدرزو کونەکاندا تا کۆتایی یان ئاویان بەناودا بڕوات بەڵام ئەو تاوێرانەی ئاو وەردەگرن پێیاندا تێ پەڕێ بەڵام نەك بە درزو کونەکاندا بە تاوێری لێ چوو(الناضحة – pervious) ناسراوە. بوونی کەللەبەرو تیك مانای توانای ئاو نییە بۆ پیا رۆیشتن. هەرچی کونیلە دار(المسامیە – porosity)ە رێژەی کەللەبەرەکان(الثغور)ە لە چاو قەبارەی گشتی تاوێرەکە.

لە قوڕەکاندا دەگاتە(٥٠٪)، بەڵام قوڕ درزوکونی نییە ئاوی پیا رەت ببێ. کونیلەی

---

(١) علم الارض / ل: ٤٧-٤٨.

(٢) الکهف: ٤٠-٤١.




تاوێرە لیەکان (sandstones الصخور الرملیـە) تـەنیا(١٥٪)یـە، بـەڵام بـە هـۆی گـەورەیی قەبارەی کەللەبـەرەکانی ئـاو هەڵـدەگرێت. بـەڵام تـاوێری تەباشـیری(chalk) کونیـکـەی زۆرە دانکەکەی وردە و درزاوی نییە بۆشایی هەیە پیاهێلۆیە هەر چەندە تیَ ی ناچێت(غیر ناضحة).

ئەو تاوێرانـەی ئـاو گلـدەرەوەن عـەمبارێکی ئـاوی ژێـرەوەن(aquifer)، وە لێوارەکـانی عەمباری سەرەوە بە ئاستی ئاوی ناو زەوی(منسوب الماء الجوفیـة – water table) دەناسـرێ و، دوای وەرزەکانی باران بەرز دەبێتەوە، لە وەرزە وشکەکاندا دادەبەزێت، کاتێ لە ژێر گردەکانە بەرز ترە نەك لە ژێر دۆڵەکاندا، ئاوەکە لەناو عەمبارەکە دەڕوات، هەرکە تێکرای ئـاوی ژێـرەوە گەیشتە رووی زەوی لای رووبارەکان و دەریاچەکان و گۆمـەکان وکانیـەکان ئـەوە دەردەکـەوێت زۆرجار عەمباری ئاو لەسەر چینێ ئارام دەگرێ ئاوی پیا ناڕوات و کەرسـتەیەك دەوری داوە ئـەو تێر ناخواتەوە. ئەو کاتە بـە ئـاوی نیـشتوو(الجاثم – perched aquifer) ناسـراوە، تیکـڕای نیشتویی هەیە.

بە هۆی بیرەکانەوە(الابار) ئاو لە عەمبارەکانـەوە دەگێردرێتـەوە، زۆر خـەرج کردنـی ئـەو تێکڕای ئاوی ناوەوە بە خێرایی دادەبەزێنێ و، لە باری ئەوپەردا بیرە تەنکەکان وشك دەکـەن ئـە تەکیاندا.

**گەر تاوێرەکانی عەمباری ئاوی بەچینە تاوێرێ داپۆشرابون کە ئاو پیایانـدا نـاڕوات، ئـەو کاتە بە عەمباری ئاوی بەستراوە(الخزان المـائی المقیـد – confined aquifer) ناسـراوە. گـەر تێکرای ئاوی ناوەوە لە ناوچەیەك دا بۆ عەمبارەکە ئاوی لەبەرزایی یەوە بێتەوە سەرو لە بیرەکـە بەرزتر بێ کە لە ناوچەکەدا هەڵکەنراوە و ناکشێ بۆ ژێر زەوی، ئەو کاتـە ئاوەکـە لـە بیرەکـەوە** بەرز دەبێتەوەو بە بیری(ئیرتیوازی) ناسراوە. لێرەدا(حەوزی ئیرتیوازی) گەورە هەن لـە جیهانـدا. کە بیرە ئیرتیوازیـەکان چـەندان کیلۆمـەتر لـەو ناوچـانەوە دوورن ئـاو بـە عـەمباری ژێـر زەوی دەدەن[1].

گەر قورئان بڕوانین لە یەك شوێندا ئاماژە بە(بـیر) کـراوە وەکـو﴿وَبِئْرٍ مُّعَطَّلَةٍ﴾[2]. واتـە

(١) علم الارض/ ل:٥٣-٥٥.

(٢) الحج: ٤٥.





وەبیری لە کارکەوتوو. واتە: ئاوەکەی وشکی کردووە، یان پڕ بۆتەوە.

## ٨١- ( ئەشکەوتەکان و بەرزو نزمی تاوێری کلسی ) :

ئاوی روونی پەتی توانای تواندنەوەی و کاربۆناتی کالسیۆمی نییە کە تاوێری کلسی پێك دێنێ، بەڵام ئاوی باران کە نیمچە ترشە بە یارمەتی ترشەڵۆکی خاك دەتوانێ کاربۆناتی کالسیۆم بتوێنێتەوەو بۆ بیکاربۆناتی کالسیۆمی بگۆڕێ بەم هۆیە ئاو دەتوانێ کون و کەللەبەرەکان فراوان بکات و ئەشکەوت دورست بکات، کە تەنیا بریتین لە چەند ڕێرەوو کۆنێکی نارێك لە ژێر زەوی دا پێك دێن وەکو تۆنێل. هەندێ جار توانای ئاو لە تواندنەوەی تاوێردا دەگاتە ئاستی ئاو بەسەری دا ناڕوات و بەناو تیك و کەللەبەرەکاندا نقوم دەبێ کە لە شێوەی(بەلوعە) و(بۆڕی) دان.

هەندێ ئەشکەوت زۆر قوڵن، هەندێ توێژەرەوەی فەرەنسی ئەشکەوتی یان وایان دۆزیوەتەوە قوڵیەکەی کیلۆمەترێ دەبێ، هەندێ ژوور زۆر فراوانن، وەکو ژوورە زلەکەی ئەشکەوتی(کارلسبار – نیومەکسیکۆ) کە دووریەکانی کیلۆمەترێ پتر و پانی (٢٠٠)م بەرزی(١٠٠)م دەبێت.



ئەم ژوورانە بەهۆی توانەوەو داخوران رووخانی سەقف و بانـەكان دەبێـت . وە تەباشـیر جـۆرەكی سپی هەڵوەشاوەی تاوێری كلسی یە لە باشور(ئینگلترا) دەردەكەوێت، یان باكوری فەرەنسادا[1].

وشەی(الكهف) ڕاستەخۆ لە قورئاندا لە سورەتی كەهفدا لـە ڕاسـت (یـارانی ئەشـكەوت) چەند جارێ دووبارە بۆتەوە﴿أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا﴾[2]. هەنـدێ سەرچاوە بۆ ئەوە دەچن ئەم ئەشكەوتە لە(یەنجەلوس) بێ نزیك(ئەفسوس) لـە ئاسـیای بـچوكدا؛ ئیمرۆ لە توركیای دا بە(تەرتوس) ناسراوە لە كێوی یەنجەلوسدا.

خوای گەورە ئەم موعجیزەیەی زیندوبونـەوەی مردوانـی لـە تاقیگـەدا لـەوێ دا پێـشانی مرۆڤایەتی داوە لەسەردەمی حوكمی (دقلدیانوس) دا(٢٤٩-٢٥١ ز) كە پادشایەكی رۆم بووە لە وڵاتی شامدا. وەكو(د: مـروان رفـاعی) لـە(الاعجـاز الطبـي في قـصة اصـحاب الكهـف) باسـی كردووە. كەچی زانای شوێنەوارزانی ئەردەنی(رفیق وفا الدجاني) (١٩٦٣) ڕایگەیاند ئەم ناوچەیە لە ئەردەنە. وەكو(یوسف الحاج) لە٠موسوعة الاعجاز العلمي/ ل: ٤٣. دا باسی كردووە.

(الثعلبي) لە(تفسیر)ەكە یدا دەڵێ: لە ئاخر زەماندا لەسەردەمی مەهدی دا(علیـه الـسلام) جارەكی تر زیندودەبنەوە دەمرنەوە، ئەوسەلامیان لێ دەكات و خوا بۆ ئەو زیندویان دەكاتەوە.

وە قورئان ئاماژە بۆ ئەشكەوتە دێرینەكان دەكات كە مرۆڤ كردونـی بەشـوێنی حاوانـەوە. یان بە كوێستان و لە هاویناندا سەفەریان بۆ كردووە﴿وَتَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا فَارِهِينَ﴾[3]. گەر تەماشای كوردستانی خۆمان بكەین چیای دێرینی زۆری تێدایە كە بەر لە مێژوو ئاوەدان بـوون و شوێنەواریان دیارە وەكو:

(١)ئەشكەوتی شانەدەر: دەكەوێتە چیای(برادۆست) و كۆنترین چیایە لـە كوردسـتاندا، لـە چیاكانی چەرخی بەردینی كۆنە لە ئەشكەوتە هەرە فراوانەكانی كوردستانەو درێژی(١٣٠) پێیـە. لەوێدا ئیسقی مرۆڤی(نیاندرتاڵ) دۆزراوەتەوە. لەوێ دا چەند خـوڵی دۆزراوەتـەوە بـۆ نیـشتەجێ

(١) علم الارض/ ل:٥٥-٥٦ بە كورت كردنەوە.

(٢) الكهف:٩.

(٣) الشعراء:١٤٩.





بوون، کۆنترینیان بۆ(٥٠-٧٠) هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە لەوێ دا ئەشکەوتی تری شوێنەوار دۆزراوەتەوە وەکو(هاودیان) و (دیان) و (بێخاڵ) کە ئاسەواریان بۆ(٥٠) هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە.

(٢) دیسان وەکو(زاوی جمی) لەزێ ی گەورەداو گردەچاڵ و هی تر(١).

## ٨٢- (بەستەڵەکی بزۆك) و ڕەنو و روتاندنەوە:

**گەنجێ لێ ی پرسیم باشە مامۆستا گەر قورئان هەموو شتەکی باسکردووە بۆ باسی بارانی کردووە بەڵام باسی بەفری نەکردووە؟! منیش وتم:**

(١)گەر قورئان باسی(الماء) دەکات وەکو﴿وَأَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً﴾(٢). واتە: بارانـدمان لـە ئاسمانەوە ئاو. لێرەدا مەبەستی پێ لە ئاوە لە دۆخی شلی و ڕەقی دا.



(١) اربيل بين الماضي والحاضر/ زبير بلال اسماعيل والاخرين/ ل: ٥٢.

(٢) البقرة:٢٢.




(٢) ئاماژەی کردووە بە راستەوخۆیی کاتێ فەرمویەتی﴿مِن بَرَدٍ﴾ [1]. وشەی(البرد) تەرزە بەفرە وەکو لە گەردوونناسی دا باسکراوە. با قوتابیان و خوێنەران بۆی بگەرێنەوە﴿لَا يَرَوْنَ فِيهَا شَمْسًا وَلَا زَمْهَرِيرًا﴾[2]. واتە: (خۆر لە گەرمایی زۆر) و فرە ساردی تێدا نابینین) کە مەبەستی بەهەشتە فرە ساردی لە جەمسەرەکاندا هەیە.

(الك سمث) دەنوسێ: (بەزۆری بەفر لە ناوچە بەرزەکان نزیك لە جووت جەمسەرەکان بەعەدەبارێ، لە هاویندا کەمێ لە بەفر نەبێ لەوێ ناتوێتەوە. ئەم بەفرە فشاری دەکەوێتە سەرو دەبێ بە بەستەڵەك و زوقم(الجليد). لەگەڵ زیاد بەفرەکەدا قورسایی یەکە زیاتر دەبێت و بەستەڵەکی ژێرەوە دەگۆڕێ بە ناوەکی شلی لینج بەستەڵەکی سەرەوەی کە درزو تیکی داوە(المتصدع دەجولێت. ئەو بەستەڵەکە بزۆکە بەفرگرە(الثلاجة – glacicr) ناسراوە، ئەو بارستایی بە بەستەڵەکانە لەم چاخەدا لە ناوچە جەمسەرەکاندا هەیە لەوانە(گرین لاند) و ناوچە بە فێنکەکان. ئەم جوڵەیە تا ئاستێ بەردەوام دەبێ تێکرای ئامادەبوونی بۆ بەستەڵەکی یەک دەبێ لەگەڵ تێکرای توانەوەیدا.

بارستایی بەستەڵەکی کیشوەری ئەستوریەکەی لە کیلۆمەترێ پتر دەبێت ئە بەشەکی فراوانی کیشوەری باکوری لە چەرخی بەستەڵەکی دوایی دا دادەپۆشێت، بەفرگرەی دۆڵەکان تێپەر دەبێ لە ناوچە بەستەڵەکیەکانی جیاکاندا. بەستەڵەکی بزۆك هۆکارێکی چالاکی داخورانە وردوخاش کردنە ئەو تاوێرە لادەبات توشی ڕووشان و ڕزین بووە و، ئەو پارچە تاوێرە هەڵدەکەمێ کە لەسەری دا دەخزێت لە زەوی تاوێری دا، ئەو تاوێرە ڕادەماڵێ و هەموو ئەو تاوێرانەی بەسەریشیاندا ڕەت دەبێ نەرم دەبن و تێك دەشکێن.

دیسان بەستەڵەکی بزۆك(ڕەنو) بەرزو نزمی(التضاريس)ی ئەو زەوی یەی دەگۆڕێ بەسەریدا دەڕوات و دەیگێڕێتەوەو ئەمەش لە بەفرگرەکانی دۆڵەکان(الثلاجات الوديان) دا دەبینرێت بەستەڵەك لە تەك سەری دۆڵدا چاڵەکی بازنەیی دورست دەکات بە(corrie – cirque

---

(١) النور:٤٣.

(٢) الانسان: ١٣.




ـسراوە، بەزۆری قوڵە مادام بەستەڵەکەکە برەکەی زۆر بێت(چاڵە ڕەنو)[1]. ئەو چاڵە لە کورسیەك دەچێ دوو دەستی هەبێت. دیواری دواوەی چاڵەکە لێژیەکەی تیژە، کاتێ بەستەڵەك ـری دەکاتەوە تیکێ لەمیان دیواری دواوە و بەستەڵەکەکە هەیە بە(بەرگشروند — bergscnrond) ناسراوە و زوقمی توند دەیگرێتەوە. ئێستا کە گۆم و دەریاچەکان زۆربەیان ئەو ـازنە چاڵەیان(الدارە — cirque) هەیە.

گەردو بازنە چاڵ یان چاڵە ڕەنوی(الدارە) پێچەوانەی یەکتری پەیدا بوون و لێوارێکی کراوەیان(حافة منفرجة — stridingedge) یان نوك(arete) لە نێوانیاندا دورست بووە. گەرسێ چاڵە ڕەنو(الدارە) یان زیاتر دورست بوو لوتکەیەکی قوچەکی(pyramidalpeak) یان قوچێ(horn) دورست بووە.

سێ بەفرگرە دۆڵە سەرەکیەکان بە قوڵی دەبنە چاڵ و برگەی پانیەکەی دەگۆڕێ لە شێوەی(V) بۆ شێوەی(u) و لەسەر شانەکانی دۆڵە تازەکە ناسەواری زەمینی دۆڵە کۆنەکە بەجێ دێڵێ و بە(تەلپ alp) ناسراوە. ڕێیە کۆنەکان لە سایەی چاڵی قوڵ و خێرادا هەڵدەواسێ و تۆڕی جۆگەلەو رووبارەکان پارچە پارچە دەکات. نمونەی تری رواڵەتی رۆشانی بەفرگرە شوستەی درزاوییە(الارصفه المحززة — striated pavemedents) ئەم تاوێرانە روتن لە بەستەڵەکی بزۆك نیشانەی درزو شکان لەسەری بەجێ دێڵێ، دیسان تاوێری(roches moutonmees) کە بریتین لە تاوێرێ بەستەڵەك لوسی کردوون، بەرەو ناواراستەی دۆڵ و جوڵەی بەفرگرە و ئەو روشان و هەڵکەندنەی پەیدا کردوو. چاڵی بە ناراستەی خوارەوەی دۆڵەکە پەیدا کردووە.

بەفرەگرەی دۆڵەکان سەرەکیەکانیان بە هۆی لاوازی چینی تاوێری یان تەنگەبەری دۆڵەکان چاڵی قوڵ پەیدا دەکەن کە دەبنە هۆی خێرا کردنی جوڵەی بەفرگرەیی و ئەو دۆڵانە داهاتوو دەبنە شوێنی دەریاچەکان. هەر بەهۆی ئەو چاڵە قوڵانە کەنداوی تەسکی قوڵ پێك دێن و ئێستا ڕێگای چوونە ژوورەوەن بۆ کەنارەکان و بەفیور دەکان(fiords) ناسراون و جۆگەڵەی تەنکیان لەگەڵدایە ملی دەریا دەگرنەبەر.

(١) لە کوردەواری خۆماندا ئەو بەستەڵەك و بەفرەی لە چیاو دۆڵێکی کوردستانەوە وەکو قەندیل و گەلاڵە دێتە خوار پێ ی دەڵێن: ڕەنوە بەفر، کەوشەیەکی جوانە لەبەردەم(الجليد المتحرك)دا.

**ئەنجا نیشتەنی بەفرگرەکان هەیە:**

پارچە تاوێر لە تەنیشتەکانی دۆڵەکان بۆ بەفرگرەکە دەکەون و بەستەڵە بزۆکەکە هەڵی گرتوون کە بە ڕەنوی بەستەڵەکی(الركام الجليدی – moraine) لایی ناسراوە. لە کاتی یەك پێ گرتنی ئەو دوو بەفرگرەدارە نوی هەردوو لا یەکتر دەگرن لە ڕەنوەکی ناوەندی دا و دەبێتە شریتەکی ڕەنویی لەسەر رووی بەفرگرە یەکگرتوەکەدا.

بەفرگرەی گەورە کەزێ ی زۆری لێ دەبنەوە زۆر شریتی ڕەنو(مورین)ی ناوەندی هەیە و هەندێ لەو ڕەنوە دەڕواتە ناو بەستەڵەکەوە و لەگەڵ تاوێری تردا بەشداری دەکات لە هەڵکەندنی زەمینی تاوێری دا لە ڕێرەوی بەفرگرەکەدا بەشەکی تریش بەفرگرەکە لە ڕێگای دا دەینیشێنێ کە توانەوەی بەستەڵەکی تێ ی دا بە ئەندازەی ئەو بڕەیە دەبێ کە لێوەی دێ و مۆرینی کۆتایی پێك دێت، بەستەڵەکەکە بەرەو پێشەوە لە جوڵە ناکەوێ هەر چەندە بەرەکەی دەکشێتەوە، لەگەڵ ئەم کشانەوەیەدا مۆرینی کشانەوە دەنیشێ، کە ناویتەی بڕە مۆرینێکی گەڕاوە(کشاوە) و مۆرینی لایی(الجانبی) و ناوەند(الوسط)ییە و هەموویان بەرامالڕاوی بەستەڵەکی(الجروفات الجليدی – glaciai drift) ناسراون یان لەبەر زۆری قوڕ پێ ی دەوترێ(قوڕی بەستەڵەکی) لە هەندێ جاردا.

نیشتەنی یە بەستەڵەکیەکان کە لە هەموو بارستایی هەموو قەبارەکان پێك دێ لە تاوێری گەورەوە بۆ تەنۆلکەی زۆر ورد کە تاوێری هاڕاو(rock flour) ناسراوە بەرکە ناریان ناکات.

لەگەڵ کشانەوەی بەستەڵەکدا گردی نزمی درێژ کۆڵە لە تەنیشتەکانیانەوە دورست دەبێ درێژی یان هەندێ جار یەك(کیلۆ مەتر) دەبێت. لە کۆتایی دا وردیلەن و بە ئاراستەی خزینی بەستەڵەکی ڕیزکراون کەلێیەوە نیشتەنی پەیدا بووە وبە کۆپارەی بەستەڵەکی(السنم الجليدی – drumline) ی ناسراوە گەر لە شێوەی چەند کۆمەڵێ دابوون سەر زەوی لە شێوەی سەللەی هێلکە لێ دەکات. بەشەکی تریان بە کلکەی رامالڕاوی بەستەڵەکی(الذنب – cragtail) ناوی دەرکردووە، کە بەفرگرەکان پاوانی تەنە تاوێرەکاندا دەینیشینێ بەرگری داخوران(التاکل) دەکات لێرەدا تاوێری تری گەورەی نامۆ هەیە بەستەڵەك هەڵی دەگرێ و لەسەر تاوێری تری دادەنێ

نیستا بە تاوێری چوکلەدار(الناتئە — erratics) ناسراوە.

وە ئاوی ڕەوان لە بەستەڵەکی تواوە قوڵی رووی پێشەوەی بگەرێتـەوە یـان ئـەزقرە بگـرێ، نیشتەیی بەفرگرەکان لە قورو لیتە(الطمی) بلاّودەبێتەوە تـا ببـێ بـە دەشـتایی یـەکی فراوانـی کەرەستەی ڕامالڕاو. کە تۆرێکی جۆگەڵـە دەبـڕێ لـە وەرزی وشـکدا، (بـا) کاربۆداخورانـدن و دارماندن دەکات لەو دەشتایی یانەدا. کانیاوی بەستەڵەکی تواوە لـە نزیـك ناوچـەی بەفرگرەکـە تەپۆلکەی خلتەو نیشتنی بە ناوی(کام kame) دورست دەکەن.

دیسان ئەو جۆگایانە کە نیمچە بەستەڵەکن بەستێ دورست دەکەن لە کۆچەوی پێـچاوپێچ بەناوی(ئیسکار) بـەفرگرەی گـەڕاوە بارسـتایی یـەك بەسـتەڵەك بـەجێ دێڵـن بـە نـاوی گـردی پنگۆ(pingo) لەگەڵ توانەوەی ئەم بەستەڵەکەدا بە پێ ی کات حەوزێکی بازنەکی بـەجێ دێڵـن بە ناوی حەوزی(کتل هۆل - ketteteboles). لەکاتی توانەوەی بەستەڵەکدا چەند کۆمێ پەیـدا دەبن نیشتەی بەستەڵەکی تێدا کۆدەبێتەوە لەگەڵ(بەستەڵەکی هاوبەش)، لەوانە نیشتەی بە دوای یەکدا(varved ) لە خلتـەو قـوڕ کـە وەرزەکـان هـەڵی دەسـوڕێنێ، وە پێـك هـێنتی توانـەی بەستەڵەکی کە گۆم و دەریاچەکان لە بەهاردا دادەپۆشێ لە زستاندا دەیبەستێت).

## ٨٣- چەرخی بەستەڵەك و داخوران:

کاتێ بەستەڵەك جارەکی تر گەڕایەوە کە سەربەچاخی بەسـتەڵەك بـوو واتـە بـەر لـە(٢٠) هەزار ساڵ دا گـۆڕانی گـەورەی بـە دوای خـۆی دا بـەجێ هێـشت لەبـەرزو نزمـی دا و شـێوەو دیوگرافی تری بە زەوی دا و هەندێ نیـشتەنی بەسـتەڵەکی هەنـدێ دۆڵـی هـەڵتاخنین و گـۆمی دورست کردن و هەندێ رووباری ناچارکردن ڕێـرەوی خۆیـان بگـۆڕن، توانـەوەی ئـەم بەسـتەڵەکە هەندێ رووباری قەبەکردن و توانستی داخوراندن و روشاندنی دۆڵە قوڵەکانی پتر کرد و کەرەستەی نیشتەیی قورس تاودایە و لێواری نیشتەنی پانتایی پێك هێنا.

زانایان کۆك نین هۆکاری دورست بوونی چەرخی بەستەڵەك بەر لـە(٢) ملیـۆن سـاڵدا چـی بووە، چوار قۆناغ بەستەڵەك هەیە، سێ ماوەی گەرم هەیـە بەسـتەڵەکی یـان تێـدا گەڕاوەتـەوە،



ڕەنگە بەستەڵەکی دوایی نەهابتێت، دوور نییە لە قۆناغی گەرمی دابین و قۆناغەکی تری بەستەڵەکی بێت هیچ لێکدانەوەیەکی قەناعەت بەخش نییە بۆ هۆکارەکانی دابەزینی گەرمی. زانایان هەندێ وای بۆ دەچن هۆکارەکەی بۆ دابەزینی گەرمایی خۆر دەگەڕێتەوە، هەندێ بڕوایان وایە گۆڕان بەسەر تەوژمی ئاوی داهاتووە لە ئۆقیانوسەکاندا، یان بە هۆی جوڵەی زەوی یەوە بووە، یان بە هۆی لاری تەوەری سوڕانەوەی بووە بە دەوری خۆیدا.

ئەم بەستەڵەکە بە شێوەیێکی گەورە کاری کردە سەرکرداری(داخوراندن) و(نیشتاندن) لە هەموو ناوچەکانی هەسارەکەو ئاستی رووی دەریادا، کاتی بەستەڵەك لەو پەڕی دا بوو ئاستی رووی دەریا بەلای کەمەوە(١٠٠)م دابەزی و پاڵی بەرووبارەکانەوە نا بۆ روشاندن بە قولیێ بەناو ڕێرەوەی دا دیسان بەسەر ڕامالینی کیشوەری دەرەوەدا تا ڕادەیەك.

لەماوەکانی نێوان دوو بەستەڵەکدا ئاستی رووی دەریا بەرز بۆوە، داخورانی دەریایی لەچەند بەرزاییەکدا کاری خۆی دەکرد، بەرزتربێ لەئاستی ئێستای رووی دەریاوە، کە ببێ بەهۆی ئەوە رێژگەی رووبارەکان پڕ لە خڵتەو نیشتە ببێ، ئەگەر بێتو بەستەڵەکی جەمسەرەکان بتوێتەوە ئاستی رووی دەریا نزیکەی (١٠٠)م بەرزتر دەبێتەوە، سەرباری گۆڕانەکانی ئاستی رووی دەریا کێشی بەستەڵەك بەسیەتی تا بەنزمایی لەهەندێ شوێندا لە توێکڵی زەویدا پەیدا بکات وەئێستا لەباکووری دەریای (بەڵتیق)دا ساڵانە (١٠)ملم توێکڵی زەوی بەرز دەبێتەوە، دوای توانەوەی بەستەڵەکی (ئیسکەندناڤی)، لەناوچەکانی نزیك سنووری (جەمسەری باکور شوێنەواری تری چاخی بەستەڵەکی هەیە، لەوێ پلەی گەرمایی لەقووڵاییەکی دیاریکراودا نزم دەبێتەوە لەژێر بەفرگەکاندا، لەژێر بەستنەوەبێ..

واتە: لەچینی تاوێری و چینی ژێرگڵدا، پلەی گەرمی ئاوا دەچەسپێ، هەتا دوای گەڕانەوەی بەستەڵەکیش و چەند سانتی مەترێ رووی گڵ نەبێ لەبەستەڵەك لەهاویندا رزگاری نابێت کەدەبێتە هۆی تێراوبوونی گڵ بەئاو و بەفراوانی و ئەم دیاردەیەش بەبەستەڵەکی هەمیشەیی ناسراوە.

ئەم دیاردەیە لەکات و دوای چەرخی بەستەڵەکدا فراوان بووە، کەچی ئێستا لەناوچەکی

ئالاسکاو سیبیریادا هەیە، کە بەربەستە ئەو ناوچانە گەشەیان پێ بدرێت[1].

لەراست بەستەڵەکی کوردستاندا (پرۆفیسۆر. هـ. أ. رایت) کتێبەکی زۆر نایابی نووسیوە بەناوی (pleistcene glaciation in Kurdistan) کە (فـؤاد حمه خورشـید) بـەناوی (آثار العصر الجليدي البلاستوسيني في كوردستان) کردوویە بە عەرەبی.

ئەم جوگرافی زانـە بەریتانیـە لەوێـدا باسـی کـردووە، ئێـستا شـوێنەوارەکانی بەستەڵەك لەکوردستان و چیاکانی کوردستاندا ماوە دەڵێ: شوێنەوارەکانی بەفرگرەی بلاستوسینی لـە سـێ ناوچەدا بەتایبەتی لێکۆڵینەوەم لەسەر کردوون، هەڵگوورد، دۆڵی رواندوزو دەورووبەری و ناوچەی جیلـوداغ، بـەرزایی زنجـیرە چـیاکانی نزیـك هـەڵگورد (٣٠٠٠-٣٥٠٠)م دەبـێ، دەکەونـە نـاو سیستەمی ئەو گۆڕانەی فراوانترین بەفرگرەو سەیاقەی چـەرخی بلاسـتوسـینی بینیـوە، کەلەسـەر قەدپاڵی باشووری چیاکاندا دروست بووەو بەرەو باشوور رۆیشتووە بەرەو زێی گەورە بۆ بەرزاییەك نزمەکەی (١١٠٠)م بووە، بەشەکانی سەرەوەی دۆڵەکە پڕبووە لە لیتەو قوڕو نیشتە کە رووبـاری بەستەڵەکی بەجێی هێشتووە (رووباری رواندز) یەکێ بوو لە زێیە گرنگەکانی رووباری زێی گەورە کـە بەسـت و چـەوەکی زۆری بـەجێ هێـشتووە دوای توانـەوەی نـاوی ژێـرەوەی بەفرگرەکـە (الثلاثة...)[2].

بەڵێ قورئان و کیتابی موقەدەس باس دەکات کەئەم ناوچـانە (جـودی) و ناوچـەی روانـدز شوێنی یەکەم و دووەمی پەیدابوونی ژیان بوون و لانەی ئادەم و نوح و ئیبراهیم بـووە، وەکـو لـە داهاتوو باسی دەکەین.

## ٨٤ -(با – الريح):

لە گەردووننناسیدا بەدرێژی باس و جۆرەکانی و سوودو زیانەکانی کرا، ئەوەی لێرەدا باسـی دەکەین پەیوەندی بایە بە کرداری هەڵوەشاندن و داخوراندنی با لە جیۆلۆجیادا.

---

(١) علم الارض، ل٦٢-٦٤.

(٢) آثار العصر الجليدي البلاستوسيني في كردستان، ل١٣-١٤.




(هشام طالب) دەڵێ: (لێك هەڵوەشان و وردووخاشبوونی چیاكان و تاوێرەكـان دیـمەنێكی بچووكی ئەو دیمەنیە قورئان لەدەیان ئایەتدا چارەنووسی چیاكانی تێدا بەیان كردووە لەپەسلاندا، لەوانە: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيباً مَّهِيلاً﴾(المزمل: ١٤) [١].

بەم پێیە چیاكان لەتەپۆلكەی لمەوە (الكثبان) دەگۆڕێ بۆ تۆزو خۆڵ و لم.

ئەم تەپۆلكە لمە (الكثبـان) كە (باو باران و ئاو) بـە كـارلێكردن لـە تـاوێرەوە (الـصخور) دەیگۆڕێ بۆ گاشە بەرد (الجلاميد) ئەمانەش چەند جۆرێكن:

١- تەپۆلكە لمی ئەستێرەیی: كە (٣٠٠) پێ لەشێوەی ئەستێرەدا بەسەر گردی دەشـتاییدا بـەرز دەبێتەوە.

٢- تەپۆلكە لمی درێژ: بە تەریبی لەگەڵ ئاراستەی بادا هاوتەریب دروست دەبـێ، درێـژی (٦٠) میل دەبێت.

٣- تەپۆلكە لمی بەرخان (barchan) لەشێوەی قۆچدایە، (درێژی (٣٠٠)م دەبێت).

٤- تەپۆلكە لمی مانگی یەك شـەوەیی (الهلاليـه) فراوانـی (١٠٠٠)پـێ و بـەرزی (١٠٠) پـێ دەبێت.

٥- پانەكۆلە (الكثبـان المـستعرضة) ئـەویش بەرخانـە بـەڵام فـراوانترە و رێكـترەو بـەدەریای لم ناسراوە[٢].

(ئەلك سمث) دەنووسێ: (بیابانەكان ئەو ناوچانەن لەساڵێدا كەمتر لـە (٢٥٠) ملـم بـارانی بەردەكەوێ، بیابان یـان سـارد، یـان گـەرم دەبـێ، رۆشـان و داخـورانی لـەرێگای هەڵوەشـان و وردبووندا تێدا دروست دەبێ، هۆكاری داخوران تێیدا (با)یە، كە لەرێگای رۆشاندن و هەڵوەشاندا دەیگوازێتەوە تا دێرەكان بەڕووتی بەجێ دێڵێت، یان رووبەرەكەی فراوان وەكو بەست بەجێ دێڵـێ كەچەوو خیزی (الحصى) تێدا بڵاو بۆتەوە..

(با) دەتوانێ شیوو نزماییە گەورەكان وەكـو شـیوی خۆرئـاوای (میـسر) بتاشـێ، كـە بـا

(١) بناء الكون ومصيرالانسان، هشام طالب، ل٣٧٤، سەیر بكە لەگەڵ هەندێ دەستكاریدا، وە (علم الارض/ ل: ٦٥)
(٢) هەمان سەرچاوە.



تاشیویەتی لەژێر ئاستی رووی دەریاوە ئەم داتاشینەش ئەوەستا تابنی دەگاتە تێکڕای ئاوی ئاوەوە، کەبە (deflation hollows) ناسراوە واتە: (قووڵاییەکانی بەتاڵ کردنەوە-اغوار التفریغ).. (با)ش دەنکە لمی هەڵگرتووە وەکو چەکێ بەکاریان دەهێنێ بۆ (داخوراندن) لەرێگای لێکخشانی میان تاوێرەکان و دەنکە لمەکان کە (با) دەیان جووڵێنێت.

زۆربەی داخوراندنەکە لەسەر رووی زەوی روودەدات کە رووی تاوێرەکان دەبڕێ و شێوەی جیاجیا بەبەردو چەو دەدات کە بە (ڤیینتیفاکس) و (دریکتانتیر) ناسراوە، دەنکە لمەکان بەخێرایی لادەدات کەبە دەنکەکانی هەرزن (الخن) دەچن و لەزۆرێ لەلمەکانی بیابان جیایە) [1].



لەقورئاندانئاماژە بەکاری (با) کراوە لەگواستنەوەیدا خوراندندا وەکو دەفەرمووێ: ﴿كَرَمَادٍ اشْتَدَّتْ بِهِ الرِّيحُ فِي يَوْمٍ عَاصِفٍ﴾(ابراهيم: ١٨).

واتە: وەکو خۆڵەمێش کەلە رۆژێکی سەختدا بای توند لێی دەدات.

(د. جودە حسین جودە) لەڕاست دیاردەکانی داتاشینی (با) دەنووسێ:

١- بڕینی تاوێرەکان و پێکهێنانی چەوی لووس و ساف.

٢- پێکهێنانی چاڵ و کون و ئەشکەوت لەبیابانەکاندا.

٣- با پارچە تاوێر دادەتاشێ و شێوەی سەیریان لێ پێك دەهێنێت.

---

(١) علم الارض، ل٦٤-٦٥.





٤- با دەتوانێ نەرمە ئاوێر داتاشێ رووی دەشتایی دروست بکات و نزمی بکاتەوە و تەنیا بارستایی رەق دەهێڵێتەوە.

وە (با) گوازەرەوەیە تۆزو خۆڵ لەبیابانەکان هەڵدەگرێ و بەگەردەلوولی تۆزو خۆڵ ناسراوە، عێراق و ئێران و کوردستان دەگرێتەوە، وە لەهەر شوێنێکدا بای تێدا لاواز بوو لەگواستنەوەدا لەوێدا تۆزوڵم و خۆڵ گرد دەبێتەوە (لووس) پێك دێنێت و تەپۆلکە لم دروست دەبن[1].

گەر سەیری قورئان بکەین لەسوورتی (المرسلات: ١-٤)دا سیفەتەکانی (با)ی باسکردووە و لەبەرگرنگی سوێندیان پێ خوراوە: ﴿وَالْمُرْسَلَاتِ عُرْفًا * فَالْعَاصِفَاتِ عَصْفًا * النَّاشِرَاتِ نَشْرًا * الْفَارِقَاتِ فَرْقًا﴾.

واتە: سوێند بەو بایەی وەکو ئەسپ لوورەیان دێ، سوێند بەو بایەی وەکو گەردەلوول هەڵدەکەن چۆن گەر دەلوولێ، سوێند بەو بایەی بڵاو دەکەنەوە چۆن بڵاوکردنەوەیەك، سوێند بەو بایەی لێك جیادەکەنەوە چۆن جیاکردنەوەیەك.

بەڵێ بایەکان تاوێرەکان دەبڕن و دەنکە لم و هەڵاڵەو تۆو هەڵم هەڵدەگرن و هەورەکان دەگوازنەوە! ﴿وَالذَّارِيَاتِ ذَرْوًا﴾[2]. سوێند بەو بایەی تۆزو گەرد بڵاودەکەنەوە.

## (دەریا) و داخوراندن و داتاشین:

هەروەها دەریاکان داتاشین و داخوران و گواستنەوە دروست دەکەن کە شەپۆلەکانی دەریا درووستیان دەکات، ئەم شەپۆلانەش هەڵکشان و داکشان و بای دەریا دروستیان دەکات، ئەم شەپۆلانەش قەبارەیان دەکەوێتە سەر هێزی باو ماوەی چالاکیەکەی و توانستەکەی، واتە ئەو ماوەیەی بای بەهێز دەبیرێ بەسەر شەپۆلەکاندا، هەڵکشان و داکشان کە تەزووی بەهێز پەیدا دەکەن توانای روشاندن و داخوراندن و گواستنەوەی تاوێرەکانیان هەیە دوای ئەوەی هاریونی..

(١) معالم سطح الارض، د. جودة حسين، ل٤٠٩-٤٢٨ ستير بكة.

(٢) الذاريات: ١.





تاوێرەکان لەرێگای فشاری (هیدرولیکی)دا دەخورێن، واتە: شەپۆلەکانی ناووهەوا پەستان دەخەنە ناو تیکی تاوێرەکان و لێکخشان (corrosion) پەیدا دەکەن، واتە شەپۆلەکان پاڵ بە چەوو بەردەکانەوە دەنێت بەقایی بەرەو ڕامالێن، وە لەرێگای تواندنەودی تاوێرەکانی ڕامالێن لەدەریادا، دیسان گیاندارانیش چالاکییان هەیە کە تاوێرەکان هەڵدەکەنن و لاوازیان دەکەن، شەپۆلەکان کاردەکەن بۆ کەرتکردنی تاوێری کەلە کرداری ڕۆشاندن و داخورانەوە پەیدای دەکات و خاوێنی دەکاتەوە.

ئەو شۆستانە (الارصفە) دەردەکەون کە شەپۆلەکان دایتاشیون لەکاتی داکشاندا، کە ئاکامێکی داخورانی تاوێرییە، دیسان شەپۆلەکان پەلاماری تاوێرە لاوازەکان دەدەن تا ئەو ئەشکەوت و کەوان و سەکۆو تەپۆلکە لمانە (المداخن) لاببەن کەچەند ستوونێکی تاوێرین شەپۆلەکان بەجێی هێشتوون لەسەر ئەو شۆستەیەی دایتاشیون، دیمەنی کەنار تا رادەیەکی باش ڕەنگدەردوەی ڕەقی پێك هاتووی تاوێرەکانیەتی.

هەندێ جار تاوێری وردوخاش لەناوی قووڵدا کەڵە کە دەبێ یان لەشێوەن کەناری لیدا پێك




دێ لە لم و چەوی نەرم و زبرو دانکەکان بەردەوام بەرەو پێش و دواوە دەڕۆن، لەگەڵ چوونەپێش و گەڕانەوەی شەپۆلە تێك شكێنەرەكان و بەم ڕێگایە خولی دەدەن، دۆخی هاوسەنگی لەكەناری لیدا پەیدا دەبێ لەمیان توانای شەپۆلەكان و قەبارەی تەنۆكەكان و پلەی لێژی كەنارەكە، بۆیە دەكرێ كەناری گەردەلوولی دروست بێ لەسەر ڕووی ئاستی هەڵكشانی بەرزەوە لەتەنۆكەی زۆر زبرتر پێك بێت.

لەرابردوو باسی زۆر رۆڵی تری دەریامان کرد بەهۆی بوورکانی دەریایی و هەڵکشان و رۆڵی باو..هتد، بۆیە درێژەی پتری پێ نادەین[1].

قورئانی مەزن ئاماژە دەكات كە لێرەدا بەردو تاوێری ڕەق هەیە و دەگیرێ لەم گۆڕانانەدا: ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ﴾[2].

واتە: (دڵان) وەكو بەرد وان یان ڕەقترن، بەرد هەیە ڕووباری لەژێرەوە هەڵدەقوڵێت).

بەڵێ تاوێرمان هەیە بەتاوێری نەرم (الصخور اللينة) ناسراوە بەهۆی شەپۆلەكان پتر تووشی داخووران دەبن و خێراتر بارستایی تاوێری هەڵدەخلیسكێ یان هەرەس دێنێ بە لەبەرزاییەوە دەكەوێتە خوارەوە، ئەمەش هاوسەنگی تاوێری ڕەق تێك دەدات كە دەكەونە سەرەوە تووشی كەوتن و خلیسكان دەبن لەدەریادا، تاوێرەكانی دەریایی لەچەند تاوێرەكی نەرمەڵان و گەورەو ئەستوور پێك دێن و دەكەونە خوارەوەی چینی تاوێری ڕەق درزی درێژیان تێ كەوتووە، ئەم پێك هاتە جیۆلۆجییە یاریدەدەر دەبێ بۆ كرداری ڕوودانی خزینی زەمینی (الانزلاق الارضي-landsides) و یارمەتی دەدات بۆ گەڕانەوەی ڕامالینی دەریایی و داخووزانی دەریایی.

هەرچەند بەردە ڕەقەكان گەردەكانی یەكتر گیرو ڕەقن و كوونیلەیان تێدا نییە شەپۆلەكی كەمتر كار لە تاوێری كەنارەكان دەكەن، كەچی داخوران بەردەوام دەبێ بەدرێژی كون و درزەكە (الصدوع) لەو ناوچە دیارانەی لاوازی جیۆلۆجییان هەیە، ئەم درزانە وردەوردە گەورە دەبن و

(١) علم الارج، ل٦٦-٦٧، بە كورتكردنەوە.
(٢) البقرة: ٧٤.



دەبنە کوونی گەورە لەتاوێرەکاندا، دیسان تاوێرەکان ئەو نیشتەنی و تاوێرە وردو خاشانە دەگوازنەوە لە کەنارەوە بۆ قوولایی ئۆقیانووسەکان[1].

دیسان قورنان باس دەکات کە دڵە رەقەکان وەکو ئەو تاوێرە رەقانەن کە ناوو تیشك و باران و با کاریان تێ ناکات، دیارە قورنانیش شەپۆلە وەکو (ئەتیر) دڵەکانیش وەکو بەرد هەموو دۆخەکان وەردەگرن، گوناهەکان دڵ رەق دەکەن و شەپۆلەکی ئەستوورو رەق لەدەوری دڵدا پەیدا دەکەن، بوار نادەن رووناکی و شەپۆلی قورئان بڕواتە ناوی و بیتوێنێتەوە، بەڵکو لەبەردیش رەقترن: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾[2].

واتە: (گەر ئەم قورنانەمان دابەزاندبایە سەرچیایەك دەتبینی ملکەچی دەبوو تلێش دەبوو لەترسی خودا.

سەیرکە وشەی (الصدع) زاراوەیەکی جیۆلۆجییە کە بەسەر تاوێرەکان دێت وەکو باسکرا، بێگومان هەموو ئەم نموونانە نموونەی زانستی ماددی و مەعنەوین تا بیریان لێ بکەینەوە: ﴿وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾[3].

## ٨٥- (دەریاچەکان و داخوران):

دەریاچە ئەو ناوەیە بەزەوی دەور درابێ، قەبارەکەی لەمیان زلکاوی بچووك و دەریای گەورەی ناو خۆدایە وەکو دەریای (خزر).. ئەو دەریاچە یان گۆمەی لەبەری دەروات بەزۆری شیرینە، گەر داخرابوو سوێرە، لەرووی جیۆلۆجییەوە گۆمەکان یان دەریاچەکان چەند دیاردەیەکی کاتین، چونکە کەڵەکەبوونی نیشتەکان بەزۆری لەناویاندا خێرایە، دیسان بەربەستەکان دەوروبەری بە پەلە دەخوات و تەنیا رووبەرەکی پانی تەختی زەمینی دەمێنێتەوە و زەلکاوەکان (المستنقعات) بەسەریاندا زاڵ دەبێت.

---

(١) بۆ درێژەی پتر بڕوانە (کوکب الارض، د. حسن سید احمد ابو العینین) ل٣٧٤ بۆ کۆتایی.

(٢) الحشر: ٢١.

(٣) الحشر: ٢١.





نیشتەی گۆمەکان بەزۆری لەناوچە شێدارو پڕ لە مـاددە ئەندامەکانـدا هەیـە، لەناوچـە بەستەڵەکەکاندا رەنگە نیشتەنییەکان بەنۆرە بن، لەناوچـە وشـکەکاندا خـوێ دەنیـشێ و لەگـەڵ نیشتەی رووبارەکاندا تێکەڵ دەبێ، هەروەها لەگـەڵ ئـەو گەردانەشـدا کـە بـا دەیانگوازێتـەوە، هەندێجار ئەو گۆمانە وشك دەبن و بە (پلایا-playa) ناسراو.

لێرەدا زۆر هۆکار هەیە دەریاچەکان یان گۆمەکان دروسـت دەکـەن، لەوانـە وەکـو گێرانـی یەکێ لەو دۆڵانە بەبەربەستێ سەرباری ئەوەش دەریاچەکان بەهۆی جوڵەی زەویو داخـورانی قـوڵ دروست دەبن. دیسان چالاییەکان لەو تاوێرانەدا دروست دەبێت کەتوانای توانەوەیان هەیـە، یـان بورکان دروستیان دەکات، بەربەستی (مۆرین) گۆڕینی رووبارەکان و دۆڵەکان لەزۆر ناوچـەدا کـە بەستەڵەك داپۆشیوە دەگرێ، هێـشتاش بەسـتەڵەکی بـەفرگرەکان دۆڵـی چـیاکانی (نەلـەب) و (کرینلاند) دادەخات، دیسان لیتەو قوڕو دارمانی زەمینی دۆڵەکان سەد دەکەن.

لەم دۆخەدا دوور نییە هەڵوەشانی پارچەی تاوێری و گواستنەوەی بـەخێرایی لافـاوی تێـك شکێنەر دروست بکات لەخوار دۆڵی رووبارەکەدا، هەندێ جار رووبارەکە دەگۆڕێ بەگۆم، ئەمەش کاتێ بەربەستی سروشتی بەرز کردەوە کەلە ئاستی دەشتایی لافاوی پێکـی دێـنێ کەپێیـدا رەت دەبێ و رێگای نەدا زێی بچووك بڕۆنە ناویەوە.

لەکاتێدا یەکێ لە رووبارەکان پێچێکی نامێنێ دەریاچەکانی (سناد النیر) دروسـت دەبـن، وە لەتـەك دەریـادا لـەمیان ئـەو جۆگەیانـەی ئـاوی بـەرز لـەدەلتاوە یـان لـە پـشت ددانـە درێژبووەوەکانەوە لـە دەریـادا یـان لەپـشت کـەنارە لیمیەکانـەوە دەریاچـەکان دروسـت دەبـن، جووڵەکانی توێکڵی زەمـینی دەریاچـە و گۆمـەکان دروسـت دەکـەن، دەریـای (خـەزر) لـەکاتی جووڵەی پەیدابوون کیشوەرەکان دروست دەبن.. دەریاچەی (ڤیکتۆریا) لە ئـەفریقیا و (ئـایر) لـە ئوسترالیادا لەکاتێدا دروست بوون کە توخمێ حەوزەکانی بەرز دەبنەوە، دیـسان لاری ناوچـەیەکی فراوانی زەوی دەبێتە هۆی پێچەوانە بوونەوەی رێڕەوی رووبارەکان و بەوپێیـە دەریاچـەکان پەیـدا دەبن، وەکو دەریاچەی (کیوگا) لە خۆرهەڵاتی ئەفریقیا، وە دەریاچەکان لـەو نزماییانـە دروسـت دەبێ کەلە میان چیاکاندا دروست دەبـن و درز پەیـدا دەکـەن (الـصدوع) کـە بـریتین لـە چـەند جووڵەیەکی بارستاییەکی گـەورەی تـوێکڵی زەوی بـەرەو لای یـەکتری لـەپێك هێنـانی گۆمـدا،



نموونەی ئەوانە لەدۆڵی درزەکان (وا دالصدوع) زۆرە لەئەفریقیادا و ئەو چاڵە قووڵەی بەفرگرەکان دروستی دەکەن حەوزی سروشتی دەریاچەکان پێك دێنن وەکو دەریاچەی (کۆری) و (قالی) لەناوچەی دەریاچەکانی ئینگلیزدا.

دیسان بەستەڵەکی کیشوەری حەوزەکانی دەریاچە گەورەکان پێك دێنێ لەئەمریکای باکووردا، دیسان ناو ئەو ناوچانە پڕدەکاتەوە کە (با) خواردوویەتی، لەناوچە گرنگەکاندا گازاوەکان (الحمم) بەربەستێکن بەکەڵکی ئەوە دێن دەریاچە دروست بکەن و لەکاتی هێوری بورکانەکاندا بەزۆری دەریاچەکان لەکوونی ئەواندا دروست دەبن[1].

ئەوەی باسمان کرد سووڕی جیۆلۆجی بوو لە زەویدا کە لەژێر ئایەتی ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ﴾(الرعد: ١٧)دا کورت کراوەتەوە، ئەم سووڕەیەش داخراوەو بەردەوامە لەزەویدا، ئەمەیە نهێنی نوێبوونەوەی زەوی و مانەوەی بەگەنجی بەبەردەوامی و خۆبارگەکردنەوەی تا ئەوکاتە بتوانێ بژێنێتەوە کە زەوی تێدا لەناو دەچێت.

## ٨٦- ( جیۆلۆجیای نیشتویی ):

بەشێ لەماناکانی ﴿وَأَمَّا مَا يَنفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ﴾ (الرعد: ١٧) جیۆلۆجیای نیشتەنییە، کە ئەم نیشتەنییانە وەکو ئاو سووڕەکی داخراویان هەیەو دووبارە دەبنەوە، واتە: ماددەی تواوەو نیشتەنی دەبن بەچیاو پاشان وردووخاش دەبن، ئەم وردووخاشانە دەبنەوە بە تاوێرو سووڕی تاوێری لەسرووشتدا پێك دێنن وەکو باسکرا.

گەر باس لەو ناوچانە بکەین کە نیشتەنییان تێدا پەیدا دەبێ دەتوانین لەڕووی زانستییەوە بەمشێوەیە بەیانی بکەین:

(بەرهەمەکانی ورووخاشبوون و ڕۆشانی تاوێرەکان لەسەر شێوەی تەنۆکەو وردکەی وردو هاڕاوە یان تواوە لەناودا دەگوازێتەوە، ئەو نیشتەیە زوو یان درەنگ ئارام دەگرێ و کەڵەکە دەبێ، یان دەبێ بە نیشتەی کیمیایی بایۆلۆجی، ئەم نیشتەنییە گەر زوو داخوراو تواوە تەمەنی

(١) علم الارض، ل٧٤-٧٦.

کورتە، یان ماوەیەکی درێژ دەوام دەکات لەڕوویەرەکی فراواندا درێژ دەبێتەوەو سەکۆیەکی ئەستووری (تاوێری نیشتوویی) دروست دەکات).

لێرەدا سێ دەورووبەری گشتی نیشتەنی هەیە: (نیشتەنی کیشودری-البینة القاریة) و دەورووبەری تێکەڵ یان کەناری (الساحلیة) و دەرووبەری دەریایی (البینة البحریة) کەرەستەکان لە ژینگەی کیشوەریدا لەسەر رووی زەوی یان ژێر ئاودا دەنیشن، ئەم نیشتەنییانە بەزۆری لە گەرتکە تاوێرو تاوێری هەڵوەشاوو رزیو پێك دێن، بەزۆری تێرە ئۆکسید بوون و رەنگیان سوورە، لەژینگەی کەناریدا لەو ئاوەدا کەرەستەکان دەنیشن کەلە سوێردا مام ناوەندن و نیشتەنییەکانی دەلتاو لیتەی جۆراو جۆرو نیشتەی رێژگەکانی رووبارەکان و گۆمەکانی کەناری و سەکۆیە نیشتەنییەکانی قەراغ کەلە سەر رووس ئاستی هەڵکشاندا لەخۆ دەگرێت.

هەرچی ژینگەی دەریاییە، نیشتەنییەکانی سێ بەشن: نیشتەنی کەنار (littoral) لەنێوان هەڵکشان و داکشانداو نیشتەنی دەریایی (neritic) کەلە سەر رووی قوولایی (٢٠٠)م لەژێر رووی دەریاوە جێگیر دەبێ، وە نیشتەنییەکانی ئاوی قووڵ (deep water).

نیشتەنییەکانی ژینگەی دەریایی بەزۆری وردکە تاوێری زبرن لەنزیك وشکانییەوەو لەئاوی قوولدا نەرمتر دەبنەوە.

لەکاتی کزربوونی نیشتەنییەکان کەلە وشکانی دەگوازرێنەوە نیشتەنی ئەندامی دروست دەبن، پڕە لە کاربۆناتی کالیسیۆم، ئەو نیشتەنییانە بەهۆی هەڵکشان و داکشان و شەپۆلەکان و تەوژمی ئۆقیانوس و تەوژمی لیلی (العکرة-tarbidiyity) دەگوازرێنەوە)[1].

## ٨٧- هۆکارە ناوخۆییەکانی زەوی کە کار لە داخوران و پێکهاتنی رووی زەوی دەکەن:

رابردوو باسی ئەو هۆکارە دەرەکیانەمان کردن کەکار لەشێوەی پێك هاتنی زەوی دەکەن و کردمانن بە دووبەشەوە:

١- هۆکاری (التجویە) واتە: کاری هەوا، مەبەست وردووخاش بوونە کە هەواو گۆڕانی

(١) علم الارض، ل٧٦.



پلەی گەرمی و زوقم و ئاوو سەهۆڵ و ڕەشەبا دروستی دەکات، بەهۆی میکانیکی یان کیمایی ڕوودەدات، ئەم کارتێکردنە تەنیا تاوێر دەگرێتەوە بێ گواستنەوەیان.

٢- هۆکاری (التعرية) واتە: ڕووتاندنەوە، ئەم هۆکارەیە تاوێرەکانو ردوو خاش دەکات و دایان دەتاشێ و پاشان لەشوێنی خۆیان دەگوازێتەوە و لەشوێنی تریان دەیان نیشێنێت، ئەم هۆکارانە ئەمانەن: ئاوی ڕەوان، ڕووبار، بەستەڵەکی بزۆك، با، دەریا..

ئەم هۆکارانە سێ پیشە ئەنجام دەدەن: (داتاشین، پاشان گواستنەوە، پاشان نیشتنی (الارساب) وە لێرەدا چەند هۆکاری هەیە لەناخی زەویدان تووشی تێکلی زەوی دەبن و بەشداری دەکەن لەگۆڕینی ڕووی زەوی و دیوگرافیایدا.

### (هێزەکانی ناخی زەوی):

تێکلی زەمینی تووشی هێزەکانی ناخی زەویو جوڵەکانی تەکتونی (tectonic) دەبێ و کار لەشێوەی ڕووی دەکات، تێکلی زەوی لەواقیعدا ناارامە، گەر سەیری قورئانی پیرۆز بکەین بە (١٠٠٠) ساڵ پتر لەجیۆلۆجی نوێ ئاماژەی بەوهێزە گەورانە کردووە کەلەناخی زەوی دان و گۆڕان لەسەر زەویدا دروست دەکەن، تا لەقیامەتدا تەواوی دیوگرافی زەوی دەگۆڕن: ﴿يَوْمَ تُبَدَّلُ الأَرْضُ غَيْرَ الأَرْضِ﴾[1].




(١) ابراهيم: ٤٨.

ئەم هێزە گەورانەش بوومەلەرزەو بوورکانەکانن ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا﴾[1].

واتە: گەر زەوی کەوتە بوومەلەرزە چۆن بوومەلەرزەیەك، زەوی تەنە قورسەکانی ناخی بەدەرنا.

﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الْأَرْضُ وَالْجِبَالُ وَكَانَتِ الْجِبَالُ كَثِيباً مَّهِيلاً﴾[2].

واتە: ڕۆژێکە زەوی و چیاکان دەلەرزن و چیاکان دەبنە کۆمەڵە لمێکی تواوە.

ئینجا لە دەریاکانیشدا بوومەلەرزەو بوورکان ناناسایی دەبن: ﴿وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ﴾[3].

واتە: کاتێ دەریاکان بوون بەگڕ.

## ٨٨- (بوومەلەرزەو جۆرەکانی):

قورئانی مەزن دەفەرمووێ: ﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا﴾[4] (دحية) هێلکەیە.

وە قورئانی مەزن دەفەرمووێ:﴿ وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾[5].

واتە: سوێند بەزەوی قڵێش قڵێش، بەو پێیە زەوی هێلکەیەکی قڵێش قڵێشە!

(د. امین الاسکدندري) دەنوسێ: (زەوی قڵێش قڵێشە وەکو تۆپی پێ، ئەم زەوییەی لەسەری دەژین و وەستاوین یەك چین نییە لەتاوێر، بەڵکو تـوێکڵی زەوی کۆمەڵـە پلێتێکـە (الـصفائح) یەکتریان گرتووەو لەشێوەی تۆپی پێ دەچێت یـان لەشـێوەی هێلکەیـەکی کـوڵاو دەچـێت کـاتێ بەکەوچکێ لێی دەدەیت دەبێ بەچەند پارچەیەك، ئەم پلێتە تاوێریانە ڕووبەرێکی فراوانیان هەیـە بـەپلێتی تـەکتونی (tectonic plates) دەچـێت، کـاتێ ئـەم تـاوێرە پلێتییانـە دەجـوولێن و تەنیشتەکانیان بەریـەك دەکـەوێ بوومەلـەرزەو بورکـان ڕوودەدات، چـونکە تەنیـشتەکانی ئـەو تاوێرانە لێك دابڕاو نین و نەچوونە ناویەکتریشەوە).

---

(١) الزلزلة: ١.

(٢) المزمل: ١٤.

(٣) التكوير: ٦.

(٤) النازعات: ٣٠.

(٥) الطارق: ١٢.





(لێرەدا ڕۆژانە (٣٠٠٠) بوومەلەرزە ڕوودەدات)[١].

دیسان قورئان ئاماژە دەکات بوومەلەرزە و بوورکان لـە خـۆرو هەسـارەو ئەسـتێرەو تەنـە ئاسمانییەکانی تریشدا ڕوودەدات: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ * تَتْبَعُهَا الرَّادِفَةُ﴾[٢].

واتە: ڕۆژێ دێ زەوی بەبوومەلەرزە دەلەرزێ و ئاسمانی بەدوادادێت.

لێرەدا قورئان زەوی بە (الراجفە) ناودەبات چونکە هەمیشە لەبوومەلەرزە و بورکاندایە.



## ٨٩- چۆن بوومە لەرزە ڕوودەدات؟

زۆرجار لەکاتێدا دووبارە بوومەلەرزە ڕوودەدات کە دوو پلێتی تاوێری بەردو یەکتری دەچـن و یەکێ ئەوی تر دەگوشێ و پلێتەکە لەجێگای خۆی دەخزێت و بەسـەر یەکدا دەجـوولێ، چـونکە ئەوفشارە پەیدای دەکات لە لێکخشانی بەهێزی نێوانیانەوە دروسـت دەبـێ، لـەم دۆخـەدا زەوی کەرت دەبێ و چینی تاوێرە دەشکێ و بوومەلەرزە دروست دەبێت.

شوێنی شکانەکە لەجیۆلۆجیادا بـە (التـصدع-fault) ناسـراوە، ئـەم شـکانە لـەقوولایی زەویدا کـە هەڵبەنـدی بوومەلەرزەیـە ڕوودەدات، لـە چـەقەوە شـەپۆلی بوومەلـەرزە ڕوودەدات

(١) الزلازل والبراكين، د. ايمن الاسكندراني، ل٦-٧.

(٢) النازعات: ٦-٧.




بۆسەرێ و زەوی ئەلەرزێت[1].

سەیرکە وشەی (التصدع) کەلە قورئاندا هاتووە وشەیەکی جیۆلۆجییە!

## ٩٠- چۆن ئەم پلێتانە چیاو گردۆکە دروست دەکەن؟:

قوئانی مەزن دەفەرمووێ: ﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾[2].

لێرەدا قورئان ئاماژە بەرۆیشتنی چیاکان دەکات بەهۆی جوولانی پلێتەکانی تاوێری توێکڵی زەمینی و سووری تەتوەریی و خوولگەیی زەوی، ئەم جوولەیەش لەپلێتەکاندا چیاو تەپۆلکە پەیدا دەکات.

(پلێتە تاوێرەکان کە توێکڵی زەمینی پێك دێنن زۆر بەهێزن، بەڵام لەژێر فشارەکی توندا کەلە جوڵەو بەریەك کەوتنا پەیدا دەبێ ئەو تاوێرانە دەنوشتێنەوەو بەرەو سەردوە گرژ دەبن و بەرز دەبنەوە چیا یان تەپۆلکە دروست دەکەن)[3].

## ٩١- ئایا گیانداران هەست بە رووداني بومەلەرزە دەکەن؟

(سەگ هەستەکی بەهێزتری هەیە لەمرۆڤ، بڕوا وایە ئەو دەنگانە دەبیستێ کە قوولن و لەزەویەوە دەردەچن بەر لە رووداني بوومەلەرزەدا و بە عەوین وەلامیان دەداتەوە، ئەم بڕوایە دوای رووداني بوومەلەرزەی (میسینارەجیۆ) زانرا لەساڵی (١٩٠٨)دا کاتێ خەڵکی بینی بەر لە رووداني بوومەلەرزەکە سەگی زۆر دەوەڕین، دوور نییە گیانداری تریش ئەمە بزانن چونکە بەر لە بوومەلەرزە رەفتاریان دەگۆڕن)[4].

پێغەمبەر (ﷺ) بەزانستی نوێ ئاماژەی کردووە کە گیانداران شەپۆلی سەرووی بیستن

---

(١) الزلازل والبراكين، ل١١.

(٢) النمل: ٨٨.

(٣) الزلازل والبراكين، ل١٠.

(٤) الزلازل والبراكين، ل١٢.

دەبیستن، بۆ نموونە لەراست سزای گۆڕ دەفەرمووێ: (انهم يعذبون عذابا تسمعه البهائم)[1]. واتە: سزایەك دەدرێن گیانداران دەیبیستن.

## ٩٢- جۆری بوومەلەرزەکان:

قورئانی مەزن دەفەرمووێ: ﴿أَأَمِنتُم مَّن فِي السَّمَاءِ أَن يَخْسِفَ بِكُمُ الْأَرْضَ فَإِذَا هِيَ تَمُورُ﴾[2].

واتە: ئایا دڵنیان کەسێ لەئاسماندا زەویتان لێ رۆبچوێنێ کاتێ ئەو گێژ دەخوات؟!

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات ناخی زەوی گێژان دەخوات و ئەو بەرپرسیارییە لە بوومەلەرزەو بورکان و زەوی رۆچووندا!.

(د. جودە حسین جودە) دەنووسێ:

(بوومە لەرزە بریتییە لەچەند لەرزینەکی زەمینی تووشی توێکڵی زەوی دەبێ و لەشێوەی شەپۆل دایە رووبەرەکی فراواندا بڵاو دەبێتەوە، توێکڵی زەوی بەهۆی نائارامی و جۆش و خرۆشی ناوەوەی هەمیشە تووشی شەپۆلە جوولە دەبێت، بەڵام ئەم شەپۆلانە لاوازن و بەزۆری هەستیان پێ ناکەین، بوومەلەرزەش زانستەکی گرنگە چونکە پەیوەستە بەژیانی مرۆڤ و چالاکی ئەو لە زەویدا).

دەنووسێ: لێرەدا چەند جۆرە بوومەلەرزەیەك هەیە بەپێی هێزی روودانییان:

### ١- بوومەلەرزەی بورکانی:

(پەیوەستە بە چالاکی بورکانییەوە، لەنیمچە دورگەی کەمچاتاتکا (Kamchatka) لەباکووری خۆرهەڵاتی ئاسیادا، زۆرجار چالاکی گڕکانی پێش دەکەوێ، یان لەرزینی توندی تێك شکێنەری لەگەڵدایە.

(١) رواه مسلم.

(٢) الملك: ١٦.





لەگەڵ بوورکانی (مونالۆ) و (کیلویا) قەوما لە دوورگەی (هاوای)دا لەرزەی زۆر توند روویدا، کاتێ گڕکانی (کراکاتاو) لەدوورگەی (سوندا)دا لەمیان دورگەی (سومەترە) و (جاوە)دا لەساڵی ١٨٨٣دا قەوما زۆر وێرانکاری دروست کرد، شەپۆلی گەورەی ناوی وێرانکەری پەیداکرد، رژایە سەر دەشتایی دورگەی نزیکی خۆی و نقوومی کردو ناوچەکانی وێرانکرد و خەلکی زۆری ئاوارە کردو زیانی زۆری لەدانیشتوانی دوورگەی سومەترە و جاوەو دورگەی تری دەوریدا[1].

هەرچەندە پەیوەندی مسۆگەر نییە لەمیان بوومەلەرزەو بورکاندا وەکو لە ژاپۆندا سەلما، بەلام قورئان ئاماژە دەکات زۆرجار بوورکان بوومەرەزەی لەگەڵدایە وەکو بوومەلەرزەی قیامەت: ﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا ۞ وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾[2].

## ٢- بوومەلەرزەی تەکتۆنی:

لەم ناوچانەدا روودەدات نارێکی و درزی تێدا پەیدا دەبێ و تووشی قلێشان (التصدع) دێ، ئەم جۆرە زۆر باوە، لەزۆری بەتوێکلی (سیالە)دا روودەدات لەقوولایی (٧٠) کم دا[3].

قورئان دەفەرموێ: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾[4].

واتە: (گەر ئەم قورئانەمان بۆسەر چیایەك ناردبایە دەتبینی ملکەچی و قلیش قلیش بووە لەترسی خودا).

**واتە:** ئەم قورئانە گەر دابەزیبایە سەر چیایەك وەکو بوومەلەرزەی تکتونی قلێش قلێشی دەکرد و خاپووری دەکرد.

**٣- بوومەلەرزەی پلۆتۆنی:** مەڵبەندەکەی زۆر قوڵە لەزەویداو بوومەلەرزەکانی لەقوولایی

(١) معالم سطح الارض، د. جودة حسين جودة، ل١٦٠-١٦١ ستير بكة.

(٢) الزلزلة: ١-٢.

(٣) معالم سطح الارض، ل١٦٢.

(٤) الحشر: ٢١.

(٨٠٠)کم لەناوچەکانی دەریای ئەخوتسکدا لەخۆرهەڵاتی ئاسیادا تۆمارکراوە.

ئەم دوو جۆرەی دوایی (تکتۆنی و بلۆتۆنی) لەئەنجامی جوڵەی توێکڵی زەوی و ژێر زەویدا روودەدەن.[1]

## ٩٢- بازنەی ئاگرو پێشینەی بوومەلەرزەکان:

مەبەست ئەوەیە هەندێ ناوچە هەیە کە زانایان لەسەر نەخشە دیاریان کردووە پتر بوومەلەرزەو بورکانی تێدا روودەدات، دەوڵەتەکانی دەخەنە مەترسییەوە.

بازنەی ئاگر (ring fire) لەکوێیە؟

قورئانی مەزن دەفەرمووێ: ﴿وَالْبَحْرِ الْمَسْجُورِ﴾[2].

واتە: (سوێند بەدەریای گڕگرتوو) لێرەدا قورئان ئاماژە بۆ بازنەی ئاگر دەکات لە نۆقیانوسدا.

بەڵێ وەکو رابردوو باسمان کرد، (د. ایمن الاسکندرانی) ئاماژەی کردووە: (٨٠٪)ی بوومەلەرزەکان لەناوچەیەکدا روودەدەن بەبازنەی ئاگر ناسراوە، کە دەکەوێتە ناوەوەو دەرەوەی کەناری زەریای هێمن و ئەوناوچەیە لەهەموو شوێنەکان پتر بورکانی تێدا روودەدات.

ئەم ناوچانەی زۆرترین بوومەلەرزەیان تێدا روودەدات و پشتێنی بومەلەرزەیان لەناوچەکەدا هەیە ئەوانەن: (نیوزلەندا و دورگەی زەریای هێمن وەکو (فیجی سولمون) ئینجا ئیندەنوسیاو فلیپین، ئینجا یابان و دورگەی مارینز، پاشان ئەمریکا، بەتایبەتی کالیفۆرنیا، پاشان ئەمریکای ناوەڕاست و مەکسیك، دوایی زنجیرە چیای ئینندیز لەخۆرئاوای ئەمریکا و دەوڵەتەکانی ئەو ناوچانە وەکو: (چیلی و پیرۆ) و تەپۆلکەی تبت و چین و بەشێ لە ئەفغانستان و تورکیا و باکووری دەریای سپی ناوەڕاست و یۆنان و دورگەکانی یۆنانی)[3]. کوردستانیش لە ناوچەیەێکی

---

(١) معالم سطح الارض، ل١٦١-١٦٢. ستير بكة.

(٢) الطور: ٦.

(٣) الزلازل والبراكين، ل١٨.




هەستیاری تەکتۆنی دایە لای زنجیرە چیای زاگرۆسداوکوردستان پێك هاتەی تکتونی ئالۆزی هەیە (الکوارث د. بیـوار خنـسي) بخوێنــەوە باسـکراوە (١٨٥) بومەلــەرزە لەنەخـشەی بومەلــەرزەی کوردستانیدا

## ترسناکترین بوومەلەرزەکان:

(محمود المصری) دەنووسیێ: (زۆربوونی بوومەلــەرزە نیـشانەیەکی نزیکبونــەوەی قیامەتــە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (وبَینَ السّاعةَ موتان شَدّید وَمعه سنوات الزلازل) رواه احمد.

واتە: (لە نزیك قیامەت دوو مردنی تونـد هەیــە، دوای ئــەوە ســالآنی بوومەلــەرزە دێـن) دەفەرمویٚ (ﷺ): (لا تَقومُ الساعَةَ حَتی یَکثِر الزَلازل) رواه البخاري، واتە: قیامــەت نایــەت تــا بومەلەرزە زۆردەبن، ئیمرۆ ئەمە دەبینین و دەبیستین لەزۆربەی ولآتانی جیهاندا[1].

وە زۆری بومەلەرزە نیشانەیەکی نزیکی دەرچوونی پێـشەوا مەهدیــە (علیـه الـسلام) لــە نەژادی عەلی و فاتیمە (علیهما السلام): (علی اختلاف من الناس وزلازل....) رواه احمد.

بێگومان بەدرێژایی مێژوو بومەلەرزە هەبووە، مێژوو زۆری لەوانەی بۆ تۆمارکروین، بــەلآم لەسەدەی (٢٠-٢١) زۆر بەناناسایی بەهۆی گـۆڕانی ئـاوو هــەواو تــوێکلی زەوی بوومەلــەرزەی زۆرتر لەجارانی بەخۆوە بینی، وەکو نیشانەیەکی نزیکی هاتنی قیامەت و بوومەلەرزە گەورەکەی پەسلآن، ئەمانەش بەشێکن لەم بوومەلەرزانە:

١- بومەلەرزەی فرانـسیسکۆ (١٩٠٦) گەورەترین بومەلەرزەیــە ئــەم ناوچــەیە بگرێتــەوەو درز (التصدع) بە سان ئەندریاس بدات و (٤٥-٦٠)ی چرکەی خایاندو مردن و ئاگری پەیداکرد و تاسیٚ ڕۆژان ئاگر کەوتنەوەکەی بەردەوام بوو.

٢- (٩/فبرایر/١٩٧١) بوومەلەرزەیەکی تر کالیفۆڕنیای گرتەوە (٦،٥)ی چـرکەی پێـوەری ڕێختەر و (٦٠) کەسی کوشت و ڕێگاوبان و پردو بانەکانی تێکدا.

٣- بوومەلەرزەی چیلی گەورە (١٩٦٠) کەناری باشـوورەکەی گرتــەوەو تـسونامی پەیـدا

---

(١) رحلة الی دار الآخرة، محمود المصري، ل٢٣٩.



کردو دورگەی هاوای و ناوچە کەناریەکانی ئەمریکای باشووری گرتەوەو زیاتر لە (٣٠٠) کەسی کوشت و بەکارەساتەکی گەورەی مێژوویی ناوزەد دەکرێت.

شایانی باسە شەپۆلەکانی ئەم بوومەلەرزەیە بەشێوەیێ بڵاوبوونەوە هەموو زەوی تا چەند رۆژێ خستە تەکان، ئەم دیاردەیە دەگمەنەو بە(لەرەری بەرەلای زەوی- free oscillation of the earth).

٤- **بومەلەرزەی ئالاسکا: لەساڵی ١٩٦٤دا بومەلەرزەیەکی بەهێز لێیدا راستەوخۆ تسونامی بەدوادا هات و کەنارەکانی گرتەوە، تەنیا تسونامیەکە بەشداری کوشتنی (٩٠٪)ی کوژراوەکانی کرد.**

٥- **بومەلەرزە گەورەکەی یابان (ژاپۆن) ١٩٢٣ز: گەورەترین کارەساتی مێژوویی بوو نەویێ گرتەوە (١٠٠) هەزار کەس قوربانی بوو، پلەکەی (٧,٩) پلە بوو بە پێوەری رێختەر، چەند رۆژێ (٨٨) ئاگری نایەوە.**

٦- **بومەلەرزە گەورەکەی چین، کە زۆرترین قوربانی خستەوە: لەساڵی (١٥٥٦ز) رویدا (٨٣٠) هەزار کەسی کوشت، خەڵکی ئەوناوچەیە لەئەشکەوتدا دەژین و ژیانی سەرەتاییان هەبوو، کاتێ بومەلەرزەکە روویدا زەوی شەق بور هەمووی هەڵلووشین.**

٧- **بومەلەرزە لەناوبەرەکەی مەکسیك (١٩٨٥): هەرچەندە مەکسیکیەکان لەگەڵ بومەلەرزەکان راهاتبوون، بەڵام ئەمەیان نائاسایی بوو، دوو بومەلەرزەی سەخت مەکسیکۆ سیتی پایتەختی وێران کرد! کە (٨,١) پلە بوو بە رێختەر، سێ هەزار کەسی کوشت و زۆر کۆشك و تەلاری رماندو کارەبای پچڕاند و ئاگری نایەوە، کاریگەریەکە بۆ باشووری ئەمریکاو تکساس و کۆلۆرادو گوازرایەوە، ئینجا زۆری نەبرد دوای (٣٦) کاتژمێری تر بومەلەرزەکە دووبارە بۆوە، کەبەهەمووی بەهەردوو بومەلەرزەکان (٩) هەزار کەسی کوشت و (٣٠) هەزار بریندار بوون و (٩٥) هەزار کەس ئاوارە بوون و (٤٠٠) بیناو (٢٠٠) قوتابخانە و (٧٠٠) کارگە وێران بوون و زیانی دارایی (٤) ملیار دۆلار بوو.**

٨- تسونامی ئیندونیسیا لە (٢٦ی دیسیمبەری ٢٠٠٤ز) تەلەفزیۆنەکان گواستیانەوە و

ترسناکترین دیمەنەکانی ئۆقیانووسی هێمنیان پێشاندا، کەچۆن پەلاماری شارەکانی ئیندۆنیسیا دەدات و هەرچی لەسەر کەنار بێتە رێگای کاولی دەکات، پلەکەی (٩) پلە بوو بەرێختەر و ژمارەیەك تسونامی رویداو (١٦٠) هەزار کەسی کردە قوربانی، بەمەش بوە گەورەترین تسونامی مێژوویی لەرووی قوربانیانەوە[١]. نوێترین تسونامی ئەوەیان بۆ لەمانگی (٣) سالّی (٢٠١١) لە یاباندا رویدا و زیاتر لە (١٠) هەزار کەسی کوشت و کانگای وزەی ناوکی کارەبایی لەکار خست. بووە گەورەترین کارەساتی نوێ بۆ ئەو ولاّتە بێگومان خوا راستی فەرمووە: ﴿أن زلزلة الساعة شيء عظيم﴾[٢] کە ئاماژەیە بۆ بومەلەرزە ترسناکەکانی ئیمڕۆی نزیك لەقیامەت.

## ٩٤- ئایا بومەلەرزە لەسەر مانگ و هەسارەکان روودەدات؟

دیارە قورئان فەرموویەتی: ﴿يَوْمَ تَرْجُفُ الرَّاجِفَةُ﴾.

لێرەدا زەوی بە (الراجفه) ناو دەبات نەك تەنەکانی تر وەکو مانگ، بۆچی؟دوای گەشتی (ئەپۆلۆ) بۆسەر مانگ زانایان بینیان بومەلەرزەی سەرمانگ وەکو بومەلەرزەی زەوی بەهێز نین، چونکە کرۆکی مانگ ساردە و وەکو زەوی تاوێرەکانی تواوە نین، (سبحان الله).

## ٩٥- بورکان (گڕکان) و ئافورەکان:

قورئانی مەزن لەراست بورکان دەفەرمووێ: ﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾[٣]. واتە: زەوی تەنە قورسەکانی دەرهاوێشت، ﴿وَأَلْقَتْ مَا فِيهَا وَتَخَلَّتْ﴾[٤]. واتە: هەرچی لەناخی بوو دەرهاویشتەی کردو خالّی بو.

(١) الزلازل والبراکین، ل١٩-٤٤ سەیر بکە.

(٢) الحج:١

(٣) زلزله: ٢.

(٤) الانشقاق: ٤.



﴿وَفَارَ التَّنُّورُ﴾[1]. واتە: ئاگردانەکە هەڵچوو، (الراغب) لە (مفردات) دەڵێ: (الفور شدة الغليان، ويقال في النار اذا هاج، وفي القدر، وفي الغضب) بەم پێیە تەنور ئاماژەیە بۆ گڕکان کاتێ هەڵدەچێ!.




بەڵێ: گڕکان هەموو ئەو سیفەتانەی تێدایە (گڕێکە هەڵدەچێ و تەنە قورسەکان فڕێ دەدات).

لێرەدا دوو جۆر بوڕکان هەیە: چالاك کە هەمیشە دووبارە دەبنەوە و نزیکەی (١٣٠٠) دانەی لەم جۆرە هەیە، ناوچە بوڕکانیەکان هەمیشە لەمەترسیدان بۆیە ناوچەکانیان خاڵییە لە دانیشتوان، ئینجا بورکانی ناچالاك هەیە وەکو بورکانی نیوزلندا کە هەزاران ساڵە خامۆش بۆتەوە.

ڕەنگە زۆرجار بورکانێ چیایەك هەڵبکەنێ و دوای خۆی کونەکی چالاك بەجێ دێڵێ بەگازاوی بوڕکانی (الحمم) ناسراوە یان (تاوێری تواوە) و گازو هەڵم و تەلەزمی بەردو تاوێر، گەرمی زۆری ناخی زەوی کە دەگاتە (٢٢٠٠) س و تاوێرەکان دەتاوێنێتەوە کەلەچینی

(١) هود: ٤٠.

(mantle) دایـە و بـە (الحمـم-magma) ناسـراوە، ئـەو کۆبونـەوەو عـەمبارbوونـەی گـازاوە گەرمەیـە فـشاری زۆر پەیـدا دەکـات و پێویـستی بـە درزێ هەیـە فرێـی بـدات، بۆیـە درزێ دەدۆزرێتەوە لەهەندێ ناوچەی لاوازداو وەکو تەقینەوەیەکی بورکانی بۆسەر زەوی دەردەچێت، ئەم تاوێرە سورە تواوەیە (ماگما-گازاو) بۆ سـەرەوە دەردەچـێ و سـارد دەبێتـەوەو بـەلاڤا (lava) دەچێ، زۆر بەی شلەیەکی رەش و زفت دەچـێ بەسـەر زەویـدا دەڕوات تـا رەق دەبێـت، تـاوێر و پڕیشکی لێ دێتە دەر واتە لەکونی بورکانەکـە (crater) لەگـەڵ دووکـەڵی چـڕی رەش و گـازی مەیلەو سوور بۆ بەرزایی زۆر هەڵدەچێ و بڵاو دەبێتەوە.

گازاوی بورکانی یان تـاوێری تـواوە (٨٠-١٦٠)کـم لـەژێرەوەی دایـە، نمونـەی گـەورەی بورکانەکان ئۆقیانووسی هێمنە یـان هـادی لەدورگـەی (هـاوای)دا کـە (١٠٠) دورگـە دەبـێ و تەقینەوەی بورکانی دروستی کردوون، هاوای یەکێکە لەوانە لەناو ئۆقیانووسـدا وەکـو چـیایەکی (٩١٥٠)م سەر بە بورکان دەردەکەوێت[١].

قورئانیش کاتێ باس لە دۆزەخ دەکات ئاماژە دەکات وەکو نـاخی زەوی گەرمـەو گـازاوو بەردی ئاگرینی تێدایە وەکو: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[٢].

واتە: خۆت بپارێزە لەو ئاگرە سوتەمەنیەکەی مـرۆڤ و بـەردە، ﴿وَظِـلٍّ مِّـن يَحْمُـومٍ﴾[٣]. ﴿يُصَبُّ مِن فَوْقِ رُؤُوسِهِمُ الْحَمِيمُ﴾[٤]. وشەی (حميم) ناوو گازاوی گەرمـە، وەکـو لەباسـی بـەردی ئاگریندا باسی دەکەین.

بەڕاستی ئەمانە هەموویان موعجیزەی قورئـانین بـۆ کەسـانی رۆشـنبیر و بـڕوادارو زانـا، کۆمەڵگای شارستانی تا تێبگەن ﴿تَنزِيلاً مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى﴾[٥].

ئینجا ئەم بورکانانە زۆر سـودیان هەڵگرتووە، گەر ئەم بورکانانە نەبوان زەوی بەهۆی جۆش

(١) الزلازل والبراكين، بةدتستكاري و كورتكردنةوة وةرطيَراوة، ل٤٤-٥٧ سةير بكةن.

(٢) البقرة: ٢٤.

(٣) الواقعة: ٤٣.

(٤) الحج: ١٩.

(٥) طه: ٤.

و خرۆشی ناوەوەی دەتەقی، ئەم بورکانانە دەرچەی ئەمانن و هاوسەنگی زەوی رادەگرن.

پاشان خاکەکەی بەتایبەتی ئەو بورکانانەی قوڕو لیتە فڕی دەدەن بەپیتن بۆ کشتوکاڵ بۆیە هەندێ لەکۆمەڵگاکان لەدەوروەی ئەو شوێنە بورکانیانەدا هەوار هەڵدەدەن و خاکەکەی دەکەن بەزەوییەکی کشتوکاڵی بەپیت.

سەرباری ئەمەش لەدەوری ئەو بورکانانەدا کانیاوی گەرم هەڵدەقوڵن و **پەیوەندییەکی** قاییان لەمیاندا هەیە، ئەم کانیاوانە سەرچاوەی سەرەکی نافوورە گەرمەکان و **کانیاوە** گەرمەکانن لەجیهاندا.

وەکو (د. حسن سید احمد ابو العنین) باسی کردووە: (لاڤا-الحميم) بەشی بازلتە **تفتەکەی** (البازلیە القاعدیە) پلەی گەرمی بەرزەو (٦٠٠-١٢٠٠)°س و زۆر جیڕەو گازی زۆرەو **پاشان شل** دەبێتەوە، لێژ دەبێتەوەو رەق دەبێت).. (لاڤای ترشی) هەیە کە سلیکاتی زۆرە زۆر **لینج و** قورسەو قایە، ئەم لاڤایە شلی کەمەو کەم دەڕوات و لەدەوری کونی بورکانەکە **کەڵەکە** دەبێت[1].

بەڵێ قورئان باس لە قورسی (لاڤا) دەکات کاتێ دەفەرمووێ: **﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾**.

وە دەنووسێ: (چاوگی نافورەکان و ئاوەگەرمەکان ئاوی باران و ئاوی تواوەی بەفرە بەناوی هەوایی (meteoric water) ناسراوەو ئەو ئاوە زۆر بەزەویدا رۆدەچێ، لەم رێگایە دوورەدا هەندێ کانزای تاوێری دەتوێتەوە، دیسان تواندنەوەی کانزای تاوێری پلەی گەرمی ئاوەکە لەو قوولاییە دوورەدا بەرز دەکاتەوە، چاوگی دووەمی ئاوی نافورە ئاوی مەگمایە،کەلەچینیلاڤادا عەمبار بووە، پلەی گەرمییەکەی (١٦٠)°ف، لەگەڵ دەرچوونی نافوەو ئاوی گەرمدا بڕەکی زۆر گازو کانزای تواوە دێتە دەر، وەکو (سلیکا) [2].

بەمشێوەیە هۆکارەکانی ناوەوەو هۆکارە دەرەکییەکان کاردەکەن بۆ پێکهێنانی بەرزونزمی توێکڵی زەوی، لەبەرامبەردا هێزە لاوازەکان هەیە دوای ملیۆنەها ساڵ توێنەواریان

(١) کوکب الارض، ل٢٦٤ سەیر بکە.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل٢٩٧-٢٩٩ سەیر بکە.





دەردەکەوێت، هەرچی شوێنەواری بورکـان و بومەلەرزەیـە خێرایـە﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا﴾.

بومەلەرزەو بورکان خێرا لەوشوێنەدا گـۆڕان دروسـت دەکـەن و دیمۆگرافیاکـەی دەگـۆڕن و تەختی ئەکەن کەتێی روودەدات بۆیە بەهێزی خێراو نکاوی ناخی زەوی ناسـراوە، ئەمانـە وەکـو میکانیزمیّ زەوی نویّ دەکەنەوە.

## ٩٦- توێکلەکانی زەوی و زانستی پێکهاتەکانی:

## ٩٧-٩٨-٩٩- زەوی حەوت توێکلی هەیە، حەوت کیشوەر، حەوی گۆی ئـەتیری دەوری داوە:

**﴿الَّذِي خَلَقَ سَبْعَ سَمَاوَاتٍ طِبَاقاً﴾[1]. واتە: خودایەکە حەوت چین ئاسمانی دروست کـردووە، وە لەزەوی ئەوەندە.**

بەڵێ زانـست سـەلماندویەتی زەوی (٧) بەرگەهـەوا دەوری داوە کـە ئاسمـانێکن بـۆ زەوی،




(١) الملك/ ٣٠.

ئینجا زەوی (٧) چینە، (٧) کیشوەرە، (٧) چینی ئەتیر دەوری داوە کە گیانەکان لەوێدا دەژین.

دیسان قورئان زەوی بە هێلکە دەچوێنێ لەشێوەداو لەپێکهاتەدا، بەڵێ زانست دەڵێ: زەوی وەکو هێلکە وایە لەشێوەداو وەکو هێلکە لەچەند بەرگ و توێکلێ پێك دێت و کرۆکەکی هەیە: ﴿وَالأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا﴾[1].

واتە: دوای ئەوە زەویمان لەشێوەی هێلکەدا دانا.

یان خودا زەوی بەتۆپ دەچوێنێ:﴿ يُكَوِّرُ اللَّيْلَ عَلَى النَّهَارِ وَيُكَوِّرُ النَّهَارَ عَلَى اللَّيْلِ﴾[2].

واتە: شەو بەگوێی دێنێ بەسەر رۆژداو رۆژ بەگوێی دێنێ بەسەر شەودا.

## ( راڤەی زانستی )

١- رابردوو بینیمان چۆن (د. ایمن الاسکدرانی) لە (الزلازل والبراکین، ل٦)دا دەنووسێ: (توێکلی زەوی کۆمەڵە پلێتەکی یەکگرتووە لەتوێژیێ دەچێ، یان بە هێلکەیەکی کولاو دەچێ دوای ئەوەی بە کەوچکێ لێی دەدەی پارچە پارچە دەبێت) بزانە چۆن قورئان وەسفی زەوی کردووە جیۆلۆجیای نوێش هەر بەو وەسفانەی قورئان زەوی وەسف دەکات!

٢- (د. زغلول النجار) زەوی ناس ئاماژە دەکات کەزەوی لە (٧) بەرگ پێك دێ و کرۆکەکی هەیە، ئەمەش دوای تۆمارکردنی بومەلەرزەکان و بورکانەکان و ئەو شیکارییە زۆرە دەرکەوت کە زانایان لەراست ناوجەرگەی زەویدا پێی هەڵسان، وە زەوی لەکرۆکەوە بۆ دەرەوە لەم (٧) پارچەیە پێك دێت:

١- کرۆکی زەوی (لب-core) یان زەوی حەوتەم: (ناوکەکی رەقە (٩٠٪)ی (ئاسن) و (٩٪)ی (نیکل)ەو کەمێ توخمی تری سووکی تێدایە وەکو: (فوسفۆر، سلیکۆن، کاربۆن (١٪) کە هەمان پێك هاتەی نیازکی ئاسنە.

تیرەی ئەو ناوکە (کرۆك) (٦٣٧١) کم و قووڵایی (٥١٧٠)کم لەئاستی رووی دەریاوە.

---

(١) النازعات/٣٠

(٢) الزمر: ٥.

٢- زەوی شەشەم ناوچەی کرۆکی شل (ی دەرەکی): ناوچەیەکی شلە دەرەوەی ناوکە رەقەکەی داوە و هەمان ماددەی کیمیایی هەیە هەرچەندە تواوەیە و ئەستووری (٢٢٨٥)کم لەژێر رووی زەمینە.

٣- ٤- ٥- ناوچەی پەردەیە (الوشاح) کەزەوی (٣) و (٤) و (٥) دەوری کرۆکی شلی داوەو ئەستووری (٢٧٦٥) کم و لەقوولایی (٢٨٨٥)کم بۆ قوولی (١٢٠)کم دەست پێدەکات لەژێر ئاستی رووی دەریاوە، ئەم پەردانە سێ دانەن: (پەردەی خوارەوە، سەرەوە، ناوەڕاست).

٦- ٧- (بەرگی تاوێرییە، یان زەوی دووەم و یەکەمە: ئەستووری (٦٥کم)ە، لەبنی دەریاکان و زەریاکانەوە و (١٢٠)کم لەژێر کیشوەرەکاندا، هێڵی پچڕاندنی شەپۆلی لەرەلەری بۆ توێکڵی زەوی و خوار توێکڵ دابەشی دەکات، توێکڵی زەوی لەمیان (٥-٨)کم لەژێر دەریاکان و زەریاکاندا و (٦٠-٨٠)کم لەژێر کیشوەرەکاندا درێژ دەبێتەوە، خوار توێکڵ بۆ قوولایی (١٢٠)کم لەژێر ئاستی رووی دەریاوە درێژ دەبێتەوە)[١].

**پاشا (٧) زەوی ئاماژەیە بۆ (٧) کیشوەرەکان، کەئەمانەن بەرووبەرەوە:**

١- ئاسیا: (رووبەر: ٤٤,٥ کم٢)یە.

٢- ئەفریقیا: (رووبەر: ٣٠,٣کم٢)یە.

٣- ئەمریکای باکوور: (رووبەر: ٢٤,٢ کم٢)یە.

٤- ئەمریکای باشوور: (رووبەر: ١٧,٨ کم٢)یە.

٥- جەمسەری باشوور: (رووبەر: ١٢,٥ کم٢)یە.

٦- ئەوروپا: (رووبەر: ١٠,٥ کم٢)یە.

٧- ئوسترالیا: (رووبەر: ٧,٧ کم٢)یە[٢].

---

(١) الارض، د. زغلول النجار، ل٩١-٩٣، بە کورتکردنەوە.

(٢) جغرافیا العالم، الاء عبدالحمید، ل٢٠٢.





لەفەرموودا هاتووە: (مَن ظَلَم قَيد شِبر طَوقه مِن سَبْع أرضَين)[1]، واتە: کێ بستە خاکێ ستەم بکات لە حەوت زەوی زنجیری دەکات.

ئەم حەوت زەوییە چییە کە ستەمکارانی تێدا زنجیر دەکرێت؟

راسترین راڤە کەبە زانایان و موسڵمانانی رادەگەیێنم ئەم فەرموودەیەیە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إن جَهنم محِيطَة بالدُنيا وإنَ الجَنّة وراءَها، فَلذلِكَ كانَ الصِراطَ طريقاً إلى الجنة) رواه ابو نعيم في تأريخ الاصبهان[2].

واتە: دۆزەخ دەوری زەوی (دنیا)ی داوە، بەهەشت بەدوای ئەوەدایە (واتە: دەوری دۆزەخی داوە) بۆیە سیرات پردێکە بەرەو بەهەشت.

بەم پێیە زەوی کەبە (الدنيا) ناسراوە واتە زەوی خوارەوە، حەوت توێکڵی گۆیی (ئەتیر) دەوری داوە کە دۆزەخە، خوای گەورەش فەرموویەتی: ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ﴾، گۆیەکان وەکو (ابن ابی حاتم) لە (ابن عباس) گێڕاویەوە ئەمانەن: (جهنم، السعير، لظي، الحطمة، سقر، الحميم، الهاوية) کە لەخوار هەموویانەوەیە[3].

هەرچی بەهەشتە هەشت گۆی ئەتیرە دەوری دۆزەخی داوە، لەفەرموودەدا هاتووە: (للجنة ثمانية ابواب) رواه الطبراني، واتە: بەهەشت هەشت دەرگای هەیە.

وە بێگومان کاتێ مرۆڤ مرد گیانی لەلەشی فیزیایی جیا دەبێتەوەو گورج خودا لەشێکی تری بۆ دروست دەکاتەوە بالّدارە تا بتوانێ لەگەڵ دنیای دوای مەرگدا بگونجێت.

(الطبراني) گێڕاویەوە لە پێغەمبەر (ﷺ) پرسیار کرا گیانی بڕواداران لەکوێیە؟ فەرمووی: (في طير خضر تسرح في الجنة حيث شاءت) واتە: لەباڵندەیەکی سەوزدایە بۆکوێی بوێ لەبەهەشتدا بۆئەوی دەڕوات، ئینجا لەراست لەگیانی بێ بڕوایان پرسیاری لێ کرا لەکوێن؟ فەرمووی: (محبوسة في سجين).

---

(١) رواه البخاري.

(٢) البدور السافرة في امور الآخرة، للعلامة جلال الدين السيوطي، ل٤٠١.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل٤٠٣.




پێشەوای (الحرمين) دەفەرمووێ: (الروم: جسم لطيف مشتبك بالاجسام الكثيفة اشتباك الماء بالعود)[1]، واتە: گیان لەشێکی ناسکە لەگەڵ لەشە چڕەکان تێکەڵ کێش دەبێ، وەکو ئاو لەناو داردا.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (مَن فارقَ الروْح الجَسَد) رواه احمد، لێرەدا دەری دەخات مردن جیابوونەوەی گیانە لەلەش.

هەرچەندە هەندێ بڕوایان وایە وەکو (ابن دحيه) لە (التنوير)دا دەڵێ: (گیانی شەهید کەلە دنیادا لەلەشێکی تردا بووە دەخرێتە لەشێکی ترەوە وەکو باڵدار وایە) بەڵام ئەمە بۆ هەموو کەسێکە تا گیانەکان بتوانن لەگەڵ دنیا میتافیزیکی و ئەتیردا بسازێن، وەکو لەفەرموودەی رابردوودا باسکرا.

(ابن القيم) دەڵێ: (گیان زۆر خێرایە لە چاوتروکانێکەوە دەگوازرێتەوە، لەگۆڕەوە بۆ ئاسمان لەکەمترین ساتدا بەرز دەبێتەوە، بەڵگە گیانی نوستووە، سەلماوە گیانی نوستوو بەرز دەبێتەوە حەوت چینەکان دەبڕێ لەبەردەم عەرشدا کڕنووش دەبات، پاشان لەکەمترین کاتدا بۆ لەش دەگەڕێتەوە)[2].

لەفەرموودەدا هاتووە کە (ابن منده) گێڕاویەتیەوە: (أنَ أرواح المؤمنين في حواصل طير خضر تَرعى في الجَنة) وە (أنَ أرواح الكُفار في حواصل طير سود تأكل مِنَ النار وتَشرب مِن النار وتأوي إلى حَجَر في النار).

بەم پێیە مردن لەم دنیایەدا لەدایك بووبەنەوەیە لەدنیای نەو دیودا، چۆن لە (منداڵدانی دایکدا) گیان دەکرێ بەبەر لەشی فیزیایی کۆرپەلەدا، کاتێ مرۆڤ مرد گیانی دەکرێ بەبەر لەشی بەرزەخدا کە زۆر لەم دنیایە فراوانترو خۆشترە، (ﷺ) فەرموویەتی: (ماشَبَهْت خروج المؤمن مِن الدنْيا ألا كمثل خروج الصَبي من بَطن أُمهِ مِن ذلك الغَم والظلمة إلى روح الدنْيا) رواه حكيم الترمذي، نودر الاصول.

---

(١) شرح الصدور، للسيوطي، ل٢٨٩.

(٢) شرح الصدور، ل٢٢٢.

واتە: دەرچوونی گیانی بڕوادار لەدنیا وەکو دەرچوونی کۆرپەلەیە لەسکی دایکییەوە لەو تاریکییەوە بۆناو جەرگەی جیهان.

(ابن القیم) لە (الروح)دا دەنووسێ: (روحەکان دوای مردن سەردانی یەکتری دەکەن: ﴿وَمَن يُطِعِ اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَأُولَـئِكَ مَعَ الَّذِينَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِم مِّنَ النَّبِيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُّهَدَاء وَالصَّالِحِينَ وَحَسُنَ أُولَـئِكَ رَفِيقاً﴾[1].

دەنووسێ: (گیانی مردوان و زیندوان لەکاتی نوستندا دیدار و سەردانی یەکتری دەکەن: ﴿اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾[2].

(ابن عباس-ر) دەفەرمووێ: لەم ئایەتەدا دەبینرێ لەکاتی نوستندا گیانی مردوان و زیندوان سەردانی یەکتری دەکەن و پرسیار لەیەکتری دەکەن (خوا گیانی مردوان دەگرێ- فيُمسِك التي قَضى عَليها المَوت) و گیانی زیندوان بۆ لاشەیان دەگێڕێتەوە (وَيُرسِل الأخرى إلى أجَل مُسَمى) [3].

بەمشێوە نووستن وەکو مردن بەکاتی گیان تێیدا لەلاشە جیادەبێتەوەو خەونەکان لەم ڕێگایەوە دەبینین.

وە پێشەوا عەلی (علیه السلام) لەراست ئەم ئایەتە دەفەرمووێ: (گیانەکان لەخەوتندا بەرز دەکرێنەوە بۆ ئاسمان، ئەوەی لەئاسماندا دەیبینن ئەوە راستە، کاتێ گەڕانەوە بەر لاشە لەهەوادا شەیاتینەکان ئیلهامی دڵیان دەکەن و درۆیان لەگەڵدا دەکەن و ئەوەی ئەوە ببینێ بەتاڵە) [4]، لەکتێبی (خەون و لێکدانەوەی خەونان) کەلەژێر چاپدایە بەدرێژی باسی ئەمە کراوە.

بێگومان زانست سەلماندویەتی گەردوون یەکەو جیاوازێ بۆ خێرایی لەرەلەرەکان دەگەڕێتەوە، ئەمەش ئەوە دەردەخات کردگارەکەشی تاقانەیە.

---

(1) النساء: ٦٩.

(2) الزمر: ٤٢.

(3) الروح، ل٣٦.

(4) الروح، ل٥٤.




## زەوی ئەتیری لەرووی زانستی میتافیزیکییەوە:

## حەوت زەوییە:

بێگومـان تاقیکردنـەوە رۆحییـەکانی زانایـانی میتـافیزیکی خۆرئـاواش لـەرێگای (هیپنۆتیزم)ەوە یـان خەوانـدنی دەستکردەوە هـەموو ئـەو راستییانەی سـەلماندووە کەلەئاینـە ئاسمانییەکاندا لەوانە ئیسلام لەراست گیان و ژیانی دوایی مەرگ باسکراوە.

(ئارتەر فندلای) کە سەرۆکی پەیمانگای توێژینەوەی گیانییە لەبـەریتانیا دەنووسـێ: مـرۆڤ لەلەش و دەروون و گیان پێك دێ، لەش ئەوەیە دەیبینین، دەروون عەقڵە، گیان لەشی ئەتیرە کـە لەگەڵ لەشی ماددی پێکـاو پێگـەو ئـەو لەشـی فیزیاییـە یـەکانگیر دەکـات، مـردنیش تـەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەتیرە لەلەشی ماددی، ئەم لەشە ئەتیرە هزر یان دەروون هەڵدەگرێ، ئەوکاتە لەرووی ئەتیرییەوە لەگەردوون دەڕوانین ئەم ماددی و جیهـانی مـاددی شـتەکی نـابووت دەبـێ و گوێی پێ نادرێت[1].

(ئەتیر ئاسمان و بۆشایی پڕکردووە (٥٠٠) پلـە لـەزەوی سـاردترە، وە بـەردەوامی (قصور ذاتي) هەیە لەگەڵ بڕی جوڵەدا، فشارەکی زۆری هەیـە، هـەر پێیـەکی دووجـای مایۆنـەها تـەن دەبێت، ملیۆنەها ئەوەندەی ماددە چڕترە، بەڵام چیڕترە، بەردەوام لەجووڵەدایە[2].

کاتێ (ئارتەر) لە مەدیومێ واتە: خەوێنراوەکی راهێنراو دەپرسـێ لەگیانـە نامادەبووەکـە بپرسێ: (ئایا دنیای ئێوە ماددییە وەکو هی ئێمە؟ وتی: دنیای ئێمە ماددی نییە، بەڵام حەقیقی و بەرجەستەیە، لە ماددەیەك پێك دێ لەرەلەری (الاهتزاز) پترە لە لەرەلەرەی دنیای ئێوە) [3].

بەمشێوە گەردوون هەمووی یەکـەو جیـاوازی بـۆ خێرایـی لەرەلـەرەکان دەگەڕێتـەوە، وە لەکتێبی (صخرة الحق)دا دەنووسێ: (دنیـای ئـەتیر بـۆ چـاکەکاران لـەزەوی جـوانترە، بـەڵام بـۆ

---

(١) على حافة عالم الاثيري، ت: احمد فهمي ابو الخير، ل٢٥.

(٢) هەمان سەرچاوە، ل٤١.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل١٠٠.



خراپەکاران بەپێچەوانەوە) [1].

دەنووسێ: (خۆری ماددی حەوت گۆی ئەتیر دەوری داوە، وە زەویش حەوت گۆی ئەتیر دەوری داوە، وەکو لە (ل: ١٧٧)دا وێنەی کێشاون و گیانەکان سوودی لێ دەبینن) [2].

شایانی باسە ئەم زانایە مەزنە دوای خوێندنەوەی زانیارییەکانی ئیسلام لەراست گیان و ژیانی دوای مەرگ و دنیای ئەتیر دان بەراستی ئیسلامدا دێنێ و دەڵێ: (من دەبینم موحەمەد وەکو عیسا پیاوێکی رووحی بەرزبووە، وەکو ئیمڕۆ دەتوانین بڵێین ناوەندەکی هەرە بەرز بووە لەمەدیومیدا) [3].

بەویستی خوا لەبەشی (میتافیزیکا) لەسایەی قورئان و فەرموودەدا، بەدرێژی باسی دەکەین.

## ١٠٠-١٠١ کانزاکان تاوێرەکان و خاسیەتەکانیان:

(تاوێرەکان: بارستایی زلن لەچەند کەرەستەیەك پێك دێن و توێکڵی زەمینی پێك دێنن، هەندێ پێك هاتەیان شوشەییە و زۆربەیان کانزایی جۆراوجۆرن و لێك جیان، هەندێ تاوێر یەك کانزایین و زۆربەیان لەچەند کانزایەك پێك دێن) قورئانی مەزن فەرموویەتی ﴿لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَى﴾ طه/ ٦ واتە: هەرچی لەئاسمانەکانو زەویدایەو هەرچی لەنێوانیاندا هەیەو لەژێر خاکدایە بۆ خودایە (تحت الثرى) ئاماژەیە بۆ ماددەو کانزا بەنرخەکان لەژێرخاکدا.

**کانزاکان:** چەند کەرەستەو پێکهاتەیەکن لەسورشتدا و سیفاتی تایبەتی خۆیان هەیە.

(**بەردی ئاگرین**): لەگازاو دروست دەبێ، کەبریتییە بە تاوێری تواوەو تێرگاز، توخمی تواوەی سەرەکی گازاویش (سلیکۆن) و (ئۆکسجین)ە، بەبڕی جیاجیا توخمی تری لەگەڵدایە، وەکو: (ئەلەمنیۆم، ئاسن، سۆدیۆم، پۆتاسیۆم، کالسیۆم، مەگنیسیۆم) کاتێ ئەو گازاوە سارد

(١) هەمان سەرچاوە، ل١٧٧.

(٢) بڕوانە، ل١٧٥-١٧٧.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل١٣.



دەبێتەوە، ئەم توخمانە یەکدەگرن تا بەتایبەتی سلیکان و گازەکان پێك بێن، (٧٠٪ - ٤٠٪)ی جۆری گازاوەکان سلیکاننە، ئەو گازاوەی سلیکانی زۆرە بەگازی ترش (Acidic) و ئەوەی سلیکانی کەمە بەگازاوی تفت (القاعدی-Basic) ناسراوە، تەواوی کانزاکان نابن بەکریستاڵی (التبلور).

(**تاوێری نیشتوو-الرسوبیة**): لە شیبوونەوەو هەڵوەشانی تاوێرەکانی تری سەرزەوی بەهەموو جۆرەکانیانەوە پێك دێ، پێك دێ لە ئۆقرەگرتنی تەنۆلکە تاوێریەکان و نیشتەنی کیمیایی و چالاکییە ئۆرگانییە جیاجیاکان، چەند هۆکارێ کاردەکەنە سەر دروستبوونی بەردی نیشتوو، لەوانە پێك هێنەرەکانی بەردی سەرەتای و رێگای گواستنەوەی کەرەستەکان، لەرێگای نیشتن و ئەو گۆڕانانە دەبێ کەلەکاتی رەقبوونی نیشتووەکاندا بەسەریاندێ و دەگۆڕێن بەتاوێر.

**تاوێری گۆڕاو (المتحولة)**: بەردی گۆڕاو لەئەنجامی ئەو گۆڕانەوە پەیدادەبن بەسەر تاوێردا دێت بەهۆی گەرمی و فشار یان یەکێ لەوانە بەفراوانی، گەر تاوێرەکە دووچاری گەرمی و پەستانی زۆرهات لەقووڵایی زەویدا جارێکی تر بۆ بەردی ئاگرین دەگۆڕێتەوە، زەوی هەسارەیەکی چالاکە بۆیە لەتاوێری (ئاگرین و نیشتوو گۆڕاو) پێك دێت بەبەردەوامی لەناو بازنەیەك گۆڕانی هەمیشەییدا[1].

قورئانی پڕ لە موعجیزەش وەکو ئاماژەمان بۆکرد ئەم زانستەی بۆ جیۆلۆجیان و بلیمەتان پشتگوێ نەخستووە، لەراست بەردی گاوازی ئاگرین (الصخور الناریە) دەفەرمووێ: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[2].

واتە: خۆتان لەو ئاگرە بپارێزن سوتەمەنییەکەی مرۆڤ و بەردە.

باس لە گازاو (الحمم-lava) دەکات کە دووجۆری بادە (بازلت) (ئەندسایت) و جۆری تریان لێ دەبێتەوە و لەکاتی بورکاندا دەبینرێن وشەی (الحمیم) -ی گەرموگازاوە لەقورئانی مەزندا

---

(١) علم الارض، الك سمث، ل٢٣.

(٢) البقرة: ٢٤.





هاتووە: ﴿فِي الْحَمِيمِ ثُمَّ فِي النَّارِ يُسْجَرُونَ﴾[1]. وەدەفەرمووێ﴿إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ الأَرْضَ﴾ الاسراء/٣٧[2].

واتە: تۆ ناتوانی ناخی زەوی ببڕیت.

لەکتێبی (الغرائب)دا هاتووە: (اعمق اختراق لسطح الارض) قوولترین بڕینی ناخی زەوی کەمرۆڤ توانیویەتی (٣٧٧٧)م لەکانەکی ئەفریقیادا لەوێدا پلەی گەرمی تاوێرەکان (٥٥)س[3].

**(خاسیەتی کانزاکان)**

**کانزاکان (المعادن):** توخم و پێکهاتەیەکن لەسروشتدا هەن و خاسیەتی تایبەتی کیمیایی و فیزیایی و بینایی (البصریە)یان هەیە، دەکرێ کانزا یەك توخم (العنصر) بێ، یان چەند کانزایەکی جیاوازبێ لەهەمان توخم پێك دێت، کەچی زۆربەی کانزاکان ئاوێتەن، هەندێ ساکارن وەکو (کواتز) لە (ئۆکسجین و سلیکۆن) و هەندێ زۆر ئالۆزن.

پێك هاتەی گەردیلەیی هەر کانزایێ لەکانزایتر جیایە، ڕێگای پێگەوە بەسترانی گەردیلەکانی کانزا لەگەڵ یەکتریدا کاریگەریەکی یەکلاکەرەوەی هەیە لەدیاریکردنی سیفاتەکانیاندا، (ئەڵماس) چونکە توند گەردیلەکانی یەکیان گرتووە زۆر ڕەقە، وە پێکهاتنی گەردیلەیی کار لە پێکهاتنی کریستالی (بلووری) کانزاکان دەکات بەو واتایەی شێوەی بلووری لەژێر دۆخەکی ڕەهادا، وە ((ئەڵماس) و (گرافیت) خۆیان لە (کاربۆن) پێك دێن.

لێرەدا شەش سیستەمی کریستالی هەیە: (شەش پاڵۆ، المکعب) و (شەشی -السداسي) و (چوارلا-الرباعي) و (لەبزینەیی-المعیني) و (تاك مەیلی-أحادي المیل) و (سێ مەیلی-ثلاثي المیل).

دەست نیشانکردنی یەك کانزا لەمیان (٢٠٠٠) کانزادا شیتەڵەکی وردی سیفاتەکانی دەوێت، بەڵام بەپێی ئەم ڕەوشتانە دەتوانرێ ئەم کانزایە دیاری بکرێت[4].

---

(١) غافر: ٧٢.

(٢) الاسراء: ٣٧.

(٣) الغرائب، ت: مها الجزائري، ل٤٧.

(٤) علم الارض، ل٢٤.




## ١٠٢- خاسیەتی رەقی کانزەکان:

قورئان دەفەرمووێ: ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾[1].

واتە: دڵیان وەکو بەردە یان رەقترە.

(رەقی کانزا لەتاوێرو بەردەکاندا بەرگەگرتنی روشان و کەرتبوونە، لێرەدا (١٠٩ کانز هەیە زنجیرەیەکن بۆ پێوانی رەقی، لەهەموو کانزاکان نەرمتر کانزای (talc-تەڵق)ە، رەقیەکەی (١)و ئەنجا چپس (٢) و ئینجا کلساتیە (٣) و فلۆرایت (٤) و ئاپاتایت (٥) و ئۆرتۆکلیس (٦) و کوارتز (٧) و یاقووتی زەرد (٨) و یاقووت (٩) ئەڵماس (١٠) [2].

لێرەدا دەبینی ئەڵماس لەهەموویان رەقترە (اشد قسوه) بۆیە بۆ برینی شووشەو شتی رەق بەکاردێت، وە (٩٠) ئەوندەی یاقووت رەقترە کەبە پلە (٩) دێت لەرەقیدا.

## ١٠٣- رەنگی کانزەکان و شوێنی رۆشان:

قورئانی مەزن بەر لەزانستی نوێ ئاماژە بەرەنگی کانزاکان دەکات: ﴿وَمِنَ الْجِبَالِ جُدَدٌ بِيضٌ وَحُمْرٌ مُخْتَلِفٌ أَلْوَانُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ﴾[3].

واتە: (هەیە لەچیاکان چەند رێگایەك سپی و سوورو رەنگاورەنگەو زۆر رەشە) دیارە چیاکان مەڵبەندی کانەکانن!

(رەنگەکان بۆ تاوێرەکان و کانزاکان هەمیشە بەڵگەی تەواو نین، بۆ نموونە (کوارتز رەنگاورەنگە بەپێی ئاوێتەبوونی لەگەڵ خڵتەدا، هەشیانە رەنگی نەگۆڕە وەکو (گالینا) کە خۆڵەمێشییە، گۆگرد زەردە)[4].

(گرانێت) یان (کاربۆن) رەش و بریسکاوەیە شوێنەوار لەسەر پەڕە پەیدا دەکات، لەچینی سوور زۆرە، ئەم ماددەیە لەبنەڕەتدا لەدروستکردنی قەڵەم رەساس (الرصاص)دا بەکاردێت، و

---

(١) البقرة: ٧٤.

(٢) علم الارض، ل٢٤.

(٣) فاطر: ٢٧.

(٤) علم الارض، ل٢٥.

بۆ ناوپۆش کردنی تاگردانی گازاوەکان و پیشەسازی بۆتەکانی گەرمی لەپیشەسازی پۆلاو مسدا، یان کبریت (زەردە) هەندێ جار مەیلەو سەوزە لەبەربوونی خلتە لەناویدا، بۆ دەنکە شخاتەو باروت و پەینی کیمیایی و قەلاچۆکردنی مێروان و مەبەستی پزیشکی بەکاردێت.

گۆگردی ئاسن (pyrite) بلوورییە زەردی کراوەیە یان زەردی زیوینە، روشاوەکەی رەشە یان زەردی سەوزباوە، (هالیت خوێی تاوێری) کەلە کلۆریدی سۆدیۆم پێك دێ، گەر رووت بێ رەنگە یان سپییە، لەزۆر رەنگدا دەبینرێ (سور، زەرد، شین، خۆلەمێشی)و بەخێرایی لەئاودا دەتوێتەوە، ئۆقیانووسەکان بەدرێژی (٣٪) ی خوێی هالیتیان تێدایە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿هَذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَائِغٌ شَرَابُهُ وَهَذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ﴾ فاطر/١٢.

ئەم دەریایە سازگار و شیرینە ئەمەش سوێرو تفتە، خوێ بۆ کاروباری ماڵ و پیشەسازی کیمیایی و پێستە خۆش کردن سوودی لێ دەبینرێت.

کواتز هەیە کە روونەو بەکریستالی تاوێری ئاسراوەو بۆ پیشەسازی گەواهیرەکان و هاوێنەی دووربینەکان سوودی لێ دەبینرێ و لە بنەڕەتدا دووەم ئۆکسیدی سلیکۆنە کە کانزایەکی گەورەو بلاوە لەتوێکڵی زەویدا لەسروشتدا لەشێوەی تەنۆلکەی نارێك و کریستالی وا هەیە، هەرچەندە خوێ بێ رەنگە یان سپییە لەپاکژیدا، زۆرجار رەنگاورەنگە وەکو زەردو وەنەوشەیی و رەش و پەمەیی، (یاقووت) هەیە بەردەکی بەنرخە روون و سوورە (زەفیر) هەیە، شینی تۆخە لەپیشەسازی خشلدا بەکار دێت، (هیماتیت) هەیە لەئۆکسیدی حەدیدۆز پێك دێ (٧٠٪)ی ئاسنە کریستالی رەشی ئاسنییە.

( ئۆپاڵ) هەیە دووەم ئۆکسیدی سلیکۆنی ئاوییە و بلووری نییە، بێ رەنگە بەخلتەوە رەنگاورەنگە وەکو سپی خۆڵەمێشی و زەردوو سووری پەمەیی، بۆ پیشەسازی خشل و نەگەیاندنی گەرمی و بریقاندنەوە بەکاردێت..

کاربۆنات هەیە کۆمەڵە خوێیەکی ترشی کاربۆنیکە لەتاوێری نیشتوو گۆڕاودا هەیە، کالیست هەیە کاربۆنی کالیسیۆمە سپی و بێ رەنگە، بەخلتەوە شین و سوورو خۆڵەمێشی و پەمەییە، دۆلۆمیت: (٥٤٪)ی کالیسیۆم و (٤٦٪)ی مەگنیسیۆمە بێ رەنگ و سپییە یان زەردباوە.

سلیکان هەیە (١/٣)ی کانزاکانە وەکو باسکرا لەزەویدا (٧٥٪)ی توێکلی زەوییە، چەند جۆرێکە وەکو ئۆلڤین کە سەوزە بەهەموو پلەکانەوە یان قاوەیی (البنی) یان رەشە، (ئۆگیت) هەیە سلیکاتی کالیسیۆم و مەگنیسیۆم و ئاسن و ئەلەمنیۆمە پێکی دێنێ سەوزی رەشباوە یان رەشە[1].

**شوێنی روشان (التخدش-streak):**

گەر کانزاکە بڕۆشێنرێ بۆ ناسینەوە سوودی پێری لێ وەردەگیرێ بەتایبەتی لەپشکنینی کەرەستە خاوە کانزاییەکاندا.

## ١٠٤- بریسکانەوە:

قورئان دەفەرمووێ: ﴿هُوَ الَّذِي يُرِيكُمُ الْبَرْقَ خَوْفاً وَطَمَعاً وَيُنْشِئُ السَّحَابَ الثِّقَالَ﴾[2].

واتە: خودایە بریسکەکان پیشان دەدات ترس و تەماعی تێدایە، وە هەوری قورس دروست دەکات.

لە (گەردووننناسی) باسی هەورو باران و بروسکە و گرمەو با کر... ئەوەی لێرەدا ئاماژەی پێ دەکەین لێرەدا وشەی (طمعا).

(هشام طالب) دەنووسێ: (لەم ئایەتەدا دیارە کە ئەو بروسکەیەی مرۆڤ لێی دەترسێ بەتریشقەکەی لێی بدات، دیسان تەماعی رووادانیشی دەکات، چونکە بارانی زۆر لەگەڵ خۆیدا دێنێ و کشتوکاڵ دەڕوێت، دیسان کاردەکاتە سەر پێکهێنانی کریستاڵی ئەڵماسی و بەردە بەنرخ و کانزاکانی تر، چونکە رووناکی دەدات لە کریستالیەکانی تاوێری و کانزایی کاربۆنی کەلە سورشتدا هەیە، دەیدەنەوە و بەهۆی تریشقە بۆ بلووری ئەڵماسی دەگۆڕێن، زانایان دەڵێن: هەموو کریستاڵێکی بەنرخ رووناکی دانەوەی تایبەتی هەیە و رەنگەکەی خۆی دەدات)[3].

(ئەلك سمث) دەنووسێ: (بروسکە (البريق)ی کانزاکان، رواڵەتی دانەوەی رووناکییە بۆسەر

---

(١) بەکورتکردنەوە لەکتێبی (معالم سطح الارض) د. جودة حسين جودة، ل٨٠-١٠٠.

(٢) الرعد: ١٢.

(٣) بناء الكون ومصير الانسان، هشام طالب، ٣٩٨.





کانزاو یەکێک لە سیفاتەکانی، بۆ نموونە (گالینا) بروسکەکەی کانزایی (فلزی)یە و (کوارتز) بریسکەکەی شوشەیی (الزجاجی)یە[1].

## کەرتبوون (التشقق):

توانای کانزایە بۆ بەشبوون بەپێی چەند روویەکی دیاریکراو، لێدانەکی سادە لەرتێرەوێکی لەباردا دەبێتە هۆی کەرتبوونی زۆربەی کانزاکان، گالینا کەرت بوونی شەش پالۆیی هەیە (مەکایکا) کەرتبوونی تفتی تەواوی هەیە، کوارتز کەرتبوونی نییە.

## شکان (التکسر):

ئەو رێگایەیە کانزای پێ دەشکێ بەبێ کەرتبوون، کوارتز شکانەکی شێوەی گوێچکەماسی (المحار)ی هەیە.

## کێشی جۆرێتی (الوزن النوعی):

کێشی نیسبی قەبارەیەکی دیاریکراوی کانزایەك بەپێی پێوەری کێشی قەبارەیەکی هاوسەنگی ئاو دەبێ، کێشی جۆری کانزا لەمیان (١,٧)ی کانزای بۆرکس و (١٩,٣)ی کانزای زێرە.

## روالەت (المظهر):

روالەتی گشتی کانزایە، بۆ نموونە (کلسایت لەشێوەی بلووری جۆراوجۆردا دەرکەوێت، یان بەپارچە پارچەیی و دانك دانکە دەردەکەوێت.

کانزاکان خاسیەتی تریشیان هەیە وەکو (تام و موگناتیسییەت)[2].

(١) علم الارض، ل٢٥.

(٢) علم الارض، ل٢٤-٢٦.





## پۆلینکردنی کانزاکان

تائێستا (٣٠٠) جۆری ناسراوە و تـوێکڵی زەوی پێـك دێـنن، بـەڵام زۆربـەیان دەگمـەنن، ئەوانەی زۆر بڵاون لەتوێکڵی زەویدا (٥٠) دانە دەبن.

بەپێی پێکهاتەی کیمیایی و بلووربیان دەبن بەچەند گروپێکەوە: (کـانزای تـوخمی وەکـوە: کانزای کبریتید، هالۆجینات، ئۆکسیدەکان، هایدرۆکسـیدات، کاربۆنـات، کبریتـات، فۆسـفات، سلیکات).

**وە کانزاکانی توخمی دوو بەشن:**

**١- کانزای توخمی فلزی وەکو:** زێڕو زیوو مس و پلاتین.

**٢- کانزای توخمی نافلزی وەکو:** گرافیت و کبریت و ئەڵماس[1].

هەندێ لەو کانزایانەی لەقورئاندا ناویان هاتووەو بنەمایەکی گەورەی ئابووری و تەکنیکین:

قورئانی پیرۆز باسی گرۆپێ لە کانزا بەنرخەکان وەکو (زێڕ و زیوو ئاسن و مـس) کـردووە، لەبەرامبەردا ئاماژەی بەسێ بەردی بەنرخ کـردووە (یـاقووت و مـەرجان و مـرواری-اللؤلؤ) وە زۆرێ لەخاسـیەتەکانی تایبـەتی ئـەوانی باسـکردوون کـە زانسـتی جیۆلـۆجی و کیمیـایی دوای ئەزموونەکان پەی پێ بردوون:



### ١٠٥- زێڕ (الذهب):

دیـارە زێـڕ کانزایـەکی بەنرخـە لەچەندان ئایەتی قورئاندا باسکراوە وەکو: ﴿وَالَّـذِينَ يَكْنِـزُونَ الـذَّهَبَ وَالْفِـضَّةَ وَلاَ يُنفِقُونَهَا فِي سَـبِيلِ اللّـهِ فَبَشِّرْهُم بِعَذَابٍ

---

(١) معالم سطح الارض، ل٧٨-٧٩ سەیر بکە.



أَلِيمٍ﴾(١). لێرەدا بەهای ئابووری زێڕ دەردەخات، کە بەدرێژایی مێژوو هۆکارێ بووە بۆ هەژاری و دەوڵەمەندی زۆرێ لە گەلان، جاران لەجێگای پارەی کاغەز (نەخت)دا بازرگانی بە زێڕ و زیوەوە کراوە، دوای زۆربوونی دانیشتوان و کەمی ئەودوو کانزایە بانکە بازرگانییەکان پارەی کاغەزییان داهێنا بۆ بازرگانی و کڕین و فرۆشتن، دوایی بڕیاردرا مافی دەرکردنی پارەی کاغەز بەبانقێ بدرێ، ئەوەبوو بانقی (سوید) بۆ ئەوە هەڵبژێرا، وە لێرەدا قورئان داوای دادوەری کۆمەلایەتی و نەهێشتنی چینایەتی دەکات.

قورئان باس لە زێڕ دەکات وەکو بەکارهێنانی بۆ خشڵ و جوانی: ﴿يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ﴾(٢).

وە بەکارهێنانی بۆ کەلوپەل: ﴿يُطَافُ عَلَيْهِم بِصِحَافٍ مِّن ذَهَبٍ﴾(٣). ئەمە مەبەست لەزێڕی ئەتیرە کەزۆر لە زێڕی فیزیایی جوانترە لەبەهەشتداو بۆ چاکەکاران دانراوە.

غەریزەی گەڕان بەدوای زێڕو زیوو کانزای بەنرخدا لەمرۆڤدا بەرجەستەیە بۆ جوانکاری و دەوڵەمەندی و بەدەستهێنانی خۆشگوزەرانی، بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لو ان لابني آدم واديين من ذهب تتمنى ثالثهـا) واتە: گەر مرۆڤ دوو دۆڵی زێڕ هەبێ خۆزگەی دۆڵەکەی تریش دەخوازێت.

بەڵێ زێر لەلایەن پسپۆڕو شارەزایانەوە زۆرشتی جوان و خشڵی وردی لێ دادەڕێژن، ئینجا لەدروستکردنی پارەو سکەی داراییداو پیشەسازی پلاتین و دروستکردنی گەیێنەرەکانی کارەباییدا سوودی لێ دەبینرێت.

دکتۆر (جودە) لەراست زێڕ دەنووسێ: ( کانزایەکی بەنرخە لەسروشتدا لەشێوەی کریستالی و ورتکە لەکوارتزەکاندا بڵاو دەبێتەوە، یان لەشێوەی توێکڵ و پلێتی تەنك و پارچەدا دەبینرێت، سیستەمی کریستاڵیەتەکەی شەش پاڵوییەو رەنگی زەردو سەنگی جۆرەتی (١٥,٦-١٩,٣) و

---

(١) التوبة: ٣٤.

(٢) الكهف: ٣١.

(٣) الزخرف: ٧١.




لێدان و ڕاکێشان وەردەگرێ و ڕەقییەکەی (٢,٥-٣).

زێڕ لەتاوێرەکانداو لەڕووبارەکان و ئۆقیانووسەکاندا هەیە، تا لەخوێنی زیندەوەرانداو لەخلتەو نیشتەی گواستراوەدا هەیە کە رووتانەوە ڕایمالیوە، لەبارستایی خاودا هەیە، هەندێ جار دەبینین بەتوخمی تر وەکو (ئەسیدی ناسن) رووپۆش کراوە، لەزۆر شوێنی دنیا دەردەهێنرێ بەتایبەتی باشووری ئەفریقیا نزیك شاری (جوهانسبرج) و بەتەنیا (٤٠٪ی جیهان بەرهەم دێنێ. دیسان لەچیای (ئورال) و سیبیریاو هیندو چین و کەناری زێڕو ئالاسکاو کالیفۆڕنیا دەردەهێنرێ بڕێکی کەم لەبیابانی خۆرهەلاتی میسردا هەیە) [1].

## ١٠٦- بۆچی خشلی زێڕ بۆ پیاوان حەرامە، بۆ ژنان حەلالە؟

پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (احل الذهب والحرير للاناث من أمتي وحرم على ذكورها رواه احمد، واتە: زێڕو ئاوریشم بۆ ئافرەتانی ئوممەتی من حەلاڵ کراوەو بۆ نێرە وەزەکانی حەرام کراوە.

حیکمەتی ئەم حەلاڵ و حەرامیەی زێڕ لەم ماوەیەی رابردوودا بۆ جیهان بەدەرکەوت (کۆمەڵەی شانشینی بەریتانی بلاویان کردەوە لەزانکۆی (ساوث هامبتز) لەبەرواری (١٩٩٨/٨/١٦) تا (١٩٩٩/١١/٢٥) تاقی کردنەوە لەسەر ئالتوون کراو بەم ئاکامە گەیشتن ئالتوون ئەو تیشکانە کۆدەکاتەوە کاریگەریان دەبێ لەسەر خانەی زیندەوەران و خڕۆکە سپییەکان و خڕۆکە سوورەکان و هۆرمۆنی نێرینە لەپیاواندا و کار ناکاتە سەر ئافرەت، ئەگەر بۆ قاپ و قاچاخ بەکاربێ و شتی تێدا بخورێ، یان بکرێ بە کەوچك شتی پێ بخورێ لەگەڵ ئەو خواردنە کار لێك دەکات و زیانی دەبێ بۆ لەشی مرۆڤ) [2].

---

(١) معالم سطح الارض، ل٩٠.

(٢) ژیانەوە، ئەندازیار عوسمان محمد رەشید، ل ٤١٤.





## ١٠٧- زیو (الفضة):



(د. محمد راتب النابلوسی) دەنووسێ: (راگەیانرا کە کارگەکانی پڕکردنەوەی شووشە گازییەکان، لەدوا قۆناغدا بۆرییەکانی لەزیو دروست دەکرێ تا ئاوی پیا بڕوا، هەتا خاوێن بێ لەمیکرۆبەکان.. زیو خاسیەتەکی گرنگی هەیە و ئەو میکرۆبانە دەکوژێ لەئاودا هەیە چونکە خاسیەتەکی تیشکی هەیە، یان دەبێ ئاوەکە بەبۆری زیویندا بڕوات یان چەند پارچە زیوەکی بخرێتە ناو.

ئەم زیوە بەکتریاکوژە گەر ئەو ئاوە بەس ئاوی بەربکەوێ لەهەموو میکرۆب و خۆرییەکی پاکژ دەکاتەوە، گەربتەوێ لیترێ ئاو خاوێن بکەیەوە پێویستە چەند گرامێ کانزای زیوی بخرێتەناو، پێنجەم ئەوەیە، مەگەر هەوا خاوێن نەبێ ڕەنگی زیو ناگۆڕێ، گەر لەژوورەکەدا گازی نادروست هەبێ ڕەنگی زیوەکە دەگۆڕێ، وەك بڵێی زیو بووە بە پێوەرێ بۆ پاکژی هەوا.

سەرباری ئەوە زیو بۆ پیشەسازی و وێنەگرتن و گەیاندن و هەڵنگاندنی کاڵاو نرخەکانیان بەکاردێت، خوای گەورە لەسوورەتی (الانسان)دا دەفەرمووێ: ﴿وَيُطَافُ عَلَيْهِم بِآنِيَةٍ مِّن فِضَّةٍ وَأَكْوَابٍ كَانَتْ قَوَارِيرَا * قَوَارِيرَ مِن فِضَّةٍ قَدَّرُوهَا تَقْدِيراً﴾[1].

واتە: بەسەریاندا دەگەڕێن لە(بەهەشت)دا بەدەفری زیوین و فنجانەی شوشەیی، شوشەی زیوین دیاری کردووە چۆن دیاری کردنێك.

ئەمەش گرنگی خاسیەتی زیو دەردەخات لەبەهەشتدا و بەشێکە لە قاپ و قاچاخی بەهەشت، ئەم ئایەتە ئەمە دەردەخات کە بنەما زانستییەکان لەکتێبی خودادا هەیە[2].

زیو توخمەکی کانزایی و کیمیاییە کێشی گەردیلەی (١٠٨)ە و ژمارەی گەردیلەیی (٤٧) و

---

(١) الانسان: ١٥-١٦.

(٢) آيات الله في الآفاق، د. محمد راتب النابلوسي، ل١٤٥-١٤٦، بەکەمێ دەستکاری و کورت کردنەوە.




نیشانەکەی (A g) لە دروستکردنی پارەو خشڵ و دەرمان و ئاوێنە و فیلمی فۆتۆگرافیدا بەکار دێت[1].

## ئاسن و باراندنی:

رابردوو باسکرا کەخوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ﴾[2]

چەندان ئیعجازی تێدایە وەکو: ١- ئاسن لەئاسمانەوە لەرێگای نیازکەکانەوەدا باریوەتە سەرزەوی.

لەفەرموودەدا هاتووە باس لە کەوتنی نیازکێ دەکات: (ابو هريرە) دەڵێ: لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) بووین گوێمان لەکەوتنی شتێ بو، فەرمووی (ﷺ): ئەزانن ئەمە چی بوو؟ وتمان: خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن، فەرمووی: (هذا حجر رمي بە في النار سبعين خريفا، فهو يهوي في النار حتى انتهى الى مقرها).

ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەنیازك و شوهبێ دەكات دوای ئەوەی بەرچینەكانی هەوا دەكەوێ لێك خشان دروست دەبێ و دەسووتێ (يهوى فى النار) مەبەست ئەوەیە ئەو تەنە رەقە دەورێ دراوە بەئاگر کە بەو لێکخشانە دروست بووە وەکو لەشەودا دەبینرێ، پێویستە زانایانی ئیعجاز بەهەندی وەربگرن، بەزۆری دەڕواتە ناخی زەوییەوە، یان بەدیاریەوە چاڵێ پەیدا دەکات، (٧٠ ساڵ ئەو ماوەیەیە نیازك دەیخایەنێ دوای ئەوەی لەتەنەکی تر جیادەبێتەوە تا دەگاتە هەموو زەوی، ئەم دۆخە لەگەڵ زۆرێ لەتەنەکاندا روودەدات کە دەیان و سەدان و هەزاران ساڵ دەخولێنەوە بەئاسماندا بەرلەوەی بەرشتێ بکەوێ، بۆ نموونە کلکداری (هالی) نزیکەی (٧٠) ساڵ جارێ بەدەردەکەوێت[3].

بەڵێ نیازکەکان بەزۆری لەکانزای قورس پێك دێن بەزۆری ئاسن و نیکلە و ئەو کۆمەڵە نیازکە بە (holosidertes) ناسراوە، لەسیبریادا دانەیەك کەوتە خوارەوە چاڵەکی پەیداکرد

(١) کەمال نامە، کەکال جەلال غەریب.

(٢) حديد: ٢٥.

(٣) بناء الكون ومصير الانسان، ل٢٧٠.



قوولّی (١٠٠)م و تیرەی (٨٠٠) م بوو.

وە هەندێ ماددەی تریش جگە لەئاسن باس دەکرێ کە سەر بەزەوی و کۆمەڵەی خۆر نییە و نامۆو دەگمەنە لەزەویدا و کەرەستەی گەردوونییە وەکو (تەکتیك-tektites) کە زۆر بە شووشەی سروشتی دەچێت، هەندێ لەزانایان بەپاشەڕۆکی کۆمەڵێ لە نیازکەکانی دادەنێن[1].

## ١٠٨- مەبەست لەبوونی هێزی زۆر (البأس الشدید) لەئاسنداو سوودەکانی:

بەڵێ خوا ئاسنی باراندووە هێزێکی زۆری تێدایە لەجەنگ و ئاشتیدا ئاسن دەیان سەدە لەمەوبەر شمشێرو رم و زرێی جەنگاوەرانی لێ دروست کراوە، ئیمڕۆش هەموو ئامێرەکان لەئاسن دروست دەکرێن.

زانایانی کیمیا دەڵێن: (ئاسن لەهەموو کانزاکان بەهێزترو چڕترە و بەرگەی زەبرو زەنگ دەگرێ و لەهەموو کانزاکان چڕترە، ئەمەش یارمەتی زەوی دەدات بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی یەکەی).

وە گرنگترین کەرەستە کە ئاسنی لێ دەردەهێنرێ (مەگنایت و هیماتایت)ە.

## ١٠٩- چۆن ئاسن دەکرێ بەئاسنەکی قایم؟

**مەگنایت:** ئەم کەرەستە خاوە ڕەنگی لەنێوان خۆڵەمیشی و ڕەشدایە و کێشی جۆریەکەی (٥) و سیفەتی مرگناتیسی هەیە و (٧٢٪)ی ئاسنە و ئەوەی تریش کاربۆنە، یاسای کیمیاکەی (fe٣ o٤) ئەم کەرەستەیە (٥٪)ی بەرهەمی جیهانە.

**هیماتایت:** سورباوە کێشی جۆری (١,٦-٥) و (٧٠٪)ی ئاسنەو ئەوەی تر ئۆکسجینە، یاسای کیمیایی (fe٢ o٢).

بەزۆری ئاسن لەنزیك ڕووی زەمینەوە هەیەو کانزاکردنیان لەکانی کراوەدا دەکرێ،

---

(١) کوکب الارض، د. حسن سید احمد ابو العینین، ل٥٠، سەیر بکە.



بەبەکارهێنانی هەڵمی ئاو ئەو چینە گڵە لادەبرێ و بەتەقەمەنی کەرەستە خاوەکە دەشکێنرێ و ئینجا کارگەی ئاسن دەبرەرێت.

ئەم ئاسنە بە (کورەی فوکەرەی نوێ) کەبەرزی (٣٠)م و (پانی: ٩م) لەپۆلا پێك هاتووە، پاکژ دەکرێتەوە، **بەرهەمی ئەم کوورانە رۆژانە (٢٠٠٠) تەن ئاسن دەبێت.**

ئەو ئاسنەی کەلە کورەی فوکەرەدا پەیدا دەبێ بەئاسنی جۆش دەناسرێ و پاشان دەنێردرێ بۆ کارگەکان تا بکرێ بە ئاسنی گونجاو یان دارژاو (السبائك)، زۆرجار لەجیانی ئاسنی گونجاو ئاسنەکی تر بەکاردێ بەناوی ئاسنی رەق (الصلب) یان پۆلا کە دارشتەی ئاسن و کاربۆنە.

بەڵێ: ئاسن چاوگی هەموو ئامێرەکانە لەچەرخی نوێدا لەئامێرە پیشەسازییەکان و ئامێرەکانی گواستنەوەو بیناسازی و کارەبایی و ئامێرەکانی جەنگ و ..هتد، ئینجا ئاسن دەبی بە موگناتیس بۆ قیبلەنۆما و دینەمۆو تەلەفزیۆن و رادیۆو تەلەفۆن سوودی لێ دەبینرێ.

بۆ پاراستنی ئاسن لە ژەنگ بۆیە و تۆتیا و تەنەکە و کرۆم ڕێژ دەکرێت.

ئاسنی دارێژراو لە (١١٥٠)ْس دا شل دەبێتەوە بە گەرمکردن، بەلام ئاسنی خاوێن لە (١٥٣٥)ْس گەرمیدا شل دەبێتەوە، بۆیە ئەو ئامێرانە لەحیم ناکرێن کەلە ئاسنی دارێژراو دروست کراون، بەلام گەر بەمووشە دەمە شل بکرێتەوە دەتوانرێ لەهەموو جۆرە قالبێک





دابڕێژرێ، گەر سوور بکرێتەوە بۆ دوو رۆژ لەم پلەیەدا بهێڵرێتەوە بۆ زۆپاو گەرماو سوودی لێ دەبینرێ، بەلاّم بۆ کەرەستەی بیناسازی بەکارنایەت وەکو شیش بەڵکو ئاسنی داڕژاو و پۆلاّ بەکاردێنرێت، وە ئاسنی گونجاو بە شلکردنەوەی ئاسنی جۆش یان دارِژراو لەکورەیەکی لەرزۆکی ناوپۆشکراو بەئۆکسیدی ئاسن دروست دەکرێ و خڵتەکانی لادەبرێت.

ئۆکسجین کردنەوەی لایان دەبات وەکو کاربۆن و و سلیکۆن و مەنگەنیز، ئاسنی پاکژ نەرمە و بۆ بەکارهێنانی ناشێت، گەر بەرێژەی (١٪-٠,١٪) کاربۆنی تیابێ ئەوە دەبێ بەئاسنەکی رەق و بەهێز دەکرێ بکشێ و بکرێ بە موگناتیس و بەشێوەیەکی هەمیشەیی بۆ بەکارهێنان بگونجێت.

سەیربکە چۆن (زولقەرنەین) کە بڕوا وایە فەرەیدوونی کوردی بێ و هاوڕێی ئیبراهیم بووە و نەمروودی لەناوبردووە، وەکو زۆر لە مێژوونووسان باسیان کردووە لەوانە: (ابن الاثیر) لە (الکامل فی التأریخ/ ج١)دا و خۆشمان لەپەراوێزی (زەردەشت و زەردەشتییەکاندا) نووسراوی (د. شفیع الماحی)دا کە چاپکراوە باسمان کردووە، چونکە نەمروودو ئەژدیهاك یەك کەس بوون[1].

---

(١) (هشام الکلبی) دەڵێ: (ئەژدیهاك نەمروودە و ئیبراهیم (ﷺ) لەسەردەمی ئەودا لەدایك بووە و ئەو ویستی بیسوتێنێ) (الکامل/ ج١، ل٥٩).

(هەندێ مێژوونووسانی فارس)دەڵێن: فەرەیدوون ئەژدیهاکی کوشت لە نەورۆزدا) (الکامل/ ج١،ل٥٩).

هەندێ مێژوونووسی فارس دەڵێن: (فەرەیدوون زولقەرنەینە هاوڕێی ئیبراهیم کە خوا لەقورئانی پیرۆزدا باسی کردووە) (الکامل/ ج١، ل٦٤) (د. عبدالوهاب النجار) لە (قصص الانبیاو، ل١٠٦)دا دەنووسێ: (ئیبراهیم وەکو لە تەوراتدا هاتووە خەلکی فدان ئارامە لە عێراقدا) (فدان ئارام) دۆڵئارانە لای سەروچاوە لەناوچەی بیتوێن و ئەشکەوتی ئیبراهیم و مەنجەنیقی ئیبراهیم و کێوی نەمروود لەوێیە.

وە بەپێی شانامەی فیردەوسی فەرەیدوون و کاوە کوردن، بەپێی سێ تابلۆ دێرینەکان کەلەساڵی (١٩٢٠) دۆزرانەوە لەلایەن ئینگلیزەوە کە وەحی نوحەو ئێستا لەمۆزەخانەی بەریتانیان و (تەقی عابد) لەرۆژنامەی (العرب)دا لەساڵی (١٩٩٠)دا بلاوی کردنەوە کە شرێنەوارزانەکی عەرەبە ئەم تابلۆیانە بەزمانی کوردی سۆرانی نووسرانەوەو ئیبراهیم لەخێڵی جافەو خێزانی هەورامی بووە، لەنەژادی نوحە کە ناوی کوردە بووە، وەکو لە گەردوونناسیشدا ئاماژەمان پێ کردووە، دوای ئەزان زەردەشت دێ کوڕی دەغدوڤای کچی ئیبراهیم خەلیل و حوکمی میدیەکان دەکات کە کوردەکانن، وەکو (محمد گۆمەیی) لەکتێبی (زەردەشتدا) کەلە سوید چاپکراوە باسی کردووە.

سەیربکە زولقەرنەین چۆن بەربەستێ دروست دەکات وەکو سنوورێکی دەستکرد، تا لەدەوڵەتە فیدراڵەکەیدا هەموو گەلان سنووری جوگرافی خۆیان هەبێت و کەس دەستدرێژی نەکاتە هیچ گەلێك، دەبینی ئەم بەربەستە بە ئاسن دروست دەکات و دەیتاوێنێتەوە، پاشان لەگەڵ مس دا تێکەڵی دەکات، تا ئاسنەکە رەقتردەبێت.

ئەم رێگایە لەچەرخی نوێشدا بەکاردێ، بەکارهێنانی مس بەتواوەیی لەگەڵ ئاسندا بەرگری و هێزی پتر پێ دەدات، لێرەدا خوداوەند بەئیلهام زولقەرنەین ئەم رێگایە تەکنیکییە فێری زولقەرنەین بۆ رێ رێگاگرتن لەپەلاماری یەئجوج و مەئجوجەکان.

﴿قَالُوا يَا ذَا الْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجاً عَلَى أن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدّاً * قَالَ مَا مَكَّنِّي فِيهِ رَبِّي خَيْرٌ فَأَعِينُونِي بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْماً * آتُونِي زُبَرَ الْحَدِيدِ حَتَّى إِذَا سَاوَى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ قَالَ انفُخُوا حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَاراً قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْراً * فَمَا اسْطَاعُوا أن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْباً﴾[1].

لێرەدا زولقەرنەین دوای ئەوەی پارچە ئاسنەکی گەورەی بۆ دێنن کەلەو شوێنە دایبنێن کە سنووری میان ئەم دوگەلەیە و دەکەوێتە دۆڵێکەوە لەمیان دوو چیادا، پارچە ئاسنە گەورەکەیان لەوێ دانا تا بیکەن بە بەربەست، ئینجا داوای کرد بە مووشە دەمەو کورە گەرم بکرێ بتاوێنرێتەوە و گەرم بکرێ، ئینجا داوای مسی کرد بەسەریدا بتاوێنرێتەوە بەکورەی ئاگر تابوو بەکێوەکی رەق، کەئەم خراپکارانە نەتوانن بەسەریدا سەربکەون یان کونی بکەن.

دیارە مس سێ سیفەتی باشی هەیە: ١- کارەبا بەباشی دەگەیەنێ، ٢- بەرهەڵستی ژەنگ هێنان دەکات، ٣- هێزەکی میکانیکی باشی هەیە، وەکو لەباسی (مس)دا باسی دەکەین.

---

(١) الكهف: ٩٤-٩٧. تێبینی: وشەی (یأجوج و مأجوج) دوو وشەی غەیرە عەرەبین لە (GOG) و (MAG OG)ەوە هاتووە، (المهدي المنتظر/ الشيخ محمود الغرباوي، ل١٦٩)





**١١٠- چۆن ئاسن لەبەردەستی ( داوود )دا ( ﷺ ) دەتوایەوە؟!**

**﴿أَنِ اعْمَلْ سَابِغَاتٍ وَقَدِّرْ فِي السَّرْدِ وَاعْمَلُوا صَالِحاً إِنِّي بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾**[1].

واتە: ئاسنمان بۆ نەرمکرد، کە زریّ دروست بکە لە درومانەکانیدا وردبە کاری باش بکەن..).

دیارە تراندنەوەی ئاسن بۆ داوود موعجیزەیەکی خودا بووەو داوود زریّی لیّ دروست کردووە تا شمشێرو رم نەیبڕێ و بژێوی ژیانی خۆی پیّ دەرهێناوەو وەکو پێغەمبەر و سەرکردەیەکی سەربازیش لەبەردەم دوژمناندا بەکاری هێناوە، ئەم کردارە بۆ ئەولیاکان پێی دەوترێ کەرامەت.

## راڤەی زانستی میتافیزیکی بۆئەوە چییە؟

بێگومان لەمرۆڤدا وزەیەکی سەرووی ماددی هەیە بەناوی (هالەی موگناتیسی) هەموو کارە نائاساییەکانی مرۆڤ لەرێگای ئەودا روودەدات وەکو (سایکۆکینیزیا)کارکردن لەتەنەکان و جوولاندن و گواستنەوەیان و تواندنەوەیان بەبێ هیچ هۆکارێکی فیزیایی (تلباتی) قسەکردن لەدوورەوە وەکو تەلەفۆن بەبێ بەکارهێنانی ئامێری بێ تەل و شەپۆلەکانی.

(ج. ا. ج. رایز) دەڵێ: (موعجیزەو کاری نائاسایی رووداوەکی سەیرە لەلایەن هێزەکی نائاساییەوە روودەدات، بۆیە پێویستە بگوترێ کارتێکردنی نائاسایی (الخارق) پێویستە هێزەکی نائاسایی دروستی بکات).

باشترین پێناسە ئەوەیە فەیلەسوفێکی رووسی (ئۆسپینسکی) کردوویەتی: (موعجیزە دیاردەیەکە لەم جیهانەدا سەرهەڵدەدات و ملکەچی جیهانێکی ترە)[2].

(رونالد ماکری) دەنووسێ: (بیل دەڵێ: بەشێوەیەکی دروست فێرن نوێژبن، با زانستی بێ، لەنوێژی بێ ئاگا خۆ بپارێزن، بیری ساغ وزەیەکی نائاسایی فرێ دەدات، بیل دەڵێ: لەناو ئێوەدا یەك وزە هەیە کیفایەتە کەشاری نیۆیۆرك بتەقێنێتەوەو بیکات بە خۆڵەمێش، ئەمەو هیچی تر،

---

(١) سبأ: ١١.

(٢) عصر الخوارق، ت. ماجدة صبيح، ل١٣.




فیزیای پێش کەوتوو ئەوەمان پێ دەڵێت) [1].

دەنووسێ: (سایکۆکینیزیا واتە: جووڵاندنی تەنەکان بەتوانای دەروونی نائاسایی، واتە هێزی هزر لەسەر مادده، یانی بەکارهێنانی توانا بۆ جووڵاندنی تەنەکان و کارتێکردنیان بەبێ بەکارهێنانی هیچ هێزەکی فیزیایی ناسراو، هێمای (P.K) بۆ دادەنرێت، ئەم دیاردەیە لەسایەی توانای مستەر یوری گیلەر ناوبانگی دەرکرد، کە دەیتوانی بەهێزی عەقڵی کەوچکی چێشت و کلیل خواربکاتەوە) [2].

سەیرکە لەقورئاندا هاتووە چۆن زانایەکی سولەیمان (ﷺ)دەڵێ: دەتوانم تەختی بەلقیسات لەماوەی کەمتر لە چاوتروکانێك بۆت بگوازمەوە: ﴿أنا آتيك به قبل أن يرتد إليك طرفك﴾ [3].

پێشەوا عەلی (علیه السلام) کاتێ دەروازەی خەیبەری دەرهێناو بەرزی کردەوە کەبە (۷) کەس نەدەجووڵا فەرمووی: (والله ما قلعت باب خيبر بقوة جسدانية ولكن قلعته بقوة ملكوتية، ونفس بنور ربها مضية) [4]. (النور) واتە: وزە یان هالەی گیانی.

(د. ا. ج. رایز) دەڵێ: (لێکدانەوەی ئەمکارە نائاسایی یانە ئەوەیە هەندێ کەس ناوچەیەکی کارەبایی موگناتیسی دەوری لەشی داون ئەم ناوچەیە بەرپرسە لەمکارە نائاساییانە) وەکو لە (عصر الخوارق/ ل۸۹)دا باسی کردووە.

دووریش نییە داوود بەرێگای کورەش ئاسنی گەرم کردبێ و نەرمی کردبێتەوەو زرێی لێ دروست کردبێت.

---

(۱) حروب العقل، ت. سمير محمد، مراجعة: د. سمير النعمة، ل۱۳۰.

(۲) هەمان سەرچاوە، ل۵۰.

(۳) النمل: ٤٠.

(٤) تفسير ابن عربي، ج۱، ل۲۰۷.





## ١١١- چۆن ئاسن دەردەهێنرێ؟
## ١١٢- چۆن ئاسن نەرم دەكرێ؟

**﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ ابْتِغَاء حِلْيَةٍ أَوْ مَتَاعٍ زَبَدٌ مِّثْلُهُ﴾[1].**

واتە: ئەو كانزایانەی ئاگری بەسەردا هەڵدەكەن بەمەبەستی خشڵ و كەلوپەل كەفێكە وەكو (كەفی ئاوە).

لێرەدا قورئان ئاماژە دەكات بەتواندنەوەی كانزاكان وەكو ئاسن و مس و زێڕو زیوو لادانی خڵتە لە كانزاكان.

دیارە وەكو باسمان كرد ئاسن و زۆرێ لە توخمەكان بەپاكژی لە سروشتدا نین و تێكەڵی توخمی ترن كەبە خڵتە (الشوائب) ناسراون و قورئان بە (الزبد) ناوی داون واتە: كەف و خڵتەی سەرئاو.



### چۆن ئاسن نەرم دەكرێتەوە بەئاگر، یان كورەی موشەدەمە؟

وەكو باسمان كرد بەبەكارهێنانی هەڵمی ئاو ئەوچینە گڵە لادەبردرێ و بەتەقەمەنی كەرەستە خاوەكان دەشكێنرێ بۆ كارگەی ئاسن دەبرێت،بەڵام لەهەندێ شوێندا كانەكان كراوە نین لەژێر زەویدان و خەرجی زۆرتیان دەوێ بۆ دەرهێنان.

كەرەستەی خاوی ئاسنەكە دەشكێنرێ، بۆیە (زولقەرنەین) وتی:

---

(١) الرعد: ١٧.



(آتوني زبر الحديد) واته: پارچه ئاسـنەکم بدەنێ، دیاره کە شکێنراوه.

لەرێگای نوێدا و موشەدەمەکردنی ئاوایه: بەرێژەیەکی دیاریکراو تێکەڵ بەبـەردی کلـس و ورده خەڵوزی کول دەکرێ، تێکەڵە کە گەرم دەکرێ وەکو خوا فەرموویەتی: ﴿وَمِمَّا يُوقِدُونَ عَلَيْهِ فِي النَّارِ﴾ یان ﴿حَتَّى إِذَا جَعَلَهُ نَاراً﴾[1]. ئاوو مادده بێگانەکان وەکو گۆگردو زەرنـیخ و کـاربۆن بەم گەرم کردنە دەردەکرێن کە قورئان بە (الزبد) ناویان دەبات، تێکەڵەکە لەســەرووی کورەکـەوە دەکرێتە ئاوێ وە لەژێریشەوە تەوژمەکی بەتین لەهەوای گەرمکراوی پیا دەبرێت.

خەڵووزی کورەکە بەهەوا گەرمەکە دەسووتێ و یەکەم ئۆکسـیدی کاربۆن و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن پەیدا دەبێ، کاتێ دووەم ئۆکسیدی کاربۆن بەرز بۆوە بۆسەرەوەی کورەکە لەگـەڵ کاربۆنـە گەرمەکەدا کار لێکدەکەن و دەبێ بەیەکەم ئۆکسیدی کاربۆن، لەناوەڕاستدا لەشوێنەکی تایبـەتی کورەکەدا بەهۆی کاربۆن یان یەکەم ئۆکسیدی کاربۆن ئۆکسـیدی ئاسنەکە دەبێ بە کانزای ئاسن و بەشلی لەبنی کورەکەدا کۆدەبێتەوە.

وەکاتێ قورئان دەفەرمووێ ﴿آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْراً﴾[2]. ئاماژە دەکات کە ئاسـنی پاکـژ وەکو ئاسـنی داڕێژراو سفت و قایم نییە وەکو داڕژاوی مس و ئاسن پێکەوە.

## ١١٣- لەدەستدانی نەرمی کانزاکان (لدونه الفلزات):

قورئان دەفەرمووێ: ﴿وَلَقَدْ جَاءَكُم مُّوسَى بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ اتَّخَذْتُمُ الْعِجْلَ مِن بَعْدِهِ وَأَنتُمْ ظَالِمُونَ﴾[3].

واتە: بەڕاستی موساتان بۆهات ئەی جولەکەکان بەچەندان مـوعجیزەوە پاشـان دوای ئـەو گوێرەکەتان کرد بە خوای خۆتان و ئێوە ستەمکاربوون.

بەڵێ جولەکە زۆر کەوتنـە ژێـر کاریگـەری میـسرییەکان لەوانـە کەنعانییـەکان کـەزۆری

---

(١) الكهف: ٩٦.

(٢) الكهف: ٩٦.

(٣) البقرة: ٩٢.



لەگیاندارنیان پەرستووە و بەپیرۆزیان داناون، وەکو (ول دیورانت) لە (قصة الحضارة/ ج٢، مجلد١، ل١٥٨)دا دەنووسێ: (ئەوان گوێرەکەو بزنیان بەپیرۆزییەکی تایبەتی سەیر کردووەو بەهێمای هێزی جنسی بنیاتنەریان داناوە).

وە میسرییە کۆنەکان تیمساح و داڵ و پەرەسێلکەو سەگلاوو ماریان پەرستووە).

بەڵام بابلییەکان لە (موسڵ)دا یان (سنجار)دا: (ئەنو) و (شمش) و (نتار) و (بەعل) یان پەرستووە واتە: (ئاسمان و خۆرو مانگ و زەوی کە بابلییەکان دوای مردن دەچنە ناویەوە)[1].

هەربۆیەش موسا بەرەو رووی ئەوجۆرە خوایە درۆیینانە بۆتەوە، ئینجا بەرلەودا یوسف لەمیسردا، وە ئیبراهیم لە کوردستاندا، ئینجا ئیلیاس دژی پەرستنی خۆرو مانگ و بەعل بوونەوە وەکو لەگەردوونناسیدا باسمان کرد، ﴿وَإِنَّ إِلْيَاسَ لَمِنْ الْمُرْسَلِينَ * إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِ أَلَا تَتَّقُونَ * أَتَدْعُونَ بَعْلاً وَتَذَرُونَ أَحْسَنَ الْخَالِقِينَ﴾[2].

هەندێ پێیان وایە ئیلیاس لەئەردەن بووە لەشاری (عجلتون) و هەیە دەڵێ لە (بعلبك) بووە لەلوبنان، دیارە ئیبراهیم دوای هێنانەوەی بەڵگەی زانستی و لۆژیکی بۆ گەلەکەی و ناساندنی خوای تاقانە بەئەوان و پوچ کردنەوەی بیری بت پەرستی هات بتەکانی شکاندن، تا بزانن چۆن خوا دەشکێنرێ و ناتوانێ بەرگری بکات.

ئینجا موساش هەمان رێچکەی باپیرەی رەچاوکرد بەرێگایەکی زانستی گوێرەکەی سامری کەلە زێڕ دروست کرابوو شکاندنی و پارچەکانی کردییە دەریاوە: ﴿وَانظُرْ إِلَى إِلَهِكَ الَّذِي ظَلْتَ عَلَيْهِ عَاكِفاً لَّنُحَرِّقَنَّهُ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُ فِي الْيَمِّ نَسْفاً﴾[3].

واتە: سەیری خوایەکەت کە دەتپەرست دەیسوتێنین پاشان وردوخاشی دەکەین و دەیخەینە دەریاوە چۆن وردوخاش کردنێ.

بەڵێ لەرووی کیمیاییەوە: (کانزاکان بەگەرم کردنەکی ئاسایی توانایان هەیە بۆ پێکهاتن،

(١) الله ذاتا موضوعا، عبدالكريم الخطيب، ل٧٩.
(٢) الصافات: ١٢٣-١٢٥.
(٣) طه: ٩٧.





بەلام گەر زۆر گەرم کراو لەهیکرا ساردکرایەوە زۆریٚ لە نەرمییەکەی (اللدونـە) لەدەست دەدات کە کانزاکان هەیانە و دەبیٚ بەشتەکی خاوو لەبەر زۆرساردکردنەوە وردوخاش دەبێت.

قورئان لەبەسەرهاتی (سامری)دا ئاماژە بۆئەوە دەکات، کە گوێرەکەیەکی پەیکەرییان بـۆ لەزێڕ دادەرێژیٚ، موسا فەرمانی کرد زۆر گـەرم بکـریٚ پاشـان بەسـاردکردنەوەی زۆر وردوخـاش بکریٚ و فڕیٚ بدرێتە ناو ئاوەوە[1].



## ١١٤- مس (النحاس) سوودەکان:

رابـردوو ئاماژەیـەکی کورتمـان لەراسـت (مـس)دا باسـکرد، کـاتیٚ ئاوێتەی ئاسن دەکرێت بۆ قایکردن و توندو تۆڵکردنی.

قورئـانی پـیرۆز فەرموویـەتی: ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ فَلَا تَنتَصِرَانِ﴾[2].

واتە: ڕەوانـە دەکاتـە سـەرتان پارچـە گـڕاوی ئـاگرو مـس و سەرناکەون. لێرەدا ئاشکرایە کە: (شـواظ) زاراوەیـەکی گەردوونناسـییە و ئاماژەیـە بـۆ پارچـە گراوی خۆری (الشواظ الشمسي- prominence) کەلە شێوەی پارچـە گـازی ڕوونـاکی بـەخش دوور لە خۆر دەردەچن بۆ دووری (٥٠٠) کم و هەندیٚ دەردەچن و هەندیٚ دەگەڕێنەوە ناو خۆر.

هەروەها ئاماژەیە بۆ پەڵەی خـۆری پرشـنگدار، وە ئاماژەیـە بۆرەشـەبای خـۆری (الريـاح الشمسي – solar winds) کەلە شێوەی تەنۆلکەی بارگاوی کارەباییدا یـان بەشـێوەی تیـشك

(١) الموسوعة الذهبية، أ. د. أحمد مصطفى المتولي، ل٢٦٤.

(٢) الرحمن: ٣٥.



بەخێرایی تیشك دەڕوات، کەکار دەکاتە سەر هەوای زەوی و تەشویشی پەیوەندییەکان و زۆربوونی گەردەلوول و بارانی ناوەخت و کار لە کەشتییەوانەکان و کەشتی ئاسمانی دەکات و کار لە چینی ئۆزۆن دەکات و کونی دەکات، ئەو چینەی زیندەوەران لە توشهاتن بەتیشکی سەر بنەوشەیی دەپارێزێ، کە هۆیەکی سەرەکی زیادبوونی نەخۆشی شێرپەنجەی پێستە.
بەهۆی کونبوونی ئۆزۆن لەسەدەی بیستەمدا خەڵکی لەئەمریکادا زۆر تووشی شێرپەنجەی پێست هاتن[1].

وە خودا لەراست چینی ئۆزۆن و (پشتێنەی ڤان ئالن) دەڵێ کە زەوی لەتیشکی کەهرۆموگناتیسی و شوهبەکان و بای خۆری دەیان پارێزن دەفەرمووێ: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاءَ سَقْفاً مَّحْفُوظاً وَهُمْ عَنْ آيَاتِهَا مُعْرِضُونَ﴾[2].

دیارە کرۆکی زەوی کەزۆربەی ئاسن و نیکلە ئەو بوارە موگناتیسییە دروست، دەکات بۆ پاراستنی زەوی لەگڕو رەشەبای خۆر[3]. وەکو باسکرا.

وشەی (النحاس) وەکو لە (الکشاف)دت باسکراوە بەدوو مانا هاتووە: (مس) و (دووکەڵ).

مس کەمەکی لەتوێکڵی زەویدا هەیە و ناگاتە (٠,٠١%) وە مس بەزۆری لە کەرەستەی خاوی (گۆگردیدی ئاسنی مس) و (گۆگردی مسۆز) دەردەهێنرێت، وە مس تاکە کانزایە سووربێت، لەپلەی (١٠٨٣)°س دا شل دەبێتەوە، خەستییەکەی (٨,٩٢گم/ سم) بەئاسانی دەتوانرێ بەراکێشان بکرێ بەتەل و تەبەق و دوای زیو باشترین گەیێنەری کارەبایە.

وەکو باسکرا مس بەباشی کارەبا دەگەیەنێ و بەرگەی ژەنگ دەگرێ و هێزێکی میکانیکی چاکی هەیە، بۆ تەلی کارەباو تەلەفۆن و پیشەسازی تری کارەبا سوودی لێ دەبینرێت، ئینجا وەکو زیو بۆ زیندەوەرانی وردە ژەهرە، بۆیە بۆئەو مەبەستە سوودی لێ دەبینرێ، وە مس یان

(١) الموسوعة الفلكية الحديثة، عماد مجاهد، ل١٢٨.
(٢) الانبياء: ٣٢.
(٣) علم الارض، الك سمث، ل١٥.




دارشتەی برۆنز لەجیاتی بۆری ئاسن یـان قورقوشـم کـەئاو پـیس دەکـەن بـەکار دەهێنرێت بـۆ ڕاکێشانی بۆری ئاو، وە بـۆ زۆر دارشـتە سـوودی لـێ دەبینـرێ وەکـو (برۆنـز و بـراس و زیـوی نەڵمانی).

## ١١٥-١١٦-١١٧- یاقووت و مەرجان و مرواری و زبرجەد:



خوای گەورە لەقورئانی پـیرۆزدا (حۆریەکان) کە هاوسـەرانی بـڕوادارن لەبەهەشتدا لەجوانی و شۆخ و شەنگی و نرخ و بەهادا بە (یاقووت و مەرجان و مرواری)یان دەچـوێنێ، تـا سـەرنجی بڕواداریان بۆلا ڕابکێشێ و هەوڵبـدەن ئەو ئاسك و ئازدارانە لەدەست نـەدەن و بڕواو کرداری باشی بۆ ئامادە بکەن. ﴿كَـــأَنَّهُنَّ الْيَـــاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾[1]. ﴿ وَحُورٌ عِـينٌ * كَأَمْثَـالِ اللُّؤْلُؤِ الْمَكْنُونِ﴾[2].

پێغەمبـــەر (ﷺ) لەراســـت ئایەتی ﴿كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾ فەرموویـەتی: (تەماشـای دەمـو چـاویان دەکـات لەناوێنـە سافترە، کەمترین مرواری لەسەریان بۆ نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوا پرشنگ دەدات).

(ئەحمەد گێڕایەوە) و (أم سلمه - ر) گێڕایەوە لەراسـت ئـەم ئایەتـە لەپێغەمبـەرم پرسـی (ﷺ): (كأنهن الياقوت والمرجان)؟ فەرمووی: (صـفاء كصفاء الـدّر الـذي في الاصـداف والـذي

(١) الرحمن: ٥٨.

(٢) الواقعة: ٢٢-٢٣.

لاتمسە الایدي) (الطبراني) گێڕایەوە، واتە: وەکو مرواری روونن کەلە گوێچکە ماسی (الصدف)دایەو دەستی لێ نەدراوە.

وە (الترمذي) گێڕایەوە لە (ابن مسعود – ر): (أن المرأة من نساء الجنة یری بیاض ساقها من وراء سبعین حلة، حتی یری منها وذلك ان الله تعالی یقول: ﴿كَأَنَّهُنَّ الْيَاقُوتُ وَالْمَرْجَانُ﴾ فاما الیاقوت فانه لو ادخلت فیه سلكا ثم استصفیته لرأیته من ورائه).

واتە: ئافرەتانی بەهەشت لەدوای حەفتا پۆشاکەوە سپیایی قاچیان دەبینرێ و تا مۆخییان دەبینرێ، بۆیە خوا فەرموویەتی: ﴿ئەوانە یاقووت و مەرجانن﴾ یاقووت بەردێکە گەر داوێکی تێ بکەی پاشان پاکژی بکەیتەوە داوەکە دەبینیت لەدوایەوە.

(احمد) و (الترمذي) لە (ابی سعید الخدری – ر) گێڕاویانەوە: (ان ادنی اهل الجنة منزلة، الذي له ثمانون الف خادم، واثنتان وسبعون زوجة، وینصب له قبة من لؤلؤ ویاقوت وزبرجد كما بین الجابیة وصنعاء) واتە: نزمترین ناستی بەهەشت کەمرۆڤ دەچێتە ناویەوە هەشتا هەزار خزمەتکاری هەیە، گومەزێکی بۆ دادەچەقێنرێ لەمرواری و یاقووت و زبرجدە، وەکو نێوان جابیەو سەنعایە.

(زەبرجد) زمروتە، چەند جۆرێکی هەیە، ئەم بەردە بەنرخەیان سەوزی زەردباوە، یان شینە، یان زەردە، یان سەوزە، لەسلیکاتی بریلیۆم و ئەلەمنیۆم یان سلیکاتی ئاسن و مەگنیسیۆم و کرۆم پێك دێت.

یاقووت: گەواهیرێکی بەنرخە و لەهەمووان جوانترو بەبەهاترەو چەند جۆرێکی هەیە، یاقووتی سوور لەهەمووان بەنرخترە، ئینجا شین، ئەم دووانە چەند بەردێکی روونن لەدوای پارچەکردنیاندا بنەمای کیمیایی یاقووتی سور بۆ ئۆکسیدی ئەلەمنیۆم (A ١٢,٣) دەگەڕێتەوە.

مەرجان وەکو رابردووش باسکرا کەبەشێکە لەخشڵ و جوانی گیاندارەکی دەریایی دروستی دەکات لەشێوەی درەخت دایە و زۆربەیان لەقوولایی دەریاکانی باشوورەوە دێن، هەرچی مروارییە بەردێکی هەرە بەنرخەبۆ سوودو جوانی دووجۆری هەیە: جۆری گەورە بە (دور) دەناسرێ و بچووکەکە بە مەرجان، ئەم مروارییە لەناو سەدەف یان گوێچکەماسیەکاندا دروست دەبێ کە

گیاندارێکی نەرمۆڵەیە (الرخویە) و لای عەرەب بە (المحار – ذوات المصراعین) ناسراوە، ئەم گیاندارە دەتوانێ کاربۆناتی کالیسیۆم (caco۳) لەدەریادا رابکێشێ و بیخاتە ناو سەدەفەکەی و ماددەیەکی لینجی سپی بەسەریدا بڕێژێ و رەق بێ و بەهۆی تیشکدانەوەش چەند رەنگێ بدات. بێ گەردێ بۆنەو خوایەی زانست و تواناو شکۆو جوانی لەهەموو شتێدا خۆی دەنوێنێت.

یان (فەیروز) هەیە کە شینەکی جوانە و لە کبریتاتی ئەلەمنیۆمی مسی پێك دێت. بەمشێوە بەردە بەنرخەکانیش کانزای خاون و شێوەو پێکهاتەی کیمیایی خۆیان هەیە[1].

ئەم کانزایانە لەجیهاندا بەهایەکی گرنگی ئابووریان هەیە، کە هەریەکەیان بەرێگای جیاجیا دروست دەبن، بەڵام زۆربەی کانزا خاوە سەرەکییەکان جگە لە ئاسن لەجیهاندا بەکاریگەری تاوێری ئاگرین دروست دەبن، زۆری لەو کەرەستە خاوانە کەبەهادارن نیشتوون وەکو (مس و خۆڵەمێش و زنك و فافۆن و جیوەو زیو کە گیراوەی ئاوی گەرمن (المحالیل المائیە الحراریە – hydrothermal) لەم تاوێرە گەرمانەوە هەڵقوڵیون لەکاتی ساردبوونەوەیاندا یان رەگی کانزاییە یان کەرەستەی خاوە لێرەو لەوێ بڵاو بوونەوە[2].

## ١١٨- سەرچاوەکانی وزە بەگشتی:

## (١١٩-١٢٠-١٢١): کەرەستە خاوەکانی سووتەمەنی (خەڵوز، نەوت، یۆرانیۆم).

زانای جیۆلۆجی (ئەلك سمث) دەڵێ: (ئەوەی بابای ئیمڕۆ پێویستی پێیەتی- نەوت، خەڵووز، یۆرانیۆم و کانزاکان و ئاوو هەتا چەوو لم)[3]. ئێمەش بەپێویستمان زانی ئاورێ لەم سێ کەرەستە بەنرخە بدەینەوە، بەتایبەتی زێڕی رەش کە نەوتە.

سووتەمەنی وەکو ئاوو هەوا یەکێکە لە پێویستییەکانی ژیان رووناکی و گەرمی وزە

---

(١) کمال نامە، کەمال جەلال غەریب، التربیة الاسلامیة، ٩، چ ٢٠٠٢، بغداد، ل٥٢-٥٧، کوکب الارض، د. حسن سید احمد ابو العینین. (کنوز العلم، ولیم ڤرجارا، ت: د. السید رمضان هدارە، ل٢٦٥.

(٢) علم الارض، ل٩-١٢٨.

(٣) هەمان سەرچاوە.



دەدات و ژیان ناتوانێ بەبێ ئەوە بەردەوام ببێت، بێگومان سەرچاوەکانی وزە گەلێ زۆرن وەکو (تیشکی خۆر، گەرمایی ناو زەوی، وزەی ئەتۆمی، با، سووتەمەنی) ئەمانە بۆ بەدەستهێنانی پێشکەوتنی ئابووری کۆمەڵگا زۆر گرنگن، بەبێ ئەوە چالاکی ئابووری دەوەستێت.

خۆر: کە خوا سوێند بە رووناکییەکەی دەخوات ﴿وَالشَّمْسِ وَضُحَاهَا﴾[1]. بۆ گەرمکردنەوەی ماڵ و ئاو گەرمکردن و بەکارهێنانی دەزگای چێشت لێنانی وزەی خۆری و دلۆپاندن و فرنی گەرمایی و بەدەستهێنانی وزەی میکانیکی و کارەبایی و هیتر سوودی لێ وەردەگیرێت، دیسان بۆ کشتوکاڵ پەروەردەی گژوگیا و قەوزەی دەریایی و شیکردنەوەی ئاو بەکاردێت، کە بەبواری کیمیایی رووناکی ناودەبرێت، وە بەکاردێ بۆ مەسەلەی کارەبایی و پاتری کارەبایی وێنەگرتن و پاتری خۆری و کرداری کارەبایی و گەرمی تردا.

گەرمی ناخی زەوی کەلە بوورکانەوە یان نافوورەی گەرمەوە دێ توربینات و دەزگای تر دەخاتە گەڕ وەکو لەنیوزلەندا و ئەمریکا، دیسان بۆ گەرمکردنەوەی ماڵ و کێڵگەی کشتووکاڵی و شتی تر سوودی لێ دەبینرێت.

ئیمڕۆ وزەی ئەتۆمی (الطاقة الذرية) هەیە کە وێستگەی کارەبایی گەرمین و لەزۆر بوازدا بەکاردێ، لەبواری پزیشکی و بەرهەمی پیشەسازی و پاراستنی خۆراك و سازگارکردنی ئاو (تحلية الماء) و لەجیاتی خەڵووزی (کوك)یش بەکاردێ لەپیشەسازی کانزاییدا وەکو پۆڵاو بواری تردا.

سەیرکە (١ گلم) ئەوت کەباشترین سووتەمەنییە (١١,٦) کیلۆوات وزەی گەرمی دەدات- لەکاتژمێرێکدا، کەچی بڕی ئەو وزەیەی لەتبووتی ناوکی ئەتۆمی یۆرانیۆم (٢٣٥) دەیدات (٢٢,٩) ملیۆن کیلۆ واتە-س.

بەڵام یەکبوونی ناوکی (الاندماج النووي) یەك کیلۆ گرام هیدرۆجینی ژمارەیەکی سەیر دەدات کە (١١٧,٥) ملیۆن کیلۆواتە-سەعات، بەمشێوەیە سروشت بڕەکی زۆر وزەی

---

(١) الشمس: ١.




شاردۆتەوە، لەقەبارەیەکی زۆر بچووکدا، لەوانە گەردیلە (ئەتۆم)[1]. هەربۆیەش خواوەند بوونەوەر بەرووناکی وزە ناوزەد دەکات و دەفەرمووێ: ﴿اللَّهُ نُورُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ﴾[2]. واتە: خوا سەرچاوەی رووناکی ئاسمانەکان و زەوییە.

خوای مەزن لەچوار جێگادا لەقورئاندا وشەی سوتەمەنی (الوقود)ی بەکارهێناوە، لەوانە: ﴿النَّارِ ذَاتِ الْوَقُودِ﴾[3]. واتە: ئاگری خاوەن سووتەمەنی، ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾[4]. واتە: خۆ لەو ئاگرە بپارێزن کە سووتەمەنییەکەی مرۆڤ و بەردە.

بەڵێ ئاگر سووتەمەنییەکەی مرۆڤە و تاوێرە لە ناخی زەویدا، ئەوەتا وەکو باسکرا ناخی زەوی ئەوەندە گەرمە تاوێرەکان دەتاوێنێتەوەو بەتاوێری ئاگرین (الصخور الناريه) ناسراون..

خوای گەورە تەواوی گەردوونی لە وزەو ماددە دروست کردووە وەکو فەرموویەتی: ﴿ثُمَّ اسْتَوَى إِلَى السَّمَاء وَهِيَ دُخَانٌ﴾[5].

واتە: کاتێ خوا ویستی ئاسمان دروست بکات دووکەڵی بوو، دووکەڵ یان سەدیمی گازی لەتەقینەوە گەورەکەدا گەردوونی دروست کرد.

لەم وزەیە ماددە دروست بوو لەگەڵ چوار هێزەکاندا، ئەم وزەو ماددەیە تەنیا (٥٪)ی بوونەوەریان دروست کرد و زەمەنێکی لەگەڵ خۆیدا داهێنا کە یانزە دووری هەبێ، کەچی (٩٥٪)ی بوونەوەر ماددەیەکی ساردەو وزەیەکی تاریکەو هیچی دەربارە نازانین[6].

خوای گەورە راستەوخۆ ئاماژە بەم راستییە دەکات و دەفەرمووێ: ﴿الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي خَلَقَ

---

(١) الانسان والبينة/ ام هولي، ت: عصام عبداللطيف، ل٨٦-٨٩، الذرة من الالف الى الياء، ك: كلاد كرف، ت: عبدالرزاق المخزومي، ل٢٥.

(٢) النور: ٣٥.

(٣) البروج: ٥.

(٤) البقرة: ٢٤.

(٥) فصلت: ١١.

(٦) موجز تأريخ الكون، هاني رزق، ل١٧٧.

السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَجَعَلَ الظُّلُمَاتِ وَالنُّورَ﴾[1].

واتە: سوپاس بۆ ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەویی دروست کردو تاریکییەکان و رووناکی دانا، ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ * نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ * الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِدَةِ * إِنَّهَا عَلَيْهِم مُّؤْصَدَةٌ * فِي عَمَدٍ مُّمَدَّدَةٍ﴾[2].

واتە: تۆ چونی تێکشکێنەر چییە؟ ئاگرێکی داگیرساوی خوایە، هەڵدێ بەسەر دڵاندا، ئەو لەسەریان داخراوە، لەستوونەکی راکشاودا، بەڵێ ئەمانە هەمووی سیفەتەکانی تیشك وزەیە وەکو تیشکە کەهرۆموگناتیسییەکانلەخۆردا، کەتوانای تێکشکاندن یان هەیە، دەتوانن وەکو نێکس وەکو لەنەخۆشخانەکاندا بەکاردێ بەسەردڵان هەناواندا هەڵێ، ئینجا تیشك ستوونی راکشاوە.

خودا لەراست وزەی باو ئاو فەرموویەتی: ﴿جَاءَتْهَا رِيحٌ عَاصِفٌ وَجَاءَهُمُ الْمَوْجُ مِن كُلِّ مَكَانٍ﴾[3].

ئاو: چاوگی سروشتی ژینگەیە هەڵگری وزەیەکی میکانیکو و کیمیایی و گەرمییە، دەکرێ وزەی میکانیکی ئاو بۆ وزەی چڕبوویەوەی هەواو وزەی بارستایی بەستەڵەکی و وزەی تەزوەکانی ئاوی وزەی دەریاکان دابەش بکرێت، وزەی دەریایی زۆر مەزنە کە هەڵکشان و داکشان شەپۆلەکانی پەیدا دەکات، لەرووسیادا وێستگەیەکی ئەزمونی بۆ سوودوەرگرتن لەوزەی هەڵکشان دانرا لەکەنداوی (کیسلا کوبا) کەتوانای وزە پەیداکردنی (٨٠٠) کیلۆوات بێ، دیسان زێیەکان و ئاو لەجیهان و لەکوردستانیشدا وێستگەیەکی باشی پەیداکردنی کارەبان وەکو زێی دوکان و زێی گەورە.

با: هەوا لە هەوای ژینگەی ژیاندا هەمیشە لەبزووتنەوەدایە، هۆی ئەم جوولەیەش و وەکو لە گەردووننانسیدا باسمانکرد ...... دابەشبوونی پاڵەپەستۆی هەوایە لەئاسۆدا.

---

(١) الانعام: ١.

(٢) الهمزة: ٥-٩.

(٣) یونس: ٢٢، رابردوو ماناکراوە.




فشارەکە (الضغط) بنەمای هێزەو جووڵەی هەوا پەیدا دەکات، جیاوازی پەستانیش تیشکی خۆر پەیدای دەکات، ئەم وزە میکانیکییە دەتوانێ ماتۆڕی هەوایی بجووڵێنێ بەمەش دەتوانێ جۆرەها ئامراز بخاتەگڕ وەکو وێستگەی کارەبایی هەوایی و وێستگەی هەڵێنجان (الضخ) و ئاشی هەواو شتی تر.

بەزۆری وزەی (با) لەوناوچە دەریاییانە بەکاردێ کە هەمیشە پێیدا هەڵدەکات وەکو (بەریتانیا و روسیاو ئۆکرانیاو هۆڵەندا).

سووتەمەنی (الوقود): ئەو کەرەستە سروشت و پیشەسازییە خەڵوزیە لەکاتی سووتاندنیدا لە ئاگرداندا بڕەکی زۆر گەرمی دەدات، وزەی کیمیایی شاراوە لەسووتەمەنیدا بەهۆی سوتان دەگۆڕێ بۆ وزەیەکی گەرمی، واتە بەهۆی کرداری بەئۆکسیدبوون، کە ئۆکسجینی بەرەڵا لە هەوادا بەشداری دەکات لەگەڵیدا[1].

خەڵوز: قورئانی مەزن لەراست سووتەمەنی خەڵووزو تەختەدا دەفەرمووێ: ﴿الَّذِي جَعَلَ لَكُم مِّنَ الشَّجَرِ الْأَخْضَرِ نَاراً فَإِذَا أَنتُم مِّنْهُ تُوقِدُونَ﴾[2].

واتە: ئەو خوایەی بۆی لەداری سەوز ئاگر دروست کردووە کاتێ ئێوە دایدەگیرسێنن، لێرەدا قورئانی مەزن بۆ زانایان و شارەزایان لەبواری جیۆلۆجیاو کیمیادا چەند ئیعجازێ دەخاتەروو، هەم بۆ بایۆلۆجی و رووەکزانەکان:

## ١- رووەکی سەوز و گەڵاکانی کۆگای وزەن:

زاناکان سەلماندوویانە یەک خانەی سەوز کەکلۆرۆ فیلەکەیەتی لەیەک خولەکدا لەکاتی دانەبەرتیشکی (٢٠) ئاوێتەی کیمیایی خۆر بنیات دەنێ ، رووەك زۆرەی خۆراکی لەئاوو هەندێ ماددەی کانزایی و ئەندامی وەردەگرێ، لەهەموویان پتر کاربۆنە کە گازی خەڵوزەو بەشداری دەکات لە پێکهێنانی رووەکدا.

---

(١) بەکورتکردنەوە سوود لە (الانسان والبیئە/ ام. هولی، ل٩٠-٩٦، وەرگیراوە.

(٢) یس: ٨٠.







خەڵکی وادەزانن لەش و لاری رووەك لەخاك دروست دەبێ، کەچی وانییە لەو کارگە مەزنە دروست دەبێ کەلە گەڵای سەوزدا دایناوە.

٢- درەختی سەوز ناسووتێ، بەڵکو تەختەو دارو چیلکەی وشك گڕدەگرن، بەڵام گەر ئەم ماددە سەوزەو کلۆروفیلە نەبوایە ئەم درەختە دروست نەدەبوو.

٣- هەندێ سەرژمێری زانستی دەڵێن: کۆی سەوزاییەکانی زەوی (١٠٠) بلیۆن تەن لەگازی خەڵوزو (٢٥) بلیۆن تەن هایدرۆجین بۆ کەرەستەی خۆراك دەگۆڕن، وەبۆ (١٠٠) بلیۆن تەن هایدرۆجین تا هەوابەرێکی هاوسەنگی ئۆکسجین و ئازۆت و کاربۆن رابگرێت[1].

٤- ئاماژە دەکات چۆن و بۆچی تەختەو دار دەسووتێ؟ بۆچی لەخۆوە ئەو بڵێسەیە بەردەوام دەبێت؟ زانست دەڵێ: ئەم پێکهاتووانە لەگەردیلەی هایدرۆجین و کاربۆن پێك دێ،

(١) آيات الله في الافاق، د. محمد راتب النابلوسي، ل٢٢٧-٢٣١، بەکورتکردنەوە.




کەبەیەك گرتنیان لەگەڵ ئۆکسجینی هەوادا دادەگیرسێن[1].

کەواتە: ئەم ئاگرە حەشاردراوە وزەی خۆرەکە خەزنی دەکات، دووەم کاربۆن و هایدرۆجینە کەوەکو ئاگرەکی شاراوە یان ماتەوزە لەرووەکدایە.

٥- ئاماژە دەکات دارودرەختەکان چاوگی خەڵوز (الفحم)ن لەزەویدا: (زۆربەی سووتەمەنی کە دەیسووتێنین لە خەڵووزو چەوری و گەلان تا دوا پێکهاتەکانی لەماددە زیندەگییەکان، بۆنموونە خەڵووز لەئەنجام رووەکەکانی بەرلەمێژوو دروست بووە، هایدرۆکاربۆنات کەلە پێکهاتەی هایدرۆجین و کاربۆن پێك دێ پێویستی بەوزەی خۆرە بۆر پێکهاتنی، ئەم وزەیەش لەسووتەمەنیدا عەمبار کراوە، کاتێ هایدرۆکاربۆنەکان شی دەبنەوە بۆ ماددەی سادەتر و چەسپیوتر وەکو هەڵمی ئاوو دووەم ئۆکسیدی کاربۆن گەرمایی دەرد ‌ەپەرێت، وە پێویستە بۆ بەکارهێنانی ئاگر دەنکە شخاتە یان چاوگی تری گەرمی بەکاربێنین، ئەمەش دەبێتە هۆی شیبوونەوەی هایدرۆکاربۆنات بۆ هایدرۆجین و کاربۆن، ئەم دووانەن یەك دەگرن بەخێرایی لەگەڵ ئۆکسجیندا بۆ پێکهێنانی ئاوو کاربۆن، ئەم گەرمییە بەردەوام دەبێ و: برەکی تر هایدرۆکاربۆنات شی دەکاتەوە تا تەواوی سووتەمەنییەکە دەسووتێ، ئاکامی ئاگرەکە برە وزەیەك فڕێ دەدات زۆر کەمترە لەو هایدرۆکاربۆنەی سووتاوە، بۆیە بەشێوەی گەرمی ئەم وزە فڕێ دەدات[2].

## ١٢٢- ( پترۆڵ ):

پترۆڵ (النفط): (وشەی پترۆڵ لەدوو وشە پێك دێت: (patra) واتە: تاوێر، (oleum) واتە: چەوری (الزیت) دوو وشەی لاتینین، واتە: ·چەوری تاوێر) واتە: نەوت لەکۆنەوە شتەکی ناسراو بوو تا لەچاخەکانی بەردینیشدا، میسرییەکان و خەڵکی پیرۆ بۆ مۆمیاکردنی مردووان بەکاریان هێناوە، دیسان ئاشوورییەکان و بابلییەکان و میسرییەکان لەبیناسازی و سواقدانی

(١) کنوز العلم، ل٢٧٥-٢٧٦، سەیر بکە بەکورتکردنەوە.

(٢) کنوز العلم، ل٢٧٥-٢٧٦، سەیر بکە بەکورتکردنەوە.



کەشتیدا سوودیان لێ بینیوە.

فارسەکان لە دوورگەی (تەبشیروت) ئاگری پیرۆزیان پاراستووە کەلەئەنجامی سووتانی گازەکان لەهەوادا هەڵگیرساوە، وشەی (النفط) لە (تەورات)دا هاتووە: (فأمره بأن يصنع فلكا من خشب قطراني ويدخله هو وعياله). يان (تجعل فلك مساكن وتطليه من داخل و خارج بالقار). لێرەدا خودا فەرمان بە (نوح) دەکات کەشتییەك لەتەختەی قەترانی دروست بکات و بەقیر دەرو ناوەوەی سواق بدات.

یان دایکی موسا وەکو لە تەوراتدا هاتووە خوا سروشی بۆ دەکات سندوقێ دروست بکات بەزفت سواقی بدات: (اخذت سفطا من بردي طلته بالحمر والزفت وجعل الولد فيه ووضعته بين الخزبان..)..

مێژوونووسی یۆنانی (هیرۆتس/ ٤٥٠ پ.ز) باس دەکات (لە ئەدریکا بیرێ هەیە سێ جۆر



مادده دەردەدات: (ئەسفلت و خوێ و چەوری) باس لەو چەوری و زەیتە دەکات: (پێی دەوترێ رادیناس کە رەشەو بۆنەکی بەهێزی هەیە).

(ابن بطوطة)ی گەشتیار باس دەکات لەنزیك دیجلە شوێنەکمان بینی پێی دەوترا (قەیارە) چەند سەرچاوەیەك هەبوو لەچەند خاکەکەی رەشدا بەقیر



دەناسرا[1].

بێگومان قورئان و فەرمودەکانیش لەچەند شوێنێدا ئاماژە بۆ پترۆڵ و جەنگی پترۆڵ دەکەن، لەوانە: ﴿وَلِسُلَيْمَانَ الرِّيحَ غُدُوُّهَا شَهْرٌ وَرَوَاحُهَا شَهْرٌ وَأَسَلْنَا لَهُ عَيْنَ الْقِطْرِ﴾[2].

لێرەدا قورئان ئاماژە بە سەردەمی سولەیمان دەکات کە تاکە جەمسەر حوکمی زەوی ئەوکاتەی کردووە کە بۆ وزە سوودی لە (با) و (القطر) بینیوە.

(د. عمادالدین الخلیل) دەڵێ: (القطر هو النفط) واتە: (القطر) لێرەدا پترۆڵە، واتە: چاڵە نەوت (عین القطر)[3].

(قطر- قطران الفحم): شلەیەکی نیمچە رەقی لینجی مەیلەو رەشە لەئەنجامی دڵۆپاندنی بەردی خەڵووزی بەردینە وە دەستگیر دەبێ بریتییە لە تێکەڵاوی چەند ماددەیەکی هایدرۆکاربۆنی چەور وەکو (بەنزاین و تۆلۆوین) ئەگەر بکوڵێنرێت زۆر ماددەی بەنرخی لێ وەردەگیرێت وەکو (نەوت) وەکو لەفەرهەنگی کەمالنامەدا هاتووە.

بەڵام هەرچی ئەمریکییەکان بوون لەسەدەی (١٨)دا نەوتیان دۆزیەوە، کە زۆربەی سەرئاوی خوێ دەکەوت، وە لەسەدەی (١٩)وە نەوت وەکو ئابووری سوودی لێ وەرگیراوە دەست بەلێدانی چاڵە نەوت کراوە، وەکو سووتەمەنی بەکارهێنراوە، لەقۆناغەکانی دواییدا کرایە پێشبڕکێ کەری خەڵووزی بەردینی، پاشان نەوت دوای پاڵاوتن زۆر بەشی تری لێ کرایەوە و بۆ بازاڕەکانی جیهان رەوانە کرا، ئەمەش هانی کۆمپانیاکانیدا زیاتر بەدوای نەوتدا بگەڕێن و چالاکی خەستر بکەنەوەو پاڵاوتەکان و کۆمپانیاکان فراوانتر بکەن، بۆ چالاکی پیشەسازی.

بێگومان خودا بە نوح (ﷺ) دەفەرمووێ: ﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلاً مُّبَارَكاً وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾[4]. واتە: بڵێ خوایە لەشوێنێکی پیرۆز پڕ پیت و بەرەکەتم دابەزێنە.

(١) دراسات عن الذهب الاسود، عزيز حسن الخفاج، بغداد ١٩٦٩، ل١٩-٢١، بەکورتکردنەوە.

(٢) سبأ: ١٢.

(٣) حول اعادة تشكيل العقل المسلم، د. عمادالدين الخليل، ل١٤٥.

(٤) المؤمنون: ٢٩.



ئەوەبوو خوای گەورە نزای گیراوکرد و ﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾[1]. لەسەر کێوی جوودی لەکوردستاندا لەنگەری گرت.

بەوپێیە خەڵکی کوردستان و دۆڵی دوزێ یەکەم کەسن ئاشنا بوون بە نەوت و سوودیان لێ بینییوە، دیارە وەکو باسمان کرد (نوح) ناوی کوردە بووەو تابلۆ دێرینەکانی کە دۆزرانەوە لەکوردستاندا (١٩٢٠) لەلایەن ئینگلیز، وە شاهێدی ئەوەن، وە ئیمڕۆش کوردستان نەوتەکی زۆرو یەدەکەکی کەموێنەی هەیە لەجیهاندا.

وە عێراق بەر لەجەنگی جیهانی دووەم (١٩٣٨-١٩٣٩) دووەم دەوڵەت بوو لەبەرامبەر دەوڵەتەکانی بەرهەمهێنەری نەوت لەخۆرهەڵاتی ناوەڕاستدا، بەڵام ساڵی (١٩٥٢) بەهۆی ئەو زیادە زۆرەی سەعودیەو کوێت و ئێران، عێراق گەڕایەوە بۆ ئاستی چوارەم، بەڵام لەئاست جیهاندا پلەی (٨)ی وەرگرت، وە بەڵێ تا ئیمڕۆش گرنگترین سەرچاوەی ئابووری و دارایی هەرێمی کوردستان و عێراق نەوتە، وە بڕوایە گەر تەنیا نەوتی کەرکوك دەربێنرێ و بەدادوەری داهاتەکەی دابەش بکرێ دەتوانێ (٥٠) ملیۆن کەس خۆشگوزەران بکات.

بەرهەمەکانی نەوتی پاڵاوتە:

١- گازە سووکەکان: بۆ چێشت لێنان و خۆ گەرمکردنەوەو رووناکی بەکاردێن.

٢- بەنزین (گازۆلین): بۆ سووتەمەنی ئۆتۆمبێل و فڕۆکەکان.

٣- نەوتی سپی (کیرۆسین): بۆ چێشت لێنان و گەرمکردنەوە.

٤- رۆنی گاز (گازۆییل): بۆ ئەو ئۆتۆمبێل و شەمەندەفەرانە بەکاردێت دیزلیان هەیە.

٥- نەوتی رەش: لەجیاتی رەژوو خەڵووز بەکاردێت.

٦- رۆنی چەورکردن: بۆ چەورکردنی ئامێرەکانە تا لێك نەخشێن پارچەکانی.

٧- (قیرش-ئەسفلت) بۆ قیرتاوی شەقام و بناغەی خانووەکان بەکاردێت.

٨- ئەلکەهول: شلەیەکی بێ رەنگە زوو دەسووتێ، بۆ هەندێ چرا بەکاردێت.

جۆرەکانی نەوت و خاسیەتەکانی:

(١) هود: ٤٤.



جۆرەکانی نەوت بەپێی جیاوازی ناوچە جیۆلۆجییەکانە، ئەو رێژە کیمیاییەن پێکی دێنێ دەیگۆڕێت، نەوتی خاوو شلەیەکی قاوەیی تۆخە یان کاڵەو رون نییەو لەبەر هەتاو بەرەنگی زەردی کراوە یان سوور دەبینرێت.

زۆرێ لەجۆرەکانی نەوت بەرەنگی سەوزی شین باو دەبریقێتەوە، بۆنەکی خۆشی هەیە، بەلام گەر کبریت و نایترۆجینی تێدابوو بەپێچەوانەوە، ئەو لەناو سووکترە و چڕیەکەی بەپێی جۆرەکانی دەگۆڕێت.

نەوت پێکهاتەی (هیدرۆکاربۆنە) و بڕەکی کەمیش نایترۆجین و کبریت و ئۆکسجینی تێدایە، بەمشێوەیە:

١- کبریت: ٨,٨٠٪، ٢- هایدرۆجین: ١٤,١٠٪، ٣- ئۆکسجین: ١,٠- ٧٪، ٤- کبریت: ٠,٠١-٥٪، ٥- نایترۆجین: ٠,٠٠٢-١,١٪.

تا هایدرۆجین لەنەوتی خاودا پتربێ سووکتر دەبێ و بڕی بەنزینی پتر دەبێ ـ تا ئۆکسجینی پتر بێ قیرو کەرەستەی راتنجی پتر دەبێ، گەر کبریتی زۆربوو لەنایابیەکەی کەمدەکاتەوە.

وە(غاز) کەلەگەڵ نەوتدا دەردەهێنرێت و زۆربەی (برافینیات)ە ژمارەیەکی نزمی گەردیلەکانی کاربۆنە، نەوغازەیە بەپێی ناوچەکانی عێراق لەراست نەوتدا دەگۆڕێت، لەکەرکوکی کوردستانی گەورەدا کەتا نیمرۆش داگیرکراوەو لەدایکی خۆی جیاکراوەتەوە شیکاری غازی لەچاڵە نەوتەکانی ئاوایە:

١- میتان: ($CH_4$) ٥٣,٧ لەقەبارەدا.

٢- ئیتان: $C_2H_6$ :$C_2H_6$).

٣- بروبان: $C_3H_8$: ٧,١).

٤- بیوتان: $C_4H_{10}$: ٥,٨٠).

٥- بنتان: $C_5H_{12}$، ٢,٤)

٦- هکسان: $C_6H_{14}$: ٢,٠).




٧- دووەم ئۆکسیدی کاربۆن $CO_2$: ١،٣).

٨- کبریتی هایدرۆجین $H_2S$: ٦،٤).

٩- ئەوگازانەی ناسووتێن......... ١،٠)[1].

## دروستبوونی نەوت:

کەس لەزانایان نازانێ سەرەتا چۆن نەوت دروست بووە، لەراست ئەمە زۆر تیوریان هەیە، ئەو تیورەی زیاتر پەسەندە ئەوەیە بەر لە دەیان و سەدان ملیۆن ساڵ لەئەندامانی دەریایی وردو رووەکی دەریایی دروست بووە، هەندێ توێژەران دەڵێن: سەرەتای نەوت لەوپاشماوە ئاژەڵیە ئاوییە لەناوچووانەوە پەیدابووە، کەلەناخی زەویدا بەهۆی گەرمایی و فشار شی بوونەوە.

زانای ئینگلیزی (engler) پاڵپشتی لەم تیۆرە دەکات، دوای ئەوەی دەتوانێ شلەیەکی وەکو پیترۆڵ لە پێکهاتەی دلۆپاندنی رۆنی ماسی لەپلە (٩٠٠٠) س دا و لەفشارێکی بەرزدا ئامادە بکات.

وە هەندێ زانای تر بڕوایان وایە نەوت لەبنەمایەکی کانزایی درووست بووە، لەوانە (مەندەلیف) بڕوای وایە پێکهاتەی هیدرۆکاربۆنی نەوتی لەناو زەویدا بەهۆی کاریگەری هەڵمی ئاوی گەرم بۆسەر کاربیدات (carbidaes) درووست بووە، کەکانزایەکە لەناو زەویدا هەیە.

بەپێی ئەزموونەکانی (سابتریل) و (سیندرسن) پێکهاتەکانی هایدرۆکاربۆنی لەبەهایدرۆجین کردنی ئەسیتیلینەوە درووست بووە و هۆکاری تر یارمەتی دەر بووە وەکو نیکل و مس.

زانا هۆفەر (hofer) بڕوای وایە نەوت لەبنەمایەکی ئاژەڵی و رووەکی درووست بووە، وەکو چەوری درەختە وردە بێ گوڵەکانی وەکو قەوزەکان (الاشنات) کەزیاتر لە (٥٠٠٠) جۆر دەبن، نەوت بەهۆی هارینی ئەو رووەکانە درووست بووە کە ژێرەوی کەوتوون بەکارێکی بایۆلۆجی، واتە: بەهۆکاری ئەنزیمەکان.

وادیارە کرداری نەوت پەیدابوون بەبێ گەرمی و فشاری بەرز پەیدا بووە و ئەنزیمەکان

(١) دراسات عن الذهب الاسود، ل٤٣ و ٧١، سەیر بکە.

هۆکاری ئەمەن، لێرەدا (هۆفەر و وانکلەر) هاوڕان کەنەوت لەبنەمایەکی ئەندامی ئاژەڵی و رووەکی پێك هاتوون و تانیمرۆش تیۆرەکی پەسەندکراوەو هاوڕای تیۆری بایۆلۆجییە، کە دەڵێ نەوت لەبنەمایەکی بایۆلۆجی پەیدا بووە لەجۆری قەوزەکان و گیانداره ورده سەرناوکەوتووەکان و سەدەفەکان کلسییەکان و کلۆرۆبیجرنا، زۆر لەزانایان وەکو (بوتونیە) و (بومبکی) بڕوایان وایە پاشماوەی کەردستە ئەندامییەکان کەژێرزەوی کەوتوون بۆ بڕی ئۆکسجینی تەواوەی ناوناو دەگەڕێتەوە.

گەر رێژەی ئۆکسجین لەناوی نیشتەی بەرزدا زۆر بوو بەئۆکسیدبوونی تەواو لەو ماددە ئەندامییانەدا روودەدات، واتە: بۆگەن دەبن، ماددەی نائەندامیش لەلەشی زیندوودا دەمێنێتەوە و بەمەش نیشتەنی کانزایی وەکو نیشتەنی کلسی دەمێنێتەوە، گەر ئەم ئاوە ئۆکسجینی تێدانەبێ ماددە ئۆرگانییەکان دەڕزن و گازی کبریتیدی هایدرۆجین پەیدا دەبێت، نەوت لە ئەنجامی دارزانی لیتەی نیشتەی دەریایی پەیدادەبێت[1].

## نەوت لەرووی جیۆلۆجیەوە:

نەوت لەناخی زەویدا لەناو چینە رێکەکانی و چینە بەردینەکانیدا هەیەو بەناوچە سەرەتاکان ناسراون، هەندێ جار بۆناو بۆشایی چینە کونیچکە دارەکان و درزە زەمینییەکاندا دزە دەکات و لەناوچەی تردا خۆی حەشاردەدات کە بەناوچەی لاوەکی ناسراون و بەکانە بەرد (المحجر) ناوزەد دەکرێن، ئەم وزە کردنە بەهۆی فشاری چینەکانی زەمینی لەسەری و فشاری گازە زەمینییەکانی ناو ئەوناوچانە دێتەدی.

ئەم کانە بەردە نەوتیانە لەشێوەی جیاجیاداو بەهۆکاری جیۆلۆجی دیاری کراو دێنەدی[2].

(١) دراسات عن الذهب الاسود، ل٢٥-٣٠، بە کورتکردنەوە.

(٢) دراسات عن الذهب الاسود، ل٣٣.

## جەنگی نەوت لەجەنگی جیهانی سێیەمدا:

(عەزیز حسن الخفاج) لەساڵی (١٩٦٩)دا دەنووسێ: (چەوری پیترۆڵ بەتایبەتی لەم سەدانەی دواییدا بووبە جێگای بایەخ لەسیاسەتی دەولیدا، پێشبڕکێ بۆ بەدیهێنانی سەرچاوەکانی و دەست بەسەرداگرتنیان بو بەمۆرکێکی هاوچەرخی، کە کێبەرکێیەکە هەموو جۆرە چەك و شێوازێکی پاك و ناپاك لەفشاری سیاسی و ئابووری تێدا بەکاردێت، وە هاتنەناوی بەناوی بازرگانی توێژینەوەی زانستی).

دەنووسێ: (ئێمە دەتوانین بڵێین هەر لەسەرەتای ئەم سەدەیەوە، دوای ئەوەش لەو بیست ساڵەی داهاتوودا بەتایبەتی جەنگی دژوار لەراست پترۆڵدا دەبینین، ئێمە گومانمان نییە لەساڵەکانی داهاتوودا بەفشارو توندوتیژییەوە ئەم جەنگە گەرمتر دەبێ و دوورنییە نەوت هۆیەکی سەرەکی یەکلا کەرەوە بێ لەرووداني جەنگی جیهانی سێیەمدا) [1].

بەڵێ هەزار رەحمەت لەگۆری و پێشبینییەکەی هاتەدی و بەچاوی خۆمان جەنگی کەنداوی فارسی، کەبەشەری (٢٤) رۆژە ناسراوەو هاوپەیمانانی خۆرئاواو وڵاتانی کەنداو بەهاوبەشی بەسەرۆکایەتی ئەمریکا ئەنجامیاندا، کاتێ سەدام کوێت و بیرەنەوتەکانی داگیرکرد لە (٢/ئاب/١٩٩٠)داو زیاتر لە (٩٥٠) بیرە نەوت ئاگری تێبەردا، تا دووکەڵ لەگەڵ باراندا دەباری.

ئەم جەنگە لە (٣) قۆناغدا تەواوبوو: (قەڵغانی بیابان و گەردەلوولی بیابان و شمشێری بیابان) پاشان دوای راوەدوونانی سوپای عێراق و شکانی ئەمریکا جەنگەکەی راگرت، بوشی باوك ئاگربەستی دانا، دوایی بوشی کوڕ لەساڵی (٢٠٠١ز)دا بەهاوپەیمانی کوردو ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەیەکجاری عێراقی بەعسیان رووخاند، وە بێگومان ئەم جەنگەش نابڕێتەوە تا جەنگی جیهانی سێیەمی لێوە هەڵدەگیرسێت و ئاڵا رەشەکان شۆڕش دەکەن و سەرکەوتن بەدەست دێنن و کۆتایی بە خراپەکاریەکانی زەوی دێنن و دنیا لەسەر دەستی ئەوان پڕدەبێ لە دادگەری وەکو پڕبووە لەستەم، وەکو رابردوو باسکرا: (..... عند کنزکم هذا ثلاثة کلهم ابن خلیفة، ثم لایصیر

---

(١) هەمان سەرچاوە، ل٧.

الى واحد منهم، ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونكم قتلا لم يقتله قوم، فاذا رايتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدي). رواه ابن ماجة، اسناده صحيح.

لێرەدا ئەم کەنزە ئەوتە کە بەزێڕی ڕەش ناسراوە، ئاڵا ڕەشەکان کوردەکانن، خۆرهەڵات و ناوچەی بەفراوی کوردستانە، وە (نعیم بن حماد) گێڕایەتوە: (اولئك قوم يأتون من المشرق حردين معهم رايات سود ..... شعارهم اقبل اقبل يعني بكوش بكوش) بڕوانە (الفتن).

لە فەرموودەدا هاتووە: (قلوبهم كزبر الحديد، هم اصحاب الدولة) رواه نعيم بن حمادة، پێغەمبەر (ﷺ) بەکوڕانی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیم (دخ) ناویان دەبات: (لاتقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفا من بني اسحاق) رواه مسلم.

(منصور ناصف) لە (التاج/ج٥)دا دەنووسێ (ئەوانە کوردەکانی شامن).

بێگومان لەسەردەمی ئەواندا کێشەی ئایدەلۆجی و ئابووری چارەسەر دەبێ و چینایەتی کۆتایی پێ دێ و هەموو گەلان لەژێر دەسەڵاتی یەك جەمسەریدا دەژین و خاوەنی خودموختاری خۆیانن، (يكون في آخر امتي خليفة يحثو المال حثيا لايعده عدا) رواه مسلم.

واتە: لەکۆتایی ئوممەتی من خەلیفەیەك دێ ماڵ دابەش دەکات بێ ژماردن، (کە مەهدییە) لەبنەماڵەی پێغەمبەر (ﷺ) دنیا پڕدەکات لەدادگەری وەکو پڕبووە لەستەم (...يملأ الارض قسطا وعدلا كما ملئت ظلما وجودا) رواه ابو داود والحاكم.

شایانی باسە کاتێ (ئۆباماى سەرۆکی ئەمریکی دوای بۆش هاتە سەر کورسی کە ئیمڕۆ سەرۆکی ئەمریکایە و بەرەچەڵەك ئەفریقییە، هەندێ زانا پێشبینی ئەوەیان کرد کە ئەو سەرۆکەیە پێغەمبەر (ﷺ) لەراستیدا فەرموویەتی کەنزی کەعبە کۆنترۆڵ دەکات: (فانه لايستخرج كنز الكعبة الا ذوالسويقين من الحبشة) وەکو لە (التاج الجامع للاصول)دا (ج٥/ ل٣٢٥)دا هاتووە، بەڵام تاچەند ئەمە راستە؟ داهاتوو رونی دەکاتەوە! (کەنز) ئەوتە وەکو باسکرا.





## ١٢٣- (یۆرانیۆم):

سووتەمەنی ناوکی بنەڕەتی یۆرانیۆم (٢٣٥) کەلە شێوەی ئۆکسیدی یۆرانیۆم هەیەو ئەم کەرەستە خاوە لەتاوێری کۆندا لە کەنەداو باشووری ئەفریقیا و ئوسترالیادا، بەلام عەمباری یەدەکی زۆر کەمە.

یۆرانیۆمی پلە نزم لە پاکژیدا لەقوڕی رەشدا هەیە لەناو زۆریێ لە دەفەرەکانی [illegible]دا، هەرچەندە دەرهێنانی یۆرانیۆم زۆری تێدەچێ بەلام بڕەکی زۆر سووتەمەنی ناوکی لەکاتی پێویستدا دابین دەکات، کەچی بەکارهێنانی کارگەکانی پیتاندن (مفاعلات التخصیب) بووە هۆی کەمتر بەکارهێنانی یۆرانیۆم، چونکە (پلۆتۆنیۆم) (٢٣٩) پەیدا دەکات کە لەبەرهەمهێنانی وزەی ناوکیدا باشترە.

بەلام بەداخەوە بەکارهێنانی وزەی ناوکی ترسناکە، سەرباری مەترسی دزەکردنی رواڵەتی پیس بووە ناوکییەکانی ئەو کارگەیە کێشەی رزگاربوون لەو پاشماوانە (النفایات) هەیە کەئەو کارگانە جێی دێڵن، هەندێ لەوانە تەمەنێکی درێژیان هەیە لەتیشکدا، بەفڕێدانیان بۆناو ئۆقیانووس لەم پاشماوانە کەم دەکرێتەوە، بەلام داهاتوو مرۆڤایەتی دەخاتە مەترسییەوە بۆ ماوەیەکی زۆر، یان ژێر خاك دەدرێ ئەمەش ناوی ژێرزەوی پیس دەکات دیسانەوە لەگەڵ پیسبووندا کێشەی تریش پەیدا دەکات، کاتێ بڕەکی زۆر پاشماوەی تیشکدەرەوەی (المشعە)ی شل رژانە ناخی زەوی لە (کۆلۆرادۆ) لەئەمریکادا، ئەم شلەیە بووە هۆی سووککردنی لێکخشانی نێوان تاوێرەکان و تووشی فشار دەبن و بوومەلەرزە پەیدا دەکەن، ئەم رووداوە لێکۆڵەرانی بوومەلەرزەی هاندا کە دەتوانن لە کەڵەکەبوونی فشاری سەرتاوێرەکانی قوولایی کەم بکەنەوەو بەهەمان هۆکارەکان رێگا بەبوومەلەرزەی دژوار بگرن[1].

بەڵێ خوای گەورە پێشبینی ئەم پیسبوونەی کردووە کاتێ فەرموویەتی: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾[2].

---

(١) علم الارض، الك سمث، ل١٢٧.

(٢) الروم: ٤١.




قورئانی مەزنیش لەچەندان ئایەتدا ئاماژەی بۆ گەردیلەو لـەتبوون و تەقینـەوەی نـاوکی و مەترسییەکانی کردووە، کەلە کتێبەکی تایبەتیدا باسـیان دەکـەین، لەگەردووناسیـشدا هەنـدێ نموونەمان باسکرد.

وەکو ﴿وَمَا يَعْزُبُ عَن رَّبِّكَ مِن مِّثْقَالِ ذَرَّةٍ فِي الأَرْضِ وَلاَ فِي السَّمَاء وَلاَ أَصْغَرَ مِن ذَلِكَ وَلا أَكْبَرَ إِلاَّ فِي كِتَابٍ مُّبِينٍ﴾[1].

واتە: ون نابێ لە پەروەردگارت کێشی ئەتۆمی لەزەویـدا نەلـە ئاسمانـدا نـە بـچووکتر لـە ئەویش.

لێرەدا قورئان چەند راستییەك دەردەخات:

١- زەوی ئاسمان هەموویان لەیەك جۆر گەردیلە دروست کراون و گەردیلەکان پێك هێنـەری تو خمەکانن.

٢- جاران بەگەردیلە دەوترا (atom) واتە: دابـەش نـەکران، کەچـی لەسـەرەتای سـەدەی بیستەمدا گەردیلە لەتکرا بوو بەبەشی وردتر!

(ك. کلادکوف) دەڵێ: (گەردیلە ماددەی سەرەکی ئەم جیهانەیە کە دەوری داویـن) جـاران فەیلەسوفانی خۆرهەلات و هیندو چـین و گریکـەکان دەیـانوت تـەواوی مـاددە بـێ سـنوورەکان لەسروشتدا لەتەنی زۆر وردیلە پێك دێن، کە نەدەبینرین و نەبەشدەکرێن بۆ بۆ بەشی وردتر.

بەلام بۆچوونەکانی زانایانی کۆن نەبوو بەزمانەکی زانستی راسـتەقینە، دوای (١٧) سـەدە زانای رووسی گەورە تیوری بنیاتنانی ماددەی دانا کە پشت بە تەنۆلکەکانی گەردیلە دەبەسـتێ، جووڵەی گەردیلەکان هۆکاری جیاوازی و جۆراوجۆرییە لەسروشتدا)[2].

بینـــرا دوای لـــەتکردنی گەردیلـــە بـــۆ بەشـــی بـــچووکتر: (تـــیرەی گەردیلـــە (١,٠٠٠,٠٠٠,١٠٠)ســم و تــیرەی ناوکەکــەی (١,٠٠٠,١٠- ١٠٠,٠٠٠)ســم ی تــیرەی

(١) یونس: ٦١.

(٢) الذرة من الالف الى الياء، ك. كلادلوف، ل١٣٤-١٣٦، سەیر بکە.



گەردیلەیە)[1].

وە بینـرا گەردیلـە جیهـانێکی بـچووکی وەکـو خـۆرو کۆمەڵەکەیـەو ئەلیکترۆنـەکان بەخێراییەکی خەیاڵی بەدەوری ناوکدا دەسووڕێنەوە.

٣- خودا باس لە (المثقال الذرة) دەکات، بەوپێیەی گەردیلە مل بۆ پێوانە کەچ دەکات.

٤- (پیار روسو) دەڵێ: (چالاکی تیشکی لەراستیدا مردنـی گەردیلـە تیـشك دەرەکانـە، گەردیلەکانی رادیۆم بۆ نموونە تێك دەشکێن-تحطیم- لەو تەنە مردووانـە گەردیلـەی رادۆن پەیـدا دەبێت، بۆیەکەم جار جیهان زانی لەمێژوودا تۆخمـەکانی کیمیـایی یـان گەردیلـەکانی دەمـرن و دەژین)[2].

وە خوای گەورە کاتێ باس لە دۆزەخ و تیشك دەکات هەمان سیفەتی تیشکی دنیایی یـان هەیە: ﴿وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْحُطَمَةُ ۞ نَارُ اللَّهِ الْمُوقَدَةُ ۞ الَّتِي تَطَّلِعُ عَلَى الْأَفْئِـدَةِ....﴾ بەڵێ رادیـۆم بۆ نموونە تێکدەشکێ لەدۆزەخدا، وە تیشکی سینی وەکو لـە نەخۆشـخانەکاندا دەبیـنین هەڵـدێ بەناخی مرۆڤدا و وێنەی ئەندامەکان دەگرێ بـۆ دەسـت نیـشانکردنی نەخۆشـییەکان، وە ئەگـەر بروانییە خۆر بە یەکبوونی ناوکی (الانـدماج النـووی) هایـدرۆجین دەسـوتێ و ملیۆنـەها سـاڵە بەردەوامە، گەر ئەم سوتەمەنییە خەڵوز بایە، لەماوەی پێنج رۆژدا خۆر دەکوژایەوە، بۆیە خـۆر گەورەترین عەمباری ناوکی و گەورەترین کارگەی ناوکییە لەکۆمەڵەی خۆردا و چاوگی وزەیە!.

خۆر کە بۆمبایێکی هایدرۆجینی گەورەیە لەچرکەیەکدا (٦٠٠) ملیۆن تـەن بـۆ هیلیـۆم و (٤٠٠) ملیۆن تەن هایدرۆجین بۆ وزە دەگۆڕێت، ئەم بۆمبایـە (٤,٥) ملیـار سـاڵ تەمەنیـەتی، واتە لەمکاتەوەی لەدایك بووە دەسـووتێ، بەمپێیـە (١٤٢) ملیـار ملیـار تـەنی هایـدرۆجینی کردووە بە هیلیۆم و (١٥٨) ملیار ملیار تەنی هایدرۆجین کردووە بەوزەو گـەرمی، دەتـوانێ (٥) ملیار ساڵی تریش بژی دوایی بگۆڕێ بەتەنەکی کوژاوەو گرگنەکی سـپی (القـزم الابـیض) واتـە: تیرەکەی لە (١,٥) ملیار کم دابەزێ بۆ (١٢٧٤٣)کم و قەبارەی ئەوەندەی زەوی بۆی بگەڕێتەوە.

---

(١) هەمان سەرچاوە.

(٢) الذرة والكون، ت: عصام میاس، ل٢٤.

قورئانی مەزنیش فەرموویەتی: ﴿إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ﴾[1].. واتە: کاتێ خۆر کوێر بۆوە، کە وشەیەکی فارسی و کوردییە.

یان (کاتێ خۆر پێچرایەوە) واتە: بچووك بۆوە بۆ گرگنێك.

هەرچی یۆرانیۆمە بە کەرتبوونی ناوکی (الانشطار النووي) لەکارگەی تایبەتیدا گەرمی و وزە دەدات، یەك کیلۆی لەیەك کاتژمێردا (٢٢,٩) ملیۆن کیلۆوات دەدات، بەڵام هایدرۆجین کە بە یەکبوونی ناوکی دەتەقێتەوەو وزە دەدات یەك کیلۆی (١١٧,٥) ملیۆن کیلۆوات دەدات لە کاتژمێرێکدا.

لەبەرامبەردا دژە ماددە (المادة المضادة) هەیە کە لەتاقیگەدا بوونی سەلماوە، کەناوکی لەپرۆتۆنی دژەندە پێك دێ نەك پرۆتۆن و خولگەکانی پۆ زیترۆنەکان بەدەوریاندا دەسووڕێتەوە نەك ئەلیکترۆنەکان.

بەوپێیە هایدرۆجینەکەیان پێی دەوترێ دژە هایدرۆجین، بەو پێیە دوور نییە نیوەی گەردوون دژە ماددە بێ، گەر دژەماددە لەزەویدا یان مەجەڕڕەیخۆماندا هەبوایە ئەوەنەی دەتوانێ درێژە بەتەمەنی بدات چونکە لەگەڵ بەرکەوتنیدا بە ماددەی ئاسایی وزەیەك پەیدا دەکات هەزار ئەوەندەی ئەو وزەیە بێ بۆمبای هایدرۆجینی پەیدای دەکات[2].

هەندێ زانا وەکو (د.هشام طالب) لە (بناء الكون ومصير الانسان/ ل٤٨١)دا بڕوایان وایە: ﴿وَأَنَّا لَمَسْنَا السَّمَاء فَوَجَدْنَاهَا مُلِئَتْ حَرَساً شَدِيداً وَشُهُباً﴾[3].

لێرەدا (حرسا شديدا) پرۆتۆن سالبە کەلەئاسماندا هەیەو ئاسمان و زەوی لە شەیاتینەکان دەپارێزێت.

دوور نییە داهاتووش لێکدانی گەردوونی دژە ماددی و ماددە هۆکاری تەقینەوەی گەردوون بێت! (خوا زاناترە).

---

(١) التكوير: ١.

(٢) الذرة من الالف الى الياء، ل٢٢٤، سەیر بکە.

(٣) الجن: ٨.



## بەندی ( شەشەم ) :

## بەرزو نزمییەکان لەسەر رووی زەویدا :

( أ ) چیاکان و گردو تە پۆلکەکان.

( ب ) دەشتەکان و بیابانەکان.




## ١٢٤- بەرزونزمییەکان لەرووکاری زەویدا:

﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءَهَا وَمَرْعَاهَا * وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾[1].

بۆ یەکەمجار مامۆستا (لۆنگ-long) سالّی (١٩٤٢) رایگەیاند رووبەری وشکانی لەچاو رووبەری ئاوی زۆرکەمەو ریژەکەی (٢٦٪) و (٧٤٪)[2].

وە بێگومان تا ئیمرۆ (١٥) تیۆر هەیە، هەریەکە لەوانە دەیەوێ ئەو هۆکارانە روون بکاتەوە وەکو ئەو شێوە دابەشبوونەی ئیمرۆی دەریاکان و وشکانی لەسەر زەویدا روون بکاتەوە، لەوانەش تیۆری (خزانی کیشوەرەکان-زحزحة القارات) کەبروای وایە سەرەتا کیشوەرەکان یەك پارچە بوون لەماوەی جیۆلۆجی رابردوودا و لەپاشاندا لەماوەی جیۆلۆجی داهاتوودا لێك جیابوونەوە، وەك دەبینرێ رووی وێك چوون هەیە لەناویاندا، تیۆری خزانی کیشوەرەکان لەتیۆری خۆمالّی کۆن جیایە کە (کلفن) و (سۆلاس) و (لابوراث) و (لاڤ) بەراستییان دادەنا، چونکە



(١) النازعات: ٣١-٣٢.

(٢) کوکب الارض، ل٤٠٠.



تیۆری کۆن وای دادەنا کیشوەرەکان و دەریاکان و ئۆقیانووسەکان لەئەنجامی خزانی هەندێ نەپارچەکانی زەوی درووست بووە بەشاوڵی (رأسیا) ئەم رایەش لەرووی زانستییەوە پەسەند ناکرێ، دوور لە توێکڵی زەوی ئەستووردا رووبدات، سەرباری جیاوازی پێکهاتەی جیۆلۆجی گشتی کیشوەرەکان کەلە تاوێری (سیبال) پێك دێن، کەچی تاوێری زەوی ئۆقیانووسەکان لەتاوێری (سیما) پێك دێت، بەڵام تیۆری خزانی کیشوەری ئاسۆیی (افقیا) روودەدات لەوشکانی کۆنداو لەئەنجامی ئەو خزانە ئاسۆییە وشکانییەکان لێك دابڕاون.

(فرانسیس بیکون/ ۱۹۲۰) یەکەم کەس بوو تێبینی کرد کەنارەکانی ئۆقیانووسی ئەتلەسی خۆرهەڵات و خۆرئاوا پێکدەچن، ئەمەش مانای خزانی کیشوەری دەگەیەنێ.

(ئێدوارد فۆربس) ساڵی (۱۸۵۰) رایگەیاند زۆر لە خێزانی روەکەکان و گیاندارانی دەریایی لەناوچە جیاجیاکانی دەریایی و زەریایی پێکدەچن، ئەم دابەشبوونە جوگرافییەش بەوە لێك دەدرێتەوە کە خزانی زەمینی لەدەریاکان و ئۆقیانوسەکاندا روویدا [1].

وەزانایانی ئیعجازی قورئان وەکو باسمانکرد پشتگیری لە رای (خزانی کیشوەری) دەکەن، وەکو خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾[2]. سوێند بەزەوی درز درز.

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾[3]. واتە: دەبینی چیاکان وەستاون کەچی وەکو پەلەهەورد دەڕۆن.

ئەمەش ئاماژەیە بۆ جوولەی تاوێرەکان و خزانیان و دورکەوتنەوەیان و کیشوەرکانیش بەمە پەیدابوون.

(لەراست دابەشبوون جوگرافی گشتی رووبەری ئاو لە چاو دابەشبوونی وشکایی دەبینری: کۆی رووبەری ئاوی = بە (۳٦۱,۰۵۹ × ٦۱۰ کم²) واتە: نزیکەی (۷,۸٪)ی رووبەری سەر رووی زەوی، کەچی کۆی وشکانی لەچاو رووی زەوی (۱٤۸,۸۹۳ × ٦۱۰ کم²=۱٤۸ ملیۆن

---

(۱) کوکب الارض ظواهرة التضاريسية الكبرى، د. حسين سيد احد ابو العينين، ل٤١١-٤١٢، بە کورتکردنەوە.

(۲) الطارق: ۱۲.

(۳) النمل/۸۸..




کـم[٢]، واتـە: نزیکـەی(٢٩,٢٪) ئۆقیانووسـی هـێمن (هـادی) بەتـەنیا ٣/١ی رووبـەری زەوی داگیردەکات و هیندی ١/٥ و ١/٧ی گۆی زەوی بەدوای یەکتریدا)[١].

مەبەست لە (الصدع- faults) روودانی شکان و درزی گەورەیە لەتاوێرە پلێتییەکانـدا کـە خزانی چینەکانی بەدوادا دێ، شـاوڵی یـان ئاسـۆیی، ئـەم جووڵـە درزینـە تکتونییـە بەفـشاری جۆراوجۆر دروست دەبێ کە تاوێرەکانی توێکڵی زەوی تووشی دەبن[٢]. وەکو باسکرا.

﴿وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾ ئامـاژە دەکـات: (بەشـەکی زۆری تـوێکڵی زەوی نائارامـە و بەدرێژایی چەرخی جیۆلۆجی بەردەوام بووە کە بەبارستایی کیشوەری (الکتـل القـاری) ناسـراوە، لەکاتێدا ناوچەی حەوزی دەریایی گەورە کەبڕەکی زۆری نیشتووەکانی تێدایە بەجووڵە بـەرزەکانی تکتۆنی لەمـاددە جیاجیاکانی مێژووی جیۆلۆجیدا کۆبوونەوەو زنجیرە چیاکانی پێك هێنا لەزەویدا وەکو دەیانبینین ، وە کاریگەری جووڵەی بەرزی تەکتۆنی هەر زنجـیرە چـیا بـەرزەکان ناگرێتـەوە، بەڵکو لێرەدا شوێنەواری جووڵەی تەکتۆنی کۆن هەیە بەر لە (کەمبـەری) و هۆکـانی رووتانـەوە کاری کردووە بۆ لابردنی کۆسپ و بەرزاییەکانی لەشێوەی بیابانی گەورەدا و ناوچەیەکی فراوانـی بارستایی کیشوەری کۆن[٣].

کاتێ قورئان دەفەرمووێ: ﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا ۞ وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا﴾[٤].

لێرەدا دەردەکەوێ ئاو کەلەزەوی هاتۆتـەدەر وەکـو باسـکرا چـاوگی ژیـان و دروسـتبوونی بەرزایی و نزماییەکانە، لەوانە چیاکان بۆیە لەوەڕو چیای بەدوای ئاودا باسکردووە.

(ئۆپارین) دەڵێ: یەکەم ژیانی زیندو لەئاودا دروست بوو[٥].

(ئەلك سمـث) دەڵێ: (بەرگەی هەوای زەوی سـەرەتا ئاوانەبوو، زۆر پڕ لە ئۆکسجین نـەبوو، لەکاتێدا رووەك گەشەیان کرد بەر لە (٢٠٠٠) ملیۆن ساڵدا بەهۆی رۆشـنە پیـك هـاتن گـەردی

---

(١) کوکب الارض، ل٤٠١.

(٢) کوکب الارض، د. حسن سید احمد ابو العینین، ل٣٢١.

(٣) هەمان سەرچاوە، ل٤٤٨.

(٤) النازعات: ٣١-٣٢.

(٥) علم الفلك، د. فیاض النجم، ل٤٢٣.





دووەم ئۆکسیدی کاربۆنیان لەت کردو ئۆکسجینیان ئازاد کرد)[1].

مامۆستا (ولدریج) قۆناغەکانی دروستبوونی چیاکان دەکات بەسێ قۆناغەوە:

١- قۆناغی دروستبوونی نیشتوەکان لەبنی دەریای جیۆلۆجی کۆندا کەبە( peiod of lithogenesis) ناسراوە.

٢- قۆناغی ... نی ئەو نیشتووە گەورە ئەستوورانە بەکرداری نوشتانەوە (الثنی- folding) و درزبردن (التصدع- faulting) کەبە (period orogensis) دەناسرێت.

٣- دەرکەوتنی زنجیرە چیاکان و قۆناغی داخورانی یان (التعریە) ئەو قۆناغە بە ( period of glyptogensis)[2] ناودەبرێت.



## ١٢٥-١٢٦- چیا چییە؟ جۆرەکانی چیا؟

قورئانی پیرۆز دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَاداً ۞ وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً﴾[3].

واتە: ئایا زەوی... نەکردووە بە لانکۆلە، چیاکان بە مێخ؟

چیاکان (mountains) چین؟ چیاکان لەرووی جیۆلۆجییەوە ئەو روبەریانەن لەئاست خاکی دەورووبەریان بەرزن، هەندێ جیۆلۆجی ناوا پێناسەی چیاکان دەکەن دیاری دەکەن کە بەزۆری تێکرای ئاستیان (المنسوب) دەکەوێتە سەرووی (٢٠٠) پێ، گەر لەمە نزمتر بوو

---

(١) علم الارض، الك حمث، ل١٥.

(٢) کوکب الارض، ل٤٤٦.

(٣) النبأ: ٦-٧.

پێی دەوترێ گردەکان (التلال- hills).

وە چیاکان بەپێی بارووددۆخی دروستبوونیان دەبن بەچەند بەشێکەوە:

١- چیا بورکانییەکان: لە قوچەکی بورکانی پێکدێن، لەقەبارەدا چەندە لاڤاو ماددەی تـواوەی بورکانی پتر بێ قەبارە قوچەکیەکان گەورەتر دەبێت، بەرزی هەندێ چیای بورکانی دەیان مەتر بەرز دەبێ لەئاستی رووی زەوی دەروبەریەوە، هەشیانە دەگاتە سەدان مەتر، سروشتی پێک هاتنیان بۆ پێک هاتەی لاڤا دەگەڕێتەوە و پاشان لەسەر شێوەی قووچەکی بازلتی بورکانی یان گومەزی بازلتی پێك دێن.

یان چەند قووچەکی یەکن (المخروطات) لە تۆزو خۆڵ و سندری بورکانی پێك دێن، یان لەشێوەی قووچەکی ئالۆزدا لەپێك هاتەی جیۆلۆجیدا دەردەکەون، ئەم چایانە بەدرێژایی کەناری ئۆقیانووسی هێمن و ناوچەی ئەندیزی ئەمریکای باشوور و ناوەڕاست و مەکسیك هەیە[١].

بەوپێیە چیا بورکانییەکان پێك هاتەی ئەو شلە مەنیە قورسانەن کەلەناخی زەویدان و لەقیامەتدا بەتەواوی دەردەچن ﴿وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا﴾.

٢- چیای درزی (الجبال الصدعیە): ئەو زنجیرە چیایانەن لەئەنجامی هەندێ جوولەی دەرزبردن (التصدع) دەردەکەون کە توێکڵی زەوی تووشی دەبن، حەوزە گەورەکەی چیاکانی رووکی لە ئەمریکادا ئەم جۆرە چیایەی پەیدا کردووە[٢].﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾.

٣- چیاکان و زنجیرە چیاکانی چەماوەیی (الالتوائی): ئەم چیایانەن لەحەوزی دەریایی تەکتونی گەورەدا دروست بوون، ئەنجا زۆر ئەستوور و سفتن، پاشان تووشی کرداری بەرزبوونەوەی تەکتوونی بوون کەبونە هۆی چەمانەوەی چینە تاوێریەکان.

٤- چیا رووتاوەکان: رووتانەوە بەدرێژایی درزو شکەستی و دەورووبەرەکەی پەیدای کردوون[٣].

گەر سەیری قورئانی گەورەو پیرۆز بکەین بەر لە دیۆلۆجیای نوێ ئاماژەی بەجۆری چیاکان

---

(١) بەکورتکردنەوەو دەستکاری لە (کوکب الارض) ل٤٧٩-٤٨٠ وەرگیراوە.

(٢) هەمان سەرچاوە.

(٣) هەمان سەرچاوە.



و جیاوازی درووستیان کردووە:

١- چیاکانی بورکانی یان ئاگرین کەلەکاتێدا لەبورکان دێنە دەرەوە ماددەتواوەکـان سـارد دەبنەوەو رەق دەبن وەکو مێخ ردگیان دادەکوتن، تـا ئـەو قوولاییـەی سـاددە تواوەکـانی رەق نەبووە، بەبێ خزین و رمالێنی چینەکان گۆڕاوە.

خوای گەورە لەراست دروستبوونی ئـەم چـیایانە فەرمووییـەتی ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا﴾. واتـە: چیاکانمان کردوون بەمێخ، بەڵێ ئەم چیایانە مێخن، دیسان چیاکانی چـەماوەیی کەلـە ئـەنجامی چەمانەوەی چینی تاوێرەکان دروست بوون و بەرز دەبنەوە، ئەمانەش مێخن﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ﴾[1]. دامان ناوە لەناو زەویدا چیایانی لەنگەرگرتووی لوتکە بەرز.

(ئەلك سمـث) دەڵێ: (ماددەی تواوەی زەوی دێتەسەر رووی زەوی چیاکان پێك دێنێ، پاشان دەرزن و تاوێرەکان هەڵ دەوەشێن تا تـاوێری تـازە دروسـت بکەنـەوە، ئـەم مەسـەلەیەی دوایـی لەسووڕی جیۆلۆجیدا یان سـووڕی تـاوێر لەسروشـتدا روون کراوەتـەوە، تاوێرەکـان لەسـەر زەوی سـەرەتاو کۆتـایی ئـەو سـووڕەن کـە سـووڕی وردووخاشـبوون (الحت- erosion) و سـووڕی هیدرۆکۆمی دەگرێتەوەو تایبەتە بەسووڕی داخوران (التآکل) لە نزمکردنەوەی بەرزاییدا بۆ نزیـك ئاستی دەریا، هۆکارەکانی بەرزکردنەوەی رووی زەوی و هۆکاری رووتکردنـەوە (التعـری) هەمـە جۆری بەرزو نزمی رووی زەمینی دروست دەکەن)[2].

سەیرکە قورئان هەندێ جار وشەی (جعل) و هەندێ جار وشـەی (القـی) بـەکار دێـنێ بـۆ دروستبوونی چیاکان، ئەمەش ئاماژەیە کە چیاکان بەیەك جۆر دروست نابن:

﴿وَأَلْقَى فِي الأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾[3].

﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ﴾[4].

---

(١) المرسلات: ٢٧.

(٢) علم الارض، ل٣٦ باسـکراوە

(٣) النحل: ١٥.

(٤) الانبياء: ٣١.





(ئەلك سمث) دەڵێ: (زۆربەی چیاكان دەكەونە زنجیرە چیاكانەوە و لەهەموویان درێژتر زنجیرە چیای ئۆقیانووسین كەزیاتر لە (٣٠٠٠)م بەسەر دەشتایی قووڵایی ئۆقیانووسەكاندا بەرز دەبنەوە).

ئەو بوركانەی كەلە كەڵەكەی حۆڵەمێش و گازاو پێك دێ سادەترین چیایە، چیای (مونالو)ی بوركانی لەوانە (٩٠٠٠)م بەرزە بەسەر بنی ئۆقیانووسی هێمندا گەورەترین چیایە، هەندێ چیا وەكو لە ئیسكوتلەندا تەپۆلكە (المضبات) بوون جووڵەی پەیدابوونی كیشوەرەكان بەرزی كردونەوە، لەدواییدا داخوراون و رووتانەوەیان بەسەر هاتووە، چونكە جووڵەكانی تەكتوونی زۆربەی چیاكان دروست دەكات) دروست بوونی چیاكانیش دەیان ملیۆن ساڵی دەوێت[1].

سوورەكان بەردەوامن و نوێ دەبنەوە داخراون وەكو سووری ئاو و سووری هەواو سووری تاوێری﴿إِنَّهُ هُوَ يُبْدِئُ وَيُعِيدُ﴾[2].

## ١٢٧- چیاكان و تاوێرەكانی بۆ بیناسازی:

﴿وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾[3].

واتە: وە ئەو سەموودەی تاوێری لە دۆڵەكان دەهێنا.

﴿وَكَانُواْ يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتاً آمِنِينَ﴾[4].

واتە: ئەوان لەچیاكانیان خانوو دادەتاشی بەبێ ترسی.

(الك سمث) دەنووسێ: (تاوێری گۆڕاوی رەق وەكو (هۆرنفلس) بەكاردێ، دیسان تاوێری نیشتووی جۆراوجۆر لەكاری بیناسازیدا یان لە شێوەی بارستایی زلدا یان لەشێوەی پارچەی

(١) علم الارض، ل٩٤-٩٥.

(٢) البروج: ١٣.

(٣) الفجر: ٩.

(٤) الحجر: ٨٢.



بچووکدا دوای ئەوەی لەرووی پیشەسازییەوە دەشکێنرێ و ورد دەکرێ، بەزۆری لەپرۆژەی گەورەی وەکو بەربەست و کۆنکریت کردنی جادەکان و کاری کۆنکریتیدا بەکاردێن، هێشتاش تاوێری سروشتی لەبیناسازیدا بەکاردێ، بەتایبەتی ئەو تاوێرانەی جوان کەرت دەبن لەکاتی برینیاندا، وەکو تاوێری (بورتلاند و کوتزولد) دیسانەوە تاوێری کلسی بەبڕەکی زۆر لە پیشەسازی ئاسن و چیمەنتۆدا بەکاردێ، بەردی لمی سلیکادار بۆ ناوپۆشکردنی ئەو ئاگردانانە بەکاردێ گەرمییان تێدا بەرز دەکرێتەوە)[1].

وە لە عێراق و کوردستاندا تاوێری کلسی بەکاردێ بۆ بیناسازی دوای برین، دیسان (مەرمەڕ) بەکاردێ کەبەردەکی گۆڕاوی کلسییە، هەرچی مەرمەڕی نەینەوایە تاوێری ئەهیراتییە.

## ١٢٨- قوڕو لیتەی دەریایی و دەشتایی بۆ بیناسازی و خشت برین:

## ١٢٩- ئەهرامەکان:

قورئانی مەزن ئاماژەی بەچەند دیاردەیەکی شارستانی میسری دەکات کەلە سەردەمی فیرعەونەکاندا هەبووە وەکو : (مۆمیا کردن)ی لاشەی مردووان، ئەوەتا قورئان لەراست هەلگرتنی لاشەی فیرعەونی میسری (عەمیس) کە خۆی بەخودا دەزانی، دەفەرمووێ:﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾[2].

واتە: ئیمڕۆ لاشەکەت رزگار دەکەین تا ببی بەموعجیزە بۆ کەسانی دوای خۆت.

ئەم فیرعەونی موسایە لەیەکێ لە ئەهرانەکانی میسریدا لاشەی دۆزرایەوە کەبۆ (٦٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر دەگەرێتەوە، بێ ئەوەی ئەندامێکی تێك چووبێ یان رزیبێ، کاتێ نوژدارانی خۆرئاوا و توێکاران توێژینەوەیان لەسەر کرد بینرا کە بەماددەیەك مۆمیا کراوە ئەوە پاراستوویەتی لە بۆن بوون و رزین، دوای ئەوەی پێیان گووترا، کە قورئان ئاماژەی بەم راستییە

---

(١) علم الارض، ل١٣٤.

(٢) يونس: ٩٢.





کردووە، هەموویان وتیان: گەواهی دەدەین ئەم قورئانە لەلایەن خواوەیە[1].

دیاردەیەکی تر پەرەپێدانی پاراسایکۆلۆجیا و ئەستێرەگەری و (التنجیم) و جادووکەری بووە تا کاتێ خەریکە موسا لەدایك ببێ ئەستێرە ناسان لەرێگای بوورجەکانەوە پێشبینی لەدایکبوونی موسا دەکەن کە دەسەڵاتی فیرعەونی لەسەر دەستی ئەو کۆتایی پێ دێت، بۆیە فیرعەون بڕیاری جینۆسایدی کوڕانی جوولەکەی دا ﴿يُذَبِّحُ أَبْنَاءهُمْ﴾[2].

تا ساحیرەکان دەکەونە ملبە ملانە لەگەڵ موعجیزەی موساداو خوداوەند موسا سەردەخات بۆیە ساحیرەکان موسڵمان دەبن: ﴿فَأُلْقِيَ السَّحَرَةُ سُجَّداً قَالُوا آمَنَّا بِرَبِّ هَارُونَ وَمُوسَى﴾[3].

وەیەکێك لە دیاردە مەزنەکانی شارستانی میسری دروستکردنی بینا بووە لەخشتەی قوڕینی سوتێنراو یان سوورکراوە.

---

(١) حقائق القرآن و العلم الحديث، عامر تحسين، ل٣٧ بە کورتکردنەوە.

(٢) القصص: ٤.

(٣) طه: ٧٠.



فیرعەوان بە هامانی وەزیری دەڵێ: ﴿فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحاً لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾[1].

لێرەدا وەکو (ابن کثیر) ئاماژە دەکات (فاوقد لي يا هامان على الطين) ئاماژە دەکات خشتی بۆ دروست بکات تا کۆشکەکەی پێ بنیات بنێت و بیسوتێنێت و سووریان بکاتەوە.

لێرەدا قورئان ئاماژە بەچاوگی کەرەستەکانی بیناسازی دەکات گەلانی رابردوو بەکاریان هێناوە، خشتی سوورکراوە (الطوب المحروق) بووە، لە قوڕی خاوی وەکو قوڕو لیتەی نیل و بیابان پێك دێ، پاشان بۆ یەکتر گرتن سوور دەکرێتەوە، ئەم سەرچاوەیە لەسەدەی رابردوو زانراو نەبوو، تا شوێنەوار زاناکان لەشوێنەوارەکانی کۆنی میسریدا چەند بینایەکیان دۆزییەوە لەخشتی قوڕی سوورکراوە دروست کرابوو، ئەم راستییانە لەسەردەمی عەرەبی نەزانیدا زانراو نەبووە)[2].

هەروەها دیاردەیەکی تری مەزنی شارستانی میسری ئەو ئەهرام و قووچەکیانەن وەکو شوێنەوار ماونەوە، قورئان لەراستییان دەفەرمووێ: ﴿وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ﴾[3].

وشەی (الاوتاد) وەکو مامۆستای خاڵ لە (تفسیر)ەکەیدا ئاماژەی بۆکردووە **ئەهرامەکانن! ئەم ئەهرامانە مەتەڵێکن وەکو مۆمیاکان و سیحرەکانی میسرییەکان تا ئیمڕۆ نەتوانراوە هەڵبهێنرێن!.**

**(سەیریان بکە چۆن تاوێرەکان بێ چیمەنتۆ قسڵ و گەچ وماددەی تر پێکەوە لکێنراون؟ چۆن ئەم تاوێرانە گوازراونەوە؟ چۆن بەرزکرانەوە؟ لەکاتێدا زانیمان کێشی یەك تاوێر (١٥-١٠٠) تەن دەبێ؟ تاوێری (بەعلەبەك) چۆن بڕدراوەو هەموار کراوە، یەك تاوێر (٣/٤)ی ملیۆن کیلۆگرامە کێشەکەی و درێژی (٢٥)م و پانی (٥)م، لەمەش سەیرتر ئەمجۆرە تاوێرانە هاوشێوەی تاوێرەکانی ئەو دەڤەرە نییە؟!.**

ئایا ئەم تاوێرانە بەگالیسکە هاتوون؟ یان لەرێگای زانستی پاراسایکۆلۆجی وەکو

(١) القصص: ٣٨.

(٢) الموسوعة الذهبية، د. احمد مصطفى متولي، ل٢٦٥.

(٣) الفجر: ١٠.




(سایکۆکینیزیا)کەبەهێزی گیانی تەنەکان دەتوانرێ بگوازرێتەوە؟ یان ئـەم ئەهرامانـە کـونترن و گـەلانی بەجەسـتەی بەرلـەوان هێناویـانن وەکـو گـەلی (ثمـود): ﴿وَثَمُـودَ الَّـذِينَ جَـابُوا الـصَّخْرَ بِالْوَادِ﴾؟!.

لە (سیاحەتنامەی ئەولیا چەلەبی)دا هاتووە سەرەتا گەلی (عاد) و (ثمـود) لەقـەلای (وان) بوون و لەچیاو ئەشکەوتی ئەوێدا ژیاون، وە (شاجالوت) لەسـەردەمی (داود)دا-ع- کەلێـسایەك لەوێ دروست دەکات، پاشان داود (ع) ئەو دەکوژێت[1].

(ئەولیا چەلەبی) لەگەشتەکەیدا بۆ (وان) لەشاری (موش) بۆ بینینی دیمەنەکی سەیر لەگەڵ هاورێکانیدا دەڕوات بەرەو باکوور دەڕوات سـەعاتێ (موش بەجێ دێڵن، وەکـو خـۆی دەڵـێ: لـە رێگایەکی لاوەکی و بەرداویەوە چارەکە سـەعاتێ رۆیـشتن ئـەم دیمەنـە سـێ وێنەیـەمان بـینی، لووتکەیەکی بـەرزە و قووچـەکییە وەکـو منـارە وەسـتاوە پیـاوێ بـەزنجیر لەبـەرزترین لووتکـە بەستراوەتەوە، تەنیا ئێـسقانی ماون، هەرچی زنجیرەکەیە ژەنگی نەگرتووەو هەر ساغ بوون و سـپی بوون وەك تازە درووست کرابن، ئێسقانی قووڵ و بەوشی (زەند) نزیکە (٧-٨) بـاڵ درێـژ دەبـوو، زۆر ئەسـتوور بوو، کەللە سـەری لەقـەبارەی ئـەو گومەزەبـچووکانی ژووری گـەرماوەکان دەبـوو، پێڵوی چاوی لە گەورەییدا لەئاستێ دابوو پیـاو دەیتـوانی بڕواتـە ناوییـەوە، مێـشکی داڵـەکان هێلانەیان تێدا دروست کردبوو، دەوترا ئەمە ئێـسقی پیـاوێکی موسـڵمانە بـڕوای بـە ئیـبراهیم پێغەمبەر هێناوە (ﷺ) و ئەمروود لەسەر ئەو لووتکەیە زنجیری کردووە و ئـاگری تـێ بـەرداوە، خوا ئێسقانی دوای سووتان پاراستووە و هەندێ لەئێسقتنی بەهۆی گەرمی بوبـوون بـە بـەردین، تەنیا ئانیشك و شان و سـەری لەدەرەوەی بەردەکەبوون)[2].

دیارە نەبیستراوەو نەبینراوە لەناو هیچ کتێبەکی زانـستی خۆرئـاوایی ئێـسقانی لـەم جـۆرە مرۆڤانە دۆزرابنەوە لەناو ئاسەوارەکاندا، بەڵام وەنەبێ بۆچـوونی لـەم جـۆرە نـەبێ، بـۆ نموونـە: لەگۆڤارەکی زانستیدا (علوم) سەرەباسێکم خوێندەوە بەناوی (الانسان الثلجي- مرۆڤـی بـەفری)

(١) رحلة اوليا ضليي في كردستان، ت: رشيد فنيدي، ل٢١١ بە کورتکردنەوە.

(٢) رحلة اوليا ضليي، ل١٧٤-١٧٥.



لەدووری گوندی (توست) لەسەر لێواری رووباری (بیجورا)ی رووسی (٥) منداڵ و دوو پیاو پۆشك و تەڵاشیان خڕدەکردەوە، لەرۆخەکەی تری رووبارەکەوە دوو بەژنی زەبەلاحیان لەبەردەمدا دەرکەوت باڵای هەریەکەیان دوو مەتر دەبوو زۆر بەئادەمیزاد دەچوون، بەڵام شاهید حاڵەکان وتیان مرۆڤ نەبوون، رووت بوون تووکی لەشیان داپۆشیبوون و چاویان لەژێر چاوە چرەکانیانەوە دەبریسکایەوەو لەهیکڕا بزر بوون، شوێن پێیان لەدوای خۆیدا بەجێ هێشت، لەقاچی مرۆڤ دەچوون، بەڵام وەکو پێی ورچ پان بوون و قامکەکانیان راخرابوون.

(ڤلادیمیر بوشکاریوف)ی جیۆلۆجیش لەدارستانی سیبیریادا (١٩٦١)دا کە رەوانەی تاووتوێ کردن کراوە ئەم زەبەلاحەیە دەبینێ، پیاوەکی قەبەیە لە دارستانەکە دەردەچێ و چاوەکانی وەکو چرا دەبریقێنەوە و لەشی بەتووك داپۆشراوە لەشی رەش داگراوە تا بەزەحمەت دەم و لووتی جیادەکرانەوەو دەستی زۆر درێژ بوون و هەنگاوەکانی زۆر سەیر بوو هەرئەوەندەبوو زەوی هەڵدەکەند.

دوای لێکۆڵینەوە گوترا ئەمە مرۆڤێکی دڕندەیە لەچیاکان و ئەشکەوتەکان دەژی و خواردنی گۆشتی کاڵە، بەڵام جیا لە دڕندەکان دەیخوات، لێکی هەڵدەوەشێنێ پارچە پارچەی دەکات بەدەمیدا و گریان و پێکەنینی هەیەو لێی بیستراوە، پرۆفیسۆر (پورشنیف) بڕوای وایە پاشماوەی مرۆڤی (هۆمینوید)ن ماون[1].

خوای گەورەش لەراست گەلی عاد و (ثمود) دەفەرمووێ: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ۞ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ۞ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ۞ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ ۞ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ ۞ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ ۞ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ ۞ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾[2].

ابن عباس دەڵێ: (ذات العماد) واتە: وەکو ستوون باڵابەرز بوون، (مجتهد) دەڵێ: (لەش و لاریان لەئاسمان بووە) وەکو لە (تفسير الطبري)دا هاتووە.

---

(١) مجلة علوم، ١٩٨٧، بغداد، ل٦٠، بە کورتکردنەوە.

(٢) الفجر: ٣-١٣.





## ١٣٠- چیاکان میّخن:

چۆن چیاکان میّخن؟ بۆچی خوا چیاکانی کردوون بە میّخ و دایکوتاون؟ رای زانستی جیۆلۆجی بۆ ئەمە چییە؟

﴿أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَاداً ۞ وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً﴾[1].

شیّخی (الزندانی) دەڵێ: (چیاکان بارستایی گەورەو هەڵکەوتەن لەبەردو تاوێر لەشێوەی پارچە و کەرتی گەورەدا لەسەرزەویدا هەن و لەهەمان ماددە پیّك دیّن، ئەم بارستاییانە لەسەر بارستاییەکی تر کە زەوییە خۆیان دادەکوتن، خەڵکی تەنیا ئەوەندە لەراست چیاکان دەزانن، بەڵام کاتێ مرۆڤ چاوی خۆی تیژ دەکات و سەیری خوار ئەم چیایانەو ژێر پێی دەکات و پەی بەو چینانە برد زەوییان پیّك هیّناوە، دەبینی چیاکان چینی یەکەم دەبڕن ئەستووری (٥٠) کم دەبێ، کە توێکڵی زەوییەو ئەم چینە دەبڕێ رەگ و ریشاڵی خۆی لە چینی دووەم دادەکوتێ کە چینەکی بزۆکە وەکو میّخی چادر خۆیان دادەکوتن و قایم دەکەن، توێژەرەکان حەپەساون کە ئەمە لەقورئاندا باسکراوە، ﴿وَالْجِبَالَ أَوْتَاداً﴾[2]. شایانی باسە رەگی چیاکان دوو هەندو نیوی لووتکەی سەرەوەی درێژترە، بێ گەردی بۆ پەروەردگاری جیهانیان)[3].

## ١٣١- چیاکان دەجووڵێن؟

ئایا چیاکان وەستاون یان دەجووڵێن و وەستانیان لەبەرچاو فێڵی چاوە؟ چۆن قورئان و جیۆلۆجیا باسیان کردووە؟

﴿وَتَرَى الْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِيَ تَمُرُّ مَرَّ السَّحَابِ﴾[4].

واتە: تۆ چیاکان دەبینی وادەزانن وەستاون کەچی وەك پەڵە هەور دەڕۆن!

---

(١) النبأ: ٦-٧.

(٢) النبأ: ٧.

(٣) الموسوعة الذهبية، ل٢٠٨.

(٤) النمل: ٨٨.





بێگومان بۆ بابای لێکۆڵەری جیۆلۆجی لەم ئایەتەدا چەند ئیعجازێ دەردەکەوێت:

١-چاو فێڵی هەیەو زۆرجار هەستەکان بەهەڵەمان دەبەن، بۆ نموونە وادەزانین زەوی و ئەستێرەکان وەستاون! یان کاتێ گۆچانی دەخەیە ناو ئاوێکی بڕێ قووڵەوە وادەزانی گۆچانەکە خوار بۆتەوەو...!

٢- زانست سەلماندوویەتی کە زەوی و هەرچی لەسەریەتی بەتەنە قورسەکانەوە وەکو دەریاکان و ئۆقیانووسەکان و چیاکان بەخێرایی (١٦٦٩)کم/س، بە دەوری خۆیداو بە (٥٣٦٢٤)کم/س، بەدەوری خۆردا دەخوولێتەوە، بەڵام چونکە هەموو شتێ لەگەڵ زەویداو بەیەك لادا دەخوولێتەوە هەستی پێ ناکەین.

٣- چیاکان دەکەونە سەر چینی یەکەمی زەوی و ئەم چینە دەبڕن و دەکەونە سەرچینی دووەم کە بزۆکە! وەکو باسکرا خزانی کیشوەرەکانی پەیداکرد.

٤- چیاکان لەئەتۆم پێك دێن و هەموو ئەتۆمەکانیش ئەلیکترۆنەکانیان بەدەوری ناوکدا دەخوولێنەوە، وەکو باسکرا، بەم پێیە چیاکان بزۆکن و وەکو پەڵەهەور دەڕۆن.

٥- هەورەکان وەکو چیان تەنی قەبەو لوتکەدارن بۆ نموونە هەوری (کەڵەکەی موزنی- الركام المزنی-cb) بەرزی لووتکەی لەئاسماندا (١٤)کم، بۆیە لێرەدا قورئان هەورو چیا وێك دەچوێنێت، سەرباری ئەوەش خودا فەرموویەتی: ﴿وَيُنَزِّلُ مِنَ السَّمَاءِ مِن جِبَالٍ فِيهَا مِن بَرَدٍ﴾[1].
وەکو لە گەردووناسی لەسایەی قورئان و فەرمودەدا باسکراوە، ئەم ڕاستییانەش دوای داهێنانی تەلەسکۆب و مانگی دەستکر زانراوە.

دیارە چیاکانیش ئامێرەکی گرنگن لەسەر زەویدا بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی و پاراستنی زەوی لە لێکترازان و قایم کردن و سفتکردنیدا.

---

(١) النور: ٤٣.





## ١٣٢- چیاکان و باران و بەفر:

﴿وَجَعَلْنَا فِيهَا رَوَاسِيَ شَامِخَاتٍ وَأَسْقَيْنَاكُم مَّاء فُرَاتاً﴾[1].

واتە: لەزەویەاندا دامانناوە چیای لەنگەرگرتووی لووتکە بەرز، وە پێمان نۆشین ئاوی سازگار.

لێرەدا قورئانی مەزن چەند زانستەکی جیۆلۆجی و هەواناسی و گەردووننناسی دەردەخات وەکو:

١-چیاکان لەزەوی لەنگەریان گرتووەو بەناخی زەویدا رۆچوون و لووتکەدارن.

٢-چیاکان چاوگی باران و بەفرو بەستەڵەك و ئاوی سازگارن، ئەمەش وای کردووە ببنە دارستان و هاوینەهەوارو شوێنەکی فێنك بۆ دانیشتوانی و گەشتیاران، وە رووبارو کانیاوەکان و بیرەکان سەرچاوەی ئاوەکانیان لەوێوەیە.

زانستی نوێ دەڵێ: وەکو لە گەردووننناسی باسمان کرد گرنگترین هۆکاری سروشتی بۆ ساردکردنەوەی هەوای کەش باوو چیاکانن، چیا بەرزوو سەر کەشەکان کاتێ دەبنە بەربەست لەبەردەم بای ئاسۆیی نزمدا ناچاری دەکاتن هەڵکشێ بۆبەرزایی هەواو سارد ببێتەوەو هەڵمی ئاو لەناویدا ببێ بە هەور، دیسان چیاکان هەمیشە بەفر دایپۆشیون و رەنوە بەفرە بەستەڵەکانیان



(١) المرسلات: ٢٧.



لێیە ئەو هەورانەی بەلایاندا تێ دەپەڕن ساردیان دەکەنەوەو چڕیان دەکەنەوەو باران دەبارێت[1].

## ١٣٢- ڕەقی تـاوێرەکان و چیاکان و نەرمییان:

## داخورانی چیاکان:

لەرابردوو باسی ڕەق و نەرمی تاوێرەاکنمان کردو باسمان کرد کە ڕەق و نەرمی تـاوێری بـۆ جۆری کانزاکان دەگەڕێتەوە کە ئەو تاوێرەیان پێك هێناوە، وە باسمان کرد چیان تووشی داخـووران دەبن، دەڕمێن و پارچەیان لێ دەبێتەوە تا تاوێرەکی تازەو چیایەکی تازەدروست بکەنەوە.

﴿ثُمَّ قَسَتْ قُلُوبُكُم مِّن بَعْدِ ذَٰلِكَ فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاء وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّهِ وَمَا اللّهُ بِغَافِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ﴾[2].

لێرەدا قورئان چەند زانستەکی جیۆلۆجی باس دەکات کەبەسەر تاوێردا دێن، باسی هەنـدێ لەسیفەتەکانیان دەکات و باسی داخوورانیان دەکات:

١- ﴿فَهِيَ كَالْحِجَارَةِ أَوْ أَشَدُّ قَسْوَةً﴾ لێرەدا ئاماژە بەرەقی تاوێری دەکـات و دەفـەرمووێ: دڵانی ئەوان وەکو بەردە یان ڕەقترە.

٢- ﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاء﴾ لێردا ئاماژە بە دەوری ئاوی ژێرزەوی دەگات کە داخوران و شەقکردن لەتاوێردا پەیدا دەکـات و ڕووبارو ئاوو کانی لێوە هەڵدەقوولێ، وەکو دەفەرمووێ: (تاوێر هەیە ڕووباری لێوە هەڵـدەقوولێ، هەیە شەق دەبات ئاوی لێوە دێتەدەر).

٣- ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللّهِ﴾ ئاماژە بە داڕزان و داخوورانی چـیاکان دەکـات، پاشان لەتك و پارچەی لێ دەبنەوە، باوو باران و بەسـتەڵەك کاریـان تـێ دەکـات، واتـە: هێـزی دەرەکی کاریان تێ دەکات وەکو باسکرا.

---

(١) الموسوعة الذهبية، ل٢١١.

(٢) البقرة: ٧٤.





سەیری کتێبی (کوکب الارض) بکە لە (الباب الثالث)دا هاتووە:

(بەندی شەشەم) ئەو هێزە ناوخۆیە خێراو کت و پڕانەی کاریگەری پەیدا دەکەن یەکەم: بوومەلەرزە، دووەم: بورکانەکان، سێیەم: نافوورەکان و چاوگە گەرمەکان.

(بەندی حەوتەم): ئەوهێزە ناوخۆییە زەمینییانەی هێواش کاریگەری پەیدا دەکەن: ١-جوولەکانی نوشتاندنەوە (الالتوات)، ٢-درز بردنەکان (التصدع).

(بەندی هەشتەم): هێزە دەرەکیەکان کەکار لە پێکهاتنی رووی زەوی دەکەن:

١-کرداری وردووخاشبوون (فعل التجويه): خاشبوونی میکانیکی و خاشبوونی کیمیایی.

٢-هۆکارەکانی رووتاندنەوە (فعل عوامل التعريه): (ئاوی سەر روو، ئاوی ژێرزەوی، بای دەشتایی وشك و گەرم، کرداری دەریا، کرداری بەستەڵەك و رەنوو)[1].

گەر ئەم ئایەتەو ئەم بەشکردنانەی (کوکب الارض) بەراورد بکەیت هەموو ئەو کاریگەریانە بەسەر بەرددا دەدۆزییەوە!

(محمود جابر محمود) لەکتێبی (الحجارة بين الوصف القرآني والتصنيف الميكانيكي)دا کە پسپۆڕەکی جیۆلۆجییە کارگەی (ئەرامکوتی سەعودییە) لەراست ئەم چەند ئایەتانە دەنووسێ کە خاوەنی (الموسوعة الذهبية) کورتی کردۆتەوە: (رەقی بەردو بەشەکانی):

رەقی و سەفتی بەرد دیاردەیەکی گەردوونییە، هەر زوو مرۆڤ پەی پێ بردووە لە دروستکردنی خانوو بەرەو چاڵی بیری و وردکردنی دانەوێڵەی و شتی تر بەکاری هێناون کە سەرەتا بەکارهاتوون[2].

بەڵام ئەیزانیووە ئەو دەتوانێ بەبڕێتی حیسابی بۆ بکات و چاکتر دەتوانێسوودی لێ وەربگرێ لەسەرەتاکانی سەدەی بیست و کۆتایی سەدەی هەژدەدا نەبێت، قورئانی پیرۆز

---

(١) کوکب الارض، ل٢٢٧.

(٢) وەکو ئاشی بەرد کە بەئاو هەڵسووڕاوە و سندۆڵ (    ) و دەستاڕ و شتی تر، سندۆڵ چاڵێکە لەبەرد هەڵکەنراوەو بەبەردەکی درێژی لووس کە گەنم و دانەی تری تێدا وردکراوە بۆ کەئەکوتا و شتی تر، دەستاڕ دوو بەردی بازنەیی بوون لەسەریەك دانراون و دانەوێڵەیان لەنێواندا وردکراوە و بەدەست هەڵسووڕاوە.

سەرەنجامی کۆتایی ئەو حیسابە بریتییە (الکمیة)ی کردووە و تاوێری لەرووی رەقییەوە کردووە بە دوو بەشەوە:

١- بەردی شکان (التکسریة) لە میکانیکی زانیدا.

٢- بەردی پلاستیکی (اللدانیة).

رەقی بەرد لەرووی میکانیکازانییەوە:

توێژینەوەی رەقی بەرد لە میکانیکازانی بەردەوە رۆڵەکی گەورەی هەیە، لە جێبەجێ کردنی پڕۆژەی گەورەدا پێویستی پێبونی دەردەکەوێ وەکو: کارگەکان و پردەکان و بەربەستەکان و کۆشك و باڵەخانە گەورەکان، ئەم رەقییە (القسوه) بەهاوکێشەی بیرکاری و نەخشەوە دەخرێتە روو، زۆر لەو گۆڕانانە دەگرێتەوە کە تاقیکردنەوەیان لەسەر کراوە، ئەوەی لەهەمووان پتر گوزارشی لەراستدا لێ دەدرێ لەرووی بریبەوە ئەوەیە کە لە میکانیکازانیدا بەپەیوەندی بەیانی میان ستریس (الاجهاد) و وەڵام دانەوە دەناسرێت.

ئەم پەیوەندییە رادەو چۆنیەتی وەڵامدانەوەی بەرد بۆ ئەو ستریس و فشارە دەردەخات کە تووشی دەبێت، چونکە بەرد لەسروشتدا تووشی جۆرەها ستریس و ماندووبون دەبێ کە فشارو توندییەك دروستی دەکات، چاوگەکەشیان دەرەکی دەبێ وەکو قورسی ئەو تاوێرەی دەکەوێتە سەری، یان ئەو پەستان و توندییەیە جوولەکانی توێکڵی زەوی پەیدای دەکات.

هەرچی فشاری ناخی زەوییە وەکو ئەو فشارو پاڵەپەستۆیەی لەئەنجامی چوونە ژووری ئاوو نەوت و گازە بۆئەو نێوانانەی لەناو بەردەکاندا هەیە، ئەو ستریسە بەهێزدەبێ یان لاواز دەبێت، هەندێ جار خێراییان هێواش دەبێت، لەیەك ئاراستەوە دەبێ یان لەچەند ئاراستەیەکەوە دەبێ، لەئاکامدا بەردەکە وەڵام دەداتەوە، بەهۆی گۆڕان هاتن بەسەر قەبارەو شێوەکەی بەردەکە درز دەدات یان دەشکێت.

وەڵامی تاوێرەکە بۆئەو ستریسە لەگەڵ جۆری تاوێرەکە و دۆخی تاوێرە بۆ ستریسەکە دەسازێت، گرنگترین دۆخی فیزیایی کە گرنگی بەناسینی دەدات لەکاتی ئاشنابوون بەچۆنیەتی وەڵامدانەوەی بەردەکە بۆ ستریس ئەوانەن: پلەی گەرمی کە ستریس و فشار دروست دەکات،




دیسان بڕی ئەو فشارەی دەکەوێتە سەر بەردەکەو، بڕی فشاری ئەو شلەیەی بەردەکە هەیەتی.

## دابەشکردنی بەردەکە لەگۆشەی ستریس (الاجهاد)ەوە:

زانایان تاوێر و بەرد لەرووی میکانیکییەوە، لەگۆشەی ستریسەوە کەبەرد وەڵامی دەداتەوە دەیکەن بەدوو بەشی نموونەییەوەو جۆرەکانی تر تاوێرەکان لەنێوانی ئەو دوانەدا ریز دەبەستن:

جۆری یەکەم: پەیوەندی ستریس بەبەکارهێنانی تاوێرەوە پەیوەندییەکی راستەوانەیە (الطردیة) بەشێوەیەك تا فشارو ستریسەکە بەردەوام بێ بەردەکە پتر وەڵام دەداتەوە، بەهۆی گۆڕانی قەبارەو شێوەکەی، لەگەڵ ستریسدا گۆڕانی قەبارەو شێوازی بەردەکە نامێنێت، ئەم جۆرەیان سەرناکێشێ بە کەرتبوون و شکان مەگەر گۆڕانەکان تێی دانە (٣-١٠٪)ی قەبارە شێوە سەرەتاکەی، ئەم جۆرە بەردە بەبەردی شکانی (التکسري) ناودەبرێت.

جۆری دووەم: پەیوەندی ستریس تێیدا بە وەڵامدانەوەی تاوێری سەرەتا پەیوەندییەکی راستەوانەیە، ئەوە جۆری یەکەمە، تا دەگاتە ئاستی جیری (المرونە) ئەوکاتە پەیوەندی ستریس بە وەڵامدانەوەی تاوێرەکە بەرگەکی تر وەردەگرێ بەوە جیادەکرێتەوە زیاتر وەڵامی ستریس دەداتەوە، بەشێوەیەك گۆڕانی گەورە لەقەبارەو شێوەی تاوێریدا دروست دەگات، هاوکات لەگەڵ هەر زیادبوونەکی کەمی ستریس (الاجهاد).

دیسان بەوە جیادەکرێتەوە بەنەمانی ستریسەکە گۆڕان بەسەر قەبارەو شێوەو رووخساری بەردەکەدا لاناچێ، لەم جۆرەیاندا بەردەکە بەشکان و کەرت بوون کۆتایی نایەت تا گۆڕانەکە لەناویدا نەگاتە رادەی (٥-١٠٪)ی قەبارەو شێوە= نەرم) ئەم بەشکردنە بەشکردنەکی گشتییە بۆ بەرد لەرەقیدا، بەڵام بەردهای پشتی پێ نابەسترێ، چونکە نێو برێك لەمیان ئەم دوو بەشەدە لەبەر ئەوەی رەقییەکەی بەپێی دۆخەکان دەگۆڕێ لەکاتێدا تووشی سترێس و فشار دێ.





## لایەنەکانی ئیعجازی لەم ئایەتە پیرۆزەدا:

### لایەنی یەکەم:

لەکاتی باسکردنی رەقی بەردو تاوێردا یەکێ لە بارو دۆخەکانی باسکردووە کە گۆڕان لەرەقی بەردەکەدا دروست دەکات، ئەویش بوونی ئاوو ئەو برە فشارە نیسبییەیە لەناو تاوێرەکەو گوزەرداریتی تاوێر (نفاذية الحجر)دا واتە: (توانای بەرد تا ئاوی تێ بچێت-permeability).

- (ئەد قەردەبیلو سبنسر) لەکتێبەکەیدا (مدخل الى تركيب الارض)دا باسی کردووە: (تا فشاری ئاو پتر بێ لەناوبەرددا لاوازتر دەبێ و توانای شکانی زۆرتر دەبێت) گەر بەردەکە گوزەرداریتی زۆربێ رێگا دەدات هەمان فشار بەسەر بەشە جیاجیاکانی بەردەکەدا بەش ببێت، ئەوە مەرجەواتە بەردەکە توانای هەبێ ئاو بەناویدا بەئاسانی بڕوات، بەشێوەیەك بەناو بەردەکەدا بڕوا، یان بەبڕەکی گەورە لێوەی هەڵقوڵێت.

لێرەدا پەیوەندی هەیە لەنێوان ئەو پاڵەپەستۆیە ئاوەی لەوبڕە ئاوە پەیدا دەبێ کە رەنگە لە تاوێرەکەوە هەڵقوڵێ و نێوان توانای بەرد بۆ شکان، ئەم راستییەش لە زۆر تاقیگەدا تاووتوێ کراوەو قورئان بەپوختی سەلماندوویەتی: ﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ لَمَا يَتَفَجَّرُ مِنْهُ الأَنْهَارُ﴾. لەوشەی (يتفجر)دا واتە: هەڵدەقوڵێ دوو ئاماژە هەیە:

١-بوونی ئاو لەژێر فشارەکی بەرزدا لەناو بەردەکەدا.

٢- تووشهاتنی بەر دی شکان (التكسر-التصدع) نەك کون کون بوون، ئەمەش فشاری گەورە وای لێ دەکات، وشەی (التفجر) بۆ تاوێر واتە هەڵوەشانەکی بەهێزی کت و پڕ.

هەرچی وشەی (الانهار)ە ئەوە دەردەخات ئاوی ئەم جۆرە بەردانە زۆرە، ئاو تێچوونی و گوزەریتی (النفاذية)ی گەورەیە، ئەم لایەنە ئیعجازییە پەیوەندی بەهێز باس دەکات لەمیان توانای بەرد بۆ شکان و فشاری گەورەی بەرد لەناو بەردەکەدا و گوزەریتی (النفاذية)ی و تێچوونی تاوێرەکە.

**لایەنی ئیعجازی دووەم :**

وەسفەکی وردی جۆری دووەمی بەردو تاوێر دەکات و دەفەرمووێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ﴾. ئەم وەسفە لەسەر ئەوە دادەمەزرێ کە جیاوازی تاوێرو بەرد لەرەقیدا پەیوەستە بەهۆیەکانی ترەوە، جیا لە پێکهاتەی کیمیایی تاوێرەکە، لەم دۆخەدا پەیوەندی رەقی بەرد هەیە بەو فشارە کەمەی ئاو کەلەناو کونوچکەکانی نێوان ئەو تەنۆلکانەدا هەیە کە پێکهێنەری بەردو تاوێرەکەن.

- (ئەدقەر دەبلیو سبنسر) وەسفی ئەو پەیوەندییە دەکات کەلەژێر فشارەکی کەمی ماددەی ناو تاوێرەکەدا هەیە و فشاری لێك خشان لەمیان تەنۆلکەکانی پێك هێنەری بەردەکە زۆر کەمە، ئەو بەردە وردە وردە دەست بە قڵیش بردن دەکات، وەلەو جێگایانەدا تەنۆلکەکان پەیوەندییان پێکەوە لاوازە ئەو تەنۆلکانە لێك دادەبڕێن و دوور دەکەونەوە بێ ئەوەی خەودی تەنۆلکەکان بشکێنن، لەگەڵ ئەو درزانە قەبارەی بەردەکە زۆرتر دەبێت، دەبێ بەجۆرێکی نەرم و پلاستیکی و ناو بەشێوەیەکی زۆر توندو تیژ دەرناپەڕێت، چونکە فشاری ئاو لەناو بەردەکەدا بەهێزە.

ئەم هەڵچوونە بەبڕێکی کەم لەناو ئاماژەیە کە ئەو درزو شکانە (التشقق) زۆر زل نییە، ئەم وەسفە زانستییەی رەقی تاوێرو پەیوەندی بەو بڕە نیسبییەی ئاوو تێکڕای هەڵچوونی لەبەردەکە خوای گەورە لەچەند وشەیەکدا زۆر بەوردکاری هێناویەتی و فەرموویەتی: ﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَشَّقَّقُ فَيَخْرُجُ مِنْهُ الْمَاءُ﴾.

کاتێ دەفەرمووێ ﴿وَإِنَّ مِنْهَا﴾ واتە: هەیە لەو بەردانە، بەوپێیەی جۆری تری تاوێری هەیە لەرەقیدا وەکو جۆری یەکەمیان نییە.

﴿لَمَا يَشَّقَّقُ﴾ کاتێ درز دەبات (يتصدع) لێرەدا ﴿يَشَّقَّقُ﴾ بۆ (المطاوعة)یە، واتە: تاوێرەکە بەهۆی فشاری ناو دەشکێت، ئەو شەقبوون و درزانە وەڵامی ئەو فشارەیە، ﴿فَيَخْرُجُ﴾ واتە لێوەی دەڕوات بە بێ هەڵقوڵین و دەرپەڕین (الاندفاع) چونکە وشەی (يخرج) لێرەدا لە بەرامبەر وشەکەی تری ئایەتەکەیە (يتفجر) لەرابردوویدا، کە دەری دەخات ئاوەکە بەهەڵچوون و زبرەوە

دەردەچێت.

ئینجا دەفەرمووێ ﴿الْمَاء﴾ تا دەری بخات ئەوئاوەی لەوجۆرە تاوێرانە دەردەچێ برەکی کەمە، لێرەدا ئەم وشەیە ﴿الْمَاء﴾ لەبەرامبەر وشەی ﴿الأَنْهَار﴾دا هاتووە لەبەشەکەی رابردووی ئایەتەکەدا وشەی ﴿الأَنْهَار﴾ کۆی (النهر)ە واتە: برە ئاوەکی زۆر.

## لایەنی ئیعجازی سێیەم:

لایەنەکی زانستی و هەم زمانەوانییە، دەفەرمووێ ﴿وَإِنَّ مِنَ الْحِجَارَةِ﴾ یان ﴿وَإِنَّ مِنْهَا﴾ لێرەدا (مِن) بۆ (التبعیض)ە واتە: بەشێ لەم بەردانە نەك هەموویان، چونکە تاوێر لەرووی رەقیەوە زۆر بەشیان لێ دەبنەوە، بەپێی ئەو دۆخەی دێتە سەریان لەفشار و سترێس.

ئایەتەکەی تر کەماوە بۆ تەواوکردنی ئایەتەکە ئەوەیانە﴿وَإِنَّ مِنْهَا لَمَا يَهْبِطُ مِنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ واتە: لەلووتکەی چیاوە دەکەوێتە خوارەوەو فەرمانی خوا بەجێ دێنێت[1].

بەبڕوای من ئەمە لایەنی چوارەمی ئیعجازەو لەگرنگیدا لەسێ ئیعجازەکانی تر کەمتر نییە، ئەویش لایەنی رزین و داخورانی چیاکانە، بەتایبەتی لووتکەکانیان بەهۆی باران و رەنوو بەستەڵەك و هۆکاری تر وەکو باسکرا.

لێرەدا پێویستە لەمێشکی خۆماندا بپرسین ئایا ئەگەر قورئان فەرمایشتی کردگار نەبێ و زانستی بێ سنووری ئەوئەبێ چۆن ئەم راستییە جیۆلۆجییانەی پەی پێ بردوو کە زانستی گەورەترین زانای جیۆلۆجی یان لەئاستدا دێتە خوارێ؟! بەڵێ لێرەدا قورئان دەفەرمووێ ماددە تواوەکانی زەوی دەبن بەچیا، ئەنجا دادەرزێن و چیاکان و تاوێرەکان لێك هەڵدەوەشێن تا تاوێری تازە دروست بکەن و سووڕی تاوێری یان سووڕی جیۆلۆجی دەوام پێ بدەن لەزەویدا، تا زەوی ئاوا بەگەنجی بێنێتەوە، تا دوا تەمەنی دێتە پێشێ و دەمرێت و چیاکانی دەبن بە تۆزو خۆڵ بەهەوادا.

---

(١) الموسوعة الذهبية، ل٢١٣-٢١٨ سەیر بکە.





## ١٣٤- چیاکان و ئەشکەوتەکان جێگای خودا نین! بەڵکو جێگای دابەزینی سورشی خوداین!



(اسحاق عظمیوف) دەنوسێت: (هەمیشە چیاکان کاریگەرییان هەبووە بۆ سەر دڵان، چیا قەبەکان کە لوتکەکانیان خۆ لە کەشکەشانی ئاسمان دەدەن و هەمیشە پەنامەکی دەوری داون و بەستەڵەك دایپۆشیون و نەتوانرا پێیاندا سەربکەون، هەر لە کۆنەوە جێگای ئیلهامی خەلکی بوون و لە بەرامبەریاندا هەستیان بە کەمی خۆیان کردووە. ئەوان بەو دۆخە بەرزو قایمە شوێنەکی باش بوون بۆ خواکان نەك مرۆڤ. خەلکی سەیری چیاکانیان کردووە کە خاکەکی پیرۆزن، بۆیە بۆ نزیك بوونەوە لە خوا وا ڕاستە لەسەر گردی چیاکان بێ نەك دەشتایی و دۆڵەکان.

لە کیتابی موقەددەسدا دەنگی خوا لە کێوی سینا دەبیسترێ، ئەمە لە کاتێ دا بوو(مووسا کلیم الله) دەراسپاردەکانی وەرگرت، لە(کتاب المقدس) دا کت و مت چیاکە دەست نیشان نەکراوە، بەلام گێڕانەوەکان باس دەکەن کە ئەمە(سینا) بووەو لوتکەیەکە دەکەوێتە لای باشووری نیمچە دوورگەی سینا کە(٣٢٠)کم لە باشووری قودس دوورە و بەرزایی(٢٢٨٥)م و خەلکی سینا بە(چیای مووسا) ناوی دەبەن.

بەرزی لووتکەی نزیکە لە چیای(سانت کرین) نزیکەی(٢٦٧٠)م دەبێ، وە ئاماژە دەکات چیایەیەکە لە هەموو شوێنەکانی تر پتر جێگای شکۆیە بۆ خودا، بەلام ئەمە لە گێڕانەوەیەکدا

نەهاتووە. لە(سفر التثنيـة)دا هاتووە خودا فەرمان بە جوولەکەکان دەکـات کـە دروشمـی گـرنگ لەسەر لوتکەی چیاکان ئەنجام بدەن لـە خـاکی تـازەدا کـە داهـاتوو دەڕژێنـە ناوییـەوە، بـۆ ئـەم مەبەستە چیای(mt.gerizim) دیاری کرد، دوایی چیای(عیبال ebal) لە ناوەندی ئیسرائیل دا تا ڕۆژگاریٚ هات ئـەو پەرسـتگایەی سـولەیمان(ﷺ) دورسـتی کـرد لـە قودسـدا بـووە جێگـای خواپەرسـتی جولەکـەکان و شـوێنی هـەموو بـەرزایی یـەکانی گرتـەوە.کەچـی هێـشتا لای(سـامرییەکان) کە گروپێکی جولەکەن(gerizim) شوێنی پیرۆزی ئەوانە، کە بەرزی(٨٥٥)م.

ئیگریکی یەکانی کۆن چیایای(ئۆلیمپیا) لـە بـاکوری یۆناندایـە جێگـای خوایـان دانـاوە و بەرزایی(٢٩٠٠)م لە هەموو چیاکانی نیوە دوورگەی یۆنانی بـەرزترە، بـەرزی چـیای(فوجیامـا) دەگاتە(٣٧٧٥)م و بەرزترین چیای یابانەو لای ئەوانە پیرۆزە.

پاش ماوەیەك بیرورا دینیەکان بوون بە بیروڕایەکی ئاسمانی و شوێنی خواکـان لـە لوتکـەی چیاکانەوە گوازرایەوە بۆ ئاسمان پاشان بۆ ئاسمانیٚ لە بوونی ماددی هەڵگوازیٚ، کە بەشیٚ نەبیٚ لە گـەردوونی مـاددی بینـراو. سـەرباری ئـەوە پێمـان وایـە گومـەزەکان و بورجـەکان بـە سـەر کەڵیساکانەوە و بەسەر مزگەوتەکانی ئیسلامی یەوە و پەیکەری قوچەکی لە بابل و ئەهرامـەکان لە میـسر هەموویان دەستکردی مرۆڤن بیرەوەری ئەو چیایەن خواکان لەسەری دا ژیاون(١).

شیکردنەوەی ئەم بۆ چوونانەی(اسحاق عظیموف) لە ڕوانگـەی ئیـسلام و زانـستی نـویٚ و فەلسەفەو عیرفانی ئیسلامی یەوە:

(١) ڕاستە هەندیٚ لە چیاکان لە قورئاندا بە پیرۆز ناوزەد کراون وەکو چـیای سـینا، وەکـو قورئان دەفەرمیٚ: ﴿وَطُورِ سِينِينَ﴾(٢). واتە سوێند بە کێوی سینا. لەبەرامبەردا دۆڵێکیش هەیـە بە پیرۆز دانراوە﴿فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾(٣).

واتە: ئەی مووسا هەردوو پێڵاوەکانت دابنیٚ تۆ لە دۆڵەکی پیرۆزیت کە طووایە.

(١) اكتشاف الارض والكون ، اسحاق عظيموف، ت: هاشم احمد ، ل:٩١-٩٢.

(٢) التين/٢.

(٣) طه /١٢.

وە قورئان سوێندی بە دەیان شت خواردووە لـە قورئانـدا وەکـو(خـۆر، مـانگ، مەککـە، شەووڕۆژ، نەفس، هەنجیر، زەیتوون......... هتد)، بەڵام ئەمە مانای وانی یە کە ئەوانە خـودان، یان جێگای خودان. بەڵکو پیرۆزی چیاکان و ئەشـکەوتەکانی ئەوانـە بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە کـە شوێنی پێغەمبەران بووەو لەوێ دا خواپەرستی یـان کـردووەو سروشـی یـان بـۆ دابـەزیوە، یـان قەڵایەك بوو بۆ پاراستنی ئەوان لە دوژمنایان، ئەنجا شوێنەکی ئارامن بۆ خواپەرستی.

(۲) کـاتێ ئیـسلام هـات یەکـەم ئامـانجی لابردنـی هاوبەشـی پەیـدا کـردن بـۆ خـوداو بیرونەندێشەی ئەفسانەیی بوو کە بیروبڕواو شەریعەتەکانی مرۆڤایەتی گرتبۆوە، نەك ئیـسلامیش درێژەپێدەری ئەفسانەی بیرو بڕوای پێشینان بێت وەکو(اسحاق عظیموف) بۆی چووە.

(۳) لە ئیسلامدا خودا لە کۆتی زەمەن و مەکاندا نییەو خودا لە هەموو جێگایەکە﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ الحدید:٤ واتە: لەهەر کوێ بن خوا لەگەڵتاندایە.

پێشەوا عـەلی(ع) دەفـەرمێ: (کـائن لاعـن حـدث، موجـود لاعـن عـدم، مـع کـل شـیء لابمقارنة، وغیر کل شی لا بمزایلة، فاعل لا بمعنی الحرکات، والالـة، بـصیر اذ لا منظـور الیـه مـن خلقه....) [1].

واتە: بووە پەیدا نەبووە هەیە بەڵام نەك لە عەدەمەوە، لەگەڵ هەموو شتێ دایـە نـەك بـە جووت بوون، غەیری هەموو شێکە نەك بە نێوان، بکـەرە نـەك بـە مانـای جوڵـەکان و ئـامێر، بینەرە، کەس کەس نابینێ لە دوورستکراوانی.

ڕاستە هەندێ لە زانایان(الاسـتواء) وەك﴿ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ﴾[2]. بـە مانـای(عـلا وارتفع) مانایان کردووە. واتە: بەرز بۆوە وەکو لە(البخاری)دا هاتووە. بەڵام(الاسـتاذ ابـوبکر بـن نورك) لە هەندێ یارانی خۆی دەگێڕێتەوە: (مانای ئەمە بەرز بوونەوە نییە بەمە سـافەو نێـوان و بون لە جێگایەکدا کە لەوێدا بنیشێ، بەڵکو مانـای وایـە هـیچ شـتێ دەوری خـوای نـەداوە. مامۆستا(ابو منصور بن ابی ایوب) دەڵێ: زۆر لە زانایانی پاشینەی خۆمـان(الاسـتواء) وا مانـا

---

(۱) نهج البلاغة/ بشرح ابن الحدید المعتزلي/ ج:۱ / ل:۹۱.

(۲) الاعراف:٥٤.

دەکەن(أي القهر والغلبـة) واتە خوا دەسەلاتی بەسەر عەرشدا گرت کە گەورەترین دوروست کـراوی ئەوەشتی گەورەی خستۆتە پێش شتی نزم تر. وە(الاستواء) بە مانـای زاڵ بـوون لـە زمانـدا زۆر بەکاردێ وەکو: شاعیر لە ڕاست(بشر بن مروان) دەڵێ: (قـد اسـتوى بـشر علـى العراق مـن غـير سيف ودم مراق)[1].

(ابو منصور عبدالقار بن طاهر بن محمد البغدادى) دەڵێ:

(زانایان کۆکن لەسەر ئەوە کە هیچ جێگاو کاتێ دەوری خوا نادات، پێچەوانەی(الحشامية) و(الكراميه) کە بروایان وایە ئەو لەسەر عەرشی یەتی، پێشەوان بڕواداران عەلی(ر) فەرمویـەتی: ( ان الله تعالى خلق العرش اظهارا لقدرته لامكان لذاته) یان(قد كـان ولا مكـان وهـو الان علـى ما كـان) . واتە: خوا عەرشی دوروست کردووە بۆ دەرخسـتنی توانای خۆی نەك جێگایـەك بـێ بـۆ زاتی ئەو. یان(ئەو هەبووە جێگای نەبووە ئێـستاش هەروایـە). بێگومـان ئەمـە ڕای ئیـسلام و سەلەفی ساڵح و خەلەفی ئیسلامە کە خودا دەوری هـەموو شـتەکی داوە نـەك زەمـان و مـەکان دەوری خوای دابێت، خوا لە شتەکان نزیکە نەك ئامێتە بووبێ، لە شتەکان دوورە نـەك نێوانیـان هەبێت.

(٤) گومەزی سەر مزگەوتەکان هەرگیز دورشمی ئەوە نییە خـوا لەسـەر چـیاکانە، بـەلکو گومەز تەنیا نیشانەیەکە بۆ ئەوە تا مزگەوتی پێ لە خانووبەرە و بینای تـر جیـا بکرێتـەوەو لـە دوورەوە پێ ی بزانرێت.

**هەندێ لە چیاو دۆڵ و ئەشکەوتە پیرۆزەکان لە قورئان و سونەتدا:**

## ١٣٥-کێوی جودی لە کوردستان.

## ١٣٦- لافاوی نوح لە کوردستاندا.

## ١٣٧- چۆن لافاوەکە رویدا؟

---

(١) الاسماء والصفات / للبيهقي/ ج:٢ / ل:١٥٢.

## ١٣٨- ئایا لافاوەکە ئیقلیم گیر بووە؟!

## ١٣٩- نوح کێیە؟

## ١٤٠- بۆچی کوردستان؟

- قورئان دەفەرمێ:

﴿وَقُل رَّبِّ أَنزِلْنِي مُنزَلًا مُّبَارَكًا وَأَنتَ خَيْرُ الْمُنزِلِينَ﴾(١).

واتە: ئەی نوح بڵێ: پەروەردگارم لە شوێنەکی پیرۆز و بە فەرم دابەزێنە، تۆ باشترین کەسی بۆ دابەزاندن.

﴿وَقِيلَ يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءكِ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ (٢).

واتە: وەوترا: ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدەوە، ئەی ئاسمان ئاوەکەت هەڵکێشەوە، ئاوەکە کەم بۆوە، فەرمانەکە ئەنجام درا، لەسەر جودی لەنگەری گرت، وترا دوری لەبەزەیی خوا بۆ گەلی ستەمکاران.

(د: زغلول النجار) زۆر ئایەتی زانستی ئیعجازی جیۆلۆجی و ئیعجازی مێژوویی لەم چەند ئایەتەدا دەست نیشان دەکات: (باس دەکات کە سورەتی هود زۆر ئاماژەی گەردوونناسی تێدایە. ئەوەی لێردا باسی دەکەین لە ڕاست نیشتنەوەی کەشتی نوحە(علیە السلام) لەسەر کێوی جودی. کەچی زانیاری یەکانی ئەهلی کیتاب سورە لەسەر ئەوە لەسەر کێوی(ئەرارات) لەنگەری گرتووە. بەڵام بەکرداری پاشماوەکانی کەشتی یەکە لەسەر کێوی جودی دۆزراونەوە کە(٢٥٠) میل لە باشوری خۆرئاوای چیای ئەراراتەوەیە لەو سەری باکوری خۆرهەلاتی تورکیاوەیە(٣).

---

(١) المؤمنون:٢٩.

(٢) هود:٤٤.

(٣) وەکو(السماء ذات الرجع). واتە: سوێند بە ئاسمانی گێڕەرەوە، کە هەڵمی ئاو لە شێوەی باران و بەفرو تەرزە و شەونم دا دەگێڕێتەوە.

## چەند ئیعجازی زانستی لەم چەند ئایەتەدا:

دیارە دوای ئەوەی خوای گەورە گەلی نوحی بەلافاو لەناوبرد تەنیا سەرنشینەکانی سەر کەشتی یەکە نەبێ، خودا فەرمانی بە زەوی کرد وەکو(الزغلول) باس دەکات و چەند مەسەلەی زانستی یان تێدایە:

**(١): ﴿يَا أَرْضُ ابْلَعِي مَاءَكِ﴾:**

واتە: ئەی زەوی ئاوی خۆت قوت بدەوە. لەم ئایەتە قورئانیە دا ئاوەکە دراوەتە پاڵ زەویەکە، زەوی خۆمان دەڵەمەندترین هەسارەی ناسراوە کە خاوەن ئاوەکی زۆرە برەکەی(١,٤٠٠)ملیۆن کم٣ یە، بۆیە زەوی بە هەسارەی ئاو یان هەسارەی شین ناسراوە. هەر لە کۆنەوە زانایان سەریان لەم هەموو ئاوە سەر سوڕماوە کە چاوگەکەی لە کوێوەیە، کە بەبێ بوونی ئەوە ژیان لەسەر زەوی ڕێتێ چوو نابێت. لە ڕاست ئەمەدا زۆر لێکدانەوە دانراوە، وەکو تیۆری بەرکەوتنی کلکدارەکان، هەموو ئەو تیورانە ڕمان، تا زانایانی بورکان زان کەوتنە لێکۆلینەوە لە پێکهاتەی ئەو گازو هەڵمانەی لە کونی بورکانەوە بەرز دەبێتەوە، بینرا(٧٠٪) هەڵمی ئاوە، بە پێ ی لێکۆلینەوەیەکی بیرکاری سادەی ژمارەی دەمی بورکانەکان لەسەر زەوی دا و ڕادەی هەڵچونی هەریەکە لەوانەو ناوەراستی ئەو هەڵمەی لە هەر هەڵچوونێ دا بەرز دەبێتەوە زانایان گەیشتنە ئەو بروایە، ئەوەندەی ئاوی سەر زەوی یە، کە لە سەر زەوی کۆبۆتەوە، وە لە ناو تاوێرەکان و نیشتوەکانی توێکلەکەی داو لە بەرگە هەواکەی دەوری دا، واتە: (١,٤٠٠)ملیۆن کم٣ یە، بەو پێیە هەموو ئاوی سەر زەوی خودا لە زەوی دەرهێناوە﴿وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَٰلِكَ دَحَاهَا﴾ وەکو رابردوو باسکرا.

قورئانی پیرۆز لە چەندان ئایەتدا باسی سوڕی ئاو لە سورشتدا دەکات(وەکو باسکرا).

بەڵام کاتی خوا فەرمویەتی: ﴿ابْلَعِي مَاءَكِ﴾ جەخت کردنەوەیە کە هەموو ئاو لە ناخی زەوی هاتۆتە دەر. ئەمەش ڕاستی یەکە قورئان بەر لە زانستی ئەزموونی دەستی خۆی پێش خستوە، تەنیا لە کۆتایی یەکانی سەدەی بیستەمدا پەی پێ براوە، دیسان دووپات کردنەوەیە کە سەرچاوەو کانیاوەکانی ژێر زەویش بەشداریان لە لافاوی نوحدا کردووە: ﴿فَدَعَا رَبَّهُ أَنِّي

مَغْلُوبٌ فَانتَصِرْ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاء بِمَاء مُّنْهَمِرٍ وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاء عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاء لِّمَن كَانَ كُفِرَ وَلَقَد تَّرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾[1].

واتە: دەرگاکانی ئاسمانمان والاَ کردن بە ئاوی هەلڕژاو، زەویمان تەقاندەوە بە سەرچاوەکان، ئاوەکان تێکەلْ بوون لەسەر فەرمانێ کە بریاری لێوە درابوو، ئەومان هەلگرت لەسەر چەند تەختەو بزمارێ، بە چاودێری ئێمە دەرۆیشت وەکو تۆلەیەك بۆ کەسانێ بێ بروا بوون، ئەوەمان وەکو موعجیزەیەك بەجێ هێشت، ئایا کەسێ هەیە بیرەوەری بکات؟

## (٢) موعجیزەی دووەم﴿ وَيَا سَمَاء أَقْلِعِي﴾.

واتە: ئەی ئاسمان ئاو هەلکێشەوە. ئەم ئایەتە قورئانیە جەخت دەکات لافاوی نوح بە ئاوی شیرین و سازگار بووە، جیا لەو لافاوانەی بە درێژایی مێژوو بە هۆی هەلسانی دەریایی و ئۆقیانوسی زەوی توشیان هاتووە.

سەرباری ئەوە دوو زانای فیزیایی ئەمریکی لە سالْی١٩٩٨ دا بە ناوی(ولیەم ریان – William ryan) و (ولتەر پەتمان – walter pitman) هاتن بیسەلمێنن لافاوی نوح بە ئاوی دەریا بووە، کتێبەکەشیان ناوی(لافاوی نوح)ە ئەم دوو زانایە جەخت دەکەن ئەو لافاوەی ئەوان باسی دەکەن لە ڕاست لافاوی دەریایی بەسەر دەریاچەی شیریندا ڕوودداوەکی سروشتی بووە پەیوەندی نییە بە ڕووداوی لافاوی گەلی نوحەوە(علیه السلام).

ئەم دوو نوسەر جەخت دەکەن ئەم ڕووداوە بە لە(٧٦٠٠) سالْ ڕویداوە، کاتێ بەرزبوونەوەی ئاوی دەریاکان و ئۆقیانوسەکان بووە هۆی پالْنانی ئەو ئاوە سوێرە لە دەریای سپی ناوەراستەوە بەسەر دۆلْی بۆسفۆردا تا هەرشتێ بێتە پێشی کاولی بکات و چەند کۆچکردنەکی گەورەی مرۆیی بقەومێنێت.

بەلاَم دۆزینەوەی پاشماوەکانی کەشتی نوح لەسەر لوتکەی جودی کەکەوتبوە ژێر قوڕو

---

(١) القمر:١٠-١٥.



لیتەیەکی نیشتویی ئاوی سازگار لە باشوری تورکیاوە تاسەر کەنداوی عەرەبی درێـژ دەبێتـەوە و ئەو ڕووبەرە فراوانەی نێوان دیجلە و فورات دەبڕێت، گومانی هەردوو ئەمریکی یەکان لادەبـات و دەری دەخات ئەم لافاوە بە ئاوی سازگار بووە، کە بارانی بە خوڕو ڕێژنە و تەقینەوەی کانیاوەکان و نافورەکان دورستی کردووە، ئەمەش قورئان بەر لە ١٤٠٠ ساڵ ئاوا وەسفی کردووە.

## (٣) ﴿وَغِيضَ الْمَاء وَقُضِيَ الأَمْرُ﴾ :

وشەی(غِيضَ) واتە: (غاض الماء : أي قل ونضب). واتە: ئاوەکـە کـەم بـۆوە و ڕۆیشـت و نەما.لێرەدا ئایەتەکە ئەوە دەردەخات ئاوەکە لە ووشکانی دا نەما، چونکە بەشـیَ زەوی قـووتی داو بەشەکەی تر تێکەڵ بە ئوقیانوس و دەریاکان و چاڵ و نەرمایی یەکانی زەوی بۆوە، لـە(سـفر التكوين) دا هاتووە: (خوا بایەکی نارد ئاوەکەی هێور کردەوە) من نازانم با چ پەیوەندی هەیە بە لابردنی ئاو لەسەر زەوی دا.

لێرەدا پرسیاریَ دێتە پێش، کە زۆر گرنگە: ئایا لافاوی نوح ئیقلیم گیر بووە و هەموو گۆی زەوی گرتۆتەوە، یان سنووردار بووەو ناوچەی گەلی نوحی گرتۆتەوە. شـوێنەوارزانان دەڵـێن: ئـەم ناوچەیە دەکەوێتە ناوچەیەکەوە لە چیاکانی تورکیاوە درێژ دەبێتەوە لە نێوان دیجلەو فـورات دا و ئەو دەشتایی یەی لە دەوریاندا درێژ بۆتەوە تا کەنداوی عەرەبی[1].

هێشتا ئەو پرسیارە وەڵامەکەی یەکلانەبۆتەوە، هەرچەند جولەکەو مەسیحی بڕوایـان وایـە لافاوەکە جیهان گیر بووە(سفر التكوين:١٨/٧:٢٤) لۆژیك دەڵیَ خـاکی نـوح سـنووردار بـووە و هەموو کوڕانی ئادەم لەویَ کۆبونەوە، پاشان ئەوانەی ڕزگار دەبن بە هەموو دەڤـەرەکانی زەوی دا بلاّودەبنەوە.

---

(١) لێرەدا نوسەر کەنداوی فارسی بە کەنداوی عەرەبی ناو دەبات و کوردسـتانیش بـە تورکیـا نـاو دەبـات، ئـەم دوو ناوەش هەردووکیان ستەمێکی مێژووین، چونکە کەنداوەکـە کەنـداوی فارسـە و جـودی و دیجلـەو فـورات خـاکی کوردسـتانی داگیر کراوە بەسـەر چوار وولاّتی داگیرکەردا، کە لە پەیمانی لۆزاندا(١٩٢٣) دا بە تەواوی جێبەجیَ کرا. بەلاّم خوا بەڵێنی داوە تـالاّ ڕەشـە کوردەکـان، کـە(٧٠) هـەزار کـوردە لـە شۆڕشـەکەیاندا یـەکجار کوردسـتان دەکێڕنەوە کە دورشمیان(بکوژ بکوژە) و شۆڕشی نوح و ئیبراهیم دووبارە دەکەنەوە. وەکو لێرەدا باسی دەکەینەوە.




## (٤) ﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾ :

لەم دەقەی قورئانی پیرۆزدا جەخت دەکات کەشتی نوح لەسەر چیای جودی لەنگەر دەگرێ. ئەم چیایە دەکەوێتە باشوری خۆرهەلاتی تورکیا بۆ باکوری خۆرهەلاتی دوورگەی( ابن عمر) لەسەر کەناری دیجلە، لە نزیك سنووری تورکیا و عێراق و سوریادا بۆ باکوری شاری ئەینەوا.

تاقی کردنەوە شوێنەوارەکانی وەکو تاقیکردنەوەکانی(مارتن رەوی — martin wroe) لە ساڵی ١٩٩٤ ز داو چارلس ویلز(charies willis) ساڵی ١٩٨٠ داو جون مۆتز گومری(Montgomery john warwick) لە حەفتاکانی سەدەی رابردوداو هەموو ئەوانەی سەلماندیان پاشماوەکانی کەشتی نوح لەسەر کێوی جودی(monunt cudi or judi bogh) کە ٢٥ میل لە باشوری خۆرئاوای چیای(ئارارات) دوورە. دوای ئەوەی یەکێ لە شوانە کوردەکان لە نیوەراستی مایۆ(١٩٤٨ز) دا جێگایەك لەوێ دەدۆزێتەوە.

چیای جودی بەرزترین لوتکەیە لە چیاکانی باشوری تورکیادا، بەرزی(٢٠٣٣) م لە ئاستی رووی دەریاوە. لە نیوەی مایۆی ١٩٤٨ ز دا شوانەکی کورد بە ناوی(رەشید سەرحان) کەشتی نوح و پاشماوەی تەختەکانی دۆزییەوە کە لە ژێر لیتەو قوری ناوی شیرین کەوتبون لە لوتکەی چیای جودی دا. دوای ئەوە لە ساڵانی(١٩٥٣، ١٩٥٩، ١٩٨٠، ١٩٨٧، ١٩٩٧، تا ئیمرۆش لیکۆلینەوە لەسەر جێگاکە کراوە.

دیسانەوە نیشتەنیەکی ئەستووری ناوی سازگار لە دەشتایی میان دیجلە و فورات دۆزرایەوە، کەلانکی زۆرێ لە شارستانیەکانی کۆن بووە، هەندێکیان دۆزراونەوە. ئەوەی راستی بێ ئەم نشتوانە پاشماوەی کەشتی نوحە، چونکە ناسۆیی یانە بە رووبەرێکی فراوانی زەوی دا بلاوبۆتەوە، ئەنجا ئەستورایی(١٠) پێ یەو تەمەنی(٣ — ٧) هەزار ساڵە بەر لە زایین. ئەنجا زۆری لەو گوندە دێرینانەی داپۆشیوە، لەمیان(١٩٢٢ — ١٩٣٤) بەردەوام لێکۆلینەوەیان لەسەر کراوە، تا ئێستاش بەردەوامە.

ئەم سەرنجامانە بە توێژنەوە کردن لەسەر ئەو ماددە نیشتوانە جەختی لەسەر کراوە کە لەیەکێ لە ئەشکەوتەکانی باکوری عێراق بە ناوی شانەدەری گەورەکۆبۆتەوە، تەمەنی ئەم

نیشتوانە بۆ ١٠٠ هەزار لەمەوبەر دەگەڕێتەوە و هەندێ پاشماوەی ئێسق و پرێسکی مرۆڤیشی لەگەڵدا بوو، ئەم ئەزموونانە زانای روسی(د: رالف سۆلسکی – Ralph s.solecki) لە پەیمانگای سمسثویان لە ئەمریکا پێیان هەڵسا. دیسان ئەو سەرەنجامانەی بە دیاری کردنی تەمەنی ڕەهای ئەو پارچە تەختانەی لەو کەشتی یە مابونەوە دوپات کرانەوە بە هۆی کاربۆنی تیشکدەرەوە(الکاربون المشع)، کە دەکەونە سنووری(٤٥٠٠ پ. ز)، (مارتین رەوی) لە ڕۆژنامەی(نوبزرفر)ی لەندەنی دا لە ١٦ ینایر ١٩٩٤ دا بلاوی کردەوە.

(اصحاح/٨) لە (سفر التکوین) دا (کەشتی یەکە لە مانگی(٧) ڕۆژی(١٧) دا لەسەر کێوی ئەرارات نیشتەوە). کەچی زۆرێ لە گێرانەوە مێژوویی یەکان ئاماژە دەکەن کەشتی نوح لەسەر جودی نیشتۆتەوە. وەکو کتێبەکانی بیراسوس(berasus) دا هاتووە لە کاهینەکانی شارستانی بابلی. وە ئەبیدۆنس(abydenus) ی قوتابی(سوکرات) وە ئاماژەکانی شارستانی کۆنی یۆنانی، سەرباری ئەوە هەوڵی خۆرئاویی یەکان بۆ سەلماندنی ئەوە کە کەشتی نوح لەسەر چیای(ئەرارات) نیشتۆتەوە بەمەبەستی بەرگری کردن لە دەقی کیتابی موقەدەس بێ هودەیە. تا گرووپێ لە زانایانی روسی لە هەینی(٢٠٠٥/٣/٢٥ ز) دا لە کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەوانی دا ئاژانسی ئینتەر فاکس(the interfax news agency) ڕایان گەیاند کە هیچ شوێنەوارێکی کەشتی نوح لەسەر چیای ئەراراتدا نیە و هەموو سەرچاوەو نمونەکان کە توێژینەوەیان لەسەر کراوە ئەوە دوپات دەکەنەوە.

دیسان توێژینەوەکانی(ڤادین چێر نۆبۆرژۆ – vadin cher noborv) بەڕێوەبەری مەڵبەندی(کۆزموبویسك) ی توێژینەوە زانستیەکان ئەم ڕاستیەیان دوپات کردەوە، کە دەستەیەك زانای بۆ لێکۆڵینەوەی ئەوە ناردبوو.

کۆنگرەی ڕۆژنامەنوسی ئاماژە پێ کراو ڕای گەیاند: دوای ئەوەی ئەو بورکانەی ساڵی(١٩٤٠ ز) چیای ئەراراتی گرتەوە هەموو شوێنەوار و بەردینەکی ئەو ناوچەیەی لە ناوبرد لەوانە پاشماوەی ڕووەکی بەردینی، کە هەندێ خەڵکی ڕابردوو بە هەڵە وایان دەزانی پاشماوەی کەشتی نوحە، لێرەدا ناتوانرێ بگوترێ هیچ پاشماوەیەکی کەشتی نوح لەسەر کێوی ئەراراتە، ئەم

گروپە لە ساڵی (٢٠٠٤ ز) بە تاووتوێ کردنی چیای ئەرارات هەڵسان، زۆر کاسێتی ڤیدیۆیی و نمونەی تاوێری(العینات) وەکو رووەکی بەردینی و ئەو تاوێرانەی لە شێوەی دەستکرد و نیمچە دەستکرد دا خورابوون لەگەڵ خۆیاندا بردنەوە، توێژینەوەکان سەلماندیان ئەوانە کرداری چالاکی بورکانین و پەیوەندییان بە کەشتی نوح پێغەمبەر نییە کە لە لەسەر جودی کەشتی نیشتۆتەوە.

## (٥) ﴿وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾:

ئەم تێکستە قورئانیە ئاماژە دەکات لەناوبردنی بێ بڕواو بت پەرستانی گەلی نوح بووە هۆی رزگار کردنی مرۆڤایەتی لە شەرو خراپەکاریەکانی مرۆڤایەتی، گەر رزگاریان بوایە خراپەکاریەکی گەورەیان دەخستە زەوییەوە، کە زۆر لە خراپەکاریەکانی ئیمرۆ بتر ببێ و وەچەکانیشیان رێ و شوێنی ئەوانیان هەڵدەگرتەوە لە خراپەکاری دا، بۆیە خوداوەند بنەبڕی کردن و تاقەواری نەهێشتن، چونکە دەیزانی پشتی ئەوان چ سیفەت و ڕەوشتەکیان هەڵگرتووە، بۆیە فەرمایشتەکە ئاراستەی ئەوانە﴿وَقِيلَ بُعْداً لِّلْقَوْمِ الظَّالِمِينَ﴾ لەبەر ئەوە بەشێ لەو عەمبارە بۆ ماوەیەی ئادەمی باوکمان هەڵی گرتبوو لە لافاوەکەدا لە ناوچوو، یاساکانی بۆماوە لە دوای ئەمەودیەو جەخت لەسەر ئەوە دەکات[1].

## بەسەرهاتی نوح لای گەلانی دێرین و تابلۆ دێرینەکاندا:

مەسەلەی بەسەر هاتی لافاوی نوح جگە لە تەورات و کیتابی موقەددەس لە ناو زۆرێ لە تابلۆ دێرینەکانی گەلانی ڕابردوو دا کە زۆربەی لە تەوراتدایە باس کراوە، دوایی تێکەل بە هەندێ ئەفسانە بووە، لەوانە:

### (١) بەسەر هاتی لافاوی سۆمەری:

ساڵی(١٨٥٣) ڕەشنوسەکی بەسەر هاتی لافاوی بابلی دۆزرایەوە، لەمیان(١٨٨٩ — ١٩٠٠ ز) دا یەکەم گروپی شوێنەوارزانی ئەمریکی بە توێژینەوە هەڵسا لە عێراقدا، کە تابلۆیەکی قورینی

(١) مدخل الى دراسة اعجاز العلمي / د: زغلول النجار/ ل:٢٤٦-٢٥٣. بەهەندێ کورت کردنەوە.



سۆمەری بوو باسی لە بەسەر هاتی لافاوەکە دەکرد لە شاری(ینبور – نفر)دا، کە دوورنیە بۆ سەردەمی شا(حەمورابی) یان بەرلەوە بگەرێتەوە.

پوختەی گێرانەوەی بەپێ ی گێرانەوەی سۆمەری ئەوەیە کە لە ڕاست شایەك قسە دەکات بە ناوی(زیو سودا) بەتەقواکار وەسف دەکراو لە خوا دەترسا و بە ملکەچی و خاکی یەوە لە خزمەتی دابوو، هەواڵی پێ درا خواکان لافاوێك بە باران و هەورە تریشقەوە دەنێرن، حەوت شەوو رۆژی دەخایێنێت، ئەم لافاوە سەر زەوی ڕادەماڵێ، دیسان(زیو سودا) بەو کەسە وەسف دەکات کە بە دورست کردنی کەشتیەکە رەگەزی مرۆڤایەتی رزگار کرد. ئەمەش ئەم رایەی بە درۆ خستەوە گوایە تەورات کۆنترین سەرچاوەیە باس لە لافاوی نوح بکات.

**(٢) بەسەر هاتی بابلی لە ڕاست لافاوەکەدا:**

**(١) داستانی گلگامش:** ( لە دیسەمبەری(١٨٧٢ ز) دا(سیدنی سمث) ڕایگەیاند کە لە کۆکردنەوەی تەواوی پارچە بلاوەکانی داستانی گلگامشدا سەر کەوتووە و لە(١٢) سرودا گوتراوە، یان وا چاکترە بڵێین تابلۆ، بەسەرهاتی لافاوەکە لە تابۆی(١١) دایە، کە پوختەکەی ئەوەیە لێرەدا پیاوێ هەیە بە ناوی گلگامش خوا فەرمانی دایە کەشتی یەك دورست بکات و واز لە موڵك بێنێ و تۆوی هەموو شتێ بخاتە ناو کەشتی یەکەوە، پاشان کەشتی یەکە لەسەر کێوی(نیسیر = نیزیر) نیشتەوە لەمیان دیجلە و زێ ی خوارەوەدا).

**(٢) بەسەر هاتی بیرو سوس:** لە نیوەی یەکەمی سەدەی(١٣ پ.ز) دا ڕۆژانی دەسەڵاتی شا(ئەنتیوخوسی یەکەم(٢٨٠ - ٢٦٠ پ . ز) دا کاهینەکی خوا هەبوو(ردوك)ی بابلی بە ناوی(بیرو سوس) مێژووی وولاتی خۆی لە سێ بەشدا بە زمانی یۆنانی دەنوسێتەوە، کتێبەکە باس لە لافاوەکە دەکات و دەڵێ: پاشایەك دەبێ بە ناوی(ئەکسیسو تروس)، ئەم پاشایە خەون دەبینێ خودا هۆشیاری دەدا کە لافاوێ زەوی دەگرێتەوە کشتوکال و گیانداران لە ناودەبات و باکەشتی یەك دورست بکات و پەنای بۆ ببات.

**هەندێ بەلگەی شوێنەواری ڕاستی لافاوەکە دەسەلمێنێ:**

هەندێ مێژوو نووس وای بۆ دەچن، هەروەها هەندێ لە مێژوونوسانیش کە لافاوی نوح هەموو زەوی نەگرتۆتەوە، بەلکو چەند ناوچەیەکی دیاری کراوی گرتۆتەوە لە دۆڵی دوزێ دا و چەند دەستەیەکی ئاسەواری بۆ ئەو شوێنانە ڕەوانە کراون بۆ لێکۆلینەوە لەو چەند ناوچانە کە چەند شارستانی یەکیان بە خۆوە بینیوە، وە بینراوە کە ئەم ناوچانە لافاوەکی گەورەیان بەر کەوتووە و شارستانی(سۆمەری) لەناو بردووە کە لە دەشتایی یەکانی دۆڵی دوزێ دا دانیشتوون ئاسەوارەکانی لافاوەکە بە ئاشکرایی چوار شاری سەرەکی دۆڵی دوزێ ی گرتۆتەوە: ئەور، ئەریش، شورباك، کیش. تاوو توێ کردنی ئەم ناوچانە ئەوەی دەرخست کەبەر لە(٣٠٠٠) ساڵ لافاو گرتونیەوە.(اور) ئیمرۆ بە(تل الکیار) ناسراوە مێژووی بۆ(٧٠٠٠ پ. ز) دەگەرێتەوە. ئەم زانایەی رابەرایەتی ئەم شاندەی کرد(سیر لیونارد ولی) لە ساڵی(١٩٢٨)دا. بینرا ئەو ناوچانە بە لیتەو قوڕ داپۆشی لە ئەنجامی لافاوەکەدا کەڵەکە بووە.

(شاری کیش) : شارەکی تری وولاتی دوزێ یە شوێنەواری لافاوی پێوە دیارە و شوێنەکی دەسەلاتی خێزانی دەسەلاتدار بووە ئێستا عەرەب بە(تل الاحیمر) ناوی دەبەن.

شاری شورباك: ئیستا عەرەب گۆریویانە بە(تل الفرح). توێژینەوەی(ئەریش سکمرت) لە زانکۆی بنسلڤانیا لە(١٩٢٠ – ١٩٣٠) بە توێژینەوەی ئەم ناوچەیە هەڵسان و سێ چین ناوەدانیان دۆزییەوە بۆ چاخی بەر لە مێژوو دەگەرێتەوە، وەکو شاری ئەور(٢١١٢ – ٢٠٠٤پ.ز) دۆزراوەکان چەند بینایەکی جوان و چەند نوسراوەکی بزماری بوون، چەند لیستێ بوون لەوشەو نوسراو، ئەوەیان دەردەخست لە هەزارەی چوارەمی بەر لە زایین پێشکەوتن هەبووە[1].

(١) ایات الاعجاز العلمی من وحي الكتاب والسنه / عبدالرحمن سعد صبي الدين / ل: ١٢٨ – ١٣٢ بە کورت کردنەوە.

## سۆمەریەکان کێن؟

(ڤــادن) کــە جــاران مامۆســتای زانــستگای لەنــدەن بــووە، فەرهەنگــەکی نوســیوە بــە ناوی(سۆمەریانی ئاری) سەلماندویەتی سۆمەریەکانیش ئاری بوونە[1].

هەرچی زانای گەورەی بەرەگەز کورد(عباس محمود العقاد) ە دەنوسێ: وەکو(البرایت) بڕوای وایە(ئەکەدیەکان و ئاشوریەکان و بابلیــەکان زمــانی ســامی بــوون). وە دەنوســێ(ســۆمەریەکان بەزۆری لە ڕەچەڵەکدا مەگۆلی بوون) و (حشی یەکان) بە زۆری ئاری بــوون لــە خۆرهەلاتــەوە بــۆ ئاسـیای بچووك چوون[2].

من بروام وایە سۆمەریەکان مەگۆلی داگیر کەر بوین، وەکو مێژوو خۆی دووبارە دەکاتــەوە هاتبن ولاتی گۆتیەکانیان داگیر کردبێت و خوا لە ناوی بردبن. هەتا ئاشــوریەکان و ئەکــەدەکان و بابلیەکانیش کە دوای سۆمەریەکان هاتوون هەر داگیرکەری خاکی گۆتیەکان بوون.

(ئەرشــاك ســافراســتیان) بــروای وایــە وشــەی(کــورد kurd) لــە خــاکی گۆتیــوم(جوتیــو gutium)ەوە هاتبێ. وە لە گەلی گۆتی(guti) و پیتی(ر) لابراوە دوای پیتی(u) **کە لە زمــانی هیند و ئەوروپی دا ئەم ڕێسایە پیادە دەکرێت. بە پێ ی نوسراوە بزماریەکانی زمــانی ســۆمەری** خاکی گۆتیوم(guftium) کۆنترین شانشینی سەربەخۆیە **لە خۆرهــەلاتی دێرینــی شارســتانی داو** هاوچەرخی سۆمەر و ئەکەد و عیلام و ئەرمینیا بــوون. وە **گۆتیــەکان(٢٣٠٠ – ٢١٧٥ پ . ز)** حوکمی بابلیان کردووە. شا ئەمبیا(ambia)ی **گۆتی دەسەلاتی ئەکــەدی کۆتــایی پــێ دێــنێ** و حوکمی بابل دەکات.

گۆتیەکان(١٢٤) ساڵ و(٤٠) رۆژ حوکمی بابل و ئەکەد دەکــەن(٢٢٦٤ – ٢١٣٧ پ . ز) کە دیارە مەبەستی لە خاکی سۆمەرو ئەکەدە و(٢١) پادشا هاتوون.

شا(ئیری داپیزیر – crridapiziv) خۆی بە پادشای چوار قورنە داناوە[3].

---

(١) بروانە: (مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەکی کورد / ئیحســان نوری/ د: حمە کریم عارف/ ل:٧.

(٢) ابو الانبیاء / ل: ١١٤ – ١١٨ سەیر بکە.

(٣) الکرد والکردستان / ت: احمد محمود الخلیل/ ل: ٢٧ – ٣٧ سەیر بکە.

## گۆتیەكان كێن ؟ بابل كوێیە؟

لە كتێبی(ریشتەنی نـزادی كـردی)دا ل: ٨) كـە لـە كتێبـی(میزوپۆتامیـا) وەرگـیراوە. كوردەكان لـە نـەژادی گۆتیـەكان كـە لـە چـیای گـۆتی(جـودی) نیـشتەجیّ بـوون. گەشـتیاری توركی(ئەولیا چەلەبی) دەنوسیّ: ( جودی شارەكی گەورەو ئاوەدانی لیّ بووە بە جەهدی ناسـراوە پادشایەكی هەبووە بە ناوی(كوردما) لە نەژادی نوح بووە(ﷺ) زۆر ژیاوە باكور و باشوری جودی لە ژێر ركێفیدا بووە، كوردەكان لەو پاشەكەوت بووە[1].

وە هەرچی كوردەكانی كوردستانی داگیركراوی توركیا بروایان وایـە وەكـو(دبلیـو . امـی . ویگرام) و (ادگار .تی . ای . ویگرام) باسیان كـردووە: (بـرواداران بروایـان وایـە ئۆرفـە ئـەوری كلدانیەكان)ەو شوێنی لە دایك بوون و وەفـاتی ئیـبراهیم بـووە و ڕێگـەی نـادەن مەسـیحیەكان چاودێری بكەن[2].

بابل وەكو لە قورئاندا هاتووە﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ﴾ البقـرە: ١٠٢. لە(كتاب المقدس) دا(شنگالە) یان(سنجار – شـنجار) لـە نەیخـەوای كوردسـتاندا: (وقـد تكونت مملكة اول الامر من بابل وارك واكد وكلنة من ارض شنعارshinar).

وەكو(ئیحسان نوری) لە(مێژووی ڕەگ و ڕەچەڵەكی كورد) ا باسی كردووە ئەمـە سـنجارە. نەك (حیللە) . هەر چەندە ئەویش كورد نیشین بووە. وەكو(ابن بطوطة) لە گەشـتەكەی دا(١٣٥٥ ز) دا باسی كردووە.

(ج . ار . درایڤەر) دەنوسیّ: ( كـورد گـەلێكی بـەربڵاوە نیـشتمانی ئـەو لـە خوراسـان و هەمەدانەوە درێژ بۆتەوە تا سنوورەكانی ئاسیای بچووك لە سمیـسات و مـەلاطیـا[3]. بـە پـیّ ی توێژینەوەكانی ئەو(كاردا، قاردا، كاردۆچی، كۆرتو، كورتی، كورتـوخ) هـەموویان یـەك ڕەگیـان

---

(١) امارات بهدینان الكردیة، صدیق الدملوجي، ل: ٤٤.

(٢) مهد البشریة / ل: ٢٠.

(٣) الكرد فی المصادر القدیمة، ج . ار . درایفر: ت: فؤاد حمه خورشید، ل:٤٢.





هەیە و لە کاتی گواستنەوەیان بۆ زمانی تر ئەم جیاوازیانە دورست بوون[1].

دۆزینەوەی سێ تابلۆ دێرینەکانی نوح بە کوردی لە کوردستاندا زۆر نهێنی ئاشکرا دەکات:

ڕۆژنامەی(العرب) لە سێ ژمارەدا(٢٨) و(٢٩) و(٣٠)ی (٥)ی (١٩٩٠) دا سێ تابلۆ دێرینەکانی نوحی بڵاوکردەوە کە(هاید پارك) بڵاوی کردۆتەوەو(تقی عابد)ی شوێنەوارزان هەڵی هێناون، کە بە خەتی بزماری کۆنی کوردی سۆرانی نوسراوەنەوە. ئەم سێ تابلۆیانە نامەیەکن لە نوحەوە(کوردە) بۆ(صاحب الزمان) و نوسراوە(لەبراسۆزەوە)، ئەم تابلۆیانە شاندەکی شوێنەوارزانی بەریتانی لە کاتی داگیرکاریەکەیدا دۆزیویەوە. ئەم تابلۆیانە زۆر نهێنیان هەڵگرتووە بۆ جیهانی ئیسلامی و کوردستان و جیهان، لەوانە:

(١) شوێنی ئادەم(دار السلام) بووە لای(ڕواندز) لە کوردستاندا (دێ سەلام).

(٢) نوح ناوی (کوردە)یە واتە: کوڕی دەیەمی ئادەم.

(٣) گۆڕی هابیل نزیك دار السلام.

(٤) وشەی سامی جولەکە دورستی کردووە و درۆیەکی مێژووییە.

(٥) ئیبراهیم کوڕی نوحە و هۆزی جافە و خێزانەکەی هەورامی یە.

(٦) وشەی(حام) و(سام) و(یافث) هیچ ڕاستیەکی نیە.

(٧) (الصفا والمروة) : کە دوو کێون لە مەککە واتە: (سەفا مەرۆ)، لێرەدا ژنی ئیبراهیم داوا لەو دەکات، واتە: سەفا مەرۆ بە جێمان مەهێڵە.

(٨) ئیبراهیم واتە: بران هەموو.

(٩) (زمزم) واتە: ژەم ژەم. واتە: چۆرەك.

(١٠) (نەبوخذنەسر) نەبی خدر، جولەکە ناویان زراندووە!

(١١) عیسا دوا ڕاسپاردەی ئەوە بووە: (لاهی لاهی سەیرکە چیم لێ دەکەن، لاهی لاهی سەیرکە چیم پێ دەکن). تا ئیمرۆ لەسەر زمانی مەسیحیەکانی خۆرئاوا دەوترێ و لە ماناکەی

---

(١) ............... / ل: ١٣ – ١٤. سەیر بکە.





تێ ناگەن.

(١٢) حەمورابی واتە: هەموو ڕابن و یاسای ئیبراهیمیە.

(١٣) حەواریەکانی عیسا هەورامیەکانن. (حەواری) واتە: هەورامی.

(١٤) نارامی واتە: هەورامی. نەك مانای زمانەکی تر بێت وەکو سریانی. بەو پێیە وشەی(جودی) و (کوردی) و (گوتی) لەیەك ڕەگەوە هاتوون کە مانای کورد و خاکی کوردانە. لێرەدا دەردەکەوێ نوح باوکی کوردەکانە. نەك کورد پێك هاتەی هیندو ئەوروپی و گەلی تر بن. کورد نە لە عەرەبە و نە لە فارسە، نە لە تورکە، نە لە هیند و ئەوروپایە، بەڵکو(کوردە) و بەس کوڕی نوحە(علیە السلام).

پێغەمبەر(ﷺ) مژدەی داوە هەر نەوەکانی نوح و ئیبراهیم لەم خاکەوە دوا جار ئاینی نوح و ئیبراهیم و(محمد المصطفی) سەلامی خوایان لێ بێ زیندو دەکەنەوە، مێژووش خۆی دوبارە دەکاتەوە﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا﴾[1].

- ثم تطلع الرايات السود من قبل المشرق فيقتلونهم قتلا لم يقتله قوم، فاذا رايتموه فبايعوه ولو حبوا على الثلج فانه خليفة الله المهدی). راوه ابن ماجة/ صحيح.

- (انما اولئك قوم يأتون من المشرق حردين معهم رايات السود شعارهم اقبل اقبل يعنی بكوش بكوش) رواه نعيم بن حماد/ الفتن.

- لا تقوم الساعة حتى يغزوها سبعون الفا من بنی اسحاق. راوه مسلم. التاج الجامع للاصول / ج٥ / ای من اكراد الشام المسلمين.

- يخرج رجل من ولد حسين من قبل المشرق لو استقبلته الجبال لهدمها. راوه نعيم بن حماد.

(١) فاطر: ٤٣.




## ١٤١ – كێوی سینا :

ڕابردوو باسكرا لە كویّ یەو چەندە بڵندە، بەڵام لێرە دا ئامـاژە بـە هۆكـاری پیرۆزیەكـەی دەكەین! ئەم چیایە دەكەوێتە باشوری قودسی شەریف و دوورگەی سیناوە(٣٢٠)كم لیّ ی دوورە، بەرزی(٢٢٨٥)م.

خوای گەورە یەكەم جار لە نزیك ئەم كێـوە لـە دۆڵیّ(طـوی) سـروش بـۆ مووسـای كـوڕی ئیبراهیم(ﷺ) دەكات:﴿ إِنِّي أَنَا رَبُّكَ فَاخْلَعْ نَعْلَيْكَ إِنَّكَ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى﴾[1]. یـان﴿إِذْ نَـادَاهُ رَبُّهُ بِالْوَادِ الْمُقَدَّسِ طُوًى اذْهَبْ إِلَى فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَى﴾[2]. لـەویّ خـوا تـەوراتی دا بـە مووسـا و لەویّ گەلەكەی داوای دیتنی خوایان كرد و، خـواش مرانـدنی و زینـدوی كردنـەوە:﴿ وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَكُمْ وَرَفَعْنَا فَوْقَكُمُ الطُّورَ خُذُواْ مَا آتَيْنَاكُم بِقُوَّةٍ وَاذْكُرُواْ مَا فِيهِ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾[3]. ﴿وَإِذْ قُلْتُمْ يَا مُوسَى لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّى نَرَى اللَّهَ جَهْرَةً فَأَخَذَتْكُمُ الصَّاعِقَةُ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ﴾[4]. بـۆ تەفسیر بڕواننە تەفسیرە كوردیەكان لەوانە(پوختەی تەفسیر/ ناسان).

كەواتە: هۆی پیرۆزی سینا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە خوا سروشی لەگەڵ مووسا دا كـردووە و جێگای گۆشەگیری و خواپەرستی مووسا بووە. نەك جێگای خوا بێت.

## ١٤٢ – صەفا و مەروە:

﴿إِنَّ الصَّفَا وَالْمَرْوَةَ مِن شَعَآئِرِ اللّهِ﴾[5].

واتە: سەفاو مەروە دوو دووروشمی خودان.

لە (تفسـیر الكبیر)ی (الرازی) دا هاتووە. ئەم دوو ناوە بۆ دوو چیای ناسراون و خـەڵكی لـە ڕاسـت ووشـەكانی زۆر قـسەیان كـردووە، (القفـال) دەڵـێ: (الـصفا) تاكـەو كۆیەكـەی(صـفي)

(١) طە: ١٢.

(٢) النازعات: ١٦ – ١٧.

(٣) البقرة: ٦٣.

(٤) البقرة: ٥٥.

(٥) البقرة: ١٥٨.





و(اصفاء)د، (الخليل) دەڵێ: بەردەكی گەورەی رەقی لوسە.

(خوا بۆیە كردوونی بە دورووشم چونكە شوێنەواری هاجەرەو ئیسماعیلیان پێوەیە كە تێ ی دا گرفتار بوون).

بە پێ ی سێ تابلۆ دێرینەكان نوح(صفا) ناوی ئیبراهیمە و(مروە) واتە: مەرۆ. بەوپێیە پیرۆزەی سەفا و مەرۆە و كردنی بە مەناسكی حەج بۆ پاراستنی مێژوو ئاسەواری ئیسماعیل و هاجەرەیە.

## ١٤٣ – ئەشكەوتی یارانی ئەشكەوت و ئەنتاكیا و ئەشكەوتی حیراء و(الثور) و ئەشكەوتی ئیبراهیم و دۆڵناران:



وە زۆر چیای تر هەیە لە فەرمودە دا باسكراون وەكو(عەرەفە) و(نوحود) و هی تر. لە ئەشكەوتەكانیش ئاماژە بە پیرۆزی هەندێ ئەشكەوت كراوە، وەكو ئەشكەوتی یارانی ئەشكەوت و ئەشكەوتی ئەنتاكیا و ئەشكەوتی(الثور) و(حیراء).

ئەشكەوتی(یەنجەلوس) نزیك ئەفسوس كە ئیمرۆ توركیا پێ ی دەڵێ(طرطوس) لەوێ دا خوا لە سەردەمی حوكمی(دقلدیانوس) دا(٢٤٩ – ٢٥١ ز) دا كە پادشایەكی رۆم بوو زیندوبوونەوەی مردوانی لە تاقیگەدا لەم ئەشكەوتەدا پیشاندا﴿وَلَبِثُوا فِي



كَهْفِهِمْ ثَلَاثَ مِائَةٍ سِنِينَ وَازْدَادُوا تِسْعًا﴾[1]. لەوێ دا خوا (٣٠٠) ساڵی خۆری و(٣٠٩) ساڵی هەیڤی مراندنی و زیندوی کردنەوە. ئەمەش بووە هۆی پیرۆزی ئەم شوێنە، لەبەر ئەوەش مزگەوتی لەسەر دورستکراوە کرا بە پەرستگا. ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾[2]. دیسان لە فەرمودە دا ئاماژە بە ئەشکەوتی ئەنتاکیا کراوە کە دەکەوێتە نزیکەی(ئیسکەندەرۆنە)ی کوردستانی یەوە کەشارەکی گەورەی جیهانی کۆن بووە، بارەگای بەتاریکەی مەسیحی بووە لە سەدەکانی سەرەتادا. ناوچەیەکی ئاسەواری گرنگە.

(متقي الهندي) لە(البرهان) دا گێراویەوە: (يستخرج تابوت السكينة من غار انطاكية) واتە: مەهدی لە ئەشکەوتی ئەنتاکیادا (تابوت السکینە)دەردێنێت.

هەروەها ئەشکەوتی حیراء لە نزیك مەککەدا شوێنی گۆشەگیری و خواپەرستی و ڕامانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناو ئەوێ دا یەك ئایەتی قورئان دابەزیە سەری(اقرء)، لەم ساتەوە بوبە پێغەمبەر و مامۆستای مرۆڤایەتی و ڕەحمەتی جیهانیەکان. هەروەها ئەشکەوتی(الثور) پیرۆزە چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ لە دەستی بێ باوەڕان رایکردە مەدینە لەوێ دا خۆی حەشاردا. پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕاست(ئوحود) دەفەرمێ: کە چیایەکە لە نزیك مەدینەداو جەنگی ئوحودی تێدا ڕودا: (هذا الجبل يحبنا و نحبه) رواه ابن حبان. ئەمە چیایەکە خۆشمان دەوێ و خۆشی دەوێین. وە لە ناوچەی بیتوێن لای سەروچاوەو بێتواتە دۆڵناران(فدان ئارام) لەوێ یە کە شوێنی مەنجەنیقی ئیبراهیمەو ئەشکەوتی ئیبراهیم لەوێیە خوا پەرستی تێدا کردووە!

•

## ١٤٤ - چیاکان و زمان و هزری خواناسی!

﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾[3].

واتە: ئەگەر ئەم قورئانە لە چیایەك دابەزێنین دەبینی مل کەچەو خاش خابووە لە ترسی خودا.

---

(١) الكهف: ٢٥.

(٢) الكهف: ٢١.

(٣) الحشر: ٢١.




﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ اللَّهَ يَسْجُدُ لَهُ مَن فِي السَّمَاوَاتِ وَمَن فِي الْأَرْضِ وَالشَّمْسُ وَالْقَمَرُ وَالنُّجُومُ وَالْجِبَالُ﴾(١).

﴿وَلَقَدْ آتَيْنَا دَاوُودَ مِنَّا فَضْلًا يَا جِبَالُ أَوِّبِي مَعَهُ وَالطَّيْرَ﴾(٢).

واتە: دامان بە داود زیادە چاکە، ئەی چیان لەگەڵی دا یادەکان دووبارەبکەنەوە لەگەڵ باڵندەکاندا.

﴿فَلَمَّا تَجَلَّى رَبُّهُ لِلْجَبَلِ جَعَلَهُ دَكًّا وَخَرَّ موسَى صَعِقًا﴾(٣).

واتە: کاتێ پەروەردگاری خۆی نواند بۆ چیاکە هاڕی و مووسا کەوت و مرد.

لێرەدا قورئان پەرچی ئەم بۆچونە دەداتەوە کە گەردوون بە جیهانەکی ماددەی مردو کەرویێ هزر ولاڵ وەسف دەکات. بەڵکو ئاماژە دەکات هەموو گەردوون بە ئەستێرەو خۆر و مانگ و زەوی مرۆڤ و دارو درخت و چیاوو گیاندارەوە جیهانی هزری زیندوون، هەموویان لە جیهانی تایبەت بە خۆیاندا یادی خوا دەکەن و دەیپەرستن.

ماتماتیکی زان و فەیلەسوفی ئینگلیزی(ئەلفەرد نورث) و(هاید هید) (١٨٨١ – ١٩٤٧) ڕایگەیاندسروشت زیندووە) واتە بێ گیان نیە. گەردووونناسی ئینگلیزی(سێر ارتەر ئیدینجتین) (١٨٨٢ – ١٩٤٤) ڕایگەیاند(ماددەی جیهان زیندووە).

(سێر جێمس جێنز) گەورەترین زانای هاوچەرخ دەڵێ: (گەردوون بونەوەرێکی هۆشیارە) (٤).

(السید الشریف) دەڵێ: (التجلی) خۆنواندنی خودا بە زات نابێ بەڵکو بە سیفەتێ دەبێ لە سیفەتەکانی، وە خودا لە دوای پەردەکانیەوە نەبێ لە زاتدا خۆی نانوێنێت. بروانە(التعریفات).

---

(١) الحج: ١٨.

(٢) سبأ: ١٠.

(٣) الاعراف: ١٤٣.

(٤) الدين في مواجهة العلم / وحيدالدين خان/ ل: ٧٤.

## ١٤٥ – چۆن چیاکان زەوی قایم دەکەن و هاوسەنگی ڕادەگرن؟

پێشەوای بڕواداران عەلی(علیه السلام) فەرموویەتی:

(وجبل جلاميدها، ونشوز متونها، واطوادها، فارساها في مراسيها، والزمها **قرارتها**، فمضت رؤسها في الهواء، ورست اصولها في الماد، فانهد جبالها عن سهولهاواساخ **قواعدها في متون** اقطارها ومواضع انصابها، فاشهق قلالها، واطال انشازها، وجعلها للارض عمادا، **وارزها فيها** اوتادافسكنت على حركتها ان تميد باهلها، اوتسيخ بحملها، او تزول عن مواضعها، **فسبحان الله** من امسكها بعد موجات مياهها واجمدها بعد رطوبة اكنافها، فجعلها لخلقه مهادا، **وبسطها لهم** فراشا، فوق بحر لجي راكد لايجري، وقائم لايسري تكركرة، الرياح العواصف، **وتمخضه الغمام** الذوارف، ان في ذلك لعبرة لمن يخشى)[1].

واتە: تاوێرەکانی بنیات نا(بۆ زەوی) و هەمیسان بەرزاییەکانی **سەر ڕووی** سەرکەشەکانی، لەنگەری پێ گرتن لە شوێنی خۆیاندا، گرتنی لەوێ ئارامیان گرت، **سەریان چوو** بە هەوادا و ڕەگیان لە ئاودا خۆیان داکوتا، چیاکانی بەرز کردنەوە لە دەشتاییەکانی، **بناغەی** چیاکانی لە تەنیشتەکانی زەوی دا بزر کرد، لە شوێنی چەقاندنیاندا، لوتکەکانی بڵند کردن، بەرزاییەکانی قیت کردنەوە، کردنی بە ستون بۆ زەوی تێ ی دا چەقاندن وەکو چەند مێخێک، ئەنجا ئارامی گرت لەوە خەلکی بخاتە جوڵە جوڵ، یان ڕۆبچێ، یان لە جێگای خۆی لابدات، بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی دوای شەپۆلی ئاوەکانی گرتی و دوای ئەوەی ڕۆخەکانی تەڕ بوون وشکی کردن، بۆ دورستکراوانی کرد بە بێشکەو بۆی پان ڕاخستن، لەسەر دەریایەکی قوڵی وەستاو و کەناڕوات، بای گەردەلوول دەیانباو دەیانهێنێ، هەوری باراناوی هەڵمی ئەو ئاوە دوای هەژاندن دەبارێنێت. (لەمەدا بۆ کەسێ پەند هەیە لە خوا دەترسێت).

لێرەدا پێشەوا عەلی تەئویلی ئەم ئایەتە قورئانیە دەکات: ﴿وَجَعَلْنَا فِي الْأَرْضِ رَوَاسِيَ أَن تَمِيدَ بِهِمْ﴾[2].

---

(١) نهج البلاغة / د: صبحي صالح / ل: ٣٢٨ / خطبة ٢١١ / ابن حديد المعتزلي.

(٢) الانبياء: ٣١.




لێرەدا ئیسلام بەر لە زانستی جیۆلۆجی ئەرکی چیاکان دەخاتەڕوو: (کە پاراستنی هاوسەنگی یە لە زەوییە، ئەم ڕاستی یەش لە کاتی دابەزینی قورئانی پیرۆزدا زانراو نەبووەو تاکامی دۆزراوە جیۆلۆجیەکان ئەمەی دەرخست).

(بەڵێ جاران وا دەزانرا چیاکان تەنیا چەند بەرزایی یەکی ڕواڵەتین لە سەر ڕووی زەوی دا، کەچی زانایان دۆزیویانەوە کە چیاکان چەند بەرزایی یەکی ڕووکاری نین، بەڵکو لەگەڵ ئەوەشدا ڕەگ و ڕیشاڵی یان هەیە(١٠ – ١٥) ئەوەندەی بەرزایی لە ژێر زەوی دا درێژبوونەوە.

چیاکان بەو وەسفە بەو بزمارو مێخە دەچن کە چادرو تاوڵی پێ قایم دەکرێ لە زەوی دا، بۆ نمونە چیای(ئیڤەرست) کە بەرزایی یەکەی(٩)کم لەسەر ڕووی زەوی دا، ڕەگ و ڕیشاڵی (١٢٥)کم بە ناخی زەویدا ڕۆچوون.

(فرانك بريس) سەرۆکی ئەکادیمی ئەمریکی لە کتێبی تایبەتی خۆی دا بە ناوی زەوی کە لە زۆر زانکۆکانی جیهاندا دەخوێنرێ باس دەکات(چیاکان چەند مێخێکن بەناو جەرگەی زەوی دا درێژ بونەوە) سەیرکە خودا چیاکان بە مێخ(وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا) یان(وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا) وشەی(ارساها) لەنگەری گرت، واتە: ڕەگ و ڕیشاڵی بۆ داناوە بەو خاسیەتە لە ناخ و دەرەوەی زەوی دا درێژ دەبنەوە، لە ناخی زەوی دا ڕەگ دادەکوتن لە خاڵی یەکتر گرتنی چینەکاندا لەگەڵ یەکتری داو دەچەسپێنو لەنگەری ئەو چینانە ڕادەگرێ، بەمە توێکڵی زەوی دەچەسپێنن و ڕێگا نادەن لەسەر چینە تەواوەکەی بخلیسکێ، یان لە نێوان چینەکانی تردا دەچەسپێ، زانراوە کە چینی دەرەکی تاوێری درزی قوڵی داوە و لە شێوەی پلێتدا خاش بووە و لەسەر چینەکی تەواوە دەجوڵێن، ئەو پلێتانە(الالواح) دەکرێ لەکاتی سوڕی زەوی تەوەرەیی دا گەر چیاکان نەبوانە بە خێرایی یەکی زۆر جوڵابان، گەر ئەم پلێتانە جوڵابان توێکڵی سەر زەوی کە خاکە دورست نەدەبوو ئاو کۆنەدەبۆوە و ڕووەك نەدەڕواو، ڕێگاوبان و خانوبەرە بە هیچ شێوەیەك بنیات نەدەنران، بەڵام خوای گەورە جولەی ئەو پلێتانەی بەو ڕاگرتووە کە چیاکانی کردون بە بزمارو مێخ و چینی وشکانی بە چینی ناوەوە بە ستۆنەوە) [1].

---

(١) الموسوعة العلمية في اعجاز القران الكريم والسنة النبوية/ د: هاني مرعي القيسي/ الشيخ مجدى فتحي السيد/ ل:٥٣٠ – ٥٣١ بە کورت کردنەوە.



## ١٤٦ – گردەکان (التلول) و تەپۆلکەکان(الهضاب):

ئەم هەموو ئیعجازانە ئەوە دەردەخەن قورئان سرورشی خوایە، زانایانی ئیسلام و خۆرئاواش شاهیدەری ئەوەن: ( ك . ا . هیوارت) دەڵێ(من پێم وایە قورئان سروشی خوایە بۆ موحەمەد(ﷺ).

(هـ . هولمان) دەڵێ( محمد دوا پێغەمبەری خوایە بۆ تەواوی خەڵکی ناردووە و ئاینی ئیسلام دوا ئاینی ئاسمانی یە.

(ئەمیل درمنهیم) دەڵێ: (قورئان موعجیزەی یەکەمی پێغەمبەرە(ﷺ) ئەو بەو جوانیە ئاسەر وەکو مەتەڵێ دەمێنێتەوە کەس دەستی پێ ناگات[1].

ود ئەگەر ئێمە بروانینە گردەکان(hllls) وەکو کورد دەڵێ(کەشکیش برای دۆیە) ئەوانیش وەکو چیاکانن.

(د: حسن سید احمد ابو العینین) دەنوسی:( گردەکان تەنیا لە قەبارەو بەرزی دا لە جیاوازە



(١) اسالة العصر المميزة/ محمد فتح الله كولف / ل: ٩٧.

لە چیایە لە بیچم و شێوەی گشتی دا وەکو ئەوە. گردەکان چەند پارچە زەوییەکی نیمچە قوچەکی یان گومەزین و لە خاکی دەووروبەریان بلندتر هەلکەوتون، بەلام تێکرای لە(١٠٠) پێ بەرزتر نییە لە ئاستی رووی زەوی دەوروبەری، وەکو مامۆستا جیکی(geikie) توێژینەوەی لەسەر کردووە. بەلام مامۆستا(ڤان ریپەر – j . e .van riper) رونی کردۆتەوە گرد تێکرا بەرزی(٢٠٠ – ٢٠٠٠) پێیە لە چاو خاکی دەوروبەری لێژیەکەی(٥) پلە زیاترە. کەچی مامۆستا (ستامپ – d.l.stamp) لە (١٩٦١ ز) دا رِوونی کردەوە سنووری میان چیاو گرد دیار نییە، بەلام چیا بەم خاکانە دەوترێ کە تێکرای بەرزی لە(٢٠٠٠) پێ پتر لە ئاستی رووی خاکی دەوروبەری، گەر لەمە نزمتر بوو دەکەوێتە بازنەی گردەوە، گرد بە تەنیاو لە شێوەی چەند دانەیەکی نیمچە وابەستە بە یەکتری یەوە دەردەکەوێت، پاشان وەکو زنجیرە گردەکی نابلند دەردەکەون، بەزۆری بە هۆی داخوران برانەوە و پێشەوەی زنجیرە چیا گەورەکان داگیر دەکەن. هەرچی تەپۆلکە(الهضاب) یە ئەویش زەوییەکی بەرزە بەسەر ئاستی خاکی دەووروبەرەکەیدا. ئەوەی تەپۆلکە جیا دەکاتەوە لوتکەکەی تەختایی و گۆرە، یان بەرزو نزمی کەمە، بەلام گەر لە چاو بەرزی تەپۆلکەی بچووکدا درێژ بوو ئەوەی فرەیە. مامۆستا جێمس(١٩٤٩) رایگەیاند گرنگترینان ئەدگاری گردۆلکەیان تەپۆلکە ئەوەیە سەر رووی هەموارو تەختە و وەکو ئاستی رووی دەریایە. بەلام مامۆستا(کریسی(١٩٤٤) رایگەیاند هەرچەند رووی تەپۆلکە بەرز نییە بەهۆی داخورانەوە، کەچی رۆخەکانی دیوارین ، یان شاولێن، ئەمەش بە پێ ی داخورانی شاولی یانەی کە رووبارەکانی دەوری پەیدایان کردووە.

ئەم گردانەش کە دەکەونە میان دەشتایی یەکان و چیاکانەوە بە زۆری بەهۆی جولەی بەرزبوونەوەی تەکتونی سادەوە دروست دەبن ، لە هەمان کاتدا خاکی ئەو ناوچەیە تووشی داخورانی گەورە دەبێ، خاکی ئەم ناوچەیە لە(٢٠٠٠) پێ پتر لە ئاستی ناوچەکانی دەوروبەری دا بەرز نابێتەوە.

یان ئەو چیایانەی تەمەنەکی کۆنی جیۆلۆجی یان هەیە و لەو ماوەیەدا توشی زۆر داخوران هاتوون، پاشان وەکو رەگێکی چیایی شێوە تەپۆلکە دەردەکەون، بەو پێیە زۆر لە گردەکان

سەرەتا چیا بوون و تووشی داخوران هاتوون.

ئەم گردانە چەند جۆرێکن وەکو:

(١) ئەو گردانەن لەسەر بارستایی کێشوەری کۆنی جیۆلـۆجی دامـەزراون، کەلـە هـەموو شوێنەکی تری سەر زەوی بەرزترن، ئەم بارستایی یە کێشوەریانەش سەرەتا لـە بـەردی ئـاگری و گۆڕاو دورست بوون.

(٢) ئەو گردانەن لەو ناوچەیە شاخاویانەدا خۆیان دەنوێنن کە هەندێ لـەتاوێری نیـشتویان دا خوراوە.

(٣) گردەکانی ناوچەی کارست کە ناوچەی جیرین و داخوران وخاش بوونی کیمیـایی کـاری زۆری تێ کردوون.

(٤) ئـەو گردانــەن لــە ســەر ڕۆخــی دۆڵــە ڕوباریــەکان و بــەرزایی لێوارەکـانی تـاوێرە هاوتەریبەکان(paraller ridges) پەیدا دەبن.

هەرچی تەپۆلکەکانن زۆر جۆریان هەیە وەکو تەپۆلکـەی بورکـانی، کـە لافـاوی بورکـانی دروستیان دەکات، وەکو تەپۆلکە بورکانی کۆلۆمبی، ئەنجا تەپۆلکەی درزی(الهضاب الصدعية) هەیە کە درزەکان دروستی یان دەکەن[1].

پێغەمبەری خودا(ﷺ) لە یەکێ لە دوعاکانی بـاران بارینـدا دەیفـەرموو: ( اللهم اجعله سقيا رحمة ولا تجعلها سقيا عذاب ولا محق ولا بلاد ولا هدم، ولا عرق، اللهم على الضراب والاكام ومنابت الشجر وبطون الاودية...) رواه الشافعي. واتە: خوایە ئەم بارانە بیکەیـە رەحمـەت، نـەك سزاو و لەناوبردن و بەڵاو کاولکاری و خنکان، خوایە بیبارێنە سەر تەپۆلکـە و گـردو دارسـتان و ناو دۆڵەکان.

قورئانی پیرۆز دەفەرمێ: ﴿كَمَثَلِ جَنَّةٍ بِرَبْوَةٍ أَصَابَهَا وَابِلٌ فَآتَتْ أُكُلَهَا ضِعْفَيْنِ﴾[2].

---

(١) بە کورت کردنەوە لە کتێبی(كوكب الارضي ظواهرة التضاريـسية الكبرى / د: حسن سيد احمد ابو العينين / ل: ٤٧٥ – ٤٩٧) وەرگیراوە.

(٢) البقرة: ٢٦٥.

واتە: وەکو باخچەیەکە بەگردێکەوەیە ڕێژنە بارانەکی لێ دەدات دووقات بەردەدات. لێرەدا ئاماژە بە گرنگی گرد و خاکەکەی دەکات بۆ باخچەو رەز و باران. ئاماژە دەکات تا خاك رووەك و باخچە و دارستانی پتر بێ سوکتر ئاوی پێدا دەڕوات ڕامالینی خاکی کەمتر دەبێت و کەمتر باوو باران کاری تێ دەکات. ئەوەتا کوردستان تا ناوچە شاخاوییەکانیشی تووشی ڕامالینی زۆر هاتووە، چونکە دار و درختەکی زۆری بڕاوەو دەبڕەرێ، بۆیە شوێنەواری لم و لیتە، کە رووبارەکان بە زۆری ساڵ بە ساڵ ڕایدەماڵن و دەیبەن لە وەرزی لافاودا دەردەکەوێت. بەمەش خاکی بەپیت کەم دەبێت.

## ١٤٧ – دەشتایی چی یە؟
## ١٤٨ – چۆن دورست دەبن؟
## ١٤٩ – جۆرەکانیان؟
## ١٥٠ – ١٥١: بیابانی حیجاز و گۆڕان بەسەری و بۆچی و چۆن؟ لەگەڵ چەند ئیعجازەکی شکۆدار لەگەڵی دا وەکو ئیعجازی حەج و تەواف و ماچ کردنی بەردە ڕەشەکەو سەفاو مەروەو خواردنەوەی ئاوی زمزم وهتد!

﴿وَبَوَّأَكُمْ فِي الأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا﴾ [1].

واتە: نیشتەجێ ی کردن لە زەوی دا لە دەشتایی و بیابانەکانی کۆشك و تەلار دورست دەکەن. وە خوای گەورە نمونەی دەشتایی بە مەککە دێنێتەوە. ﴿رَّبَّنَا إِنِّي أَسْكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيْرِ ذِي زَرْعٍ﴾ [2]. واتە: (ئیبراهیم پارایەوە): پەروەردگارمان من نەژادی خۆم لە دۆڵێ دا نیشتەجێ کرد کە کشتوکاڵ و شینایی نییە.

لێرەدا ئیبراهیم(ﷺ) ئاماژە دەکات کە ئەو لە بیابانەکی ڕوتی بێ ئاوو سەوزایی خێزانی

(١) الاعراف: ٧٤.
(٢) ابراهیم: ٣٧

خۆی نیشتەجێ دەکات. دیارە وەکو ڕابردوو باسکرا سێ ناوچەی پیرۆز هەیە لە جیهاندا کە مەڵبەندی پێغەمبەرایەتی وشارستانی بوون:

یەکەم کوردستان کە شوێنی ئادەم و شیت و ئیدریس و نوح و ئیبراهیم و زەردەشتی نەوەی یونس و دەیان پێغەمبەری تر بووە. لەسەردەمی ئیبراهیمدا دوای بەرەوڕووبونەوەی لەگەڵ نەمروودا.یان ئەژدیهاك لە فداران ئارام یان دۆڵناران دا لە ناوچەی بیتوێن لە قەزای رانیە دا، کە گردی نەمروودو شوێنی مەنجەنیقی و ئەشکەوتی ئیبراهیم لەوێ یەو خۆشم لەوێ دادەنیشم، ئیبراهیم کۆچ دەکات بۆ شام لە کوردستان دە غدوڤای کچی بەجێ دێڵێ زەردەشت لەو پاشەکەوت دەبێ ، ئەنجا لە شام ئیسحاق بەجێ دێڵێ پێغەمبەران لەوێ لەو پاشەکەوت دەبن، ئەنجا لە حیجازدا ئیسماعیل بە جێ دێڵێ ، تا زەمینە بۆ لە دایك بوونی دوا پێغەمبەر(ﷺ) خۆش بکات. وەکو لە (صحیح البخاری) دا هاتووە: (ثم نشیء فیهم وتعلم اللغة العربیة منهم). پاشان ئیسماعیل لە ناو عەرەبەکاندا گەورە بوو زمانی عەرەبی لەوان فێر بوو. بەڵێ ئیبراهیم ئیسماعیل لە ناوچەیەکی بیابانی وشکدا کە مەککەیە نیشتەجێ دەکات. پاشان خودا وەکو موعجیزەیەك بۆ ئیبراهیم و ژنەکەی و ئیسماعیل ئاوی زمزمیان بۆ هەڵ دەقوڵێنێ و لەوێ کۆچەران لەگەڵیاندا نیشتەجێ دەبن و مەکە ئاوەدان دەکەنەوە و کەعبە دورست دەکەن کە دەبێتە شوێنی حەج بۆ خەلکی لە هەموو ناوچەیەکیەوە:﴿ وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾[1]. بەڵێ کەعبە دوای بنیات نانی بووە مەڵبەندی یەکتاپەرستی کە ئیبراهیم و ئیسماعیل و کوڕو نەوەکانی سەرپەرشتی یان دەکرد. دوایی مەککە گەشەی کردوو بووە شارەکی گرنگ لە بواری دینی و سیاسی و ئابووری دا. بووە بازارگەیەکی گەورە ، بەشداری کرد لە ژیانی ئابوری و کۆمەلایەتی و رۆشنبیری دا. دوایی بەزەبر و زۆری هۆزی عەرەبی(جورهم) دەست بەسەر کەعبەدا دەگرن، ئەنجا خوزاعە، وردە وردە شوێنەواری یەکتاپەرستی بزردەبێت و بت پەرستی ڕو لە زیندوبونەوە دەکات و ماڵی ئیبراهیم دەبێ بە مەڵبەندی بت پەرستی.

---

(١) الحج: ٢٧.





وە لە مێژوو دا کوردەکان و فارسەکان و سابینە و عەرەب بەر لە ئیسلام بۆ حەج کردن چوون، هیندەکان وایان زانیوە گیانی(شنوە) کە یەکێکە لە پیرۆزەکانیان لە کاتی سەردانی دا بۆ مەککە چۆتە بەر بەردە ڕەشەکەوە.

فارسەکان چوونە حەج وایان زانیوە گیانی (هورمز) چۆتە بەر کەعبە.

(ساسان بن بابك) چوەتە حەج کردن وەکو یەکێ لە شاعیرانی کۆن باس دەکات:

**ومازلنا نحج البيت قدما ونلقي بالاباطح امنينا**

**وساسان بن بابك سا حتى اتى البيت العتيق باصيدنا**

**وطاف به وزمزم عند بئر لاسماعيل تروي الشاربينا**

**(مەسعودی) دەڵێ: فارس بڕوایان وابووە ئیبراهیم باوکی ئەوان بووە بۆیە چونە حەج کردن، دوا کەسیان کە حەجی کردووە(ساسان بن بابك) بووە**[1].

بەڵام ڕاسترین بۆچوون ئەوەیە ساسانیەکان کوردبوون، لەوانەش ساسان کوری بابك[2].

لێرەدا خودا لە بەر چەند هۆیەکی گرنگ ناوچەی حیجازی کرد بە شوێنی حەج:

(١) مەککە دەسەڵاتی دکتاتۆرانی نەدەگەیشتێ.

(٢) مەککە چەقی وشکانی یە لە جیهاندا.

**(٣) مەککە مەڵبەندی کۆکردنەوەی تیشکی یە بۆ ڕاکێشانی موگناتیسی لە زەوی دا، وەکو زانایەکی تبوگرافی ئەمریکی ئەمەی سەڵماند و(د: حسین کمال الدین) سەرۆکی بەشی پێوانەی وێنە گرتن لە زانکۆی(الرياض/ السعودية) ئەوەی دووپات کردەوە**[3].

**(٤) گەر(مسجد الحرام) لە ناوچەیەکی ساردی وەکو ئەوروپا بایە یان شوێنی تردا خەڵکی بەدژواری حەج و عومرەیان دەکرد، دیسان لە ناوچە فێنکەکانیش(وەکو کوردستان) چونکە لە زستان دا زۆر ساردە، ئەنجا حەج و عومرە بەرگ و پۆشاکی تایبەتی یان هەیە لە ناوچەی گەرمە**

(١)بۆ زانستی پتر(تأريخ الكعبة/ د: علي حسني الخربوطلي) . دار جيل/ لبنان.

(٢) مێژووی کوردو کوردستان/ شوکروڵای بابان/ ل: ٦٣ /ط ٢٠٠٤.

(٣) ايات الاعجاز العلمى/ عبدالرحمان سعد صبى الدين/ ل: ٥٣ — ٥٤.




سێر نەبێ ناتوانرێ بپۆشرێن[1].

(٥) داهاتوو مەککە دەبێ بە ناوچەیەکی دەوڵەمەند و نەوتی تێدا دەدۆزرێتەوە﴿إِن يَكُونُوا فُقَرَاء يُغْنِهِمُ اللَّهُ مِن فَضْلِهِ﴾[2].

(٦) ئیبراهیم دوعای قبوڵ بوو خوا ئەو خاکەی دەوڵەمەند کرد بە نەوت و بووە بازاڕەکی گەورەی جیهانی ، هەر چەندە ناوچەیەکی بیابانی یە خوا ئەو وولاتەی پڕ کرد لە میوەجات و رۆزی﴿رَبِّ اجْعَلْ هَـَذَا بَلَدًا آمِنًا وَارْزُقْ أَهْلَهُ مِنَ الثَّمَرَاتِ﴾[3].

(٧) لە فەرمودەدا هاتووە کە(احمد) گێراویەوە قیامەت نایەت تا دورگەی عەرەبی نەگۆڕێ بە باخچەو رووبار(وحتى تعود جزيرة العرب جنات و انهارا).

بەڵێ کاتێ ناوچەی حیجاز و کەنداو دەوڵەمەند بون بە هۆی ئەو نەوتەوە شارو دێهاتی شارستانی نوێ دورست بوون و باخچەو باغات و مێرگوزاری تێدا دوروستکراو تۆڕی رێگاو بانی تێدا بنیات نرا، هەموو ئەو هۆکارانە وای کرد ئەو ولاتانە ببنە پارگ و باخچەیەکی جوان(د: عبدالرحمن حميده) دەنوسێ:

(هەر لەو کاتەوەی زەوی دورست بووە ناووهەواو کەش لەوەچەرخان نەوەستاوە، واتە هەر لە(٤,٥) ملیار ساڵەوە. گۆڕانەکان پتر لە نێوان وەچەرخانەکانی نێوان چاخی بەستەڵەکی و نێوان چاخەکانی خزینی بەستەڵەکی دا ڕویداوە، کە نزیکەی بەر لە(٢) ملیۆن ساڵ بە شوێن یەکتری دا هاتوون لێرەدا زۆر هۆکاری سروشتی هەیە بە شێوەیەکی مسۆگەر لە سەر پێوەرەکی زەمەنی لەمیان هەزاران و ملیۆنەها ساڵدا کار گۆڕانی کەش و هەوا دەکات). دەنوسێ ئەم ڕاستی یانە ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) پشت ڕاست دەکاتەوە: (لاتقوم الساعة حتى تعود جزيرة العرب مروجا وانهارا). زانایان لەمەیان کۆلیودتەوە کە ئێستا دۆڵی رووباری وشك هەیە وەکو دۆڵی(الرمه) و(دواسر) و(الحنيفه) لە(نجد) دا، دیسان ناوی قۆڵ تاوتوێ کراوە کە بۆ(٢٤٠٠٠)

---

(١) ايات الله في الجبال والصحاري و الغابات / ل:١١٧ / د: ماهر احمد الصوفي.

(٢) النور: ٣٢.

(٣) البقرة: ١٢٦.

ساڵ دەگەڕێتەوە، واتە بۆ چاخەکی شێدارو تەڕ بە تەواوی لە ئاوو هەوای ئێستا جیابووە.
دەنوسێ: (چالاکی پێش سەد ساڵە کار لە هەوا دەکات و لە داهاتودا گۆڕانی گەورەتر دورست دەکات.

(زەوی گەرمتر دەبێ و ئاسەواری ترسناك دورست دەکات و دوورگەکان و هەرێمەکان بزر دەکات و بیابانی ڕوت(التصحر) پەیدا دەکات) وە(تا ئێستا دە چەرخی بەستەڵەکی بەسەر زەوی دا هاتووە).

دەنوسێ: ( وزەی خۆر کە ئێستا چاوگی ژیانە(٢٤٠) واتە = ٣٤٠ جول/ چ١ لەسەر یەك مەتر چوار گۆشەی زەوی دا، ئەم وزەیە وردە وردە زیاتر دەکات. پێك هاتەی هەوای زەوی لەوەتەی دوورست بووە گەشە دەکات، کێشوەرەکانیش لە خزین و یەك گرتن و پارچە بوون بە هۆی دیاردەی تکتونیکی پلیتەکان نەوەستاوە[1].

(٨) تەواف بە دەووری کەعبە دا:

ئیعجازی(٨) لەم گۆڕانەدا حیکمەتی تەوافی حەجە بە دەوری کەعبەدا:

﴿وَلْيَطَّوَّفُوا بِالْبَيْتِ الْعَتِيقِ﴾[2].

﴿جَعَلَ اللَّهُ الْكَعْبَةَ الْبَيْتَ الْحَرَامَ قِيَامًا لِّلنَّاسِ﴾[3].

بەڵێ لە حەج و عومرە دا داوا لە موسلمانان کراوە(٧) جار بە دەوری کەعبەدا بسورێنەوە، بەپێچەوانەی میلی سەعات، ئەمەش بەشداری یە لە سوڕی بونەوەردا، چونکە هەموو گەردیلەو تەنێکی ئاسمانی بە خولگەی خۆیدا بە دەوری جەمسەری خۆیدا دەسورێتەوە و کەعبەی خۆیەتی. لە گەردیلەدا ئەلیکترۆنەکان بە دەوری ناوکداو، هەسارەکان و زەوی بە دەوری

(١) گۆڤاری(الجیل/ تشرینی دووەم/ ١٩٩٠ /الجد١١ / العدد ١١/ ل: ٣٨ – ٤٣. سەیر بکە، بە دەستکاری و کورت کردنەوە) وەرمان گرتەوە.

(٢) الحج: ٢٩.

(٣) المائدة: ٩٧.

خۆردا لەگەڵ کۆمەڵەکەیداو، کۆمەڵەی خۆر بە دەوری چەقی کاکێشانداو، مەجەڕڕەکان بە دەوری چەقی مەجەرەکانـدا هـەموو ئەوانـە بـەدەوری چـەقی خۆیانـدا پێـچەوانەی میلـی سـەعات دەسورێتەوە. تا لە خانەدا پرۆتۆپلازم دەسوڕێتەوە، یان میلی سەعات خول دەخۆن.(وکل فی فلـك یسبحون) !.سەرباری خانەی مرۆڤ کە لـە(پرۆتینـات) پێـك دێ، گەردیلـەی زۆر ئـالۆزی(ترشـی ئەمینین). ئەم گەردانە لە پێنج توخمی سـەرەکی پێـك دێـن(کـاربۆن — هایـدرۆجین، ئۆکـسجین، کبریت — نایترۆجین) ئەم توخمانە بە دەوری گەردیلەی کاربۆندا بەلای چـەپدا ڕیـزدەبن، واتـە: بـە هەمان ئاراستەی سوڕان بە دەوری کەعبەدا[1]. دیارە ناوچـەی کەعبـەش وەکـو باسـکرا چـەقی جیهانەو شوێنی کۆبونەوەی تیشکی یـە بـۆ ڕاکێـشانی موگناتیـسی ئەمـەش دەوری هەیـە بـۆ بارگاوی بونەوەی مرۆڤ. لەمەش پتر روحێکی زۆری پێغەمبەران دەوری کەعبەیان داوە.

(٩) (ابو بکر الفقیـه) لـە(مختـصر الکتـاب البلـدان) دا گێراویـەوە لـە باسـی مەککـەدا: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (ما من نبی هرب من قومـه الا هـرب الی الکعبـة یعبـد الله فیهـا حتی یموت، وان قبر هود و شعیب و صالح فی ما بین زمزم و مقام ، وان فی الکعبة قبر ثلاث مائـة نبی، ومابین الرکن الیمانی الی الرکن الاسود قبر سبعین نبیا).

واتـە: هـەر پێغەمبـەرێ لـە دەسـت گەلەکـەی ڕای کردبـێ پـەنای بردۆتـە بـەر کەعبـە خواپەرستی تێدا کردووە تا وەفاتی کردووە، گۆری هود و شوعەیب و سـالح لـەوێ یـە ، لـەمیان زمزم و مەقامدایە، لە کەعبەدا گۆری(٣٠٠) پێغەمبەر هەیە،لەمیان روکنی یـەمانی و روکنـی ئەسودا گۆڕی(٧٠) پێغەمبەر هەیە. کەواتە ئەم ناوچەیە شوێنەکی پڕ لە فەیزو ڕوونـاکی یـە تـا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (ما بین بیتي و منبري روضة من ریاض الجنة) متفق علیه. واتە: لە میان ماڵی من (گۆڕی من) و مینبەرمدا باخچەیەکە لە باخچەکانی بەهەشت.

بەم شێوەیە کەعبە مەڵبەندی ڕووناکی و روحی و موگناتیسی و هالەیە و چەقی وشـکانی یە، بۆیە سوڕانەوە بە دەووری دا گیانو لەشی مرۆڤ بارگاوی دەکاتەوە.

(یوسف الحاج) دەنوسێ: ( کەشتی یەوانـەکانی ئاسمـانی کـاتێ بـۆ ئاسمـان بـەرز دەبنـەوە

---

(١) لە(ایات الاعجاز العلمی / ل: ٤٦ — ٤٩ بە دەسکارییەوە وەرگیراوە.




ڕووناکی کەعبە دەبینن).

(١٠) یوسف الحاج دەنوسێ: زۆر کەس دەڵێن: عمر وتویەتی(انك حجر لاتنفع ولا تضر ولولا اني رايت رسول الله(ﷺ) قبلك ما قبلتك) متفق عليه. بەڵام بێناگان لە وەڵامەکەی پێشەوا عەلی بۆ ئەو:(لا انه حجر من الجنة وكان ابيض لكنه اسو من ذنوب العباد)[1].

واتە عمر وتی: تۆبەردێکی قازانج و زیانت نیە، گەر پێغەمبەر ماچی نەکردبای ماچم نەدەکردی. بەڵام عەلی وەڵامی دایەوە: نەخێر وانیە ئەمە بەردێکی باخچەکەیە یان بەهەشتە سپی بووە، بەهۆی گوناهی خەڵکی ڕەش داگەڕاوە. وە لە(مستدرك الحاكم/ح ١٦٩٦) دا عەلی بە عومەر ڕادەگەیەنێ: (انه يضر و ينفع) واتە: ئەو زیانی هەیە و سوودی هەیە. من شاهێدم لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیست: (يؤتى يوم القيامة بالحجر الاسود وله لسان ذلق يشهد لمن يستلمه بالتوحيد). واتە: ڕۆژی قیامەت ئەم بەردە ڕەشە دێ زمانەکی پاراوی هەیە، کێ بە یەکتاپەرستی دەستی لێ دابێ، شاهێدی بۆ دەدات. ئەنجا عومەر ووتی: ( اعوذ بالله ان اعيش في قوم لست فيهم يا ابا حسن). واتە: من بە خوا خۆدەپارێزم لە ناو گەلێ دا بژیم ئەی باوکی حسن تۆی تێدا نەژیت.

وە لە(المستدرك/ ح:١٦٨٩) دا (ابن عباس) دەڵێ: (پێغەمبەرم(ﷺ) بینی ڕوکنی یەمانی ماچ کرد و کولمی خۆی خستە سەر. بەڵێ: هەتا هەندێ لە خۆرناوایی یەکان بەشێ لەو بەردەیان لێکۆڵینەوە لەسەر کردووە و گەیشتونە ئەو ئاکامەیە ئەم بەردە ناوێزەیە لە زەویدا لە بەشی نیمچە گەیێنەرەکانە(شبه الموصلات) ئەم بەردە دەتوانێ هەموو ئەو کەسانەی ئاماژەیان بۆ کردووە یان دەستیان لێ داوە وەکو کۆمپیوتەرێ ناویان تۆمار بکات. لە دێریندا دەبوایە بۆ هەمرو تەلەفۆنێ تەلێکی تایبەتی ڕابکێشرێ، بەوپێیە چەند سەد تەلێك پێویستی بە چەند کێبلێکی گەورە هەیە ڕابکێشرێ و پێ یدا بڕوات. بەڵام دوای دۆزینەوەی تەنە نیمچە گەیێنەرەکان، توانرا لە(فيبر جلاس) کە لە قەبارەی لمۆزێکی مام ناوەندە دا ملیۆن(هێڵ)ی تەلەفۆنی ڕابکێشرێت، لێرەدا ئەم بەردە ڕەشە کە بەشێکە لە نیمچە گەیێنەرەکان دەتوانێ ناوی

---

(١) موسوعة الاعجاز العلمي/ يوسف الحاج/ ل: ٩٥٩ – ٩٦٠ سەیر بکە.



هەموو ئەو کەسانە تۆمار بکات کە ماچیان کردووە و دەستیان لێ داوە. هەتا(شافعی) ئەم عەللامە عاریفە دەڵێ( بەردە ڕەشەکە هەر کەس سەردانی بکات ناوی خۆی و دایکی دەنوسێت). لێرەدا شافیعی بە فیراسە وئیلهام زانیویەتی، بێ ئەوەی لەم چاخەدا ناوی کۆمپیوتەر هەبووبێت. هەروەها ڕۆیشتن بەرەو سەفاو مەروە کە شوێنەواری ئیسماعیل و دایکی یەتی و ناوچەیەکی هالاوی گیانی و موگناتیسی بە مرۆڤ بارگاوی دەکاتەوە. زانایان ناماژە بە موگناتیسی یەتی سەفا و مەروە دەکەن. ئیمرۆ باس لە بارگاوی کردنەوە دێ بە(هالەی موگناتیسی) و (موگناتیس) بۆ چارەسەرکردن خۆپاراستن[1].

بەڵێ هەموو مەناسیکەکانی حەج یاد و بیرەوەری مێژووی پێغەمبەرانە، لەوانە ئیبراهیم و ئیسماعیل و دایکی یان و دوا پێغەمبەری ڕۆڵەکەیان(ﷺ) مرۆڤ بە ئەنجامدانیان دڵ و دەروون و هەست و نەست و جەستەی بارگاوی دەبێتەوە، بە بارگەی گیانی و دەستەیی و مرۆڤ ئارام دەبێتەوە و دڵی لە ژەنگ و گوناه خاوێن دەبێتەوە وەکو تازە لە دایکی خۆی بوو بێت پاکژ دەبێتەوە.

(١١) ئاوی زمزم: پێغەمبەر(ﷺ) بە شیفای ناو دەبات: **(فان شربته تشفی بە شفاك الله)** رواه الدار قطنی.

**(١٩٧٣)** و (١٩٨٠) **لە لایەن چەند دەزگایەکی جیهانی و تایبەتەوە ئەو ئاوە شی کرایەوە** بینرا هیچ میکرۆبێکی تێدا نییەو ئاوەکی کانزایی یە بە ڕێژەی(**٢٠٠٠)ملغم بۆ یەك لتر** ئاوو بە زۆری کالسیوم و سۆدیۆم و مەگنسیۆم و پۆتاسیومە. ئاوێکە **پارێزەرە** لە نەخۆشیە خوێن بەرەکانی دڵ وئاوێکی گازی هەرس کەرە و بە ڕێژەی(**٢٥٠) ملگم لە یەك لتر** ئاودا بیکاربۆناتی تێدایە. زانایانی پزیشکی باس دەکەن ئاوی کانزایی سودی **بۆ چارەکردنی زۆر نەخۆشی** هەیە وەکو روماتیزم و ترشی گەدەو سك چوونی کۆن و بەد هەرسی و .... **هتد**[2].

---

(١) ئەمەمان بە کورت کردنەوەو دەسکارییەوە لە کتێبی(موسوعة الاعجاز العلمی/ یوسف الحاج / ل: ٦٥٩ — ٦٦٩ وەرگرتووە، هەروەها لە(الارض/ د: زغلول النجار / ل: ٥٧١.

(٢) بڕوانە: ایات الله في الافاق/ د: محمد راتب النابلسی/ ل: ٢١١/٢١٥.





مەککە چەقی وشکانی یە، بۆیە چەقی موگناتیسی یەو لە هەموو ناوچەکانی تری جیهان لە موگناتیسی یەتی کرۆکی زەوی نزیکترە و سالآنە زیاتر لە دە ملیۆن موسلمان وەکو ئەلیکترونەکان بە دەوری ناوکدا و هەسارەکان بە دەوری خۆردا دەخولێنەوە و بەشداری سوڕی گەورەی بونەوەری دەکەن، بەم شێوە خوداوەند ئەم بیابانەی کرد بە پەرستگایەکی گەورەی جیهانی، کۆشکی سپی خودایی و، مەڵبەندی رووناکی یەکان و وەچەرخانەکان.

## بیابان لە ڕوی زانستی جیۆلۆجی یەوە چی یە؟ جۆرەکانی چەندە؟ چۆن دورست دەبن؟

(د: حسن سید احمد) دەنوسێ: (دەشتایی – السهل – plains) لە رووی جیۆلۆجیەوە ئەو زەوییە هۆکاری ڕوت کردنەوەو ڕامالین (التعریە) بەشداری کردووە لە دورست کردن و پێک هێنانیاندا.

هەندێ لە جیۆمورفولۆجیەکان لەوانە(شتلهەر – shrahler) و(لۆبیك- lobeck) و (فینمان-fenneman) ڕونیان کردۆتەوە بە زۆری دەشتایی یەکان لەسەر ئەو خاکانە دورست دەبن لە تاوێری چینی مەیل ناسۆیی(horizontal or flat-lying strata) پێك دێ، بەڵام ئەم پێناسەیە بۆ دەشتایی داخوراوی دەریایی و رووباری نابێت، کەلەسەر تاوێری خوارو



نوشتاوەوە چەماوە پێك دێ، هەرچەندە ڕووی زەوی لە شێوەی دەشــتایی یــەکی گــەورەو لێــژایی کەمدا دەردەکەوێ و بەرزو نزمی کەم پێوە دەبینرێــت. مامۆســتا جــێمــس(p.e.james.١٩٣٥) ڕونی کردۆتەوە تێکرای بەرزی دەشتایی(٥٠٠) پێ نابێ لە ئاستی ڕووی دەریاوە. بەڵام توێژینەوە تازەکــان دووپاتیــان کــردەوە لێــرەدا دەشــتایی داتاشــراوو ڕامــاڵراو(التحاتیــة) هەیــە لــە ســەر چیاکان(١٠٠٠-١٢٠٠٠) پێ دەبن و دەکەونــە چــوار چــێوەی دەشــتایی یــەوە چــونکە لێــژییان لاوازەو ڕویان تەختە[1].

قورئان لە ڕاست دەشتایی دەفەرمێ کە داخوران و ڕووتانەوە دورستی کردووە:﴿ فَلَوْلَا أَنَّهُ كَانَ مِنْ الْمُسَبِّحِينَ لَلَبِثَ فِي بَطْنِهِ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ فَنَبَذْنَاهُ بِالْعَرَاءِ وَهُوَ سَقِيمٌ ﴾[2]. واتــە: گــەر یونـس لە ناو سکی نەهەنگدا تەسـبیحاتی خوای نەکردبایە لە سکی دا دەمایــەوەبۆ ڕۆژێ زینــدو دەبنەوە. ئەنجا لە دەشتەکی ڕووتدا فرێماندا ئەو نەخۆش بوو. (الزمخشری) لە (الکشاف) دا دەڵێ: گێراویانەوە نەهەنگەکە لە کەناری شاری نەینەوا دا فرێ ی دا.(العراء) شــوێنەکە دارو درەختــی لێ نەبێت و هیچ شتێ داینەپۆشی بێت.

ڕای زانستی ئەوەیە(العراء) ئاماژەیە بۆ دەشتایی یەکی ڕووت ڕووتابێتەوەو دارو درەختــی نەمابێ بە هۆی لاچوونی تــوێکڵی زەوی زینــدوی. وشــەی(التعریــە) کــە وشــەیەکی جیۆلۆجیــە لە(عراء)ەوە هاتووە، واتە: ئەو هۆکارانەی کــار دەکــەن بــۆ ڕووتانــەوەی تاوێرەکــان دوای خــاش کردنیان ئەنجا گواستنەوەیان نیشتاندنیان لە جێگایەکی تر. هۆکارەکانیش ئاوو باوو بەســتەڵەکە، وەکو باسکرا.

ڕابردوو باسمان کرد کە دەشتایی هۆکاردکانی ڕووتاندنەوە(التعریە) دورســتی دەکــات، یــان بەشداری دەکات لە دورست کردنی دا.

**مامۆستا(فان ڕیپەر-j.e.riper) دەشتایی بۆ سێ بەش پۆلین دەکات:**

(١) دەشــتایی کەناری(الســهول الســاحلیە) : لە تەك هێڵی کەناری و دەوروبەری دا دورســت

---

[1] (١) کوکب الارض/ د: حسن سید احمد ابو العینین./ ل: ٤٩٨.

[2] (٢) الصافات: ١٤٣ – ١٤٥.

دەبێ و تێکرای بەرزی بە زۆری لە (٥٠٠) پێ لە ئاستی رووی دەریادا تێ پەر ناکات[1].

ئەوەی قورئان باسی کرد لە راست دەشتایی دا(العراء) لە نەینەوا دا کە شارەکی کوردستانی یە دەشتایی کەناری یە کە نەهەنگەکە یونسی لە ناو ئاودا فڕێ دەداتە ناوییەوە.

(٢) دەشتی لافاوی رووباری(السهول الفيضية النهرية) :

لە دۆڵی رووبارەکاندا و بنی دا دروست دەبێ و، لیتەو قوڕەکەی بە زۆری هاڕاوی تاوێرییەکە رووبار و زێیەکانی لە سەرچاوەکانیانەوە بۆ ناوچەکانی ناوەراست و ژێرەوە هێناویانە. تێکرای دەشتایی لافاوی رووباری لە هەموو شوێنەکان وەکو یەك نییە ، لەناوچەکانی سەرەوەی روبارەکە بەرزی(٩٠٠) پێ دەبێ ، لەبەشی خوارەوەی دۆڵەکەیدا ناگاتە(١٠٠) پێ لەئاستی رووی دەریاوە(٣) ئەو دەشتانەی دەکەونە ناوەراست وباشوری عێراق و دیجلە وفورات دروستی کردون لەو دەشتانەن شوێنەکی بە پیتن بۆ کشتوکاڵ. بەڵێ قەراغەکانی ئەو روبارانە دەشتی لافاو کردیان لێ دورست بووە لەسەرەتاوە بەرزن تا بەردو دەریا بچن کەم کەم بەردو لێژی و نزمایی ددچن.

یونس بۆ ئەو دەشتایی یەی کەنار دۆزییەکان فڕێ دەدرێت، یونس لای ئەهلی کیتاب بە(یونان) هاتووە، خوا فەرمانی پێ دەکات بچێ بۆ نەینەوا چونکە خراپەکاریان زۆر بووە، وەکو(د: عبدالوهاب النجار) لە(قصص الانبياء) بە درێژی باسی کردووە.

(٣) دەشتایی راماڵراوی چیایی (السهول التحاتية الجبلية):

ئەو دەشتایی یانە بە هۆکاری جیاجیای رووتانەوە پێك دێن، پاشماوەکانی لە بەرزایی چیاکان و ناوچەکانی میان دۆڵەکانی لافاوی و هێڵەکان و جوگەکانی دابەشکردنی ناو بەسەر دۆڵی جیاجیای لافاو دەمێنێتەوە، پاشان تێکرای رادەکەی لە شوێنێکەوە بۆ شوێنکی تر جیایە. گەر تێکرای بەرزی(٧٠٠)پێ بوو لە ئاستی رووی دەریای ئێستاوە کەم وایە لەسەر نیشتوی تاوێری جیاجیادا دورست ببێ کە چۆنیەتی دروست بوونی و هۆیەکانی راماڵێن کە بەشداری یان کردووە لە پێك هاتنی داو ئەو ماوە جیولۆجیانەی تێ یدا دروست بووە دەربخات.

(١) كوكب الارضى /: ٤٩٨- ٤٩٩.

لەگەڵ جیاوازی ئەو دەشتانەو جیاوازی دۆخی دروست بونیان هەموویان لەو خاسیەتانەدا بەشدارن، گشتیان درێژبونەوەیەکی گەورەیان هەیە و روتەختن و بەرز و نزمیان و هەورازو نشێویان کەمە، مام ناوەندی پلەی لێژنەی گشتی یان لە(٥) پلە زیاتر نییە.

(حسن ابوالعینین) لە(اصول الجیومورفولوجیا) کردونی بە دووبەشی سەرەکی یەوە، لەسەر بنەمای هەمە جۆرێتی دورست بوونیان:

**(١) دەشتایی تاوێری (السهول الصخریه)** : ئەم جۆرە دەشتانە لە پێك هاتەکانی تاوێری ناچوون یەك دێت، لە تاوێری سفت و نەرم و کەڵەکەی سەریەکتری دەبن. هەرچی تاوێری نەرمەلانە زوو بە هۆکارەکانی ڕامالین دادەشۆرێ، کەچی تاوێری ڕەق و سفت بەرەنگاری یان دەکات.

**(٢) دەشتایی یەکانی ڕامالین(السهول التحاتیه)**: لەسەر ئەو تاوێرانە پەیدا دەبێ لە ڕەقی و پێك هاتەدا جیاوازن، دوریەکانی بە پێ ی ماوەی جۆراو جۆری پێك هاتەی تاوێری و سیستەمی بونیەی چینەکان کاریان تێ ناکرێ، بەڵکو لە شێوەی چەند ناوچەیەکی دا دەردەکەون، زۆر درێژ بونەوە و لێژیان لاوازە، سەرباری ئەوەی تاوێرەکانی ژێرەوەی جۆراو جۆرەو سیستەم و ڕێسای بونیەی جیاوازە. دەشتایی یەکانی ڕامالین بە پێ ی چەند هۆکارێکی جیاوازەوە کە بەشداریان لە دروستیاندا کردووە(ڕامالینی رووباری، ڕامالینی دەریایی، ڕامالینی بەستەڵەکی بە چەند خاسیەتێکی جیۆمۆرفۆلۆجی جۆراو جۆر پێك دێن. زانراوە کە کۆمەڵە دەشتایی ڕامالڕاو لە کۆتایی سوڕی ڕامالیندا دروست دەبێ، واتە لە کاتێ دا ڕووبار لە قۆناغی ساوایی بۆ قۆناغی لاوی پاشان بۆ قۆناغی پێ گەیشتن دەڕوات. لە کۆتایی قۆناغەکەدا خاکی تاوێری ڕامالڕاو و درێژ دەبێتەوەو زۆر نابات بە هۆی هۆیەکانی ڕامالینی جۆراو جۆر توشی ڕامالین و بەش بوون دەبێت. گەر رووی زەوی لە ماوەی تەمەنی جیۆلۆجی درێژی دا(٦٠٠ ملیۆن ساڵ بەر لە کەمبەری تا چاخی نوێ) توشی گۆڕانی تەکتونی نەبوایە بە تەواوی رووی تەخت دەبوو، هەورازو نشێوی نەدەبوو. بەڵام بە هۆی گۆڕانە تەکتونیەکانی بەردەوام رووی جیومۆرفۆلۆجی




گشتی بەشەکانی رووی زەوی لە نویێ بونەوە دایە[(١)].

**ئەو هۆکارانەی هەورازو نشێوی(التضاریس) لە زەوی دا پەیدا دەکەن، لەوانە دەشتایی یەکانن:**

**(١) ئەو دەشتایی یانەی ئاوی ڕەوان دروستیان دەکات:**

زۆربەی ئەو دەشتایی یانەی دروست دەبن لە سەر زەوی رووتاندنـەوەو ڕامـاڵینی دەریـایی دروستیان دەکات. گەر لـە قۆنـاغی لاوی دابـێ رووبارەکـان ڕێـرەوی خـۆی لـە مـاوەی ناوچـە لاوازەکانەوە(تاوێرە نەرمەکان- رووی درزاویەکان- اسطح الصدوع- دا دەبات) لە قۆناغی دوایـی دا چینە تاوێرە بەرزە نەرمەکان دادەخورێنێ، ئەمەش بە پێ ی کرداری داخورانی رووباری شاولی و تەنیشتی، ئەنجا رۆخ و تەنیشتەکانی دۆڵی رووباری فراوان دەبـێ، رووی زەوی لـەو قۆناغـە دا لێژی سادەیە و هەورازو نشێوی کەمە و بە دەشتایی ڕاماڵراوی دەریایی ناوزەرد دەکرێت.

## دەشتایی یەکانی ئاوی ڕەوان دەکرێ بە چەند بەشێکەوە:

**(أ) دەشتایی لافاوی (السهول الفیضیة):**

لە خـاکی دۆڵـی رووبـاری و دەووروبـەری ڕێـرەوی رووبـاری دا پێـك دێ و خلتـەو لیتـەو قورەکەی کە لە شێوەی پلێتدایە بە پێ ی نیشتنی رووبارەکە کەڵەکە دەبێتە سەر یـەکتری ، کـە

(١) شایانی باسە لە کاتی نوسینی ئەم بابەتەدا لە(نهج البلاغة/ الامام علی علیه السلام/ بشرح د: صبحی صالح/ ل: ١٣٢) بینیم ئیمام ئاماژەی کردووە : (فسکنت من المیدان الرسوب الجبال في قطع ادیها). واتە: ئـارامی گـرت لـە ناریکی لەمەیدانی نیشتەنیدا چیاکان لە پارچەی توێکلەکەیدا. وشەی(الرسوب) و(ادیم) وشـەیەکی جیۆلـۆجین لـە زاراوەی نوێ دا! ل: ١٣٢ دەفەرمێ: (ورست اصولها في الماء فانهد جبالها عن سهولها). واتـە: رەگـی چـیاکانی لـە ئاودا داکوتاو چیاکانی لە دەشتایی یەکان بەرز کردەوەو جیاکردەوە. بەڵێ چیاکان لوتکەی ژێرەوەیان دەگاتـە ئـاوو خودا لە دەشتایی جیای کردونەوە.لێرەدا پێشەوا عـەلی بەفیراسـەو ئیلهام پـەی بـەم راسـتی یانـە بـردووە، کـە پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕاست زانستی ئەودا دەفەرمێ: (انا مدینة العلم و علی بابها). رواه الطبرانی وصححه الحاکم وحسنه ابن الحجر. واتە: من شاری زانستم و عەلی دەرگاکەیەتی. لێرەدا سەیر بکە(الاصول) و(الجبال) و(السهول) هەموویان کەلە وشەیێکی جیۆلۆجین.

لە کاتی لافاودا هەڵی دەگرێت و هەندێ لە بارەکەی خۆی لە دەوروبەرو ڕۆخەکانی دا دەنیشێنێت.

یان هەندێ خڵتەو لیتە لێ دەگەرێ لە ڕێڕەوەی تەنگەبەری دا بەجێ ی دێڵێ لە دوای ئەوەی دەیدرێت. ئەو تاوێرانەی ورد و خاش بوون و دەشتایی لافاوی یان پێك هێناوە لە هەموو شوێنێکدا بە درێژایی بنی دۆڵی رووباری (valley floor) وەکو یەك نین. لە بەشی سەرەوەی حەوزی رووبارەکە دا لە بەردی ڕەقی لوسی گەورە پێك دێ کە لە شێوەو پێك هاتنـدا چۆن یەك نین. ئەو لیتەو قورانەی تاوێرەکانی چاوگەکانی سەرەوەی حەوزی رووبارەکە لێك هەڵوەشاوەن، کەچی ئەو تاوێرە هەڵوەشاوانەی دەشتایی تاوێری بەشی ژێرەوەی حەوزی رووبارەکەیان پێك هێناوە لە وردو خاشی تاوێری قەبارە بچووك پێك دێ، بە زۆری بە هۆی ئەم گەشتە درێژەیان و بەرکەوتنیان بە بنی رووبارو دورست بونیان بە هۆی ئاوەکەوە رۆخەکانیان لوسکەڵەو ساف بووە.

### (ب) دەشتایی دەلتایی(delta plain or deltas):

زۆربەی ئاوی رووبارەکانی جیهان دەچێتەوە ناو دەریاکان و ئوقیانوسەکانەوە و قورو لیتەو خشت و خاڵەکانی هەڵدەگرێت. هەندێ لەو ماددە نیشتوانە لەبەشی ژێرەوەی رووبارەکەدا کەڵەکە دەبێ، بە تایبەتی لە تەك دەمەکەیەوە، وە بە دەوری خۆی لەسەر بنی دەریاو ئوقیانوسە تەنکەلەکان دەنیشێ کە رووبارەکە بەرەو رووی دەڕوات. گەر هێزی تەوژمەکان و شەپۆلەکان و کرداری هەڵکشان و داکشان توند بوو، لە ڕێگای ئەم هۆکارانەوە بەردەوام نیشتوەکانی رووباری ڕادەماڵرێن و هەل نارەخسێ لەبەردەم زارکی رووباردا پێك بێ کەڵەکە بێت. گەر بەشی خوارەوەی رووبارەکە توشی کرداری دابەزینی زەمینی بێ دژوارە ماددە نیشتوەکان کۆببنەوە، چونکە زۆربەیان توشی کرداری دابەزین (الهبوط) دەبن و رووبارەکە بە سەر زارکی رووبار و ناوچەکانی قەراغی دەوروبەری دەکەوێت.

بەڵام ئەگەر کرداری تەوژمەکانی و شەپۆلەکانی دەریایی و کاریگەری هەڵکشان و داکشان لاواز بوو، وەکو لە گۆمەکان و دەریا داخراوەکاندا وایە، وەکو دەریای سپی ناوەراست و دەریای




ڕەش و کەنداوی مەکسیك، ئەو کاتە نیشتوەکانی ڕووباری دەتوانن لە زارکی ڕووبارەکەو هەر دوو ڕۆخی خوارەوەی دۆڵی ڕووبارەکە کەڵەکە بن، لە شێوەی چەند چینێکدا کۆببنەوەو ڕووەکانی نزیك ڕێژگەی ڕووبارەکە ساڵ بە ساڵ داپۆشن و دەشتایی پان و درێژ پێك بێنن. بە ڕۆری شێوەی باوەشێنی(المروحه) وەردەگرن. ئەو دەشتایی یە نیشتویەی لەسەر زارکی ڕووبار(فوهە النهر) دورست دەبێ پیێ ی دەوترێ(دەلتا).

دەڵتاکانیش دوو شێوەی گەورە وەردەگرن: (١): (دەلتا باوەشێنیە سێ گۆشەکان): زۆربەی دەلتاکانی ڕووبارەکانی جیهان شێوەی سێ گۆشەیی وەردەگرن، بە شێوەیەك بناغەی سێ گۆشەکە کەناری ئەو دەریاو گۆمە پێك دێنێ کە ئاوەڕۆی خوارەوەی ڕووبارەکەی دەرژێتە ناو. کەچی سەری سێ گۆشەکە ئاوچەیەك پێك دێنێ ئەو ئاوەڕۆیانە لە ئاوەڕۆی سەرەکی دەکاتەوە. هەندێ جار ڕێژەوی ڕووبارەکە زیاد دەکات کە لەسەر دەلتاکە پێك دێ و ئەوەی دوایی یان شێوەی باوەشێن وەردەگرێ. نمونەی ئەوانە(دەلتای نیله) .

### (٢) دەلتا قامکیەکان (الدلتاوات الاصبعیه):

هەندێ دەلتاکان بە هۆی ڕێڕەوی قولی ڕووباری پێك دێن و پیێ ی دەترێ شوێنی پەرینەوەکان(المعبر- passes) ئەو شوێنانەی پەرینەوە شێوەی قامکی دەست یان پیێ ی باڵندەیەك وەردەگرا چەند شریتەکی دەشتایی تەنگەبەر دەکەوێتە نێوان ئەو قامکانەوە کە لە قوری نەرم و قایم پێك دێت، جوانترین نمونە دەلتای ڕووباری(مسیسبی) یە کە چەند ڕێڕەوێکی قوڵی هەیە لە دەریادا لە شێوەی پەنجەکانی باڵندەدا(foot birds) درێژ دەبێتەوە.

### (٢) ئەو دەشتایی یانەی بە هۆی دەریا پێك دێن:

دورست بوونی دەشتایی ڕامالڕاوی دەریایی(السهول التحاتیه البحریه) بۆ کاریگەری شەپۆلەکان و تەوژمەکان و تەزوەکانی دەریایی و هەلکشان و داکشان و هەلسان و دابەزینی ئاستی ڕووی دەریا دەگەڕێتەوە لە ماوەی چاخە جیۆلۆجییە جیا جیاکاندا، لە ناو تاوێرە



وشکەکانی هاوسنووری رووی دەریادا. هەندێ لێکۆلینەوە جیۆمۆرفۆلۆجییەکان ئەوە دەردەخەن لە ئەنجامی ئەو هۆکارانەی رابردوودوە لە خاکە هاوسێیەکانی هێلی کەنار لە ماوەیەکی درێژدا، یان بە پیێ ی گەرانەوەی دەریا لە و زەوییە هاوسێیەدا دەشتایی زۆریان و درێژ دورست بوون، کە بەرزو نزمی یان لاوازیێ، هەندێ جار بە هەندێ نیشتەو زیندەوەری دەریایی جیا جیا دادەپۆشرێ،،رەهەندو دوریەکانی لەمیان رامالینی دەریایی و هێلی کەناری ئێستا دا دەبێت.

هەندێ جیۆلۆجی بەریتانی لە سەدەی(١٩)دا بروایان وابوو زۆربەی چیا رامالراوەکان لە دوورگەکانی بەریتانیا دەشتایی رامالراوی دەریایین و دەریای کۆن لەگەل گەرانەوەیەك بە دوا یەکەکانیان دروستی کردون لە ماوەی جیاجیای چەرخی جیۆلۆجی دا.

وە زاناکان رونیان کردۆتەوە کرداری پێك هاتنی دەشتایی داخوراوی دەریایی بە درێژایی کەناری دەریایی دەردەکەوێ، لە کاتی رامالینی دەریایی دا دەگەرێتەوە، لە تەکیەوە درێژ دەبێتەوەو لە تاوێری پلاستیکی و نەرم پێك دێ، ماوەکەشی زۆر خێرا دەبێت.گەر ئەو دەشتایی و رەسیفە دەریایی یانە لە رووی جیۆلۆجیەوە تەمەن درێژ یان کەم بن لە کاتی هەلکشانی بەرزدا بە ئاوی دەریا دادەپۆشرێن، دیسانەوە لەکاتی گەرانەوەی ئاوو داکشانی دا دەردەکەونەوە. شەپۆلە تێك شکێنەرە پالنەرە بەهێزەکان بەشداری لە دروست بوونی دەشتی دەریایی دەکەن لە ژێر پیێ ی رامالنیدا(cliffs) دا درێژ دەبنەوە، ئەمەش بە هۆی بەرکەوتنی دەنکە لمەکان و نیشتووە جیاجیاکان کە شەپۆلی داهاتوو هەلیان دەگرن، یان ئەو شەپۆلانەی دەگەرێنەوەو بەر تاوێری دەشتایی‌و رامالراوی دەریایی دەکەون و لێك دەخشێن. کەچی مامۆستا(ولیم موریس) پیێ ی وایە بە دەگەمەن لێکۆلەر بەلگەی دەکەوێتە دەست دورست بوونی دەشتایی رامالراوی دەریایی بسەلمێنێ، چونکە زۆربەی نیشتووەکانی دەریایی روویی وردە وردە بە هۆی هۆکارەکانی تری داخوران لەناودەچن. مامۆستا(هنری بولیج / ١٩٥٢) پیێ ی وایە زۆربەی رووی پاشماوەکانی دەشتایی داخوراوی دەریایی لە چەوو بەستەلان و کۆنجلومرات پێك دێت.

**(٣) ئەو دەشتایی یانەی بەستەڵەك دوورستیان دەكات:**

ئەو ناوچانەی نزم و نشێون و لە چاخی بلاستۆسینی دا توشی داتاشین و داخوڕان هاتوون زۆریان دەشتایی بەستەڵەکی یان تێدا پەیدا بووە، ئەم دەشتانە بەوە جیا دەکرێنەوە کە روویان گۆڕو تەختە و بەرزو نزمی یان کەمە، کەچی هەموویان لە بنەمادا لە تاوێری هاڕاوو وردی ناچوون یەك لە شێوەو پێك هاتندا پێك هاتوون و بەستەڵەك لەسەر رووی بنەرەتی ناوچەکە نیشتواندونی ، کەبەر لە سەرەتای چاخی بلاستوسینی رووی ناوچەکە بووە. لێرەدا دەتوانین دوو جۆر دەشتایی بەستەڵەکی جیا بکەینەوە:

**(١) دەشتایی قوڕی بەستەڵەکی (سهول الطفل الجلیدی / مواد صلصالیة حصویة – till plains):**

هەر چەندە وشەی(تیل) لە ئیسکوتلەندا بلاوە، بەلام جیۆلۆجی و جیومۆرفۆجیەکان لە بەریتانیا وشەی قوڕی بەستەڵەکی(الطفل الجلیدی) بەکاردێنن، ئەمریکیەکان نیشتوی چەوی قوڕینی بەستەڵەکی بەکار دێنن، کەلە بنەمادا لە وردکەی نەرم پێك دێ بە تایبەتی قور(الصلصال) کە چینی وەرناگرێت[1]. )

**(٢) دەشتایی لافاوی بەستەڵەکی (out wash plains and fans):**

ئەم دەشتایی یە لە(تیل) جیایە، چونکە(تیل) یان(الطفل) یان بەردی قوڕین لەو ناوچانەدا

---

(١) **بێگومان لە قورئانی مەزندا** لە زۆر ئایەتدا ئاماژە بە زۆر جۆری قورو لیتە و ماددەی نیشتوویی کراوە، وەکو: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾ الحجر:٢٦.واتە: مرۆڤمان دورست کردووە لە قوڕێکی وشکی رەش. بەپێ ی(اثار عصر الجلیدی البلاستوسینی في کردستان/ ه. أ . رایت) ناوچەی رواندزو هەلگورد و جیلوداغ ئەم چەرخەی گرتۆتەوە کە ژیانی تێدا دورست بووە، شوێنەوارەکانی ماون لەوێ. وە بەپێ ی سێ تابلۆ دێرینەکانی نوح ئادەم لە رواندوز و قورو لیتەی بلاستوسینی ئەوێ یەکەم خانەی ژیان دورست بووە. لە(کتاب المقدس)یشدا ئاماژە ددکات(التکوین/ ٢ / ٧ – ١٥) ئادەم لە میزوپۆتامیادا دورست بووە. وەکو داهاتوو باسی دەکەین. ﴿وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ﴾ هود: ٨٢. واتە: باراندمانە سەرمان بەردێکی قورینی چینی. ﴿لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن طِينٍ﴾ الذاریات: ٣٢. واتە:داببەزێنە سەر بەردی قوڕین. بێگومان هەموو ئەم وشانە جیۆلۆجین و لە زاراوەکانی جیۆلۆجی دا بە هەمان وەسف و واتا بەکاردێن. لە(کەمالنامەدا) هاتووە: (حجر طیني-الطفل-clay stong) بەردەقوڕ.



دورست دەبێت بەستەڵەك دایپۆشیوە، کەچی هی دووەم واتە: دەشتایی لافاوی بەستەڵەکی لە دەرەوەی بازنەی بەستەڵەکی دورست دەبێ بە هۆی ئاوی تواوە، بەپێ ی گەڕانەوەی بەستەڵەك بۆ دواوە. ئەنجا لە ئەنجامی لافاوی بەستەڵەکی دروست دەبێ لە نیشتوو هاراوەی تاوێڕی، لەگەڵ ئاوی تواوە خلۆر دەبێتەوە، یان بە هۆی سەرکەوتن دەگوازرێتەوە، پاشان ئەو نیشتوانە بە هۆی ئاوی ڕەوان پێك دێتەوە، بەڵام نیشتەی قوڕی بەستەڵەکی تەنیا بە بەستەڵەك دروست دەبێت. نمونە(سوبیر یور- میتشجان- هورن- ئیری-ئونتاریو) یە کە ناوچەی دەریاچە گەورەکانی **باشوری** ئەمریکا پێك دێننو لە چاخی بلاستوسینی بەستەڵەك دروستی کردون[1].

**١٥٢- سودی بیابانەکان و دارستانەکانیان:**

**١٥٣- کێشەی بوون بە بیابانی ڕووت(التصحر) لە جیهاندا:**

**١٥٤- کێشەی بوونی خاك:**

خوای گەورە فەرمویەتی:

**﴿ أَلَمْ نَجْعَلِ الْأَرْضَ مِهَادًا ﴾**[2].

واتە: ئایا زەویمان بۆ نەکردوون بە لانکی ژیان؟

بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی ئەم زەوییەی ئامادە باش کردویە بە باوەش و دایەنێ بۆ نادەمیزاد ، ئەم مرۆڤەی ئامادە کردووە تا لەگەڵ ئەو ژینگەیەدا بسازێ و لێ ی مالی ببێت....

هەرگیز ڕێکەوت(المصادفە)دانیشتوانی جیهانی هەر لەو کاتەوە مرۆڤ هەیە نەهاتووە وایان لێ بکات لە دۆڵەکانی رووبارەکاندا کۆببنەوە، یان لەو ناوچانەدا خاکەکەیان بۆ بەرهەم هێنانی داهاتی خۆراکی لە بارو بە پیتە، یان سامانی رووەکی و ئاژەڵی سروشتی یان پێشکەش بکات و مرۆڤ بتوانێ پێویستیەکانی خۆیان لێ بە دەست بێنێت. خوداوەند چەند هۆکارێکی بۆ پێك

(١) بە کورت کردنەوە لە(کوکب الارض / د: حسن سید احمد ابو العینین/ ل: ٤٩٨ / ٥٢٢) وەرگیراوە. کە بەراستی کتێبەکی بەرزی جیۆلۆجییە.

(٢) النبأ: ٦.




هێنانی دەستە مۆکردووە و ڕامی کردووە کە جۆرەها میوەجات و بەرهەم بێنێتە بەرهەم ، لەوانە: (جۆری تاوێرو هۆیەکانی ڕامالین و داخوراندن ورووی زەوی، تا دەگاتە قۆناغی هەراشی و پێ گەیشتن. خوای گەورە فەرمویەتی﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ الْأَرْضَ ذَلُولًا فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ وَإِلَيْهِ النُّشُورُ﴾ [1].

واتە: خوایە کە زەوی بۆ ڕام گردون بڕۆن بە کەنارەکانی دا لە ڕۆزیەکەی بخۆن، گەڕانەوەش بەرەو لای ئەوە.

خوای بێ گەرد زەوی ڕام کردووە، پانی ڕاخستووەو خاکی نەرم دۆلی لەسەر رووی دروست کردووە، گەر زەوی تاوێری ڕەق و تەق بوایە، نە دەتوانرا بەسەریدا ڕۆیشتن بکرێ، رووەك سەوز نەدەبوو. بەلام هۆکارەکانی ڕامالین بە هۆی باوو باران و گەرمی ئەو تاوێرە ڕەقانەی هەلوەشاندووە و خوای گەورە ئەم خاکە بە پیتەی بۆ ژیان لێ دوروست کردووە. ئەو دارستان و دارو درەخت و رووەك و رۆزیانەی تێدا دروست کردووە کە مرۆڤ لەسەریان دەژیت، بیگومان کاتێ خوا زەوی دروست کردوو تەسلیم بە مرۆڤی کرد ئاوا بوو!

## - چۆن هاوسەنگی ژینگەیی تێك چوو؟

کاتێ مرۆڤ هاوسەنگی ژینگەیی تێك دا، ماددە پیسەکان لە خاکدا بلاوبوونەوەو بارانی ترش بە سەریاندا باری، وەشی بوونەوەی ئەو ماددە پیسی یانە لەم چەند ساڵەی دوایی دا زیاتر بوو، تا پیس بونەکە گەیشتە ئاوی ژێر زەوی، ئەمەش بووە هۆی دابەزینی بەرهەمی کشتوکالی و لەوەڕ و پێك هاتەکانی تێك چوو بۆ خۆراکی مرۆڤ گوازرایەوە.... بەمەش سەوزەو میوەکان پیس بوون، شیر پس بوو، هێلکە پیس بوو ، گۆشت پیس بوو...!!

## - مەبەست لە سیستەمی دینامیکی چییە؟

شاراوە نییە(خاك) یاساکانی دینامیکی هاوسەنگی هەیە، لەوێ دا زیندەوەران لە دۆخەکی

---

(١) الملك: ١٥.



هاوسەنگی ژینگەیی(البیئی) وردا هەنە... ئەم زیندەوارانە ڕۆڵەکی گرنگ دەبینن لە خاکدا و بە کەرەستە ئەندامی یەکانیان دەوڵەند تری دەکەن، پاشان هەوا گۆڕکێ ی تێدا دروست دەکەن، بەڵام پیس بوونی خاك بە دەرمانەکانی قەڵاچۆکردن(المبیدات) زۆربەی ئەم زیندەوارانەی قڕ تێ خستن وەکو مێرووولەو کرمی زەوی و مێروو و زیندەوەری تر. وە خاك بە جۆرەکی تایبەتی توخمەکەی گرنگە بۆ ڕەچاوکردنی ژیان، چونکە بەشەکی زۆری بەرهەمی خۆراکی پشتی پێ دەبەستێت، وە ڕامڵین دیاردەیەکی سروشتی بەردەوامە، بەڵام لە سیتەمێکی ژینگەیی رێك دا کە بەرگێکی چڕی رووەکی داپۆشێت، تا دەسەڵاتی بەسەر دابگرێ خاکەکە پتر نوێ دەکاتەوە، گەر هاوسەنگی لە نێوان خاك و رووەکدا نەما، وەکو لە زۆر دۆخدا لەبەر دەست مرۆڤی نارێکدا روودەدات زوو خاکەکە دا دەشۆرێ و ڕادەماڵرێ، ئەوەش ئاکامی خراپی لێ دەکەوێتەوە. گەر خاك بە رووەك داپۆشرابێ سروشت پێویستی بەچی دەبێت؟ هەتا لە باری ئاسایی دا، گەر خاك بە رووەك داپۆشرابێ، سروشت پێویستی(١٠٠-٤٠٠) ساڵ هەیە تا(١٠)ملم خاك دروستدەکات لەسەر روودا، وە بۆ دورست کردنی خاکێك کە قەدەر ئەو پەرەیە قوڵ بێ پێویستی بە(٣٠٠٠-١٢٠٠٠) ساڵ دەبێت، کەواتە: چینی خاك لاچوو لە ئاستی ژیانی مرۆڤدا واتە: تازە ناگەرێتەوە. لە ناوچەی هێڵی یەکساندا بە خێرایی خاك بزر دەبێ، بۆیە دانیشتوان لەوێ تووشی کێشەی خۆراکی دەبن و هەوڵی چارەکردنی دەدەن، ئەم ناوچانە پتر لە ناوچە فێنکەکان تووشی ڕامالّین دەبن بە هۆی تەبوجرافیا و سروشتی خاك و رووەکان.

بۆچی زۆربەی وڵاتی هیندستان توشی نەمانی خاك دەبن؟ بۆ نموونە زیاتر لە نیوەی خەڵکی هیند بە هەرجۆرێ بێ لە جۆرەکان دوچاری نەمانی خاك دەبێ، لە رووبەری گشتی هەر(٣,٣) ملیۆن کم٢ دا(١,٤)ملیۆن کم زیاتر توشی لە ناوچوونی خاك دەبێت، لە کاتێ دا (٢٧٠,٠٠٠)کم٢ بە هۆی لافاوو سوێری و کەلەوی(القلویة) تووشی لەناوچوون دەبێ، ساڵانە لە هەر(٨٠٠,٠٠٠)کم٢ دا(٦) ملیار تەن توخمی بە پیت لەناو دەچێ، واتە زۆرتر لەو پەیەنەی بەکار دێ، بە پێ ی خێرایی ئیمرۆ بۆ گۆڕانی بیابانی(التصحر).

**هۆکاری چیە ٣/١ی خاکی بە پیتی زەوی کە بۆکشتوکاڵ لە بار بوو بزر بوو؟**

نزیکەی٣/١ ی خاکی لە باری زەوی بۆ کشوکاڵ لە ماوەی(٢٠) ساڵی داهاتوودا لە ناودەچێت.

• رووەکانی زەوی سوتان و بەرگی سەوز هەڵماڵرا و زەوی سوتا وەك بڵێ ی گەردەلولەکی گڕاوی لێ ی دابێت، کە هەمان گەردەلولە گڕاویەکە خودا لە قورئاندا وەسفی کردووە﴿فَأَصَابَهَا إِعْصَارٌ فِيهِ نَارٌ فَاحْتَرَقَتْ﴾ البقره: ٢٦٦. گومانی تێدا نییە بە گەورە دانانی کێشەی بونە بیابانی رووت دا(التصحر) لە جیهاندا بەم دیمەنە ترسناکە، بەڵام کارەساتێکە بۆ مرۆڤ و، سزای خودایە، بانگێشمیەکە بۆ گەڕانەوە بەرەو رێبازی خودا لە بەکارهێنانی زەوی دا.﴿ وَفِي ذَلِكُم بَلاء مِّن رَّبِّكُمْ عَظِيمٌ﴾ البقر: ٤٩[1].

بەرهەمی سیستەمی ژینگەیی لە ناوچەی کشتوکاڵی دا تەنیا لەسەر چاکی خاك هەڵوێستە ناکات، بەڵکو لەسەر چاودێری جێگای گیاندارانی سود بەخشیش هەڵوێستە دەکات، بە تایبەتی ئەو مێروانەی دانکە هەڵاڵە(اللقاح) هەڵدەگرن، وە گیاندارانی دڕەندە کە لە سەر گیاندارانی مشەخۆر دەژین، لەناوبردنی گیاندارانی وێرانکەریش هەر مەسەلەیەکی رووت نییە لە سەربەکاهێنانی دەرمانی قەڵاچۆکردنی مێروەکان دابمەزرێ بە برەکی زۆر، بەنیسبی، چونکە نرخی ئەو بەرهەمانەی لە نەوت دەردەهێنرین لەبەرزبونەوەدان، بەڵام بەتایبەتی زیادە ڕەوی کردن لە بەکارهێنانی ئەو ماددە قەڵاچۆکەرانەدا دەبێ بە یارمەتی دەر بۆ سەرهەڵدانی ئەرۆمەکانی بەرگری کردن، لە ماوەی ئەو(١٢) ساڵەی رابردوودا ژمارەی ئەو مێروو و گەنانە(القرادات) بەرگری لەو قەڵاچۆکەرانە دەکەن دووقات زیاد بوون. دیسان زیادە ڕەوی کردن لە بەکارهێنانی لەناوبەرە مێروویەکان دا ئەو زیندەوەرانەش لە ناو دەبات کە زیندەوەرە تێك دەرەکان راو دەکەن و، هەندێ لە زیندەوەرانی بێ زیانیش دەگۆڕێ بە زیندەوەری زیان بەخش وە زیان لەو

---

(١) وە خوا فەرمویەتی:﴿ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾ نوح: ١٠-١٢. واتە داوای لێ بوردیە، ئاسمان رێژنە بارانتان بۆ دەبارێنێ، سامان و منداڵتان زۆر دەکات، باخچە و باغاتتان بۆ دورست دەکات، وە رووبارەکانتان بۆ دورست دەکات.

زیندەورانەش دەدات کە نیاز نەبووە لە ناوبەردرێن، خواردنی مرۆڤ و گیانداران پیس دەکات، پێویستە بەکارهێنانی لەناوبەرە مێرووەکان تەواوکەری کۆمەڵێ هۆکار بێ، رێك دەخرێت کە ناوی دەبەین بە تەقەلایەکی بە پلان دژی کارەساتی مێروویی، وەکو بەکارهێنانی ئەو رووکارانەی دژ بەو کارەساتەکان موقاوەمە دەکەن، هەم مۆڵگە رووەکیەکان و، شێوازی کشتوکاڵی تایبەتی، رێگای میکانیکی بەکار هێنانی دورخەرەوەکان، هۆرمۆنەکان و پشت بەستن بەزیندەوەرە ڕاوکەرە سروشتیەکان[1].

## سودی دارستان چی یە؟

﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ الْمُعْصِرَاتِ مَاء ثَجَّاجًا لِنُخْرِجَ بِهِ حَبًّا وَنَبَاتًا وَجَنَّاتٍ أَلْفَافًا﴾[2]. البنأ: ١٤-١٦.

﴿أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا مَتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾[3]. النازعات: ٣١-٣٣.

(سەرباری ئەوەی دارستانەکان دارو تەختەمان پێ دەبەخشن بۆ بیناو پیشەسازی و شتی تری بە سوودن، کاریگەرییەکی چالاکیش دەکەنە سەر ئەو کردارانەی بۆ مرۆڤ گرنگی یەکی گەورەیان هەیە، چونکە کاردەکەنە سەر جۆرەها ئاووهەوا و کەشی خۆجێ یی و هەرێمی و بەگشتی فێنکی دەکات بەشداری دەکات لە هەڵگرتنی ئاوی دروست دا بەیەکبینەسی، لێرەدا هەندێ دارستان هەیە، بەتایبەتی دارستانی چڕی هێڵی یەکسان ئاو زیاتر گلدەداتەوە بە هۆی دەست بەسەرداگرتنی ئەو شێ یەی لە هەوا دا هەیە).

## سوودی دارستان حەوزەکانی خۆراك پێدان (احواض التغذية) چی یە؟

بەڵام دارستانەکانی حەوزی خۆراکی پێدان بایەخێکی تایبەتی خۆیان هەیە، خاك لە

---

(١) الموسوعة العلمية في اعجاز القران الكريم والسنه النبوية/ د: هاني بن مرعي القيسي/ ٤٦٣/٤٦٦.

(٢) واتە: باراندومانە لە هەورانی گوشراوەوە ئاوی بە لێزمە، تاوەکو پێ ی بروێنین دانەوێڵەو رووەك و باخچەی چڕو پڕ.

(٣) لە زەوی دەرهێنا ئاوو لەوەرگەکەی و چیاکانی لەنگەر پێ گرت، بۆ سوودی ئێوەو ئاژەڵەکانتان.







شوێنی خۆیان دەپارێزن و، ئەو ناوچانە چەپاڵە دەدەن کە دەکەونە بەر هاتنی لافاوی گەورەوە، لە هەموو گۆڕاندکی تریش کە ترسناکن و بەسەر هاتنی ئاودا دێن. یەکەم کردنەوەی ئەو ماددە نیشتوانەی رووبارەکان هەڵی دەگرن بەم شێوەیە، ئەو دارستانانەی دەکەونە رۆخی حەوزی رووبارەکانەوە ئەوانیش بەشداری دەکەن لە رێ پێ گرتنی گیرانی عەمباراوەکان و رژێمی جۆگەو جۆگەلەکان و حەوزو چاڵاوەکان وتەنگە کردنی دەربەندی مەرجانەکان لە ژێر نیشتوویی یەکان دا، دارستانەکان، بگرە هەزاران ساڵە بەو کارە هەڵدەستن بەرلەوەی بچنە سورەکی تازەوە.

## تەمەنی هەندێ لە دارو درەختەکان چەندە؟

هەندێ لە دارو درختەکان بە قەبارەوە تەمەنیان هەموو ئەو ژمارانەیان بڕیون کە زۆربەی زیندەوەرە جیاجیاکان تۆماریان کردون، بۆ نمونە درەختی(سیکا) ی ئوسترالی، کە بەبەردینەکی





زیندو دادەنرێ تەمەنی گەیشتۆتە(١٥) هەزار ساڵ، لە کالیفۆرنیا کاژ(سنەوبەر)ی باڵابەرزەکان هەیە(٣٦٠٠)م بە هەوادا بەرز دەبنەوە، شەمەندەفەر دەتوانێ لە ڕێگای سکەکەیەوە بە لقەکەیدا بڕواتە ژوورو بێتە دەرەوە و تەمەنی یان لە(١٥٠٠)ساڵ تێ پەر ناکات. درەخت هەیە سەردەمی ئیبراهیم خەلیل هەزار ساڵ بووە(ﷺ) و زەمانی مەسیح گەیشتۆتە قۆناغی بەساڵداچوون. درەخت هەیە بۆمبای ئەتۆمی هیرۆشیما نەیتوانی زیانی لێ بدات، چاخی دایناسورەکانی بینیوە، دابەزینی مرۆڤی بەرچاو کەوتووە لە زەوی دا، ئەمە مەتەڵێکی سەرسوڕهێنەرە، هەر لەڕۆژێ دروست بونیەوە(٣)ملیۆن ساڵە موقاوەمەی کردووە، هەتا ئێستا لەم جۆرانە ماون و زیندون.

## بەرگری سروشتی لە دژی پیس کردنی پیشەسازی:

سەرباری ئەوەی ڕابردوش دارستانەکان بەرگرییان کردووە، هەیە لە دژی پیس کردنی تەکنلۆژیادا، کە لە هەموو شوێنەك و دەوورویەرێ دەتوانرێ بچێنرێن.

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَنَزَّلْنَا مِنَ السَّمَاء مَاء مُّبَارَكًا فَأَنبَتْنَا بِهِ جَنَّاتٍ وَحَبَّ الْحَصِيدِ﴾[1]. ق: ٩.واتە باراندومانە لە ئاسمان ئاوێکی پیرۆز بەفەڕ، پێمان ڕواندووە دارو درخت و باخچەکان و دانەوێڵەی درواوە. کێ دەزانێ، شایەد داهاتووی خۆراکی لە هەموو ژینگەیەکدا تێ دا بێ، شایەد ئەو توانایەی تێدا بێ کە بەرگی سەوز بۆ زەوی بگێڕێتەوەو هاوسەنگی بۆ بگێڕێتەوەو، زەوی ببێتەوە بە باخچەو دارستانی چڕو پڕ بۆ مرۆڤ و گیانداران و بونەوەرەکان، وەکو لە ئایەتی(٢٤ — ٣٢)ی (عبس)دا هاتووە:﴿ فَلْيَنظُرِ الْإِنسَانُ إِلَى طَعَامِهِ أَنَّا صَبَبْنَا الْمَاء صَبًّا ثُمَّ شَقَقْنَا الْأَرْضَ شَقًّا فَأَنبَتْنَا فِيهَا حَبًّا وَعِنَبًا وَقَضْبًا وَزَيْتُونًا وَنَخْلًا وَحَدَائِقَ غُلْبًا وَفَاكِهَةً وَأَبًّا مَّتَاعًا لَّكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾. واتە با مرۆڤ سەیری خۆراکی بکات، ئێمە ئاومان بۆ باراندووە

---

(١) بە ڕاستی کوردستای ئێمەش کە بەهەشتی ئادەم و نوح ئیبراهیم بووە، لانەی ژیانی سەرەتایی بووە، کەچی ئیمڕۆ بە هۆی کەمی سوتەمەنی و برینی دارستانەکان لەمەترسی گەورە دایە، هەر چەندە پۆلیسی دارستان هەیە بەڵام بەرنامەو حوکمی نییە، خاکی بە پیت نەما، هەموو زەوییەکان دابڕان بۆ فرۆشتن، گیاندارانی کێوی نەمان، کانیاوەکان کەم بوون یان وشك بوون، ئاوی ژێر زەوی بە هۆی بیری ئیرتوازی زۆر ئەویش لە مەترسیدایە!

چۆن باراندنیێ، پاشان زەویمان شەق کردووە چۆن شەق کردنیێ تیماندا رواندووە دانەوێڵە. وە ترێیەکان و گژوگیا. وە زەیتون و دار خورماو باخچەی چڕو پڕ بۆ سوودی ئێوەو ئاژەڵانتان. لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ لە گەڵا دارستانەکانی حەوزەکانی خۆراکدان بە فراوانی لەناو دەبەن، بەمەبەستی چاك کردنی خاك و بۆ کشتوکاڵ، دار دەبرن بۆ سوتەمەنی دارو تەختەکان ولیف و ریشاڵەکان و زیادە ڕەوی کردن لە ئاژەڵداری کردنداو دوروست کرنی رێگاو بان بە بێ نەخشەیەکی دوروست. تەنیا(١٪)ی دانیشتوان لە ناوچە شاخاویەکان دەژین و لە(٤٪) ی لە دەشتایی دەرووبەری دا دەژین، بەم شێوەیە نیوەی خەلکی زەوی ژیان و هۆکارەکانی بژێوی راستەوخۆ لەسەر ئەو چۆنیەتی یە دادەمەزرێ کە سیستەمی ژینگەیی حەوزەکانی خۆراك پێدان پێی ئامادە دەبێت[1].

﴿تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ الْجِبَالَ بُيُوتًا﴾[2].

بەڵێ ئیمرۆ کێشەی گۆڕانی دارستان بە بیابانی رووت مەترسی مەترسی یەکی گەورەیە، ئەمەش بە هۆی برینی دارستانەکان و زۆر بوونی ئاژەڵداری بوو، ئاوەکان ووشك بوون، تا لە کوردستانیشدا سەدام و خۆشمان دارو درختەکانمان وێرانکردن. ئاوەکان کەم بوون لەسەر زەویدا، نێستا بێ بەزەیی یانە بیری ئیرتوازی لێ دەدرێن و بێ بەزەیی یانە سەرف دەکرێ، ئەمەش داهاتور مەترسی بۆ سەر دابەزینی ئاوی ژێر زەوی دەبێت و، قەیرانی گەورەی ئاوی پەیدا دەکات.

## ١٥٥- مەترسی یەکانی پیس بوونی ژینگە لە قورئاندا:

﴿وَالسَّمَاء رَفَعَهَا وَوَضَعَ الْمِيزَانَ أَلَّا تَطْغَوْا فِي الْمِيزَانِ﴾[3].

واتە: ئاسمانی بەرز کردەوە، تەرازوو هاوسەنگی دانا، زیاد ڕەوی مەکەن لە تەرازووەکەدا.

﴿وَإِذَا تَوَلَّى سَعَى فِي الأَرْضِ لِيُفْسِدَ فِيِهَا وَيُهْلِكَ الْحَرْثَ وَالنَّسْلَ وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الفَسَادَ﴾[4].

---

(١) الموسوعة العلمية غي اعجاز القران الكريم و السنه النبوية/ ل: ٤٦٦ — ٤٦٨. به كورت كردنەوه.

(٢) الاعراف: ٧٤.

(٣) الرحمن: ٧-٨.

(٤) البقرة: ٢٠٥.

واتە: کاتێ(ئەم ستەم کارە) پشتی هەلکرد لە زەوی دا تاخراپەکاری تێدا بکات و کشتوکالّ و وەچە لەناو ببات، وە خوا خراپکاری بێ خۆش نییە. بەلێ برین و سوتاندنی دارستان و بەکارهێنانی چەکی زیان بەخش وەکو بۆمبالی ئەتومی و ناپالّم و فسفۆر دارستان لە ناو دەبان و خاك و ناوو هەوا پیس دەکات. بۆ نمونە ئەمریکا بە بۆمبای ئەتۆمی هێروشیما و ناکازاکی یابانی پێکا و دارستانی ڤێتنامی بە ماددەی کیمیایی ڕشاند تا دارو بارەکان لە ناوبچن. نابێ لە یادمان بچێ ئاکامەکانی نەمانی دارستان و خاکی بە پیت و گۆڕانیان بە بیابان برسێتی و کۆچکردن و کێشەی لێ دەکەوێتەوە. نمونەی گەورە ئەو برسێتی و بەدخۆراکیەیە سۆدان و سۆمالّی گرتۆتەوە، هەروەها ناوچە بیابانەکانی تر.

## وێنەیەکی جەرگ بڕو هەژێنەر و مەترسیدار!

(خیر شاهین) دەنوسێ: باشترین وێنە بۆ پیشاندانی مەترسی بوون بە بیابان ئەو منداڵەیە خێزانی مردوون، بەرەو مەلّبەندی فریا گوزاری(الاغاثة) دەڕوات، دالێ لە پشتی یەوە چاوەڕێ دەکات بمرێ و بیخوات، بەلاّم نازانین منداڵەکە دەگاتە مەلّبەندی فریاکەوتن یان ئەو دالّە دەیخوات . ئەم وێنەیە لە برسێتی سۆداندا گیراوە لە سالّی(١٩٩٤ ز ) دا و بەخشندەی(بولتزر)ی هێنا، کاتێ ئەو منداڵەی برسێتی لێ ی داوەو لەشی داهێزراندووە و لەڕی کردووە، بەرەو چادری خۆراك دەڕوات کە کیلۆمەترێك لێ ی دوورە. ئەو دالّەی لەپشتی یەتی و تەنیا کەلاك و لاشە دەخوات چاوەڕێ دەکات بمرێ و بیخوات. ئەم وێنەیە جیهانی هەژاند، کەس نازانێ ئەو منداڵە و وێنەگرەکەی بە ناوی (کارتەر) چی یان بەسەر هاتووە کە دوای وێنە گرتنەکە شوێنەکەی جێ هێشتووە.

دوای سێ مانگ بینرا وێنەگرەکە خۆی کوشتووە، دوای ئەوەی وێنەکە کاری تێ کردووە و توشی خەمۆکی و ڕوخان(الکابة و الاحباط) ی کردووە[1].

---

(١) علوم الارض والبيئة، خير شاهين، ل:٢٣٧ – ٢٣٨، دار الميسرة.





## ١٥٦ – پیس بوونی ژینگە بە گشتی:

لێرەدا جۆرەها پیس بوونی ژینگەیی(التلوث) هەیە، کە زیان لە ژینگە و مـرۆڤ و رووەك و گیانداران دەدەن وەکو:

پیس بوونی هەوا، پیس بوونی ئاو، پیس بوونی خاك، پـیس بـوونی خـۆراك، پـیس بـوون هەیە تیشکەکان و هەیە دەنگ و هاژە هاژ دورستی دەکات.

خوای گەورە لە راست ئەم پیس بوونانە فەرمویەتی: ﴿ظَهَـرَ الْفَـسَادُ فِـي الْبَـرِّ وَالْبَحْـرِ بِمَـا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾ الروم: ٤١.

واتە: خراپەکاری و تێك چوون لە وشکانی و دەریـا دا دەرکـەوت بـە هـۆی ئـەو کارانـەی دەستی مرۆڤ کردوویەتی. ئەو هۆکارانەی ژینگە پیس دەکەن هەموو ئەوانە لەم بەنـدە دا دەیـان بینین:





# بەشی حەوتەم:

## کێشەی پیس بوون (التلوث):



لەم چەند ئایەتانە قورئان بەرپرسی مرۆڤ دەردەخات لە ڕاست ژینگەکەیدا بەو مانایەی ئەو سەرۆکی گیاندارانە لە زەوی دا، بەرپرسی یەکەمە، داوامان لێ دەکات بە ژینگەپارێزی و ئاگادارمان دەکاتەوە لە مەترسی یەکانی پیس بوونی ژینگە، کە داهاتوو مرۆڤگەر ڕوودەدات و نیشانەیەکی ئاخر زەمانە. هانمان دەدات بۆ پەروەردەی ژینگەیی لە هۆشیار کردنەوەی تاك و کۆمەڵگاو چارەکردنی کێشەو گیروگرفتەکانی و پاشان پاراستنی ژینگە، دوایی چارەکردنی ئەو قەیرانەی ئیمرۆ ژینگە تێ کەوتووە و جیهانی هەژاندووە، ئیسلام دەستی خۆی پێش خستووە.

**(١٦٥) (١٦٦): پیس بوون و گەرم بوونی زەوی:**

**(١٦٧) كون بوونی چینی ئۆزۆن:**

**(١٦٨) زیانەكانی پیس بوونی هەوا:**

قورئانی مەزن دەفەرمێ: ﴿وَجَعَلْنَا السَّمَاء سَقْفًا مَّحْفُوظًا﴾[1]. واتە: سەردوەی زەویمان كردووە بە سەقفێكی پارێزراو. كە بەرگە هەوای زەوی و چینی ئۆزۆنە.

﴿إِذَا السَّمَاء انشَقَّتْ﴾[2]. واتە: كاتێ ئاسمان كون بوو. لێرە دا ئاماژە دەكات بۆ كون بوونی چینی ئۆزۆن و بەرگە هەواكە دەیان پارێزن لە گەرمی و شوهبەكان و تیشكە كوشندە كەهرۆ موگناتیسی یەكان.

لە سەدەی بیستەم دا ئەم پێشبینی یە هاتەدی، كەوا نیشانەیەكی قیامەتە. ﴿فَارْتَقِبْ يَوْمَ تَأْتِي السَّمَاء بِدُخَانٍ مُّبِينٍ يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[3]. واتە: چاوەرێ بكە رۆژێ دێ ئاسمان بە دوكەڵێكی ئاشكرا دێ،؟ ئەمەش سزایەكی بەچێژە! دیارە پیس بوونی ئاسمان بە دوكەڵ و گازەكان دیاردەیەكی مەترسی داری هاوچەرخە!

(عماد مجاهد) دەنوسێ: (هەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە بە هەموو بەش و شێوەكانیانەوە گەشەی كرد، كارگەپیشەسازییەكان برێكی زۆر گازی ژەهراوییان فرێ دا وەكو یەكەم ئۆكسیدی كاربۆن و دووەم ئۆكسیدی كاربۆن و سیانوجین و هتد. چینە هەورێكیان پێك هێنا لەو گازانە پێك بێ لەبەرگە هەوای زەوی دا. بەپێ ی بوونی ئەو هەورە لە بەرگی زەوی دا، كە دوكەڵ و گازە قورسەكان پێكیان هێناوەو لە كارگەكان و سوتاندنی سوتەمەنی یەوە دورست دەبێت، بەم هۆكارە برەكی زۆر گەرمی گلداوەتەوە(الانحباس الحراري) دیسان برە تیشكەكی زۆر ، رێگای گرتووە بۆ ئاسمان و دەوروبەری بەرگە هەوای زەوی بدرێتەوە، ئەم گلدانەوە گەرمی یە

(١) الانبياء: ٣٢.

(٢) الانشقاق: ١.

(٣) الدخان: ١٠-١١.

بە(الدفینة- green house effect) ناسراوە، وەکو چۆن خانوی بلاستیکی و شوشەیی و نایلۆنی بە کاردێ لە کشتوکاڵدا بۆ پاراستنی گەرمی. بە هۆی ئەو خانوە شوشەیە(الدفینە) کە بەسەر زەوی هاتووە پلەی گەرمی زەوی لە ئاستی خۆی بەرز تر بۆتەوە و بەرێژەی(٢٥٪) پلەی سەدەی لە نێوان (١٨٨٠-١٩٤٠) دا زیادی کردووە، پاشان لە میان(١٩٧٠- ١٩٨٠ ز) بە رێژەی(٣٪) زیادی کردووە، دیسانەوە دووەم ئۆکسیی کاربۆن لە هەوادا زیاتر بووە و لە سەرەتای هەشتاکاندا(٥) هەزار ملیۆن تەن سوتەمەنی سوتێنراوە، ئەم برەیەش(٢٠) ملیۆن تەن دووەم ئۆکسیدی کاربۆنی بەرەڵا کردووە.

بەرزبوونەوەی رادەی گەرمی لە هەوای زەوی دا بوبە هۆی توانەوەی برێکی زۆر بەستەڵەك لە جووت جەمسەری باکورو باشوردا، بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی رووی دەریا لە ئۆقیانوسەکان و دەریاکانی جیهاندا، کت و مت ئەمە روویدا، ئاستی رووی دەریا لە ئۆقیانوسەکاندا(١٥) سم لە سەرەتای ئەم چاخەوە، کە سەدەی بیستەمە بەرز بۆتەوە، ئەم بەرزییەش لە گەرمی دا هاوشانی تێك رای پلەی گەرمی زەوییە، چاوەڕێ دەکرێ رێژەی ئاو لە داهاتوودا لە ئۆقیانوسەکان و دەریاکاندا تا(٥) مەتر بەرز ببێتەوە، ئەمەش سەردەکێشێ بۆ نقووم بوونی وولاتەکانی سەر کەنارە گەورەکان وەکو(تۆکیۆ) و (بەنگلادیش) و (هۆڵەند)ە.

دیسان پیشەسازی بەفرگرەکان(الثلاجات) و کەرستەکانی جوانکاری وقەڵاچۆکەری مێروەکانو گازی(کلۆر فلۆر کاربۆن) بەکار دێنن، کە لە هەموو گازەکان پتر دوژمنی ئۆزۆنە، لەزیندەوەران لە تیشکی سەربنەوشەیی دەپارێزێت، گەر ئەو تیشکە بە برێکی زۆر بگاتە سەر زەوی بە گشتی قڕ تێ دەخات، ئەنجا تیشکی سەربنەوشەیی هۆکارێکی سەرەکی تووش هاتنە بە شێرپەنجەی پێست. دیارە رێژەی تووش هاتنیش بەو نەخۆشیە دوای داخورانی چینی ئۆزۆن زیاتر بووە کە ژیانی زەوی لەو تیشکە مەترسیدارە دەپارێزێت[1].

بڕی ساڵانەی زیانەکانی جیهان بە هۆی کارتێ کردنی هەوا لە بەرهەمەکانی رووەکی کشتوکاڵی بە(٥٠٠٠) ملیۆن دۆلار دەقرسێنرێت[2].

---

(١) الموسوعة الفلكية الحديثة ، عماد مجاهد، ل: ١٦٠.

(٢) التربية البيئية، د: عادل مشعان ربيع ، ل:٣٧.




## زیانەکانی پیس بوونی هەوا

﴿يَغْشَى النَّاسَ هَذَا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1].

بەڵێ زیاد بوونی گازو دوکەڵە ژەهراوییەکان کۆئەندامی هەناسە و چاوەکان تووشی ئـازارو زیان دەکات. زۆر بوونی هەڵمی ئەمیناتی ئەندامی هەنـدێ جـۆری شـێرپەنجە دورسـت دەکـات، هەندێ گازی وەکو نایترۆجین زیان لە کۆئەندامی دەدات، ئـەنجا تیـشکی ئـەتۆمی شـێوانی سـك مانگی و مردن دورست دەکات.

## پیس بوونی ژاوە ژاوی ( الضوضائي ).

﴿وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ﴾[2].

واتە: دەنگت نزم بکەوە، ناخۆشترین دەنگ دەنگی گوێ درێژە.

بەڵێ دەنگی بەهێزو، دەنگی تێکەڵ و بەژاوە ژاو و نارێك وەکو دەنگی کەرو دەنگی هـۆڕن و گڕەی ترومبیل و گڕەی فڕۆکە و دەنگی بـەرزی تەلـەفزیۆن و رادیـۆو کۆمپانیـا و کارگـەکان کاریگەری خراپیان هەیە بۆ سەر دەرون و کۆئەندامەکانی مرۆڤ، وەکو شەکەت بـوون و دڵتـەنگی و بیربلاوی و ماندوکردنی دەمارەکان و خێرا لێدانی دڵ و خێـرا دەردانـی هۆرمۆنـەکان و فـراوان بوونی بیلبیلەی چاو و گرژکردنی خوێن بەر و بۆری خوێن. وە زیان لـە ئەنـدامی بیـستن دەدات. دوورنییە ژاوە ژاوی بەرز مرۆڤ بکوژێت. دیسانەوە دەنگی تەقەو دەنگی هەورە تریشقە و فوشەی با هەموو ئەوانە کاریگەری فسیۆلۆجی و دەرونی پەیدا دەکەن[3].

﴿يَجْعَلُونَ أَصْابِعَهُمْ فِي آذَانِهِم مِّنَ الصَّوَاعِقِ حَذَرَ الْمَوْتِ﴾[4].

واتە: لە کاتی گرمەو تریشقەداقامك دەخەنە گوێچکەیانەوە لە ترسی مردن.

---

(١) الدخان: ١١.

(٢) لقمان: ١٩.

(٣) التربية البيئية/ بەکورت کردنەوە(٥١-٥٥) .

(٤) البقرة: ١٩.





ئێستا دەنگەکان بە پێوەری(دیسبیل) دەپێورێن، (db) هێمایەتی. بەڵێ: خوای گەورە فەرمویەتی﴿وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ﴾ دەنگت نزم بکەوە. دیارە قسەی چرپەی میان دوو کەس(٢٠) دیسبل)ە، گۆرانیەکانی تۆمارگە(٧٠) و دەنگی گرەی ترومبیل(٩٠-٩٥) و زیوە زیوی فرۆکەی جەنگی(١٤٠) دیسبیلە.

ئەم ناناراميەی دەنگە دەنگەکان لە شارەکاندا بە تایبەتی گەورەترین مەترسی تەندورستی و دەروونی یان دورست کردووە. بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: ( خۆتان لە دەنگە دەنگی بازار بپارێزن)! (اياكم وهيشات الاسواق) واتە: وریا بن لە تێکەڵاوی بازارەکان.

## ١٦٩- پیس بوونی ئاوو دەریاکان:

بێگومان زۆر شت هەیە ئاو پیس دەکەن و مەترسی بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ و گیانداران و رووەك پەیدا دەکەن. پیسایی مرۆڤ و گیانداران و پەلەوەرو چوارپێیەکان هەر چەندە پەیینەکی باشن بۆ خاك ، کەچی ئاوو خاکیش پیس دەکەن. مانگا بە ئەندازەی(١٠) کەس پیسایی دەکات، (١٠) مریشك بە ئەندازەی نەفەرێ پیسایی دەکەن. ئەم پیسایی یانە بە بەکتریا و



مشەخۆرەکان بلاّودەکەنەوە، کە دەبنە هۆی دوورست کردنی جۆرەها نەخۆشی وەکو تیفۆد و هەوی سەلمۆنیلات و زەحیری و کولیّرا و بەهارزیا و سك چوون و هی تر.

دیسان پیس بوون هەیە بە نەوت و گـاز دەریاکـان پـیس دەکـەن، بـە تایبـەتی لـە کـاتی رووداوی سـوتان و وەرگەرانی پاپۆری نەوت هەلّگردا، زیان لە رووەك و گیاندارانی دەریـا دەدات. دیـسان پاشەرِۆکەکانی پیشەسازی و بەرهەمەکانی رِستن و چنین و کارگـەکانی خـۆراك و کارگـەی پەرِەو کارگە کیمایی یەکان و کارگەی نەوت و بـەکانزاکردن و لاسـتیك و پیـشەسـازی کانزاکـان، دەگەنە دەریاو ئۆکسجینی ئاو لە ناو دەبەن و قرِ لە زیندەوەران و مرۆڤ دەخەن.

هەمیسان جیوە مەترسی بۆ مرۆڤ و ماسیەکان دوورست دەکات، مرۆڤ تووشی تیّك چـوونی دەماری دەکات. سالّی(١٩٥٦) زۆر کەسی لە دورگەی میتامانای یابانی کوشت. سالّی(١٩٧٢) عیّراق برِیّ گەنم و جۆی لە مەکـسیك کرِی بوو، بینرا تیّکـەلّ بـە پیّـك هاتـەی(میـشیلی جیـوە کرابوو) (٦٥٣٠) کەس ژەهراوی بوون و (٥٠٠) کەس مردن.

پاشان ژەهراوی بوون بە کادیۆم و خۆلّەمیّشی دوورست کردنی پاتریەکان و زەرنیخ و هی تر. زەرنیخ ئازارو بیّ تاقەتی ماسـولکە و نەخۆشـی جگـەرو دەمـارو کۆئەنـدامی حـەرس دروسـت دەکات[1].

پیّغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: نەکەن میزو پیسایی بکەنە ئاوی مەنـدو رِەوانـەوە: (نهـی ان يبال في الماء الراكد)[2].

(نهى ان يبال في الماء الجاري)[3].

خوای گەورە رِاستی فەرموە:﴿ ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾ وەکـو رابـرد. هـەتا جولّـەی زۆری بەلەمـەکان و پاپۆرەکان و دوورست کردنی بەنداوەکان ئاو پـیس دەکـەن. هـەموو ئەوانـە ئـاوو ووشـکانی یـان تیّکدا.

(١) بەکورت کردنەوە لە(التربية البيئة / ل: ٦٦-٨٨ . وەرگیراوە

(٢) رواه مسلم.

(٣) رواه الطيالسي.

### ١٧٠ – پیس بوونی خاك:

ڕابردوو باسکرا(ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ). بەڵێ خاکیش پیس بووە بە هۆی ماددەی کانزایی و پەیینی و دەرمانی قەلاچۆکردنی مێروەکان، دیسان پاشماوەی کارگەکان لە گازو تیشکەکان و کیمیکە ماددە. سەرباری شوشەو کانزاو پەڕۆ و لایلۆن و پلاستیك و دەرمان و حەب و تەختەو قتور هەموو ئەو ماددانە دوای شی بوونەوەیان لە خاکدا ڕووەك دەیانمژێ و شانەکانیان وەریان دەگرن، دوای ئەوە مرۆڤ و گیانداران دەیان خۆن زیانیان بەردەکەوێ، یان گۆشت و شیری گیاندارە پیس بووەکان دەخوات، ڕەنگە زۆر جار کوشندە بێ. هەندێ لەو ماددانە زیندەوەری سوود بەخشیش دەکوژێ، کە خاك بە پیت دەکەن.

بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای نەداوە گۆشتی گیاندارانی پیسایی خۆر بخورێت(الجلال) (نهى عن اكل الجلالة والبانها) [1]. واتە: قەدەغەی کردووە خواردنی ئاژەڵی پیسایی خۆر گۆشتەکەی و شیرەکەشی.

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ وَالْبَلَدُ الطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُ بِإِذْنِ رَبِّهِ وَالَّذِي خَبُثَ لاَ يَخْرُجُ إِلاَّ نَكِدًا﴾[2].

واتە: شاری خاوێن ڕووەکانی بە ویستی پەروەردگاری سەردەردێنن و دەڕوێن، شاری پیس تەنیا کەمێکی دەڕوێنێت. ڕابردووش لە باسی بوونە بیابان(التصحر) زیاتر باسمان کرد.

وە خودا لە سورەتی(الکهف)دا دەفەرمێ:﴿ إِنَّا جَعَلْنَا مَا عَلَى الْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَإِنَّا لَجَاعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا﴾ [3].

واتە: ئێمە ئەوەی لەسەر زەویمان کرد بە جوانی یەك بۆ ئەوە تا تاقیتان بکەینەوە کام لە ئێوە باشترین کردای هەیە. ئێمە ئەوەی لەسەر زەوییە دەیکەینە خاکەکی ڕووت. لێرەدا قورئان دەری دەخات بە هۆی کردەوەکانی مرۆڤ سەر زەوی دەبێ بە خاکەکی ڕووت و مردوو! بیگومان پیس بوونی خاك و نەمانی دارستان و بوون بە بیابان ڕۆژبەڕۆژ لە مەترسیدایە!

---

(١) رواه ابو داود والترمذي / صحيح.

(٢) الاعراف: ٥٨.

(٣) الكهف: ٧-٨.

**١٧١ - پیس بوونی تیشکی:**

**١٧٢ - مەترسیەکانیان:**

**١٧٣ - خۆپاراستن:**

تیشك مەسەلەیەکی زۆر ئالۆزە، بریتی یە لە کۆمەڵە شەپۆلێکی کەهرۆموگناتیسی یان چەند بەشێکی ئەتۆم بە خێرایی یەکی بەرز دەجوڵێن و توانای لە ناوبردنی خانەیان هەیە. کەرەستە چالاکەکان لە رووی تیشکی یەوە چەند شێوەیەکی جیاواز لە تیشکەکان بەرهەم دێنێت، ناوکی ئەتۆمەکان ناجێگیرە بۆ خۆیان شی دەبنەوە، ئەو شی بوونەوە بە تیشکەکان بەرهەم دێنێت، چالاکیەکان و تێك ڕای دەربەڕاندنی تیشکی ناگونجێ بگۆڕێ یا ن قەدەغە بکرێ، دەرپەڕاندنی تیشکی ناوەستێ تاشی بونەوەی تەواوی ناوکە ئەتۆمەکانی ئەلفاو بێتاو گاماو نێکس و نیترونات پێك دێت.

سەرچاوەکانی تیشکەکان سروشتی یەکانن وەکو تیشکە گەردوونیەکان، وەکو تیشکە کەهرۆموگناتیسی یەکانی خۆر، یان لە تاوێرەکانی زەوییەوە یەکە بری پۆتاسیۆمی تیشکدەریان تێدایە. یان دەست کرد و پیشەسازییە، لەوانە بە کارهێنانی تیشك وەکو سینی(X) لە بواری نوژداری دا، یان لە وەرزی کەهرو ناوکی و کەرستەی تیشکدەرەوە کە لە دورستکردنی سوتەمەنی ناوکییەوە پەیدا دەبێت. یان لە کانزا کردن(التعدین) و لەتکردنی یۆرانیۆمەوە سەر هەڵدەدات، یان لە عەمبارکردنی تیشکدەرەکان و فڕێ دانی پاشماوەکانی تیشکدەرەکانەوە، یان لە وێستگەکانی تاوتوێ کردنی ناوەکییەوە پەیدا دەبێت.

بەشێ لەو تاوتوێە ناوکییانە تاووتووێ ی کشتوکاڵی و فیزیایی و کیمیایی و دەرمانخانەو تاوتوێ ی پیشەسازی و پاراستن و هەڵگرتنی خۆراکە. ئەم تیشکانە زۆر زیان بەخشن کاریگەری زۆر دەکەنە سەر زیندەوەران، ریزبەندی ترشی ئەمینی دەگۆڕن لە جینەکان و ئەنزیەکانی خانەدا، ئەمەش زیانی بۆ ماوە بەجێ دێڵێ و بۆ وەچەکانی داهاتووش دەگوازینەوە. وە کاریگەری تیشکی بۆ سەر سیستەمی ژینگەیی سروشتی بە گشتی لە رێگای گۆڕینی پێك هاتە زیندەگی یەکانیەوە دەبێت، دۆزراوەتەوە گەر سیستەمی ژینگەیی سروشتی بەپەیتی(٣-٢)





ڕاد بەر تیشکەکان بکەویّ کار دەکاتە سەر ژمارەی جۆری گیاندارەکان.

بەڵام گەر بەر(٢٠-٣٠) ڕاد بکەون بەرگری دارودرختە گەڵاپانەکان دژ بە مێرەوەکان کەم دەبێتەوە.لێرەدا دوو جۆر کارلێکردنی تیشکی هەیە:

(١)کاریگەریە تیژەکان یان ماوە کورتەکان: ئەم کاریگەرییە زوو بە دەردەکەویّ لە دوای بەرکەوتنی تیشکی دا، دوای سەعاتیّ یان دوو سەعات، یاخوودچەند خولەکیّ دوای بەرکەوتنی تیشکی زۆر بەرز دا کاریگەریەکە دەردەکەوێت، بەڵام بۆ مردن دوو مانگی بەسەردا تیّ دەپەڕیّ، ئەمەش لە قوربانیەکانی بۆمبای ئەتۆمی یاباندا بینرا. ئەو مردنەی لە ئەنجامی بەرکەوتنی تیشکی یەوە ڕوودەدات لە ژەمی(١-٥)گرای دا هۆکارەکەی لەناوچوونی ئەو شانەوە ئەتەمانەیە خۆێن بەهەم دێنن، لە ژەمی بەرزدا هۆکارەکەی نارێکی پەیدا بوونە لە کۆئەندامی هەرسی دا، کاتیّ بەرزبوونەوەی ژەمی بەرزتر دا مردنەکە بۆ لە ناوچوونی چەقە کۆئەندامی دەماری دەگەڕێتەوە.

گەر تیشکەکان و ژەمەکانیان بەرز بوو کاریگەری کوشندەیی سەرەکییان بۆ لە ناوچوونی ئەو خانانە دەگەرێتەوە لەش بنیات دەنێن، بەڵام ژەمی هەرە کەم دابەش بوونی دەزوولەیی(الانقسام الخيطي) ڕادەگرێت. ئەو تیشکانەی شانەکانی پێك هاتنی خانە دەگوڕن، بە تایبەتی خانەی مۆخی ئێسقان کە هەستیارە لە هەمبەر تیشکدا و خانە لمفاوییەکان، ئەمە گەورەترین کاریگەرییە. لێرەدا کاریگەری تیژ هەیە بۆ سەرپێست و موهەڵوەرین، کاردەکاتە سەر کۆئەندامی زاووزیّ و ڕەنگە نەزۆکی پەیدا بکات، یان ئەو خانانە لەناوببات هێلکۆکە دروست دەکەن و، چاك بوونەوەشی نییە وە تووش هاتن بە تیشکی کەم چەند کاریگەرییەك دروست دەکات، لەوانە هاندان بۆ تووش هاتن بە شێرپەنجە و لێڵ بوونی هاوێنەی چاو کاریگەری جیا جیای بۆ ماوەیی[1].

ئەشی مونتاگۆ زانای(ئەنثرۆبیولۆجیا) دەڵیّ: ئەو لە ناوچوونەی تووشی دەزگای بۆ ماوەی هەزاران کەس دەبیّ لە ئەنجامی خراپ بە کارهێنانی تیشکی سینی دا لە پشکنینی نوژداری و

(١) تربية البيئة/ ٩٠-٩٣. بەکورت کردنەوە




داندا تا ئێستا بەردەوامە[1].

دیارە تەلەفزیۆن و ئەنتەرنێت و کۆمپیوتەر و مۆبایل-هەموو ئەوانە کاریگەری خراپ بۆ سەر لەش دروست دەکەن، تیشکەکانیان لەوانە سینی شێرپەنجە پەیدا دەکات و بە ئەزموون کردن لەسەر مشکەکان لە تاقیگەدا سەلماوە، پاشان کاردەکەنە سەر دایکی سك پڕو کۆرپەلەکەی، منداڵەکەی دەشێوێنێ، یان دەیکوژێ، بۆیە لە کەنەدا ژنان لەبەشی کۆمپیوتەر بۆ بەشی تر گوازرانەوە. کار دەکاتە سەر خەوزڕان و لێدانی دڵ و بیر کردنەوە مراندن. کار دەکاتە سەر سۆمای چاوو نەزۆکی پەیدا دەکات. کار لە جینە دەکات بۆ وەچەکانی داهاتوو، سەرباری خەمۆکی و هەڵچوون[2].

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَجَعَلَ لَكُمْ سَرَابِيلَ تَقِيكُمُ الْحَرَّ﴾[3].

واتە: پۆشاکی بۆ داناون لە گەرمایی دەتان پارێزێت. واتە: لە تیشکەکان و گەرما و تاو برن.

﴿وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ الْجَاهِلِيَّةِ الْأُولَى﴾[4]. واتە: ئەی ئافرەتان وەکو نەزانی سەرەتایی جوانی خۆتان والآ مەکەن.

﴿وَقَرْنَ فِي بُيُوتِكُنَّ﴾[5]. واتە: لە ماڵەکانتدا ئۆقرە بگرن.

لە توێژینەوەیەکی نوێ دا لە ئەمریکا دا، کەلەسەر نەخۆشی شێرپەنجە کرا بینرا پیاوان لە ژنان پتر تووشی شێرپەنجە دەبن. شێرپەنجەی سی یەکان (١٨٪) یان پیاون کەچی لە(٣٪) ی ژنانن. شێرپەنجەی پێست(٢٢٪) پیاوانن و لە(١٣٪) ژنانن. پیاوان لە ژنان پتر تووشی مردن دەبن چونکە پیاوان پتر هۆکاری دەرەکی کاریان تێ دەکات. ئامادەیی سروشتی زیاتر لە پیاواندا

(١) الاشعاع في حياتنا/ عبدالرسول مهدى عبرة/ ل: ٧٠.

(٢) مواقف الاسلام من تنشئة الطفل/ ل: ٢٨٦ / سعد ابراهيم طايل الدليمى/ دبلۆم لە دەروونزانی دا.

(٣)النحل: ٨١.

(٤) الاحزاب: ٣٣.

(٥)الاحزاب: ٣٣.

هەیە زیاتر بەشی دەرەوەی پیاوان کە ئاوەڵەیە تووشی هۆکاری دەرەکی دەبێت[1].

پاشان ئیمرۆ زرێ و بەرگی بایۆلۆجی داهێنراوە کە کاریگەری تیشك بۆ سەر لەش دەکاتەوە.

زانست باس لەرەشەباو گەردەلوولی خۆری دەکات، کە گەردەلوول پتر دەکات لە زەوی دا، کار لە چینی ئۆزۆن دەکات، کار لە کەشتی یە وانەکان و کەشتی ئاسمانی دەکات. ﴿يُرْسَلُ عَلَيْكُمَا شُوَاظٌ مِّن نَّارٍ وَنُحَاسٌ﴾[2].

وەکو باسکرا. ئەنجابە هۆی کون بونی چینی ئۆزۆن کە زەوی لە تیشکی سەربنەوشەیی دەپارێزێ وە هۆکارەکی سەرەکی تووش هاتنە بە شێرپەنجەی پێست رێژەی شێرپەنجە لە ئەمریکادا پتر بووە[3].

(د: مصطفى محمود) دەنوسێ: ئەو کارەساتانەی بەسەر عاد و سەموودا هات، کە قورئان بە درێژی باسی کردووە دوور نییە کارەساتەکی لە شێوەی تەقینەوەی ئەتۆمی بوویێ، کە زۆربەیان بە تەقینەوەو دەنگێ دەست پێ دەکات:﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ﴾[4].

واتە: دەنگێکمان نارده سەریان وەکو کاو ئالیکی ناو ئاخوڕیان لێ هات. ﴿فَدَمْدَمَ عَلَيْهِمْ رَبُّهُم بِذَنبِهِمْ فَسَوَّاهَا﴾[5]. واتە: پەروەردگاریان بە دەنگێ بە تاوانەکانیان گرتنی تەختی کرد. ئەم دەنگە گەورەیە(الصيحة- الدمدمة) بەم دەنگانە دەچن کە ئیمرۆ بە شەپۆلی سەروی دەنگی ناودەبرێن، ڕەنگە گەر تیژ بن مادده بتەقێنەوەو ئەتۆم لەت بکەن و تەقینەوەی ئەتۆمی گورج دورست بکات. درێژەی ئەو ڕووداوەی قورئان باسی کردووە، زۆر لە ڕووداوەکەی هیرۆشیما نزیکە، لێرەدا بومەلەرزە هەیە زەوی ئاوەژوو دەکاتەوە ، گەرمی یەکەی زۆرو گەردەلولەکی

---

(١) الطب الوقائي في الاسلام/ د: عمر محمد عبدالله / ل:١٠٢ – ١٠٣.

(٢) الرحمن: ٣٥.

(٣) الموسوعة الفلكية الحديثة/ عماد مجاهد / ل:١٢٨ – ١٢٩ بەکورت کردنەوە.

(٤) القمر:٣١.

(٥) الشمس: ١٤.




کاولکار هەیە، لێرەدا تیشك هەیە سۆمای چاو دەبات و وەکو تریشقە بەرکەوتن خەلکی دەکوژێت.﴿ فَأَخَذَتْهُمْ صَاعِقَةُ الْعَذَابِ الْهُونِ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ﴾[1].

واتە: تریشقەی سزای سەرشۆری گرتنی بە هۆی ئەو کارانەی ئەوان دەیان کرد.

زەوی ئاوەژوو دەبێتەوە خەلکی وەکو باران وبەردو تاوێرەکان دادەبارنە سەر:﴿ فَلَمَّا جَاء أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَالِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ﴾[2].

واتە: کاتێ فەرمانی ئێمە هات سەرەو ژێمان کرد و بەردی قورینی کەوتووە سەریەکمان باراندە سەریان.

لێرەدا هیچ رێگایەك نییە بۆ رزگاری(لوت) (ﷺ) لە چارەنووسی گەلەکەی بە دوورکەوتنەوە نەبێ نیوە رۆژێ لە ئەوان، چونکە رووداوەکە سروشتی یە بە کاری نائاسایی رزگاربوون نییە، بەلاَم دەبێ لە دەست رووداوە رابکات و دووربکەوێتەوە. خوای گەورە بۆ راکردنی لوت کاتەکی دیاریکراوی دانا، ئەویش دەرچوون بوو بەشەو، کاتەکی دیاری کراویشی بۆ روودانی رووداوەکە دانابوو، کە بەرەبەیان بوو، تا لوت توانیبی ماوەیەکی بڕیبێ و لە بازنەی لەرزینەکە دوورکەوتبێتەوە. پێویستە راکردوان بۆ دوواوە ئاور نەدەنەوە، چونکە تیشکی تەقینەوەکە داهاتوو ئەوەی سەیری بکات چاویان کوێر و نابینا دەکات، وەکو لە سورەتی(هود) و (الحجر) دا هاتوو:

﴿فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ اللَّيْلِ وَاتَّبِعْ أَدْبَارَهُمْ وَلاَ يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَامْضُواْ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ﴾[3].

واتە: هەندێکی شەو خۆت وخێزانت برۆن و بە شوێن ئەواندا برۆ با کەس ئاوڕنەداتەوە لە ئێوە، بۆ کوێ فەرمانتان پێ کراوە بۆ ئەوەی بچن. لەوەش پتر کارلێکردنەکان و پاشماوە بلورییەکان کە لە خاکی هیروشیما دا دۆزراونەوە، کە دوای لێدانی بۆمبای ئەتومی خاکەکەی گۆڕابوو زۆر بە پاشماوەکانی سەدوم و عەموره دەچوو لە فەلەستیندا کە گەلی لوتی تێدا

---

(١) فصلت: ١٧.

(٢) هود: ٨٢.

(٣) الحجر: ٦٥.





ژیاوە[1]. بەڵێ هەموو ئەم ڕاستی یە زانستی جیۆلۆجیانە ئەوە دەردەخەن قورئان موعجیزەیە و فەرمایشتی خودایە، گەرنا چۆن مرۆڤەکی نەخوێندەواری(١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر پەی بەم ڕاستیەیانە بردوون، گریمان زاناو فەیلەسوفی سەردەمی خۆشی بوو بێت؟!

هەتا ووشەکانی قورئان، پیتەکانی وەکو خانەیەکی زیندوون لە مرۆڤدا کەلەوپەری ئەندازەیی وردا داڕێژراون خانەکان لە لەشدا لێك دەچن و دووبارە دەبنەوە، کەچی دووبارە نابنەوە، بەڵکو جیاوازن و جۆار جۆرن، لە قورئانیشدا ووشەکان دەبینین دووبارە بونەوە، کەچی ئەوانە دووبارەنین و هەر جارە دیمەنێکی نوێ هەڵدەگرن. هەر وشەو ڕستەیەکی قورئان بیگری ئوقیانوسێکی پڕ لە مرواری و مەرجانە بۆ دەرهێنانیان مەلەوانی شارەزاو خۆماندوکەری دەوێت!

ئەو خەزێنانەی لە قورئاندان لە هەموو جۆرە زانستێ لە هەزری گەورەترین فەیلەسوف و زانا فراوانترە. دوژمنانی ئیسلام و ملیارەها دۆلار خەرج دەکەن بۆ لە ناوبردن و لکەدار کردنی ئیسلام و قورئان و پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بەلام تا ئێستا نەیانتوانیوە ئایەتێك لە شێوەی ئەودا دابڕێژن، گەر بەم کارە هەڵسابان هەموو دنیا دەنگی دەدایەوەو پێ ی دەزانی!

﴿وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَى عَبْدِنَا فَأْتُواْ بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ وَادْعُواْ شُهَدَاءكُم مِّن دُونِ اللّهِ إِنْ كُنْتُمْ صَادِقِينَ﴾[2].

(ئارتەر بلگری) دەڵێ: (ئەو قورئانەی موحەمەد(ﷺ) بە بانگەوازی هەڵسا لە لایەن خواوەیە) . (جین بول رکس) دەڵێ: (گەورەترین موعجیزەی پێغەمبەر ئیسلام(ﷺ) قورئانە کە بە سروش بۆی هاتووە). (رایمۆند چارلس) دەڵێ: (قورئان لە کتێبە سروشە خوایی یەکان پتر

(١) القران كائن حي/ د: مصطفى محمود / ل: ٩٠ – ٩٧. تێبینی لە ساڵی(١٩٤٥) دا دوای ئەوەی یابان هۆشیاریەکەی ئەمریکای گوێ پێ نەدا فرۆکەکانی ئەمریکا بۆمبایەکی ئەتۆمیان کێشا بە هیرۆشیما دا، دوای سێ ڕۆژ بە ناکازاکی دا. هەر لە هیرۆشیما دا(٨٠,٠٠٠) کەس کوژران(١٢٠,٠٠٠)هەزار بریندار بوون، (١٠٠,٠٠٠)هەزار کەس بێ شوێن بوون. ئەمەش کارەساتەکی گەورەی مێژوویی بوو، هەرگیز بە خۆیەوە نەدیبوو! دیسان(لوت) خەڵکی فەلەستین نەبووە بەڵکو پێغەمبەری ئەوێ بووە برازای ئیبراهیم(ﷺ) بووە، لەگەڵ ئەودا لە بیترین لای دۆڵناران(فدان ئارام) کۆچ دەکات.

(٢) البقرة: ٢٣.





زیندەگی بە بڕواداران دەگەیێنێت). (مۆریس) دەڵێ: ( قورئان موعجیزەییکە لە سەروی هەموو ڕەخنەییکەوەیە). (مانۆیل کنج) دەڵێ: (قورئان کۆی گشتی پێغەمبەرمان(ﷺ) بە درێژایی پێغەمبەرایەتیەکەی وەری گرتووە). (ڕودویل) دەڵێ: (تا مرۆڤ لە خوێندنەوەی قورئان ورد بیتەوە زیاتر سەری سوڕدەمینێ، لە واق وڕمان و شکۆدار ڕاگرتنی هیچی تری بەدەستەوە نامێنێت)[1].

ئەمانە وتەی چەند زانایەکی خۆرئاوایە لە سەدان زانا کە ئەوانیش بە هەمان ئاکام گەیشتوون و، زۆرێکی لەوانە بۆ ڕێ ی ڕاست ڕێنوما کردووەو موسڵمان بوون.



(١) اسألة العصر المحيرة، محمد فتح الله كولن، ت: اورخان محمد علي، ل: ٩٧.



# بەندی هەشتەم

## ١٧٤ – دورگەکان (الجزر) Antsland:

لە فەرمودەدا هاتووە: (لاتقوم الساعة حتی یکثر المال ویفیض. حتی یخرج الرجل بزکاة ماله فلا یجد احدا یقبلها منه، وحتی تعود ارض العرب مروجا وانهارا)[1].

واتە: قیامەت نایەت تا ماڵ و سامان زۆرو بۆر نەبێت، تا پیاو بە زەکاتەوە دەڕوات کەسی دەست ناکەوێ زەکات وەربگرێت. واتا زەوی عەرەب نەگەڕێتەوە بەمێرگوزارو رووبارەکان.

لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) پێشبینی دەکات ڕۆژێ دێ لەسەردەمی مەهدی دا(علیە السلام) ئابووری گەشە دەکات و دادگەری کۆمەڵایەتی پیادەبێ و هەژاری و چینایەتی بنەبڕ دەبێت ، تا هەژارێ نامێنێ زەکات وەربگرێت. وەکو لە فەرمودەی صحیح دا هاتووە: (یکون في اخر امتي خلیفة یحثوا المال حثیا لا یعده عدا)[2]. واتە: لە ئاخیری ئوممەتی من دا خەلیفەیێك دێ سامان بێ شومار دابەش دەکات و نایژمێرێت.

پێش بینی دەکات گۆڕانەکی جەوهەری لە جیهاندا دورست دەبێ لە رووی دینی و سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتی دا، ئەنجا لە رووی ئاووهەوا و جیۆلۆجیادا خاکی عەرەب جارێکی تر دەگەڕێتەوە بە رووبارو مێگوزار و دارستان.

لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە دەکات کە هەموو گەلێ خاك و جوگرافیاو سنووری هەیە، ئەمە خاکی عەرەبەو، ئەمە خاکی فارسەو، ئەمە خاکی کوردەو، ئەمە خاکی تورکە. کەس بۆی نییە سنوورەکانی یان ببەزێنێت.

---

(١) رواه مسلم.

(٢) رواه مسلم. (الدار الاخرة / محمد متولي الشعراوي/ ل: ٢٨٤/ج١.



قورتانی مەزن دەفەرمێ لەسەر زمانی (نوح) کاتێ بە خەڵکی میزوپۆتامیای فەرموو:﴿اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا يُرْسِلِ السَّمَاء عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَل لَّكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَل لَّكُمْ أَنْهَارًا﴾(١).

بەڵێ لەسەردەمی مەهدی و مەسیحدا(علیهما السلام) خەڵکی تۆبە دەکەن و دەست بەرداری گوناهەکان دەبن، ئەو کاتە کۆنەستەکانی مرۆڤ(اللاشعور الجمعي) و نەستی گەردوون پێکەوە ئاشت دەبنەوە، ئەو کاتە گۆڕانەکی جەوهەری لە گەردووندا روودەدات و دەروازەکانی خوا لە زەوی و ئاسماندا دەبنەوە. ﴿وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُواْ وَاتَّقَواْ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاء وَالأَرْضِ وَلَـكِن كَذَّبُواْ فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ﴾(٢).

زۆر زانای گەورە وەکو(یۆنگ) بڕوایان وایە گەردوون یەکەو پەیوەندیەکی توند لەمیان سروشت و لەش و دەروونی مرۆڤدا هەیە. جیهان وەکو مرۆڤ بەشی دەرەوەو ناوەوەی هەیە ئەم

---

(١) نوح: ١٠ – ١٢.

(٢) الاعراف: ٩٦.



یەك بونەی گەردوونیش وەكو(دۆرن dorn) ئاماژەی پێ كردووە دوای مردن دەردەكەوێت[1].

شایانی باسە(ارض العرب) بە (جزیرە العرب)یش ناوی هاتووە: (ان الشیطان ینسان یعبد في جزیرة العرب) [2]. واتە: شەیتان نائومید بووە لە دورگەی عەرەبی دا بپەرسترێت.

(ابوعبیدە) دەڵێ: (دورگەی عەرەبی پارچە زەوییەكە دەكەوێتە نێوان چاڵی نەبی مووسا تا ئەوسەری یەمەن لە درێژەی دا، وە دەكەوێتە نێوان(رمل یبرین) تا كەرتی سەماوە لە پانی دا)، وەكو (ابن الاثیر) لە (النهایە) دا ئاماژەی پێ كردووە. بەڵام گەر ووشەی(الجزیرة) وشەی(العرب) ی پێوە نەبوو ئەوە نێوان دیجلەو فوراتە.

(الشیخ الزندانی) نوسیویەتی: ( برۆفیسۆر – الفەرید كورروز – كە ناودارترین زانای جیۆلۆجی یە لە جیهاندا ئامادەی دانیشتنی جیۆلۆجیا بوو لە كۆلێژی(زەوی ناسی) دا لە زانكۆی(ملك عبدالعزیز)دا. پێم گوت: ئایا ئێوە هیچ ڕاستی یەكتان لە ڕاست ئەوە پێیە كە دورگەی عەرەبی سەرەتا باخچەو باغ و دارستان بووە؟ وتی: بەڵێ ئەم مەسەلەیە لای خۆمان زانراوە و ڕاستی یەكی زانستی یە و جیۆلۆجیەكان ئەوە ئاگادارن، چونكە بچیە هەر لایەك چەند شوێنەوارێ دەبینی ئەوە دەردەخەن ئەم خاكەیە مێرگ و رووبار بووە. ئەنجا پێم ووت: **ئایا** ئاگادارن عەرەبەستان جارەكی تر دەبێتەوە بە مێرگ و روبار؟ وتی: **بەڵێ ئەمە راستی یەكی** نەگۆڕە لامان و ئێمە جیولۆجی حیسابمان كردووە. دەڵێ: **ئێمە مێژووی رابردوی زەویمان تاووتوێ** كردووە بینیومانە بە چەند چەرخێكدا ڕادەبرێ، لەوانەش چەرخی بەستەڵەكی. **واتە: برێ لە** ئاوی رووبار دەگۆڕێ بە بەفرو لە جەمسەری باكووردا كۆدەبێتەوە، **پاشان بەرەو باشور** دەخزێت و ژێرەوەی دەبەستێ و كەشی زەوی دەگۆڕێت و دەبێتە ناوچەیەكی بارانـاوی و رووبار، سعودییە وەكو باكووری ئەوروپای بەسەردێت.

ئەنجا من ئەم فەرمودەیەم خوێندەوە(لاتقوم الساعة حتى يكثر المال ويفيض. حتى يخرج الرجل بزكاة ماله فلا يجد احدا يقبلها منه، وحتى تعود ارض العرب مروجا وانهارا).

---

(١) بۆ زانستی پتر بڕوانە كتێبی : (التزامنیة / نخبة من الاساتذة / ت: سعد هادی سلیمان / بغداد/ ١٩٩٠.

(٢) رواه احمد.

ووتم: کێ بە(موحەمەدی(ﷺ) وتووە عەرەبستان یان دورگەی عەرەبی سەرەتا باخچەو رووبار بووە؟ وتی: رۆمەکان.

وتم: ئەی کێ هەواڵی داوە داهاتوو دەبێتەوە بە رووبارو مێرگ؟ بیری کردەوە و ڕاما، ئەنجا ئاماژەی بۆ ئاسمان کرد، واتە: سروشی خودایە. وتم : بنوسە. ئەنجا بەخەتی خۆی نوسی: من ئەو راستی یە زانستانەی لە قورئان و سونەتدا واقیان ورماندوم، کە داهاتوو زانست پەی پێ بردوون. ئەمەش مانای وایە پێغەمبەر(ﷺ) بە سروشی ئاسمانی ئەو زانستەی پێ گەیشتووە[1].

## دورگە لە رووی جیۆلۆجیەوە:

دورگە لە رووی جیۆلۆجیەوە رووبەرێکی زەوییە کە لە هەموو لایەکەوە ئاو دەوری دابێت. زانایان ماوەی رووبەری دوورگەیان دیاری نەکردووە، بۆیە مامۆستا(ماکیندەر) وشکانی کیشوەری ئەفریقیا و ئەمریکای باشور و ئەمریکای باکوور ئوراسیا و ئوسترالیا بە (دوورگە گەورەکانی جیهان – world islands) ناویان دەبات.

بەڵام (سوین – swayn) لە ساڵی(١٩٥٦) ئەوەی بە راست زانی کە دوورگە دەبێ تەنیا ئەو خاکە سنووردارەبێ لەسەر خاکی ووشکانی هەیە و، لە رووبەری کیشوەرەکان بچوکتر بێت. **هەندێ دوورگە** دەکەونە نێوان رووبارەکان، بۆیە بە دوورگەی رووباری ناسراون. هەیانە دەکەونە **نێوان دەریاکان و ئۆقیانوسەکان** بۆیە بە دوورگەی دەریایی و ئۆقیانوسی دەناسرێن.

## دوورگەکان سێ بەشی سەرەکین:

(١) دوورگەی بورکانی: بە زۆری لە ئۆقیانوسەکاندا بڵاودەبنەوە، بە تایبەتی ئوقیانوسی هێمن، ئەم دوورگانە لە ئەنجامی هەڵچوونی بورکانی دا دورست بوون لە چاخە جیۆلۆجیە جیاجیاکاندا، تاوێرەکانی بۆڕکانین، واتە: بەشێکن لە تەواوەی(لاڤا). لەسەر بنی ئۆقیانووسی هێمن(٢٠٠٠)دورگەی بورکانی بەرزبۆتەوە لە هەموویان ناودارتر(هاوای)یە.

---

(١) بە کورت کردنەوە لە(الموسوعة الذهبية/ د: احمد مصطفى متولي/ ل: ١٠٩١ وەرگیراوە.



(۲) دوورگەی کێشوەری: ئەو دوورگانە لە کێشوەری دەورو بەریان دروست بوون، بەهۆی جوڵەی تەکتونی، لە ماوەی چاخە جیاجیاکاندا. لە تاوێری جۆارو جۆر پێك دێن.

(۳) دوورگەی مەرجانی: لە هەندێ لە ئاوەکانی هێڵی یەکسان و بازنەیی دا گەشە دەکەن ئەو دوورگانە لە تاوێری جیری پێك دێن، کە لە بنەڕەتدا پەیکەری ڕەقی گیانداری مەرجانی بوون، لە ئەنجامی لە ناوچوونی پەیکەری(جیری) زیندەوەرە دەریایی یە جۆراو جۆرەکاندا و کۆبونەوەی پەیکەری مەرجانی و تێکەڵ بونیان لەگەڵ کانزای جۆراو جۆردا، تاوێری جۆراو جۆری مەرجانی دروست دەبن[1].



(۱) بەکورت کردنەوەی لە کتێبی(کوکب الارض) ل: ٥٢٣ – ٥٣٢. وەرگیراوە.





## بەندی نۆیەم:

## دروست بوونی ژیان لە هەسارەی زەوی دا:





**١٧٥- چیرۆکی دروست بوون.**

**١٧٦- تیورەکانی دروست بوون.**

**١٧٧- تیوری لە خۆوە پەیدا بوون.**

**١٧٨- تیوری گەردونە بنەرەت.**

**١٧٩- تیوری کیمایی،**

خوای گەورە فەرمویەتی:﴿ قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾[1].

واتە: بڵێ: بڕۆن بە زەویدا چۆن دورست بون دەستی پێ کـردووە! لەگـەڵ ئـەوەی دا **قورئـان** هەموو چیرۆکی دورست بوونی ژیـانی بـۆ مـرۆڤ روون کردۆتـەوە، هـانی مرۆڤـی داوە سـۆراغی شوێنەواروبەردینەکان بکات کە چۆن ژیان دورست بوودو لەگەڵ دەقە قورئانیەکانـدا بـەراووردیان بکات و بتوانێ تیورێکی دورست لە ڕاست دورست بوونی ژیاندا دابمەزرێنێت.

مرۆڤ بونەوەرێکی هوشیارو زیرەکە، هەستی سۆراغ و دینی هانی دەدات بیربکاتەوە و لـەم جیهانە پان و پۆرەی دەووروبەری تێ بگات و بزانێ، ئەم جیهانە چۆن دروست بـووە؟ چـۆن ژیـان دروست بووە؟ ئایا بونەوەر سەرەتای هەیە؟ ئایا کۆتایی هەیە؟ ئەی کێ ئەم بونەوەرەو جیهانـەی دامەزراندووە؟ کێ بونەوەرو ژیان بەرێوە دەبات؟ بۆچی بونەوەرو ژیـان دورسـت بـووە؟ بێگومـان وەڵامی ئەم پرسیارە غەریزەیی یانە ئایدیاو بیروبڕواو تێ گەیشتنی ئەو لە ڕاست بونەوەرو ژیانـدا پێـك دێنێـت، بـە شـێوەیەکی کاریگەرانـە هاوبەشـی دەکـات لـە چارەنوسـی مـرۆڤ و جـۆری شارستانیەتی و ژیانی کۆمەڵایەتی و تاکێتی، یان ئارام گرتنی دەروونی وی، یان هـزری دەکـات بە نێچیری گومان و دوودڵی و سەرگەردانی و بێ چارەیی و کلۆڵی و گومرایی.

رابردوو باسمان کرد کە چۆن زەوی دورست بووە؟ چۆن کراوە بە لانەی ژیـان و حەوانـەوە بـۆ مرۆڤ و گیانداران و رووەك؟ ئێستا دەبێ وەڵام بدەینەوە چۆن ژیان دورست بووە؟ دیارە بۆ وەڵامی ئەم پرسیارە زانایان و فەیلەسوفان هەوڵیان داوە هەریەکـەیان لـە رێگـای زانسـت و فەلسـەفەی

(١) العنكبوت: ٢٠.

خۆیانەوە وەڵامی یان بدەنەوەو هەر یەکە لە تیوریێ دا، یان گریمانێ دا دایبرێژن. ئێمە لەم باسە و لێکۆلینەوەیەدا دەمانەوێ کامە تیوری ڕاستەو لە بنەماکانی قورئان و دین نزیکە بیخەینەروو، مامۆستایان و قوتابیان و خوێنەرانیان پێ ناشنا بکەین، بۆ ڕێنومابوون و رزگاری لە سەر گەردنی تیورەکان، لەوانەش تیوری پەرەسەندن کە بەداخەوە تا ئیمرۆ لە قوتابخانەکان و زانکۆکان دەخوێنرێت و بە ماددەیەکی زانستی و لۆژیکی دا دەنرێت. لەوانەش کتێبی(علم التطور/ لیث عبدالجلیل جواد)، بۆیە ئێمە ئەم کتێبە دەکەینە ماددەی بابەتەکەمان بۆ لیکۆلێنەوە و ڕاڤەکردنی و بەپێ ی قورئان و زانستی نوێ پاسادانانیان دەکەین. چونکە هەر ڕێسایەك پێچەوانەی دین بێ دیارە ڕاست نییە و، سپەی یان دووی زانستیش لە دژی دا ڕادەوەستێت و بەڵگەی ئەزموونی ڕەتی دەکاتەوەو هەرەسی پێ دێنێت. یەك لەم تیورە پەرەسەندنە، کە لەلایەن دین و زانستی نوێوە بچینە ناو ئەم بابەتەیەوە با چاوێ بە سەرەکی ترین تیورەکانی دورست بوونی ژیان بخشێنین، بابزانین چونکە زانستی و دینی نەبوون زوو کۆتایی بە تەمەنیان هاتووە: ﴿وَقُلْ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾ (١).

(ئیرل چستەر ریکس) زانای ماتماتیکی و فیزیایی لە ئەمریکا دەڵێ: (ئەو تیورانەی ئیمرۆ کە دورست بوونی گەردوون ڕاڤە دەکەن، دیسانەوە دەسەڵات بەسەرداگرتنی، بەشێوەیەکی ناوا پێچەوانەی دەقە هاوردەکانی نامە ئاسمانیەکان بێ، ناتوانێ هەموو ڕاستی یەکان روون بکاتەوەو خۆی دەخاتە شەوەزەنگی گومان و نادیارەوە، من خۆم بڕوام بە خوا هەیە و بروام وایە ئەو ڕکێفی بونەوەری لە دەستدایە(٢).

## ئەمەش دیارترین تیورەکانن:

### (١) تیوری لە خۆوە پەیدا بوون (نظرية الخلق الذاتي):

یەکەم تیورە بنەمای ژیان دەخاتە دەماقاڵی یەوە، لێرەدا چەند تیوریێ هەیە لەم بوارەدا

(١) الاسراء: ٨١.

(٢) الله يتجلى في عصر العلم / جون كلوفر مونسا / ل: ١١٠.





بەپێ ی ئەم تیورە دروست بوونی زیندەوەرانی ساکار بۆ زیندەوەری ئالۆز دەگێڕێتەوە لە کەرستەی نازیندەگی یەوە. هەر بۆیە(ئەرستۆ) باوەڕی وابووە تەپۆو کێچ لە شتی بۆنگەنەوە دروست بوون. سەرە مێکوتە(الدعامیص) و کرمەکان و زیندەوەرەکان لە قوڕ دروست بوون، بڕوای وابووە مێش لە گۆشتی بۆنگەن دروست بووە. بەڵام لە سەدەی(۱۷) دا(رەوی) پزیشکێکی ئیتالی بوو هەوڵی دا ئەم تیورە بەدرۆبخاتەوە لەمەشدا سەرکەوت، چەند تاقی کردنەوەیەکی سەرکەوتووی کرد بنەماکانی ئەم تیورەی هەڵتەکاند. قاپێکی هێنا پڕی گۆشتی کاڵی کردە ناوو سەری بەپەڕۆیەکی تەنك قەپات کردو دایە بەرهەوا، پاش مادەیێ بینی کرمەکانی مێش لە ناو قاپەکە دا دورست نەبوون، بەڵکو لەسەر پەڕۆکە دەرکەوتوون. لەمەوە بۆ هەمووان ئاشکرا بوو ئەو کرمانەلە خۆوەلە گۆشتی بۆنگەن دورست نەبوون، بەڵکو گەرای مێشەکانە لەسەر گۆشتی دادەنێن و پاشان ئەم گەرایانە هەڵاتوون و بوون بەکرم(اليرقات) [1]. پاشان(باستێرش) بە تەواوی تیوری لە خۆوە دورست بوونی هەڵتەند، هەڵسا هەندێ گۆشتی بە چەڵاوی هێنا کوڵاندی و لەناو قاپێکی داخراودا دایە بەرهەوا، لە ڕێگای بۆڕیچکەی وردی چەماوە هەوای دەڕژیشتە ناوەوە، بەم شێوەیە ئەو چەڵاوو مەرەگەیەی دایە هەوای ئازاد، بێ ئەوەی هیچ گەشەیەکی بەکتریایی تێدا ببینی، لەمەوە بۆی دەرکەوت گەشەیی بەکتریای خۆراك لە ناو خۆراکێکدا گەشە دەکات کە بەکتریای تێدا بوبێت[2].ئەمەش مانای وایە: ژیان لە ژیانەوە نەبێت پەیدا نابێت.

گەر ئێمە تەماشای ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر(ﷺ) بکەین و لێ ی ووردبینەوە بە لە(رەوی) و(سبلانزانی) و(پاستێر) دەری خستووە مێش و کرم و بەکتریا لە دەرەوەدا لە ناو هەوادا دێنە ناو خواردەمەنیەکانەوە: (غطوا الاناء واوكئوا السقاء، فان في السنة ليلة ينزل فيه وباد لايمر باناء لم يغط او سقاء لم يوكأ الا وقع فيه ذلك الوباء) [3].

واتە: قاپەکان داپۆشن و کوندەومەشکەکان دەم بەست بکەن، لە ساڵێ دا شەوێ هەیە

(۱) علم التطور ، ليث عبدالجليل جواد ، ل: ۲۵.

(۲) علم التطور، ل:۲٦.

(۳) رواه الترمذي

نەخۆشی پەتای تێدا دادەبەزێ بەلای قاپ و کوندەیەکی دا بڕوا سەر ئاوەڵە بن دەرواتە ناوییەوە. بەڵێ هەوا و تۆزو خۆڵ و مێش هەموو ئەوانە میکرۆب و نەخۆشیان هەڵگرتووە دەچنە ناو قـاپی سەر ئاوەڵە و گەرای تێدا دەدانێن و گەشەی تێدا دەکەن!

**(٢) تیوری گەردوونی (النظرية الكونية):**

تیوری دووەم بۆ بنەمای ژیان تیوری گەردوونییە، واتە: سپۆرەکان(الابـواغ spores) یـان بۆیەکان بەرێکەوت لە بەشێکی تری گەردوونی دەرەوە گەیشتووتە زەوی و بنەمای ژیانیـان پێـك هێناوە.

ئەم تیورەش ڕاست نییە لەبـەر دووهۆکـار: سـەرمای زۆرو وشـکی تـەواو و ئـەو تیـشکە گەردونیانەی لەمیان ئەستێرەکاندا هەیە، بەرگـەگرتنی ئـەو دۆخانـە بـۆ سـپۆرەکان زۆر دژوارە. دووەم: تیورەکە بنەڕەتی ژیان ڕوون ناکاتەوەبەڵکو دەیگۆڕێ و دەیباتە لایەکی دووری نەناسـراوی گەردوون[1].

گەر بگەڕێینەوە بۆ ناو بازنەی ئیسلام هەندێ لە زانا موسڵمانیش پێیـان وایـە ژیـان یـان ئادەم لە دەرەوەی زەوییەوە هاتووە بۆ سەر زەوی لەوانە(بەهەشت) . وەکو(ابن كثير) لـە(البدايـة والنهاية) دا (ج١)دا باسی کردووە. کە(حسن البصري) دەڵێ: ئادەم لەبەهەشـتەوە هاتۆتـە سـەر زەوی، واتە لە ئاسمانەوە، چونکە دابەزیوە وەکو قورئان فەرمویـەتی:﴿ وَقُلْنَـا يَـا آدَمُ اسْـكُنْ أَنـتَ وَزَوْجُكَ الْجَنَّةَ﴾[2]. و

واتە: وتمان ئەی ئادەم خۆت و خێزانت لە بەهەشتەوە نیشتەجێ بـنن. (اهْبِطُـواْ مِنْهَـا) لـە بەهەشتەوە دابـەزە. یان(اخرج منها) هەموو ئەوانە ئەوە دەردەخەن ئادەم لەئاسمان بووە.

(حسن) دەڵێ: (ئادەم لە هیندستان وْ حەوا لە جدەو شـەیتان لەدەشتی میسان لای بەسـرە هاتۆتە خوار). بەڵام زانایانی تر وەکو(ابن عباس) و (ابي بن كعب) و (سفيان بن عينيـه) و هـی

---

(١) علم التطور / ل:٢٦.

(٢) البقرة: ٣٥.





تر بڕوایان وایە ئادەم لە زەوی دروست بووە نەك لە بەهەشت و لە ئاسمانەوە دابەزی بێت. نـاکرێ لە بەهەشتی مانەوەدا خواردنێ حەرام بکرێ یان شەیتانی بڕواتە ناوولێ ی بچێتە دەر. بەڵکو بـە دەقی قورئان خوا ئادەمی لە زەوی دا دروست کردووە: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾[1]. واتـە: من خەلیفەیەك لە زەوی دروست دەکەم. ئەنجا ئەم(الجنه)ی ئادەم مەبەست لە باخچەو دارستانە. وەکو خوا فەرمویەتی:﴿ إِنَّا بَلَوْنَاهُمْ كَمَا بَلَوْنَا أَصْحَابَ الْجَنَّةِ إِذْ أَقْسَمُوا لَيَصْرِمُنَّهَا مُصْبِحِينَ﴾ [2]. واتـە: ئێمـە تاقیمـان کردنـەوە وەکـو چـۆن خـاوەن باخـچەکانمان تـاقی کرنـەوە. ئـەنجا وشەی(الهبوط) مەرج نییە هەر لە ئاسمانەوە بێ، ئەوەتا قورئان دەفەرمێ: ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلاَمٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[3]. واتە: کەسێ ووتی: ئەی نـوح بـە ئاشـتی و بەرەکەتـەوە لەلایـەن خۆمانـەوە دابـەزە. ﴿اهْبِطُواْ مِصْراً﴾[4]. واتە: دابەزنە میسر. لە فەرمودەشدا هـاتووە: (ان الله خلق ادم مـن قبـضها قبـضا من جميع الارض) [5]. بەم پێیە خوا ئادەمی لە هەموو خاکێ دروست کرد کە هەموو توخمـەکانی تێیدا بێت، ئەمەش لە زەوی دا ڕوویدا نەك لە ئاسماندا[6]. لێرەدا قورئان ڕەتی کردۆتەوە ژیان لە دەرەوەی زەویدا پەیدا بووبێت. پاشان لە(كتاب المقدس/ التكوين ٨ ) دا **هاتووە: (خودا ئـادەمی لە خاکی زەوی دروست کرد و دەروونی ژیانی بە لوتدا کرد بەبەردا).**

**پاشان ئاماژە دەکات خـوا ئـادەمی لـە باخـچەیەکی زەوی دا دانـا چـوار ڕوویـاری پێـدا بڕوات(١١ — ١٥) : فیشون، جیحون، حیداقل، فورات. دیسان لە سێ تابلۆ دێرینەکانی نوحـدا هاتووە کە ئینگلیز(١٩٢٠) لە کوردستانی دا دۆزیونەوەو لە مۆزەخانەی بـەریتانیا دا دانـراون و (هاید پارك) بڵاوی کردنەوەو، (تەقی عابد) ی شوێنەوارزان لە سێ ژمارەی ڕۆژنامەی(العرب) دا**

(١) البقرة: ٣٠.

(٢) القلم: ١٧.

(٣) هود: ٤٨.

(٤) البقرة: ٦١.

(٥) رواه احمد.

(٦) بڕوانە البداية والنهاية / ج١ / ل: ٧٦ — ٩٦. بەکورت کردنەوە و دەستکاری وەرگیراوە.

(٢٨ – ٢٩ – ٣٠/٥)ی (١٩٩٠) دا بلاوی کردنەوە لەوێ دا باسی کردووە کە ئادەم لە دۆڵی دۆزێ لە(دێ ی سەلام) یان(دار السلام) لای(ڕواندز) دورست بووە و باخچەی ئادەم ئەوێ بووە.

(س . ن . کریمەر) لە کتێبی(هنا بدء التأريخ) دا وەرگێڕ(ناجیە مرانی) ( s.n.kramer. history begins at summer. London/ ١٩٥٩) دا دەنوسێ: ژیان لێرەوە لە دۆڵی دوزێوە سەری هەڵداوە.

وە لە دۆزراوەی سۆمەریەکاندا بەر لە(تەورات) باس لە(فیردەوس) کراوە کە چوار رووباری بەلادا ڕادەبرێ، بە(دەلمون) ناوی دەبات کە هەموو جۆرە میوەیەکی تێدایە لە عێراقدا[1]. **جیۆلۆجی ناوداری بەریتانی دوای تاقیکردنەوەی لەسەر چیاکانی(هەلگورد) و رووباری ڕواندز و ناوچەی جیلوداغ** سەلماندویەتی چەرخی بلاستوسینی ئەو ناوچانەی گرتۆتەوە کە ژیانی سەرەتایی تێدا دورست بووە. (پرۆفیسۆر رایت مامۆستای جیۆلۆجیا لە زانکۆی مەنسوتای ئەمریکی گرنگی یەکی زۆری بە چیاکانی کوردستان داوە پاشماوە و شوێنەوارەکانی پلاستوسینی بە تایبەتی نێوانی بەستەڵەکەکانی گرنگی پێداوە، چونکە لە ناو ئەو دۆزراوانەوەدا لە هەندێ ئەشکەوت و شوێنەواری کۆنی ئەو ناوچانە دوای تاوتوێ کردنی شوێنەواری مرۆڤی و گیانداری بینراوە، لەوانە مرۆڤی نیاندرتاڵ...)[2].

## (٣) تیوری کیمایی ئۆپارین:

ئەم تیورە(ئۆپارین) ساڵی(١٩٢٤) کە زانایەکی روسی یە دایهێنا بڕوای وایە دوای ساردبونەوەی زەوی و گەیشتنی بە(١٠٠) $^{\circ}$ س هەڵمی ئاو چڕ بۆووەو باران باری. ئەو بارانە هەموو پێك هاتە ئەندامی یەکانی کە پێك هاتبوون بۆ زەلکاوەکانی دوایی بۆ ئۆقیانوسەکان گواستەوە. زانای بەریتانی هاوچەرخی(ئۆپارین) بە (الحساء المخفف الحار) ناوی دەبات واتە: (شلەی روتکراوەی گەرم).

---

(١) هنا بدء التأريخ/ س. ن . کریمر/ ل: ٧٦. سەیر بکە.

(٢) العصر الجليدى البلاستوسينى/ ت: فؤاد حمه خورشيد / ل:٩.





بەندی دووەمی تیوری ئۆپارین گریمانی دادەنێ بۆ چەند یەکەیێکی زۆر ئالۆز تر بە ناوی(coacervates) لێرەدا گەردەکان حەز بە ئاو ناکەن(hydrophobic) قۆناغەکی تر وەردەگرن، کەقۆناغی دابرانە لە ئاو، لینجاوە سەرەتایی(الغرويات الاولى – colloids) پێك بێنێت. ئەو ماددە لینجانە لەگەڵ بڕێکی کەمی ئاو یەك دەگرن تا تیرەی قەبارە بچوکتر پێك بێنێت. ئەو وردیلە بچوکانە کە لە ڕاستی دا چەند هێشویەکی ملێن پەردەیەکی تەنکی ئاوی دەوری داون(coacerates) لای ئۆپارین توانای پیا ڕۆیشتنی ئازادی هەبووە.

پاشان ئۆپارین ئاماژە بە بوونی کارلێکردنەکی دورو درێژ و پێك هاتنێکی درێژ خایەنی گەردەکان لەناو خانەی سەرەتایی(پرۆتۆپدازم- protosell) دەکات. ئەم ماوەیە بە(چاخی پەرەسەندنی کیمیایی) ناو دەبات. یان چەرخی دروست بوونی نازیندەگی(حقبه النشوء اللاحيوى – abiogencsis) ئەو چاخە ملیۆنەها ساڵی پێ چووە[1]. بەم پێیە ئەم خانەیە سەرەتای دورست بوونی خانەکانی پێش بەرایی یەکانە(premonera)، ئەم خانانە دوای ملیۆنەها ساڵ پەرەیان سەندووە تاخانە بەرایی یەکان پێك بێنن.

ئەم تیورە لە مەنهەجی خوێندنی قوتابخانەکان و زانکۆیانی ئیمرۆی کوردستاندا تا ئیمرۆ دەخوێنرێ، بە تایبەتی لە پۆلی چواری دواناوەندی دا کە بە پۆلی(١٠) ناسراوە، لە کتێبی زیندەوەرزانی یاندا، بێ ئەوەی ئاماژە بە تیورەکانی تر بکەن کە تازەن یان ڕەخنەیان لەسەر هەیە!

---

(١) نظرية التطور/ ل:٢٨ بەکورت کردنەوە.



**١٨٠ – پاسادان كردنی قورئان بۆ تیورەی كیمیایی**

**١٨١ – چیرۆكی دورست بوون لە قورئاندا.**

**١٨٢ – دورست بوونی ئادەم لە خاك.**

**١٨٣ – دورست بوونی حەوا لە لەشی ئادەم.**

بێگومان گەر سەیری تیوری تۆپارین بكەین و بە ئایەت و فەرموده پاسادانی بكەین و ڕای تیورەكانی تریش وەربگرین وەكو تیوری دورست بوون(نظرية الخلق) كە داهاتوو باسی دەكەین لە هەندێ خاڵدا قسەكانی زانستین و پێكاو پێكی قورئانن، بەڵام لە هەندێ خاڵدا پێچەوانەی تێكستە قورئانیەكانەو، زانستی نوێژ بە درۆی خستۆتەوە.

(١)قورئانی مەزن ئاماژەیە خانەی سەرەتایی دەكات(پرۆتۆپلازم – الجبلـه) كە ئادەم و گیانداران و رووەكی لێ دورست بووە.﴿ وَاتَّقُوا الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالْجِبِلَّةَ الْأَوَّلِينَ﴾[1]. لێرەدا (جبلـه) پرۆتۆپلازمەیان كە ئەو شلەیەیە دیواری خانەی زیندوی پڕ كردووە. لە فەرهەنگی(كەمالنامـه)ی كەمال جەلال غەریبدا هاتووە: (جبله – پرۆتۆپلازم – ماددەی زیندوی سەرەتایی).

(٢) قورئان ئاماژە دەكات یەكەم ژیان یان یەكەم خانەی سەرەتایی لە ئاودا دورست بووە: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾[2].

(كریسون موریسون) دەڵێ: هەموو ژیانێكی بزۆك لە ئاودا دەستی پێ كرد[3]. تۆپارین دەڵێ: ( یەكەم ژیانی زیندو لە ئاودا دورست بووە، لەژێر هەوایەكی دابەزیودا، لە شێوەی بارستایی یەكی مڵ(الغرويه) لەسەر پێك هاتووە ئەندامییەكانی دەوری گەشە دەكات، زۆر نابات خانە كەدوكەرت دەبێت، یان پتر، ئەنجا بۆ بەشی تر دابەش دەبێ، پاشان سیستەمی جینەكان گەشە دەكات، ڕای راست ئەوەیە خانەی سەرەتایی رووەكی بووە، بۆ خۆراك پشتی بە خۆی

---

(١) الشعراء: ١٨٤.

(٢) الانبياء: ٣٠.

(٣) العلم يدعوا للايمان/ كريسۆن موريسون/ ت: الاستاذ محمود صالح الفلكي / ل: ٢٠٠.





بەستووە لە ڕێگای ڕۆشنە پێك هاتنەوە لە چینی تەنکی ڕووبارەکاندا.

زەوی بەر لە(٤,٥) سالٌ پێك هاتووە. ئۆقیانوسەکان بەر لە(٤,٢) سالٌ دوروست بوون. بەکتریاو قەوزەی سەوز بەر لە(٣,٤) بلیۆن سالٌ دەرکەوتوون. ژیانی فرەخانەیی بەر لە(٢,١) بلیۆن سالٌ سەری هەلٌداوە.

**یەکەم تاوێری زەوی بەر لە(٣,٥) بلیۆن سالٌ دەکەوتووە. بەرگە هەوای زەوی کەلە گازەکانی ناخی زەوی بە هۆی بورکانەکانەوە دوروست بووە. ئۆقیانوسەکان بەر لە(٤,٢) بلیۆن سالٌ دوروست بوون. ژیانی سەرەتایی بەر لە(٤)بلیۆن سالٌ دەرکەوتووە، یەکەم جار سەوزایی گەشەی کردووە برێکی زۆر ئۆکسجینی بەرهەلا کردووە هەتا لە بەرگی هەوایی دا ئارام بگرێت. بەرگە هەوای ئیمرۆ بەر لە(١) بلیۆن سالٌ تەواو بووە[1]. وە قورئان ئاماژەی کردووە سەرەتا ڕووەك دوروست بوون:﴿ وَالْأَرْضَ بَعْدَ ذَلِكَ دَحَاهَا أَخْرَجَ مِنْهَا مَاءهَا وَمَرْعَاهَا وَالْجِبَالَ أَرْسَاهَا مَتَاعًا لَكُمْ وَلِأَنْعَامِكُمْ﴾[2].**

**واتە: پاشان زەوی لە شێوەی هێلکەیی دا دارشت. لە زەوی ئاوو لەوەڕو گیای دەرهێنا، چیاکان چەقاند. بۆ سوودی ئێوە و ئاژەڵەکانتان.**

**واتە: دوای ئەوەی زەوی شێوەی ڕێکی وەرگرت و بویە هێلکەیی و سارد بۆوە، خودا ئاوی لە زەوی دەرهێنا، ئەنجا بەرگە هەوا، دوایی دارو درەختی دوروست کردن بۆ زۆر کردنی ڕێژەی ئۆکسجین و خۆراك بۆ گیانداران، واتە: ئەنجا گیانداران دروست بوون، دواجار ئادەمیزاد.**

**(٣) خوداوەند فەرمویەتی:﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾[3]. واتە: لە هەموو زیندەوەرێ نێرو مێ یەکمان دوروست کرد. لێرەدا قورئان دەری دەخات خوداوەند سەرەتا بۆ هەموو زیندەوەرێ نێرو مێ یەك دوروست دەکات لە خاکی زەوی، ئەنجا کرداری زۆر بوون دەست پێ دەکات بە توخمە زۆر بوون و ناتوخمە زۆر بوون، بە بێ پەرەسەندن کە داروین و ئۆپارین بۆی**

---

(١) علم الفلك، د.فیاض النجم، ل:٤٢٣. بەکورت کردنەوە.

(٢) النازعات: ٣٠-٣٣.

(٣) الذاریات: ٤٩.




چوون، وەکو دوایی باسی دەکەین.

(٤) قورئان ئاماژە دەکات خانەی سەرەتایی ئادەم لە(ئاو + لیتەو گڵ) دورست بووە بە چەند قۆناغێکدا﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾[١].

واتە: ئێوەی بە چەند قۆناغ دورست کردووە. بەڵام ئەم قۆناغانە چەندیان نێوان بووە دیار نییە! ﴿وَهُوَ الَّذِي خَلَقَ مِنَ الْمَاء بَشَرًا فَجَعَلَهُ نَسَبًا وَصِهْرًا وَكَانَ رَبُّكَ قَدِيرًا﴾[٢]. واتە: خوا ئەو خوایەیە مرۆڤی لە ئاو دورست کردووە، ئەنجا کردوویەتی بە پیاوو بە ژن. پەروەردگارت بە توانایە. (خاك): ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن تُرَابٍ﴾[٣]. واتە: ئەی خەڵکینە گەر گومانتان لە زیندووبونەوە هەیە ئێمە لە خاکمان دورست کردوون.

(کارامازۆف) دەڵێ: (ئایا راستە دین پێمان دەڵێ گەر مردین زیندو دەبینەوە سەر لە نوێ پێك شاد دەبینەوە، بەڵێ سەر لە نوێ پێك دەگەینەوە، هەمووومان بەوپەری کامەرانی رووداوەکانی رابردوومان بۆ یەکتری دەگێرینەوە[٤].

ئەنجا قورئان بەر لە ئۆپارین ئاماژە بە(ئاو+ گڵ) = قورو لیتە دەکات، کە یەکێکە لەقۆناغەکانی دورست بوون. ﴿إِنَّا خَلَقْنَاهُم مِّن طِينٍ لَّازِبٍ﴾[٥]. واتە: ئێمە لە قورێکی یەك گرتوو دورستمان کردوون. بەڵام نەك هەموو قورو لیتەیەك بەڵکو پوختەیەکی هەڵبژاردە﴿مِن سُلَالَةٍ مِّن طِينٍ﴾[٦]. پاشان قورەکە ووشك دەبێ تا رەش دادەگەرێت: ﴿مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ﴾[٧]. دوایی قورەکە زیاتر ووشك دەبێت وەکو گڵی گۆزەی لێ دێت: ﴿خَلَقَ الْإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ

---

(١) نوح: ١٤.

(٢) الفرقان: ٥٤.

(٣) الحج: ٥.

(٤) موجز تأريخ الكون/هاني رزق/ ل:٢٢٣.

(٥) الصافات:١١.

(٦) المؤمنون: ١٢.

(٧) الحجر: ٢٦.



كَالْفَخَّارِ﴾[1]. ئەنجا قۆناغی ڕێك خستنی ئادەم دێ یان خانەکە، دوایی گیانی، یان ژیانی دەکرێ بەبەردا: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾[2].

(٥) هەرگیز(خانە)ی زیندوو لە خۆوە بەرێکەوت دوروست نابێ وەکو ئۆیارین و زانایانی پەرەسەندن بۆی چوون، ئەمە پێچەوانەی دین و زانستە و، لۆژیکیش پەسەندی ناکات: بەڵکو خوا خانەی سەرەتایی ڕێك خستووە(الجبلە) و گیانی کردووە بە بەرداو ئادەمی لێ دوروست کردووە، دوور نییە ئەم دوروست کردنەی ئادەم بە قۆناغ بوبێ وەکو دوروست بوونی کۆرپەڵە لە منداڵدانی دایکیدا!

سەیرکە(فرانك ئالن) سورشت ناسی بایۆلۆجی لە ئەمریکادا لە ڕاست دوروست بوونی خانەو پێك هاتەکانی لە توخمەکانی زەوی بەدەستی کردگارو ئەگەری دوروست نەبوونی یەك خانەی زیندوو بە ڕێکەوت دەنوسێت: (با ئێستا سەیری ئەوە بکەین کە ڕێکەوت دەتوانێ لە دوروست بوونی ژیاندا دەوری تێدا بگێرێت. **پرۆتینەکان کە پێك هاتەی سەرەکین** لەهەموو خانە زیندووەکاندا لە پێنج توخم پێك دێن: **کاربۆن، هایدرۆجین، نایترۆجین، ئۆکسجین و کبریت.** ژمارەی گەردیلەکان(الذرات) لە یەك گەردی پرۆتینی دا**(الجزیئات) لە(٤٠٠٠) گەردیلە پێك** دێت. گەر ئەو توخمە کیمیاوییانەی لە سروشتدا کە(٩٩)[3] **دانەیە هەموویان بەبێ سەرویەری** وهەڕەمەکی دابەش بوبن، ئەگەری کۆبوونەوەی **ئەو پێنج توخمانە تا یەك گەردی پرۆتینی پێك** بێنێ دەتوانرێ بژمێردرێن. تابری ئەو ماددەیەی پێ بزانرێ **کە پێویستە** بەردەوام تێکەڵ بکرێ تا ئەو گەردە پێك بێنێت، پاشان تا ئەو ماوە زەمەنییەی پێ بزانرێ تا ئەو کۆبونەوەی نێوان گەردیلەکانی یەك گەردی تێدا رووبدات. زانای ماتماتیکی سویسری (چارلس یوجین جای) بە ژماردنی هەموو ئەو هۆکارانە هەڵسا، بینی قەت دەرفەت نایێتە پێش لە ڕێگای ڕێکەوتەوە یەك گەردی پرۆتینی پێك بێ بە ڕێژەی(١) بۆ (١٠)١٦٠ نەبێت، واتە(١) بۆ (١٠) کە(١٦٠)

---

(١) الرحمن: ١٤.

(٢) الحجر: ٢٩.

(٣) ژمارەی توخمە کیمیاوییەکان ئێستا(١٠٣) دانەیە لە زەوی.




جار کەرەتی خۆی بکرێت. ئەمەش ژمارەیێکە بە ووشە گوزارشی لێ ناکرێت.

پێویستە بری ئەو ماددەیەی پێویست دەبێ بۆ ڕوودانی ئەو کارلێکردنە بە ڕێکەوت تا یەك گەردی پرۆتینی بەرهەم بێنێ ملیۆنەها ئەوەندەی ئەو گەردوونە فراوان بێت. پێك هاتنی یەك گەردی ئاوا بە ڕێکەوت لە سەر زەوی بلیۆنەها بێ شومار سالّی دەوێت، بەگوێرەی ئەم زانایە سویسرییە ژمارەی: (١٠) بوو کە(٢٤٣) جار جارانی خۆی بکرێ لە سالّ(١٠)٢٤٣ سالّ. پرۆتینەکان لە زنجیرەی درێژی(ترشی ئەمینی) پێك دێن. چۆن گەردیلەی ئەو گەردانە پێك دێن؟ گەر بەم ڕێگایە ئاسایی و سروشتی یەی خۆیان پێك بێن بەکەلکی ژیان نایەن، بەلکو هەندێ جار دەبن بە ژەهر. زانای ئینگلیزی(ج . ب . لیثز – j.b.leathes). ئەو ڕێگایەی ژمارد کە لەوانەیە گەردیلەکانی یەك گەردی سادەی پرۆتینی لێوە دوروست ببێ، بینی ژمارەکەی دەگاتە بلیۆنەها(١٠)٤٨. بەو پێ و دانگە ئەگەر نییە ئەو هەموو ڕێکەوتانە بێتە پێش تایەك گەردی پرۆتینی پێك بێنن. بەلاّم پرۆتینەکان خۆشیان کەرستەی کیمیایی نازیندەن، تا ئەو نهێنی یە سەیرە(کەروحە) و هیچی لە ڕازەکەی نازانین نەڕواتە ناوییەوە. هێزی بێ سنوور کە خوای تاقانەیە بە کارزانی ڕەهای توانیویەتی پەی بەوە ببات کە نمونەی ئەو گەردە پرۆتینی یە دەتوانێ ببێ بە ئارامگای ژیان بۆیەپێکی هێناو کلێشەی بۆ کێشاو نهێنی ژیانی پێ بەخشی[1]. بەو پێیە بە هۆی گیان پرۆتینەکان زیندو دەبن: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ !

(٦) دوای ئەوەی خوای گەورە ئادەمی لە خانەی سەرەتایی(الجبلە) دروست کرد و گیانی کرد بە بەردا پاشان خانەکە دابەش بوو بۆ خانەی تر تا لەشی ئادەم تەواو بوو، خوداوەند(حەوا)ی خێزانی لە لەشی ئەو جیاکردەوە﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا﴾ بەلاّم چۆن؟ بێگومان ئەم جۆرە دوروست بوونە لە زاراوەی نوێ دا پێ ی دەوترێ(ناتوخمە زۆر بوون – التكاثر اللاجنسي): ئەم زۆربوونە بە چەند ڕێگایەك لە زیندەوەراندا ڕوودەدات، لێردا کەرت بوون(الانشطار) هەیە، کە لە گیاندارانی سەرەتایی و بەکتریادا ڕوودەدات، لێردا خانەکە دەبێ بە دووبەش و دوای ئەوە سەربەخۆ دەبن و دەبن بە دووزیندەوەر.

(١) الله يتجلى في عصر العلم/ ل:٩ – ١٠.





یان دوورنییە خانەی سەرەتایی دورست بوونی ئادەم کەرت بوبێ، بوبێ بە دووبەش، بەشێ بو بە نێرینەو بەشەکەی تر بە مێ بینە، ئەم ڕێسایە لە دورست بوونی جمکی چۆن یەکدا دەبینرێ لە منداڵداندا: ( هەندێ جار هێلکۆکەی پیتراو کەرت دەبێ، ئەبێ بە دووخانە و لێك جیادەبنەوە و سەربەخۆ گەشە دەکەن و دەبن بە جمك، یان دوو منداڵی چون یەك[1].

بەم شێوەیە خوداوەند بە شێوەی ناتوخمە زۆر بوون(حەوا) لە ئادەم دورست دەکات، ئەم بارودۆخەش لە ڕێسای دورست بوونی جمکەکان و هەندێ زیندەوەردا دەبینرێ: وەکو بەکتریا و هەندێ کرم.

(٧) ئەنجا خوداوەند بە ڕێگای توخمی زۆر بوونی وەچەی ئادەمیزادی زۆر کردو بڵاوی کردەوە لە زەوی دا﴿وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيرًا وَنِسَاءً﴾[2]. واتە: لە ڕێگای زاووزێ کردنەوە.

(٨) دوورنییە خوداوەند خانەی گیاندارانی تریشی بەم ڕێسایەی دورست بوونی ئادەم و حەوا دورست کردبێ وەکو فەرمویەتی:﴿ وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ الذاريات:٤٩. واتە: لە هەموو زیندەوەرێك نێرو مێ یەکمان دورست کرد.﴿ وَمَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الأرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَآبَّةٍ﴾[3]. واتە: وە ئەوەی باراندویەتی لە ئاسمانەوە لە ئاو ، زەوی پێ زیندوو کردۆتەوە لە دوای مردنی دا، ئەنجا تێ ی دا بڵاو کردۆتەوە هەموو زیندەوەرێك.

ئەم ئایەتە ئەوەی لێ وەردەگیرێ وەکو تۆێژارین دەڵێ: زەوی سارد بۆوە پلەی گەرمی بوبە(١٠٠) هەڵمی ئاو چڕ بۆوە و باران باری. ئەم بارانە هەموو پێك هاتووە ئەندای یەکانی بۆ ناو گۆم و زەڵکاوەکان گواستەوە ئەنجا بۆ ئۆقیانوسەکان، وەکو باسمان کرد. بەم پێیە زەوی ساردەبێتەوە، ئەنجا باران دەبارێ، ئەنجا ڕووەکەکان دورست دەبن، ئەنجا زیندەوەران. وە خوای گەورە سەرەتا لە هەموو زیندەوەران نێرو مێ یەك یان خانەکانی نیرو مێ یەك دورست دەکات،

---

(١) بروانە (علم التطور / ل: ٣٣ / بابەت : التكاثر الجنسي و اللاجنسي) و( دليل المراة الطبي/ د: ديڤيد رورفيك/ ٨٥.

(٢) النساء: ١.

(٣) البقرة: ١٦٤.




**پاشان** لەکرداری زۆر بوونەوە بە زەوی دا زۆر دەبن و بڵاودەبنەوە. سەرەتا خوا نێرینەی گیانداران یان خانەی سەرەتایی یان دورست دەکات ئەنجا بە ناتوخمە زۆربوون می یەی لیّ جیا دەبێتەوە، ئەنجا بە توخمە زۆربوون، یان ناتوخمە زۆربوون زۆر دەبن.

﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[1].

واتە: خودا هەموو گیاندارانی لە ئاو دورست کرد، هەیە لەسەر سک دەڕوات(خشۆکە) هەیە لەسەر دوپیّ دەڕوات، هەیە لەسەر چوار پیّ دەڕوات، ئەوەی خوا بیەویّ دورستی دەکات، خودا بەسەر هەموو شتیّ دا بەتوانایە. لێرەدا قورئان بەر لە ئۆپارین ئاماژە دەکات گیانداران سەرەتا لە ئاو دا لە ئاو دورست بوون، ئەنجا زانستی یانە گیاندارانی پۆلین کردووە بۆ چەند بەشێك بەشی کردوون. ئاماژە دەکات ئەم زیندەوەرانە بە پەرەسەندن دروست نەبوون، بەڵکو هەریەکە خانەی تایبەتی خۆیان بۆ دورست بووە و لێوەی دورست بوون و بڵاو بوونەوە.

(٩) ﴿وَمِن كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ﴾ بیرۆکەی پەرەسەندن لە ڕاستی دووردەخاتەوە کە(داروین) بۆ یەکەم جار دایهێنا، بەڵکو هەموو زیندەوەران دورست بوونی تایبەتی خۆیان هەبووە. لەسەر زەوی دا(٣٤٠) هەزار جۆر ڕووەك و ملیۆنێك جۆر گیاندار هەیە، کە زانایان تا ئیمڕۆ دۆزیونیانەوە. وە ژمارەیکی زۆریش چاوەڕیّ ی دۆزینەوەن. بەپێی پۆلینی ئێستا گیانداران دەکرێن بە(٥) پۆلێنەوە:

**(١) جیهانی بەرایی** یەکان وەکو بەکتریا.(٢) جیهانی پێشەنگی یەکان ئەو زیندەوەرانەن **تاك خانەن** ناوکێکی ڕاستیان هەیە وەکو هەندیّ قەوزە. (٣) جیهانی ڕووەك، ڕووەك فرەخانەکانن. (٤) جیهانی کەروەکان. (٥) جیهانی گیانداران، کە گیاندارە فرەخانەکانن. (لیث عبدالجلیل) دەڵیّ: (پەرەسەندن — التطور) لای داروین: بریتیی یە لە لێژبوونەوە بە گۆڕانەوە. لەبەر ئەوەی جۆرە نزیکەکان لە یەکتری، کە پەیوەندییان بە یەکترەوە هەیە تا ڕادەیەکی گەورە پێك دەچن، هۆیەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هاوکاری بۆ ماوەیی هاوبەش لە نێوانیاندا، هەندیّ

(١) النور: ٤٥.




جۆریش لیکتری جیاوازن، ئەوەش بۆ جیاوازی بۆماوەیی دەگەڕێتەوە لەو کاتەوە باپیرەی هەر یەك لەو جۆرانە لێك دابڕاون. یان دەتوانرێ پەرەسەندن لای (داروین-darwin ١٨٠٩ – ١٨٨٢) ناوا پێناسە بکرێ: (چەند جۆرێکی تازەن لە زیندەوەرانی بەر لە خۆیان دورست دەبن).

(لیث عبدالجلیل جواد) دەڵێ: (لێکۆڵەرانی پەرەسەندن نالێن مرۆڤ لە **هیچ** جۆرە زیندەوەرێکی ئێستا لێژبۆتەوە، بەڵام لێردا ڕاستیەکە ئەوەیە مرۆڤ و مەیمونی باڵا **لەیەك باپیرەوە** هاتوون، کە تا ئێستا نەزانراوە) [1].

## ١٨٤ – بەراوردێ لەمیان تیوری پەرەسەندن و تیوری دورست بووندا:

بیگومان چۆن تیوەرکان تری بێ بروایی هەرەسیان هێنا وەکو تیوری ماتریالستی **دیالتیك** و تیوری فرۆید و تیورەکانی تر کە دژایەتییان لەگەڵ دین و لۆژیك و فەلسەفەو زانست **دا هەموو** هەرەسیان هێنا، تیوری پەرەسەندن و تیورەکانی بەر لەخۆشی وەکو تیوری لەخۆوە **پەیدا بوون و** تیوری گەردوونی و تیوری کیمیایی کە چیرۆکی دورست بونیان لە **ڕێگەی ڕێکەوتەوە روون** دەکردەوە بەردو هەرەس هێنان چوون، هیچ بابەتێکی نەمایەوە زانستەکانی **ئەزموونی نەیخەنە** بەر نەشتەری ڕەخنەوە و بەدرۆی نەخەنەوە، چونکە خوای گەورە **بەڵێنی داوە هەمیشە ڕاستی** یەکان سەردەکەون و ناڕاستیەکان هەرەس دێنن: ﴿وَقُلْ جَاء الْحَقُّ وَزَهَقَ الْبَاطِلُ إِنَّ الْبَاطِلَ كَانَ زَهُوقًا﴾[2].

لەبەرامبەر تیوری پەرەسەندندا ئێستا لە ئەمریکا **دا تیورێکی** تازەی زانستی سەری هەڵداوە، بە ناوی تیوری دورست بوون، کە(٤٠٠) زانا لە هەموو بەشەکانی زانستی دا بەشدارییان کردووە لە دورست کردنی دا، (د: دوان . ت کیش) لە زانکۆی کالیفۆرنیا پسپۆری کیمیایی زیندەگی و یاریدەدەری سەرۆکی پەیمانگای توێژینەوەکانی دورست بوون ئەندامێکی کارای ئەو پەیمانگایەیە، لە ڕاست ئەمە چەند کتێبێکی گرنگی نوسیوە، یەکێ لەوانە ئەم

---

(١) علم التطور/ ل:١١.

(٢) الاسراء: ٨١.

کتێبەیە کە ئێمە سوودمان لێ بینیوە: (have you been brain washed?) کە(اورخان محمد علی) بە ناوی(هل تعرضت لغسیل الدماغ) بۆ سەر زمانی عەرەبی وەری گێراوە.

ئەم زانایە لەم وتارەی دا بەراوردێکی وردی زانستی کردووە لەمیان تیوری پەرەسەندن و تیوری دورست بووندا، لە زۆری لە زانکۆکانی ئەمریکی لە بەرامبەر ئەم تیورە دا دەخوێنرێت، ئەمەش بەشێکە لەم بەراوردییە:

(زانایانی پەرەسەندن پێیان وایە ژیان وردە وردە لە یەك خانەوە پەرەی سەندووە، ئەم خانە زیندووەش لە ماوەیەکی نازیندەوە گەشەی کردووە. کەچی زانایانی بیرۆکەی دورست بوون — خلق — بروایان وایە هەموو شێوەکانی ژیان لە رێگای فەرمانی کردگار دورست بوون.

ئەو سەلماندنەی بای پەرەسەندن بۆ پشت گیری کردن لە پروپاگەندەکانی پێویسی پێ یەتی ئەوەیە: بەردینەکانمان(المتحجرات) پێشان بدات کە پەیتا پەیتا گەشەیان کردووە لە شێوەکانی ژیان دا، لە شێوەکانی سەرەتایی گیانداریەوە بۆ شێوەی ئاڵۆزو پەرەسەندو، بەشێوەیەکی یەك لە دوای یەکتری دا.

ئەم سەلماندنە لە دۆخی بوونی شێوەی زۆری دیمەنەکانی گواستنەوە(الانتقال)دا دێتە دی لە تۆمارگەی بەردینەکاندا.

بەڵام ئەو سەلماندنەی پشتگیری لە بیرۆکەی دورست بوون دەکات بوونی بەردینەکانە، کە ئەوە دەربخەن شێوە ئاڵۆزو پەرەسەندوەکانی ژیان لە هیکرا دەرکەوتوون بێ ئەوەی لێرەدا زنجیرەبەندی و پەرەسەندووە ئاڵۆزەکان لەئارادابن.

با ئێستا چاوێ بگێرین بەو بەڵگانەی تۆمارگەی بەردینەکان لە واقیعی کرداری پێشکەشیان دەکات.

## چەرخی دیڤۆنی/ چەرخی سیلۆری/ چەرخی ئەردوڤیشی:

کۆنترین بەردینەکان لە چینەبەردینەکان لەچاخی کەمبەری دا بینراوە. چەرخی بەر لە کەمبەری بەردینی تێدا نییە، ماوەی رەق بوونی زەمینە. بەردینەکان کە لێرەدا بەرچاوت

دەکەون بلیۆنەها دەبن هەموویان شێوە ژیانی پەرەسەندوو ئالۆزیان هەیە. هیچ بەلگەیەك نییە لەسەرپەرەسەندنی پەیتا پەیتایی ئەو شێوە ئالۆزانەی ژیان لە شێوەی سادەو سەرەتایی یەوە، بەپێ ی گومانی بابایانی پەرەسەندن ئەم ئاژەلانە پێویستی یان(١٥٠٠) ملیۆن ساڵ پەرەسەندن بووە تا بگەنە ئەم پلەیە.

ئەمە چاخێکە تەمەنی(١٥٠٠) ملیۆن ساڵە هیچ بەردینەکی تێدا نابینین. گیاندارانی فرەخانەن. بلیۆنەها گیانداری بالا هەیە وەکو بێ بڕبڕەکانی دەریایی و مەرجان و کرمەکان و لالەی دەریا(القناديل البحريه).... هتد هەموو ئەوا لەنکاو دەرکەوتوون، بەبێ هەبوونی هیچ نیشانەیەکی پەرەسەندنی وردە وردەیی لە شێوەی سەرەتاو ساکارە وە بۆ شێوەی ئالۆز.

هەتا ئێستا هیچ بەردینێك لە جیهاندا نەدۆزرانەوە فرەخانەبێ و بۆ چاخی بەر لە بەردین بگەڕێتەوە.

لە تۆمارگای تەواوی بەردینەکاندا نادیارییەکی بەرجەستەی گەورە هەیە لە هەموو شوێنەکانی شێوەکانی گواستنەوەدا، گوایە وەکو تیوری پەرەسەندن گریمانی کردووە هەیە. لێرەدا سەدان هەزار ئالقەی شاراوە هەیە لەمیان بڕبڕەدارەکان و بێ بڕبڕەکاندا. بڕوایان وایە(sguint) باپیرەی بڕبڕەدارەکانە وە بەپێ ی گریمانی زانایانی پەرەسەندن ماسی پێویستی بە(١٠٠) **ملیۆن** ساڵ هەیە تا لە بێ بڕبڕەکانەوە پەرەدەستێنێ، کەچی لێرەدا بە **هیچ شێوەیێك بەلگەیێك نییە،** هیچ بەردینێك نییە ئەوەمان پیشان بدات ئەوە **بەبێ گومان هەلگرتن رویداوە. زانایانی** پەردسەندن دەڵێن: ماسیەکان پێویستی یان بە(٥٠) **ملیۆن ساڵ بووە تا پەرەیان سەندووە بۆ** وشکاوییەکان(البرمائيات).

کەچی هیچ شێوەیێکی گواستنەوەی ماسییەکان نابینین بۆ وشکاوییەکان. بۆ نمونە(هیچ بەردینێك نابینین هەندێ پەرە(الزعانف)ی هەبێ لەگەڵ هەندێ پێدا. هەموو بەشەکان و پۆلە بالاکانی زیندەوەران وەکو بێ بڕبڕەکانی پەرەسەندوو ماسی یەکان و وشکاوییە باڵندەکان و خشۆکەکان و باڵندەکان و شەمشەمەکوێرەکان و شیردەرەکان و مرۆڤ هەموو ئەوپۆل و جۆرانەکت و پڕ دەرکەوتوون).

(چارلس داروین خۆی دانی بەمەداناوە: (بەپێ ی تیوری پەرەسەندن دەبێ ژمارەیەکی زۆر شێوەی گواستنەوە هەبێت، لە چینەکانی زەوی دا نایان بینین، پێویستە ژمارەیئالقەکانی ناوەراست لە نێوان زیندەوەرانی ئێستاو زیندەوەرانی قرِ تێ کەوتوودا ئەوەندەزۆر بێ بڕوا نەکرێت).

گەر پەرەسەندن ڕاستە، بۆچی زیندەوەرانێك نابینین لە ڕێگای پەرەسەندنەوە پێ هەڵچووبن؟ ئەی نەدەبوایە جۆری نوێ و ئەندامی تازەو پێك هاتەی هاوچەرخ لە بونیەی زیندەوەرانی ئێستادا دەرکەوتبانە؟

گەر کرداری پەرەسەندن ڕابردوو رووی دابایە دەبوایە تا ئیمرۆ دەوامی کردبایە. گومان وا براوە شوێنەوارەکانی باڵندەی(ئەرکیو بتریکس) ئالقەی مام ناوەند بێ لە نێوان باڵندەکانو خشۆکەکاندا، بەڵام لێرەدا جیاوازی هەیە لەمیان ئەم باڵندەیەو خشۆکەکاندا. لێرەدا جیاوازی گەورە هەیە بەڵکو جیهانێك جیاوازی هەیە لە میان ئەم باڵندەیە و خشۆکەکاندا. ئەم باڵندەیە باڵ و پەرەمووچی هەبووەو، توانای هەبووە بفرێت. بۆ زانین گەر چرِنوکی هەبووە لەسەر باڵەکانی دا ئەوە ناکاتە بەڵگە باب و باپیرانیشی خشۆك بوون، لێرەدا ئێستا کە دوو جۆر باڵندە هەیە چرِنوکیان هەیە. بەردین زانەکان ئێستا دان بەوەدا دێنن کە باڵندەی(ئەرکیو بتریکس) تەنیا باڵندەیەکی ڕاستەقینە بووە.

بەڵام ئەم زنجیربەندییەی ئەسپ ئەندیشەیێکە نەك بەڵگەیەکی بەردینی بێت. (داروین) هاتووە(زەرافەی) بەبەڵگە وەرگرتووە لەسەر هەڵبژاردنی سروشتی دا، وای داناوە لە ئەنجامی نەبونی گژوگیای گشت لاگرەوەدا نەیتوانیوە گەڵای درەختەکان بەدەست بێنێ لە لوتکەی درەختەکانە وەنەبێ، بۆیە زەرافە مل بچووکەکان مردوون و لەناوچوون و زەرافەی مل درێژ ماونەوە. کەچی لە هیچ شوێنەکی دنیادا زەرافەی مل کورت نەدۆزرانەوە، ئەی چییان بەسەر هاتووە؟ (داروین) نەیتوانیوە پەی ببات کە خاسیەتەکانی جەستەیی وەچەکان بەرنامەکەی بەپێ ی گەردەکانی(D.N.A) دەروات کە بۆماوە لە باوانەوە دەگوازنەوە، نەك لە ڕێگا مل درێژ کردن و جوڵاندن و ڕاهێنانی هیچ ئەندامێکی لەشدا.



لەساڵی(١٩٦٦) گۆڤاری زانست(science) /٩/ کانونی یەکەم لەبەرگی کتێبەکەیدا دیمەنی شەمشەمەکوێرەیەکی بەردینی خستە روو، کە گوایە مێژووەکەی بۆ(٥٠) ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوەو، باسی کرد کە کۆنترین شەمشەمەکوێرەی بەردینی یە، کەچی وەکو شەمشەکوێرەی ئێستا بوو، ئەی بۆچی دوای(٥٠) ملیۆن ساڵ گۆڕان و پەرەسەندن نەبینراوە؟

ئێستا بە چاکی دەزانم چاوێ بەو بەڵگانەدا بخشێنین، کەزانایانی بەردین پێشکەشیان کردووە بەمەبەستی هەوڵدان بۆ بنیاتنانەوەی تیوری پەرەسەندنی ئادەمیزاد. هەندێ پێیان وایە ئەم ناوەیەی پێ ی دەڵێن: (ramapitnecus) ئەوە(مرۆڤ — مەیمون) بووە. ئەم بڕیارەش بەپشت بەستن بە دۆزینەوەی چەند پارچە ددان و چەند پارچەی شوێلاگێیك دراو هیچی تر، ئەمە هەمو بەڵگەی ئەوانە لە بەردینە ئێسقانەکاندا.

(د: جولی Dr.jolley) لە ڕاپۆرتێکی خۆی دا نوسیویەتی: جۆرەها مەیمون کە لە ئەسیوبیای حەبەشەدا دەژین هەمان سیفەتی ئەو ددان و شوێلگەیان هەیە. کەواتە: ئەو خاسیەتانە خاسیەتی مرۆڤ نین، زانایانی تری بەردینیش یەك ڕان کە(**Ramapithecus**) تەنیا مەیمونێك بووە.

لەبیستەکانی ئەم چاخەدا لە چیندا پارچە کەللە سەرێ و چەند **شوێلاگ و ددانێ لە** قەدپاڵەکانی جێری نزیك(پەکین) دۆزرانەوە، بەهەر **حاڵ لە جەنگی جیهانی دووەمدا** ئەم تەلەزمانە وون بوون. هەمور ئەو گیاندارانە جەنگاون و خواردنیان **خواردووە کەللەیان وەکو** یادگاری هەڵگیراوە. هەندێ ئەنتۆپۆجینە بەرزەکان بروایان وایە ڕاوچی **تەنیا** دەبێ پیاوێ بێ و مرۆڤێکی ڕاستەقینە بێ، لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤی پەکین تەنیا **مەیمونێکی** قەبە بێت.

لە ڕاست مرۆڤی(جاوا) دا لەکاتی دۆزینەوەی ئێسقی ڕانێك و سێ ددان کران بە بەڵگە لەسەر هەبوونی ئەم جۆرە مرۆڤە، ئەم ئێسقانە لە ماوەی(٥٠) پێ دا لە ماوەی ساڵێکی ڕەبەقدا دۆزرایەوە. (د:دیبوا Dr.Dobois) سی ساڵ ڕاستی یەکەی شاردەوە، لە نزیك ئەو ئێسقانە لە هەمان ئاستدا لە چینی زەمینی دا کەللە سەری ئادەمیزادی ئاسایی دۆزیونەوە.

کە بەمرۆڤی ئاسایی لە کاتی ژیانی گیانداری جاوادا ژیاوە، دوورنییە کە ڕانەکە بۆ مرۆڤ




بگەڕێتەوە، کەللە سەرەکە بۆ مــەیمونێکی گــەورە(APE) بگەڕێتــەوە بــەر لــە مردنــی دا دوای ئەوەی دیبوا گومانی ڕابردووی نەماو مەســەلەکانی وەکــو پیــاز ســپی کــرد ڕای خــۆی گــۆڕی و بریاری دا دوور نیە مرۆڤی(جاوا) مەیمونێکی گابۆن(Gibbon) بێ، نەك مرۆڤێکی شێوەی مرۆڤ بێ بە هیچ شێوەیێك.

مرۆڤــی(نیانــدرتاڵ) پەیکــەرێکی زلی وەکــو مرۆڤــی ئێــستای هــەبووە، کەللەســەری لــە کەللەسەری مرۆڤی هاوچەرخ فراوانتر بووە. وتراوە ئەوانە بەر لە(١٠٠) هەزار ســاڵ هــەبوون و تــا بەر لە(٢٥) هەزار ساڵ ژیاون. بــەڵام هــەموو(ئەنترۆپۆلۆجیــەکان) ئێــستا بڕوایــان وایــە ئەوانــە مرۆڤێکی ئاسایی وەکو من و تۆ بوون.

چەند پەیکەرێکی تەواوی مرۆڤــی(کرۆمــانیۆن) دۆزرایــەوە، بینــرا قــەبارەی مێــشکی لــە قەبارەی مێشکی مرۆڤی هاوچەرخ گەورەتر بووە، ئێــستا زیندوبایــە و بــە شــەقامدا ڕۆیــشتبایە سەرەنجی کەسی ڕانەدەکێشا.

پاشان لێرەدا چەند شتێکی تر هەیە زانایانی پەرەسەندن پێ ی دەڵێن: دوو ئالقەی شاراوەی سەیر کە مرۆڤی(نبراسکا) و (پلتداون) ە لەو دادگا ناودارە دا کە لە(دایتــون — تینــسی) بەســترا لە ڕاست مەسەلەی پەرەسەندندا مرۆڤی نبراسکا لە لایەن گەورەترین زانای پەرەسەندن خرایە ڕوو وەکو بەڵگەیێك لە سەر تیوری پەرەسەندن، بەڵام کاتێ بەڵگــەکانی کــەم بــوون کەوتنــە گەمــەو پێکەنین بە(ولیەم جینز). تاکە بەڵگەکە ددانێ بوو، وای دادەنــا بــۆ مرۆڤێکــی بــەر لــە مێــژوو دەگەڕێتەوە، بڕوایان وایە بەر لە ملیۆنێ ساڵ ژیاوە.

بە هەر حاڵ دوای چەند ساڵێ و دۆزینەوەی بەردینی تر دەرکــەوت مرۆڤــی نبراســکا تــەنێ بەرازێ بووە، بڕوام وایــە ئــەوە یــەکجارە لــە ســایەی بابایــانی پەرەســەندن بــەراز بگــۆڕێ بــە مەیمونێك.

لە ساڵ(١٩١٢ ز) دا(چارلس داوسن) مرۆڤی(پلتداونی) دا خستەڕوو. کە تەنیا بریتی بــوو لە پارچە شوێلەگێك و دوو ددان و پارچە کەللەسەرێ، ئەم پارچە ئێــسقەی لەبــەردەم پــسپۆڕان و زانایاندا کردە بەڵگەیێك لە سەر ئەو گیاندارەی لە نێوان مــرۆڤ و مەیمونــدا بــووە، بــەر لــە نیــو

ملیۆن ساڵ ژیاوە.

بەڵام ساڵی(١٩٥٣) ئەو گاڵتە جارییە دەمامکی لەسەر لابراو دەرکەوت ئەم کەللەسەرە بۆ مەیمونێکی هاوچەرخ دەگەڕێتەوە، دوو ددانەکانیش بە ئەنقەست چێنراون و ئەم کەللەسەرەش بە دەستکردی بۆیاغ کراوە تا جەماوەر فریو بدات.

وە دکتۆر دەڵێ: ( با سەرەتای دورست بوونی ژیان باس بکەین لە لایەن ئەواندوە: نەبوون و بۆشایی لە ڕێگای ڕێکەوتەوە گۆڕا بۆ ماددەو جەوهەرێ! پاشان ئەو ماددەیە گۆڕا بۆ ماددەیەکی ئەندامی ئەوپەری ئاڵۆز، بەبێ بوونی خوایەکی ڕێک خەریان دورست کەر: داروینیەکان وای دادەنێن، ژیان یان خانەی سەرەتایی بە ڕێکەوت دورست بووە بۆ نمونە: هەندێترشی ئەمینی لە خۆوە بە ڕێکەوت پەیدا بووە لەو ترشە ئەمینی یانە پرۆتینەکان کە بۆ ژیان پێویستن پەیدا بوون.

خاڵی لاوازی ئەم گریمانکاریە ئەوەیە خێرایی شی بوونەوەی پێك هاتە کیمایی یی سادەکان تا ڕادەیێ لاوازە کە بەهۆی هۆکارەکانی تیشکی سەربنەوشەیی یان هۆیەکانی بەتاڵ کردنەوەی کارەبایی ڕوودەدات لەسەروی خێرایی پێك هاتنی ئەو پێك هاتانەیە. بەم شێوەیە هیچ برێك لەوانە دورست نابێت.

کۆسپی دووەم کە ناتوانرێ بەسەری دا بازبدرێ ئەوەیە: ئەو ترشە ئەمینی یانە دەبێ لە زنجیرەبەندییەکی دیاری کراو و سیستەمێکی ورد ڕێك بخرێ تا پرۆتین پێك بێنێت. بە تەواوی وەکو ڕێك خستنی چەند پیتێکە تا ڕستەیێکی بەسود پێت، یاسا کیمیایی و فیزیاییە ڕووتەکان ئەوە ناتوانن. بێ لە ڕێگای ڕێکەوتەوە بە بێ یاسایە ئەگەرەکان(الاحتمالات): (١٠)٦٥ واتە: (١ : ١٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠,٠٠٠).

سادەترین خانە لە چەند هەزارێ جۆر پرۆتین و بلیۆنەهای لەو چەشنە پێك دێت، سەرباری ترشە ناوکییەکان(D.N.A) و(R.N.A) و گەردی تر کەلەوپەری ئاڵۆزی دان، هەموو ئەوانە لەسیستەمێکی ئاڵۆزو وردی سەر سورهێنەر دانە.دەبێ ترشی یە ناوەکییەکان(D.N.A) و(R.N.A) بە بەرهەم هێنانی ئەنزیمە پرۆتینەکان هەڵسن، لە هەمان کاتدا دەبێ ئەو ئەنزیمە پرۆتینانە بەبەرهەم هێنانی ترشی ناوکی ( D.N.A)و(R.N.A)ی هەڵسێ، ئەی کێ یەکەم جار




کارەکەی دەست پێ کرد ؟!.

دەڵێ: (وەکو خوا لە ئینجیلی رومی: ٢،١) دا ئاماژە دەکەن و دەری دەخەن کە لێرەدا کرگاریێ هەیە، وە هەموو نەخشەیێك نەخشەکێشێك دایڕشتووە، هەموو یاسایەك یاسادانەرێکی هەیە، بۆیە ئەم فەرمایشتەی دەفەرمێ: خودا شتەکانی لە سەرەتادا دورست کردووە تا ئێستا ڕاسترین فەرمایشتە دەربارەی سەرەتای گەردوون و سەرەتای ژیان پێك هاتەی گەردوون دەوترێت[1].

## ١٨٥ - مەبەست لە جەستە و گیان / یان خانەی زیندوو:

خوداوەند دەفەرمێ: ﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ ص: ٧٢.

واتە: پاشان ڕێکم خست ئادەم و لە گیانی خۆم بەبەردا کرد. بەڵێ خوداوەند سەرەتا لە قوڕو لیتە ترشی ئەمینی دورست کرد، لەوانیش پرۆتینەکان و ڕێکی خستن، ئەنجا بە هۆی گیان کردی بە خانەیێکی زیندوو. وەکو (د: دوان . ت . کیش) ئاماژەی پێ کرد لە سەرچاوەی رابردوو دا (د: ن . دبلیو . پیر: Dr.n.w.pirie) کە لە( Rothomstead Exper Mental Station On Harpenden Lengiand) کار دەکات هەموو گریمان و بۆچوونانەی لە ڕاست پێك هاتنی پرۆتینەکان لە خۆوە بە ڕێکەوت لەسەر بنەمای ڕاستی یەکی نەگۆڕ نکۆڵی لێ دەکات: **(گەردە ئالۆزەکان وەکو پرۆتین، بەپێ ی تاقیکردنەوە زانستی یەکانمان ناتوانرێ لە خۆوە دورست بێن تا بە شێوەی پەیتا پەیتاییش، بۆ زانین هەموو شێوەکانی ژیان پشت بە پرۆتین دەبەستن).**

دکتۆر جۆن مور(Dr.john moore) لە کاتی بەستنی دانیشتنی ساڵانەی کۆمەڵەی ئەمریکی بۆ پێش کەوتنی زانست ڕای خۆی لە ڕاست تیوری پەرەسەندن ڕاگەیاند کە دەڵێ: (مرۆڤ لە ئەمیباوە، ئەویش لە قوڕو لیتەی دەریاکان دورست بووە) ووتی: ئەمە بڕوایێکە

---

(١) بەکورت کردنەوە لە ووتاری(پرۆفیسور دوان ت. کیش) وەرگیراوە لە کتێبی(هل تعرضت لغسیل الدماغ/ ت: اورخان محمد علی.

ناتوانرێ پەسەند بکرێ، بەڵکو هەر زانست نییە.

جیاوازی کرۆمۆسۆمەکان لە گیانداراندا لەگەڵ پێشینی یەکانی تیوری پەرەسەندندا ڕێك ناکەوێ، چونکە کرۆمۆسۆمی زیادە لە جۆرە سەرەتاکاندا بۆ جۆرە ئاڵۆزەکان نابینرێ، گەر تیورەکە ڕاست بایە دەبوایە بینرابایە. زیاتر لەوە جیاوازی فراوان دەبینین لە کەرستە بۆماوەیی یەکاندا کە جینی کرۆمۆسۆمەکان هەڵی دەگرێت.

لەوانە(بۆت) ئەو کەرستە جینی یانەی لە کەرستەی جینی مرۆڤ پترە، ئەمەش دژایەتی لەگەڵ تیوری پەرەسەندندا دوروست دەکات، بۆیە تیوری داروینی لۆژیکی نییە نەك هەر بایۆلۆجی نەبێت. وە تیوری پەرەسەندن لەگەڵ یاساکانی(دینامیکای گەرمی) دا دژ دێتەوە کە لە رووی زانستی یەوە پەسەندە. یاساکانی دینامیکای گەرمی(ثیر مودینامیك) بڕیار دەدات هەموو شتەکان کە وازیان لێ دەهێنرێ مەیلی گۆڕان دەکەن لە ئاڵۆزەوە بۆ سادەکاری و، لە شێوەی ڕێکەوە بۆ شێوەی نارێکی، کەچی تیوری پەرەسەندن پێچەوانەی ئەمە دەڵێ، چونکە بڕوای وایە شتەکان لە سادەوە بۆ شێوەی ئاڵۆز دەڕۆن(١).

دیسان خوداوەند فەرمویەتی:﴿ يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَٰلِكَ تُخْرَجُونَ﴾(٢).

واتە: (خوداوەند) زیندو لە مردوو دەردێنێ و مردوو لە زیندوو دەردێنێ، زەوی دوای مردنی زیندوو دەکاتەوە، زیندوو بوونەوەی مردوانیش ئاوایە.

(ئەم ئایەتە پیرۆزە ئاماژە بە توانای خودا دەکات لە دوروست کردنی زیندوان و مادده سەرەتایی یەکان کە لەگەڵ دوروست کردنی گەردووندا بنیاتی ناون، ئەو ماددانە نازیندە بوون و گیانیان لەبەر نەبووە، جارەکی تریش کاتێ گیان لەو لاشەو خانانە دێتەوەدەر ئەو ماددانە بۆ ئەو ماددانە دەگەڕێتەوە گەر سەرەتا دوروست بوون. بەم پێیە خوداوەند تاکە دەسەڵاتە دەتوانێ زیندوو لە مردوو دەربێنێ و مردوو لە زیندوو دەربێنێ، ئەمەش بەسەر دوروست بوونی سەرەتایی

(١) ....... / ل: ٤٣ – ٤٤.

(٢) الروم:١٩.




و زیندووبونەوەی پەسلاندا پراکتیك دەبێت[1].

(پرۆتینەکان پێك هاتەی ئەندامین لەگەردی ئالۆز پێك دێن، بەیەك گرتنی گەردیلەکانی کاربۆن و هایدرۆجین لەگەڵ ئۆکسجین و نایترۆجین، سەرباری کبریت و فسفۆر لە هەندێ دۆخدا دورست دەبێت. هەموو شانەو ئەتەمە زیندووەکانی مرۆڤ و گیانداران لە پرۆتینەکان پێك دێن. کە یەکەی پێك هاتن لە پێك هێنانی جۆرەها خانەی زیندودا، بە چەندان کۆمەکی جوڵە هەڵدەستێ لە ماسولکەکان و ئێسقانداو، لە کردارەکانی گواستنەوەی خوێن و ناردنی هەواڵەکانی دەمارەکاندا و، لە هاندانی جۆرەها کارلێکی زیندوو لە خانەکاندا، وەکو هەندێ لە ئەنزیمەکان و هۆرمۆنەکان پیێ ی هەڵدەستن، هەموو ئەوانە بەشێکن لە پرۆتینەکان).

(خانەکانی زیندەوەران جگە لە خانە دەمارەکان بەردەوام نوێ دەبنەوە، لەشی مرۆڤ لە هەر چرکەیەکدا(١٢٥) ملیۆن خانەی لە ناودەچێ و دەمرێ و گورج ئەوەندەی تر سروشت دەبنەوە. ئەمەش بەشێکە لە وێنەکانی دەرهێنانی زیندوو لە مردوو دەرهێنانی مردوو لە زیندوو، لەوێ دا کەرەستە مردووەکانی زەوی لە ئاو و هەواو زەوی وەرگیراوە هەروەها وزەی خۆر بۆ دورست کردنی کەرەستە زیندوەکان بۆ پێك هێنانی خانەی زیندوو لە کاربۆهیدرات و پرۆتینەکان و ماددەی تر، کە خانەی زیندووی تازەی لێ پێك دێنێ، لە هەموو کردارەکی گەشە و زۆربوندا، گەر ئەو زیندەوەرە مرد پێکهاتەکانی بۆ زەوی دەگەڕێتەوە تا خوا سەر لە نوێ مردو لە زیندوو دەربێنێت. ئەم ڕاستی یانە لە کۆتایی یەکانی سەدەی بیستەمدا زانراون، لە کتێبی خوای گەورە ئەم ئاماژە وردە زانستی یە کراوە﴿يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيِّتَ مِنَ الْحَيِّ وَيُحْيِي الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَكَذَلِكَ تُخْرَجُونَ﴾ الروم: ١٩. ئەمە گەواهیدەری ئەم ڕاستی یەیە قورئان فەرمایشتی خوایە نەك دەستکردی مرۆڤێك بێ، وە گەواهیدەرە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خاتەم(ﷺ) کە (١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر وەری گرتووە، لە چاخێ لە توانای کەس دا نەبووە ئەمە بزانێت.

---

(١) الموسوعة العلمية في اعجاز القران والسنه النبوية/ د: هانى مرعى القيسى/ ل:٨١١-٨١٢. النباتات فى القر. د: زغلول النجار.





## چۆن خانەی زیندوو لە توخمەکانی زەوی پێك دێت؟

﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجًا﴾[1].

واتە: خوداوەند لە خاك دورستی کردن، ئەنجا لە نوتفەیێك، پاشان کردنی بە جووتانە. بەڵێ خوا ئادەمی لە خاك دورست کردووە واتە: لە توخمەکانی زەوی خانەی یەکەمی ئادەمی دورست کرد، ئەنجا کردی بە خانەیێك(النطفە) پاشان دایکە حەوای لێ دورست کرد. بە هەمان شێوەی دورست بوونی جمکێکی چون یەك لە یەك هێلکۆکەی پیتراو لە منداڵدانەدا. کە دەبن بە نێرو مێ یەك.

(د: کریسون موریسون) دەڵێ: (سەیری ئەم شتە گرنگە بێ وێنەیە بکە کە لەزەوی و گشت بونەوەر گرنگترە جگە لە کردگارەکەی نەبێت، مەبەستم لە خاڵێکە لە(النطفة) یان خانە، ئەویش پرۆتۆپلازم(الجبلە) یە، کە خەریکە نەبینرێت، وەکو جەلاتین روونە و توانای جوڵەی هەیە و چالاکی خۆی لە خۆر وەردەگرێ و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن لە هەوا دا دەبرێ و گەردیلەکان ناچار کات بۆ جیا بوونەوە و هایدرۆجین لە ناو وەردەگرێ و هیرۆناتی کاربۆن بەرهەم دێنێ، بەم شێوەیە خودی خۆراکی خۆی پێك هاتەیێکی کیمیایی ئەوپەڕ سەرکەشە. ئەم تاکە خاڵە وردیلە بچووك و روونەکە لە ناوێ دەچێ، خودی خۆی خۆرەی ژیانە و توانای دابەشکردنی ژیانی هەیە بەسەر تەواوی زیندەوەرانی بچووك و قەبەداو لەگەڵ ژینگەکەیاندا ڕابێنێ لە هەرکوێ یەك بن، لەبنی ئۆقیانوسدا بن تا ئاسمان)[2].

ئەمە ڕای زانایێکی ئاسایی نییە، بەڵکو ڕای جەمسەرێکی جیهانە، کە سەرۆکی ئەکادیمی زانستی یە لە نیورك و سەرۆك و ڕاگری پەیمانگای ئەمریکی یە لە شاری نیورکدا.

خوای گەورە بەر لەم زانایە فەرمویەتی﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ ضُرِبَ مَثَلٌ فَاسْتَمِعُوا لَهُ إِنَّ الَّذِينَ

---

(١) فاطر: ١١.

(٢) العلم يدعوا للايمان/ کریسون موریسون/ ت: الاستاذ محمود صالح الفلكي/ ل: ٩٤.

تَدْعُونَ مِن دُونِ اللَّهِ لَن يَخْلُقُوا ذُبَابًا وَلَوِ اجْتَمَعُوا لَهُ﴾[1].

بەڵێ، هەرگیز خوای بێ بروایـان لـەبت و سـەنەم و سروشـت و ڕێکـەوت و زانسـت قـەت ناتوانن مێشولەیێ، یان مێشێ یان خانەیەکی زیندوی وەکـو بەکتریایـەك دورسـت بکـەن، گـەر هەموو ماددەی بونەوەرو هەموو تەمەنی بونەوەریان پێ بدرێت و بەکۆمەکی یـەکتریش هەڵـستن لە ڕاپەراندنی دا! ئەمەش بەشێکە لەواتای﴿فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي﴾ ص:٧٢.

بینیمان(فرانك ئالن) ووتی: (پرۆتینەکان کەرەستەی بێ ژیانی ناڕواتە نـاو تـا ئـەو نهێنـی سـەیرە نەڕواتە ناوی کە هیچ لە ڕەزاکەی نازانین) کە مەبەست لە (گیان)ە.

نیر فینج ولیام نوبلوچی) مامۆستا سروشتی لە ئەمریکا دەنوسێت

من بروام بە هـەبوونی خـودا هەیـە، نـاتوانم وا بیربکەمـەوە ڕێکـەوت بەتـەنیا دەتـوانێ دەرکەوتنی ئەلیکترونەکانی سەرەتا، ترشە ئەمینی یە سەرەتایەکان، پرتۆپلازمی سەرەتایی، یـان تۆوی یەکەم، یان هرزی یەکەم ڕون بکاتەوە. من بروام بە بوونی خوا هەیە، چونکە بونی پـیرۆزی ئەو لێکدانەوەییکی لۆژیکی بێ وێنەیە بۆ هەموو ئەو دیاردە گەردونیانەی لەدەورمانن.

لێرەدا وەڵامی ماتریالیستەکانی وەکو(بیرتراند راسل) دەداتەوە کە دەڵێ: ( هیچ مەبەسـتێ لە دوای دورست بوونی مرۆڤەوە نیە، دورست بوون و ژیان و هیواو تـرس و سـۆزو بـروای مـرۆڤ هەموویان ئاکامی کۆبونەوەی گەردیلەکانی لەشیەتی لە ڕێگای ڕێکەوتەوە) [2]. ئەی گیان چیە؟!

(النووی) دەڵێ: ڕاست ترین پێناسە بۆ گیان ئەوەیـە زانـای حەرەمـەین فەرمویـەتی: (انـه جسم لطیف مشتبك بالاجسام الكثیفة اشتباك الماء بـالعود الاخضر) [3]. واتـە گیـان لەشـێکی ناسکە وەکو چۆن ئاو لە داری سەوزدایە ئاوا تێکەڵ بە لەشەکان دەبێت.

(ابن القیم) دەڵێ: (گیان جولەو گواستنەوەی خێرایە وەکو چـاوتروکاندنێکە، لـە کـەمترین ساتدا لە گۆڕەوە بۆ ئاسمان بەرزدەبێتـەوە، بەڵگـەش خـەونی کەسـانی نوسـتوە کـە گیانەکـەیان

(١) الحج:٧٣.

(٢) الله یتجلی في عصر العلم. د ل:٥١/٥٤.

(٣) شرح الصدر للسیوطی/ل: ٢٨٩.

دەبینێت. سەلماوە کە گیانی نوستو بەرزدەبێتەوە حەوت چینی ئاسمان دەبڕێ لەبەردەم عەرشدا کورنۆش دەبات و لە کەمترین ماوەدا دەگەڕێتەوە بۆ لەش)[1].

(جلال الدين المحلى) لە (تفسير الجلالين)دا دەڵێ: (والروح جسم لطيف يحيى بە الانسان بنفوذه فيه).

پێشەوا جەعفەری صادق خوای لێ رازی بێ دەفەرموێ: (لو كنت تراه لقلت هو هو). واتە: گەر بەرچاوت بکەوێ دەڵێ ی کت و مت لەشەکەیەتی.

پێغەمبەریش(ﷺ) ئاماژە بە هاوشێوەیی لەش و گیان دەکات، واتە لەشێوەدالێك دەچن کاتێ دەفەرموێ: (من رانى فى المنام فسيرانى فى اليقظة) متفق عليه. واتە کێ من لە خەوببینێ ئەوە خۆمم وەکو ئەوەیە لە بێداریدا چاوی پێم دەکەوم.

(ارثر فندلای) دەنوسێ(مرۆڤ لە لەش و دەروون و گیان پێك دێت، لەش ئەوەیە دەیبینین، گیان لەشی ئەتیرە کە پێکاو پێکی لەشی فیزیایی یە و بەیەکتریەوە دەبەستێتەوە، مردن تەنیا جیابونەوەی گیانە لە لەش،کە هزریان دەرون لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت)[2].

بەلام ڕازی دورست کراوانی ماددی و روحی تەنیا خوا پەیان پێ دەبات﴿قُلِ الرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّي وَمَا أُوتِيتُم مِّن الْعِلْمِ إِلاَّ قَلِيلاً﴾[3]. الاسراو:٨٥.

بەڵێ:گیان لەکاتی خەون و هیپنۆتیزم و دوای مەرگ دەبینرێت. خوداوەند فەرمویەتی : ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾[4]. واتە: گیانی خۆمان ناردە لای مەریەم خۆی بەلەش کرد لە شێوەی مرۆڤێکی تەواو دا. (جیبیە) قوتابی پاستێرو بەرێوەبەری پەیمانگای باستێر لە نیورك دەڵێ: (خۆبەلەش کردن بە هزی گیانەکان ڕوودەدات لە ڕێگای ئەو هێزەی لە

---

(١) ..../ ل:٢٢٠.

(٢) على كافة عالم الاثيرى، د. ارثر فندلاى، ل:٢٥.

(٣)الاسراء/ ٨٥ .

(٤) مريم / ١٧ .

ناوەندەکان ـ الوسيطـ وەری دەگرن).

(سیرۆلیەم باریت) سروشت ناس و مامۆستای جیۆلۆجی لە زانکۆی دبلن و ئەندامی کۆمەڵەی زانستی بەریتانی دەڵێ: (سەلماوە کە جیهانی گیانی هەیە، دووەم ژیان لە دوای مردندا، سێیەم ئاخاوتن لە گەڵیاندا کە مردون و چونە ئەویێ)[1].

(ابن عباس) دەفەرموێ: بەپێ ی ئایەتی:﴿ اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى﴾[2]. گیانەکان لە کاتی نوستندا واتە: گیانی مردوان و زیندوان دیداری یەکتری دەکەن: (ان ارواح الاحياء و الاموات تلتقى فى المنام فيساءلون بينهم فيمسك الله ارواح الموتى ويرسل ارواح الاحياء الى اجسادها)[3]. واتە: گیانی زیندوان و مردوان دەگرێ و گیانی زیندوان ومردوان ژوانی یەکتری دەکەن و پرسیار لە یەکتری دەکەن، ئەنجا خوا گیانی مردوان دەگرێ و گیانی زیندوان بۆ لاشەیان دەگێڕێتەوە.

شایانی باسە هەیە لە زانایان پێ ی وایە ژیانی خانەیی جیایە لە ژیانی گیانی، وەکو خاوەنی کتێبی(الطب محراب الايمان) ئاماژەی پێ کردووە چونکە گیان لە(٤٠) مانگی دا دەکرێ بە بەر کۆرپەلەدا.

هەیە لە زانایانی خۆرئاوا وەکو: (د.شتاینر) پێ ی وایە مرۆڤ لە چوار لەش پێك دێت: (لەش، لەشی ئەتیر، لەشی وەهمی، لەشی(من))[4].

هەیە لە زانا موسڵمانەکان دەرون و گیان بەیەك شت دەزانێ، یان بە جیاوازیان دەزانێت وەکو لە(الروح/ ابن القيم) دا باسکراوە. بە هەر حاڵ گەردوون یەکەو جیاوازی بۆ خێرایی لەرە لەرەکانی(الذبذبات) دەگەڕێتەوە.

(١) مع القرآن في عالمه الرحيب، د: عمادالدين خليل، ل:١١٤.

(٢) الزمر: ٤٢.

(٣) الروح، ابن القيم الجوزى، ل:٣٦. وە بڕوانە(خەون و لێکدانەوەی خەونان بۆ هەموان) نوسراوی نوسەر کە لە ژێر چاپدایە.

(٤) ما بعد الحياة، كولن ولسن، ت: د: فاضل السعدونى/ ل: ٦٠.

**١٨٦- ئایا بەر لە ئادەم ئادەمی تر هەبووە؟**

**١٨٧- ئایا نوح دووەم باوکە بۆ ئادەمیزاد؟**

بێگومان لەسەر وەڵامی ئەم دوو پرسیارە زانایان ناکۆکن و ڕای جۆراو جۆریان هەیە.

(١): ئایا ئادەم یەکەم باوکە، یان باوکی تریش هەبووە؟

بێگومان بە دەقی قورئان و زانست بە درەنگەوە مرۆڤ پەیدا بووە، قورئان فەرموویەتی: ﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾[1].

واتە: ئایا ڕۆژگارێ بەسەر مرۆڤدا هاتووە هەرناویشی نەبراوە؟!

بەڵام ڕۆژگارە چەندە؟

لای زانایانی دینی مەسیحی وەکو(جیمس نەشر ١٥٨١-١٦٥٦) زەوی لە ٢٣/ تشرینی یەکەم دا(٤٠٠٤) بەر لە زایین دورست بووە.

لای زانایانی فیزیایی وەکو(لورد کلڤن/١٨٢٤-١٩٠٧) کە زانایەکی بەریتانی یە تەمەنی زەوی(٢٠-٤٠) ملیۆن ساڵە.

بەپێ ی خەمڵاندنی(یۆرانیۆم) دەگاتە(٤/٥)ملیار ساڵە، چونکە لای زانایانی **هاوچەرخ** دەتوانرێ بە هەڵوەشاندنی یۆرانیۆم تاوێرەکانی زەوی تەمەنیان دیاری بکرێ، **کە ژیانی هاوتاکەی** یان زرتوخمەکەی(٢٣٨) واتە(٤٥٦) ملیۆن ساڵە. **گەر هاوتاو زرتوخمی قورقوشم(الرصاص) - ٢٠٦)و** یۆرانیۆم کە لە تاوێردا هەیە بیپێوین، دەتوانین لەو کاتە **دیاری بکەین کە تاوێرەکانی تێدا** ڕزیوە. دیسان بە هۆی(پوریوم) دەپێورێ، **تێکرای تەمەنی هاوتاکەی یان** زرتوخمەکەی(النظیر) (٣٢٢) و (٣٠٠) ملیۆن ساڵە، **یان بە هۆی کاربۆن(١٤)یەو تێکرای** ژیانی(٥٥٧٠) ساڵە.

قرساندن بە تیشك هەیە، کۆنترین شوێنەواری ژیان بۆ(٣٠٠) ملیۆن ساڵ دەگەڕێتەوە.

وە بڕوا وایە لە چەرخی بلاستوسینی دا ڕووەکەکانی نوێ و شیردەرە نوێیەکان دەرکەوتون،

---

(١) بۆ زانستی پتر بڕوانە(بناء الكون و مصير الانسان/ هشام طالب / ل:٣١٥/٣١٨.




دیسان مرۆڤ لە چاخی جیۆلۆجی پێنجەمدا دەرکەوتووە، کە زانایان بۆ(٥٠-٦٠) هەزار ساڵی دەگێڕێتەوە. مرۆڤی ئەم کاتە بە مرۆڤی ساپین(human sapiens) ناسراوە[1].

ڕابردوبینیمان زۆر مرۆڤی ساختەکاری لەلایەن زانایانی پەرەسەندنەوە دورست کرابوون، لەوانە مرۆڤی(نبراسکا) و (پلتدان) و (پەکین) و (جاوا) و (کرومانیون) و (نیاندرتاڵ) گوایە بەر لە مرۆڤی نوێ هەبوون، کەچی داهاتو زانست سەلماندی هەموو ئەوانە ساختەکارین و هیچ بنەمایەکی زانستی یان نییە، بەشی زۆری کەللە سەرو ئێسق و رووفاتی مەیمونەکان بوون، هەرچی مرۆڤی نیاندرتاڵە کەللەو مێشکی وەکو کەللەو مێشکی مرۆڤی ئیمڕۆ بووە ! وە لێرەدا هیچ ئالقەیەکی شاراوە لە نێوان ئەوان و مرۆڤدا نیە. مرۆڤی نیاندرتاڵ کەلە ئەشکەوتی شانەدەری کوردستانیشدا شوێنەواریان دۆزراوەتەوە بەرلە(١٠٠٠٠٠) ساڵ تا(٢٥٠٠٠) ساڵ لەمەوبەر ژیاون، کەچی زانایانی ئەنترۆپولۆجیا دەڵێن: ئەوانە مرۆڤی ئاسایی بوون وەکو خۆمان !

هەندێ لە زانایان پێیان وایە بەر لە ئادەم زەوی ئاوەدان بووە، (قتادە) دەڵێ: (جنۆکە) و (البن)ی تێدا ژیاوە.

هەندێ لە زانایان پێی یان وایە بەر لە ئادەم ژیانی ئادەمی تر هەبووە، لەبەر ئەوە کاتێ خوا فەرموی بە فریشتەکانی و ئیلهامی کردن: ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾[2]. واتە: من جێنشینێ دورست دەکەم. وتیان: ﴿أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاءَ﴾.؟ واتە ئایا کەسێکی تێدا دورست دەکەی خراپکاری تێدا بکات و خوێن ڕێژی بکات. (قەتادە) پێی وایە فریشتەکان ئەمەیان بەوەزانیوە کەبەر لەئادەم(الجن و البن) هەبووە.

(ابن عمر) پێی وایە جنۆکەکان بەر ئادەم بە(٢٠٠٠) ساڵ خوێن ڕێژیان کردووە، خوا سوپای فریشتەکانی ناردنە سەرو بەرەو دورگەی دەریاکان دەری کردن، (ابن عباس)یش بڕوای وایە. لای(حسن) بە ئیلهام زانیویانە.

زۆر لە زانایانی کۆن و تازە بەدووری نازانن بەر لە ئادەم مرۆڤی تر هەبوبێ، وەکو لە ناو

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو.

(٢) قصص الانبياء، ابن كثير، ل: ١٢/١١.





کوردەواری خۆشماندا باس لە بوونی دێو کراوە، گوایە لە کۆندا هەبووە. لە گۆڤارێکی زانستی دا بابەتێکی گرنگ سەرنجی راکێشام کە نوسرابوو(الانسان الثلجی) واتە: مرۆڤی بەفری، کە لە سۆڤیەت لە قەدپالە بەفرینەکانی هیمالایە بینراوە. لەم گۆڤارەدا هاتووە: بەر لە(١٥) ساڵ دور لە گزندی(مۆست تەسیلما) کە دەکەوێتە قەراخی رێرەوی باشوری روباری بیجورا، باکوری خۆرئاوای یەکێتی سۆڤیەتی کۆن(٥) منداڵ و دوو پیاو قەسەڵ و گژوگیایان کۆدەکردەوە، لە بەرامبەر لایەکەی تری رووبارەکەدا دوو بەژن و باڵای زەبەلاح دەرکەوتن، هەریەکەیان دوو مەتر بەرز دەبوون، زۆر لە مرۆڤ نزیك بوون، بەڵام شاهید حاڵەکان زوو زانییان مرۆڤی نا-ایی نین. ئەو دوو باڵایە رووت بوون و موی درێژو پڕ داپۆشیی بوون، لە ژێر برۆیە چرەکانیان دا دوو چاوەکانیان دەبریسکایەوە، پاشان بزربوون ، لە دوای خۆیاندا شوێنەواری پێیەکانیان بەجێ هێشت، کە زۆر لە شوێن پێی مرۆڤ گەورەتربی، لە پێی ورچ دەچوو تەخت بوو، قامکەکانیان هەندێ بۆ لای هەردوو تەنیشتەکان لێکتر بلاوبوون. زانای جیۆلۆجی(فلادیمیر بوشکاریوف) لە شاندی لێکۆڵەری ئەو رووداوەی ناوا گوێ بیست بوو، لێ ی دەگێڕنەوە رۆژێك شان بە شانی روباری(ئوبی) چیایی دەرۆیشتین لە دارستانی سیبریادا ساڵی(١٩٦١) سەگەکان رایان کردو چونە پێشەوە. زۆری نەبرد بە ترسەوە گەڕانەوە لای خاوەنەکەیان، کە بە چاوی خۆی پیاوێکی قەبەو زەبەلاحی بینی تابلێ ی بەخۆوە بوو لە دارستانەکە دەرچووە دەر هەردوو چاوەکانی دەبریسکانەوە وەکو چرا، لەشی بە موی وەکو توك داپۆشرابوو، دەم و چاوی مەیلەو رەش بوون، تانەدەتوانرا دەم و لوتی لێکترجیابکرێتەوە، دەستەکانی زۆر درێژ بوون، لە درێژی باسکی مرۆڤ نەدەچوو، ئاماژەی سەیری پێ دەکردن، هەنگاوەکانیشی سەیر بوون وەك بلێ ی زەبەلاحێك زەوی هەڵدەکۆڵێت.

لەلایەکی تریشەوە لیژنەیەکی تایبەت سەر بە ئەکادیمی زانستی سۆڤیەتی ئەو کاتە هەر لە ساڵی(١٩٥٨) وە لە راست مرۆڤی بەفری بە کۆکردنەوەی زانیاری هەڵدەستێت. دەری خست زۆربەی زانیارییەکانی لە راوچی یەکان و خەلکی لادێ ی دوور وەرگیراوە کە شاهید حاڵ بوون یان توشی ئەو گیاندارە دارستانی یە هاتون. خەلکی باکوری ئەوروپاو سیبریاو جکوتکا و




خۆرهەلاتی خوارەوە ناوی جیا جیای پێ دەلێن، وەکو(تیژرەو- سریع العدو) و چاو زەق(الجاحظ) و شان پان. ئەم مرۆڤە درندەیە گۆشتی کالّ دەخوات بەدەستەکانی پارچەی دەکات و دەیخوات. لەدرزو ئەشکەوتی بچوکدا ژیان بەسەر دەبات وەکو ورچ قسە ناکات، بەلاّم ئەوانەی بینیویانە گوێیان لە گریان و پێکەنینی گەورەی بووە.

هەندێ لە زانایانی پەرەسەندن پێیان وایە ئەمە پاشماوەی مرۆڤی(هۆمینوید) بووە وەکو(بورشیف) و (سندرسن) کەمەیمونێکە لە مرۆڤ دەچێتەوە، ئەمیمونە و نە مرۆڤ و لەو نێوانەدایە[1].

لەچیرۆکی گەلاّندا باس لە زۆر لە گیانداران هاوشێوەی مرۆڤ کراوە، وەکو گیانداری(ئەسعەد) لە چیاو ئەشکەوتەکاندا ژیاوە وەکو کاوڕ بووە، سەری لە مرۆڤ چووە، قسەی کردووە، بۆ خواردن راوکراوە بەلاّم سەرەکەیان فڕێ داوە چونکە لە سەری مرۆڤ چووە.

یان باس لە دێوەزمە و عفریت دەکەن کە هەبووەو بینراوە، یان پیرژنە دێو، کەلای عەرەب بە(السعلاة) ناسراوە و خۆی پیشانی کاروان چیان داوە.

لە قورئانی پیرۆزیشدا باس لە شەیاتین و جنۆکەو عفریت کراوە. ﴿وَالشَّيَاطِينَ كُلَّ بَنَّاء وَغَوَّاصٍ وَآخَرِينَ مُقَرَّنِينَ فِي الْأَصْفَادِ﴾. وە شەیتانەکان هەمرو بیناسازان و ژێر دەریاوانن، ئەوانەی تر زنجیرو کۆت کراون.

﴿قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ الْجِنِّ أَنَا آتِيكَ بِهِ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ وَإِنِّي عَلَيْهِ لَقَوِيٌّ أَمِينٌ﴾. دێوێکی جنۆکە بە سولەیمانی وت: من(تەختی بەلقیسات) بۆ دەگوازمەوەو دێنم بەرلەوەی لە شوێنی خۆت هەلّبستیت. من لەسەر ئەوە بەهێزم وئەمیندارم[2]. داهاتو باسی(جنۆکە) دەکەین.

پاشان باس لە مرۆڤی تر دەکرێ کە لە ناو دەفری ئاسمانی دان و دەیان هەزار بەلّگە نامە هەیە، کەبینراون و قسەیان لەگەلّداکراوە، وەکو لە گەردوونناسی دا باسکراوە داهاتوش باسی دەکەین.

---

(١) مجلة العلوم، ل: ٦٠/١٩٨٧،بغداد.

(٢) سەیرێکی(غرباء و خارقون و دخلاء، فريد مجيد، بکە(١١٥/١٣٨).





وەلای زەردەشتی یەکان کە کوردەکانی زەردەشتین و ئـەوانیش بـە دەقـی قورئـان ئـاینی ئاسمانین وەکو لە کتێبی(زەردەشـت وە زەردەشـتیەکاندا) باسمـان کـردووە بـە(المجوس) ناسـراون، واتە(موگەکان) یان(میدیەکان)، ئەوان پێیان وایە: (ڕۆژگار هەر لەسـەر دەمـی کیوسـەردەوە تـا کاتی کۆچکردنەکە سێ هەزار و سەدوسی و نۆسالە و ئەوان هیچ شتێ بەر لـە کیومـەرد نـاڵێن، پێ یان وایە ئەو ئادەم بووەو هەواڵ گێرەوەکان لە ڕاست ئەودا یەك ڕانـین، هەیـە ڕای زەردەشـتی یەکانیان هەیە[1].

جولەکەکانیش پێیان وایە بەپێ ی تەورات نێوان ئادەم تا کۆچـی پێغەمبـەران(ﷺ) چـوار هەزارو سێ سەدو چل و دوو ساڵە. یۆنانیە مەسیحیەکان پێیان وایە نێوان دوورست برونی ئادەم و کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) پێنج هەزارو نۆسەد و نەوەدو دوو ساڵ و مانگێکە[2].

وە دابەزینی ئادەم لە بەهەشتەوە بۆ ناو هیندستان وەکو(ابو جعفر الطبری) و (ابـن الاثـیر) باسیان کردووە ڕاست نییەو نە لە قورئان و نەلە سوننەتی ڕاستیدا ئاماژەیێك نەهاتووە. [3].

زانای ئەمریکی تایبەت بە بینین لە دورەوە(ئەدگارس کیس) پێ ی وایە: (سـێ کارەسـاتی گەورە زەوی گرتۆتەوە لەمیان(١٠) هەزار ساڵ و(٢٨) هەزار ساڵ و (١٢٥) هەزار ساڵ لەمەوبەر ڕویان داوە. کارەساتی تریش هەیە هەڕەشە لە مرۆڤ دەکات. لێرەدا چەند ئاماژەیەك هەیە دەری دەخات شارستانی مرۆیی لە حیسابی زەمەنی گەردوونی دا کاتی یە[4].

(د: عبدالوهاب النجار) دەڵێ: هەندێ لێکۆڵەران پێیان وایە ئـەو باخـچەیەی ئـادەمی لێ بوە کێشوەرێکی تربوو، نەك ئەم کێشوەرانە و ژێر ئۆقیانوس کەوتووە، بە چـیاو شـێوو گیانـدارو درختەوە نقوم بون و بەو ڕوداوە(٦٠) ملیۆن کەس خنکان. وە لە ڕاست ئەم باخـچەیە(الجنـە) لـە (الاصحاح/٢)ی (سفر التکوین) دا هـاتوە کـە کەوتۆتـە لای چـاوگەکانی دیجلـەو فوراتـەوە [5].

(١)النهایة في التأریخ، ابن الاثیر، ج١ ، ل:١٦.

(٢) ... / ل:١٦.

(٣) ..../ ل:٣٤.

(٤) عصر الخوارق، ج ١٠ . ج رایز، ت: ماجدة صجیح، ل:١٠٢.

(٥)قصص الانبیاء/ عبدالوهاب النجار، ل:٢٦.




پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (الجنه فی المشرق). رواه الفردوسی.

بەڵام زۆربەی زانایان و مێژوونوسان(ئادەم) بە باوکی سەرجەم مرۆڤایەتی دەزانن و بروایان وایە سەرجەم مرۆڤایەتی لەو پەیدابووەو، بەر لە ئەو ئادەمیزادی تر نەبووە، جگە لە جنۆکەکان نەبێت.

ئەنجا قورئان ڕێزەکی تایبەتی بۆ مرۆڤ داناوە و لە گیاندارانی تری جیا کردۆتەوە.﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾[1]. ﴿إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾[2]. ﴿وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا﴾[3]. ﴿وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ﴾[4].

خوداوەند نەهاتووە مرۆڤ لە مەیمون دورست بکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەندێ لە مرۆڤە خراپکارەکانی وەکو مەسخ و گۆڕینی سیستەمی جینی و بۆ ماوەیی گۆڕیون بە مەیمون و بەراز وەکو سزایێک بۆ ئەوانەو لکەدارکردنیان، وەکو داهاتوو باسی دەکەین.

زانایانی واقیعی و ڕاست گۆ کاتێ قۆناغەکانی جیۆلۆجی یان داناوە، وەکو(هشام طالب) ئاماژەی پێ کردووە مرۆڤیان لە قۆناغی چوارەمدا داناوە، کەچاخی پلاستوسینی یە. بۆ(٢٠) هەزار ساڵ لەمەوبەر دەگەڕێتەوە، لێرەدا زاراوەی(Regent) بەکاردێنن، واتە: هەڵسان بە خەلافەت، بەو مانایەی گەورەی زەوییەو نوێنەری خوایە لە ناوی دا[5]. خوا ئادەمیزادی کردووە بە خەلیفە، ڕێزی لێ ناوە، زانستەکانی فێرکردووە، فەرمانی بە فریشتەکان کردووە کرنۆشی بۆ ببەن.

زیاتر لەمەش پێغەمبەری ئیسلام(ﷺ) فەرمویەتی: (کنت اول الناس في الخلق واخرهم فی البعث) ابن سعد عن قتادة مرسلا/ صحیح / الجامع الصغیر. واتە: من یەکەم کەسم لە دورست کراندا و دوا کەسم لە ڕەوانە کراندا.

---

(١) الاسراء:٧٠.

(٢) البقرة:٣٠.

(٣) البقرة:٣١.

(٤) البقرة:٣٤.

(٥) بناء الکون ومصیر الانسان هشام طالب/ ل:٦٣٦.



(كنت نبيا وادم بين الروح و الجسد). رواه الطبرانی/ صحيح / الجامع الصغير. واتـه: مـن پێغەمبەر بووم و ئادەم لە نێوان گیان و لەشدا بوو.

بەم پێیە یەکەم دورست کراو گیـانی یـان نـوری پێغەمبـەر(ﷺ) بـووە، کـە لـە جیهـانی مەلەکوتی دا خوا پەرستی کردووە. وە ئەم باخچەو بەهەشتی ئادەمی لیّ بووە کوردسـتان بـووە، وەکو لە فەرمودەی ڕابردودا بینیمان :

( الجنه فی المشرق) رواه الفردوسی. واتە: باخچەکە لە خۆرهەڵاتـە. خۆرهـەڵاتیش عێراقـە/ بەشی کوردستان. وەکو لە(صحيح مسلم) دا هاتووە: (عن ابن عمر يقول: يا اهل العراق ! ما عن صغيرة واركبكم الكبيرة ! سمعت ابی عن عبدالله ابن عمر يقول سمعت رسول الله ان الفتنة تجیء من ها هنا وامتیء بيده نحو المشرق من حيث يطلع قرنا الشيطان...) بەو پێیـە دوا گـۆڕان و دوا نویّ بونەوەی دین لە خۆرهەڵاتەوە دەبێت. کە ئالاّ ڕەشەکان پێی هەڵدەسـتن وەکـو ڕابـردوو ئاماژەمان پیّ کرد.

## دروست بوونەوەی ژیان لە سەردەمی نوحدا لە خۆرهەڵاتدا لە کوردستاندا:

هەندیّ مێژوونوسـان پێیان وایە نوح باوکی دووەمی یان باوکێکی تری ئادەمیزادە و لە سەردەمی ئەودا لافاوو بورکان و بومەلەرزە و هەڵچونی ئاوی ڕویداوە و هەموو خەڵکی سەر زەوی خنکاوە، تەنیا سەرنشینەکانی ناو کەشتی نوح ڕزگاریان بـووەو، ئـەوان بـاوکی دووەمـی ئـادەمیزادن لـە زەویدا لەسەردەمی بەستەڵەکیدا.

(ابن عباس) دەڵیّ: (کاتیّ ئادەم کەوتـە سـەرەمەرگەوە وەسـیەتی کـرد بـۆ شـیت، کـات ژمێرەکانی شەو و ڕۆژی فێرکردو، ئەنجا عیبـادەتی خـەڵوە لـە هـەر کاتژمێرێکدا، لـە لافـاوی ئاگادار کردوە، دوای ئادەم سەرۆکایەتی کەوتە بەر دەستی ئەو خـوا پـەنجا لاپـەرەی بـۆ نـارد و ئادەمیزادی ئیمرۆ لە پشتی ئەون[1]. بەڵام مەجوسەکان پێیان وایە کیو مەرد ئادەمە: کیو مەرد کچێکی پەیدا بوو بە ناوی میشان، خوشکی میشی، میشی میشان دەکاتە هاوسەرو سیامەك و

(١) الكامل في التاريخ ، ج١/ ل:٤٣.




سیامی پەیدا دەبن. سیامك: ئەفروال و دقس و بواسپ و ئەجرەب ولۆراشی پەیدا دەبێت، دایکی هەموویان سیامی یە کچی میشی و خوشکی برایانە. دەڵێن: زەوی حەوت دەڤەرە، بابل یەك دەڤەرە و دانیشتوانی لە نەژادی ئەفروالی کوڕی سیامك و پشتی ئەوە[1].

(بابل) کە لە قورئاندا هاتووە کە شوێنی هاروت و ماروت بووە: ﴿وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ﴾[2]. لە (کتاب المقدس / التكوين/ ١١/١٠) سنجارە لای ئەینەوا کە پارێزگایێکی کوردستانی داگیر کراوە.

(وقد تكونت مملكته اول الامر من بابل وارك واكد وكلنة في ارض شنعار). (د: طارق صالح الزبيدي) دەنوسێ: (ئەینەوا شارێکی کۆنە بە شاری چل پێغەمبەر ناسراوە... گۆری جەرجیس و شیت پێغەمبەر و یونس پێغەمبەری لێیە)[3].

مێژوونوسان پێیان وایە(خنوح) ئیدریسە کە خودا لە ڕاستی دەفەرموێ﴿وَاذْكُرْ فِي الْكِتَابِ إِدْرِيسَ إِنَّهُ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا وَرَفَعْنَاهُ مَكَانًا عَلِيًّا﴾[4].

پاشان (نوح) دێ کوردەیان کوڕی دەیەمی ئادەم، کە نەوەی ئیدریسە، کاتێ لە پێغەمبەریان(ﷺ) پرسی نێوان نوح و ئادەم چەند بووە؟ فەرموی: (عشره قرون) رواه ابن حبان. واتە(١٠) وەچەیان(١٠) سەدە بووە، بەڵام دە وەچەکە ڕاسترە. بێگومان تەمەنی ئەو وەچانەش درێژ بووە، نوح(٩٥٠) ساڵ لە ناویاندا ماوەتەوە:﴿ فَلَبِثَ فِيهِمْ أَلْفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمْسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ الطُّوفَانُ وَهُمْ ظَالِمُونَ﴾. وە پێ ی قورئان(نوح) لەسەر کێوی جودی لە کوردستاندا نیشتۆتەوە: (واستوت على الجودي). وەکو لە ڕابردو باسکرا.

لێرەدا دوو خاڵمان بەڵاوە گرنگە باسی بکەین: ئایا لافاوی نوح ئیقلیم گیر بووە، یان جیهان گیربووە؟ دووەم: ئایا نوح و کوڕەکانی باوکی دووەمی ئادەمیزادن یان نەء؟

(١) ... / ل:٤٣.

(٢) البقرة:٢:١٠٢.

(٣) التراث العلمي العربي الطبي، د: طارق صالح الزبيدي/ ل:٣٦٩.

(٤) مريم / ٥٦ – ٥٧.



ڕابردو بینیمان وەکو(د: زغلول) ئاماژەی پێ کردووە تا ئیمڕۆ دیار نییە کە ئایا لافاوی نوح جیهان گیربووە، یان تەنیا ناوچەکانی نوحی گرتۆتەوە لە میزوپۆتامیادا. زۆر لە زانایان و ئەهلی کیتاب دەڵێن: ئیقلیمی بووە، لەوانە(مولوی محمد علی لاهور). پاشان مەجوسەکان دەڵێن: ئەو لافاوە ناوچەی ئەوانی نەگرتۆتەوە. وە(ودلی) و (ویلکوکس) بروایان وایە ئەم لافاوە دنیای نەگرتۆتەوە، بەڵکولافاوێکی سەخت دۆڵی دۆزێ ی گرتۆتەوەو ناوچە ئاوەدانیەکانی نێوان شاخەکان و بیابانەکانی نقوم کردووە. ئەم ناوچانە بۆ ئەوان هەموو دنیا بووە[(١)].

ئەنجا خوداش دەفەرموێ: ( واستوت علی الجودی). ئەوەتە: ناوچەی دۆزێ ی گرتۆتەوە.

وە لەو تابلۆیانەی گلگامشدا کە لە(٧٠)کانی سەدەی ڕابردودا لێکۆلەر(جۆرج سمت) سەر بەمۆزەخانەی بەریتانیا چەند تابلۆیەکی قوڕینی تاووتوێ کرد، کە بەخەتی بزماری نوسراوەو لە(نەینەوا) دۆزرایەوە[(٢)].

(مامۆستایانی خەت ناسی پێیان وایە ئەم نوسراوە خەتی ئارامی یەو هەرکام لەوان بە جۆرێکیان وەرگێراوە کە بە هیچ بەڵگەیی ناتوانن ڕاست بن) [(٣)].

بەپێی ئەم تابلۆیانە: یەکێ لە خواکان بە نوح ڕادەگەیێنێ، نوحی بابلی کە کەشتی یەك دورست بکات و خۆی قوتار بکات[(٤)].

بەپێی سێ تابلۆ دێرینەکانی نوح، کە ئینگلیز لە ساڵی(١٩٢٠) دا **لە کوردستان** دۆزیویتەوە و(تقی عابد)ی خەت ناس هەڵی هێناون، نوح **ناوی کوردە بوە و باوکی** کوردەکانە،(ئارامی) هەورامیە، ئەم تابلۆیانە بە خەتی بزماری **کوردی نوسراون و لە مۆزەخانەی** بەریتانین وەکو ڕابردوو باسمان کرد. بەو پێیە زمانی کوردی زمانێکی **دێرینەو کورد** خاوەنی کۆنترین زمان و کۆنترین شارستانی و مێژووەو خاوەنی کۆنترین خاکە، کە(جودی)یە. لێرەدا

(١) معجزة القرآن والطوفان/ المهندس سعد حاتم محمد مزرة، ل: ٩٨/٩٩ ستیریکة.

(٢) الانسان وقواة الخفية، کولن دلسن/ ل:١٠١.

(٣)هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد/، حبیب الله تابانی، و: جلیل گاوانی، ب٢، ل:٣٣٨.

(٤) معجزة القران والطوفان/ ل:٩٥.

دەردەکەوێ خوداوەند لە قورئاندا ئاماژە بە کوردستان دەکات. کە هەر لە کۆنەوە بەو ناوە ناسراوە. وشەی(کورد)یش هەر لەم وشەیەوە هاتووە. واتە: کێوی کوردەکان. ئەوەتا(ج . ار .درایڤەر) دەنوسێ: (ئۆنکلۆس –onqelos) بە چیای ئارارات دەڵێ کە کەشتی نوحی لە سەر نیشتۆتەوە: (کاردۆ –qardu) ( (نولدکە) بڕوای وایە وشەی (کورد)kurd لە وشەی گیرتی(kyrtii)یەوە هاتووە) [1]. (ڕایسکە) بڕوای وایە(خالدی و کوردی و کۆرتی و کوردیا) هەموو ئەوانە یەك شتن و یەك مانا دەدەن).

(بی لرخ) هەمان ڕای هەیە. وە مادو بارس هەمان کوردی ئیمڕۆن.

وەکو لە سەرچاوە یۆنانیەکاندا هاتووە: (کورتی) کە لە مادو بارسەکانن) هەمان کوردی ئیمڕۆن[2].

(د: احمد محمود خلیل) دەنوسێ: (چیای جودی لە نزیك دورگەی بۆتانە نەك لە عیراقدا، لە قورئاندا هاتووە کەشتی نوح لەسەر لوتکەی ئەو چیایە نیشتۆتەوە، لە کاتی ئارام بوونەوەی لافاوەکەدا، ئایەتەکە دەفەرمێ: (واستوت علی الجودی) هود:٤٤ . شایانی باسە وشەی جودی شێوازێکی وشەی(جوتی – غوتی – گۆتی) یە کە ناوێکی مێژوویی کۆنی گەورەترین لقەکانی باپیرەکانی کوردەکانە لە کوردستاندا) [3]. بەڵام ڕاستروایە(جودی) و (کورتی) و (گۆتی) و (کوردی) یەك واتایان هەیە و لە کاتی گواستنەوەیاندا بۆ زمانی تر ئەم گۆڕانانەیان بەسەردا هاتووە.

(ابن الاثیر) دەڵێ هەندێ لە مەجوسەکان دەڵێن: (لافاوەکە لە بابل) و دەوروبەری دا ڕویداوە، خۆرهەڵاتی کە ناوچەی کێو مەردە نەیگرتۆتەوە. ئەوان هەر لە سەردەمی ئەودا حوکمیان کردووە، گەر لافاو ئەوێ ی گرتبایە حوکمی ئەوان دەپچڕا[4].

---

(١) الكرد في المصادر القدیمة، ت:فؤاد حمة خورشید، ل:٢٣-٢٦ سەیرکە.

(٢) الكرد فی دائرة المعارف الاسلامیة، ت:حمید ریبوار، ل: ٣٢-٣٨ سەیر بکە.

(٣) الكرد وكردستان، ارشاك سامزاستیان، ت: و: احمد محمود الخلیل، ل: ١١-١٢ پەراوێزی. وەرگێڕ.

(٤) النهایة في التاریخ، ج١ ، ل:٥٨.




دووەم: شت: (ابن عباس) دەڵێ: (هەشتا کەس لە کەشتی یەکەدا بون هـەموویان کـورانی شیت بوون، یەکێ لەوا جورهوم بوو) (قتادە) دەڵێ: (هەشتا کەس بوون) . (الاعمش) دەڵێ: (٧) کەس بوون[١].

هەندێ پێیان وایە: ﴿وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ﴾[٢]. ئەوە دەردەخات کە تەنیا ڕەچەی نـوح مایەوەو ئەوانی تر کە لەگەڵ نوحدا بوون بێ نەژاد مانەوە.

وەکو(الرازی) لە (تفسیر الکبیر)دا باسی کردووە، وە لە(ابن عبـاس)ی گێراوەتـەوە: (سـێ کوڕی هەبووە: (سام و حام و یافت). سام باوکی عەرەب و فارس و ڕۆمە. حـام بـاوکی سـۆدانە. یافت باوکی تورکە.

بەڵام گەر سەیری ئایەتی تر بکەین خوێندنەوەی تری لێ وەردەگرین: ﴿قِيلَ يَا نُوحُ اهْبِطْ بِسَلَامٍ مِّنَّا وَبَرَكَاتٍ عَلَيْكَ وَعَلَى أُمَمٍ مِّمَّن مَّعَكَ وَأُمَمٌ سَنُمَتِّعُهُمْ ثُمَّ يَمَسُّهُم مِّنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[٣]. واتە: پێی وترا: ئەی نوح دابەزە(لەوکەشتی یە) بـە سـاغی و بـێ تـرس لـە لایـەن ئێمـەوەو وە بەرەکەت بۆ سەرتۆ و ئەو ئومەتانەی لەگەڵتدانە، وە چەند ئومەتێك کە چەند خۆشیەکی دنیایـان پێ دەدەین، پاشان لە لایەن خۆمانەوە سزایەکی توندیان دەدەین.

بەم پێیە نوح زۆر گەلی لەگەڵدا بوون، جگـە لـە کـورد ، کـە لـەو سـەردەمەدا هـەبوون. گەلانی تر لەوان پاشەکەوت بوون. لێرەدا هیچ بەڵگەیەك نییـە لەسـەر ئـەوەی ئەوانـە مـردون و وەچەی نوح ماوەتەوە[٤]. وەکو لە ڕابردو باسکرا بەپێ ی نوسـراوی سێ تابلۆ دێرینەکانی نوح کـە لیژنەی شوێنەوارزانی بەریتانی دۆزیوینەوە لە کاتی داگیر کردنـی دا بـۆ کوردسـتان و لـە(هایـد پارك) دا بڵاوکرایەوەو، (تقی عابد)ی شوێنەوارزانی عەرەب هەڵیهێناون، کـە بەخـەتی بزمـاری کۆنی کوردیە: (نوح) ناوی(کوردەیە) واتە: کوڕی دەیەمی ئادەم، وە ئادەم لە(دێ ی سـەلام)بـووە

(١) ..../ ل:٥٦.

(٢) الصافات:٧٧

(٣) هود:٤٨.

(٤) بەو پێیە(وَجَعَلْنَا ذُرِّيَّتَهُ هُمُ الْبَاقِينَ) مانای مانەوەی وەچەی ئەوانەو لـە ناوچـونی وەچـەی کـوفرە، وەکـو خـوا بـە پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (ان شانئك هو الابتر).





له (رواندز). وشەی(سامی) هەڵبەستراوەو هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییـه. تـا وشـەی(هـەڵگورد) واته(هەڵی گرت) واته: ئەم چیایه یان ئەم زنجیرە چیایە ئادەمی لیٚ دوروست بـووەو نـوح لەسـەری نیشتۆتەوە[1].

جیۆلۆجی بەریتانی گەورە(هـ. ا . رایت) لە کتێبی(اثار العصر الجليدى البلاستوسینی في کوردستان)دا بابەتێکی گرنگی نوسیوە لەسەر شوێنەواری چەرخی بلاستوسـینی لـە کوردسـتاندا کە ژیانی مرۆڤی تێدا دەرکەوتووە.

لەوانە(هەڵگورد) و (روباری رەواندز) و (جیلوداغ). لە ئاکامدا دەنوسیٚ: (بەڵگەی دوروست بوونی بەستەڵەك و بەفرگرەیی لە چیاکانی کوردستاندا ئەوە دەردەخەن کە ئـاوو هـەوای چـەرخی بلاستوسینی تێیاندا لە گردو تەپۆلەکانی ساردترو شێدارتر بووە. بەڵام گـۆڕانی کـەش و هـەوای دوای ماوەی بەستەڵەکی تا گەیشتۆتە شێوەی کەش و هەوای ئێـستا دەکـریٚ بکـریٚ بـه بەڵگـه لەسـەر ئەو ماوەیەی کشتوکاڵ کردن و دامەزراندنی گوندی کشتوکاڵی تێدا دەسـتی پـیٚ کـردووە بەر لـە(١١٠٠٠-٩٠٠٠) سـاڵ دا. تـا لـە کۆتـایی یـەکانی چـەرخی بلاستۆسـینی دا، بـەر لـە گەڕانەوەی کۆتایی بەستەڵەکە چـیایی یـەکان لێـرەدا پەیوەنـدی پێکـەوەیی هـەبووە لـە نێـوان زیندەوەران و ژینگەیاندا کە لەگەڵ ئەو ئابوورییە تازەدا بـسازیٚ کـە بـۆ چـەند هـەزاری داهـاتوو بەردەوام بێت، بەهۆی هەڵبەزین و دابەزینی کەش ، کە چەند ناوچەیەکی ژیان لە گرد و چیاکاندا **بەرزو نزمی پیٚ دەکات.**

**لەویٚ دا مرۆڤی کۆن توانای هەبوو ئەو شوێنانە بگەریٚ کە زۆر لـە بـارترن لـە قۆنـاغێکی دەوڵەمەندی قۆناغەکانی پەرەسەندنی ژیاری دا).**

وە ئەم زانایە زۆر ئەشکەوت گەڕاو شوێنەواری مرۆڤی تێدا بینی، لەوانە مرۆڤی کـۆن کـە بە نیاندرتاڵ ناسراوەو ئێستا دەرکەوتووە هەمان مرۆڤی ئیمرۆ بوون، پێچەوانەی ڕایەکانی تیـوری پەرەسەندن، کە بە مرۆڤێکی جیا لە مرۆڤی ئیمرۆی دادەنێن وەك باسکرا.

بەکورتی: کوردستان لانەی شارستانیەکان بووە، لانـەی سـەرهەڵدانی یەکـەم ژیـان بـووە،

---

(١) جريدة العرب/ ٢٨/ ٥/ ١٩٩٠.





هەموو قۆناغ و گۆڕانە مێژوییی یە گەردوونیەکان لەوێ دا سەری هەڵداوەو، مێژوش خۆی دوبارە دەکاتــەوە. لــەکتێبی (مقدمــة في تــاريخ الحـضارات القديــة/ طــه بــاقر)دا (ل:٢٣٢)دا بــاس لەسەنگەسەر دەکات لای پشدەرو رانییە کەسێ کەنار هەیە شوێنەواری چەرخی پلاستۆسینی یان پێوە دیارە ئەمەش ئاماژە بۆ دێرینی ئەم ناوچەیە دەکات.

## ١٨٨-١٨٩- جنۆکەکان کێن و چین؟ ئایا بەر لە ئادەم هەبوون؟ کێشەی شەیتان و ئادەم بۆچی؟

قورئانی پیرۆز دەفەرمێ: ﴿وَلَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ مِن صَلْصَالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ وَالْجَآنَّ خَلَقْنَاهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ السَّمُومِ﴾. واتە: مرۆڤمان لــە قــوڕێکی ڕەش دورســت کــرد کــە بــۆنی کردبــێ. جنۆکەکانمان بەر لە ئەو(مرۆڤ) لە ئاگرێکی پەتی دورست کردبوو.

دیارە جنۆکە ئەوانیش گیانارێکی هۆشیارن و وەکو مرۆڤ بەر پرسیارن، بــەڵام لــە مــاددەی بەرجەســتەی وەکو توخمەکانی زەوی و خاك دروست نەکراون، بۆیە پێنج هەستەکانی مرۆڤ ناتوانێ پەیان پێ ببات. هەتا وشەی(الجن) وەکو(الراغب) لە (المفردات) دا ئاماژەی پێ کردووە. واتــە: ( ستر الشيء عن الحواس). ﴿فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ اللَّيْلُ﴾ [1]. بە پێیە جنۆکە واتــە: گیانــدارانی پــەنهان کە پێنج هەستەکانی مرۆڤ هەستیان پێ نەکات. دیارە ئادەمیزاد لە مادده دورست **بووە ، بــەڵام** جنۆکەکان لە ڕوناکی و وزەیەك دورست بوون کە **هەستەکانی مرۆڤ نەتوانێ بیــان بینێــت. وەکــو** چۆن ناتوانێ تەزوی کارەبا و شەپۆڵە کەهرۆموگناتیسی **یەکان پەی پــێ ببــات، وەکــو(ئــێکس و** گاماو و بێ تەل و سەربنەوشەیی و ژێر سور) تەنیا ڕوناکی بینــراو دەبینــێ کــە لــەرە لــەرەکانی لەمیان(٤٠٠-٧٥٠) بلیۆن لەرە لەردایە لە چرکەیەکدا. مرۆڤ توانێ **شەپۆلی لەرە لــەر بــەرز تــر** وەکو ئەیتر پەی پێ ببــات وەکــو(تومــاس یــونگ — ١٨٠٤) **ئامــاژەی پــێ کــردووە شــەپۆلی کەهرۆموگناتیسی** بە ناوی دا دەڕوات.

مرۆڤ تەنیا لە جیهانی خەون و هیپنــۆتیزم و ئیلهامــدا کــە(نەســت) بــە ئاگایــە دەتــوانێ

---

(١) الانعام:٧٦.




جیهانی ئەتیرو گیانی پەی پێ ببات کە دونیای سەروی ماددی و میتافیزیکی یان پێك هێناوە.
بۆ زانستی پتر بڕوانە(عصر الخوارق/ ج . ا . ج . رایز)[1].

(د: شتاینر) دەڵێ: (ئێمە لە کاتی چونە سەر جێگا و کاتی بێداربونەوە بە ژوانی مردوان دەگەین، ئەمە بۆ خۆتێوەگلاندن لەگەڵ ئەوانە زۆر گرنگە کە بە مردو ناویان دەبەین، لەگەڵ هەر زیندەوەرێکی تری گیانی جیهانە باڵاکان دا)[2].

بەڵێ وەکو باسمان کرد (ابن عباس) گێڕایەوە: (گیانەکان لە کاتی نوستندا ژوانی یەکتری دەکەن) وەکو لە (کتێبی الروح/ ابن القیم) دا باسکراوە.

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (الرؤیا ثلاثة: فبشری من الله، وحدیث النفس، وتخویف من الشیطان) رواه الترمذی. واتە: خەون سێ بەشە: مژدەی خوایی، دالغەو خەیاڵ، ترساندن لە شەیتانەوە.

(دەبلیو . ئی . ئیفنز وینتز) کە بەڵگەیە لە ئایینەکانی خۆرهەڵاتی دا، لە کتێبەکەی دا کە سەرچاوەیە(الایمان بالجن فی الاقطار الکلتیە) دەڵێ: (دەکرێ بەڵگە بۆ گیاندارە نادیارەکان بێنبرێتەوە وەکو جنۆکە و عفریت و دێو و هەموو جۆرەکانی جنۆکەی راستەقینە و ئەو مرۆڤانەی گیانیان لە لاشە دەرچووە). ئەو لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەی چەندان ساڵی لە جنۆکەو کۆکردنەوەی سەدان حاڵەت بەو ئاکامە گەیشتووە[3].

لە ناو ئەوانەدا دوپێرِ هەیە، موسڵمان و کافر، بە کافرەکان دەوترێ شەیاتینەکان، پێری(ئیبلیس) ، باوکی یەکەمی جنۆکەکانە وە تا قیامەت دەمێنێ و، یەکەم کەس بوو لە خوا یاخی بوو سەرپێچی ئەوی کرد، ئەمەش لە کاتێ دابوو خوا ئادەمی دورست کرد و گیانی کرد بەربەردا کردی بە خەلیفە و پێغەمبەر بۆ جنۆکەو مرۆڤ و فریشتەکان، ئەنجا فەرمانی بە ئیبلیس و فریشتەکان کرد کرنوشی بۆ ئادەم ببەن، واتە بڕوا بە پێغەمبەرایەتی و ویلایەتی گەورەی ئەو

---

(١) عصر الخوارق سەیر بکە.
(٢) ما بعد الحیاە / کولن ولسن/ ل: ١٦٦.
(٣) ما بعد الحیاە / ل:٦٣.

بکەن و سەری ڕێزی بۆ دابنوێنن، بەڵام ﴿فَسَجَدُوا إِلَّا إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ الْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِ﴾[1]. واتە: فریشتەکان کرنۆشیان برد تەنیا ئیبلیس نەبێ کە لە جنۆکەکان بوو، سەرپێچی فەرمانی پەروەردگاری کرد.

بۆچی ئیبلیس کرنۆشی نەبرد؟ دیارە جنۆکەکان لە فریشتەکان جیان هەر چەند ئەوانیش لەشی ئەتیرین، بەڵام ئەوان وەکو مرۆڤ کردەوەکانیان دووبەشە: خۆویست خۆنەویست، هەرچی فریشتەکانن کردەوەکانیان هەمووی خۆنەویستە. لێرە ئیبلیس خۆی بەزلدەزانی و خۆی پێ لە ئادەم لە پێشترە بۆ ویلایەتی گەورەو خەلافەت و پێغەمبەرایەتی، ئەنجا ئەو لە ڕوناکی و ئادەم لە خاك دورستکراوە ﴿ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ﴾[2].

وە شەیتان وتی: ﴿أَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا﴾. ئایا کرنۆش بۆ کەسێ ببەم لە قوڕ دورستت کردووە؟ یان : ﴿قَالَ أَنَا خَيْرٌ مِّنْهُ خَلَقْتَنِي مِن نَّارٍ وَخَلَقْتَهُ مِن طِينٍ﴾[3]. وتی من لەو باشترم منت لە ئاگر دورست کردووە، ئەوت لە قوڕ دورست کردووە ﴿ قَالَ فَاخْرُجْ مِنْهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ وَإِنَّ عَلَيْكَ لَعْنَتِي إِلَى يَوْمِ الدِّينِ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرْنِي إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ الْمُنظَرِينَ إِلَى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ﴾[4].واتە: خوا فەرمووی: لەو ئاستە دەربچۆ تۆ ڕەجم کراویت. نەفرینی منت لایە تا ڕۆژی پەسڵان. وتی: پەروەردگارم تا ڕۆژێ مۆڵەتم بدە کە زیندو دەبنەوە. **فەرمووی: تاکاتە** زانراوەکە تۆ مۆڵەت دراویت. پێشەوای بڕواداران علی(علیه السلام) **فەرموویەتی:(فاعتبروا بما کان من فعل الله بابلیس اذا احبط عمله الطویل وجهده الجهید، وکان قد عبادالله ستة الاف سنة لایدری امن سن سني الدنیا ام من سني الاخرة عن کبر ساعة)**[5]. **واتە: ئەی خەڵکینە** پەند لە شەیتان وەر بگرن، کە ئەو ماندو بوون و کۆششە زۆر و درێژەی بە **فیڕۆدا، شەش هەزار** ساڵ خوای پەرست ، نازانرێ ئایا لە ساڵەکانی دنیایە یان ساڵەکانی پەسڵان، بەخۆ بەگەورە زانینی

---

(١) الکهف:٥٠.

(٢) البقرة:٣٤.

(٣) ص:٧٦

(٤) ص: ٧٧-٨١.

(٥) نهج البلاغة، د: صبحی صالح/ ل:٢٨٧.




یەك سەعات ! بەڵێ خوا شەیتانی لە جیهانی فریشتەیی دابەزاند کە لـە مەلـەکوتی بـاڵا دابـو، پێی فەرموو: تۆ(رجیم)ی ! واتە: تۆ جارەکی تر ناتوانی بچیەوە جیهانی مەلـەکوتی بـاڵاو رەجـم دەکرێ بە شوحبەکان. کە رۆکێتی خواین و لە تەنی ماددی و ئەتیریك دێن ! ﴿وَلَقَدْ زَيَّنَّا السَّمَاء الدُّنْيَا بِمَصَابِيحَ وَجَعَلْنَاهَا رُجُومًا لِّلشَّيَاطِينِ وَأَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابَ السَّعِيرِ﴾[1]. بڕوانـە (گەردوونناسی) لەوێدا باسکراوە.

شەیتان ووتی: ﴿قَالَ فَبِعِزَّتِكَ لَأُغْوِيَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ إِلَّا عِبَادَكَ مِنْهُمُ الْمُخْلَصِينَ قَالَ فَالْحَقُّ وَالْحَقَّ أَقُولُ لَأَمْلَأَنَّ جَهَنَّمَ مِنكَ وَمِمَّن تَبِعَكَ مِنْهُمْ أَجْمَعِينَ﴾[2]. واتە: بـە شـکۆی تـۆ هـەموویان هەڵـدەفریوێنم(لـە جنۆکـە و مـرۆڤ) تـەنیا بەنـدەکانی تـۆ نـەبێ، لەوانـە دڵـسۆزەکان. خـوا فەرمویسوێند بە حەق و حەق دەڵێم: من دۆزەخ لە تـۆو ئەوانـەی دەبنـەپێڕی تـۆ پڕدەکـەم لـە هەموویان.

بەڵێ هەر لەوکاتەوە کێشە لە نێوان حەق و ناحەقدا و، ئایدی ڕاسـت و ئایـدیای ناڕاسـتدا سـەری هەڵدا.

ئەمەش پێچەوانەی مەزهەبە گەردوونیەکانە وەکو زانای ئەڵمانی(ماکس میلەر) پێی وایـە سەیرکردنی گەردوون و دیاردەکانی بۆ یەکەم جـار هەسـتی ئـاینی ورووژانـد. وەکـو دەبیـنین لـە توێژینەوەی(ڤیدا vedas) دا کە پەراوی(بەراهەمی) یەکانە نـاوی خواکانیـان ئاسمـان و ئـاگرە. پێچەوانەی ڕای مەزهەبی سروشتی ناوێزەی دژوار وەکو(جیڤۆنس) زانای ئینگلیزی بـڕوای وایـە ، کارەساتە ئاسمانیەکان وەکو: هەورە تریشقە و گەردەلول و لافاوو بومەلەرزە و خۆر و مانگ گیران هەستی دینی ورووژانـدووە و پەیـدا کـردووە. یـان هەیـە پێـی وایـە(دیـن) پەیـدابووی هۆکـارە کۆمەڵایەتیەکانە وەکو(دورکایم).

ئەمە پێچەوانەی ڕای زانایانی وەکو(سپنسر) و (تیلۆر) و (دورکایم)ە کـە بیروڕایـان وایـە: ئاین لە شێوەی ئەفسانەو بت پەرستی دا دەستی پێ کردووە. ئەنجا گەشـەی کـردوو،، وەچـە لـە

---

(١)الملك:٥.

(٢) ص:٨٢-٨٥.



دوای وەچە هاتووە بووە بە ئاینی یەکتا پەرستی.

بەڵام زانایانی وەکو(لانج) و (شریدەر) بڕوایان وایە یەکتاپەرستی بنەڕەتەو دوایی شێوازی بت پەرستی و ئەفسانەیی وەرگرتووە، ئەوەتا ئارییە کۆنەکان و هۆزە نەزانەکان لە ئوستراليا و ئەفریقیا و ئەمریکا دا بڕوایان بە خوای باڵادەست هەیە. [1].

بەوپێیە یەکەم (ئاین) یەکتاپەرستی بوو، ئادەم یەکەم پێغەمبەر و خەلیفەی خوا بوو لە زەوی دا، شەیتان یەکەم کەس بوو غەیری ئاینی ئەوی هەڵبژارد و سەرپێچی خوای کردو، داهاتوو ئەو ئاینەی بت پەرستی و ئەفسانەیی بە ئیماکانی خستە هەست و نەستی ئادەمی یەکانەوە. لەوانە(شەیتان پەرستی). کە دوای یەکتاپەرستی کۆنترین ئاینە. یەکەمجاریش لە کوردستاندا لە ناو کورانی (قابیل) دا دورست بوو، ئەو قابیلەی بە وەسوەسەی شەیتان(هابیل) ی برای شەهید کرد. (زانای گەورەی ئەڵمانی ناودار فون هامر) دەڵێ: (شەیتان پەرستی یەکێکە لە ئاینەکانی کۆنی کوردە دێرینەکان، تا ئێستاش گروپێ لەوانە ماون بەناوی یەزیدیەکان) [2].

یەزیدییەکان شەیتان بە (مەلەکە تاوس) ناو دەبەن، ئەو براوەو سەرکەوتوو دەزانن لە ناو فریشتەکاندا، چونکە وتی: من تەنیا کوڕنوش بۆ یەزدان دەبەم. بۆیە خوا کردی بە سەرۆکی فریشتەکان. هەموو ئەوانەش لە(بابل) دا بوو لە(سنجار).

تا لە سەردەمی(نوح) دا(ﷺ) خەڵکی دۆڵی دوزێ پەرستنی تریان دا هێنا لە بت پەرستیەکان وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿وَقَالُوا لَا تَذَرُنَّ آلِهَتَكُمْ وَلَا تَذَرُنَّ وَدًّا وَلَا سُوَاعًا وَلَا يَغُوثَ وَيَعُوقَ وَنَسْرًا﴾[3].

(ابن ابی حاتم) لە(یعقوب) ئەویش لە(ابی المطهر) گێڕایەوە، وتی: لای پێشەوا(ابی جعفر الباقر)- علیه السلام – بوم باسی(یزید بن المهلب) کرا، ئەو نوێژی دەکرد، کاتێ نوێژی تەواو کرد، فەرموی: باسی(زید بن المهلب)تان کرد، بەڵام ئەو لە خاکێکدا کوژرا کە غەیری خوای بۆ

---

(١) بڕوانە کتێبی (الدین، د: محمد عبدالله دراز)سودمان لەو وەرگرتوە.

(٢) امارة بهدینان الکردیة، صدیق الدملوجی، ل:٦٧.

(٣) نوح:٢٣.

یەکەم جار تێ دا پەرسترا. وتی: ئەو باسی (ود)ی کرد و فەرموی: پیاو چاکێ بوو لای گەلەکەی خۆشەویست بوو، کاتێ وەفاتی کرد، خەلکی لە خاکی بابلدا لە دەوری دا خلۆەیان کێشاو مانەوەو دەستیان بە خواپەرستی کرد، زۆر بۆی پەریشان بون، کاتێ ئیبلیس بینی ئەوانە پەرۆشیانە، لە شێوەی پیاوێکدا خۆی بە لەش کرد وتی: من ئاگاداری پەرێشانی ئێوەم بۆ ئەو پیاوە، ئایا رازین وێنەیەکی ئەوتان بۆ بکێشم، لە کۆڕی خۆتاندا دایبنێن و یادی بکەنەوە؟ دوای ئەوە پێ ی وتن: ئایا پەیکەری ئەوتان بۆ بکێشم کە لە ماڵی هەمووانتان دابێ و یادی بکەنەوە؟ وتیان: بەڵێ. ئەنجا پەیکەری ئەوی بۆ کێشان کە لە هەموو ماڵێکدا پەیکەرێکی ئەو هەبێت و یادی بکەنەوە. کاتێ وەچەکانی ئەوان هاتن و باب و باپیرانیان ئاوا بینی و بیریان لەم بارەکردەوە تا وای لێهات نەوەکانیان بیکەنە خوداو بیپەرستن. یەکەم(بت) کە پەرسترا دوای خودا ئەو بتەبوو ناویان نا(وەد) [1]. وە خودا دەیان پێغەمبەری لەم ناوچەیەدا نارد بۆ گێرانەوەی بیری یەکتاپەرستی و نەهێشتنی بیری بت پەرستی وەکو: (ئیدریس ، نوح، ئیبراهیم، زەردەشت، یونس و.... هتد). دوای ئادەم یەکەم پێغەمبەر لە خاکی(بابل)دا واتە: کوردستاندا(شیت) بوو کە بارەگای پیرۆزی لە نەینەوایە. [2].

## ١٩٠- چۆن ژیان لە میزوپۆتامیاوە بە کیشوەرەکانی تر گەیشتوە؟

ڕابردوو باسمان کرد کە(زانایانی وەکو(تیلور -١٩١٠) و(سنیدار / ١٨٥٨ ) (فیجنەر-

(١) قصص الانبیاء/ ابن کثیر/ ل:٧٣.

(٢) تێبینی: روحەکان لە روحە پاکەکان وەکو فریشتەکان و روحی مردوان و جنۆکەکان دەتوانن خۆلەش بکەن و، لە کاتی خەون و ئیلهامدا خۆیان دەربخەن. ئەمەش بە هێواش کردنەوەی لەرە لەری خێرایی لەشی ئەتیریان دەبێ تابتوانن خۆیان بەرجەستە بکەن و ببینرێن. خوا لە راستە(الروح) دەفەرموێ﴿فَأَرْسَلْنَا إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا﴾ مریم:١٧. واتە گیانی خۆمان نارده لای مەریەم خۆی لە شێوەی پیاوێکی تەواودا لەش کرد. یان(جبریل) بە زۆری لە شێوەی(دحیة الکلبی) دا خۆی پیشانی پێغەمبەرمان(ﷺ) داوە. یان پێغەمبەر(ﷺ) لە ڕاست خۆبە لەشکرکردنی خۆی فەرمویەتی: ( من رانی فی المنام فسیرانی فی الیقظة، فان الشیطان لا یتمثل بي) متفق علیه. واتە کێ منی لە خەوندا بینی ئەوە وەکو ئەوە وایە لە بێداری دا منی بینیوە چونکە شەیتان ناتوانێ لە شێوەی من خۆی بە لەش بکات.

١٩١٤) ئاماژەیان بە خزینی کیشوەرەکان (زحزحە القارات) کرد/ فیجنەر سالّی(١٩١٤) کتێبی(دورست بوونی کێشوەرەکان و ئوقیانوسەکان)ی بلاّوکردەوە. لەم کتێبەدا باس دەکات سەرەتا زەوی یەك کیشوەر بووە بە ناوی(پانجیا-pangaea) و یەك ئوقیانوسی گەورە دەوری داوە. پاشان بە هۆی خزینی کیشوەری ئەم حەوت کیشوەرانە دورست بوون. چۆن ژیان لە میزوپۆتامیاوە بە کیشوەرەکانی تر گەیشتووە ! قورئان لە راست ئەمە فەرمویەتی: ﴿وَمِنَ الْأَرْضِ مِثْلَهُنَّ﴾ [1]. یان ﴿وَالْأَرْضِ ذَاتِ الصَّدْعِ﴾[2]. بێگومان ئەم خزانە هەر بەردەوامە.

(ابن عباس) دەفەرموێ: (الارض سبعة اجزاء فستة اجزاء منها يأجوج و مأجوج، وجزء فيه سائر الخلق) رواه نعيم بن حماد/ الفتن/ ١٦٢٥.

واتە: زەوی حەوت پارچەیە، شەش لەوانە یەئجوج و مەئجوجە شەش پارچەی هەیە، بەشێکیشیان هەمور بە بەشەکانی تری لێ یە لە دورست کراوان.

## ١٩١- ( شوێنەوار زانی ) بەردینەکان ( المتحجرات ) :

زانستی چالّینەکان الاحافیر) یان بەردینەکان(المتحجرات) لە چەندان ئایەتی قورئاندا ئامازەیان بۆ کراوە لەوانە ئایەتی(العنكبوت:٢٠) کە(خیر شاهین) هێناویەتەوە﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ ثُمَّ اللَّهُ يُنشِئُ النَّشْأَةَ الْآخِرَةَ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[3].

واتە: بلّێ: برۆن بە زەویدا سۆراغ بکەن و بروانن چۆن ژیاون دەستی پێ کردووە، پاشان دورستکردنی دوایی دەستی پێ دەکاتەوە، بەراستی خوا بەسەر هەمور شتێکدا بە توانایە؟

(دایناسۆرەکان) بەر لە ملیۆنەها سالّ قریان تێ کەوتووە، چۆن مرۆڤ ئەمەی زانی و پەی بە سیفەتەکانی ئەوان برد؟

وە خوداوەند زۆر شارستانیەتی و گەل و هۆزو ژیانی لە ناوبردووە، گەل و ژیانی تری

---

(١) الطلاق:١٢.

(٢) الطارق:١٢.

(٣) العكنبوت:٢٠.





داهێناوە لە زەویدا:

﴿إِن يَشَأْ يُذْهِبْكُمْ أَيُّهَا النَّاسُ وَيَأْتِ بِآخَرِينَ وَكَانَ اللّهُ عَلَى ذَلِكَ قَدِيرًا﴾ [1]. واتە: گەر خوا بیەوێ ئەی خەلکینە نێوە لە ناو دەبات و خەلکی نوێ دوروست دەکاتەوە﴿ وَكَمْ قَصَمْنَا مِن قَرْيَةٍ كَانَتْ ظَالِمَةً وَأَنشَأْنَا بَعْدَهَا قَوْمًا آخَرِينَ ) [2]. واتە: زۆر شارو دێهاتمان لـە نـابرد کـە ستەمکار بوون دوای ئەوان گەلی ترمان هێنان.

وە قورئان ئاماژە دەکات بە شوێنەوار زانی و هانمان دەدات بـۆ گـەڕان بـە شـوێنیاندا کـە چەند نەهێنیان لە ڕاست مێژوی ژیان هەلگرتووە: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ وَثَمُودَ الَّذِينَ جَابُوا الصَّخْرَ بِالْوَادِ وَفِرْعَوْنَ ذِي الْأَوْتَادِ الَّذِينَ طَغَوْا فِي الْبِلَادِ فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ فَصَبَّ عَلَيْهِمْ رَبُّكَ سَوْطَ عَذَابٍ﴾ [3].

لێرەدا قورئان دەفەرموێ: (أَلَمْ تَرَ) ئایا نابینیت؟ لێرەدا خوداوەند هانمـان دەدات سـۆراغی ئەو شوێنەوارانە بکەین، کە سروشتی خوا ئاماژەی بۆ کردون، تا زیاتر دلنیا بین لـە ڕاسـتی ئـەم هەواڵە مێژوویی یانە کە قورئان باسی کردوون و، شوێنەوارەکان زیاتر دلنیاییت پێ دەدەن !



﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ﴾[4]. واتە: ئێمە مردوان زیندوودەکەینەوە و کارو کردەوەو شوێنەواریان دەنوسین. بەلێ خوای مەزن هەموو مێژووی خۆی لە سروشتدا نوسیوە، هەروەها لە زەوی دا، لە تابلۆدێرینەکاندا، لـە نامـەی

(١) النساء:١٣٣
(٢) الانبياء:١١
(٣) الفجر:٦-١٣.
(٤) يس:١٢.





ئاسمانی دا، کە مرۆڤی پسپۆر دەتوانێ دوای سۆراغ و لێکۆلینەوەیان بیانخوێنێتەوەو تێ یان بگات و سودیان لێ وەربگرێت. ئەنجا خواوەند هەموو شتێکی لە(لوح المحوظ)دا تۆمار کردووە، کە مرۆڤ لە دنیای واتاو نەستدا پەیان پێ دەبات، یان دنیای(نەست- اللاشعور) کە لە کاتی نوستندا بێدارە، غەزالی عەللامە دەلێ: (دڵ دوو دەرگای هەیە، یەکێ بۆ خەونەکانە، دەرگای دووەم هەستەکان دادەخرێت، دەرگای دەروونی و ناخی- الباطن- بۆ دەکرێتەوە، شتی پەنهانی بۆ لە جیهانی مەلەکوتی و لەوحی مە حفوظدا ئاشکرا دەبێ وەکو روناکی دەبێت، هەندێ جار خەونەکەی پێویستی بە لێکدانەوە دەبێت.[1].

ئەنجا زەوی لە رێگای هالەی موگناتیسی مرۆڤەوە هەموو شوێنەوارو قسەکان و جوڵەکانی تۆمار دەکات و قەت ون نابن و رەش دەبنەوەو لە کاسێتی زەوی خەزن دەبن و وەکو تابلۆیەکی پارێزراو دەمێنێتەوە.

(هنری کرایس) و (ولیم دیک) ئاماژە بە دوروست کردنی ئامێرێکی نوێ دەکەن بە ناوی(ئامێری زەمەن- اله الزمن) کە پرۆفیسۆری روسی(ئەجنادی سێر جین) دایهێناوە. ئەم دوو رۆژنامەنوسە دەگێرنەوە: (لە رۆژی دوایی دا دیمانەیێکمان هەبوو لەگەڵ دکتۆر ئەجنادی سیر جین کە لە رێگای تەلەفۆنەوە هەواڵی دا ئەو دەیەوێ لە رێگای دیداری ئەودا دەزگای ئامێری زەمەنیان پیشان بدات.... پاشان بۆ حاڵی بوون لە ئیشی ئەم ئامێرەو چۆنیەتی کار کردنی نمونەیەکی سادەی بۆ هێنانەوە: وابزانە منو ئێوە کێشەیەکی عاتفی و سۆزیمان هەیە، بالاوەکیش بێ ئەوە عاتفی یە، کاتێ ئێمە ئەو شوێنە بە جێ دەهێڵین ئەو کێشە عاتفی یە وامان لێ دەکات شوێنەواری لە دوای خۆمان بە جێ بێڵین، کە ئێوە ناتوانن بیبینن یان هەستی پێ بکەن، یان بۆنی بکەن، یان بیبیستن، بەڵام گومان لەوەدا نیە لە روی تیوری یەوە پێویستە هەمیشە ئەو شوێنەوارە لە وێ دا بمێنێتەوە. مرۆڤ شوێنەواری خۆی لە دەوروبەری دا بە جێ دێڵێ، چونکە ئێمە هەمیشە وزە و روناکی دەبەخشین، ئەو وزەیەش لە دەوروبەرماندا دەمژرێ و عەمبار دەکرێت، ئەم وزەیەی دەورپشتمان هەرگیز لە ناو ناچێت، بۆیە شوێنەواری وزەمان هەتا هەتایە

(١) کمیاء السعادة، مجموعة الرسائل الامام الغزالي، ابراهیم امین احمد، ل:٤٥٣.

دەپارێزرێ لە ناو شتەکاندا، سەرباری شوێنەواری ئەو کەسانەی لەم ژورەیەدا هەنە.

بە کورتی ئەوەی من کردوومە گەشەپێدانی ئامێرێکە بلوری شل بەکاردێنێ، ئەو بلورەی لە سەعاتە نوسراوەکاندا بە کاردێنرێت، بە مەبەستی تاووتوێ کردن و ڕونکردنەوەی ئەو وزەیە کە بەسەر رووی تەنەکانەوەیە، ئەو دەتوانێ بیرەوەریەکانی رابردوو تۆمار بکات و لە شێوەی تریەی ئەلیکترۆنی دا بیان گێریتەوە، کە لەو تەنەدا عەمبار بوون[1]. بەڵێ خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا﴾[2].

واتە: لە پەسلاندا زەوی هەواڵی خۆی دەگێڕێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرموی: (فان اخبارها ان تشهد على كل عبد وامة بما عمل ظهرها...)رواة الترمذی/ حسن صحيح. واتە هەواڵی زەوی ئەوەیە شاهیدی لەسەر هەموو کەسێك دەدات کە کردەوەی لەسەر کردووە.

پاشان ئیمرۆ(شوێنەوارەکان) لە جیهاندا بونە جێگای ڕامان و وردبوونەوەی زانایان، ئەم سەرنج و ڕامانە وای کرد لقێکی زانستی تازە بکەوە بە ناوی شوێنەوارزانی ، بۆ لێکۆڵینەوە لە ئاسەوارە مێژوویەکان و تاووتوێ کردنیان تا هەواڵی گەلانی رابردوو شارستانی یەکانیان تێ بگەن، ئەم دۆزراوە ئاسەواریانەش، بە تایبەتی تابلۆ دێرینەکان کە بەخەتی بزماری کۆنی ئەو گەلانە نوسرانەوە خزمەتێکی گەورەیان بە مێژوو کرد، لەوانەش مێژوە ئیعجازییەکان کە قورئان بەر لە دۆزینەوەی ئاسەواری زۆری لە گەلان و کەسایەتیە ناودارەکانی مێژوو ئامارەی بە بونی کردوون، ئەنجا مرۆڤی هانداوە سۆراغی شوێنەواریان بکەن، تا ببێ بە پاڵپشتێ بۆ ئیعجازە شوێنەوارییەکانی قورئان و سوننەت. ئەمانەش بەشێکن لەم ئیعجازە شوێنەواریانە:

## ١٩٢- شوێنەواری نوح و بەردینەکان لە کوردستاندا

بێگومان دوو شوێنەواری گەورەی(نوح) (ﷺ) دۆزرایەوە لە کوردستاندا﴿وَاسْتَوَتْ عَلَى الْجُودِيِّ﴾ واتە کەشتیەکە لەسەر جودی نیشتەوە، کە چیایەکی کوردستانی یە، سەر بە زنجیرە

(١) الباراسايكولوجى سر من اسرار الدولة/ هنرى كرايس و وليم ديك/ ت: منير يوسف زينل/ ل:١٢٨/ بغداد/ ١٩٨٩
(٢) زلزلة:٤.




چیای ئەراراتە(٢٣٠٠)م بەرزە.

لە ساڵی(١٩٤٨) شوانێکی کورد بە ناوی(رەشید سەرحان) پارچەیەکی کەشتی یەکەی دۆزییەوە، کە ژێر قورو لیتە کەوتبوو. بەپێ ی لێکۆڵینەوەکانی(د: رالف سولسکی) لەسەر ئەم تەختانە بە هۆی کاربۆنی تیشکدەر تەمەنی ئەم تەختانە بۆ(٤٥٠٠پ.ز) دەگەرایەوە.

وەکو(د: زغلول) باسی کردووە، رابردوو باسمان کرد[1]. وە زۆر تابلۆ دۆزرانەوە لە ناوچەی کوردستان کە ئاماژەی بە کورد و لافاوی نوح بکەن ، وەکو تابلۆکانی سروشتی نوح، کە ئینگلیز لە کاتی داگیر کردندا دۆزیوینەوەو، ئێستا لە مۆزەخانەکانی بەریتانیان و بەپێ ی لێکدانەوەکانی(تقی عابد) بەخەتی بزماری کوردی سۆرانی کۆن نوسرانەوە.

دووەم:دۆزینەوەی تابلۆکانی(گلگامش)ە لە نەینەوا، کە ئێستا لە مۆزەخانەی(ئەشمولیانە) لە لەندەن. بروا وایە لە(عین سینا) کە گوندێکە لە شارۆچکەی شێخان ئەم کەشتی یەی دورست کردووە [2]. وە وشەی(سینا) لە قورئانیشدا هاتووە. هەرچی تابلۆکانی گلگامشە زانایانی خەت ناس پێیان وایە بە زمانی ئارامی نوسرا بێتەوەو هەرکەسە بە ئارەزووی خۆی لێکی داونەوە، بەڵام لێکدانەوەکان زۆر لە راستیەوە دورن.

بۆ یەکجار(جۆرج سمث) کە لە مۆزەخانەی بەریتانیا دا کاری دەکرد تاووتوێ ی ئەم تابلۆیانەی کرد لە نەینەوا دا دۆزراونەوە و، باس لە داستانی گلگامش دەکات، ئەنجا لافاوی نوح باس دەکات کە جیهانی وێران کردوە، بەشێ لەو تابلۆیانە هێشتا بزرن[3]. وەکو باسکرا.

ئەنجا زۆر شوێنەوار لە کوردستاندا دۆزراونەوە لەوانە ئەشکەوتی شانەدەرو زاوی جمی گردەچاڵ. لە ناو ئەشکەوتی شانەدەر ئێسق و روفاتی مرۆڤی نیاندرتاڵی تێدا دۆزراونەتەوە. شوێنەواری مرۆڤی بەر لە(٥٠-٧٠) هەزار ساڵی تێدا بینراوەتەوە. وەکو باسکرا.

سەرباری دۆزینەوەی شوێنەوارەکانی چەرخی بلاستوسینی لە کوردستاندا وەکو(گەلاڵە و

---

(١) مدخل الى دراسة اعجاز العلمي، د: غلول، ل:٢٥١.

(٢) هاونەتەوەیی قەومی کورد و ماد، حبیب الله تابانی، ب٢ ، ل:٣٣٩.

(٣) بروانە(الانسان وقواه الخفية، كولن ولسن/ ل:١٠٢-١٠٣.







روباری ڕواندزو برادۆستو هەلگورد وجیلوداغ) کە پرۆفیسۆر(هـ. أ . رایت) لە کتێبی(اثار العصر الجلیدی البلاستوسینی فی کوردستان) دا باسی کردووە. وە(ج . ار . دایڤەر) لە کتێبی(الکرد فی المصادر القدیمە) زۆرێ لەو سەرچاوەو تابلۆیانەی باسکردووە کە باس کورد و کوردستان و جودی دەکەن. دەنوسێ: (کۆنترین) باس کە ناوی کوردی تێدا هاتووە لە تابلۆ دێرینە قوربینەکانی سۆمەریدا دۆزراونەتەوە، کە بۆ سێ هەزارەی بەر لە زایین دەگەرێتەوەو ناوی خاکی کاردۆ(قاردا) هاتووە(land karda) ، (qarda) . وەکو باسکرا.

(ارشاك سافراستیان) ئاماژە دەکات کە جودی یەکان یان گوتی یەکان یان کوردەکان(١٢٤) ساڵ و(٤٠) ڕۆژ حوکمی(بابل) و ئەکەدیان کردووە، لە میان(٢٢٦٤-٢١٣٧پ.ز) دا و(٢١) شای گۆتی هاتوونە سەر کورسی[١] .

تا بڕوا وایە وەکو(تقی عابد) لە تاقی کردنەوەکانی خۆی بۆی دەرکەوتووە

(١) الکرد و الکردستان / ت: د: احمد محمود الخلیل/ ل:٣٧.





تابلۆکانی(حەمورابی) یاساکانی حەزرەتی ابراهیم خلیلە، نەك حەمورابی کەسایەتی یەکی دیاری کراو بێت. حەمورابی واتە: (هەموڕابن). ئەم راستی یانە لە رۆژنامەی(العرب/ ٥/ ١٩٩٠) دا هاتوون، کە لە ڕابردوو ئاماژەمان بۆ کردن. بە پێ ی ئەو تابلۆیانە ئادەم لە ڕواندز بووە لە(دار السلام). وە ئیبراهیم جاف بووەو ژنەکەی هەورامی بووە. ئێستا شوێنەواری لە دۆڵنارانە لەلای سەروچاوەی سەر بە رانیە.

## ١٩٣- شوێنەواری ( عاد ):

قورئانی پیرۆز فەرمویەتی: ﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ﴾ (١).

واتە: نەت بینی پەروەردگارت چی کرد بە گەلی عاد. ئیرەمی خاوەن ستون. کە وێنەی ئەوان لە ولاتدا دورست نەکرابوو.

لێرەدا قورئان ئاماژە دەکات(ئیرەم) خاوەنی کۆشکی بلند بوون، ئەستونی گەورەو بێ وێنەیان بۆ دامەزرێنراوە.

ئاماژە دەکات ئەو گەلە کۆشکی بەرزیان هەبووەو خۆش گوزەران بوون: ﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ آيَةً تَعْبَثُونَ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ﴾(٢).

**واتە: ئایا لە هەموو بەرزایی یەکدا بالاخانەیەك ڕاست دەکەنەوە بۆ هەولو ئارەزووەکان و خۆشگوزەرانی. وە تەلارەکان توند و تۆڵ دەکەن شایەد بمێننەوە؟**

ئەنجا قورئان ئاماژە دەکات ناوچەی عاد و سەمود باخچەو دارستانۆ کانی و رووبار بووە: ﴿وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ﴾ (٣). **واتە: لەو خوایە بترسن** ئەو بەهرانەی پێ ی دان کە خۆتان دەزانن. بەهرەکان و منداڵی پێدان. وە باخچەو کارێزەکان. وە

---

(١) الفجر:٦-٧-٨.

(٢) الشعراء:١٢٨-١٢٩.

(٣) الشعراء: ١٣٢-١٣٤.

**ناماژەی** کردووە خودا بە گەردەلول و ڕەشەبا ئەم گەلەی لەناوبرد خاکەی ویران کرد، ئەم **گەردەلولەش** خاك و لمی هەلگرتبوو دەوڵەتەکەی ژێر لم کردن﴿وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَانِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَى كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ فَهَلْ تَرَى لَهُم مِّن بَاقِيَةٍ﴾[1].

واتە: بەڵام عاد بە بایەکی بەهێزی گەرم لە ناوچوون. حەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەردەوام بووبە سەریاندا کە بای(حسوم) بوو، خەلکەکەت دەبینی وەکو لقە دارخورمایەکی گەندەڵ مردوون. ئایا شوێنەواریان دەبینیت؟!

لە گەردووناسی دا باسی بایەکان و بای(حسوم) کرا.

بڕوا وایە گەلی(هود) لە(ئەحقاف) نیشتەجێ بووبن، کە خاکێکی لماویە وە مێژوونوسان دەڵێن: لە میان یەمەن و عوماندایە.

وە بروا وایە یەکەمجار لە شوێنەوار زانان(نیکولاس کلاب) ئەم شوێنەوارەی دۆزیەوە. بۆ سەلماندنی بونی شاری(عوبار) دوو ڕێگای بەکار هێنا، یەکەم ئەم شوێنەوارانەی بابای دەشتەکی باسی کردوون هەنە، ئەنجا داوای لە ئاژانسی ناسای ئاسمانی کرد بە مانگی دەستکرد وێنەی ناوچەکە بگرێت. دووەم: پشتی بە نەخشەی(بەتلمی) ساڵی(٢٠٠ز) بەست.

(د: زارینز) کە یەکێکە لە ئەندامانی شاندی لێکۆلەرو پێشڕەوی چالێنەکە بوو وتی: (ستونە قەبەکانی نیشانەیەکی شاری عوبارن، شاری ئیرەمیش کە لە قورئاندا باسکراوە کە خاوەنی ستونی گەورەیە باشترین بەڵگەیە کە ئەو شارەی دۆزراوەتەوە شاری ئیرەمەکە لە قورئاندا **هاتووە**﴿إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ﴾.

ئەو شارە کە لە قورئان باسکراوە بە ناوی(ئیرەمiram) دورست کراوە تابێ وێنەبێ، یان وەکو وتراوە بە قاسیدی بێت.

لە یۆلیۆ(١٩٩٠) ئاژانسی ئاسمانی ئەمریکی(nasa) یەکێ لە مانگە دەست کردەکانی وێنەی ژمارەیەکی زۆر جۆگەو بەربەستی کۆنی گرت کە بۆ ئاودێری بەکار هاتووە لە ناوچەی

---

(١) الحاقة:٦-٨.



گەلی (عاد)دا کە توانای هەبووە ناوی(٢٠٠٠٠٠) هەزار کەس دابین بکات، دیـــان وێنـــەی دوو روباری وشکی گرت. تۆرماگە مێژوویی یەکان ئەوەیپیشان دەدەن ئەو ناوچانەی ئیرەم یـان ناوچـەی گەلی عاد خاکێکی بە پیت و بە ئاو بووە. بەڵام توشی گـۆڕانی کـەش و هـەوا بـووەو بـووە بـە بیابانەکی ڕوت. قورئانی پیرۆزیش بەر لە(١٤٠٠)ساڵ ئەمەی فەرمووە.

هۆکاری لە ناوچوونی ئـەم شارسـتانی یـەش گۆڤـاری(aminteyesse) فەرەنسـی ڕونـی کردۆتەوە، کە شاری(ئیرەم) یان(عوبار) توشی گەردەلولی لمی گەورە هاتووە و شارەکەی بە چـینە لمێك داپۆشیوەو ئەستوریەکەی گەیشتۆتە(١٢)م. ئەمەش بە ڕاست دانەری ئەم ئایەتی قورئانیەیە کە باسمانکرد. یان﴿فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي أَيَّامٍ نَّحِسَاتٍ لِّنُذِيقَهُمْ عَذَابَ الْخِزْيِ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَلَعَذَابُ الْآخِرَةِ أَخْزَى وَهُمْ لَا يُنصَرُونَ﴾[1].

ئایا کێ ئەمەی بە پێغەمبـەر(ﷺ) گوتـووە، کـێ بەسـەرهاتی عـادی پـێ وتـووەو کـێ ناوچەکەی کت و مت لە(الاحقاف) دا بۆ دەست نیشان کردووە. لەناو ئـەو ناوچـە لمارییـە دا کـە شوێنەوارەکانی گەلی عاد، لە قورئاندا بە(ارم) هاتووە بۆ(٣٠٠٠پ.ز) دەگەڕێتەوە[2].



## ١٩٤-١٩٥- شوێنەواری فیرعەون و (هامان)

لە قورئـانی پـیرۆزدا لـە چـەند شـوێنێکدا باسی شارستانی میسری و فیرعەونی دەکات، کە ئیمرۆ شـوێنەوارزانان زۆرێ لـەو راسـتی یانـەیان سەلماندووە، قورئان ئاماژەی بۆ کردوون. وەکو:

(١) ئەهرامەکانی فیرعـەونیـەکان﴿وَفِرْعَوْنَ

(١) فصلت:١٦

(٢) بۆ زانستی پتر بروانە(الارض / د: زغلول النجار/ ل: ٦٠٣-٦١٦، و(ایات الاعجاز العلمی/ عبدالرحمن سعد صبي الدين/ ١١٦-١٢٥.

**ذِي الْأَوْتَادِ﴾**[1]. واتە فیرعەونەکان خاوەن میّخ، یان قوچەکی. وەکو خوا فەرمویەتی: ﴿**وَالْجِبَالَ أَوْتَادًا**﴾. رابردوو باسی ئەهرامەکان کراوە، کە یەکێکن لە شتە سەرسوڕهێنەرەکانی مێژووی جیهان.

(۲) قورئانی پیرۆز دەسەلاتدارانی میسری کۆن بە(فرعون) ناو دەبات لە(۷٤) شوێندا دوبارە بۆتەوە، کەچی لە سورەتی یوسف دا بە(الملك) ناوی بردون واتە: (پادشا) و﴿وَقَالَ الْمَلِكُ إِنِّي أَرَى سَبْعَ بَقَرَاتٍ سِمَانٍ يَأْكُلُهُنَّ سَبْعٌ عِجَافٌ وَسَبْعَ سُنْبُلَاتٍ خُضْرٍ وَأُخَرَ يَابِسَاتٍ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ أَفْتُونِي فِي رُؤْيَايَ إِن كُنتُمْ لِلرُّؤْيَا تَعْبُرُونَ﴾[2].

لە کۆتایی یەکانی سەدەی نۆدا(شامپلیۆن)ی فەرەنسی توانی لە ڕێگای هەڵهێنانی هێمایێکدا لە نوسینی (هیمۆگلیفنی)دا بیسەلمێنێ یوسف پێغەمبەر(ﷺ) لە میسر دا لە سەردەمی پادشا(هەکسوس)دا ژیاوە لەمیان(۱۷۳۰-۱۵۸۰ پ.ز)[3].

(۳) یەکێکی تر لە نهێنی فیرعەونەکان و شارستانیەکەیان، کە قورئان ئاشکرای کردووە باسی(هامان)ە، (د:موریس بوکای) دەڵێ: (قورئان باس لە ناوی(هامان)یّ دەکات کە لە دەستەو دائیرەی فیرعەونە، داوای لێ دەکات کۆشکێکی بۆ دورست بکات زۆر بەرز بێ کە بتوانێ وەکو بە گەمەپێ کردنی بە موسا دەڵێ دەستی بگاتە خوای ئەو. ویستم بزانم گەر ئەم ناوە پەیوەندی بە ناوی هیرۆگلیفی یەوە هەبێ دورنییە لە بروانامەیێک لە بروانامەکانی چاخی فیرعەونی دا تۆمار کرابێ، ڕازیش نەبوم بە وەڵامی ئەمە گەر چاوگەکەی پیاوێك نەبێ جێگای متمانەبێ و عەرەبی زانی باش نەبێت، ئەم پرسیارەم ئاراستەی زانای میسریەکان(egyptologue) کرد، باباێیکی لەبەردەمدا بە زمانی عەرەبی نوسی، من ئەم ویست دەقی واتاکەی بەو بلێم، بەلام ئەوەندەم پێ وت کە ئەم دەقە بۆ سەدەی حەوتەمی زاینی دەگەرێتەوە.

وەڵامی یەکەمی ئەوە بوو ئەم بنەمایە نەگەر نییە، چونکە لە زمانی هیروگلیفی دا ناوێك

---

(۱) الفجر:۱۰.

(۲) یوسف:٤٣.

(۳) موسوعة الاعجاز العلمی /یوسف الحاج/ ٤٢.



نییە، وە ئەو زەنگولێکی هیروگلفی لایە بۆ سەدەی(٧) زاینی دەگەرێتەوە و تائێستا نەزانراوە، چونکە لەمێژە زمانی هیروگلیفی لە یاد کراوە.

بەلام ئامۆژگاری کردم بگەرێمەوە بۆ ناوی ئەو کەسانەی لە ئیمپراتۆری تازەدان(dictionary peysonal names of the new) و لە ویدا هەیە یان نییە. ئەمە گریمان دەکرێ، لە کاتی گەراندا بینیم ئەوەی چاوەرێم دەکرد لەو لیستەیەدا نوسرابوو، ئای لەو قەزاو قەدەرە!

سەرباری ئەوە کارەکەی ئەویشم دۆزییەوە، کە بە زمانی ئەلمانی واتە: (رئيس عمال المقلع)[1].

بەلام بەبێ ئاماژە کران بۆ مێژووی نوسینەکە، بەلام بۆ ئیمپراتۆریەتی سەردەمی(موسی) (ﷺ) دەگەرێتەوە، ئەم کارەی لەو نوسراوە دەری دەخات ئەوەیە ئەو کەسەیە گرنگی بە بیناسازی داوە، دەکرێ بەراورد بکرێ لەگەڵ ئەو فەرمانەی فیرعەون بەسەر هامانی دا دەدات: ﴿وَقَالَ فِرْعَوْنُ يَا أَيُّهَا الْمَلَأُ مَا عَلِمْتُ لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرِي فَأَوْقِدْ لِي يَا هَامَانُ عَلَى الطِّينِ فَاجْعَل لِّي صَرْحًا لَّعَلِّي أَطَّلِعُ إِلَى إِلَهِ مُوسَى وَإِنِّي لَأَظُنُّهُ مِنَ الْكَاذِبِينَ﴾[2].

واتە: فیرعەون وتی: ئەی جەماوەر جگە لە خۆم بە خوای ترم نەزانیوە، **ئەی هامان لە قور خشتم بۆ دورست بکە بیسوتێنە کۆشکێکم بۆ دورست بکە تا سەیری خوای مووسا بکەم**، من وای بۆ دەچم یەکێ بێ لە درۆزنەکان.

(٤) لەم ئایەتەی رابردوو دا ئاماژە بە خشتی قورینی سورکراوە دەکات، لەو ماوەیەی رابردووشدا زانای شوێنەوار زان(بتری) برێك خشتی سورەوەکراوی دۆزیەوە کە گۆرەکانی پێ دورست کراوە، یان کۆشك و بالآخانە و تەلارەکان. ئەم خشتانە بۆ سەردەمی فیرعەونی(رەعمسیس)ی دووەم و(سیتی دووەم) و (مرینتاح) دەگەرێنەوە، کە لە خێزانی(١٩)ی

---

(١) (المقالع) لە (المنجد) دا کۆی( المقلع)ە واتە: کانە بەرد. وەکۆی(المقلاع)ە واتە: هاوێژەر کە ئامێرێکی جەنگی کۆنە، بەردی هاوێشتووە.

(٢) القصص:٣٨.




فیرعەونین(١٣٠٨-١١٨٤پ.ز). لە شوێنێکدا دۆزرانەوە زۆر دوور نییە لە(بی رعمسیس) یان(قەنتیر)، کە پایەتەختی فیرعەونەکانە لە خۆرهەڵاتی دەلتاوە و شوێنەوارێکی ئاسەوارییە[1].

(٥) شوێنەوارێکی تری فیرعەونی مانەوەی لەشی فیرعەونی سەردەمی موسایە تا ئیمرۆ: (د: موریس بوکای) لە کتێبی خۆیدا(القرأن والعلم الحدیث)دا هاتووە چارەنوسی فیرعەونی میسری دوای خنکانی لە دەریادا بەراورد دەکرێ لەگەڵ واقعی ئیمرۆیدا، کە تا ئێستا لاشەکەی وەکو معجیزەیەك بۆ جیهان هەر ماوە: ﴿فَالْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ آيَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ النَّاسِ عَنْ آيَاتِنَا لَغَافِلُونَ﴾[2].

واتە: ئیمرۆ بە لاشەوە رزگارت دەکەین تاببیە موعجیزە بۆ کەسانی دوای خۆت، زۆر کەس لە موعجیزەکانی ئێمە بێ ئاگان.(د:بۆکای) دەڵێ: گێرانەوەی تەورات لە راستی دەرچوونی بەنوئیسرائیلی یەکان لەگەڵ موسادا(ﷺ) لە میسردا بە توندی ئەو رایە پشت راست دەکاتەوە کە(mineptah) جێنشینی(رەمسیس)ی دووەم فیرعەونی میسر بووە لە سەردەمی موسادا. وە تاووتوێ کردنی مۆمیای(mineptah) زۆر زانستی بە سودی لە راست هۆیەکانی مردنی ئەم فیرعەونە بۆ خستینە روو. تەورات باس دەکات کە (لاشەی فیرعەون دەریاکە قوتی داوە، چارەنوسەکەی سەری بە چی دەگات باس ناکات، بەڵام قورئان باس دەکات فیرعەونی نەفرین لێ کراو داهاتوو لاشەکەی لە ئاوەکە رزگاری دەبێ وەکو لە ئایەتی داهاتودا باسی کردووە، توێژینەوەی پزیشکی ئەو مۆمیایە ئەوەی دەرخستووە، ئەم لاشەیە ماوەیێکی زۆر لە ئاودا ماوەتەوە،هیچ نیشانەیەکی پێوە دیار نییە بە هۆی مانەوە زۆرەکەی لە ئاودا بە تەواوی لە ناو چوبێت).خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَلَقَدْ أَوْحَيْنَا إِلَى مُوسَى أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِي فَاضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا فِي الْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَافُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَى فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ بِجُنُودِهِ فَغَشِيَهُم مِّنَ الْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ﴾[3].

---

(١) ایات الاعجاز العلمی/ ل:١١٤-١١٥ سمیرکە.

(٢) یونس:٩٢.

(٣) طه:٧٧-٧٨.

واتەئسروشمان بۆ موسا کرد ، لەگەڵ بەندەکانم کۆچ بکەو برۆ ڕێگـایێکی وشـکیان بـۆ لـە دەریا بکەوە، لەوە مەترسە بە تـۆ بگـەن و مەترسـە لـە خنکـان. ئـەنجا فیرعـەون و سـوپاکەی شوێنیان کەوتن، ئەوەی بەهۆی دەریا توشیان هات.

موریس بوکای دەڵێ: (ئاکامی تۆێژینەوە پزیشکی یەکان هات تاگریمانکاری ڕابردوو پـشت ڕاست بکاتەوە، ئەوە بۆ ساڵی(١٩٧٥)دا کرتە گۆشتێکی بچوکیان لە شانەی ماسولکەیی بـڕی، ئەمەش لە سایەی ئەو یارمەتی یە بە نرخە بوو مامۆستا(michfi durigon) پێشکەشی کرد. ئەو پشکنینە وردە بە میکرۆسکۆب ئەوەی دەرخست بچوکترین پارچەی نوێکاری ماسولکەیی لە پارێزرانی تەواو دایە، ئەمەش ئاماژەیێکە گەر ئەو لاشەیە زۆر لە ئاوەکەدا مابایەوە نەیـدەتوانێ ئاوا بە تەواوی مابایەوە، یان گەر ماوەیەکی درێـژ لـە دەرەوەی ئـاو مابایـەوەو گـورج کـرداری مۆمیـای بـۆ نەکرابایـە. تـاووتوێ ی پزیـشکی شـەرعی ئـەو مۆمیایـە کـرا بـە هاریکاری(ceccagon) بەڕێوەبەری ئاسـنامەی قـەزائی لـە پـاریس و مامۆسـتا(durigon) ڕێگایان پێدابن لە هۆی ئەو مردنە خێرایە بکۆڵێنـەوە کـە بـە هـۆی خـوێن بـەربونی مێـشکی ڕوودەدات، کەللەبەرێکی قەبارە گەورە لە ئاستی دیـوی نـاوەوەی کەللەسـەر دورسـتی **دەکـات،** لەگەڵ کارەساتی شکاند!، هەموو لێکۆلینەوەکان ئەوە ئاشکرا دەکەن، **کە لەگەڵ بەسەرهاتەکانی** کیتابی مرقەدەسدا پێکاو پـێکن، کـە ئامـاژە دەکـەن ئـەم **فیرعەونـە لـە کـاتێ دا دەکەوێتـە** بەرشەپۆلەکان دەمرێت) (١).

هەموو ئەم ڕاسـتی یانـەش شـارەزانەبوون، **تاکۆتـایی سـەدەی(١٩)، کـاتێ** لاشـەی ئـەم فیرعەونە دۆزرایەوەو، تا ئیمرۆش ئەم لەشە گۆڕانی بەسـەردا نـەهاتووە، **شـایانی** باسـە لاشـەی هەموو فیرعەونەکان لە دۆڵێ شاکان لە قەراغی نیلدا بە خاك سپێراون، **لاشەی** ئـەم فیرعـەونەیـە نەبێت !

---

(١) ایات الاعجاز العلمی/ ل:١١٦-١١٧.





## ١٩٦- (شوێنەواری یارانی ئەشکەوت)

رابردوو باسمان کرد یارانی ئەشکەوت(اصحاب الکهف) لە سورەتی (الکهف) بەسەر هاتی مردن و زیندو بونەوەیان باسکراوە، وەکو موعجیزەیەك بۆ زیندو بونەوەی مردوان﴿أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَابَ الْكَهْفِ وَالرَّقِيمِ كَانُوا مِنْ آيَاتِنَا عَجَبًا﴾(١).

هەندێ مێژوو نوس پێیان وایە ئەم بەسەرهاتە لەسەردەمی رۆمەکاندا کە ئەوروپاو ئەمریکای ئیمرۆیە رویداوەو،(قلدیانوس(decius ٢٤٩-٢٥١) حوکمی کردووە، کە پادشایەك بووە لە ولاّتی شامدا. ئەم ئەشکەوتەش ناوی ئەنچەلوس (anchilus)ە لە نزیك(ئەفسوس)دا لە ئاسیای بچوکدا، کە(تەرتوس)ە لە تورکیای ئیمرۆدا. ئەمانە خودا لەگەڵ سەگەکەیاندا(٣٠٠) ساڵی خۆری و (٣٠٩)ساڵی مانگی دەمرن و خوا زیندویان دەکاتەوە. دوای مردنەود موسڵمانان وەکو پەرستگاییك و رێزێك مزگەوتیان لەسەر دەکەن: ﴿قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَى أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا﴾(٢).(٣)

کەچی شوێنەوارزانی ئەردەنی(رفیق وفا الدجانی) لە ساڵی(١٩٦٣ز)دا رای گەیاند کە ئەم ئەشکەوتەیە دەکەوێتە ناوچەی(الرجیب) لە ئەردەن دا. لە ناو ئەو ئەشکەوتەیەدا هەشت گۆڕو

(١) الکهف:٩.

(٢) الکهف:٢١.

(٣) الاعجاز الطبی في قصة اهل الکهف/ د:مروان رفاعی/ ل:٩.




کەللەی سەگێ دەدۆزرێتەوە[1]. بەڵام تا ئێستا بە تەواوی ڕون نەبۆتەوە لە کوێ ئەوانە ژیاون و لەکام ئەشکەوت بوون.

وە لە قورئاندا باس لە چەند کەسێك دەکات کە مردوون و زیندوبونەوە، یان زیندوبونەوەیان پیشان دراوە، وەکو(موسا) و ئەو کەسانەی لەگەڵی دابوون لەسەر کێوی سینا کە داوای بینینی خوایان کرد﴿ثُمَّ بَعَثْنَاكُم مِّن بَعْدِ مَوْتِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ﴾[2]. یان موسا(ﷺ) وەکو لە ڕوداوی مانگای جولەکەکاندا هاتووە بە کلکی مانگا مردوێك زیندو دەکاتەوە: ﴿فَقُلْنَا اضْرِبُوهُ بِبَعْضِهَا كَذَلِكَ يُحْيِي اللّهُ الْمَوْتَى وَيُرِيكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ﴾[3].

دیسان عیسا، یەکێ لە موعجیزەکانی زیندوکردنەوەی مردوان بووە. وە حەزرەتی ئیبراهیم لە کوردستاندا لە بیتوێن(دۆڵناران- فدان ئارام) داوای لە خوا دەکات بۆ گەیشتن بە دڵنیایی لە بڕوادا زیندوبوونەوەی مردوانی پیشان بدات﴿رَبِّ أَرِنِي كَيْفَ تُحْيِـي الْمَوْتَى﴾[4].

یان عوزێر پێغەمبەر کە گۆڕەکەی لە(هەولێر)ە خوا بە خۆی و کەرەکەی لە سەردەمی نەبوخدنەسردا(١٠٠) ساڵی دەمرێنێ و زیندوی دەکاتەوە، وەکو لە سورەتی(البقرە:٢٥٩)دا بەسەرهاتەکەی گێڕاوەتەوە.

(ابن عباس) و (عکرمە) و (قتادە) دەڵێن: ئەم پیاوە عوزێر بووە. وەکو لە**(تەفسیری الطبری/ ج١)** دا هاتووە. وە خوداوەند لە ئاخر زەمانیشدا دەیان **موعجیزەی خۆی نیشانی** خەڵکی زەوی دەدات بۆ گێڕانەوەی بڕواو دڵنیایی بە ئادەمیزاد، **بە تایبەتی دیارەدە غەیبی و** نادیارەکان، وەکو گەڕانەوەی مەسیح و هاتنی مەهدی و دەرچوونی**(دابە الارض) و هەڵاتنی خۆر** لە خۆرئاواوەو... هتد.**﴿ يَوْمَ يَأْتِي بَعْضُ آيَاتِ رَبِّكَ لاَ يَنفَعُ نَفْسًا إِيمَانُهَا لَمْ تَكُنْ آمَنَتْ مِن قَبْلُ﴾**[5]. دیارە مێژووش خۆی دووبارە دەکاتەوە**﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا﴾**.

---

(١) موسوعة الاعجاز العلمي/ يوسف الحج/ ل:٤٢.

(٢) البقرة:٥٦.

(٣) البقرة:٧٣.

(٤) البقرة: ٢٦٠.

(٥)الانعام:١٥٨.

## ١٩٧- (مەسەلەی مەسخ بوونی مرۆڤ بۆ مەیمون و بەراز)

﴿فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ﴾[1]. واتە: بە یارانی شەممەمان ووت: ببنە مەیمونێکی سەر شۆڕ.

﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ الْقِرَدَةَ وَالْخَنَازِيرَ﴾[2]. واتە: لەوانەمان هەبوو کردمانن بە مەیمون و بەراز.

لە کتێبی(القنبلة: يهود مسخه الله قردة و خنازير/ محمد عيسى داود) دا لە ساڵی(٢٠٠٣) بڵاوی کردەوە کە هەندێ لە شوێنەوار زان و پسپۆری موسڵمانی فەلەستینی توانیان گۆرستانێك بدۆزنەوە، ئەو لەشە مۆمیایانە دەربێنن و وێنەیان بگرن. مۆمیا کراوەکان قژی سەرو لەشیان ماوەو دەمیان داچەقیوە و ترس و شپرزەیان پێوە دیارەو هەندێکیان کلکیان هەیە وەك مەیمون و هەندێکیان کلکیان بستێك دەبێت وەك بەرازو، هەندێکیان ناوقەدیان درێژبۆتەوە شێواوە، ئەمە بێجگە لەمە کە پارچە تۆری ڕاوچی یەکانیش دۆزاوەتەوە[3]. بەڵێ خوای گەورە بەم شێوەیە لە ڕێگای دۆزینەوەی شوێنەواری یارانی شەممە کە خودا قەدەغەی کردن لەو ڕۆژە دا ڕاو نەکەن و ئەوانیش سەرپێچی یان کرد، موعجیزەی قورئانی گەورەتر کردو، جختی کردەوە، کە ئەوەی قورئان فەرمویەتی ڕاستە وە ئێوەش پەند لەوانە وەربگرن، دەست بەرداری بێ دینی و خراپەکاری و سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوادابن.

﴿وَلَقَدْ عَلِمْتُمُ الَّذِينَ اعْتَدَواْ مِنكُمْ فِي السَّبْتِ فَقُلْنَا لَهُمْ كُونُواْ قِرَدَةً خَاسِئِينَ فَجَعَلْنَاهَا نَكَالاً لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ﴾[4].

مەسخ (monstrosity) واتە: گۆڕینی وێنەو بیچم لە شێوەیێکەوە بۆ شێوەیێکی ناشیرینی تر. مەسیخ واتە: کەسێك دورست بوونی ناتەواو بێ و، کەسێکە ڕوخساری نەبێت.

(١) البقرة:٦٥.
(٢) المائدة:٦٠
(٣) بروانە ژیانەوە(ئەندازیار عوسمان محمد رەشید/ ل:١٩٤.
(٤)البقرة:٦٥-٦٦.




لەرووی پزیشکیەوە: ناتەواوی دورست بوون و زگماکی یە، هۆیەکانی زۆرە، وەکو خـواردنی دەرمانی لەلایەك دایكی سك پڕەو، لە مانگەکانی سەرەتایی دا، یان دایك زۆر خۆی داوەتە بـەر تیشك، یان توشی هەندێ نەخۆشی بووە وەکو سورێژەی ئەڵمانی و هی تـر[1]. یـان هەنـدێ جـار هۆی لادانی کرۆمۆسۆمی یەوە دورست دەبێ وەکو مەنگۆلی....(۲).

وە ئێستاش زۆر جار لە کتێب و گۆڤارەکاندا دەخوێنینەوە ئافرەت هەیـە بـۆن و گـورگ و شتی تری پەیدا بووە. بۆ وێنە بڕوانە گۆڤاری(تەندروسـتی و کۆمـەڵ/ ژ/ ئـازار/ ۱۹۸۸/ ل:۵۸. باس لە ئافرەتێك دەکات بە وێنەوە کە چەند گـورگێکی پەیـدا بـووە: دیـارە لـە فەرمودەکانـدا هاتووە یەکێ لە نیشانەکانی ئاخر زەمان دوبارە بوونەوەی مەسخە لە جیهاندا.

---

(۱) الموسوعة الطبية الفقهية/ ل:۸٦۰-۵۸۲/ د: احمد محمد كنعان.




## بەردین زانی ( علم التحجرات-علم الاحافير )

﴿قُلْ سِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ﴾[١].

﴿إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ﴾[٢].

(بەردینfossils) واتە پاشماوەو ئاسەواری زیندەوەران کە لە چاخی جیۆلۆجی دا ژیاون و بەلگەیێکە لەسەر جۆری زیندەوەرەکەو بەزۆری لە ناو تاوێری نیشتوویی دا هەلگیراوە. تاووتوێ ی بەردانیەکان یان چالێنەکان لە تاووتوێ زیندەورانی ئێستاکە جیایە، چونکە بریتی یە لە لێ حالێ بون لە سروشتی ژیانی کۆن لەبەر ئەوەی لێرەدا هەندێ زیندەوەر هەیە ئێستاش هەیە، هەشە لە مێژە لە ناو چووە وەکو دایناسۆرەکان، زانست بە توێژینەوەی گیاندارانی ڕابردوو دەڵێ: چالێنەکان یان بەردینەکان. بەلام چۆن زانست دەتوانێ تاوو توێ ی خۆگونجاندن و ڕێرەوی ژیانی ئەوان بکات لەکاتێ دا ملیۆنەها ساڵە نەماون، بۆ نمونە دایناسۆرەکان(١٦٥) ملیۆن ساڵ بەر لە دەرکەوتنی مرۆڤ لە ناو چون، زۆر لە زیندەوەران ملیۆنەها ساڵ لەمەوبەر ژیاون و قریان تێ کەوتووە؟ زانایانی بەردینی زیندەوەران بەکاردێنێ بۆ تاووتوێ ی کردنی سیفەتی ئەو زیندەوەرانەو چاوتێ برینیان و هەندێ لە نەریتەکانیان بەلام ئەو بەردینانە چۆن دەتوانن هەواڵی ئەو زیندەوەرانەمان بداتێ کە لە رابردووی دوردا ژیاون؟ هێڵەکان و لێوارەکانی دەتوانی شوێنی پەیوەندییان بە ماسولکەکانیان دەربخەن، ئەستوری دیواری ئێسقانەکە هەندێ توانستو بەرگەی ئەو دەتوانێ ئاشکرا بکات، دیسانەوە جۆری ددانەکەی و تەمەنی گیاندارەکەو جۆری خواردنەکەی دەخاتە روو، جگە لەوە ئیسقانی پەلەکان شێوازی جولەکانی دەست و پێیەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانیان ئاشکرا دەکات.

دەتوانرێ تەمەنی نیسبی ئەو بەردینانە بەبەراوکردنیان لەگەل چینی تاوێری نیشتویی دا دەربخرێ کە لە ناوی دا دۆزراوەتەوە، بەلام دیاری کردنی تەمەنی بەردینەکە بە ساڵ دەتوانرێ بە پشت بەستن بە چالاکی تیشکدەری هەندێ لە توخمەکان دیاری بکرێت، هەندێ توخمەکان کە لە

---

(١) العنكبوت:٢٠.

(٢) يس:١٢.



چاڵێن و بەردینەکاندا یان تاوێرە نیشتوەکاندا هەیە تیشك دەرەوەن(المشعە) و لە چەند ماوەیەکی دیاری کراوی کاتی ڕێکدا شی دەبنەوە، ئەو ماوە زەمەنیەش کە تێ ی دا شی دەبنەوە نیوەی بڕی ئەتۆمی تیشکدەری ئەو توخمەیە لە بەرامبەر ئەتۆمەکانی جۆری تردا، بە ماوەی نیوە تەمەن(half life) ناو دەبرێت. نمونەش کاربۆن(١٤) یەکە یەکێکە لە هاوتاکانی کاربۆن، کە بە شێوەیێکی سروشتی هەیە، هەر کام لە کاربۆن(١٢)ی تیشکدەرەوە کاربۆن(١٤)ی ناتیشکدەرەوە لە هەوادا هەیە، زیندەوران بەردەوام هەر دوو جۆر کاربۆنەکە بەکاردێنێت، بەو هۆکارەیە ڕێژەی هەردووکیان لە شانەکانی زیندەوەردا نەگۆڕە، لە کاتی مردنی ئەو زیندەوەرەدا چونی کاربۆن بۆ ناو لەشەکە دەوەستێت و کاربۆن(١٤) دەست بە شی بوونەوە دەکات و ڕێژەی نێوانیان دەگۆڕێت، چونکە نیوە تەمەنی کاربۆن(١٤) بریتی یە لە(٥٧٣٠) ساڵ، ئەوکاتە دەتوانرێ تەمەنی بەردینەکە دیاری بکرێ کە تەمەنی ناگاتە(٥٧٠٠٠) ساڵ، وە دیاری کردنی تەمەنی بەردینی لەمەکۆنتر هاوتا تری تیشکدەرەوە (النظائر المشعة) بەکاردێ وەکو(پۆتاسیوم) -٤٠- کە تەمەنی(١,٣) بلیۆن ساڵە یۆرانیۆم(٢٣٨) تەمەنی نیوەی ئەو(٤,٥) بلیۆن ساڵە. دەتوانرێ سود لە بوونی بەردینی دیاری کراو وەربگیرێ لە چینەکانی تاوێری دا بۆ زانینی تەمەنی چینەکە بە بەراورد لەگەڵ چینی تردا، بەمە زانایان دەتوانن بە پێ ی تەمەنەکان بەردینەکان ڕیزبکەن.

گرنگترین سوودەکانی بەردینەکان ئەمەیە: یارمەتی دەردەبێ بۆ دیاری کردنی تەمەنی تاوێرەکان، یارمەتی دەردەبێ بۆ ناسینی جوڵە زەمینیەکان کە چیاکان و کیشوەرەکان بنیات دەنێت. یارمەتی دەری جوگرافی کۆن دەبێت لە دابەش کردنی بونی کیشوەرەکان و ئاو لەسەر زەوی دا. یارمەتی دەردەبێ بۆ تاووتوێ ی ئاووهەوای دێرین. یارمەتی دەردەبێ بۆ تاووتوێ کردنی ژینگەکانی کۆن.

مەرجەکانی بەردین: یەکەم: بوونی پەیکەرێکی ڕەقە، یان سەدەفێکی ڕەقە، وەکو ئێسقان و سەدەفی نەرمۆڵەکان(الرخويات)و درکی ئەسفنجی یەکان و توێکل و ماددەی سلیلۆز لە داردا و ماددەی کایتین لە مێروەکاندا.

دووەم: دەبێ ئەو گیاندارە دوای مردن خێرا بشاردرێتەوە، وەکو شاردنەوەی لە




ناوبەستەڵەکدا، وەکو بەردینی(مامۆس) کە لە بەستەڵەکدا دۆزرایەوە.یان ئەوەتا ئەو زیندەوەرە بکەوێتە زەڵکاوی پەترۆڵەوە. وەکو بەردینی یەك شاخە(وحید القرن) کە لە زەڵکاوی قیڕدا دۆزراوەتەوە، یان لە ناو ماددەی کەهرەماندا کەجەوو کەتیرەی هەندێ رووەکە وشك دەبێتەوە یان پاراستنی سەدەفی نەرمۆڵەکان[1].

رابردو بینیمان خوای گەورە نمونەی چەند کەسی پیشاندایین کە خوداوەند دەیانمرێنێ و زیندویان دەکاتەوەو لەشیان لە گۆڕان دەپارێزێت وەکو: (عوزیر) کاتێ خوای گەورە پێ ی دەفەرموێ: ﴿أَوْ كَالَّذِي مَرَّ عَلَى قَرْيَةٍ وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَى عُرُوشِهَا قَالَ أَنَّىَ يُحْيِـي هَـَذِهِ اللَّهُ بَعْدَ مَوْتِهَا فَأَمَاتَهُ اللَّهُ مِئَةَ عَامٍ ثُمَّ بَعَثَهُ قَالَ كَمْ لَبِثْتَ قَالَ لَبِثْتُ يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ قَالَ بَل لَّبِثْتَ مِئَةَ عَامٍ فَانظُرْ إِلَى طَعَامِكَ وَشَرَابِكَ لَمْ يَتَسَنَّهْ وَانظُرْ إِلَى حِمَارِكَ وَلِنَجْعَلَكَ آيَةً لِّلنَّاسِ﴾[2].

واتە: یان وەکو ئەو کەسەی بەسەر شاخێکدا رابرد بینی بەسەر یەکدا ڕوخاووە، وتی: چۆن خودا ئەوانە زیندوو دەکاتەوە؟! ئەمجا خوداوەند سەد ساڵی مراند و پاشان زیندوی کردەوە. فەرموی: چەند ماویەوە؟ وتی: ڕۆژێك دەبێ یان نیوە ڕۆژێك. فەرموی: بەڵکو سەد ساڵ ماویەوە، سەیری خواردن و خواردنەوەت بکە نەگۆڕاوە، سەیری کەرەکەت بکە، وەتا بتکەینە موعجیزە بۆ خەڵکی... .

یان یارانی ئەشکەوت خوداوەند(٣٠٠) ساڵی خۆری و(٣٠٩) ساڵی مانگی لەشیان هەڵدەگرێ و لەناو ئەشکەوتداو لە گۆڕان و تێك چوون دەیان پارێزێت: ﴿إِذْ أَوَى الْفِتْيَةُ إِلَى الْكَهْفِ فَقَالُوا رَبَّنَا آتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا﴾[3]. (ئیعجازێکی پزیشکی لەم ڕوداوە بێ وێنەیەدا دەردەکەوێ لە دۆخێکدا کە خودا رەخساندویێتی بۆ دەرخستنی ئەم موعجیزەیە، ئەم لاوانە لە بارودۆخێکی سڕبون(السبات) دا دەمێننەوە، وەکو سڕبوونی ورچ لە وەرزی زستاندا(hibernation)، بۆ رەخساندنی ئەمەش بارەکی سروشتی نەگۆڕی دەوێت، لە

(١) بە کورت کردنەوەی لە کتێبی علوم الارض والبینة/ ل:١٤٢-١٤٤/خیر شاهین/ وەرگیراوە.

(٢) البقرة:٢٥٩.

(٣) الکهف:١٠.

ئەشــکەوتەکەدا ئەمــە دەپارێزێــت، پلــەی گــەرمی و شــێداری نــەگۆڕەو دورن لــە کاریگەریــە دەرەکیەکان وەکو کاریگەری سروشتی و کاریگەریــە بەرجەســتەکان. ﴿وَتَرَى الشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَاوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ الشِّمَالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِّنْهُ ذَلِكَ مِنْ آيَاتِ اللَّهِ مَن يَهْدِ اللَّهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِي وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُ وَلِيًّا مُّرْشِدًا﴾(1).

تیشکی خۆر بــە کاریگــەری گــەرمی و روناکییــەوە لــە ئەشــکەوتییان لادەدات، لــە لای ڕاستەوە هەڵدێ و لە خۆرئاواوە ئــاوا دەبێــت، واتــە خۆرهــەلاّت دەکەوێتــە لای ڕاســتی زارکــی ئەشکەوتەکەوە و خۆرئاوای چەپیەوە ئەوێ کەمترین ئاراستەیە بکەوێتە بەر کاریگــەری تیــشکی خۆرەوە تا وێنەکە تەواو ببیّ و ئەشکەوتەکە سروشتی خۆی بپارێزێ و گەرمی نەگۆڕێ و تــاو لــە چاویان نەدات لەو سڕبون و هیپنۆتیزم بونە وریایان بکاتەوە.

﴿فَضَرَبْنَا عَلَى آذَانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا﴾ الکهف:١١.

پێنج هەستەکان وەستاون دورن لە کاریگەری دەرەکی﴿وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِّنْهُ﴾الکهف:١٧.

وەکو چۆن ورچ بە درێژایی زستان دەکەوێتــە ســڕبونەوە تــا هــەوا گــەرم دەبــیّ و گــۆڕینی گەرمی وریای دەکاتەوە. یان لە کاتی خەواندن و هیپنــۆتیزم دا بابــای خەوێنــەر ئیحــا مــەدیوم دەکات گوێ ی لە هیچ دەنگ و هەستیّ نەبێت، بۆ ئەوەی بخەوێ و هیچ دەنگیّ وریای نەکاتەوە.

﴿وَتَحْسَبُهُمْ أَيْقَاظًا وَهُمْ رُقُودٌ وَنُقَلِّبُهُمْ ذَاتَ الْيَمِينِ وَذَاتَ الشِّمَالِ وَكَلْبُهُم بَاسِطٌ ذِرَاعَيْهِ بِالْوَصِيدِ لَوِ اطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوَلَّيْتَ مِنْهُمْ فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا﴾(2).

واتە: ئەو(٣٠٠) ساڵە زیندون و خەوتون و کاریگــەری زینــدەگی لــە لەشــیاندا و پیــشەی ئەندامەکانیان وەکو لێدانی دڵ و مێشك و جگەر و گورچیلەو هــی تــر چــالاکە. دڵ لێــدەدات و سوڕی خوێن دێتە دی خواردن لە عەمبارەکانی یانەوە بۆ بەشــەکانی تــری لــەش دەڕوات. پاشــە ڕۆکاکەکانی میتابولیزم بۆ جگەر و گورچیلە دەگێڕێتەوە تا لەشی لیّ ڕزگــار بکــەن. مێــشك تــا تەواو بوونی سڕبوون چالاکی، تا ئەو ئیعجازە پزیشکی و هیپنۆتیزمی یە بێتــە دی. ئــەنجا گــەر

---

(١) الكهف:١٧.

(٢) الكهف:١٨.



ئەم لاوانە لە یەك دۆخدا یان لەم ماوە درێژەدا لەشیان هەمووی دەبوبەبرین، بەلاّم سۆزی خوا پەرستی لە هەموو لایەك چەپاڵەی دان و بۆ لای راست و چەپ وەری دەگێران. ئەمەش پرنسیپەکی پزیشکی یە تا ئەو جۆرە برینانەی لە نەخۆشیەکاندا ڕونەدات، کاتێ ماوەیێکی زۆر لەسەر جێگا دەمێننەوە، ئەمەش لە مێژینیە پزیشکی پێ ی ناشنا بووە[1].

خوای گەورە فەرمویەتی: ﴿وَجَعَلْنَا نَوْمَكُمْ سُبَاتًا﴾[2]. واتە: خەوم بۆ کردون بە(سبات) ئەم وشەیە بە مانای حەسانەوەو هەم سڕبوون دێت، یان بەنج بون. یان﴿وَجَاءَتْ سَكْرَةُ الْمَوْتِ﴾[3]. وشەی(سکرە) یەکێ لە ماناکانی سڕبونە یان بەنج بون لە کاتی مردندا.

بێگومان عیساش(علیە السلام) بە پێ ی دەقی قورئان و سوننەت لاشەی لە ئامێرێکی تایبەتی دا هەڵگیراوە، لە ئاخر زەماندا دەگەرێتەوەو مەهدی نەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێش نوێژی بۆ دەکات﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ إِلاَّ لَيُؤْمِنَنَّ بِهِ قَبْلَ مَوْتِهِ﴾[4]. واتە: ئەهلی کیتاب هەمووی بەر لە مردنی بڕوای پێ دێنن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی: (کیف انتم اذا نزل ابن مریم فیکم وامامکم منکم) متفق علیە. واتە: ئێوە چۆن دەبن کاتێ کوڕی مەریەم دابەزیە ناوتان و ئیمامی خۆتان لە خۆتانە. کە مەهدی رزگاری بەخشە(علیە السلام). بەم شێوەیە هێشتنەوەی شوێنەوارەکان و لاشەکان لای خوا ئاسانە، کە بە زۆر رێگا هەڵدەگیرێن وەکو بە خەڵوز گەڕان و پۆشین بە کالسیوم و مۆمیا کردن.

---

(١) سوودمان لە نامیلکەی(الاعجاز الطبي في قصة اهل الكهف/ د: مروان رفاعي وەرگرتووە، لەگەڵ کەمێ دەسکاری دا.

(٢) النبأ:٩.

(٣) ق:١٩.

(٤) النساء:١٥٩.



**١٩٨- ( چاخە جیۆلۆجیەکان )**

**﴿هَلْ أَتَى عَلَى الْإِنسَانِ حِينٌ مِّنَ الدَّهْرِ لَمْ يَكُن شَيْئًا مَّذْكُورًا﴾[1].**

واتە: ئایا بەسەر مرۆڤدا هاتووە ماوەییێك لە ڕۆژگـار هەرناویـشی نـەبووە. ﴿وَقَدْ خَلَقَكُمْ أَطْوَارًا﴾[2]. واتە: ئێوەی لە چەند قۆناغێکدا دورست کردووە.

چاخە جیۆلۆجیەکان، یان ڕۆژگارەکانی دەبن بە چەند سەردەمێکەوە، هەر سـەردەمە بەسەر چەند دابەش دەبن:

**(أ): چاخی بەر لە کامبێری:**

زانیاری لە بارەیەوە کەمەو، بەر لە(١,٨٥٠,٠٠٠,٠٠٠) دەسـتی پـێ کـردووە وەکـو لـە ژمارەی چالاکی تیشکی دا پێشانی دەدات، ئەویش دەبێ بە دوو خول یان سـەردەم: (سـەردەمی ئەرکیوزیك).

سەردەمی(پرۆشیر روزیك ئەلجونکیان) و چینێکی ئەستوری تاوێری نیشتویی لێکیـان جیـا دەکاتەوە.

**(ب) چاخی ژیانی کۆن(بالیۆزی): دەبێ بە چەند سەردەمێکەوە:**

(١) چەرخی کامبێری: (١٠٠) ملیۆن ساڵی خایاندووە، **واتە بەر لـە(٥٢٠-٤٢٠) ملیـۆن** ساڵە. بێ بڕبڕەکانی دەریایی تێـدا دەرکـەوتن، **گرنگترینیـان(پریلوبیـت و هێلکـە شـەیتانۆکەی** سەرەتایی(القواقع) و ئیسفنج و قەوزەی دەریـایی**(الطحالـب البحریـە) و ئەسـتێرەی دەریـایی و** هەندێ توێکلدارەکان(القشریات).

(٢) چەرخی ئۆردۆڤیسی: حەفتا **ملیۆن ساڵ دەوام دەکات، واتە** بەرلە(٤٢٠-٣٥٠) ملیۆن ساڵ لەو چاخەدا بێ بـڕ بڕەکـانی دەردەریـایی(اللافقریـات البحریـە) و زنبقـی دەریـایی و قـاچ سەرییەکان(الرأس قدمیات) و مەرجان.

(٣) چەرخی سلوری: (٣٠) ملیۆن ساڵ دەوامی کرد، واتە: بـەر لـە(٣٥٠-٣٢٠) ملیـۆن

---

(١) الانسان:١.

(٢) نوح:١٤.




سالْ. لەم چاخەدا دوپشکی دەریاو زەنبقی دەریـا و قـاج سـەریەکان و هێلکـە شـەیتانۆکەکان و **توێکڵدار**ەکان و مەرجاننیەکان دەبینرێن.

(٤) چەرخی دیڤۆنی: (٤٥٠) ملیۆن سالْ دەوامی کـرد(٣٢٠-٢٧٥) ملیـۆن سـالْ). لـەم چەرخەدا ماسیە زرێ پۆشەکان وسی یـەکان ژیـاون، لەوشـکانی دا(مێروەکـان و جاڵجالۆکـەکان ووشکاوییەکان) ژیاون. ڕووەکەکان دەرکەوتون.

(٥) چەرخی کاربۆنی(خەلۆزی): (٢٠) ملیۆن سالْ دەوامی کردووە، واتە لە (٢٧٥-٢٥٥) ملیۆن سالْ لە ڕابردوودا. چاخی سەر خەسییە گەورەکان و دارخورماکان و دارستانی چڕ و پـڕەو کۆنترین ڕووەکی گوڵدار دەرکەوتون لە قوچەکیی یەکان، دیـسان چـاخی وشـکاوییە گـەورەکان و مێرووە زەبەلاحەکان و پێست دڕکاوییەکانە.

(٦) چەرخی پێرمی: (٦٠) ملیۆن سالّی خایاندووە(٢٥٠-١٩٥) ملیۆن سالْ. خـشۆکەکان بۆ یەکەمجار دەرکەوتن، ئەنجا ڕووەکە قوچەکیەکان بلاّوبونەوە، زۆر گیانـدار لـە ناوچـوون، بـەلاّم گوێچکە ماسییەکان (المحاریات) هەرماون.

**(ج): چاخی ژیانی ناوەندی(میسۆزوی): دەبن بە چەند چەرخێکەوە:**

(١)چەرخی سیانی(ترییاسی): (٢٥) ملیۆن سالْ دەوام دەکات(١٩٥-١٧٠) ملیۆن سالْ.

جۆرەها ماسی و زنبقی یەکان و گوێچکە ماسـی یـەکان هێلکـە شـەیتانۆکەیی یـەکان و ئامۆنیەکان ژیاون. بەردینەکانی ئەم چەرخە کەمێکن.

**(٢) چەرخی جۆراسی: (٣٠) ملیۆن سالْ دەوامی کردووە(١٧٠-١٤٠) ملیۆن سالْ دەوامی کردووە. بە چاخی زەبەلاحەز لە وشکانییەکان و ئاوییەکان و باڵندە ناسراوە. وە هەندێ گیانداری شیردەر و مێروو دەرکەوتون وەکو مێروو مێش.**

(٣) چـەرخی تەباشـیری(کریتاسـی): (٧٠) ملیـۆن سـالّی پـێ چـوو ویڵـداش دارەکان(المشیمیات) و ڕووەکەکاسەتۆوییەکان(کاسیات البذور) لەم چاخەدا خشۆکەکان گەیـشتنە چڵەپۆپە، لە دوایی دا دەستیان بە قڕتێ کران کرا.

(د) چاخی ژیانی نوێ(کاینوزی) و سەردەمی شیردەرەکان: دەبێ بە چەند چەرخێکەوە؟:



(١)چەرخی(ئالیوسین) و (ئایۆسین) : (٢٥)ملیۆن ساڵ دەوام دەکات(٧٠-٤٥) ملیۆن ساڵ باپیرەی گیاندارانی سەگەکان و پشیلەکان و نەهەنگەکان دەردەکەون.

(٢) چەرخی( نولیکوسینی): (١٠) ملیۆن ساڵی دەوام کرد، واتە: لە(٤٥-٣٥) ملیۆن ساڵ. قرتێنەرەکان(القوارض) و نەسناسەکان و فیلەکان و کەمتیارەکان دەرکەوتن.

(٣) چەرخی مایۆسینی: (٣٠) ملیۆن ساڵی دەوام کرد واتە: لە(٣٥-١٥) ملیۆن ساڵ. هەندێ فیلی قرتێ کەوتووی تێدا دەبینین یان هەندێ گیانداری سەر بە خێزانی سەگەکان و پشیلەکان.

(٤) چەرخی مایۆسینی: (٣٠) ملیۆن ساڵ دەوام دەکات واتە: لە(١٥-١)ملیۆن ساڵ شیردەرەکان و ئەسپی ئیمرۆ دەردەکەون.

(٥) چەرخی پلاستوسینی و چەرخی نوێ: بەر لە یەك ملیۆن ساڵ دەستی پێ کردووە، تا چەرخی نوێ، بەر لە(٢٥) هەزار ساڵ دەست پێ دەکات. لەم چاخەدا زۆر گیاندار لە ناوچوون. پڵنگەکان و فیلەکان و وشترەکان و ئەسپەکان دەرکەوتوون. لای زانایانی پەرەسەندن لەم چاخەدا مرۆڤی سەرەتایی دەرکەوتووە، لە کۆتایی دا مرۆڤی کرۆمانیۆن، نەخش و نیگاریان بەسەر چیاکانەوە دیارە[1].

﴿وَاللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَابَّةٍ مِن مَّاء فَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى بَطْنِهِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى رِجْلَيْنِ وَمِنْهُم مَّن يَمْشِي عَلَى أَرْبَعٍ يَخْلُقُ اللَّهُ مَا يَشَاء إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ﴾[2].

لێرەدا خوای گەورە دەری دەخات ژیانی سەرەتایی لە ئاودا دورست بووە، لەوانە خشۆکەکان کە لە سەر سك دەڕۆن، ئەوانەی لەسەر دوو پێ دەڕۆن، ئەوانەی چوار پێن.

وە ئەم چەرخە کوردستانیشی گرتۆتەوە، چەرخی پلاستوسینی، وەکو شوێنەوارەکانی لە رووباری ڕواندزە دا کە جۆگەیەکی گرنگی زێ ی گەورەیەو پاشماوەکانی چەوو بەردی کە توانەوەی ئاوی ژێر بەفرگرە دروستی کردووە ئەستوری دەگاتە(٤٠-٦٠) مەتر لە ئاستی روی رووباری

---

(١) پاشکۆی (هل تعرضت لغسيل الدماغ/ ت: اورخان محمد علي/ ل:٤٩-٥٢.

(٢) النور:٤٥.




ئێستاوه.

ئەنجا لە جیلۆداغدا و ناوچەی هەلگوردا کە زنجیرە چیاکانی بەرزییان لەمیان(٣٠٠٠-٣٥٠٠)م دایە. ئەو ناوچانە سەخترین چەرخی پلاستوسینی یان بینیوە، وەکو(هـ . أ .رایت) لە (اثار العصر البلاستوسینی فی کردستان) باسی کردووە.

وه باخچەی ئادەم لە کوردستانە، لە ناوچەی ڕواندز لە دێ ی سەلام، وەکو لە سێ تابلۆ دێرینەکانی نوحدا ئاماژەی بۆ کراوە. ئەنجا لە(تەورات) دا وەکو باسکرا ئاماژە دەکات لە دۆڵی دوزێ ئادەم ژیاوەو پەیدابووە. وەکو باسکرا(ڕوبارەکان: فیشونو جیحونو حیدداقل و فوراتە) . (التکوین/٢/١١-١٥). لە فەرمودەشدا هاتووە(الفردوسی) گێراویەوە. (الجنە فی المشرق). وەکو(المناوی) لە(فیض القدیر)دا ئاماژەی کردووە مەبەست لە خۆرهەلاتی عێراق و دەوری یەتی کە باخچەو دارو درەختی زۆرە. لای(حاکم) (صحیح الاسناد)ە. ڕاستیش دەکات.

ئەنجا بە پێ ی دەقی قورئانیش(نوح) کەشتی یەکەی لە کوردستان لەسەر جودی نیشتۆتەوە، بەم پێیە ئادەمیش لەوێ دا ژیاوە﴿واستوت علی الجودی﴾ وەکو باسکرا. یەکێ لە سیاسەت مەدارە هاوچەرخەکانی کورد قسەیێکی زۆر جوانی هەیە لەم ڕوانگەوە کاتێ دەڵێ: (ئەم خاکە ژمارەیێکی زۆر پێغەمبەرو فەیلەسوفی دەرخستوتە مەیدان، ئێستاش بۆ پێش کەوتنێکی بەم جۆرەی شۆرشی کوردستان جارێکی دیکە مێژوو خۆی دووبارە دەکاتەوە) .

(ویل دیورانت) لە (قصە الحضارة) دا دەنوسێ: ناوچەی جەزیرە لە نێوان هەردوو زێکەدا(**میزوپۆتامیا**) ئەوەندەی ئێمە بزانین شوێنی یەکەمین دیمەنەکانی شانۆیی ژیاری مرۆڤن[1].

---

(١) قصة الحضارة / ول دیورانت/ج١/ل٢٤٤/ نوێلس.

## ١٩٩- ژیان لە دەرەوەی زەوی دا

قورئانی مەزن دەفەرموێ: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ خَلْقُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَمَا بَثَّ فِيهِمَا مِن دَابَّةٍ﴾. الشورى:٢٩.

واتە: لە نیشانەکانی خودا دورست کردنی ئاسمانەکان و زەوییە، وە ئەو گیاندارەی لە هەردوو جێگادا بڵاوی کردونەوە.

لە فەرمودەدا هاتووە: (فعرضت ولايتكم على اهل السماوات والارض فمن قبلها كان عندى من المؤمنين، ومن جحدها كان من الكافرين) (فرائد السمطين/ للجويني) واتە: ویلایەتی ئێوەم خستە روی خەڵکی ئاسمانەکان و زەوی، کێ پەسەندی کرد لای من لە برواداران، کێ پەسەندی نەکرد لای من لەبێ بروایانە.

پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژە بە هەسارەیێك دەدات کە وەکو زەوییە، بەڵام روناکی خۆری خۆی یان خۆری ئێمەی بە(٣٠) رۆژ پێ دەگات، سنوری کۆمەڵەی خۆر(١١) کات ژمێری تیشکی یە.

(لله دار بيضاء مشحونة خلقا كثيرا، مسيرة الشمس فيها ثلاثون يوما مثل ايام الدنيا ثلاثين مرة، لايعلمون ان الله يعصي في الارضى ولا يعلمون ان الله خلق ادم وابليس). رواه احمد.



واتە: (خوا خانەی سپی هەیە پڕ لە دوستکراوە، ڕێگای خۆر تێ ی دا سێ رۆژە، وەکو رۆژانی دنیایە سێ جاران، ئەوان نازانن خوا لە زەوی دا سەرپێچی دەکرێت، نازانن خودا ئادەم و ئیبلیسی دورست کردووە). واتە بێ ئاگان لە ژیانی زەوی وەکو چۆن ئێمە لە ژیانی ئەوان بێ

ئاگاین.

بەپێ ی زانستی گەردووناسی وەکو لە گەردووناسی لە سایەی قورئان و سوننەتدا باسمان کردووە، بڕوا وایە هەر لە(مەجەرەی خۆماندا کە نزیکەی(١٠٠٠٠٠)ملیار ئەستێرەی تێدایە، (١٠٠) هەزار شارستانی تێدایە کە دەتوانن پەیوەندی بە یەکترەوە بکەن)[1].

(زانایان بڕوایان وایە لە مەجەرەی خۆماندا(١٠) ملیار هەزار هەسارە هەبێ بە کەڵکی ژیان بێن، لەوانە(٥٠٠) ملیۆن بە بێ گومان ژیانیان تێدا دەرکەوتووە)[2].

دیارە نمونە زۆرە و بینراوە وەکو دەفرە ئاسمانیەکان، کە لە دەرەوەی زەوی هاتوون و دێن بۆ سەر زەوی و زۆر جار بینراون و هەزاران بەڵگە ئاسە لەم بارانەوە هەیە. (د: عبدالرزاق نوفل) لە کتێبی(السماء واهل السماء) و (الله وعلم الحديث) و ئێمەش لەگەردووناسی دا هەندێ نمونە و بەڵگەنامەمان هێناونەوە، کە کتێب و گۆڤارو ڕۆژنامەکانی پڕکردووە. بۆ نمونە: لە ساڵی(١٩٦٩)دا کەنەدا ڕایگەیاند هەندێ هاووڵاتی شاری(کویبیك) چەند تەنێکی نامۆی ئاسمانی دەبینن لە نزیك ئەواندا دادەبەزن و ڕۆژنامە نوسەکان و پیاوانی نیدارە شوێنەواری نیشتنی ئەوانیان بینی کە بازنەیی و خڕ هەڵکەوتبو.

لە ساڵی(١٩٦٨)دا هەندێ لایەنی زانستی پورتوگاڵی ڕایان گەیاند کە تەنێکی نامۆ لە ئاسمانی پورتوگاڵدا دەردەکەوێت، وە تەنێکی سپی لولەیی لەسەر فرۆکەخانەی دورگەی سانتاماریا دەبینرێ لە بەرزایی(٨-١٠) هەزار مەتردا . شایانی باسە لە کاتی دابەزینی ئەم تەنەدا سەعاتی کارەبایی موگناتیسی فرۆکەخانەکە لە کار کەوت.

یان ساڵی(١٩٦٨) لایەنی ڕەسمی بەرازیل ڕایگەیاند کە هێزی هەوایی لە ڕوداوی بونی تەنێکی هەوایی دەکۆڵێتەوە کە چوار پیاوی بچووکیان هەڵگرتووە، ڕەنگی سەوزیان هەیەو لە نزیك شاری بیراسونونجادا لەو ویلایەتی سان باولودا دادەبەزن.

بێگومان ئەمەش موعجیزەیەکی گەورەیە بۆ قورئان، کە(١٤٠٠) ساڵ لەمەوبەر ئاماژە بە بونی ژیانی شارستانی تر دەکات لە دەرەوەی زەویدا!

---

(١) علم الفلك/ د: فياض النجم/ ل: ٤١٩.

(٢) نظرتنا المعاصرة الى الكون/ د: طالب ناهي الخفاجي/ ل:١٠٨.





# بەندی دەیەم

## ٢٠٠- ( كۆتـایی زەوی ) و نەمانی ژیان لە ناویدا :
## ٢٠١- گواستنەوە بۆ( زەوی ئەتیر ) لە دوای مردندا :

قورئانی پیرۆز بەر لە زانستی جیۆلۆجی و میتافیزیكی باسی لە قیامەت و پەسڵان كردووەو، بەبەشێكی سەرەكی بڕواداری داناوە، كە بریتی یە لەو گۆڕان و كارەساتە لە ناوبەرەی بەسەر زەوی و بونەوەردا دێت. بۆ ئەو مەبەستەش چەند دیمن و تابلۆی ئەو كارەساتە ترسناكەی كێشاوە، كەلەو كاتەدا بەسەر زەوی و گەردونی ماددیدا دێت و مرۆڤیش لە بەرامبەری دا كاس و سەرسام دادەمێنێت. لەگەڵ نەمانی گەردوون و زەویشدا چەند وێنەو دیمەنێكی پەنهانی و غەریبی بە دەردەكەوێت، ئەویش نەمانی جیهانی سروشتی ماددی و دەركەوتنی جیهانی پەنهان و گەردونی گەورەیە. ئەمەش مانای وایە كە ڕووداوو كارەساتەكانی قیامەت كە گەردوونی ماددی وێران دەكات گۆڕانێكی گەورەیە لە سروشت و ژیاندا پەیدا دەبێت، كە ئەنجامەكەی ون بوونی جیهانی ماددی و دەركەوتنی جیهانی گیانی یە بەدوایدا.

توێژینەوە گەردونناسی و فیزیایی یەكانیش جەخت لەسەر ئەوە دەكەن كە بونەوەری فیزیایی تەمەنێكی دیاریكراوی هەیەو ڕۆژێك دێت لەبەر یەك هەڵوەشێ و بتەقێتەوەو هەپرون بە هەپرون بێت.

لەوانە(ئەدوارد كیلەر) دەنوسێت: (ئەم پرەنسیپەی لە گەردوندا باوە ئەوەیە هەموو شتێ سەرەتاو كۆتایی هەیە، گۆی زەوی سەرەتاو كۆتایی هەیە. زەوی بەر لە (٥) ملیار ساڵ لە دوكەڵ و گازێكی گەردوونی دورست بووە بە سەدیمی خۆری ناسراوە، ناوكی سەرەتایی ئەستێرەكان و سیستەمی هەسارەكانی پێك هێنا. ژیان بەر لە(٢) ملیار ساڵ دەركەوتووە، دوای ئەوە زۆر شێوە ژیان دەركەوتوون و پاشان لە ناوچوون، پاشماوەی بەبەردبونیان ئاماژە بۆ شوێنیان دەكات لە

**مێژووی** زەوی دا، چەند ملیۆن ساڵێکە مرۆڤ دەرکەوتووە، کە پەڕەیەکی زۆر نوێیە لە پەڕەکانی **مێژووی** زەمینی دا گومان لەودا نییە ڕۆژێك دێ خۆری تێدا لە ناو دەچێت و شوێنەواری خۆی لە زەوی دا بەجێ دێڵێت)[1].

بۆ نمونە قورئان لە سورەتی(الزلزلە)دا دەفەرمێ:

﴿إِذَا زُلْزِلَتِ الْأَرْضُ زِلْزَالَهَا وَأَخْرَجَتِ الْأَرْضُ أَثْقَالَهَا وَقَالَ الْإِنسَانُ مَا لَهَا يَوْمَئِذٍ تُحَدِّثُ أَخْبَارَهَا بِأَنَّ رَبَّكَ أَوْحَى لَهَا يَوْمَئِذٍ يَصْدُرُ النَّاسُ أَشْتَاتًا لِّيُرَوْا أَعْمَالَهُمْ فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْرًا يَرَهُ وَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرًّا يَرَهُ﴾[2].

واتە: کاتێ زەوی کەوتە جوڵەو بومەلەرزە، چۆن بومەلەرزەیێك زەوی هەرچی لە ناخی دابو دەری پەڕاند. مرۆڤ ئەو ڕۆژە وتی: چی یە؟! ئەو ڕۆژە زەوی هەواڵی خۆی باس دەکات، کە پەروەردگاری ئەو سروشتی بۆ کردووە. ئەو ڕۆژە خەڵکی پۆل پۆل دەردەچن(لە گۆڕەکانیان) تاکردەوەکانیان ببینن. کێ بە ئەندازەی کێشی گەردیلەیێك چاکەی کردبێت دەیبینێتەوە، کێ بە ئەندازەی کێشی ئەتۆمی خراپەی کردبێت دەبینێتەوە. لە سورەتی(القارعە) دا قورئان دەفەرمێت:

﴿الْقَارِعَةُ مَا الْقَارِعَةُ وَمَا أَدْرَاكَ مَا الْقَارِعَةُ يَوْمَ يَكُونُ النَّاسُ كَالْفَرَاشِ الْمَبْثُوثِ وَتَكُونُ الْجِبَالُ كَالْعِهْنِ الْمَنفُوشِ فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ وَمَا أَدْرَاكَ مَا هِيَهْ نَارٌ حَامِيَةٌ ﴾[3]. واتە: دڵنیابە بەچڵەکێنەر. چی یە دنیا چڵەکێنەر! تۆ چوزانی دنیا چڵەکێنەر چییە؟. ڕۆژێکە خەڵکی وەکو پەپولەی پەرت و بڵاون، چیاکان وەکو خوری شی کراوەن. ئەنجا کێ تای تەرازووی چاکەکانی قورس بوو ئەوە لە ژیانێکدایە پێ ی ڕازییە. کێ تای تەرازووی چاکەکانی سوك بوو نیشتمانی ئەو هاوییەیە تۆ چوزانی ئەوە چییە؟! ئاگرێکی گەرمە.

---

(١) جیولوجیا البینة/ ادوارد کیلر/ ت: د: غسان محمد البستي/ ل:٢٩.

(٢) الزلزلة:١-٨.

(٣) القارعة:١-١١.

لە سورەتی(الشمس)دا دەفەرمیێ:﴿ إِذَا الشَّمْسُ كُوِّرَتْ وَإِذَا النُّجُومُ انكَدَرَتْ وَإِذَا الْجِبَالُ سُيِّرَتْ وَإِذَا الْعِشَارُ عُطِّلَتْ وَإِذَا الْوُحُوشُ حُشِرَتْ وَإِذَا الْبِحَارُ سُجِّرَتْ وَإِذَا النُّفُوسُ زُوِّجَتْ وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ وَإِذَا الصُّحُفُ نُشِرَتْ وَإِذَا السَّمَاء كُشِطَتْ وَإِذَا الْجَحِيمُ سُعِّرَتْ وَإِذَا الْجَنَّةُ أُزْلِفَتْ عَلِمَتْ نَفْسٌ مَّا أَحْضَرَتْ﴾[1].

واتە: کاتێ خۆر پێچرایەوە ، وەکاتێ ئەستێرەکان تاریك داهاتن. وە کاتێ دەریاکان بون بە ئاگر، وەکاتێ دەرونەکان جوت بونەوە، وە کاتێ زیندەبەچاڵەکان لێیان پرسیار کرا؟ بەکام تاوانە کوژران؟ وەکاتێ پەڕاوی کردارەکان بلاۆکرانەوە. وەکاتێ ئاسمان هەڵماڵڕا، وە کاتێ دۆزەخ گەرم داهێنرا، وەکاتێ بەهەشت نزیك خرایەوە، هەموو دەرونێ دەزانێ چی کردووە.

لەم چەند ئایەتەدا دوو دیمەن دەبینین:

(١) مردنی دنیای فیزیایی وەکو پێچرانەوەو بچووك بونەوەی خۆر وەکو گرگنێ و نەمانی رووناکیەکەی‌و، نەمانی روناکی ناو ئەستێرەکان و رودانی بومەلەرزە و بورکان لە زەوی دا، سەر زەوی بە چیاو دەشتایی و دەریاوە دەبنە یەك پارچە بورکان و ئاگر و تەقینەوە و دیاردەی ژیان کۆتایی پێ دێت.

(٢) دیمەنی دووەم دەرکەوتنی جیهانەکی ترە، دوای جیهانی فیزیایی یە، ئەویش دنیای میتافیزیکی یە، بریتین لە بەهەشتەکان و دۆزەخ، کە مرۆڤ بە پێ ی بڕواو چاکەو خراپەی خۆی یەکێ لەو دوانە بەدەست دێنێت. چاکەکاران بەرەو دنیای میسالی و مەلەکوتی بەهەشت دەچن و خراپەکارانیش بەرەو جیهانی دۆزەخ. بەم پێیە بە مردنی جیهانی فیزیایی جیهانێکی تر لە دایك دەبێت کە جیهانی روحی و ئەتیرە.

گەردونناسان دەڵێن: ( گەر تەمەنی خۆر چوار ملیار و نیوساڵ بێ واتە: هەر لە سەرەتای ژیانەوە تا ئیمرۆ (١٤٢)ملیار ملیار تەن هایدرۆجینی گۆڕیوە بۆ هیلیۆم و بەشی(٥) ملیار ساڵی تریشی تێدا ماوە، واتە(١٥٨) ملیار ملیار تەن. ئەو کاتە دەکوژێتەوەو لەگەڵی دا ژیانی سەر زەوی تێك دەچێت و دەگۆڕێ بە گرگنێکی سپی(القزم الابیض) وەکو تەنێکی خامۆشی لێ

(١) الشمس:١-١٤.




دێت، ترێك دەبێت لە قەبارەی زەوی)[1].

(دورن dorn) دەڵێ: (گەردوون یەك گرتووە دوای مردن دەردەکەوێت)[2].

## بەهەشت و دۆزەخ لە کوێن؟

(ابو نعیم) لە(تاریخ الاصفهان)دا لە پێغەمبەری(ﷺ) گێراوەتەوە: (ان جهنم محیطة بالدنیا وان الجنة من ورائها فلذلك كان الصراط طریقا الی الجنة)

واتە: دۆزەخ دەوری گۆی زەوی داوە، بەهەشتیش بە دوای ئەودا دەوری زەوی داوە، بۆیە پردی سیرات هێڵێکە بەرەو بەهەشت. ئەمەش ڕاسترین گێرانەوەیە لە پێغەمبەرو(ﷺ) چەند فەرمودەی تری ڕاست و چەند توێژینەوەی میتافیزیکی پشتگیری لێ دەکات وەکو:

(الجنة اقرب الی احدکم من شراك نعله والنار مثل ذلك) رواه البخاری. واتە: بەهەشت لە قەیتان پێڵاوتان لە ئێوە نزیکترە، ئاگریش هەروەها. (الجنة لها ثمانیة ابواب، والنار لها سبعة ابواب) رواه ابن سعد/ حسن الاسناد. بەهەشت هەشت دەرگاو دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە.

واتە: حەوت گۆی دۆزەخی دەوری زەوی داوە، دوایی هەشت گۆی بەهەشتی دەوری زەوی داوە.

(الجنة مأة درجة، مابین کل درجتین، کما بین السماء والارض) ابن مردویة/ اسنادە حسن. واتە: بەهەشت سەد پلەیە، نێوان هەردوو پلەیەك نێوان زەوی و ئاسمانە. (الجنة مأة درجة، ولوان العالمین اجتمعوا فی احداهن وسعتهم). واتە: بەهەشت سەد پلەیە، گەر جیهانەکان لە یەك پلەدا کۆببنەوە جێگایان دەبێتەوە.

ئەنجا پێغەمبەر(ﷺ) لە فەرمودەی(متفق علیه) دا دەری خستووە حەوت زەوییەکان کە دەوری زەوییان داوە دۆزەخن: (من ظلم قید شبر من الارض طوقه من سبع ارضین) واتە: کێ بستە خاکێ ستەم بکات لە حەوت زەوییان زنجیری دەکات.

---

(١) موجز تاریخ الکون/ هانی رزق/ ل:١١٩.

(٢)التزامنیة/نخبة من الاساتذة/ ت: سعد هادی سلیمان/ ل:٤٣.



(ج . ارثر . فندلای) دەڵێ: (مرۆڤ لە لەش و دەرون و گیان پێك دێت. لـەش ئەوەیـە کـە دەیبینین، دەرون هزرە، گیان لەشی ئەتیرە، ئەو لەشـی وا لێ دەکـات پێکـەوە بنوسـێت، مـردن تەنیا جیابوونەوەی لەشی ئەتیرە لە لەشی ماددی، ئەم لەشە ئەتیرییە هزریان دەرون هەڵـدەگرێت . ئەو کاتە لە ڕوی ئەتیرییەوە سەیری گەردوون دەکەین نەك لە ڕووی مادییەوە، جیهانی مـاددی دەبێ بە شتەکی پوچ و نابوت گوێ ی پێ نادرێت. بەڵام ئەتیری یـان بۆشـایی ماددەێیکـە لـەرە لەری زیاترە، ئەمە جیهانێکی حەقیقی یە ئاوەڕی لێ دەدرێتەوە، ئـەو گەردوونەیـە بـە ئـەگۆڕی دەزانین، کەچی گەردوونی ماددی بەرەو شـی بوونـەوە دەروات، لـە گـەردوونی ئـەتیری دا هـیچ شوێنەوارێك بەدی ناکەیت شی بێتەوەو لە ناوبچێ، بەڵکو هەمەوو شتێك لـە نـاوی دا چەسـپاوو ڕێکە) [1].

(لەشی ئەتیری یە لەسەر زەوی لەشی ماددیمان دەپارێزێت، دوورنییە هەمەوو شتێ لە بونـدا لەشی ئەتیری هەبێت. عـەقڵ بـە مـردن نـاگۆڕێ، بـەڵکو لـە ناوەنـدی تـردا کارەکـانی ئـەنجام دەدات)[2].

بێگومـان ئیـسلام بـە گـەردوونی گـەورە دەفـەرمێ: (العرش العظیم) کـە کورسـی و بەهەشتەکان و دۆزەخ و بونەوەری ماددی هەمووی لە ناودایەو دەوری داون و شـێوەێیکی گـۆیی وەردەگرێت. زەوی لە ناو عەرشدا چەقی بونەوەری گەورەیە!

قورئان فەرمویەتی: ﴿قُلْ مَن رَّبُّ السَّمَاوَاتِ السَّبْعِ وَرَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ﴾[3].

واتە: بڵێ: کێ پەروەردگاری حەوت ئاسمانەکان و پەروەردگاری عەرشی مەزنە؟!

﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ [4]. واتە: کورسی خودا بە ئەندازەی ئاسمانـەکان و زەوی فراوانە. بەوپێیە دەوری ئەوانی داوە.

---

(١) علی حافة عالم الاثیری/ ج . ارثر فندلای/ ل:٢٥.

(٢) .... / ل:٢٦.

(٣) المؤمنون:٨٦.

(٤) البقرة:٢٥٥.




﴿وَسَارِعُواْ إِلَى مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا السَّمَاوَاتُ وَالأَرْضُ أُعِدَّتْ لِلْمُتَّقِينَ﴾[1].

واتە: پەلە بکەن بۆ لێ خۆش بوون لە پەروەردگارتان و بەهەشتانێ پانتای یان وەکو ئاسمانەکان زەوییە، ئامادەکراوە بۆ تەقواکاران.ڕاسترین فەرموودە لە ڕاست لە کورسی و عەرش ئەمەیە، کە (الطبری) لە (تفسیر)ەکەیدا گێراویەتیەوە: (ابن زید) لە ڕاست مانای﴿وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ﴾ دەڵێ: باوکم بۆی گێرامەوە، پێغەمبەری خودا(ﷺ) فەرمویەتی: (ما السموات السبع في الكرسي الا كدراهم سبعة القيت في ترس) واتە: حەوت ئاسمانەکان لە ناو کورسی دا وەکو(٧) درهەمە هەڵدەدرێتە ناو مەتاڵێکەوە.

(ابو ذر) وتی: لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە: (ما الكرسي في العرش الا كحلقة من حديد القيت بين ظهري فلاة من الارض) واتە: کورسی لە عەرشدا وەکو بازنەیەکی ئاسنە فڕێ دەدرێتە ناو دەشتێکی کاکی بەکاکی.

هەندێ لە فەیلەسوفەکان پێیان وایە حەوت ئاسمانەکان لە کورسی دان و کورسی لە عەرشدایەو، عەرش فەلەکی نۆیەمە.

(ابن حزم) بە دوری نازانێ ئایەتی: ﴿وَيَحْمِلُ عَرْشَ رَبِّكَ فَوْقَهُمْ يَوْمَئِذٍ ثَمَانِيَةٌ﴾[2]. واتە: ئەو ڕۆژە هەشت عەرشی خوا هەڵدەگرن. حەوت ئاسمانەکان و کورسی دەبن بە هەشت و ئەوان ئیمرۆ و ئەو ڕۆژەش لەمیان نێمە و عەرشدان[3].

(ارثر فندلای) دوای قسەکردنی لەگەڵ گیانێکدا لە ڕێگای مەدیومێکی تایبەتی خۆیەوە کاتێ لە گیانەکە دەپرسێ: ئایا جیهانی ئێوەش وەکو جیهانی ئێمە ماددییە؟ مەدیومەکە کە خەوێنراوە وەڵامەکە ئاوا لە ڕوحەکە وەردەگرێت: (جیهانی ئێمە ماددی نییە، بەڵکو حەقیقی یە، لەبەر ئەوەی بەرجەستەیە، چونکە لە ماددەیێك پێك دێ لەرە لەری لەو ماددەیە بەرزترەکە جیهانی ئێوەی پێك هێناوە).

---

(١) ال عمران:١٣٣.

(٢) الحاقة:١٧.

(٣) الفصل في الملل والاهواء والنحل/ ابن حزم الاندلسي الظاهری/ ج١/ ل:٣٣٦.

وە دەڵێ:(ئێمە لە جیهانێکی حەقیقی بەرجەستەدا دەژین، گەردیلەکانی پێك هاتەکەی لە گەردیلەکانی پێك هێنەری جیهانی ئێوە جیاوازە، هزری ئێمە دەتوانێ کار لەو ماددە هەست پێ کراوە بکات، بەڵام ئێوە لە جیهانی خۆتاندا ئەوە ناتوانن، چونکە ئێوە لە جیهانێکدا دەژین لەرە لەری(الذبذبات) یان لە جیهانی ئێمە هێواش ترە) [1].

**وە(ارثر فندلای) دەنوسێ:**

(مردن وەکو پێمان گوتن ئاسانە، وەکو ئەوە وایە دەچیە سەرجێگا بۆ نوستن، لەشی ئێمە لە لەشی فیزیاییمان دێتەدەر، هزر لەگەڵ خۆیدا هەڵدەگرێت، پاشان لە ئاونەدێکی تردا بێدار دەبینەوە. خزم و کەس و کارمان دەبینینەوە، ئامادەن لەو ژیانە تازەیەدا رێنومامان بکەن، مردن تەنیا بریتی یە لە جیابونەوە لەو لەشە ماددییە...) [2].

گەر تەماشای قورئانی موعجیزەمان بکەین فەرمویەتی: ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَائِقَةُ الْمَوْتِ ثُمَّ إِلَيْنَا تُرْجَعُونَ﴾[3].واتە: هەموو دەرونێ مردن دەچێژێ، پاشان بەرەو لای ئێمە دەگەرێنەوە. ﴿يَا أَيَّتُهَا النَّفْسُ الْمُطْمَئِنَّةُ ارْجِعِي إِلَى رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً فَادْخُلِي فِي عِبَادِي وَادْخُلِي جَنَّتِي﴾ [4].

واتە: ئەی دەرونی دڵنیا بگەرێوە لای پەروەردگارت کە رازی وئەو لێت رازیە، **برۆ ناو** بەندەکانی منەوە برۆ ناو بەهەشتی منەوە.﴿ **اللَّهُ يَتَوَفَّى الْأَنفُسَ حِينَ مَوْتِهَا وَالَّتِي لَمْ تَمُتْ فِي مَنَامِهَا فَيُمْسِكُ الَّتِي قَضَى عَلَيْهَا الْمَوْتَ وَيُرْسِلُ الْأُخْرَى إِلَى أَجَلٍ مُّسَمًّى إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**﴾ [5]. لێرەدا قورئان مردن ونوستن بەیەك چاو سەیر دەکات، ئەنجا نوستن بە ئامێری پەیوەندی دەزانێ لە نێوان گیانی مردوان و گیانی زیندواندا.

(ابن عباس) رەزای خوای لێ بێ لە راست ئەم ئایەتە دەفەرمێ: **(گیانی زیندوان و مردوان**

(١) على حافة العلم الاثير/ ل:١٠٠.

(٢) على حافة عالم الاثيري/ ل:٤٤.

(٣) العنكبوت:٥٧.

(٤) الفجر:٢٧-٣٠.

(٥) الزمر:٤٢.

لە کاتی نوستندا دیداری یەکتری دەکەن، پرسیار لە یەکتری دەکەن، ئەنجا خوا گیانی مردوان دەگرێت و گیانی زیندوان بۆ لاشەیان دەگێڕێتەوە)[1].

## مردن چییە؟

بە پێ ی فەرمودەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کاتێ گیان لە لەشی ماددی جیابۆوە تا بتوانێ لەگەڵ ئەو ناوەندە نوێیە هەڵبکات کە دنیای بەرزەخە لەشێکی تری بۆ گیان دوروست دەکرێت، چۆن لە دنیادا لەشێکی ماددی بۆ دوروست دەکرێ تا بتوانێ لەگەڵ دنیای فیزیایی دا هەڵبکات: (نسمة المؤمن طائر يعلق في شجر الجنة) رواه احمد. واتە: گیانی بڕوادار باڵندەیەکە بە درختی بەهەشتەوە خۆی هەڵدەواسێت. (ارواح الشهداء في حواصل طير خضر تسرع في الجنة حيث شاءت). واتە: گیانی شەهیدان لە سی کلدانۆچکەی باڵندەی سەوزدایە بۆ کوێ بوێ لە بەهەشتدا دەڕوات.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمویەتی کە (احمد) و (الترمذی) گێراویانەوە: (من فارق الروح الجسد وبريء من ثلاثة دخل الجنة: من الكبر والغلول والدين). واتە کێ گیانی لە لاشە جیابۆوە لە سێ شت بە دوور بوو دەڕواتە بەهەشتەوە، خۆبەزلزانی و ناپاکی و قەرز.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) (الاسلمی) ڕەجم کرد کاتێ دانی نا بە زینادا، فەرموی: (والذی نفسي بيده انه الان في انهار الجنة ينغمس فيها). رواه احمد و ابو داود. واتە: سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە ئێستا لە ڕوبارەکانی بەهەشتدا خۆی تێدا نقوم دەکات.

سەیری ئەم فەرمودەیە موعجیزەیە بکە: (ما شبهت خروج المؤمن من الدنيا الا كمثل خروج الصبي من بطن امه، من ذلك الغم والظلمة الى روح الدنيا). (نوادر الاصول / حكيم الترمذي) دەرچونی بڕوادار لە دنیا بەوە دەچوێنم کە کۆرپەڵە لە سکی دایکی دا لەو غەم و تاریکی یە دەردەچێ بۆ ناو خۆشی دنیا.

گیان وەکو(النووی) دەڵێ: (لەشێکی ناسکە دەڕواتە ناو لەشە چڕەکانەوە وەکو بوونی ئاو

(١) الروح / ابن القيم الجوزي/ ل:٣٦.





لە ناو داری تەڕدا)[1].

(ابن عمر) گێراویەوە: (ارواح المسلمین في صور بیض في ظل العرش والارواح الکافرین في الارض السابعة). واتە: گیانی بڕواداران لە وێنەی یان لە لەشی سپی دان لە سێبەری عەرشدا، گیانی بێ بڕوایان لە زەوی حەوتەمدایە. چونکە(کرۆك) لە ناو زەوی و هەموو تەنێکی تری ئاسمانی دا وەکو ئەستێرەکان لە هەموو شوێنێك گەرمترە.

لە دۆزەخیشدا هەروەها!

ڕابردوو باسمان کرد زەوی لە ڕووی جیۆلۆجییەوە لە(٧) توێکڵ پێك دێ، لە ڕووی میتافیزیکی یە وە لە حەوت دۆزەخ پێك دێت دەوری ئەو(٧) چینەی داوە. ناو زەوی ماددی هەمووی تاوێری تواوەیە پلەی گەرمی یان(٢٢٠٠)° س. کرۆکەکەی لە هەموو شوێنێك گەرمترە. قورئانیش فەرمویەتی: ﴿فَاتَّقُواْ النَّارَ الَّتِي وَقُودُهَا النَّاسُ وَالْحِجَارَةُ﴾ البقرە:٢٤.

واتە: خۆت بپارێزە لەو ئاگرەی سوتەمەنیەکەی مرۆڤ و تاوێرە. وەکو باسمان کرد ناخی زەوی لە گازاو(الحممlava) پێك دێت کە ماددەی تواوەیە لە کاتی بورکاندا دەبینرێت. جا ئەگەر پلەی گەرمی زەوی فیزیایی ئەوەندە بێ، دەبێ گەرمی دۆزەخ چەند بێ لە ناو ئەو زەوی یە فیزیایەدا کە(٧) گۆی ئەتیرینە لە ناخی دان و دەوری داون؟!

پێشەوا علی(علیه السلام) ئاماژەی کردووە: (باب فوق باب) واتە: دۆزەخ دەرگاکانی یەك لەسەر یەکە. (البیهقی) لە پێغەمبەری(ﷺ) گێراوەتەوە: (دەرگاکانی دۆزەخ حەوت دەرگایە: (الجهنم، الحطمة، لظی، السقر، السعیر، الهاویة، الجحیم).

(ابن منده) لە پێغەمبەری(ﷺ) گێراوەتەوە: (ان ارواح المؤمنین في حواصل طیر خضر ترعی في الجنة، قد تأکل من ثمارها، وتشرب من میاهها وتأوي الی قنادیل من ذهب تحت العرش یقولون ربنا الحق بنا اخواننا واتانا و عدتنا، وان ارواح الکفار في حجر في النار یقولون ربنا لاتلحق بنا اخواننا ولا تؤتنا ما وعدتنا).

واتە: گیانی بڕواداران لە سیکڵدانۆچکەی باڵندەی سەوزدان لە بەهەشتدا لە میوەی

---

(١) شرح الصدور للسیوطي/ ل:٢٨٩.





بەهەشت دەخۆن، لە ناوی بەهەشت دەخۆنەوە، مرودەی چەند چرایەکی زێر دەبن لە دەوری عەرشدا، دەڵێن: پەروردگارمان بە براکانمان بگەیێنەو ئەو بەڵێنەی پێت دابوین بۆمان بێنەدی، وە گیانی بێ بڕوایان لە سیکڵدانۆچکەی باڵندەی ڕەشدان خواردنیان ئاگرەو هەر ئاگر دەخۆنەوە، ڕوله تاوێرێکی دەکات لە ئاگردا، دەڵێن: پەروەردگارمان بە برادەرانمان مەگەیێنە و ئەو بەڵێنەی بە نێمەت دابوو مەیبە سەر. ...

لە فەرمودەی(صحيح)دا هاتووە کە(متفق عليه) یە: (ان اهون اهل النار عذابا القيامة لرجل يوضع في اخمص قدميه حجران يغلي منهما دماغه). واتە: سوکترین سزای دۆزەخ لە قیامەتدا بۆ پیاو ئەوەیە دوو تاوێر پێ ی دادەنرێن مێشکی سەری لە گەڵی دا دەکوڵێت.

یان دەفەرمێ: (ناركم هذه التي توقدون جزء من سبعين جزء من نار جهنم). متفق عليه. واتە: ئەو ئاگرەی ئێوە دای دەگیرسێنن بەشێکە لە حەفتا بەشی دۆزەخ.

بە ویستی خودا لە بەشی(میتافیزیکا) بە درێژی باس لە جیهانی سەروی ماددی و میتافیزیکا دەکەین، کە دەوری گەردوونی ماددی داوە و مرۆڤ لە کاتی نوستن و مردندا پێ ی دەگات و پەی دەبات و لە کۆتی زەمان و مەکان دەڕواتە دەروو دەبێ بە سفر. وەکو میعراجی پێغەمبەرو(ﷺ) خەونەکانمان کە باشترین نمونەن بۆ ناشنابونمان بەم جیهانە، کە مرۆڤ دوای مردن بە یەکجاری پیێ ی دەگات. ﴿رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ﴾ البقرة:٢٠١.





# (دوا وشەمان)

**(وفي الارض ايات للمؤمنين)**

ئەوەی خوێندمانەوە زیاتر لە(٢٠٠) ئیعجازی جیۆلۆجی لە خۆی گرتووە ، ژمارەیەکی ئاوا زۆر هەتا ئینسکلۆپیدیا ئیعجازییە عەرەبیەکانیش دا کەمە، زۆر سوپاسی خوا دەکەم کە دەرفەتی دام توانیم ئەویش بێنمەرێزی گەردوونناسیەکەم و پێشکەشی قوتابیان و مامۆستایان و خولیایانی ئەم ئیعجازانەو جیۆلۆجیەکانی بکەم، هیوادارم هەنگاوێ بێ بۆ بەرەوپێش بردنی زانست و زانیاری لە کوردستانی پیرۆزماندا، ئەو کوردستانەی لانەی پێغەمبەران و ئەولیایان و فەیلەسوفان و شۆڕش گێران بووە، خالێ گۆڕان و نوێ بوونەوەی دین و مێژووش هەر لەوێ دەبێت﴿وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ اللَّهِ تَبْدِيلًا﴾.

بێگومان ئیعجازە گەردوونیەکان و جیۆلۆجیەکان لە قورئانی پیرۆزدا بە شێوەیێکی موعجیزەیی دارێژراون، کە هەموو چەرخ و سەردەمێ دەتوانێ لێیان حالێ ببێت و سەرنجیان بۆ رابکێشت، لەگەڵ فراوان بوونی بازنەی زانستی و زانیاریشدا وەچە لەدوای وەچە ئەو مانایانە فراوانتر دەبن، بێ ئەوەی ناکۆکی بزانن لەگەڵ یەکتری دا، ئەم دارشتنەش بۆ وشە خوایی یەکان نەبێ نابێت، بۆیە لە هەموو چاخێکدا پێویستە راستی زانستەکان دیاری بکرێت تا بتوانین لە وشە خوایی یەکان بگەین و ئەوە بسەلمێنین، ئەوەی ئیمرۆ زانست لە رێگای ئەزمونەکانەوە دەدۆزێتەوەو دەیسەلمێنێ قورئان دەست پێشخەری کردووە و، بەرلەو ئاماژەی بۆ ئەو راستی یە گەردوونیانە کردووە. پاشان قورئان دنیاو پەسلاێ پێکەوە گرێ دەدات و لە یەك هاوکێشە دایان دەنێت. سەرباری ئەودش قورئان هەموو هەڵە زانستی یەکان و فەلسەفی یەکان و ئاینی یەکان، کە مرۆڤی ئەمرۆ تێ کەوتووە راست دەکاتەوە. بە مرۆڤایەتی رادەگەیێنێ ئەم گەردوونە یەکەو ماددەو ئەتیرە، خوا دورست کەریانە، خوایاسا دانەریانە، خودا بەرێوەبەریانەو بەفەرمان و ویست و زانست و توانای ئەو هەڵ دەسورێت. گەر ئێمە سەیری تەفسیرەکان بکەین تەفسیری(الكبير)ی (الرازي) یەکەم تەفسیرە ئایەتەکان بە فەلسەفی و زانستی لێك دەداتەوە، ئەنجا(تفسير الجواهر)ی (الطنطاوي)، کە لەگەڵ روحی سەردەم دا دەگونجێت و لە ئاستی هزری سەردەمدا قسە دەکات!.




**پێشەوا علی(علیه السلام) لە ڕاست قورئان فەرمویەتی: (وان الله سبحانه یعظ احدا بمثل هذا القران، فانه حبل الله المتین، وسببه الامین. وفیه ربیع القلوب، وینابیع العلم، وما للقلب جلاءه غیره)** [1].

واتە: خوای بێ گەرد کەسی ئامۆژگاری نەکردووە بە وێنەی ئەو قورئانە، ئەو پەتی قایمی خودایە، هۆکاری ئەمینداری ئەوە، بە هاری دڵان لەودایە، سەرچاوەی زانستە، دڵان بەو نەبێ پاکژنابنەوە.

دەفەرمێ: **(وتعلموا القران فانه حسن الحدیث، وتفقهوا فیه فانه ربیع القلوب، واستشفوا بنوره فانه شفاء الصدور، واحسنوا تلاوته فانه انفع القصص)** [2].

واتە: فێری قورئان بن جوانترین فەرمایشتە، لێ ی حاڵی بن ئەو بەهاری دڵانە، بەروناکی ئەو خۆتان چارە بکەن، ئەو چارەی دڵانە، جوان بیخوێننەوە، ئەو بەسودترین داستانە.

بەڵێ قورئان قوتابخانەی ڕێنومایە، ڕێبازی ژیانە، مرۆڤ تەنیا لە سایەی قورئانندا مانای ژیانی تێ دەگات و ئایدەلۆژیای ڕاست دەکاتەوە، ڕوانینی بۆ گەردوون ڕاست دەکاتەوەو بە هیواوە دەتوانێ بژی و شنەی ئاسایش و بەختەوەری و ئارام هەڵمژێت. دەبا قورئان بخوێنین، لە ماناکانی وردبینەوەو عەمبارە پڕ لە هاوبیرەکانی بدۆزینەوە، ڕێبازی ژیان لەوشە خوایی یەکان دایە کە بانگێشە دەکەن بۆ ڕێنومابونی مرۆڤ و هەڵگرتنەوەی لەسەرەنگرێ بوون و هەرەس هێنان و گومرابوندا.

با خۆمان لە خوێندنەوەی ئەو کەسانە دوربخەینەوە کە وشەکان دەخوێنینەوەو لە ناوەرۆکە پڕ لە زانست و عیرفان و فەلسەفەکەی تێ ناگەن، ئەو کەسەی لە کەنار ئۆقیانوسێ دەوەستێ لە قوڵایی یەکەی تێ ناگات، ئەوەی لەسەر ڕوی دەریا مەلە دەکات، ناتوانێ مرواری و مەرجانەکانی بەدەست بێنێت. ئاسۆی قورئان فراوانە، قوتابخانەکەی دەوڵەمەندە و بەخششیەکەی نەبڕاوەیە، لە هەموو ئاسۆکانیەوە ڕۆژ بە ڕۆژ مرۆڤ ئاسۆیەکی نوێ ی ژیانی تێدا دەدۆزرێتەوەو، واتایەکی نوێ پەردە لەسەر هەڵدەماڵێت.

---

(١) نهج البلاغة/ بشرح الشیخ د: صبحي صالح./ ل:٢٠٤

(٢) ..... / ل:١٦٤.





بەڵێ: قورئان خۆی شاهیدە کە هەموو بونەوەر لەودا نوسراوەتەوە، تابلۆی پارێزراوی خودایە: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِي الكِتَابِ مِن شَيْءٍ﴾[1].

واتە: هیچ شتێ نییە لە قورئاندا باسمان نەکردبێت.

﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ تِبْيَانًا لِّكُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً﴾ [2].النحل:٨٩.

واتە: قورئانمان ناردۆتە سەر تۆ ڕونکەرەوەی هەموو شتێکە و ڕێنوماو ڕەحمەتە.

پێشەوا عەلی(کرم الله وجهه) فەرمویەتی: (وان القران ظاهرة انيق، وباطنه عميق، لاتفنى عجائبه، ولاتنقضي غرائبه، ولاتكشف الظلمات الا به). واتە: قورئان ڕواڵەتەکەی جوانە، ناوەکەی قوڵە، شتە سەیرەکانی تەواو نابن، شتە نامۆکانی نابڕێنەوە، تاریکاییەکان بەو نەبێ لاناچن.

بەڵێ ئەم ئیعجازە قورئانیانەن چینی زاناو ڕۆشنبیری خۆرئاوا بەرەو لای خۆیان ڕادەکێشن و لە شەوە زەنگی تاریکی یەوە بەرەو روناکییان دەبات و، داهاتوش دەیانکات بە بانگەوازی خوازێکی دڵسۆز بۆ ئەو قورئانە، کە ئەوی ڕێنوماکردووە. لەوانەش(سێر جیمس) و زاناو بیر تیژی ماتماتیکی ئینگلیزی(لورد هدلی) و (خ . کمال الدین) و (د: لیوبولد فایبس)کە ناوی خۆی نا(محمد اسد) وە زۆرێ لەوانە کاتێ ستایشی گەورەی قورئان وکەسایەتی بەرزی پێغەمبەر (ﷺ) لەلایەن کەڵێساوە تۆشی بێ بەشی و ئازار هاتون لەوانە(توماس کارلیل ) و(تۆلستوی)و(جان بروا) و (جۆرج بەرنادشۆ) و هی تریش.

جۆرج بەرنادشۆ دەڵێ: گەر محمد لە گۆڕ زیندو بێتەوەو بێتەدەر لە ماوەی خواردنەوەی پیاڵەێیك قاوەدا کێشەکانی جیهان چارە دەکات. ئەنجا پێشبینی دەکات ناچارە ئەوروپا بەرەو ئیسلام بێت، چونکە کێشە مرۆیی یەکان بە ئیسلام نەبێت چارە نابن. بۆ زانستی پتر بڕوانە: (حركه الاسلام ومفكر الغرب/ د:محسن عبدالحميد) و(ژیانەوە/ ئەندازیار عوسمان محمد رەشید) و (العلم طريق الايمان/ الزنداني) .

لەم خوێندنەوەیەدا دەبینین کە ئیمان و زانست وەکو دوو باڵ وانە بۆ مەل و ناتوانێ بە بێ

(١) الانعام:٣٨.

(٢) نهج البلاغة/ ل:٣١٥.




ی ئەم دووگ باڵە بفرێت. شاراوەنیە لە خۆرئاوا لە سەدەکانی ناوەراست دا بە هۆی ستەمی کەڵێساو سەرکوتکردنەکانی لەسەر هەندێ بیرو بڕوای زانستی، دەهات زانایانی دەسوتاند و پێشی بە زانستە ئەزمونیەکان دەگرت، بەم هۆیە ناکۆکی کەوتە نێوان ئاین و زانستەوە، هەندێ لە دەمارگیرەکان پەلیان کێشا بۆ جیاکردنەوەی دین لە زانست، گوایە زانست جێگرەوەی دینە، بەلاّم زانایانی ڕۆچوو لە زانست و فەلسەفە دا هەر ئەو کاتە بەمە ڕازی نەبون و بەمەترسیداریان وەسف کرد، بەلاّم زۆری نەبرد، ئەم تیورە هەرەسی هێناو ڕەوتی زانایانی بڕوادار زاڵ بویە سەر ڕەوتی زانایانی بێ بڕوادا، تا ئەنیشتاین وتی: (دین بەبێ زانست کوێرە و زانست بە بێ دین شەلە). ئەنجا ڕابونی ئیسلامی دەورەکی باڵای گێرا لە گێرانەوەی بڕوا بۆ ناو هزری زانایان و، پەشیمان کردنەوەیان لەم هەڵوێستە توندەی کە لە ڕاست دیندا نواندییان.

سەیرکە دەیان کتێب لە دژی بێ بڕوایی دا بلاّوکراوەتەوەو، لە هەموو بوارێکدا هەڵکوترایە سەر هەموو تیورەکانی بێ دینی، لەوانە تیوری ماددی یەت و مارکسی یەت و تیوری پەرەسەندن و دەیان تیوری تر کە لە دژی دیندا بە ناوی زانست ڕاست کرابونەوە.

لەوانە(الله يتجلى في عصر العلم) کە زیاتر لە(٣٠)پسپۆری ئەمریکی دەینوسن، لەوانە(العلم يدعوا للايمان/ کریسۆن مۆریسۆن). لە ساڵی (١٩٩٠) دا زانای فیزیایی بەناوبانگ باول(دیفیز) بەخششی یەك ملیۆن دۆلاری لەسر کتێبی(الله والفيزياء الحديث) وەرگرت کە بونی خوا و جیهانی غەیبی تێدا بە بەڵگەی زانستی دەسەلمێنێت. (هل تعرضت لغسيل الدماغ/ دوان . ت كيش). خوای گەورەش بەڵێنی داوە بە گەڕانەوەی خۆرئاوا بەرو ئیسلام، بەلاّم دوای ئەوەی جیهانی ئیسلامیش دینی ڕاستەقینەی موحەممەدی تێدا نوێ دەبێتەوەو حوکمی خەلافەتی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامی دا زەمینە خۆش کەرەبۆ ئەو گۆڕانە گەورەیەی بەرێوەیە و دین و مێژوو نوێ دەکاتەوە.

﴿سَنُرِيهِمْ آيَاتِنَا فِي الْآفَاقِ وَفِي أَنفُسِهِمْ حَتَّى يَتَبَيَّنَ لَهُمْ أَنَّهُ الْحَقُّ﴾ فصلت:٥٣.

﴿وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي الزَّبُورِ مِن بَعْدِ الذِّكْرِ أَنَّ الْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ الصَّالِحُونَ﴾ الانبياو:١٠٥.

*(وصلى الله على سيدنا محمد واله الطاهرين واصحابه وازواجه واتباعه الى يوم الدين)*

چیوەی سەرێ/ ٢٠٠٩/٧/٣٠



## سەرچاوەکان

(١) القران الكريم.
(٢) نهج البلاغة/ بشرح الشيخ محمد عبدة، دار الكتاب العربي.
(٣) تفسير الطبرى/ ابى جعفر محمد بن جرير الطبرى / تعليق محمود شاكر / بيروت/ لبنان.
(٤) تفسير الكبير/ فخرالدين الرازى الشافعى/ دار التب العلمية / بيروت – لبنان.
(٥) تفسير الكشاف / ابى قسم جارالله محمود بن عمر/ دار المعرفة/ بيروت – لبنان.
(٦) تفسير القران العظيم / لابن كثير / دار السلام/ الرياض.
(٧) صفوة التفاسير / محمد على صابونى/ دار القلم العربي/ حلب.
(٨) مفردات الراغب/ العلامة الراغب الاصفهانى / ذوى القربى.
(٩) لسان العرب/ لابن منظور / دار الصادر.
(١٠) المنجد في اللغة/ لويس معلوف.
(١١) الصحاح / الجوهرى/ دار المعرفة.
(١٢) معجم المحيط. الفيروز ابادى/ دار المعرفة.
(١٣) کەمال نامە/ کەمال جەلال غەریب/ سلیمانی/ ج١.
(١٤) معجم الوسيط / ابراهيم مصطفى و الاخرين / دار الدعوة.
(١٥) فتح البارى على صحيح البخارى/ ابن حجر العسقلانى/ دار السلام – الرياض.
(١٦) النهاية في غريب الحديث والاثر/ ابن الاثير / دار المعرفة.
(١٧) صحيح مسلم بشرح النووى/ للنووى / دار ابن الهيثم.
(١٨) سنن النسائى بشرح السندى و السيوطى/ دار المعرفة.
(١٩) سنن ابن ماجة بشرح السندى/ دار المعرفة.
(٢٠) فيض القدير/ شرح الجامع الصغير /للمنادى/ دار الكتب العلمية/ بيروت – لبنان.
(٢١) كتاب المقدس.
(٢٢) الاتقان في العلوم القران / للسيوطى/ دار بن كثير.
(٢٣) الارض في القران الكريم/ ن . زغلول راغب محمد النجار/ دار الكتب العلمية / بيروت – لبنان.
(٢٤) الموسوعة الكونية الكبرى/ د: ماهر احمد الصوفى / المكتبة العصرية.
(٢٥) ايات الله فى الافاق / د . محمد راتب النابلوسى/ دار المكبى.
(٢٦) الموسوعة الذهبية في اعجاز القران الكريم والسنة النبوية / د: احمد مصطفى المتولى / دار الابن الجوزى

/ القاهرة.
(٢٧) موسوعة الاعجاز العلمى في القران الكريم و السنة المطهرة/ يوسف الحاج/ مكتبة ابن حجر.
(٢٨) الموسوعة العلمية فى اعجاز القران الكريم والسنة النبوية/ د: هانى المرعى القيسى / الشيخ مجدى فتحى السيد/ المكتبة التوفيقية.
(٢٩) ايات الاعجاز العلمى / من الوحى الكتاب والسنة/ عبدالرحمن سعد صبى الدين/ دار المعرفة.
(٣٠) موسوعة عباس محمود العقاد الاسلامية / المكتبة العصرية.
(٣١) مقدمة ابن خلدون/ ايهاب محمد ابراهيم/ مكتبة القران.
(٣٢) تفسير ابن عربي. للشيخ العلامة ابن عربي/ دار احياء التراث العربي.
(٣٣) مدخل الى دراسة اعجاز العلمى/ د: زغلول النجار / دار المعرفة.
(٣٤) السماء فى القران الكريم/ د: زغلول النجار / دار المعرفة/ بيروت / لبنان.
(٣٥) بناء الكون ومصير الانسان / هشام طالب/ دار المعرفة/ بيروت / لبنان.
(٣٦) علوم الارض والبيئة للهواة/ خير الشاهين/ دار المسيرة.
(٣٧) كوكب الارض ظواهره التضاريسية الكبرى/ د: حسن سيد احمد ابو العينين/ دار النهضة العربية.
(٣٨) معالم سطح الارض/ د: جودة حسين جودة/ دار النهضة العربية.
(٣٩) جغرافيا العالم / الاء عبدالحميد/ مكتبة لكل بيت.
(٤٠) الموسوعة الفلكية الحديثة/ عماد مجاهد.
(٤١) موجز تاريخ الكون/ هانى رزق/ دار الفكر.
(٤٢) عجائب الطبيعة/ بسام محمد عيسى/ دار الرضوان.
(٤٣) الزلازل والبراكين/ د: ايمن الاسكندرانى / مكتبة ابن سينا.
(٤٤) علم الارض / الك سمث/ ت: فارس لطفى الخورى/دار الشؤن الثقافة العامة.
(٤٥) علم الفلك / د: فياض النجم/ د:مجيد مجول/ وزارة التعليم العالى /العراق/ ١٩٨٢.
(٤٦) على حافة عالم الاثيرى / ج. ارثر فندلاى/ ت: احمد فهمى ابو الخير مكتبة النهضة المصرية.
(٤٧) ما بعد الحياة/ كولن ولسن/ ت: د: فاضل السعدونى/ مكتبة التحري.
(٤٨) عصر الخوارق/ ج . ا . ج . رايز/ ت: ماجدة صبيح/ بغداد / ١٩٨٥.
(٤٩) التزامنية/ نخبة من الاساتذة / ت: سعد هادى سليمان/ بغداد/ ١٩٨٨.
(٥٠) حروب العقل/ رونالد . م . ماكرى/ ت: سمير محمد / بغداد/١٩٨٨.
(٥١) اثار العصر الجليدى البلاستوسينى في كردستان/ ء . ا . رايت/ ت: فؤاد حمه خورشيد/ بغداد/ ١٩٨٦.

(٥٢) علم التطور/ ليث عبدالجليل الجواد/ د: عبدالوهاب النجار/ دار الحديث/ القاهرة.
(٥٣) قصص الانبياء / د: عبدالوهاب النجار/دار الحديث/ القاهرة.
(٥٤)تاريخ الطبرى/ دار الكتب العلمية/ بيروت.
(٥٥) البداية والنهاية/ ابن كثير/ دار المعرفة.
(٥٧) مروج الذهب/ للمسعودى/ دار المعرفة.
(٥٨) جغرافية البحار والمحيطات/ د: مهدى محمد على/ بغداد/ ١٩٨٢.
(٥٩) استكشاف الارض والكون/ اسحاق عظيمون/ ت: هاشم احمد/ المجلس الاعلى للثقافة.
(٦٠) الذرة من الالف الى الياء/ ك . كلادكوف / ت:عبدالرزاق المخزومى/ بغداد / ١٩٨٨.
(٦١) الجيولوجيا البيئة/ ادوارد كيلر/ د: غسان محمد البستى/ اربيل /١٩٨٩.
(٦٢) هل تعرضت لغسيل الدماغ؟ بروفيسور ددان ت . كيش /ت : اورخان محمد على/ بغداد /١٩٨٥.
(٦٣) الله يتجلى فى عصر العلم/ جون كلوفر مونسا/ د: الدمرداش عبدالحميد سرحان/ القاهرة/ مؤسسة الحلبى.
(٦٤) العلم يدعو للايمان/ كريسون لوريسون/ ت: الاستاذ محمود صالح الفلكى. القاهرة /نيورك/ط٥.
(٦٥) الاسماء والصفات/ البيهقي/ دار الكتاب العربي.
(٦٦) الفرق بين الفرق/ ابو منصور البغدادى/ دار الطلائع/٢٠٠٥.
(٦٧) الفصل/ ابن حزم الظاهرى/ دار ابن الهيثم.
(٦٨) الملل والنحل/للشهرستانى/ دار ابن الحزم.
(٦٩) الروح/ ابن القيم الجوزى / الشركة الجزائرية اللبنانية.
(٧٠) شرح الصدور/ السيوطى/ دار الكتاب العربى.
(٧١) الدار الاخرة/ محمد مترلي الشعراوى/ مكتبة التراث الاسلامى.
(٧٢) البدور السافرة في امور الاخرة/ مؤسسة الكتب الثقافية السيوطي.
(٧٣) كنوز العلم / وليم فرجارا/ ت: د: السيد زمضان هدارة/ بغداد/ ١٩٨٧.
(٧٤) نشأة الحياة على كوكب الارض / ويليام داى/ ت: يعقوب يوسف ابونا/ بغداد / ١٩٨٩.
(٧٥) الطبيعة فى القران الكريم/ د: كاصد ياسر الزيدى/ بغداد / ١٩٨٠.
(٧٦) مهد البشرية / ديكر اى/ ديطرام / ت: جرجيس فتح الله.
(٧٧) الكرد فى المصادر القديمة/ ج . ار . درايفتر / ت: فؤاد حمه رشيد.
(٧٨) الكرد والكردستان / ارشاك سافراستيان/ ت: د: احمد خليل.





(٧٩) نظرتنا المعاصرة الى الكون/ د: طالب ناهي الخفاجي/ دار الرشيد للنشر.

(٨٠) الله وعلم الحديث / د: عبدالرزاق النوفل.

(٨١)السماء و اهل السماء/ د: عبدالرزاق النوفل.

(٨٢) الاسلام يتحدى/ وحيد الدين خان.

(٨٣) الدين في مواجهة العلم/ وحيد الدين خان.

(٨٤) الموسوعة الفلسفية المختصرة/ ت: فؤاد كامل – جلال العشرى.

(٨٥) مع القران في عالمه الرحيب/ د: عماد الدين خليل/ دار العلم للملايين.

(٨٦) حقائق القران والعلم الحديث/ عامر تحسين/ مطبعة الزهراء الحديثة.

(٨٧) دراسات عن الذهب الاسود/ عزيز حسن الخفاج/ بغداد/ ١٩٦٩.

(٨٨) الكون العميق/ د: علي الامير/ بغداد/ ١٩٨٦.

(٨٩) العقائد الاسلامية/ السيد سابق.

(٩٠) التربية البيئة/ د: عادل مشعان ربيع / د: هادى مشعان ربيع/ عالم الثقافة.

(٩١) فلسفتنا / السيد محمد باقر الصدر.

(٩٢) التصوف الاسلامى / نور اندرية.

(٩٣) الفتح الربانى والفيض الرحماني/ للشيخ عبدالقادر الكيلاني.

(٩٤) معجزة القران والطوفان/ المهندس سعد حاتم محمد مزرة/ ١٩٩٥/ط١.

(٩٥) الانسان وقواه الخفية/ كولن ولسن/ مطبعة الرشاد/ بغداد/ ١٩٨٨.

(٩٦) الانسان والبيئة/ ت: عصام عبداللطيف / بغداد / ١٩٧٩.

(٩٧) هنا بدء التاريخ/ س . ن . كريمو / ت: ناجية المرانى/ بغداد /١٩٨٠.

(٩٨) صورة الكون/ د: محمد عبد اللطيف مطلب/ بغداد/ ١٩٧٨.

(٩٩) الكامل في التاريخ/ للابن الاثير/ دار الكتب العلمية/ بيروت/ لبنان.

(١٠٠) مجموعة الرسائل الغزالي/ ابراهيم امين احمد/ مكتبة التوفيقية.

(١٠١) مع الله في السماء/ د: احمد زكي/ دار الهلال.

(١٠٢) الانفجار الكبير/ اوميد شمشك/ ت: اورخان محمد على/ بغداد /١٩٨٦.

(١٠٣) گەردوونناسی لە سایەی قورئان و فەرموودە/ نوسەر.

(١٠٤) دەیان کتێب و سەرچاوەی تر لە گۆڤارەکان و ڕۆژنامەکان.



## ناوەرۆك


زەوی ناسی



زەوی ناسی

## ئەم ئینسكلۆپیدیایە:

- كتێبێكە دادەبەزێتە ناو هەموو مەیدانەكانی ئیعجازی قورئان و سوننەتی و لەئاستێكی بەرزدا دەیانخاتە ڕوو.
- كتێبێكە تا ئێستا بەگەورەترین ئینسكلۆپیدیای ئیعجازی كوردی دادەنرێت.
- ئەم كتێبە هەموو ڕۆشنبیرێك پێویستی پێی دەبێت.

ئەم زنجیرە ئیعجازە پێكهاتووە لەم بەشانەی خوارەوە :

١- گەردوونناسی
٢- زەوی ناسی (جیۆلۆجی)
٣- میكافیزیكی
٤- گەردیلەناسی
٥- سێكس لۆجی
٦- پزیشكی خۆپاراستن
٧- پزیشكی چارەسەركردن
٨- پزیشكی گژو گیاو خۆراك
٩- پزیشكی دەروونی (دەرنناسی)
١٠- گیانەوەر زانی
١١- هەندێ زانستی جیاجیا
١٢- كۆرپەلە ناسی
١٣- ژینگە ناسی
١٤- زۆر شتی تر





چاپخانەی ڕۆژهەڵات/هەولێر
عێراق - كوردستان - هەولێر
٠٦٦ ٢٢٣٣٨٦٨
نرخی ٨٠٠٠ دینارە